# ئیسلام

## لە نێوان ڕۆژهەلات و ڕۆژئاوادا





نووسینی
عەلی عیززەت بیگۆڤیچ

ەرگێرانی
محەمەد جی

چاپی
٢٠٠٦

- ناوی کتێب بەعەرەبی / الاسلام بين الشرق والغرب
- نوسەر / عەلی عیززەت بیگۆڤیچ
- ناوی کتێب بەکوردی / ئیسلام لەنێوان ڕۆژهەڵات و ڕۆژئاوادا
- وەرگێڕانی / محـەمەد چیـا
- پێداچونەوەو بەراوردکردنی لەگەڵ وەرگێڕاوە فارسیەکەدا/ یوسف محەمەد صادق
- نۆبەی چاپ / سێیەم
- چاپی یەکەم / ١٩٩٩
- چاپی سێیەم / ٢٠٠٦
- چاپەمەنی/ سیما
- تیراژ/ ١٠٠٠ دانە
- ژمارەی سپاردن (٢) ی ساڵی ١٩٩٩ وەزارەتی ڕۆشنبیری حکومەتی هەرێمی کوردستانی پێدراوە.

# پێشەکی وەرگێڕاوە کوردیەکە

بۆ یەکەمجار کاتێك کتێبی ((ئیسلام لە نێوان ڕۆژهەڵات و ڕۆژئاوادا))ی ((عەلی عیزەت بیگۆڤیچ))م بینی و دەستم بەخوێندنەوەی کرد ئەوەی زیاتر پەلکێشی دەکردم بۆ چوونە ناوەوەی ئەوە بوو کە ئەم کتێبە لە ڕووی شێوازی بیرکردنەوەو لە ڕووی تەوزیفکردنی کۆمەڵێك چەمکی تەواو نوێوە بۆ ناو فیکرە ئیسلامییەکە، لەلام جیاوازتر بوو لە هەموو ئەو کتێبە ئیسلامیانەی پێشووتر خوێندبوومەوە.

تەنها کتێبێك کە لەم شێوە نزیك ببێتەوە کتێبی (ألأسلام یتحدی - وحیدالدین خان)ە، لەشتێکدا لەم کتێبەی (بیگۆڤیچ) دەچێت، ئەویش ئەوەیە هەردووکیان جیاوازن لەو تەرزەی کە لەفیکری ئیسلامی تەقلیدی و عەرەبیدا پێی دەنوسرێت،ئەمەش لەبەرئەوەی ئەو نوسینانە کە لە بازنەی فیکری ئیسلامیە عەرەبی و تەقلیدیدا دەخرێنەڕوو کەمتر پشت بە وروژاندن و سەلماندنی عەقلی دەبەستن، کەمتر بوار بەعەقڵی مرۆڤ دەدەن بیربکاتەوە، بەڵکو بەبێ بەشداری پێکردنێکی عەقڵی بەرامبەر دێت و کۆمەڵێك گریمانە لە فۆرمێکی ڕەهادا دەسەپێنێت، دواجاریش ئەوەی بەرهەم دێت زیاتر لە کۆمەڵێك ئامۆژگاری و (موعظة) دەچێت، نەك بابەتێك بێت بۆ گومان و توژینەوەو گفتوگۆو پرسیار هەڵگرتن، بەڵام بەجیا لەو گوتارە باوە (بیگۆڤیچ) لەم کتێبەیدا هاتووە بەدرێژی باسی لەو دوو چەمکە کردوە کەئەوانیش چەمکی ((ئایین)) و چەمکی ((ئیسلام))ن، لە تەوتمیەتەوە بۆ دوانگیری ئیسلام و پاشانیش تەسلیمبوون بە ئیسلام، لەو میانەشدا هاتووە کۆمەڵێك ڕەگەز کەهەتا ئێستاش لەو چوارچێوە باوەدا کە ئیسلامی پێ پێناسەکراوە، ئەم ڕەگەزانە وەکو شتانێکی نامۆ لە ئایین سەیر دەکرێن، ئەوانیش: چەمکەکانی ((هونەرو دراماو یاساو زانستی ڕەوشت و ڕۆشنبیری و شارستانیەت و فەلسەفەو عەدەمیەت و وجودیەت ... هتد)، بیگۆڤیچ لەم

کتێبەدا هەوڵی داوە ڕیشەی هەموو ئەمانە لەناو بازنە گەورەکەی ئایندا جێ بکاتەوە یان بیدۆزێتەوە.

نووسەری ئەم کتێبە لەو سۆنگەیەوە کە لەژێر کاریگەری زیاد لە ڕۆشنبیریەکدا بووە، ئەوا ئەو کاریگەریانە بەگشتی ڕەنگی داوەتەوە لەسەر شێوازی ئیشکردنی، ئەو لەناو زەمینەیەکدا بەخێرایی دەتوانێت پانتایەکی فراوان لە هزری خوێنەر داگیر بکات، بەتایبەتی سەرەتای کتێبەکە هەتا ناوەڕاستی بەنسبەتی خوێنەری ئاساییەوە تووشی جۆرێك لە پەرش و بڵاوی فیکری دەبێت و ڕەنگە لە سادەترین گوزارشتدا بەرامبەر بەم حاڵەتە بڵێت : ((ئەمە کتێبێکی ئاڵۆزە))، هەرچەندە بەشێکی ئەمە ڕەنگە بگەڕێتەوە بۆ ئەوەی کە ئەم کتێبە زمانی دایکی (صرب ـ کرواتیە)، بەگوێزانەوەی ئەم زمانەش بۆ کۆمەڵێك زمانیتر ((ئینگلیزی و عەرەبی و فارسی و کوردی)) لەڕووی شێوازی گوزارشت و داڕشتنەوە کاریگەری خۆی بەجێ دەهێڵێت. بۆ وەرگێڕانی ئەم کتێبە من سەرەتا پشتم بە وەرگێڕانە عەرەبیەکە بەستووە، بەڵام لەپاشاندا لەگەڵ وەرگێڕانەکەدا بەراوردم دەکرد لەگەڵ وەرگێرراوە فارسیەکەیدا (ئیسلام بین دوو دیدگاه شرق و غرب) پاشانیش برای بەڕێزم کاك ((یوسف محمد صادق)) م ڕاسپارد کە بە تەواوی بەراوردی هەموویم بۆ بکات لەگەڵ وەرگێڕانە فارسیەکەیدا، بۆ ئەوەی ئەگەر هەر جیاوازیەکی جەوهەری هەبوو لە ماناد‌ا (بە چاوپۆشین لە جیاوازی لە داڕشتندا )، چونکە هەست دەکەم وەرگێڕانە فارسیەکە ئازادانەتر مامەڵەی لەگەڵ شێوازی داڕشتنەوەی دەستەواژەو گوزارشتەکاندا کردووەو لەم ڕووەوە سەرکەوتوو بووە، ئەوا ڕەچاوی بکەینو پاش بەراووردکردنیان لەنێوان هەردوو وەرگێرانە عەرەبیو فارسیەکەدا گونجاوترینیان وەرگرین، بەئەنجامدانی ئەم کارەش وەرگێڕانە کوردیەکە دەوڵەمەندوو سەرکەوتووتلا بوو، چونکە ئێمە دوو دەقمان لە دوو زمانی جیاوازدا لەبەردەستدا بوو، کاك (یوسف) یەکێکە لەو نووسەرانەی توانایەکی باشی بەسەر زمانی فارسیدا دەشکێتو شارەزایە تێیدا . لێرەدا سوپاسی ماندووبوونی دەکەم کە ئەو ئەرکەی لە ئەستۆ گرت.

یەکێکی تر لە خاسیەتەکانی ئەم کتێبە ئەوەیە کە بەشێوەیەك نووسەر ئیشی لەسەر بنچینەی راستەقینەی ماناو سەرچاوە فیکریەکان کردووە کە شایانی تێڕامان و تێبینیەکی قووڵە، چ بەنسبەت ڕۆشنبیرێکی ئیسلامییەوە یان ڕۆشنبیرێکی نائیسلامییەوە، ئەگەر خوێنەر توانای ئەوەی هەبێت تێکڕای کتێبەکە بخوێنێتەوە ئەوا لەکۆتایدا دەگاتە ئەو دەرئەنجامەی کە ئیسلام بە لەخۆگرتنی هەموو ئەو چەمکە جۆراوجۆرانە گەورەو مەزنتر دەردەکەوێت، تا ئەو رادەیەیی ڕەنگە وای کردبێت هەندێك خوێنەری تەقلیدی ئەم حاڵەتە بەجۆرێك لەلادان بزانێت لە بازنەی ئیسلامیە ڕەسمیە بارگاوی کراوەکە، ئەمەیش شتێکی سروشتیە لەکاتێکدا خوێنەرێکی ئیسلامی پێی وایە مەسەلەکانی مۆسیقاو هونەرو شانۆ شتانێکی حەرامن‌و جێگەی باسکردن نین، کەچی بیگۆڤیچ دێت‌و ریشەی ئەمانە لە قوڵایی ئاینیدا دەدۆزێتەوە، هەر ئەم جۆرە ئیش کردنەشە وای کردووە کە نووسەر بە لایەنەکانی ناوخۆیی و دەروونی مرۆڤدا زۆر شۆڕ ببێتەوەو مامەڵەیەکی ووردو هەستیار لەگەڵ ناخە ئاڵۆزو ڕۆحە پەنهانەکەیدا بکات، دواجار ئەم کتێبە ڕادەی قەناعەت‌و تێگەیشتنی کەسێکی موسڵمانی ڕۆژئاوایی (غەیرە عەرەب) دەخاتە ڕوو سەبارەت بە ئایین‌و لەوێشەوە بە ئیسلام.

(بیگۆڤیچ) پێی وایە ئیسلام (ڕێگەی ناوەندە) لەنێوان راست‌و چەپداو، دووانگیری ئیسلامیش کە سەرچاوەیەکی فیتری هەیە لە مرۆڤ و ژیاندا ڕووبەڕووی ئەو جەمسەرگیریە دەبێتەوە کە جیهانی دابەش کردووە لە نێوان دوو ئاستدا، پێی وایە ئیسلام دەتوانێت ئەو دوو جەمسەرە کۆبکاتەوە لەخۆیدا، کە ناوی دەنێت بە (یەکەی دوو جەمسەر)، لێرەوە لە ڕێگەی تەوزیفکردنی(دوانگیری) و کۆکردنەوەی ئەو دوانگیریە لە یەکەیەکدا، ئیسلامی وەکو تێزێك و وەکو چارەسەرێکی گونجاو بۆ هاوسەنگکردنەوەی ژیانی مرۆڤایەتی خستووەتەڕوو، دەتوانین بڵێین ڕەهەندی سەرەکی لەم کتێبەدا ئەوەیە لە ڕێگەی سەلماندنی ئەوەوە کە ژیان هەر بەفیترەت لە کۆمەڵە چەمکێکی دوانگیریدا خۆی دەخاتەڕوو، کەواتە ئیسلامیش دەرەئەنجامێکی

حەتمی ئەو حاڵەتەیەو بە تێپەڕاندنی هەردوو ئەزموونە (تەوراتی) و (ئینجیلی)یەکە، ئیدی ژیان خۆی لەو ڕێگایەدا دەبینێتەوە کە گرتوویەتەبەرو سەریشی لە ئیسلامەوە دەچێت، لێرەشەوە ئیسلام دەبێتە ئاینی هەڵبژاردەی سروشتو ژیان،((بیگۆڤیچ)) پێی وایە ئیسلام ئایینێکە پێشی خۆی کەوتووە، واتە ئیسلامێکی سروشتی هەیە کە لە خودی ڕەگەزەکانی ژیاندایە و ئیسلامێکیش کە لەشێوەی پەیامێکدا (قورئانێکدا) هاتووەو تەنها جەخت لەسەر خۆی دەکاتەوە، واتە ئیسلام دەبێتە سەلمێنەری حەقیقەتێك لە ژیاندا، ئەو حەقیقەتەش هەمان ئیسلامە فیتریەکەیە لە (یەکەیەکی دوو جەمسەر)دا.

لە پەراوێزی ئەم پێشەکیە کورتەدا تەنها دەمەوێت دوو سەرنجی تایبەتی خۆم سەبارەت بە ناوەرۆکی ئەم کتێبە بخەمەڕوو .. پێشم وایە تارادەیەك خاڵی جیاوازی قەناعەتی منە لەگەڵ نووسەردا.

یەکەم : نووسەر پێی وایە ئیسلام (یەکەیەکی دووجەمسەرە) واتە لەگەڵ هەردوو چەمکی (دوانگیری): (ثنائیة) Duolisme و چەمکی تاکگیری: (الواحدیة) Monisme دا دژ دەوەستێتەوە، بەڵام ((پلورالیزم)) Pluraism لەگەڵ ئەو دوو چەمکەو تەنانەت ئەوەیش بیگۆڤیچ بە ((یەکەیەکی دووجەمسەر)) ناوی دەبات دژ دەوەستێتەوە، لەوێوە کەپێی وایە ((هەموو شتێك کە هەیە لەبووندا لەزیاد لەجەوهەرێك پێك دێت)) و ناکرێت بگەڕێنرێتەوە بۆ تاکە بنەمایەك، پلورالیزم پێشنیاری چەمکێکە بۆ ژیان کە لە بری کۆکردنەوەی جەوهەرەکان لەیەکەیەکدا یان (یەکەیەکی دوو جەمسەردا) دێت جەوهەرەکان دابەش دەکاتەوە لەنێوان ڕەگەزەکانی ژیاندا، بەمەیش ڕەتی هەموو جەمسەرگیریەك دەکاتەوە کە ژیان لە فۆرمێکدا یان دوو فۆرمی دژ یان تەبادا کۆ بکاتەوە.

تێبینی دووهەمیش ئەوەیە: نووسەر لەگێڕانەوەی مێژوییەکەی ئایندا لە (تەوتەمیەتەوە) بۆ (ئیسلام)، نەیتوانیوە خۆی لەو گریمانە رزگار بکات کەوا خودی ئاین لەگەڵ ئەزموونەکانی مرۆڤدا پەیدا بووەو پاشان هاتووەو ئەمڕۆ بەفۆرمێك گەیشتووە کە واقیع جەختی لێدەکاتەوە. دەمەوێت ئەوەیش بڵێم کە

ئەم دوو خاڵە تەنها سەرنجی خوێنەرێکە ماوەیەك لەگەڵ ئەم کتێبەدا ژیاوە، دەکرێت هەر خوێنەرێکی تریش پاش خوێندنەوەی ئەویش بۆ خۆی کۆمەڵە سەرنجێکی لا دروست ببێت کە دژ یان تەبابێت لەگەڵ ئەم بۆچوونەدا، لەم بارەیەوە هەموو خوێنەرێك ئازادو سەربەخۆیە لە جۆری تێگەیشتنیدا.

لەکۆتایشدا دەمەوێت زۆر سوپاسی ئەو برا بەرێزانە بکەم کە لە ڕووی ماددی و مەعنەویەوە هاوکاریان کردم بۆ بە چاپگەیاندنی ئەم کتێبە، هەروەها دەمەوێت داوای لێبوردن لە خوێنەرانی بەرێز بکەم لە هەر کەمو کورتیەك کە بەرچاویان بکەوێت، لەو ڕووەوە کە هیچ کارێك بێ کەموکورتی نابێت و بمانبەخشن بەو لاوازییەی کە یەکێکە لەخەسڵەتەکانی هەر مرۆڤێك.

**محمد چیا - سلێمانی**

٢٠٠٢/٣/١٦

# پێشەکی وەرگێڕاوە عەرەبیەکە

کتێبی (ئیسلام لەنێوان ڕۆژهەڵات و ڕۆژئاوادا) کتێبێکی ئاسایی نیە، هەروەها وەرگێڕانیشی بۆ ئینگلیزی و پاشان بۆ عەرەبی لە ڕەوش و بارودۆخێکی ئاسایدا نەکراوە...

(عەلی عیززەت بیگۆڤیچ) نووسەری ئەم کتێبە بیریارێکی ئیسلامیی دانسقەیە، لەناوجەرگەی ڕژێمێکی کۆمەنیستیدا پێگەیشتووە بێ‌ئەوەی خۆی بدۆڕێنێت. بەڵکوو بەسەربەرزی لەسەر ئیسلام ماوەتەوەو تێکۆشەرێکی لێهاتووبووە، نەچەماوەتەوە لەبەردەم هیچ شەپۆلێکی بێ باوەڕیی و ستەمکاردا، چەکی تێکۆشانیشی بریتیە لە بیرو پێنووس و هیممەت و بڕوای دامەزراوی بە پەروەردگار.

(عەلی عیززەت بیگۆڤیچ) لەساڵی ١٩٢٥ز لە خێزانێکی موسڵمانی بۆسنەیی دێرین لە شاری (کروبا) لە کۆماری (بۆسنەو هێرسك) لەدایك بووە کە بەشێك بوو لە یەکێتی یوگوسلاڤیای جاران. لە قوتابخانەکانی شاری (سەراییڤۆ) خوێندوویەتی و پاشان چووەتە زانکۆو چەندەها بڕوانامەی لە بوارەکانی یاساو ئەدەب و زانستدا بەدەست هێناوە. بۆ ماوەی ٢٥ ساڵ ڕاوێژکاری یاسایی بووە، پاشان بەتەواوی خۆی تەرخانکردووە بۆ نووسین و لێکۆڵینەوە، (عەلی عیززەت) لەماوەی ژیانیدا زۆرچالاك بووە لەبوارەکانی کاری ئیسلامیدا چ لەڕێگەی نووسین وە یاخود وتارەکانیەوە بێت. لە ساڵی ١٩٤٩ز لە سەردەمی (جوزیف بروز تیتو) بۆ ماوەی پێنج ساڵ زیندانی کراوە لەگەڵ کارکردنی قورسدا بە تۆمەتی ئەوەی پەیوەندی بە ڕێکخراوی (لاوانی موسڵمان)ە وە بووە، هەرچەندە ئەم ڕێکخراوە کاری سیاسی نەدەکرد تەنها چالاکیەکانی لە بوارەکانی فێرکردنی ئیسلامی و کاری خێرخوازیدا کۆکردبویەوە.

بزوتنەوەی (لاوانی موسڵمان) بزوتنەوەیەکی خێرخوازی مرۆڤایەتی و ئاینییە لە پێش جەنگی جیهانیەوە هەندێ لە زانایانی بۆسنە دایان مەزراند کە لە زانکۆی ئەزهەر لە قاهیرە زانستیان وەرگرتبوو، بوونی ئەم بزاوتە ئیسلامیی لە میصر کاری لێکردبوون، ئەوانیش گوێزایانەوە بۆ لاوانی موسڵمانی بۆسنە. لەپێش جەنگی جیهانیی دووەمەوەو لەکاتی

جەنگیشدا ئەم بزووتنەوەیە ڕۆڵێکی گەورەی ھەبوو لە پەنادانی کۆچەران و یارمەتی ھەژاران و سەرپەرشتی ھەتیواندا، (علی عیززەت)یش یەکێك بوو لە ئەندامە چالاکەکانی.

لەدوای کۆتایی جەنگەوە حیزبی شیوعی بە پێشەوایەتی (تیتۆ) دەسەڵاتی گرتەدەست. پاشان خۆیشی بوو بە یەکەم سەرۆکی ئەو کۆمارە. یەکەم کارێکیش کە (تیتۆ) پێی ھەستا بریتی بوو لە دانانی دادگایی سەربازیی بۆ زانایانی ئیسلام و ئەندامە چالاکەکانی ڕێکخراوە ئیسلامیەکان بەتایبەتی ئەندامەکانی بزوتنەوەی (لاوانی موسڵمان)، ڕێکخراوەکە ھەڵوەشێنرایەوەو ھەموو ئەندامەکانی زیندانی کران و ژمارەیەکیش لە سەرکردەکانی لە سێدارەدران، بەشی (علی عیززەت)یش پێنج ساڵ زیندانیکردن بوو وەکو لەپێشەوە ئاماژەمان بۆ کرد. پاشان کە بارودۆخەکە جێگیربوو بۆ فەرمانڕەوایەتی شیوعی پەلامارەکانی بۆ سەر موسڵمانەکان کەمێك سووك کرد ئەمەیش بووە ھۆی ئەوەی بەخێرایی بزوتنەوە دەست بە چالاکی بکاتەوەو بەڕێنمایی کۆمەڵەی لاوانی موسڵمان کە لە زیندانەکان ئازاد کرا بوون، ئەمەش وای کرد کە جارێکی تر دەستگیر بکرێتەوە لە ساڵی ١٩٨١ز.

(علی عیززەت) ھەستی بەو مەترسیە دەکرد کە ڕووبەڕووی چینی لاوانی موسڵمان بووبوویەوەو ئەترسا کە ناسنامەی ئیسلامەتیان ون بکەن، چونکە بێ بەش بوون لە فێرکردنی ئیسلامیی و تەنانەت لە ماڵەکانیشیاندا وایان لێ ھاتبوو ئابلۆقەیەکی فیکری و دەروونی دەوری تەنی بوون تەنھا سێ ڕێگا لەبەردەمیاندا مابوویەوە ھەڵیبژێرن ئەویش یا ئەو بێباوەڕیەی کە ڕژێم بونیادی ناوەو ڕەونەقی پێ‌دەدات لەقوتابخانەو لە ڕێگەی دەزگاکانی ڕاگەیاندنیەوە، یا کاثولیکی کرواتی، یا ئەرسۆزکسی صربی کە لەڕێگەی کۆمەڵگەکانی ناوچەکەوە پێیان دەگات. ھەردوو کەنیسەکەیش سەربەستیەکی ڕێژەییان ھەبوو لە چالاکیەکانیاندا، ئەڵمانیای ڕۆژئاوا یارمەتی کرواتە کاثولیکەکانی دەداو بەریتانیاش یارمەتی صربەکانی ئەدا کە ھاوپەیمانی بوون و چاویان لێ دەکرد. ڕژێمی (تیتۆ) جیا لەدەوڵەتە شیوعیەکانی‌تر لەئەنجامی چەند مەرجێکەوە کە لەپێشەوە بڕیار درابوون یارمەتیەکانی ڕۆژئاوا بەڕوویدا کرابوونەوە. بەڵام موسڵمانەکان ھەرچەندە بەشێکی گەورەی ناو کۆمارەکانی یەکێتی یوگوسلاڤیا پێك دەھێنن کە ژمارەیان دەگاتە شەش ملیۆن کەس. کەچی ھیچ مافێکی دانپیانراویان نیە وەکو مافی کاثولیکەکان و

ئەرسۆزکسەکان، سروشتی باری ئەو کاتەیش بەشێوەیەك بوو هیچ دەوڵەتێك نەبوو بتوانێت ئەو مافە شەرعیانەیان بۆ دەستەبەر بکات. لەپێناوی ئەمەدا (علی عیزەت) زۆر زوو هەوڵیدا کە چەند ئامرازێك بڕەخسێنێت بۆ ئەوەی لاوی موسڵمان لەئیسلام بەشێوەیەکی هاوچەرخ تێ بگات. بۆ ئەمەش کتێبێکی بچووکی تەرخان کرد بە ناونیشانی (راگەیاندنی ئیسلامیی) کە لەساڵی ١٩٧٠ز بەشێوەی چەند زنجیرەیەك بڵاوی کردەوە، پاشان خۆی تەرخانکرد بۆ لێکۆڵینەوە و نووسینی کتێبەکەی (ئیسلام لەنێوان رۆژهەڵات و رۆژئاوادا) لە کۆتایی حەفتاکان و سەرەتای هەشتاکاندا، مەبەستیشی ئەوەبوو وەکو لە پێشەکیەکەدا ئاماژەی پێ کراوە هەوڵدانە بۆ وەرگێڕانی ئیسلام بۆ سەر زمانێك کە چینی نوێ قسەی پێ دەکات و لێی تێ دەگات) بەڵام مەبەست لە (راگەیاندنی ئیسلامیی) ئەوەیە کە لاوانی موسڵمان لە یوگوسلاڤیادا لە دەوری تێگەیشتنی ئاشکراو سادەو کرداری کۆبکاتەوە، ببێتە رێنیشاندەر بۆ کاری ئیسلامیی، پێشتریش بەد ڕەفتارانی صرب و کرواتەکان پڕوپاگەندەیەکی زۆریان پەرش و بڵاوکردەوەو بەوە پێناسەیان دەکرد کە (مەنفستۆیەکی ئیسلامیە) بانگەشە بۆ جیهاد دەکات بۆ دامەزراندنی دەوڵەتێکی ئیسلامیی لەناو دڵی ئەورووپادا. ئەمەیش بوە هۆی ئەوەی خاوەنەکەی و لەگەڵ یانزە رۆشنبیری موسڵمانی تری هاوەڵیدا ڕەوانەی دادگا بکرێن و سزای چواردە ساڵ زیندانی کردن بدرێت بەسەریاندا بەتاوانی کارکردن دژی رژێمی دەوڵەت و ئاسایشی گەلەکەی. لە ڕاستیدا (علی عیزەت) و هاوەڵەکانی بەدوور بوون لەو تاوانانەو ستەملێکراو بوون، لە (راگەیاننی ئیسلامی)دا شتێکی تێدا نەبوو زیان بە دەوڵەت بگەیەنێت هەتا ئاماژەیەکیشی تێدا نەبوو نە لە دوورەوەو نە لە نزیکەوە بۆ ئەو رژێمە، بەڵام مەبەست لەو دادگایی کردنە سەرکوت کردن و داپڵۆسینی بیری ئیسلامیی و هەڵگرانی بوو، هەر بۆیە (علی عیزەت) و هاوەڵەکانی دادگاییەکی خێراو نیمچە نهێنی کران، کتێبی (راگەیاندنی ئیسلامیی) هەڵەو زیادەڕەوی تێداکراو بوو بەبەڵگەنامەیەك بۆ تاوانبارکردنی (علی عیزەت) و ئیسلام بە شێوەیەکی گشتی. نەك تەنها لەدەزگاکانی راگەیاندنەکانی صرب و کرواتەوە، بەڵکو لەرێگەی دامودەزگاکانی رۆژئاوایشەوە کە خەریکی دروستکردنی ئەو بڕیارانەن پەیوەستن بە نەهامەتیەکانی بۆسنەو وردەوردە پلانەکان جێبەجێ دەکەن بۆ پارچەکردنی دەوڵەتی بۆسنە و کردنی گەلەکەی بەپەناهەندە لە ژێر رژێمی پاراستن کە نەتەوە یەکگرتووەکان

پێی هەڵدەستێ.

یەکێتی یوگوسلاڤیا هەڵوەشایەوە سلۆڤینیاو کرواتیا سەربەخۆییان بەدەست هێنا بەمەش دەوڵەتێکی صربی نەتەوەیی ڕەگەزپەرست بەدەرکەوت کە مەبەستە فراوان خوازیەکانی لەسەر سڕینەوەی ڕەگەزەکانی تر بونیاد دەنێت. هەروەها تێدەکۆشێت بۆ داڕشتن‌و بەرپاکردنی صربیای گەورە.

چەتەو تیرۆریستە صربییەکانی (شتنیك) سەرلەنوێ دەرکەوتنەوە بۆ جێبەجێ کردنی پلانە تاوانکارییە داڕێژراوەکانیان. گەلی بۆسنەو هێرسکیش ئەبوایە لەو ناوەندەدا پەیوەندیان یان بە صربەکانەوە بکردایە یا بە کرواتیەکانەوە، بە وتەی هەندێکیش وەکو دەڵێن: (هەڵبژاردن لەنێوان صربو کروات وەك هەڵبژاردنێك وایە لەنێوان شێرپەنجەی خوێن و شێرپەنجەی مێشکدا لەبەرئەوە (علی عیززەت) و هاوەڵەکانی حزبی کاری دیموکراتیان پێکهێنا. پاشان لە هەڵبژاردنیشدا سەرکەوتنیان بەدەست هێناو بەمەیش (علی عیززەت) بووە سەرۆك کۆماری بۆسنەو هێرسك، گەل سەربەخۆیی هەڵبژارد، دەوڵەتی بۆسنەو هێرسکیش توانی وەك سلۆڤینیاو کرواتیا لە کۆمەڵگای نێودەوڵەتیدا دان بە قەوارەی سەربەخۆییدا بنرێت و ببێتە ئەندام لە نەتەوە یەکگرتووەکاندا. ئەمەش بووە هۆی دووبارە بوونەوەی زنجیرەیەك ناخۆشی و نارەحەتی، لەپێشدا صربەکان و پاشانیش کرواتەکان دەستیان کرد بەلێدانی ئەو دەوڵەتە ساوایەو هەڵگرتنی ئاسایشی لەسەر گەلەکەی بەو چەکمە ترسناکانە کە لەیوگوسلاڤیاوە بۆیان مابوویەوە بەسەپاندنی شەڕێکی وێرانکەر بۆ لەناوبردن و سڕینەوەی بوونی ماددی و مەعنەوی گەلی بۆسنە بە تەواوەتی. ڕێگەی خۆچەکدارکردنیشی لێ گیرا بۆ ئەوەی نەتوانێت بەرگری لەخۆی بکات، ڕۆژئاوایش بە بێدەنگی وەستاوە سەیری ئەو قەسابخانە مێژووییەی موسڵمانان دەکات. ئەو هاوارەیش کە لە لێرەو لەوێ بەرز دەبێتەوە سەبارەت بە جێبەجێ کردنی پرۆسەی ئاشتی و مافی مرۆڤ و یارمەتیە مرۆییەکان بۆ موسڵمانان و هاتنە کایەی ڕژێمی نوێی جیهانی و ئەو کۆمەکیانەی کە فرۆکەکان لە یەك دوو جێگادا بەریان دایەوە بۆ گەلێکی ئابلۆقەدراوی برسی لەماوەی شانزە مانگدا. هەموو ئەمانە تەنها بۆ مەرام و کاری ڕاگەیاندنی خۆیان و هێورکردنەوەی ئەو سۆزە هەڵچووەی خەڵکی بوو، (یان زۆرجار بۆ یاری کردن بوو بەو پەڕۆ سوورەی کە لە گۆڕەپانی زۆرانبازیدا گایەکی پێ چەواشە دەکەن بۆ ئەوەی دووربێت

لە خستنەوەی مەترسی راستەقینە). خوای گەورەیش لە (مالیکی کوڕی نەبی) خۆش بێت خاوەنی ئەم پەندە کە رۆژانە چەنجار لەبەر چاوماندا دووبارە دەبێتەوە لەگەڵ ئەو هەموو چەرمەسەرییە ناخۆشانەی کە بەسەر موسڵمانانندا دێت.

لێرەدا پێویست بوو ئاماژە بۆ ئەم نەهامەتیانە بکەین کە روویداوە لەکاتی وەرگێڕانی ئەم کتێبەی (علی عیززەت)دا لە چاپە ئینگلیزیەکەوە بۆ چاپی عەرەبی، چونکە ئەم کتێبەو خاوەنەکەیشی بەشێکن لەو نەهامەتیانە.

کاتێکیش (علی عیززەت) هەستی بە تەواوبوونی کتێبەکەی کرد (ئیسلام لەنێوان رۆژهەڵات و رۆژئاوادا) لەزیندان دەرچوو وە کو پێشتریش ئاماژەمان بۆ کرد، بەڵام نەیتوانی لەو کاتەدا بە زمانەکەی خۆی کە (صربی-کرواتی)یە بڵاوی بکاتەوە بەڵام بەهۆی هاوڕێیەکیەوە کە ناوی (حەسەن قەرەشی) بوو توانی دەستنووسی کتێبەکە ببات بۆ دەرەوەی یوگوسلاڤیا بۆ (کەنەدا) لەساڵی ١٩٨٣ز لەوێ پاش تەواوکردنی پێشەکیەکەیو وەرگێڕانی بۆ زمانی ئینگلیزی لەساڵی ١٩٨٤ لە وڵاتە یەکگرتووەکان بڵاوی کردەوە. پاشان جارێکی تر لەچاپ درایەوە کە ئەمەی دواییان ئەو چاپەیە کە پشتمان پێ بەستووە لە وەرگێڕانە عەرەبییەکەدا.

(حەسەن قەرەشی) هاوەڵی منداڵی خوێندنگای (علی عیززەت)ە بەیەکەوە لە قوتابخانەکانی (سەراییڤۆ) خوێندوویانە، لە زانکۆی زەغریب لە کۆلیژی ئاداب لەساڵی ١٩٤٩ خوێندنی تەواو کردووە. لەپاشان چووە بۆ کەنەدا، لەوێ پەیوەندی کردووە بەزانکۆی (تورنتو)وەو لە هەندەسەی کیمیاویدا پلەی زانستی بەدەست هێناوە، پاشان لە تاقەکانی (نیاجرا) گیرساوەتەوەو لەوێ بناغەی کارەکانی دامەزراندو خانوویەکی فراوانیشی دروست کرد کە بوو بوو بە جێگەی پێگەیشتنی بیریارە ئیسلامیەکان لەهەموو شوێنێکی جیهانەوە، لەگەڵ هەموو ئێشو ئازارەکانی ئەم دواییەی وڵاتەکەیدا ژیاوە، بانگخوازێکی لێهاتووی ئیسلامیی بوو لە ئەمریکای سەرووودا هەتا نەخۆشی لەماڵدا خستی لەمانگی ئابی ساڵی ١٩٩٣ز کۆچی دوایی کرد.

کتێبی (ئیسلام لەنێوان رۆژهەڵات و رۆژئاوادا) کتێبێکی ئاسان نیە خوێنەر بە ئاسانی لێی تێبگات، یاخود بابەتێکی لێوەرگرێتو لاپەڕەیەك لێرە بخوێنێتەوەو لاپەڕەیەك لەوێ وابزانێت کەوا شتێکی لێی تێگەیشتووە، یادەتوانێت هەڵی سەنگێنێت و دابەشی بکاتەوە

بەسەر شێوازە فیکریە جۆراوجۆرەکانیدا، خوێنەری لێهاتوو پێویستە لەسەری خۆی بۆ ئامادە بکات بۆ چوونە ناوەوەی کتێبێك کە دەوڵەمەندە بە بیروپرۆگرامیکی بەهێزو ڕۆشنبیریەکی قووڵ و فروان. نووسەری ئەم کتێبە شارەزاو بەتوانایە لە هەردوو ڕۆشنبیریە ئیسلامی و ڕۆژئاواییەکەدا موسڵمانێکی دامەزراوەو ڕۆژئاواییشە بە زایندو پێگەیشتن و فێرکردنیەوە، لە فیکری ڕۆژئاوادا قووڵ بوەتەوە، بەڵام لەهەمان کاتدا مەلەوانێکی بەتوانایش بووە، ئەو فیکرەیە نەیتوانیوە لایەنە بەهێزەکانی مرۆڤایەتی تێیدا لاواز بکات، (علی عیززەت) توانیویەتی ئەو ڕاستیانەمان بۆ شیبکاتەوە کە پێشتر پێمان نەزانیوە یاخود نەمان توانیوە لەشوێنی خۆیاندا دایانبنێین لەگەڵ مەبەستەکەیدا کە خۆی لەبارەیەوە دەڵێت: (بۆ ئەوەی جیهان بەراستیو دروستی تێبگات پێویستە بنچینەی ڕاستەقینەی ئەو ماناو سەرچاوە فیکریانە بزانین کە ئەم جیهانە بەڕێوە دەبەن.

نووسەر بیرو تێگەیشتنێکی تازەی هەیە بەشێوازێکی سادەو ساکار واتاو مانا تازەکانی دادڕێژێت. بۆ نموونە کاتێك باس لە (ئایین) دەکات ئەم وشەیە مانای ئیسلام ناگرێتەوە، بەڵکو ماناکەی لەوەدا کورت دەکاتەوە کە ڕۆژئاواییەکان لێی تێگەیشتوون چ لەوانەی شوێنکەوتووی بوونو چ ئەوانەیش لێدەری بوون.

ئەوە ئەو ڕامانو پەیوەندیە دەگرێتەوە کەلەنێوان مرۆڤ و پەروەردگاردا هەیە، پەیوەندی بە دونیاو کاروباری ژیانەوە نیە. لەکاتێکیشدا باس لە ئیسلام دەکات، ئەوا باس لەو چوارچێوە فیکرییە تازەیە دەکات کە خۆی هێناویەتیە کایەوە، ئەویش فیکرەی (یەکەی دووجەمسەری)یە واتە کۆکردنەوەی ئەو دووجەمسەرە جیاخوازو پێکدادەری ناو عەقڵیەتی ڕۆژئاواییە لەیەك ڕەوڕەوەدا، ئەوانیش بریتین لەو ڕۆحو ماددە، زەویو ئاسمان، مرۆڤو گیانلەبەر، ئایینو دونیا. سروشتی ئیسلامیش وایکردووە کە ئەو دوانە جیاوازە لەیەك قەوارەدا کۆیکاتەوە.. ئەمەش ئەوە ناگەیەنێت ئەو دوانەیە بخرێنە یەك، بەڵکو بوونی کارلێکێکو جووت بوونێکە کە ڕەگەزێکی تازەو کاریگەر بەرهەم دەهێنێت. هەروەك چوون لە سروشتدا ڕوودەدات کاتێ گەردیلەکان یەکتر دەگرنو ڕەگەزێکی جیاواز پێك دەهێنن... لەپاشاندا ئەو ڕەگەزە دەبێتە خاوەنی تایبەتمەندیەکی نوێ. بۆ نموونە کارلێکی نێوان گەردیلەکانی ئۆکسجین لەگەڵ گەردیلەکانی هایدرۆجیندا کاتێك یەکدەگرن ئاو پێك دەهێنن کە مرۆڤ و گیانلەبەرو ڕووەك لێی دەخۆنەوەو ئەمەیش سیفەتێکی نویە. ئەگەر نا کەس

بەتەنها ئۆکسجین یاخود هایدرۆجین ناخواتەوە، هەروەها نووسەر ئەوەمان بۆ روون دەکاتەوە کە چۆن گونجانی ئەو دوانەیە گونجانێکی فیترییە لەگەڵ دوالیزمی ژیانو دوالیزمی مرۆڤدا، لەرێگەی شیکردنەوەیەکی وردەوە نووسەر جەخت لەسەر ئەو رووخانە دەکات کە تووشی ئایدۆلۆژیەتە گەورەکان بووە لەجیهانداو هۆکەیشی دەگێڕێتەوە بۆ ئەو تیۆرە یەکلایەنیەی کە جیهانی دابەش کردووە لەنێوان ماددیەتێکی بێباوەڕو کاسۆلیکیەتێکی پڕ لە نهێنیو شاراوەدا، کە هەریەکەیان ئەوی تر رەت دەکاتەوەو ئومێدێکیش ناهێڵنەوە بۆ پێك گەیشتنێك لەنێوانیاندا.

بەڵام نووسەر، لە ئەنجامی ئەو شیکارانەیەوە بۆ فیکری رۆژئاوا، ئەنجامێکی باشی بەدەست هێناوە لە هەوڵدانیدا بۆ ئاوێتەکردنی ئەو دووانە لێك جیاوازە، بۆ نموونە دابو نەریتی فیکری ئینگلیز بەشێوەیەکی تایبەتیو جیهانی ئەنگلۆسکسونیەوە بەشێوەیەکی گشتی ئەوەی دۆزیوەتەوە کە خۆی ناوی ناوە (رێگای سێیەم) بەدەر لە ئیسلام) کە لە کۆتایی ئەم کتێبەدا بەشێکی تایبەتی بۆ تەرخان کردووە، نووسەر وای دەبینێتەوە کە ئەمە هەوڵێکە بۆ چوون بەرەو ئەو رووگەیەی کە ناوی ناوە (ئیسلامی فیگری) ئەگەرچی بەبێمەبەستو بێئاگایشەوە بێت. بەڵکو ئەو ئاماژە بۆ ئەو بەڵگەو راستیە مێژووییە گرنگانەیش دەکاتو لە فیکری ئینگلیزی دەکۆڵێتەوەو لە (رۆجر بیکون)وە دەیگەڕێنێتەوە بۆ سەر بنچینەکانی ئیسلام، کەواتە رێنمایی عەقڵی ئینگلیزی بۆ (رێگای ناوەند) بەرێکەوت نەبووە.

بەرنامەو پرۆگرامی (علی عیززەت)و شیکردنەوەکانی بۆ چەمکەکانی تر لەبەشی یەکەمی کتێبەکەیدا زۆرەو لە رادەیەکدایە زۆربەی ئەو راستیانە خوێنەر بۆ یەکەم جارە پێی بگات، بەڵکو لەدەرگای ئەو بابەتانەیشی داوە کە رەنگە خوێنەر حەزی کردبێت باسی لێوە بکرێت ئەویش مەسەلەی (ئایین)ە.

بەڵام (علی عیززەت) بەنیگا تیژەکانی رەگەزە ئایینیەکان لەو بابەتانەدا دەدۆزێتەوە وەکو: هونەرو دراماو یاساو زانستی رەوشت و هەتا فەلسەفەکانی وجودی و عەدەمیەت.

نووسەر سەرنجی خوێنەر بۆ ئەوە رادەکێشێت کە ئەم دوژمنایەتیەی ئێستای رۆژئاوا بەرامبەر بە ئیسلام تەنها لە درێژکراوەی ئەو دوژمنایەتیە کۆنەوە دووبارە بووە. وە پێکدادانە شارستانیەتە چەکداریەوە نەهاتووە لەنێوان ئیسلامو رۆژئاوادا کە

لەسەردەمەکانی هێرشەکانی خاچپەرستەکانەوە رووی‌داوە. بەڵکو دەیگەڕێنێتەوە بۆ ئەو ئەزموونە مێژووییە تایبەتیەی لەگەڵ ئایینداو تێنەگەیشتنی لە ئیسلام لەبەر دوو هۆکاری بنەڕەتی، ئەوانیش بریتین لە سروشتی (عەقڵ)ی ئەورووپی‌و یەك روانگەیەی لە لێکدانەوەیدا لەگەڵ کەم توانایی زمانە ئەورووپاییەکان لە لەخۆگرتنی زاراوە ئیسلامیەکاندا بۆ نموونە ئەم زاراوانە. نوێژو دەست نوێژو زەکاتو خەلافەت و (ئوممەت). ئەمانە لە زمانە ئەورووپیەکاندا مانایەك نیە لە بەرامبەرەکەیاندا. هەروەها زاراوە ئیسلامیەکان، وەکو (ئیسلام) کە پێك دێت لە (یەکەیەکی دوو جەمسەر) وای کردووە کە (عەقڵ)ی ئەورووپی نەتوانێت لێی تێ بگات، لە دوایشدا لە ئیسلام تێ‌ناگات.

لەبەرئەوە مادییە رۆژئاوایەکان دژایەتی ئیسلامیان بەوە دەکرد کە ئایینی غەیبیاتە واتە (راستڕەوە)، لەکاتێکدا مەسیحیە رۆژئاواییەکان وای دەبیننەوە کە ئیسلام بزووتنەوەیەکی کۆمەڵایەتی سیاسیە واتە (چەپڕەوە) بەو شێوەیە رۆژئاواییەکان دژایەتی ئیسلامیان دەکرد، لەبەرئەوە نوسەر وادەبینێتەوە بۆ ئەوەی رۆژئاوا لە ئیسلام تێ بگات پێویستە چاوێك بەو زاراوانەدا بخشێنێتەوە کە پەیوەندی بە ئیسلامەوە هەیە.

لەکاتێکدا نووسەر باس لە یەهودیەت و مەسیحیەت دەکات بەو شێوەیە باسی دەکات کە لەکتێب و سەرچاوەکاندا رەنگیداوەتەوەو پێشەوایانی ئەو دوو ئایینە خۆیان پشتیان پێ بەستووە، لەکاتێکدا کە باسی عیساو موسا دەکات (دروودی خوایان لەسەر بێت) بەو شێوەیە باسی کەسایەتیان دەکات کە شوێن کەوتووەکانی عیساو موسا وێنەیان کێشاوە، سەربەنیش لەوەدا ئەوەیە کە ئەوان بەو وێنەیە کاریگەری مێژووییان هەبووە لە جیهاندا. بە چاوپۆشین لەو راستیانەی لە قورئانی پیرۆزدا هەن لەو بارەیەوە کە نووسەر لێیان بەئاگایە، لەبەرئەوە ئەگەر مادیەتی گێڕایەوە بۆ یەهودیەت وە یا بۆ مووسا (درودی خوای لەسەر بێت) ئەوە ناگەیەنێت ئەمە باوەڕی ئەوبێت بەرامبەر بەو پێغەمبەرە گەورەیە ئەوەندەی کە باوەڕی جوولەکە خۆیانە لە وتەو بەرهەمەکانیاندا– لەوانەیە ئەم دان پیانانەی (دود ورپ کارلسن) کە بیرمەندێکی ئەورووپایی بێ‌لایەنەو سەر بە ئایین‌و تیرەی نووسەریش نیە راستگۆتر شك نەبەم کە لەبارەی کتێبی (ئیسلام لەنێوان رۆژهەڵاتو رۆژئاوادا) دەڵێت:(شیکردنەوەکانی بۆ ڕەوشەکانی مرۆڤایەتی و بەتوانایی لەشیکردنەوەکانیدا هەست و (شعور)ێکی گەورەمان پێ دەبەخشێت لە بەرامبەر ئیسلام و

جیهانگیریەکەیدا).

(علی عیززەت) کۆتایی کتێبەکەی بەوە دێنێت بە باسکردنی هەڵوێست و ئەو بارە دەروونیەی خۆی لەبەرامبەر ئەو ناخۆشی و نەهامەتیانەی هاتووەتە ڕێی خۆی و گەلەکەی و ڕووبەڕووی گەورەترین قەسابخانە بوونەتەوە لەمێژووی تازەدا، هەموو جیهانیش بە گاورو موسڵمانیەوە، بەتواناو بێ توانایەوە لێیان گەڕاون و بێدەنگن. ئای چەندە پێویستمان بەوە هەیە لەم دەستەواژەیەی خوارەوە رابمێنن کە لەکۆتایی ئەم کتێبەدا هاتووە (ئیسلام ناوی خۆی لەو یاساو دەستوورو شتە یاساغ کراوەکانیەوە وەرنەگرتووەو، هەروەها لەو هەوڵ و تەقەلا دەروونی و جەستەییانەی مرۆڤیشەوە کە لێی داواکراوە، بەڵکو لەشتێکەوەیە کە ئەمانە هەموو دەگرێتەوەو ناویان لێ دەنێت، لە ئان و ساتێکدا پزیشکێکی هوشیارکەرەوەو بەهێز لە دەروونەوە دەردەچێت بۆ بەرەنگاربوونەوەی نەهامەتیەکان و لە خۆئامادەکردن بۆ هەر کارەساتێك کە دێتە کایەوە، لە حەقیقەتی خۆسپاردن بە پەروەردگار.. ئەوەیە خۆ سپاردنە بە پەروەردگار... ئەوەیە بریتیە لە ئیسلام.

محمد عدس

لەندەن

سەرەتای سێپتێمبەری ١٩٩٣

# ( پێشەکی ) چاپە ئینگلیزیەکە
# لەلایەن ( حسن قەرەشی ) یەوە

کتێبی (ئیسلام لەنێوان رۆژهەڵات و رۆژئاوادا) ئەنجامی لێکۆڵینەوەیەکی فراوانو هەمەلایەنەی دەرکەوتووترین فیکرە جیهانیەکانە لەمێژووی مرۆڤایەتی هاوچەرخدا. دیاردەی بیرچوونەوەی خود لە مێژووی تازەی جیهانی ئیسلامیدا، هەردوو بیریاری رۆژهەڵاتی و رۆژئاوایی وەکو یەك دەخاتە بەردەم هەڵوێستێکەوە لەم کتێبەدا.

لەئەنجامی لێکۆڵینەوەو بەراورد بۆئەو پێشەکیە بنەڕەتیانەو بەرهەمە کەڵەکە بووانە لەبوارەکانی کۆمەڵایەتی و یاسایی و سیاسی و ڕۆشنبیری دەروونیدا، هەروەها لە بواری هەردوو ئایدۆلۆژیەتەکەدا کە بەدرێژایی چاخەکانی ئەم دواییە چارەنووسی ڕەگەزی مرۆڤایەتیان دیاری کردووە.

لەئەنجامی ئەو لێکۆڵینەوانەدا نووسەر ئەو دیمەنە ناخۆشانەمان نیشان دەدات کە لە برەودان بۆ بە گاورکردن و بێباوەڕ کردن لەم جیهانەدا، مەسیحیەت وەکو نموونەی دیاردەیەکی ئایینی شارستانی، واتە ئایینێك کە بەمانا رۆژئاواییەکەی دابڕاو لە یاسای (وحی) و فکرەیەکی گشتگیرە بۆ داهێنان و شارستانیەت و هونەرو رەوشت، بەم تایبەتمەندیەوە مەسیحیەت ئەو مەزهەبەیە کە خولیای بە ڕۆحانیکردنی مێژووە.

بەڵام بێباوەڕیی کە پشت بە ماددی و ـ سۆشیالیستیەت دەبەستێت لە ڕوانگە کرداری و مێژووییەکەیەوە ئەم بێباوەڕیەیە کە هۆکاری هاوبەشی رەگەزەکانی پەرەسەندن و شارستانیەت و سیاسەت و (تۆباوی)[1] یەتە، گرنگی دەدات بە سروشتی ماددی و مێژوویی مرۆڤ.

---

[1] /تۆبیا: ئەسڵی زاراوەکە لە (Uotopia) یۆتۆپیاوە هاتووە، کە لەمێژووی فەلسەفەی ئیسلامیدا زاراوەی تۆپیا وەکو فارابی باسی دەکات واتە (المدینه المفچله) (شاری خەیاڵ) بەڵام لەئەنجامی وەرگێڕانیەوە بۆ عەرەبی یۆتۆپیاکە کراوە بە تۆپیا لەبەر دوو هۆ، یەکەمیان: لەبەرئەوەی لە (معجم الفلسفی)یدا وا هاتووە لە (قاهیرە ـ ١٩٨٢) دەرچووە، دووهەمیش: وشەی (فاضلة) کە پێوەیەتی مانایەکی (میثالی) دەبەخشێتە واتاکە کەلەگەڵ تێگەیشتنە ئیسلامیەکەدا نایەتەوە هەرچەندە (میثالیەت) لە رۆشنبیری ئێمەدا شتێکی جوانە، بەڵام لە عەقڵیەتی رۆژئاواییدا پەیوەندی بەو شتانەوەهەیە کە وەکو (مەحاڵ)ێك سەیردەکرێن،(وەرگێڕی عەرەبی).

مرۆڤ خۆی لە ساتێکی مێژوویدا دۆزییەوە کە دابەش بووە دابەش بوونێك بۆ (ڕۆح) لە ڕوانگەی مەسیحیەتەوە، بۆ بیٚ باوەڕی لە ڕوانگەی ئەنجامدانی کردارییەوە، فیکری ئیسلامیش ئەوەی سەلماندووە، کە ئەو دوو ئاڕاستەیە لەپێکهاتەیەکدا کۆدەکاتەوەو تاکە نموونەیەکە ئەکرێت بەرز بکرێتەوە بۆ ئاستی هەڵوێست، لە پێناوی ئەمەشدا ئیسلام دادەنرێت بە پێویستیەك زیاتر لەوەی مەسەلەیەکی هەڵبژاردنی بێت.

نووسەر لەجیهانی ئەنگلوساکسونیدا ئەوەمان بۆ ڕوون دەکاتەوە هەندیٚ لەو ڕەگەزانەی کە هاوێنەی فێرکردنە ئیسلامیە ڕەسەنەکانن، ئەمەیش نیشانەی وەرگەڕانێکی سۆزداری نیە بۆ جیهان، بەڵکو حەقیقەتێکی جەختلێکراوە بۆ لۆژیکێکی ناوخۆیی و پێویستە لەسەر جیهان کە ڕۆبچێت لە تێگەیشتنیدا.

نووسەر لە ڕێگەی گەڕاندنەوەی فیکرە ئیسلامیەکەوە بۆ ڕەسەنەکەی وەکو فیکرێکی دوالیزمی گرنگ، ئەو لاوازییە لادەبات کە ڕووکەشی ئەو هۆشانەی کردووە لە هەردوو سەرچاوەی ماددی و ئاینیەکەوە، وەئەوە دەخاتەڕوو کە چۆن ئەو عەقڵانە واڕاهاتوون کە بە یەکلایەنی بڕواننە شتەکان و نەتوانن ئەو گۆڕانکارییانە ببینن کە لە ئەمڕۆی گۆڕەپانی فیکردا ڕوو دەدەن.

هەرچۆنێك بێت (جۆشی ئیسلامیی) حەقیقەتێکی مێژووییە، (خۆسپاردنیش بە پەروەردگار) کە هاوواتایی زاراوەکەیە واتە (ئیسلام) تاکە ڕێبازە کە سەرپەرشتی قەدەری مرۆڤ دەکات، ئەو قەدەرەی کە ڕەنگدانەوەی قەدەری گەردوونییە).

# پێشەکی دکتۆر س. بالیتشی

نووسەری ئەم کتێبە (علی عیززەت بیگۆڤیچ) پارێزەر لە سەرایڤۆ، یوگوسلاڤیا، لەو سەقالبانەی باشوورەوە هاتووە کە لە پێش پێنج سەد ساڵەوە ئیسلامیان پێگەیشتووە. لەبەر ئەوە سەیر نیە کە بەعەقڵیەتێکی ئیسلامیەوە بۆی بڕوانرێت، هەرچۆنێك بێت، ئەو ڕێگە تایبەتیەکەی خۆی بەشێوەیەك کێشا کە شایەنی سەرسوڕمانە.

(علی عیززەت) لەدڵیدا هەمیشە ئاواتی ئەوەبووکە شێوازێك بۆ ئاڕاستەکردنی توێژی نوێ لە لاوانی موسڵمان پێشکەش بکات.

پاش ئەوە (علی عیززەت بیگۆڤیچ) پاش ئەوەی بەمێژووی ئیسلام ئاشنا بوو لە بۆسنەدا. لە ساڵی ١٩٨٣ دا لە دادگای سەرابیڤۆ لەگەڵ یانزە کەسی تردا لە ڕۆشنبیرانی بۆسنە (کە شاعیرێکی ئافرەتیشیان تێدابوو) سزای چواردە ساڵ زیندانی درا بەسەریاندا بە تاوانی (لادان بەرەو ئوصولیەت).

ئەوەیش ڕوون و ئاشکرا بوو لەلای کاربەدەستە شیوعیەکانی یوگوسلاڤیا کە فەلسەفەی ئەم نووسەرە مەترسیەکی گەورەیە لەسەر ڕژێمەکەیان، لەو سەردەمەدا من وەکو موسڵمانێکی بۆسنی کە ماوەیەکی درێژ هەوڵم داوە بۆ پارێزگاری لە بیروباوەڕی ئیسلام لە ژێر بارودۆخێکی ناڕەحەت و لە کۆمەڵگایەکی عەلمانیدا زۆر پێخۆشحاڵم بەم هەلە گەورەیە هەتاوەکو برەو بەو فیکرە ئیسلامیە قووڵە بدەم لەناو هۆش و دڵی موسڵمانانی بۆسنەدا.

نە (عەلی عیززەت بیگۆڤیچ) و نە هیچ هاوەڵێکی تریشی کە لە دادگای سەرابییڤۆ تاوانبار کران لە ساڵی ١٩٨٣ هیچ ئامانج و مەبەستێکی سیاسیان نەبوو. نەدەکرا هیچ یەکێکیان تاوانبار بکرێن بەبیانووی خراپە کردن بەرامبەر بە دەوڵەت و گەل، وە دادگا لەو بڕیارەیدا زوڵمی لێکردن.

بۆ ڕوونکردنەوەی هەندێ کێشەی سەرەکی و لێکۆڵینەوە لە ناوەڕۆکی ئەم کتێبە لێرەدا ڕاوبۆچوونی کۆمەڵێك لە موسڵمانی ڕۆشنبیرتان بۆ دەخەینەڕوو لە بڵاوکراوەیەکدا کە لە (ڤیینا) دەردەچێت بەناونیشانی (ئیسلام و ڕۆژئاوا) پێویستە لێرەدا تێبینی ئەوە بکەین کە ئەو بڵاوکراوەیە - لەڕاستیدا - تاکە ئۆرگانێکی موسڵمانەکانی بۆسنەیە لە جیهانی سەربەستدا، کە بەچەند زمانێکی جۆراوجۆر دەردەچێت لەوانە بە ئەڵمانی و بۆسنەیی و

صربیۆ ـ کرواتی.

لێرەدا ئەو ڕاوبۆچوونانەتان بۆ دەخەینەڕوو بەبێ هیچ ڕێکخستن ودەستکاریەك:

دەرکەوتن بانگەشەی (گەڕانەوە بۆ ئوصولیەت) کە ئەمڕۆ جیهانی ئیسلامی جوڵاندووەو قاڵی کردووە، ئەتوانین بیگێڕینەوە بۆ بەربەرەکانی ئەوان بەرامبەر بە ئێمە، ئەگەر بە وردی کلتورو شارستانیەتی ئیسلام بپشکنینو جیای بکەینەوە لەو کەڵەکەبوونەی بە درێژایی چاخەکان کۆبووەتەوەو دوری بخەینەوە لەو پروپاگەندانەی گوایە ئیسلام ڕێگرە لەبەردەم پێشکەوتندا، ئەگەر ئەمەمان بەشێوەیەکی کرداری و سەربەخۆ ئەنجامدا. ئەو کاتە بۆمان دەردەکەوێت کە ئەو (گەڕانەوەیە) بوار بۆ نەزانی و دواکەوتن خۆش ناکات، بەڵکو بەپێچەوانەی ئەوەوە، دەتوانێت بمانگەیەنێتە تێگەیشتنێکی پاکو بێگەرد سەبارەت بە ئیسلام، ئیسلام ئەوە ناگەیەنێت بە واتای (تەسلیم) بوون بۆ تاریکاییەکانی مێژوو، بەڵکو مەبەست لەوە واتە بەردەوامی لە ڕێکخستن و ژیاندا لە هەموو جێگایەکدا کە بگونجێت لەگەڵ پێویستیەکانی سەردەمدا، لەگەڵ (تەسلیم) بوونی تەواو بۆ پەروەردگار. ئەمەیش بانگمان دەکات بۆ زیاتر دڵنیابوون لەو ڕەهەندە گەردونیانەی ئیسلام کە یەهودیەت و مەسیحیەت دادەنێت بە دوو ئەڵقەی سەرەتایی و نۆبەرە لە زنجیرەی مێژوودا.

*ئەو مەیلە سروشتییەی گەلانی ڕۆژهەڵات و پابەندبوونیان بەو شێوازە فکریە بۆماوانەوە (ئەمە تاوانبارکردنێکی قورئانی پیرۆز خۆیەتی بۆ عەرەب) ئەوە ڕێگرێکە لەبەردەم تێگەیشتنی ئیسلامی هاوچەرخدا کە لەسەر مەعریفەتێکی زانستی بونیادنراوە،* ئەوە ڕەگەزێکی گرنگەو پێویستە بۆ موسڵمانان لە پەرستشیاندا بۆ پەروەردگار، گۆڕانکاریەکیش هەیە کە پێویستە لە زووەوە ڕووی بدایە ئەویش ئەوەیە:

ئەگەر ئێمە واز لەو شوێن کەوتنە کوێرانەیەی ئەو دەسەڵاتە فیکرییانە بهێنین، ئەوا دەتوانین ئاسۆی تازە بکەینەوە.

هەتا لە ئەورووپای عەلمانیشدا ئیسلام ڕێی بە خۆی نەداوە کە وا بڕوانێتە پەروەردگار کە (خوای مێژووە) لە تێڕوانینی ئیسلامەوە (نەك هەر لە دیدی مێژووەوە بەڵکو هەر لەپێش مێژوو لە پاش مێژوویشەوە ئەو بیرە سنووردارەی مرۆڤ بەرامبەر پەروەردگار بۆتە هۆی ڕۆچوونو وردبوونەوەی مرۆڤ بەدەوری خۆیداو، ئەمەش دەبێتە هۆی پەیدابوونی

بیرۆکەیەکی هەڵە بەرامبەر بەرەگەزی مرۆڤایەتی خۆی. لە ئەنجامی ئەوەشدا، مرۆڤ دوور دەکەوێتەوە دوورکەوتنەوەیەکی ترسناک لەو دەستوورەی کە پەروەردگار بۆ بەندەکانی داناوە.

ئیسلام شێوازی سەرکەوتوو بە شوێنکەوتوانی دەبەخشێت بۆ بەرەنگاربوونەوەی ژیان لە کۆمەڵگای عەلمانیدا، لێرەدا باس لە چەند نموونەیەک دەکەین: (خاڵی بوونی لە نهێنیە پیرۆزەکان و ڕژێمی کاهینگەریەتی و لە ئاوەڵکێشان)، هەروەها سروشتی شارستانیانەی ژن و مێردیی لە ئیسلامداو، دەروازەی (فطری) پەیوەندی (جنس)ی لەنێوان پیاو و ئافرەتداو، لابردنی بیرۆکەی ڕێگرتن لە چوونە کەنیسەو،[2] هەڵوێستی باشی لەمەڕ زانیاری و لێکۆڵینەوەو زانست و، ڕێپێدانی ڕێژەیی بەرامبەر بە هاوسەرگیریی تێکەڵاوو ئامادەگیی بۆ گفتوگۆو گونجانی لەگەڵ بیروباوەڕ یەکتاپەرستیەکاندا.

ئەو پێشکەوتنە کە بونیادنەنراوە لەسەر بناغەو چوارچێوەیەکی بەهادار، دەبێتە هۆی ئەوەی کەسێتی تووشی دابەش بوونو ون بوون ببێت، شوێنەواری ئەم جۆرە ناودەبرێت بە (ڕۆحی سەردەم) بۆ نموونە لەو (حاڵەتە)ی جولەکەدا بەدەردەکەوێت. لەبەرئەوە مارتن بوبر (Martin Bober) جولەکە لەوە ئاگادار دەکاتەوەو دەڵێت: (ئەگەر ئێوە وەکو گەلانی ترتان لێهات، ئیتر شایانی ئەوە نین کە هەبن).

ئەگەر ئێمە ئەو ئیرادە ئیسلامیەمان وەرگرت کە ناتوانرێت نکولی لێ بکرێت دەربارەی چاکردنی باری جیهان ئەوا بۆمان دەردەکەوێت کە تۆمەتی (ناچارکردن)[3] و سەپاندنی بەسەر ئیسلامدا هەڵەیەکی ئاشکرایە، ئێمە ئەو تۆماتانە دەگێڕینەوە بۆ ئەو شێوەیەی کە زانستی دەروونناسی مۆدێرنەوە سەرچاوەی گرتووەو بونیادنراوە لەسەر تەنگ کردنەوەیەکی مرێنەرانە بۆ هەموو ڕەهەندە مرۆڤایەتیەکان وە بۆ کاریگەریەکانی ژینگە.

ئەم تەنگکردنەوەیە ناپرسێت لەمانای ژیان، هەروەها پاڵ بە مرۆڤەوە نانێت بۆ گەشەکردنی ئیرادەی بۆ ئەوەی مانایەک بە ژیان ببەخشێت. بەڵکو دەڵێت بە مرۆڤ کە تۆ قوربانی ئەو بارودۆخەیت.

---

[2] / بریتیە لەو دەسەڵاتەی کە (قەشە) هەیەتی ئەگەر بیەوێت کەسێك لە کەنیسە دەربکات.

[3] / (الجبرية) زۆرلێکردن یا ناچارکردن: کۆمەڵێکن بەناوی ئیسلامەوە دەڵێن گوایە مرۆڤ دەسەڵاتی ئەوەی نیە کەکارێك بکات یان ڕەتی بکاتەوەو نەیکات بە ئیرادەی خۆی بەڵکو ناچارە بەکردنی یەکێکیان.(وەرگێڕ. ك)

ناودارێکی ئەکادیمی لەم بارەیەوە دەڵێت: (ئەمە خۆراکی دەمارگیری کۆمەڵە چونکە (ناچارگەرایی) بەشێکە لە دیاردەکانی نەخۆشی (دەمارگیریی) کۆمەڵایەتی.
ئاشکرایشە کە بەرزی ئەو ژیانە رۆحیەی موحەممەد (دروودی خوای لەسەر بێت) تا ئەوپەڕی، کە لەو بڵندبوونەوە رۆحیەیدا بۆ ناو ئاسمانەکان دەردەکەوێت کە قورئانی پیرۆز لە ژێر ناوی (میعراج)دا باسی کردووە، ئەم نموونە بەرزەی رۆحیەتی موحەممەد (دروودی خوای لەسەر بێت) ئاماژە بۆ ئەو ئاراستە دەکات کە پێویستە ژیانی موسڵمان تێیدا جووڵە بکات، ئاشکرایشە ڕەوتی ئەو جووڵە کردنەیش بەرەو سەرەوەو ئەو دینداریەی کە هەست بەو بەرز بوونەوە ڕۆحیە بکەیت و، نایەتە دی بەملکەچ بوونی تەواو نەبێت بۆ پەروەردگار، ئەوە بەرزبوونەوەیەکی ئاگایی و زۆر بەهێزە چونکە پابەند نییە بەلاسایی کردنەوەی شێوەی باوەوە.

فەلسەفەی ئیسلامیی رووناکی بەخش بوو هەتا کۆتایی سەدەی سیانزەیەمی زاینی، پاشان لە چەند ماوەیەکی پچرپچڕیشدا گەشاوەتەوەو، ئەو فیکرەیەی جێگیرکرد کە زانست و (وحی) وەکو پێویستیەك لەگەڵ یەکدا رێککەوتوون، هەردوو زانایش ئیبن روشد و فارابی کە لەساڵی (١١٩٨ی زایینی کۆچی کردووە) ئەم فیکرەیەیان بەوپەڕی بەهێزیەوە وەرگرتووە. هەروەها مێژووی شارستانیەتی ئیسلام ئەوەی بەشێوەیەکی تەواو سەلماندووە کە ئایین و زانست توانایان هەیە پێکەوە بگونجێن.

نووسەری ئەم کتێبە ـ کە کتێبی (راگەیەنراوی ئیسلامیی) پشی داناوە کە لەو کاتەدا راگەیاندنی جیهانی هەژاندو یەکێك بوو لە هۆکانی دادگایی کردنیشی لە (سەرایيڤۆ) هەوڵ دەدات لەسەر بناغەی ئەو میراتە رۆحیە خۆی بونیاد بنێت کە شوێنی سەرمایەداریە و ماتەریالیزمی دیالەکتیکی پێکەوە بگرێتەوە، ئەمەیش شتێکی تازە نیە لەجیهانی ئیسلامیدا، بەڵکو (عەلی عیززەت بیگۆڤیچ) تەنها دەروازەیەکی تازەی بەسەردا کردوەتەوە.

شێوازی چارەسەرکردن و ئەو بەرنامەیەی کە گرتوویەتەبەر بۆ چارەسەری گیروگرفتەکانی، موڵکی شەرعی و تایبەتی نووسەرن، لەم دوو رێگایەوە: بەرنامەو شێوازی چارەسەرکردن، فەلسەفەیەکی تایبەتیان بۆ نووسەر پێکهێناوە کە لەم کتێبەیدا بە ڕوونی دەردەکەوێت.

دەمەوێت لێرەدا ئاماژە بەوەیش بکەم کە گرتنو زیندانیکردنی نووسەر لەو کاتە

چاوەڕوان نەکراوەداوای لێکردووە کە نەتوانێت هەندێ لایەنی زانستی وەك بیبلۆگرافیاو ئەو سەرچاوانەی کە پشتی پێبەستوون تەواوی بکات، ئەو سەرچاوانەیشی دیاری کردوون ناونیشانەکانیان تەواو نیە، ئەوەیش روون نیە کە ئایا نووسەر لە سەرچاوەی ئەو کتێبانە خۆیان سوودی وەرگرتووە یاخود لە دەقە وەرگێڕاوەکەیان، لەم جۆرە حاڵەتانەدا بەم پیتانە (npd) ئاماژەی پێ دەکەین، واتە (بەبێ مێژووی بلاوکردنەوە).

دەخوازین کە ئەمە بخرێتە بری ئەو بارودۆخە (شاز)ەی کە کتێبەکەی تێدا بلاوکراوەتەوە، هیوادارین خوێنەریش لەو کەم و کووڕییانە خۆش ببێت کە لە بایەخ و گرنگیی ئەم کتێبە کەم ناکەنەوە.

# دەربارەی ناوەڕۆکی کتێبەکە لەلایەن نووسەرەوە

جیهانی نوێ، بەپێکدادانێکی ئایدۆلۆژیدا تێدەپەڕێت کە هەمووانی گرتوەتەوە ئیتر چ وەکو بەشداری کردن لەو پێکدادانەدا بێت یاخود وەکو قوربانیەکانی، ئایا هەلوێستی ئیسلام چیە لە بەرامبەر ئەم پێکدادانە ترسناکەدا؟ ئایا ئیسلام دەتوانێت ڕۆڵ لە بونیادنانی جیهانی ئێستادا ببینێت ؟ ئەم کتێبە هەوڵ دەدات کە بەشێك لەو پرسیارانە وەلام بداتەوە.

سێ تێڕوانینی تەسەل هەیە بەرامبەر بەجیهان کە بریتین لە: تێڕوانینی ئایین و تێڕوانیتی ماتریالیزمی و تێڕوانیتی ئیسلامیی[4]، ئەم سێ تێڕوانینە سێ (امكانية مبدئي) تێیاندا رەنگ دەداتەوە، کە ئەمانەن (ویژدان، سروشت، مرۆڤ) هەریەکە لەمانەیش بە شێوەیەکی بەدوایەکدا خۆیان لە مەسیحیەت و ماددیەت و ئیسلامدا دەبیننەوە.

دەکرێت هەموو ئایدۆلۆژیەت و فەلسەفەو بیروباوەڕێکیش هەر لەچاخە کۆنەکانەوە هەتا ئەمڕۆ، لەشیکردنەوەی کۆتاییدا بیگێڕێتەوە بۆ یەکێك لەم سێ تێڕوانینە جیهانیە بنەڕەتیانە.

یەکەمیان خاڵی سەرەتایی لەبوونی رۆحەوە وەردەگرێت، دووەمیان لە بوونی ماددییەوە، سێیەمیان لەو بوونە هاوبەشەی نێوان رۆح و مادده پێکەوە، ئەگەر تەنها مادده بوونی هەبوایە، ئەو کاتە ئەو فەلسەفەیەی کە لەسەری پێك دەهات بریتی دەبوو لە فەلسەفەی ماتریالی، بەپێچەوانەی ئەوەیشەوە ئەگەر رۆح هەبێت، کەواتە ئەوە دەلالەتە لەسەر بوونی مرۆڤیش[5].

---

[4] / زاراوەی (ئایین) لەم کتێبەدا ئاماژە بۆ مانایەکی دیاریکراو دەکات کە ئەویش ئەو مانایەیە کە ئەورووپا لە (ئایینەکەی) ناوەو بەم شێوەیە لێی تێدەگەن: ئایین بریتیە لە ئەزموونێکی تاکەکەسی و تایبەتی لەنێوان مرۆڤ و پەروەردگاردا، پەیوەندییەکە تەنها لەڕێگەی بیروباوەڕو ئەو دروشمانەوە کە تاکەکەسی ئەنجامی دەدات گوزارشت لە خۆی دەکات. لەبەرئەوە ناکرێت ئیسلام ناوببرێت وەکو (ئایین) چونکە ئیسلام زیاتروفراوانترە لە (ئایین) چونکە ئەو هەموو ژیان دەگرێتەوە.

[5] / لێرەدا نووسەر مەبەستیەتی کە بەهۆی بوونە رۆحیەکەوە ئەو تایبەتمەندیە بۆ مرۆڤ بگێڕێتەوە کە وەکو (کائن) ێکی جیاواز هەیەتی. (وەرگێڕ. ك)

ژیانی مرۆڤ بێمانایە بەبێ بوونی جۆرێك لە ئایین و رەوشت، ئیسلامیش ئەو ناوەیە كە دەنرێت لەو یەكبوونەی نێوان رۆح و ماددە، وە ئەوەیش ئەو دارشتنە ناوییەیەكە مرۆڤی پێ ناوزەد كراوە.

ژیانی مرۆڤایەتی تەنها كاتێك تێروتەسەل دەبێت كە هەموو ئارەزوو هەستی و تاسەو حەزە رۆحیەكانی گرۆی بەشەری بیگرێتەوە، هەموو تێكشكانەكانی مرۆڤ یان نەفی كردنی پێداویستیە ژیانیەكانی مرۆڤ لەلایەن ئایینەوە بووە یاخود ئینكاری كردنی مەزهەبی ماتریالیە بۆ هەست و دەرك پێكردنە رۆحیەكانی مرۆڤ.

باووباپیرە پێشینەكانیشمان دەربارەی بوونی دوو جەوهەر دواون: كە ئەوانیش بریتین لە (عەقڵ) و (ماددە) لەسەر ئەوەیش لەبوونی دوو رەگەزو دوو رژێمی جیهانی بنەرەت جیاواز و سروشت جیاواز تێگەیشتوون. كە هیچ یەكێكیان پێش ئەوی دی ناكەوێت، وەناكرێت یەكێكیان بخرێتە ژێرباری ئەوی ترەوە، هەتا گەورە بلیمەتەكانی جیهانیش نەیانتوانیوە پەیوەندی ئەو دووانە بپچڕێنو لەیەكیان دووربخەنەوە سەرەڕای جیاوازی ناوەڕۆكیش. دەتوانین وا بیربكەینەوە كە ئەم دوو جیهانە لە ڕووی زەمەنی لەیەك دابڕاون، یاخود دوو جیهانی بەشوێن یەكدا هاتوون (ئێستاكەو دواتر) یا دووجیهانی هاوكاتن و بەڵام لە سروشت و مانادا جیاوازن، كە ئەمیش زیاتر لە ڕاستیەوە نزیكە.

دوانگیری نزیكترین (مشاعر)ە بە مرۆڤەوە، بەڵام وەكو پێویست گەورەترین فەلسەفەی مرۆڤایەتی نیە، بەپێچەوانەی ئەوەوە، هەموو فەلسەفە گەورەكان یەك لایەنیان گرتووە، مرۆڤ لەرێگەی شارەزایی خۆیەوە دوولایەنیو دووانگیری جیهانی بۆ روون دەبێتەوە، بەڵام یەكانگیری شاراوەتەوە لەپێكهاتو فیكری هەموو مرۆڤێكدا. فەلسەفە دان بە (دوانگیری)دا نانێت. لەگەڵ ئەوەشدا، هیچ گرنگ نیە ئەوە ئەگەر فەلسەفە دانی پێدا بنێت یاخود نا. چونكە ژیان باڵاترە لە فیكر، پێویستیش ناكات بكەوێتە ژێر بڕیاری فیكرەوە. ئێمە وەكو مرۆڤێك كە لە واقیعدا دەژین، دەتوانین نكوڵی لەم دووجیهانە بكەین بەڵام ناتوانین لێیان ڕا بكەین، ژیانیش زۆر ناوەستێت تا بەتەواوی لێی تێبگەین. لەبەرئەوە، پرسیار لێرەدا ئەوە نیە لەنێو دوو ژیاندا دەژین، بەڵكو ئەوەیە: ئەگەر ئێمە ئەوەمان كرد ئایا لەو حەقیقەتە تێدەگەین؟ لەوێدا مانای تەواوەتی ئیسلام دەردەكەوێت، ژیان دووانگیرە، ئەمەیش بە شێوەیەكی كرداریی سەلمێنراوە كە مرۆڤ ناتوانێت لەیەك ژیاندا بژی لەو كاتەوەی جیا

کراوەتەوە کە ڕووەك بێت یاخود گیانەوەر، هەر لەو ساتەوە کە وتیان ﴿ قالوا بلى ﴾[٦] لەو کاتەوە کە پێوەرە ڕەوشتیەکان پێگەیشتن، یاخود هەر لەو کاتەوەی (مرۆڤ خرایە ناو ئەم جیهانەوە).

ئێمە بەڵگەیەکی عەقڵیمان پێ نیە لەسەر بوونی جیهانێکی تر جگە لەم جیهانە، بەڵام (شعور)ێکی ڕوون و ئاشکرامان هەیە کە مرۆڤ تەنها بۆ ئەوە دروست نەکراوە کە بەرهەم بهێنێت و بەکار ببات.

ئەو زاناو بیریارانەی کە هەوڵ و کۆششی زۆر دەدەن بۆ گەیشتن بە حەقیقەت، تەنها ئەو بیرکردنەوەیە ناتوانێت ژیانێکی بالاًیان بۆ دەستەبەر بکات، بەڵکو ئەو ژیانەی کە بەکاریان بردووە لە لێکۆڵینەوەو گەڕان بەشوێن حەقیقەتداو بەپشتگوێ خستنی داخوازییە جەستەییەکانیان، کە ئەمە لەخۆیدا بەرزترین شێوەیەکە لە شێوەکانی بوونی مرۆڤایەتیی.

ئەو دوو هێڵە بیرکردنەوەیە، کە لە مێژووی مرۆڤایەتیدا وتووێژی لەسەر کراوە هاوڕێکن، وە جیاکردنەوەیشیان ئاسانە، سەرەڕای ئەو پێکدادانە بەردەوامەی نێوانیشیان هەتا ئەمڕۆکە ماونەتەوە بەبێ گەیشتنە هیچ جۆرە پێشکەوتنێکی گەوهەریی.

هێڵی یەکەم کە لە (ئەفلاطون)ەوە دەست پێ دەکات و درێژ دەبێتەوە هەتا بیریارە مەسیحیەکانی چەرخی ناوەڕاست، کە بەشوێنیاندا (غەزالی) و پاشان (دیکارت) و (مالبرانش) و (لیبنتز) و (برکلی) و (فختە) و (کدورث) و (کانت) و (هیگل) و (ماخ) و (برجسون) لە چاخی نوێدا. بەڵام هێڵی ماددی کە خۆی لە (گالیس) و (ئەنکسمندریس) و (هرکیلیتس) و (لوکریتوس) و (هوبز) و (جاسندی)، و (هلفتیوس) و (هولباخ) و (دیدرو) و (سبنر) و (مارکس)دا دەبینێتەوە لەبواری ئامانجە مرۆڤایەتیە کرداریەکاندا ئەم دوو ڕەوتە لە بیرکردنەوەی مرۆڤدا لە دوو جەمسەری جیاوازدا دەوەستن، ڕەوتی یەکەم لە مەزهەبێکی مرۆڤایەتیانەدا خۆی دەبینێتەوە، بەڵام ڕەوتی دووهەم خۆی لە پێشکەوتندا دەنوێنێت.

ئایین بەو شێوەیەی ڕۆژئاوا لێی تێگەیشتوون ڕووەو پێشکەوتن نابزوێت، هەروەها زانستیش نابێتە هۆکارێك بۆ بەهێزبوونی چەمکە مرۆڤایەتیەکان.

---

[٦] / ﴿ وإذ أخذ ربك من بني آدم من ظهورهم ذريتهم وأشهدهم على أنفسهم ألست بربكم قالوا بلى شهدنا أن تقولوا يوم القيامة إنا كنا عن هذا غافلين ﴾ الأعراف/١٧٢.

هەرچۆنێك بێت، لەواقیعدا ئایینێك نیە كە پاڵفتەبێت هەروەكو چۆن زانستێكی پاڵفتەكراویشمان نیە، بۆ نموونە: ئایینێك نیە بەبێ هەبوونی ڕەگەزە زانستیەكان تێیدا، هەروەها زانستێكیش نیە بەبێ بوونی ڕەگەزو هیوا ئاینیەكان تێیدا. ئەم حەقیقەتەیش هەروا بەتێكەڵاوی دروست بووەو ناڕەحەتە تێیدا بتوانرێت كە بنچینە ڕاستەكان و جێگە ڕاستەكانی ئەو بیرو ڕەوتانە بدۆزرێتەوە. وە ئەگەر ئێمە لەو دوو فیكرەیەمان كۆڵیەوە. ئەو كاتە هەوڵ دەدەین بۆ گەیشتن بەشێوە پاك و بێگەردەكەی هەریەكەیان لەگەڵ گەیشتن بە ئەنجامی كۆتایی و (منطقی) و بەڵكو هەندێ جاریش ئاڵۆزییان. هەروەها بۆمان دەردەكەوێت كە ئەوانە دوو ڕژێمی (منطقی)ین لە ناوەڕۆكدا وە داخراون بەسەر خۆیاندا. بەڵام بەلای زۆربەمانەوە ئەو ئەنجامە ناسروشتی و كتوپڕدەبێت هەریەكە لەوانە بەشێوەیەك تەفسیری ئەوی تر دەكات لەشێوەی (فسیفساء)[7] یكدا كە هەریەكەیان دەیەوێت لەوی تریاندا ڕەنگ بداتەوە بە بەكارهێنانی دیالكتێكی پێچەوانە. لەكاتێكدا مادییەت بانگەشەی ئەوە دەكات هۆكارە بابەتیەكان (بەدەر لە مرۆڤ) جوڵێنەری بنەڕەتی ڕووداوە مێژووییەكانن و پێویست بوو لەقۆناغی دووهەمیشدا لەقۆناغەكانی كرداری دیالتیك پێشبینی فیكرەیەكی تەواو پێچەوانەی ئەم فیكرەیە بكەین. هەروایش دەرچوو، پاش لێكۆڵینەوەیەكی كەم فیكرەی تەفسیركردنی (پاڵەوانگەری) بۆ مێژوو بەدەركەوت. (كارلیل) پێی وایە كە هەموو ڕووداوە مێژووییەكان ئەكرێت لەڕێگەی كاریگەری كەسایەتیە بەهێزەكانەوە لێك بدرێتەوە، ئەوانە كە بلیمەت بوون. بەو شێوەیە مادیەكان لەناو خۆیاندا تووشی بەرەنگاربوونەوەی یەكتری بوونەوە. هەیانە كە دەڵێت: (مێژوو لەسەر سەری ناڕوات)[8] ئەوانی تر بە پێچەوانەی ئەمانەوە دەڵێن: بلیمەتەكان مێژوو دروست دەكەن.

وەك لە نموونەی پێشوودا دەردەكەوێت كەماددیەتی مێژوویی دژی فەردیەتی مەسیحیەتە، بەهەمان لۆژیكیش بوونەوەر دژی بەرەوپێش چوونە، نموونەی باڵا دژی بەرژەوەندییە، ئازادی دژی لاسایكردنەوەیە، فەردییەت دژی كۆمەڵە.. بەو شێوەیە.

---

[7] / فسیفساو: پارچەی ڕەنگاو ڕەنگی مەڕمەڕو شتی ترە كاتێك ڕەنگەكان تێكەڵی یەكتر دەبن لەشێوەو وێنەی جۆراو جۆردا دەردەكەون، جۆرێكە لە كاشی. (وەرگێڕ ك)

[8] / كارل ماركس Karl Marx: The Karl Marx library, trans. seal K. Padower (New Yourk).

بانگەشەکردنی ئایین بۆ تێک شکاندنی ئارەزووەکان، لەبەرامبەریدا ڕێبازی شارستانیەت دێت کە دەڵێت: (هەمیشە ئارەزووە نوێیەکان دروست دەکەم). لەکێشەکانی کۆتایی ئەم کتێبەدا هەوڵ دراوە بە وردی پۆلێنی ئەو بیرو بۆچوونانە بکرێت، بەپێی ئەو شێوەیەی لە پێشەوە باسکراوە.

ئەمە ئەگەر چی بەشێوەیەکی تەواویش نەبێت دەتوانێت ئەوەمان بۆ ڕوون بکاتەوە کە ئایین و ماددیەت دوو فیکرەی سەرەتایین لە جیهاندا ناکرێت بەش بەش بکرێن یاخود لەخۆیان بچووکتر بکرێنەوە، یان یەکێکیان تێکەڵ بەوی تر بکرێت. لەم بارەیشەوە ئەم ئایەتە پیرۆزەی قورئان بەنموونە دەهێنینەوە کە دەفەرموێت: ﴿ مرج البحرين يلتقيان بينهما برزخ لايبغيان ﴾.

بەهیچ شێوەیەکیش ناتوانرێت بەڵگەیەکی (منطقی) بهێنرێتەوە کە بەرەنگاری هیچ یەکێك لەو دوو فیکرە جیهانیەی پێ بکرێت. چونکە هەریەکێکیان لەخۆیدا خاوەنی ڕژێمێکی (منطقی)یە هیچ (منطقی)ێکی تریش نیە کە بڕیاردەر بێ بەسەریانەوە.

لە ڕووی (مبدء)یشەوە مەگەر تەنها خودی ژیانی مرۆڤایەتی باڵاتر بێت لێیان. لەسەروو هەموو ئەمانەیشەوە ژیانێکی تێرو تەسەل و خەیرو بەرەکەتدار چاکترە لە هەر ئایین و لە هەر سۆشیالیستیەك.

مەسیحیەت دەتوانێت لایەنە ڕۆحیەکەی مرۆڤ پڕ بکاتەوە، سۆشیالیزم بەپێچەوانەی ئەوەوە هەوڵ دەدات لایەنە دەرەکیەکەی مرۆڤ پڕ بکاتەوە، ئێمەش لەنێوان ئەم دوو جیهانە هاوتاو یەکسانەدا کە هەمیشە لە پێکدادانێکی بەردەوام و بێچارەسەردان..

هەست دەکەین پێویستیمان بەوە هەیە کە پێکەوە هەردووکیان قبوڵ بکەین لەپێناوی دۆزینەوەی هاوسەنگیەکی سروشتی و نوێدا بۆیان، بەپێچەوانەیشەوە هەموو تێگەیشتنێکی جیاوازو ناتەباش دەبێتە هۆی دابڕان و لێکترازانی ژیان و دابەشکردنی حەقیقەت و چارەنووسی مرۆڤایەتی. هەندێ حەقیقەتی بنەڕەتی هەیە لە ژیاندا هەموو مرۆڤێك بەچاوی ڕێزەوە تێیان دەڕوانێت بەچاوپۆشی کردن لەو فیکرەیەی کە هەیەتی، مرۆڤ لەڕێگەی هەستێکی هاوبەشەوە، یاخود لەئەنجامی سەرکەوتن و بەرەو پێشچوونیەوە ئەم حەقیقەتانەی بۆ دەرکەوتووە: خێزان، بوونی دارایی، خۆشگوزەرانی، دامەزران، ڕاستگۆیی، تەندروستی، زانیاری، سەربەستی، بەرژەوەندی، هێز، لێپرسراویەتی... هتد.

ئەگەر ئێمە بێین و ئەم حەقیقەتانە شی بکەینەوە، وە دەبینین هەموویان لە دەوری یەك تەوەرە کۆبوونەتەوەو پێکەوە ڕژێمێکی کرداری پێك دەهێنن بەهۆیانەوە حەقیقەتەکانی ئیسلامەمان وەبیر دێتەوە.

ئەو جیاوازیەی کە لەنێوان ئەو دوو ڕەوتەدا هەیە کە لەپێشەوە باسمان کرد. وانمایش دەکرێن کە ئیتر ناتوانرێت بەهیچ شێوەیەك لێیان لابدرێت، بەڵام ئەمە تەنها وەك تیۆرێك دەمێنێتەوە، چونکە لە ژیانی ڕۆژانەدا ئەمە جێبەجێ ناکرێت، ئەوەی دوێنێ دژایەتیان دەکرد ئەمڕۆ لەسەری تەبان، ئەوەیش کە دەمێنێتەوە چەند فیکرەیەکن کە تەنها بۆ ڕووکەش کردنن و ڕووی دەرەوەی تیۆرەکانی پێ دەڕازێننەوە.

مارکسیەت لە ئاستی تیۆریدا بە هەموو شێوەیەك خێزان و دەوڵەتی ڕەتکردەوە. بەڵام لە لایەنی کرداریەوە، پارێزگاری لە مانەوەی ئەو دوو سیستەمە کرد. هەموو ئاینێکیش هەوڵی ئاسانکردنی ئیش و کارەکانی مرۆڤ دەدات لە دنیادا، ئاینیش چونکە بیروباوەڕی کەسانێکی زیندووە هەمیشە هەوڵ دەدات بۆ دادپەروەریی‌و کۆشش لەپێناوی ڕەخساندنی جیهانێکی باشتردا. مارکسیەت ناچاربوو تا ڕاددەیەك ئازادی تاکەکەس قبوڵ بکات، هەروەها ئاینیشی وەکو ئامرازێك بۆ خۆبەهێزکردن بەکاربهێنێت.

کەواتە لێرەدا ئەوەمان بۆ ڕوون دەبێتەوە کە مرۆڤ لە هەڵس و کەوت و ژیانی ڕۆژانەیدا ناتوانێت بەپێی ئەو دەقە فەلسەفیە جێگیرو نەگۆڕانە ڕەفتار بکات و بجوڵێتەوە.

لێرەدا پرسیارێك دێتە ئاراوە: ئایا ئەو دوو ڕەوتە دەتوانن هەر بەو شێوەیە بمێننەوە کە هەن ؟ لەڕاستیدا واقیع شتێکی ترمان پێ دەڵێت: ئەوان بۆ ئەوەی لە ژیاندا پێکەوە هەڵکەن و بگونجێن پێویستە هەریەکەیان سوودو شارەزایی لەوەی تر وەربگرێت.

ئەو مەسیحیەی کەلەپاشدا گۆڕا بە کەنیسە، ئێستا هاتووەتەوە سەر باسکردنی دەسەڵات و سامان و هێزو زانست و زانیاری و کارو فرمان و ژنخوازیی و دادپەروەریی کۆمەڵایەتی و هەروەها لایەنەکانی تری ژیانی ماتریالی. لەلایەکی تریشەوە، ماتەریالیزم کە پاشان گۆڕا بەرەو سۆشیالیزم و ڕژێم و دەوڵەت، بەهەمان شێوە ئەویش گەڕاوەتەوە سەر چەمکە مرۆڤایەتیەکان و باسکردنی ڕەوشت و هونەرو ئەفراندن و دادپەروەریی و لێپرسراویەتی و ئازادیی... هتد.

کەچی هەموو جارێکیش لەبری داننان بەو حەقیقەتانەدا، بیانووی ئەوە دەهێننەوە کە

ئەوانە تەنها لە مامەڵە کردنی رۆژانەدا بەکاردەهێنرێن.

بەو شێوەیە هەریەکە لە ئایین و مادییەت بەردەوام لە شێواندندا بوون بەوەی کە خرابوونە ناو چوارچێوەی یاسایەکی دیاریکراوو یەك لایەنەوە. لە هەردوو حاڵەتەکەیشدا یەك گیروگرفت هەبوو: چۆن بەرنامەیەك کە تەنها باسی لایەنێك لەلایەنەکانی ژیان دەکات دەتوانرێت بەسەر تێکڕای لایەنەکانی تری ژیاندا بسەپێنرێت؟

لەلایەنی تیۆریەوە مرۆڤ دەتوانێت مەسیحی بێت یا ماتەریالی بێت. هەرچەندە ئەمە شێوەیەکە لە شێوەکانی توندڕەویی، بەڵام لە واقیعدا ناکرێت هیچ یەکێك لەو دووانە بەتەنها پیادەبکرێت چ مەسیحیەت یاخود ماددیەت بێت.

ئەو تۆباویە تازەیەی کە لە چینو کۆریای باکوورو ڤێتنامدا هەیە، خۆی بە باشترین شێوازێك دەزانێت کە نزیکترو گونجاو تر بێت لەگەڵ بنەماکانی مارکسیەتدا. لەڕاستیدا ئەم تۆباویەتە دادەنرێت بە چاکترین نموونەیەك بۆ چارەسەرکردنی ناتەواویەکانی ئەو حاڵەتە یەکلایەنگیریەی لەپێشیەوە باسمان کرد، هەروەها لەبەر ناجێگیربوونیشی لەلایەنی کرداریەوە، لەباتی ئەوەی پەیوەندیە نویەکانی رەنگدانەوەی بنەما ئابووریەکانی بێت، زۆر بە سادیی سوودی لە پێوانە رەوشتیە باوەکان وەرگرتووە بەتایبەتی هەردوو رەوشتی (تواضع)و رێزگرتنی مرۆڤی بەتەمەن[٩].

بەو شێوەیە ئەو مارکسیەتە توندڕەوەی خۆی بە بەرنامەیەکی تێرو تەسەلو کامڵ دەزانێ کەچی پەنا دەباتە بەر ئەو بەها رەوشتیانەی کە لە ئاییندا ئامادەییان هەیە.

دانەرانی خودی ئەو رژێمانەیش بەناچاریی دان بەو راستیانەدا دەنێن، بەڵام ئەو حەقیقەتانە هەر بەو شێوەیە دەمێننەوە، بە چاوپۆشین لەو دان پیانانەی ئێمەیش.

لەهەندێك لە وڵاتە سۆشیالیستەکاندا لەسەر جێبەجێکردنی کاری پوختو رێكوپێك خەڵاتی کرێکارەکان دەکرێت بە هاندانێکی مەعنەویانە لەبری هاندانی ماددی لەگەڵ ئەوەیشدا ئەو هاندانە مەعنەویانە لەو چوارچێوەی فەلسەفەی ماتەریالیدا هیچ پێناسەو تەفسیرکردنێك هەڵناگرێت، هەروەها بانگەشەکردنی بۆ چەمکەکانی دادپەروەریی‌و مرۆڤایەتی‌و یەکسانی‌و ئازادی‌و مافی مرۆڤ هەموو ئەمانە سەرچاوەکانیان لە ئایینەوە

---

[٩] / (تواضع) بیانوویەکی چاکە بۆ ئەوانەی لە ئاستێکی نزمی گوزەراندا دەژین، بەڵام رێزگرتنی مرۆڤە بە تەمەنەکان، بە ئاسانیی گۆڕا بە رێزگرتنێکی کوێرانە لەلایەن دەسەڵاتەوە.

وەرگرتووە، بەڵام ئەوەی کە گومانی تێدا نیە هەموو مرۆڤێك مافی ئەوەی هەیە بەو شێوەیە بژی کە بۆ خۆی بەباشی دەزانێت، ئەگەر نەیشگونجێت لەگەڵ ئەو فیکرە تایبەتیەی کە هەیەتی. بەهەرحاڵ، بۆ ئەوەی لەم جیهانە تێبگەین تێگەیشتنێکی ڕاستو دروست، گرنگە کە لەسەرچاوەو حەقیقەتەکانی ئەو فیکرانە تێبگەین کە ئەم جیهانە دەبەن بەڕێوە. لە لێکۆڵینەوەیەکی لەم جۆرەدا ئێمە پێوەی خەریکین زۆر گرفتی شاراوەی لەخۆیدا هەڵگرتووە، بۆ نموونە، ئەوەی کە ناودەبرێت (بە شتە روون و ئاشکراکان) و ئەو بیرو باوەڕانەی لەلایەن کۆمەڵەوە بەگشتی پشتیوانی و پێشوازیی لێ دەکرێت، خۆر بەدەوری زەویدا ناسوڕێتەوە، سەرەڕای ئەوەی سەیری دەکەیت وادەزانیت وایە، نەهەنگ ماسی نیە، کەچی بەلای زۆربەی خەڵکیەوە وا تێدەگات، سۆشیالیزم لەگەڵ ئازادیدا دوو چەمکن ناتوانن بەیەکەوە بگونجێن، سەرەڕای ئەو هەموو هەوڵانەیش کەدەدرێت بۆ پێکەوە گونجاندنیان. سەرەڕای هەموو ئەو چەواشەکاریانەیشن ئەوفیکرانە بەشێوە راستەقینەکەی خۆیان دەمێننەوەو کاریگەر دەبن بەسەر جیهانەوە، نەك تەنها بەمانایەکی کاتیی و باو، بەڵکو بەپێی مانا بنەڕەتیەکانیو بەشێوەیەکی حەقیقیو ڕەسەن.

ئێستا خەریکە لەماناو پێناسەی ئیسلام نزیك دەبینەوە بەڵام پێناسەیەکی جیاواز لەو پێناسە باوەی بۆی کراوە، لەگەڵ پاراستنی ئەو خاڵە بنەڕەتیەی لەهزرماندا هەیە، ئەتوانین بڵێین ئیسلام واتە تێگەیشتنو حاڵی بوون لە دوانگیری و پێکەوە بەستنی هەردوو چەمکی ڕۆحیو ماددی بۆ جیهانو پاشانیش زاڵبوون بەسەر ئەو دوانگیریەدا.

ئەم جۆرە پێناسەیەی کە لەم کتێبەدا بەکاری دەهێنین بۆ وشەی (ئیسلامیی) تەنها بۆ ئەوە نیە پێناسەی ئەو یاسایانەی پێ بکەین کە هەمیشە وەکو خودی ئیسلام ناسێنراون، بەڵکو بۆ دیاریکردنی ئەو بیروباوەڕە بنەڕەتیانەشە کە ئیسلامی لێ پێك هاتووە. بەو شێوەیە، ئیسلام دەبێتە ناونیشانی پەیڕەوو پرۆگرامێك زیاتر لەوەی چارەسەرێکی لەبار بێت، واتە: ئیسلام بریتیە لە تێکەڵێك لە بنچینە تێکەڵەکان. ئەم بنەما بنەڕەتیە لە ئیسلامدا هەر هەمان ئەو شێوازەیە کە ژیانی لەسەر بونیادنراوە. ئەو سروشتەی کە ئازادی عەقڵ و حەتمیەتی سروشتی پێکەوە بەستووەتەوە تا بەو شێوەیەی کە لەژیاندا دەبینرێت، خودی ئەو سروشتەیە کە دەستنوێژو نوێژی لە یەکەیەکدا کۆکردوەتەوە کە پێی دەوترێت (نوێژی ئیسلامیی) بەتێگەیشتنێکی بەهێزو ڕامان و ورد بوونەوەیەکی قووڵ لە نوێژ

دەتوانرێت ئیسلامی بەتەواوەتی لەسەر بونیاد بنرێت، هەروەها لە ڕێگەی رامان و ورد بوونەوەیش لە ئیسلام دەتوانرێت ئەو دوانگیریە دیاری بکرێت کە هەموو ئەم جیهانە دەگرێتەوە[10].

ئەوروپا نەیتوانیوە بگاتە ڕێگا چارەیەکی مام ناوەند (هەرچەندە ئینگلتەرا هەوڵێکی لەو شێوەیەدا تاببێتە پێشڕەوی ئەو بوارە). لەبەرئەوە، ناتوانرێت تەعبیر لە ئیسلام بکرێت بە بەکارهێنانی ئەو زاراوە ئەوروپاییانە. ئەو زاراوە ئیسلامییانە وەکو: نوێژ، زەکات، خلیفە، جەماعەت، دەست نوێژ، هەروەها زاراوەکانی تری لەو جۆرە لە بەرامبەریدا لە زمانە ئەوروپاییەکەدا وشەیەك نیە کە ئەو مانایانە بگرێتەوە، پێناسەکردنی ئیسلام بەوەی پێکهاتەیەکە بریتیە لە ئاین و ماددیەت پێکەوەو هەڵوێستیشی لەنێوان مەسیحیەت و سۆشیالیزمیدا هەڵوێستێکی مامناوەندیانەیە، ئەوە پێناسەیە کە دەکرێت وەربگیرێت بە پێی چەند مەرجێکی دیاریکراو. ئەوە پێناسەیەکی ڕاستە بەیەکێك لە شێوەکان، بەڵام نەك لە هەموو لایەنێکەوە. نوێژو زەکات و دەست نوێژ ئەمانە چەند پێکهاتەیەکن کە ناکرێت پارچە پارچە بکرێن چونکە ئەوانە تەعبیر لە هەستێکی سروشتی سادەو ساکار دەکەن، ئەوە دڵنیاییەکە تەنها بەیەك وشەو بەیەك شێوە دەتوانرێت دەربپڕێت. بەڵام لەگەڵ ئەوەشدا بە شێوەیەکی (منطقی)یانە دەمێنێتەوەو هەڵگری دەلالەتە دوانگیریەکانی دەبێت. لێرەدا مرۆڤ نوێنەری ئەوە چونکە ئەو کاتە مرۆڤ دەبێتە تەفسیرکەرو پێوەری ئەو.[11]

لەناو ئەو کەسانەدا کە قورئان بەعەقڵیەتێکی ڕەخنەیی و شیکارییەوە دەخوێننەوە ئەوە بڵاوە کە گوایا قورئان لەلایەنی بابەتیەوە پشت بەرژێمێکی دیاریکراو نابەستێت، وەکو ئاوێتەیەك وایە کە لە چەند ڕەگەزێکی پەرش و بڵاو پێکهاتبێت، بەڵام پێویستە لەپێش هەموو شتێکەوە ئەوە بزانرێت کە قورئان بریتی نیە لەکتێبێکی ئەدەبی بەڵکو بریتیە لە ژیان. خودی ئیسلامیش ڕێگەیەکە بۆ ژیان زیاتر لەوەی ڕێگەیەك بێت بۆ بیرکردنەوە. تاکە پێناسەیەکی ڕەسەن و تەواویش بۆ قورئان ئەوەیە کە بڵێین قورئان بریتیە لە (ژیان)،

---

[10] / پێناسە کردنی ئیسلام وەکو (بنەما)یێك گرنگیەکی جەوهەری دەبێت بۆ پاشەڕۆژی، چونکە لەوەو پێش زۆر وتراوە کە ئیسلام وایەو جیهانی ئیسلامیی ئاوا، هاتوون و هەر لە دەرەوە وێنەیەکی سەرپێییان گرتووەو لە پاشاندا خستویانەتە ناو چوارچێوەیەکی داخراوەوە.

[11] / ئایەتی (٣٠) سورەتی (الروم) بە ڕوونی باس لەمە دەکات: ﴿ فأقم وجهك للدين حنيفا فطرة الله التي فطر الناس عليها لا تبديل لخلق الله ذلك الدين القيم ولكن أكثر الناس لايعلمون ﴾.

هەروەکو دەزانین کە ئەو ژیانە لەشێوە بەرجەستە کراوەکەیدا بریتیە لە ژیانی پێغەمبەر ﷺ. ئیسلام بەشێوە نووسراوەکەی (واتە قورئان) ئەگەر بە رووکەش سەیری بکەیت پێ دەچێت وەکو رژێمێك نەیبینینەوە، بەڵام لە ژیانی پێغەمبەردا ﷺ ئەوە سەلمێنراوە کە ئەوە یەکەیەکی سروشتی و کامڵە: لە خۆشەویستی و هێز، لە بڵندیی و واقعی، لە رۆحی و بەشەری.

ئەمە پێکهاتەیەکی زیندوو بەهێزە لە ئاین و سیاسەت، هێزو توانایەکی گەورە دەبەخشێتە ئەو گەلانەی کە ئیسلامیان وەرگرتووە. لە یەك ساتیشدا ئیسلام لەگەڵ ژیاندا رێك دەکەوێت و دەگونجێت.

هەڵوێستی مامناوەندی ئیسلام ئەتوانرێت هەستی پێ بکرێت لەرێگەی ئەو حەقیقەتەوە کە ئیسلام هەمیشە جێگای هێرش کردنە سەر بووە لەلایەن هەردوولایەنە ناکۆکەکەوە: ئاین لەگەڵ زانست، لەلایەنی ئاینەوە ئیسلام بەوە تاوانبار دەکرێت کە زیاتر پەیوەستە بە سروشت و واقیعەوەو زیاتر گونجاوترە لەگەڵ ژیانی دونیادا، لەلایەنی زانستیشەوە تۆمەتی ئەوەی دەخرێتە پاڵ کە پێکهاتەیەکە لە رەگەزە ئاینی و غەیبییەکان. لە راستیدا ئیسلام تەنها یەك ئیسلامە بەڵام پێکهاتووە لە هەردوولایەنەکە، وەکو چۆن مرۆڤ پێکهاتووە لە روح و جەستە، بەڵام بەهۆی لایەنە جیاجیاکانیەوە کەدەبێتە هۆی جیاوازی تێروانینەکانیش. مادییەکان لەئیسلامدا تەنها لایەنی ئاینی و غەیبییەکەی دەبیننەوە واتە (راستڕەو) لەکاتێکدا مەسیحیەکان وای بۆ دەچن کە بزوتنەوەیەکی کۆمەڵایەتی سیاسی بێت واتە (چەپڕەو).

سیفەتی دوانگیری خۆی دووبارە دەکاتەوە لەکاتی روانیندا بۆ کرۆك و ناوەخنی ئیسلام، چونکە هیچ دەزگایەکی ئیسلامی نیە کە بتوانێت هەموو ئاین لە خۆیدا کۆ بکاتەوە یان هەموو زانست بگرێتە خۆی، ئەمە سەرەڕای بوونی رەگەزەکانی تری وەکو سیاسەت و ئابووری. سۆفیەت هەمیشە دووپاتی لایەنە ئاینیەکەی ئیسلام دەکاتەوە، لەکاتێکدا ئەقڵانیەکان زیاتر گرنگی بەلایەنەکانی تری دەدەن، هیچ کامێکیشیان راست ودروست ئیسلامیان نەدۆزیوەتەوە لەبەر هۆیەك، ئەویش ئەوەیە ناکرێت ئیسلام لەناو یەك لایەندا بەند بکرێت. بۆ نموونە دەست نوێژ سۆفیەك وای دەبینێتەوە کە ئەمە پاك بوونەوەیەکی ئاینیەو هەڵگری چەند دەلالەتێکی هێماییە. بەڵام کەسێکی عەقڵانی وای دەبینێتەوە کە

تەنها مەسەلەیەکە و پەیوەندی بەپاك وخاوێنییەوە هەیە.

هەریەکێك لەم دوو بۆچونەیش ڕێژەیەك لە ڕاستیان تێدا هەیە. بەڵام ناتەواوی لە تەفسیرکردنی سۆفیەکەدا ئەوەیە کەلایەنی پاك و خاوێنیە مادییەکەی فەرامۆش کردووە، هەروەها هەمان (منطق) لە مەسەلەکانی تریشدا دووبارە دەبێتەوە. دەبینین ئەم جۆرە تێگەیشتنە دەبێتە هۆی لە قاڵبدانی ئیسلام بەخستنە ناو چوارچێوەیەکی ئاینی ڕووتەوە. لەڕێگەی دوورخستنەوەی هەموو پێکهاتە مادی و ئەقڵی و کۆمەڵایەتەکان تێیدا. بەڵام ئەقڵانیەکان بەپێچەوانەی ئەوانەوە ڕێگایەکی تر دەگرنەبەر بەفەرامۆش کردنی لایەنی ئاینی لە ئیسلامداو، بچوککردنەوەی بۆ تەنها بزوتنەوەیەکی سیاسیانە، بە بەکارهێنانی لەپێناوی نەتەوەگەریدا وەکو نەتەوەگەرییەکی ئیسلامی بێبەش لە گەوهەرە ئاینی و رەوشتیەکە تێدا، بەتاڵ و یەکسان لەگەڵ هەموو نەتەوایەتیەکانی تر لەو بوارەداو لەم حاڵەتەدا موسڵمان ناتوانێت پابەندی ئاکارو رەوشتە ئاینیەکان ببێت؟ هەروەها بانگەشەو ئەرکە ئیسلامیەکانی جێبەجێ ناکات و ناتوانێت هەڵوێستێکی باش و (ایجابی) یانەی هەبێت لەبەرامبەر راستیەکاندا، بەڵکو تەنها بریتی دەبێت لە لایەنگیری بۆ کۆمەڵە مرۆڤێك جیاواز لە کۆمەڵێکی تر.

ئیسلام تەنها بریتی نیە لەنەتەوە ئەوندەی ئەوەی بانگەشە کردنێکە بۆ نەتەوەیەك (کە فەرمان بەچاکە بکەنو واز بێنن لە خراپە).[١٢]

واتە هەڵدەستێت بە جێبەجێ کردنی پەیامێکی رەوشتی. ئەگەر ئێمە پێکهاتە سیاسیەمان لە ئیسلام دابڕی و کورتمان کردەوە لە تەنها ڕێگەیەکی سۆفیگەری ئاینیدا، ئەو کاتە ئەبێت بێدەنگ و گۆشەگیر تەنها بە پەرستشەوە خەریك بین. لە بەرامبەر ئەوەدا، ئەگەر پێکهاتە ئاینیەکەمان لە ئیسلام دابڕی ئەو کاتە ناتوانین توانایەکی رەوشتی بەهێزی بۆ بنیاد بنێین.

پاش ئەمە چ گرنگیەکی دەبێت ئەگەر ئیمپریالیزم بەریتانی بێت یا ئەڵمانی بێت یاخود ئیسلامی، مادام هێزێکی چەوسێنەرەوە بێت بەسەر گەلانو شتەکانەوە ؟

---

[١٢] / ﴿ الذين ان مكناهم في الارض اقاموا الصلاة واتوا الزكاة وامروا بالمعروف ونهوا عن المنكر ولله عاقبة الامور ﴾ الحج (٤١).

﴿ ولتكن منكم امة يدعون الى الخير ويامرون بالمعروف وينهون عن المنكر واولئك هم المفلحون ﴾ ال عمران (١٠٤).

لەپێناو پاشەڕۆژی مرۆڤو چالاکیە کرداریەکانیدا، ئیسلام گرنگیەکی زۆر دەدات بە بانگەشەکردن بۆ پەروەردەکردنی مرۆڤ لە هەردوو لایەنی روحیو جەستەییەوە، هەروەها کۆمەڵگایەك کە پارێزگاری لە یاساو دەزگا کۆمەڵایەتیو ئابوورییەکان بکاتو نەیان شێوێنێ. ئیسلام بریتیە لەمەو (ئەشێ هەر بەو شێوەیەش بمێنێتەوە) مەبەستو ئەرکی مێژووی ئیسلام بریتیە لە راگرتنو هاوسەنگکردنی هەردوو حاڵەتە دەرەکیو ناوەکیەکان لە ئەمڕۆو داهاتوودا. ئەو گیروگرفتانەیش کە دەمانەوێت لەم کتێبەدا چارەسەریان بکەین، هەمان ئەو گیروگرفتانەن کە ئەم بارودۆخەی ئێستایان خوڵقاندووە، مەبەستیشمە لێی: ئەو دابەشبوونەی جیهانە بۆ دووسەربازگەی پێکدادەر هەر لە سەرەتاوە لەئەنجامی ململانێیەکی ئایدۆلۆژییەوە، بەرەنگاربوونەوەیش لەنێوان فیکرو بیروبۆچونەکاندا رەنگدانەوەیەکی وای دەبێت لەسەر واقیع کە رەنگە نموونەی لەو شێوەیەی نەبوبێت، بەداخێکی زۆریشەوە ئەم جەمسەرگیریە رۆژ بە رۆژ گەورەو فراوانتر دەبێت.

ئێستا لە بەردەماندا دووجیهان هەیە کە هەتا سەر ئێسقان لەیەك جیاوازن، لە ڕووی سیاسی و بیروباوەڕو ویژدانەوە، ئێمە بەچاوی خۆمان ئەو ئەزموونە مێژووییە ترسناکە دابینین لەبارەی جەمسەرگیری جیهانی مرۆڤەوە. بەڵام هەتا ئێستایش بەشێك لە جیهان ماوەو کاریگەر نیە بەو جەمسەرگیریە، زۆربەی ئەو شوێنانەش بریتیە لە وولاتە موسڵمانەکان. ئەمەیش دیاردەیەکە بەڕێکەوت نەهاتووە، بەڵکو ئیسلام لەلایەنی بیرو باوەڕەوە سەربەخۆیەو ئەمەیش بووتە هۆی ئەوەی کە سروشتێکی (بێلایەنی) وەربگرێت.

پرۆسەی بەرەو سەربەخۆیی چوونی سیاسی و بیروباوەڕی لەلایەن دەوڵەتە موسڵمانەکانەوە بەردەوام دەبێت، ئەمەیش تەنها لایەنی سیاسی ناگرێتەوە، بەڵکو بە شوێنیدا داواکاریتر دێت بۆ رزگار بوون لە کاریگەری و پاشکۆیەتی بێگانە، گەرچی رۆژهەڵاتی بێت یاخود رۆژئاوایی. ئەمە واقیعو سروشتی ئەمڕۆی ئیسلامە لە جیهاندا[١٢].

پێویستە لەسەر ئیسلام بەپێی ئەو شوێنەو ناوەندەی داگیری کردووە لەنێوان رۆژهەڵات و رۆژئاوادا لەئاستێکی هۆشیاری بەرزدا بێت بەرامبەر بەو پەیامە تایبەتیەی

---

١٢ / لەکاتی نووسینی ئەم کتێبەدا هەریەك لە پاکستان و ئێران ئەندام بوونی خۆیان هەڵوەشاندەوە لە رێکخراوی (Cento) کەسەر بە رۆژئاوایە، لەپێش ئەمەیشەوە هەریەك لە ئەندەنوسیا وسودان ومیسرو وسۆماڵ هەموو ئەو هەولانەیان رەت کردەوە کەئەدرا بۆ ئەوەی رابکێشرێتە ناو سەربازگەی رۆژهەلاتیەوە.

هەڵیگرتووە، ئەمڕۆ ئەو ئایدۆلۆژیەتە توندڕەوەو پێکدادەرانە ناتوانرێت (فرض) بکرێن بەسەر رەگەزی مرۆڤایەتیدا، بەڵکو پێویستە کە شێوازێکی نوێ وەربگرن شێوازێکی میانەڕەوو مامناوەند لەچۆنیەتی مامەڵەو هەڵسوکەوتیاندا، ئەمەوێت لێرەدا ئەوە دووپات بکەمەوە کەئیسلام زیاتر گونجاوترو هاوئاوازترە لەگەڵ ئەم شێوازە سروشیە لە بیرکردنەوەدا.

هەروەك چۆن لە رابردوودا (پردێك) بووە لە ریگەیەوە شارستانیەتە کۆنەکان گوێزراونەتەوە بۆ رۆژئاوا، پێویستە لەسەری ئەمڕۆ جارێکی‌تر هەستێتەوە بەو رۆڵە (کامة وسط) لەنێو ئەم جیهانە دابەشبووەدا، کە ئەمە بریتیە لە مانای رێگای سیەم، کە رێگای ئیسلامە لەکۆتاییدا، ئەمەوێت بەچەند وشەیەکی کەم لەبارەی خودی ئەم کارەوە بدوێم.

ئەم کتێبە کراوە بەدوو بەشی سەرەکیەوە: لە بەشی یەکەمدا بەشێوەیەکی گشتی لە مەسەلەی ئایین دەکۆڵێتەوە، بەڵام بەشی دووهەمی پێکهاتووە لە باسکردنی ئیسلام، یاخود زیاتر لایەنێك لەلایەنەکانی کە بریتیە لە: دوانگیری. جارێکی تریش ئەوە دووبارە دەکەمەوە کە ئەم کتێبە کتێبێکی لاهوتیانە نیە و نووسەرەکەیشی لەپیاوانی لاهوت نیە، ئەوەندەی ئەوەی هەوڵدانێکە بۆ وەرگێرانی ئیسلام بۆ زمانێك کە ئەمڕۆ نەوەی نوێ قسەی پێدەکات. ئالێرەوە هەڵەو کەم و کورتیەکان دروست دەبن، بێگومان هیچ وەرگێڕانێکیش نیە کامڵ و دوور بێت لە هەموو کەم و کورتیەك.

# تێبینییەکانی نووسەر

کتێبی (ئیسلام لەنێوان ڕۆژهەڵات و ڕۆژئاوادا)، کتێبی لاهوت نیە، بەڵکو کتێبێکە لەبیروباوەڕی ئیسلام و چەمك و تێگەیشتنەکانی دەکۆڵێتەوە، بە مەبەستی کەشفکردنی شوێنگەی ئیسلام لەناو چوارچێوەی فیکری جیهانیدا، ئەم کتێبە تێڕوانینێك نیە بۆ ئیسلام لە ناوەوە، بەڵکو زیاتر تێڕوانینێکە لە دەرەوەی، بەو مانایە، بابەتی ئەم کتێبە لە بنەڕەتدا لە بارەی ئیسلامەوە نادوێت وەکو مامۆستایەك، بەڵکو لە بارەی تێڕوانینی ئیسلامەوەیە بۆ جیهان.

ئەم کتێبە پێکهاتووە لە دوو بەشی سەرەکی، بەشی یەکەمیان بە ناونیشانی : چەند پێشەکیەك، کە پێکهاتووە لەبابەتی ئایین بەشێوەیەکی گشتی، بەڵام بەشی دووەمی تایبەتە بەئیسلامەوە یا بەشێوەیەکی وردتر بەیەکێك لە سیفەتەکانی ئیسلامەوە کە (دوانگیریە).

پێشەکیەکان لە ڕاستیدا بریتین لە لێکۆڵینەوەیەك لە بێباوەڕیی و مادییەت، بەڵام شەش بەشەکەی تری، لە هەڵوێستی هەریەکە لە ئایین و بێباوەڕیی دەکۆڵێتەوە سەبارەت بە بنچینەی مرۆڤو ئەو بابەتانەی پێوەی پەیوەستە، کە مەبەستم لێی کێشەی پەرەسەندن و بەدیهێنانە، بەم شێوەیەی لای خوارەوە:

بەشی یەکەم: بەدیهێنان و پەرەسەندن.

بەشی دووەم: ڕۆشنبیری و شارستانیەت.

بەشی سیەم: دیاردەی هونەر.

بەشی چوارەم: ڕەوشت.

بەشی پێنجەم: ڕۆشنبیری و مێژوو.

بەشی شەشەم: دراماو تۆپیا.

تیۆرەکەیش ئەوەیە بەپێی (منطق)ی ناوەوەی شتەکان هەریەکە لە پەرەسەندن و شارستانیەت و زانست و تۆبیا لەگەڵ بێباوەڕیدا هاوڕێکن، بەپێچەوانەیشەوە بەدیهێنان و ڕۆشنبیری و هونەرو ڕەوشت لەگەڵ ئایندا تەبان.

پەرەسەندن بەپێی سروشتی و بەچاوپۆشین لەوەی تا چ ڕاددەیەك جێگای باوەڕە

هەروەها بەپێی ئەو ماوە زەمەنییەی کە تێیپەڕاندووە نەیتوانیوە مرۆڤێك بەرهەم بهێنێت، بەڵکو تەنها گیاندارێکی نموونەیی هێناوەتە بەرهەم، یاخود وایلێکردووە کە ببێتە ئەندامێك لە کۆمەڵگەدا. سۆشیالیزم بەو مانایەی کە بەرهەمێکی کرداریی و کۆمەڵایەتی مادییەتە مامەڵە لەگەڵ مرۆڤدا ناکات، بەڵکو زیاتر لەگەڵ رێکخستنی ژیانی گیاندارێکی کۆمەڵایەتیدا خەریك دەبێت.

مرۆڤ بەپێی ئەو سیفەتە بنەڕەتیانە کە هەیەتی زیاتر رەگەزێکی رۆحیەو، رەگەزێکی بایۆلۆژی و کۆمەڵایەتی نیە، وە نایشیەتە بوونەوە ئەگەر خوای گەورە ویستی لەسەر نەبێت، لەپاش ئەوە، ئەگەر (خودا) نەبوایە ئەوا مرۆڤیش دروست نەدەبوو، ئەگەر مرۆڤیش نەبوایە ئەوا رۆشنبیریش نەدەبوو، بەڵکو تەنها پێویستیەکانە، ئەوەیش کە ئەم پێویستیانە تێر دەکات بەمانایەکی تر شارستانیەتەو هیچی تر. بیّباوەڕیی خۆی بە لایەنگیری زانست و پێشکەوتن دادەنێت[14] کەچی لەناوەڕۆکیدا بریتیە لە دژایەتی کردنی مرۆڤ هەر لەبەر هەمان هۆیشە کە دژایەتی هەریەکە لە مرۆڤایەتی و ئازادی و مافەکانی مرۆڤ دەکات. ئەو ناسازییەی کە لەنێوان رۆشنبیری و شارستانیەتدا هەیە لە واقیعدا بریتیە لەو ناکۆکیە بنەڕەتییەی لەنێوان ویژدان و عەقڵدا، لەنێوان بوون و سروشتدا، یا لەسەر ئاستێکی کرداریی لەنێوان ئاین و زانستدا.

هەموو رۆشنبیریەك لەجەوهەرەکەیدا باوەڕدارەو هەموو شارستانیەتێکیش بیّباوەڕ، لەسەر ئەم پێوانەیەیش، زانست پەرە بەلایەنی مرۆڤایەتیی نادات، لەنێوان زانست و رۆشنبیریشدا لەبنەمادا هیچ خاڵێکی هاوبەش نیە، ئایین لەلایەن خۆیەوە نابێتە هۆیەك بۆ پێشکەوتن، بە تێڕوانین و قووڵ بوونەوە لەم شیکارکردنە، ئەوەمان بۆ دەردەکەوێت کە بەشی یەکەمی ئەم کتێبە دووپاتی ئەو دوولایەنی و هەمەگیریەی جیهانی مرۆڤایەتی دەکاتەوە کە خۆی لەو ناسازییە قورس و گەورەیەدا دەبینێتەوە کە لەنێوان رۆح و جەستەو، ئایین و زانست و، رۆشنبیری و شارستانیەتدا هەیە. ئەم جۆرە تێڕوانینەش بۆ

[14] / مەبەست لەوشەی (پێشکەوتن) لەم کتێبەکەدا بەمانا (لای نووسەر) کورتکراوەی پێشکەوتن و گەشەسەندنە لەلایەنی مادییەتەوە، کە ئەمە هەمان ئەو مانایەیە کە مادیەکانو عەلمانیەکان مەبەستیانە کاتێك لەبارەی (پێشکەوتن)ەوە قسەدەکەن، کەواتە غەریب نیە ئەگەر نووسەر دایبنێت بە (دژی مرۆڤ) مادام دابڕاوە لە بەها رەوشتیو ئاینییەکان، بڕوانە شیکردنەوەی نووسەر لەبارەی ئەم فیکرەیەوە لەبەشی دووەمی ئەم کتێبەدا. (وەرگێڕ. ع).

جیهان لەوەدا رەنگ دەداتەوە کە ناودەبرێت بەو ئاستە مەسیحیەی لە هۆشیاریی مرۆڤایەتیدا هەیە. سۆشیالیزم تەعبیرە لە هەمان ئەو ئاستە لە هۆشیاریەی، گرفتەکەیش لێرەدا دەردەکەوێت، کە تەنها هەڵبژاردنەکەیشە جیاوازە، سۆشیالیزم بریتیە لە هەڵگەڕاوەی مەسیحیەت، لە ڕاستیدا تەنها جیاوازییان لەوەدایە کە سۆشیالیزم هەمان بەهاو دەستەواژە مەسیحیەکانی بەپێچەوانەوە وەرگرتووە، لەبڕی فەردییەت کۆمەڵگای وەرگرتووە، لەبری مرۆڤایەتیی پێشکەوتن و لەبری نەش و نماو پێگەیشتن هەوڵ بۆدان و راهاتن و، لەبری خۆشەویستی توندوتیژیی و لەبری ئازادیش پاراستنی تاکەکان لەلایەن کۆمەڵگاوە هەیە، هەروەها لەبری مافەکانی مرۆڤ مافەکانی کۆمەڵگاو لەبری مەملەکەتی (خوا) مەملەکەتی زەوی داناوە.

ئایا مرۆڤ دەتوانێت زاڵ بێت بەسەر ئەو ناکۆکیانەدا : ئەمەیان یاخود ئەوەیان، یا ئاسمان وەیاخود زەوی، یان مرۆڤ ناچارە بەوەی کە لەنێوان ئەو دوولایەنە ناکۆکەدا بە سەرگەردانی بمێنێتەوە؟ ئایا ئامرازێك هەیە کە زانست بەهۆیەوە بتوانێت خزمەتی ئاین و تەندروستی و خواپەرستی و پێشکەوتن و مرۆڤایەتی پێ بکات؟

ئایا ئەکرێت تۆبیایی مەملەکەتی زەوی مرۆڤانێکی لەسەر نیشتەجێ بکرێن لەبری کەسانێکی ون و بێناسنامە، هەروەها سوود لە بنەماو پێکهاتەکانی (مەملەکەتی خودا) وەربگیرێت لەسەر زەوی؟

بەشی دوومی ئەم کتێبە تەرخانە بۆ ئەم پرسیارە وەڵامەکەیشی: بەڵێ، لە ئیسلامدا. ئیسلام تەنها ئاین و ڕێبازێك نیە بەڵکو بریتیە لە بەرنامەی ڕێکخستنی بوونەوەر. ئیسلام لە پێش مرۆڤەوە هەبووە، هەروەکو قورئانی پیرۆز ئەو بنەمایانەمان بۆ روون دەکاتەوە کە مرۆڤی لەسەر دروست کراوە وەك تەواوکارێکی شتەکانی تر.[15]

پاشان ئەو پێکەوە گونجانە (فطري)یە دەبینینەوە لەنێوان مرۆڤ و ئیسلامدا، یاخود ئەوەی کە لەم کتێبەدا بە "مرۆڤ دۆستی" ی ئیسلام ناوبراوە.

وەکو چۆن مرۆڤ پێکهاتووە لە رۆح و جەستە، بەهەمان شێوە ئیسلام یەکەیەکە لەنێوان ئاین و ڕژێمی کۆمەلایەتیدا، وەکو چۆن جەستە لەکاتی نوێژکردندا ملکەچە بۆ جوڵانەوەی

---

[15] /﴿ فاقم وجهك للدين حنيفا فطرة الله التى فطر الناس عليها لاتبديل لخلق الله ذلك الدين القيم ولكن اكثر الناس لايعلمون ﴾ الروم /٣٠.

ڕۆح، ڕژێمی کۆمەڵایەتیش بەو پێیە دەتوانێت خزمەت بە نموونە باڵاکانی ئایینو ڕەوشت بکات، ئەم یەکبوونە هەم لە مەسیحیەت و هەم لە مادییەتیشدا غەریبە، سیفەتێکە لە ئیسلام، بەڵکو ئەمە یەکێکە لە تایبەتمەندترین تایبەتمەندیەکانی ئیسلام.

بەشی دووەمی ئەم کتێبە تەرخانە بۆ ئەم فیکرەیەی کە باسی لەبارەوە دەکەین، لە ڕێگەی زنجیرەیەك گفتوگۆوە لە بوارەکانی ئایین و یاساو ڕۆشنبیری و مێژووی سیاسیدا، ئەم بەشە بەوە دەست پێ دەکات بە بەراوردکردنێك لەنێوان پەیامەکانی (موساو عیساو موحەممەد) دا (دروودی خوایان لەسەر بێت) کە لە سێ وەڵامی (مبدء)یانەدا خۆیان دەبیننەوە بۆ مامەڵەکردنی لەگەڵ ڕەگەزی مرۆڤایەتیدا بە درێژایی مێژوو، لەکاتێکدا کە قورئانی پیرۆز پێکهاتەیەکی بێ وێنەیە کە واقیعیەتی (العهد القدیم) لەگەڵ نموونەیی (العهد الجدید) لەخۆیدا کۆکردوەتەوە.

لە بەشی هەشتەمدا شیکردنەوەیەك هەیە لەبارەی پێنج پایە سەرەکیەکانی ئیسلامەوە کە نوێژ یەکێکە لە پایە هەرە سەرەکیەکانی.

لەڕاستیدا نوێژ جەوهەری هەموو ڕێساو تەوەرەی بنچینەیی ئیسلامە بەشێوەیەکی گشتی، وەکو سەرەڕمێك وایەو پارێزەری لایەنەکانی تریەتی. ئەمەیش بۆ ئەوە دەگەڕێتەوە کە نوێژ دوو (مبدء) لەیەك چوارچێوەدا کۆدەکاتەوە، کە بە تێڕوانینی مەسیحیەت ئەو دووانە دوولایەنی ناسازو بەیەك نەگەیشتوون، مەبەست لێیان دەست نوێژو نوێژکردنە. ئەم دوو (مبدء)ە بەقووڵی بەنێو بونیادی ئیسلامدا ڕۆچوون. عەقڵانیەت ڕەفزی لایەنی مەعنەوی دەکات لە تێڕوانینیدا بۆ ناوەوەی خود کە ئەمەیش دەبێتە هۆی داخستنی دەرگای عەقڵ و (تێکدانی هاوسەنگی لە نوێژدا) هەموو توندڕەویەکی یەك لایەنەیش لەم بوارەدا بکرێت دادەنرێت بەدابەزینێك بۆ ئاست هۆشیاری مەسیحیەت و، تێکدانێکە لە تەوەرە سەرەکیەکەی ئیسلامدا.

ئەگەر ئیسلام نمایشی توانستە (فطري)یەکانی مرۆڤ بکات، کەواتە پێویستە کە دەرکەوتنێك هەبێت ئیتر ئەگەر ئەم دەرکەوتنەیش بەشێوەیەکی ناتەواو بێت و یاخود لە

شێوەی پریشکێکدا بێت لێرەو لەوێ، وەکو دەبینین کە ئایین پەروەران ڕۆڵی کاریگەری خۆیان لە یاد نەکردووە لەم جیهانەدا.[16]

نووسەریش هەستی بەهۆکارەکانی ئەم دیاردەیە کردووە بەتایبەتی لەجیهانی ئەنگلۆ ساکسونیدا. وەکۆتایی کتێبەکەی بە وتەیەك دەهێنێت کە بریتیە لە تەسلیمبوونی تەواوەتی بۆ پەروەردگارو بەو مانایەی کە بریتیە لە ڕۆحی ئیسلام.

[16] / ﴿ وابتغ فيما آتاك الله الدار الآخرة ولا تنس نصيبك من الدنيا وأحسن كما أحسن الله إليك ولا تبغ الفساد في الأرض إن الله لا يحب المفسدين ﴾ الأنبياء/٧٧.

# دەروازەی یەکەم

# پێشەکیەکان

# چەند تێڕوانینێک دەربارەی ئایین

## بەشی یەکەم

## بەدیهێنان و پەرەسەندن

﴿ مرۆڤ تەنها بەو شێوەیە نیە، داروین باسی دەکات، گەردوونیش تەنها بەو شێوەیە نیە، نیوتن باسی دەکات ﴾.

# داروین و مایکل ئەنجیلۆ

کێشەی (بنچینەی مرۆڤ) بەردی گۆشەی هەموو فیکرەو بیروبۆچوونێکە. هەموو لێکۆڵینەوەیەك کە لەبارەی چۆنیەتی ژیانی مرۆڤەوە بێتە ئاراوە، وامان لێ دەکات بگەڕێینەوە بۆ بنەڕەت و مەسەلەی بنچینەی مرۆڤ. لێرەدا ناسازیەك لەنێوان ئەو وەڵامانەدا دروست دەبێت کە هەریەکە لە ئاین و زانست پێشکەشمان دەکەن. کە ئەمە لە زۆربەی کێشەکانی تریشدا هەستی پێ دەکرێت.

زانست وا دەڕوانێتە (بنچینەی مرۆڤ) کە لە ئەنجامی کردارێکی دوورو درێژخایەنی پەرەسەندنەوە لەنزمترین شێوازەکانی ژیانەوە دەستی پێکردبێت، لەوێدا هیچ جیاوازیەکی ئاشکرا لەنێوان مرۆڤ و ئاژەڵدا بەدی ناکرێت. تێڕوانینی زانست بۆ گرۆی بەشەری بە بۆچوونی زانست بەهۆی هەندێ حەقیقەتی ماددی و دەرەکییەوە بووەتە مرۆڤ: ڕۆیشتنی لەسەرپێی و، دروستکردنی ئامێرەکان، بەردەوام بوونی بەهۆی زمانێکەوە کە دەتوانێت قسەو باسی پێ بکات. مرۆڤ لێرەدا دەبێتە دەستکردێکی سروشت و هەمیشە وەکو بەشێك لە ئەو دەمێنێتەوە.

لەلایەکی ترەوە، ئاین و هونەر باس لە بەدیهێنانی مرۆڤ دەکەن، بەدیهێنان پرۆسەیەك نیە کە سروشت پێی هەستابێت بەڵکو بریتیە لە ویست و کردەوەیەکی خوایی.. شتێك نیە کە لەئەنجامی بەردەوامیەوە پێگەیشتبێت، بەڵکو کردەیەکی کتوپڕەو خودا بە دەسەڵاتی خۆی بەدیهێناوە کردەیەکی ئازاردەرو کارەساتبار بووە. مرۆڤیش چ بەرهەمی پەرەسەندن بێت، یا بەدیهێنراوێکی خواوەند بێت، لە هەردوو حاڵەتەکەدا ئەم پرسیارە بە نە سەلمێنراوی دەمێنێتەوە : ئایا مرۆڤ چیە؟ وە ئایا مرۆڤ بەشێکە لەم جیهانە یاخود شتێکی ترەو جیاوازە لەو؟

ماددیەکان دەڵێن: مرۆڤ بریتیە لە ئاژەڵێکی کامڵ (L'homme machine) وە جیاوازی نێوان مرۆڤ و ئاژەڵ جیاوازییە لە پلەدا نەك لە جۆردا، وە جەوهەرێکی جیاکەرەوە

نیە کە جۆرە تایبەتمەندیەك بە مرۆڤ ببەخشێت[17]. ئەوەی کە هەیە بە تەنها بریتیە لە (فیکرەیەکی مێژوویی و کۆمەڵایەتی دیاریکراوە لەلایەن مرۆڤەوە) و (مێژووی ئابووری و کۆمەڵایەتیش بە تەنها مێژوویەکە نزیك بێت لە حەقیقەتەوە).[18]

(مرۆڤ بریتیە لە سیستەمێك وەکو سیستەمەکانی تر لە سروشتدا، کە ملکەچە بۆ یاسا سروشتی و گشتی و حەتمیەکان[19] وەپەرەسەندنی مرۆڤیش کارتێکراوە بەحەقیقەتێکی بابەتی دەرەکی. کە بریتیە لە کار، یاخود وەکو فریدریك ئینگلز دەڵێت : (مرۆڤ بەرهەمی ژینگەو کارەکەیەتی). دروستبوونی مرۆڤیش تەنها بریتیە لەکردارێکی بایۆلۆژی دەرەکی کە چەند حەقیقەتێکی رۆحی و دەرەکی دیاریی دەکات.

بۆ نموونە دەست دەبێتە پاڵنەرو هۆکاری پەرەسەندنی ژیانی دەروونی...

(دۆزینەوەیشی لەگەڵ دۆزینەوەی زماندا ڕادەی کۆتایی مێژووی ئاژەڵیەتی و سەرەتای دەست پێکردنی ژیانی مرۆڤانەیەتی).[20]

ئەم فیکرەو بیروبۆچوونانە ڕەنگە لە ڕووکەشدا تا ڕێژەیەك قەناعەت پێکەرین، بەڵام ئەوەی کەتێدا روون و ئاشکرا نیە کە ئەمە لەهەمان کاتدا ئینکار کردنێکی بنەڕەتیانەی خودی مرۆڤە.

لەفەلسەفەی مادییەتدا مرۆڤ دابەش دەکرێتەوە بۆ ئەو بەشانەی کە لێی پێکهاتووە، پاشانیش لەکۆتاییدا لەناودەچێت، ئینگلز دەڵێت: مرۆڤ بەرهەمی پەیوەندیە کۆمەڵایەتییەکانە یابەشێوەیەکی وردتر بریتیە لەبەرهەمی ئەو ئامێرە بەرهەمهێنەرانەی کە هەن.

مرۆڤ شتێك نییە باسی بکرێت، وە ئەو هیچی بەدی نەهێناوە، بەڵکو بەپێچەوانەوە ئەو بەتەنها بریتیە لە بەرهەمی چەند حەقیقەتێکی دیاریکراو.

---

[17] / (جۆن واتسون) لە گۆڤاری (النفسیة)دا دەڵێت: **(Psychological review No.20 (19B) p.158)** (لەنێوان مرۆڤو گیانلەبەرانی تردا هیچ هێڵێکی جیاکەرەوە نیە).

[18] / جیورجی لوکاکس Gyorge lakacs: Existentialism or maxism in: European realism, trans. Edith Bone (London: Hillway publishing Co. 1950).

[19] / ایڤان پاڤلوف Evan P. Pavlov: Eperimental Psychology. Essays in Psychology and Paychiatry (New Yourk: Citadel press. 1962).

[20] / هـ بر: **H. Berr, in his introduction to Lewis H. Morgan: Ancient society Chicago: C.H. Kerr, 1907).**

(داروین) هاتووە وەرچەرخانی ئەم مرۆڤە (اللاشخصی)یەی بەوە پێناسە کردووە کە بەهۆی کرداری (هەڵبژاردنی سروشتیەوە) بەرزبووەتەوەو هەتا وای لێهاتووە بووە بە مرۆڤێك کە توانای قسەکردن و دروستکردنی ئامێرەکانی هەبێت و هەروەها بتوانێت بە رێکوپێکی لەسەر پێیەکانی بڕوات، پاش ئەوە زانستی بایۆلۆژی دێت بۆئەوەی وێنەکەمان بۆ تەواو بکات و، ئەو وامان نیشان دەدات کە هەمووشتێك دەگەڕێتەوە بۆ شێوە سەرەتاییەکەی ژیان ئەمەیش لەخۆیدا کردارێکی سروشتی کیمیاویە..و یاریکردنێکە بە (گەردیلە)کان.

بەڵام ژیان و ویژدان و رۆح.. لەبەرئەوەی بوونێکی دەرەکیان نیە، لەدوای ئەمەیشەوە هیچ جەوهەرێکی مرۆڤایەتی بوونی نابێت.

ئەگەر وازمان لەم لایەنە زانستیە تیژە هێنا، کە شێوازێکە ڕەنگە بەئاسانی لێی تێبگەیت، هەرچەندە رەنگە تووشی (کآبة)ت بکات (ئەگەر وازمان لەم لایەنە هێناو لامان دایەوە بەلای کەنیسەی (سیکستین)داو لەو تابلۆ گەچیانەی (مایکل ئەنجیلۆ) راماین کە لەناو ئەو کەنیسەیەدا نەخشاندوونی کە نمایشی مێژووی مرۆڤ دەکەن هەر لە دابەزینیەوە بۆ سەر زەوی هەتاوەکو رۆژی دوایی، ئەوا سەرسوڕمانێکی زۆر ڕوومان تێ دەکات سەبارەت بەماناکانی ئەو وێنانە، وە ئەگەر پرسیارمان کرد: ئایا ئەو وێنانە بەڕاستی هیچ حەقیقەتێکیان تێدایە لەبارەی ئەو بابەتە گەورەیەوە کە وێنای کردووە؟ ئەگەر وابێت، ئەوا ئەو حەقیقەتە کامەیە؟.. بەشێوەیەکی وردتر: بەکام مانا دەتوانرێت کە ئەو وێنانە بەگشتی حەقیقەتێك پێك بهێنن... ؟

درامای گریکی و، خەونەکانی (دانتی) لەبەهەشت و دۆزەخداو گۆرانیە ئاینییە ئەفەریقیەکان و، دەرکەوتنی (فاوست) لە ئاسمان و، دەمامکی (الملانیزیة) و، تابلۆ گەچیەکانی یابانی کۆن و وێنە نوێیەکان ـ هەموو ئەمانە ئەگەر بەبێ رێکخستنێکی دیاری کراو وەریان بگرین، ئەوا لەناوەڕۆکیاندا هەموویان یەك دەلالەتیان هەڵگرتووە. کە بە ئاسانی ئەوەمان بۆ دەردەخەن کە ئەمانە هیچ پەیوەندییەکیان بە مرۆڤەکەی (داروین)ەوە نیە، بەهیچ شێوەیەکیش خەیاڵ ناتوانێت بەرەو ئەوەمان بەرێت کە ئەمانە بەرهەمی ئەو سروشت و ژینگەیەن کە تێیدا ژیاون. ئەمە چ جۆرە هەستێکە بەرامبەر بەبیرکردنەوەی ئاینی ڕزگارکەر؟ ئەو تەعبیرە تراژیدیانە مانای چ دەگەیەنن؟ وە چ شتێکی تراژیدی هەیە

لە ژیاندا کە تەنها لە ئەنجامی ئاڵوگۆڕێکەوە دروست بووبێت لەنێوان بوونەوەرێکی زیندوو وە لەگەڵ سروشتدا؟ ئایا (ئێرنست نایزفستنی) بە چاوی عەقڵ چی بینی کاتێک کە وێنای دۆزەخەکەی دانتی کێشاوە؟ بۆچی ترس لەنێوان هەموو شتێکی زیندوودا هەیە، کە مادام مرۆڤو ژیان لە بنچینەدا هەردووکیان بەرهەمی یەک سروشت بن؟

ئەم پرسیارە وامان لێ دەکات گومان لەوە بکەین کە ئایا ئەو وێنانەی زانست کێشاونی تەواوو کاملن؟ زانست تەنها وێنەیەکی فۆتۆگرافی وردمان پێدەبەخشێت سەبارەت بە جیهان، ئەو وێنە کەمتر دەتوانێت ڕەهەندە جەوهەرییەکەی واقیع بخاتە ڕوو.

زانست بەوە جیادەکرێتەوە کە سروشت و تێگەیشتنێکی هەڵەی هەیە بۆ هەموو ئەوانەی کە زیندوون و هەموو ئەوانەی کە (انسانی)ن. ئەو بەتەنها بەلۆژیک و لێکۆڵینەوەی ڕووتی خۆی وا لە ژیان دەکات کە خاڵیی بێت لە ژیان، وە وا لە مرۆڤ دەکات کە خاڵیی بێت لە مرۆڤایەتیی. زانست لە پەیوەندیدا لەگەڵ مرۆڤ کاتێک بوونی دەبێت کە مرۆڤ خۆی بەشێک بێت لە جیهان وە یا بەرهەمی ئەو بێت ـ بەمانایەکی تر، کە بەتەنها شتێک بێت. بەپێچەوانەی ئەمەیشەوە هونەر کاتێک پەیدادەبێت کە مرۆڤ جیاوازبێت لە سروشت و غەریب بێت تێیدا دەبێت مرۆڤ ناسنامەی جیاوازتربێت. هەموو هونەرێکیش ئەو چیرۆکەمان بۆ دەگێڕێتەوە کە پەیوەندی بەغەریبی مرۆڤەوە هەیە لە سروشتدا.

بەو شێوەیە، ئەوەی پەیوەندی بەو پرسیارەوەیە لەبارەی بنچینەی مرۆڤەوە، ئەوەیە کە زانست و هونەر هەردووکیان لەسەر هێڵێکی ڕووبەڕووبوونەوەی حەتمی و تەواو دەوەستن.

زانست ئەو حەقیقەتانە بەبەڵگە دەهێنێتەوە بۆ ئەوەی لەو ڕێگەیەوە بەهەر شێوەیەک بووە ئەوە بسەلمێنێت کە مرۆڤ بەشێوەیەکی پلەپلەیی پەرەی سەندووەو لە ئاژەڵەوە بووە بە مرۆڤ. بەڵام هونەر وا مرۆڤ نیشان دەدات کە بەشێوەیەکی بزوێنەرو سەرنج ڕاکێش لەجیهانێکی نادیارەوە هاتبێت. زانست ئاماژە بۆ (داروین)و تیۆرە دۆزخیەکانی دەکات، بەڵام هونەر ئاماژەی بۆ (مایکل ئەنجیلۆ)و ئەوکارە جوانو بڵندانەی دەکات کە لەسەر دیوارەکانی کەنیسەی سیکستین نەخشاندوونی.[21]

---

[21] / بیرۆکەی پەرەسەندن هەمیشە پابەندبووە بە بێباوەڕییەوە، وە ئەو بیرۆکە سەرەتاییانەی بەدەرکەوتن لەبارەی بنچینەی جۆرەکانەوەو لەناوچوونیان لەلایەن شاعیری ڕۆمانی (لوکر تیوس) کە ناسراوبوو بە بیرۆکە بێباوەڕییەکانیو بە مەزهەبی چێژوەرگرتن. بڕوانە (تیتوس کاروس لوکرتیوس): Titus Carus Lucretius De rerum natura, trans. W.H.D. Rouse, 3rd. edition (Cambridge, MA; Harvard University press. 1937).

داروین‌و مایکل ئەنجیلۆ نمایشی دوو فیکرەی جیاوازو دوو حەقیقەتی ناکۆك دەکەن دەربارەی مرۆڤ. کە هیچ کامێکیشیان ناتوانێت بەسەر ئەوی تردا سەربکەوێت چونکە ئەمیان پشت بەکۆمەڵێکی زۆر حەقیقەت دەبەستێت کە ناتوانرێت بەدرۆ بخرێتەوەو نکولیان لێ بکرێت، لەکاتێکدا ئەوی تریان جێگیرو چەسپاوە لە دڵ و دەروونی هەموو مرۆڤێکدا. لێرەدا دەتوانرێت دوو حەقیقەتی ناکۆك دەستنیشان بکرێت لە مرۆڤدا کە لە سەرجەمی بوونەوەرانی تری جیادەکاتەوە، وە بە ئاوێتەکردنیان بەیەکەوە دەتوانرێت کە وێنەو حەقیقەتێکی تەواومان پێ ببەخشێت دەربارەی مرۆڤ.

پێناسەکردنی مرۆڤ بەوەی کە (کائن)ێکی بایۆلۆژییەو هەڵگری چەند سیفەتێکی ئاژەڵییە لە خۆیدا، ئەم پێناسەیە لە پێش (داروین) و هەروەها لە پێش (دی لامارك) (De Lamark)ەوە لە ئاییندا باسی هاتووە، یان دەڵێت ئاژەڵیەتی لایەنێکە لە لایەنەکانی مرۆڤ بەڵام جیاوازییەکە لە ڕێژەی گشتگیریەتیەکەی ئەو لایەنەدایە.

بە وتەی زانست : مرۆڤ لە ئاژەڵێکی زیرەك زیاتر نیە، ئاینیش دەڵێت: مرۆڤ گیاندارێکە کە کەسایەتییەکی (ذاتي) و تایبەتی پێ بەخشراوە.

با ئەوەیشمان لەبیر نەچێت وشەی (مرۆڤ) لە عەقڵماندا دوو مانای لەخۆ گرتووە، کاتێك دەڵێین (ئێمە مرۆڤین) بەواتای ئەوەی تاوانبارو لاوازین. بەڵام کاتێك دەڵێین: (با مرۆڤ بین) وەك یادخستنەوەیەك بۆ ئەوەی بزانین ئێمە بوونەوەرێکی باڵاترین و پێویستە لەسەریشمان کە پابەندبوونەکانیشمان باڵا بێت، وەئەرکیشمان ئەوەیە نابێت کە خۆپەرست و خوو نزم بین، وەکو حەزرەتی مەسیح (دروودی خوای لەسەر بێت) کاتێك کە ڕەخنە لە (القدیس) بطرس دەگرێت دەفەرموێت : (تۆ بەتەنها بیر لە مرۆڤ دەکەیتەوە) وە هەموو ئەولەویەتێکی پێدەبەخشیت لەو شتانەدا کە (الهی)ن.

هەردوو زاراوەی (مەزهەبی مرۆڤی) و (هیومانیزم) هەردووکیان لە وشەی مرۆڤەوە وەرگیراون و هەڵگری دەلالەتێکی ڕەوشتی بەرزن. دوو واتایی ئەو فیکرەیەشی کە پەیوەندی بەناوی مرۆڤەوە هەیە لە ئەنجامی دوانیەتی سروشتی مرۆڤەوەیە، کە یەکێکیان لە زەوی و ئەوی تریشیان لە ئاسمانەوە هاتووە.

ماددیەکان هەوڵی ئەوەیان داوە کە ڕوانینمان بەرەو لایەنی دەرەکی شتەکان بگۆڕین. ئینگلز دەڵێت: (دەست بەتەنها ئەندامێکی کارکردن نیە، بەڵکو لەهەمان کاتدا خۆیشی لە

ئەنجامی کارکردنەوە بەرهەم هاتووە.. لە ڕێگەی کارکردنەوە دەست ئەو شێوە جوان و ڕێك و پێکەی وەرگرتووە کەبتوانێت تابلۆکانی (رافاییلو) (Rafaello)و، پەیکەرەکانی (پور ڤالدسن) (Thovaldsey)و، مۆسیقای (باجانینی) (Payanini) پێ بەرهەم بهێنێت[٢٢].

ئەوەی کە (ئینگلن) باسی لێوە دەکات بریتیە لە بەردەوام بوونی گەشەی بایۆلۆژی نەك گەشەکردنی رۆحی. هونەری وێنەکێشان کارێکی زیاتر رۆحیە لەوەی کارێك بێت بەتەنها بەدەست ئەنجام بدرێت. (رافائیل) تابلۆکانی زیاتر کارێکی رۆحین لەوەی کارێکی دەستی بن. (بتهۆڤن) گەورەترین کارە مۆسیقیەکانی لەپاشی کەربوونی نووسیوەتەوە. گەشەی بایۆلۆژی بەتەنها ئەگەر درێژبکرێتەوە بۆ هەتاهەتایە ناتوانێت نموونەی تابلۆکانی (رافائیل)مان پێ ببەخشێت، یاخود ئەو وێنە سەرەتاییانەی کە لەناو ئەشکەوتەکاندا لە چاخەکانی لەپێش مێژوو بەدیارکەوتوون. لێرەدا ئێمە لەبەردەم دوولایەنی جیاوازداین لە بوونی مرۆڤدا. پێکهاتەی مرۆڤ بەتەنها کۆمەڵە کارو فەرمانێکی بایۆلۆژی جیاواز نیە. بەهەمان شێوەیش سەبارەت بە تابلۆیەکی هونەری، ناکرێت شیبکرێتەوە بۆ چەندیەتی ئەو رەنگانەی تێیدا بەکارهاتووە، هەروەها قەسیدەیەکیش بۆ ئەو وشانەی لێی پێکهاتووە، راستە مزگەوت بونیادنراوە بە ژمارەیەکی دیاریکراو لە بەردو تەختەو پایە بەشێوەیەکی دیاریکراوو بەنەخشەیەکی دیاریکراو داڕێژراوە،.. لەگەڵ ئەوەیشدا، ئەمە هەموو حەقیقەتێك نیە دەربارەی مزگەوت، لەپاش هەموو شتێك جیاوازی لەنێوان مزگەوتو سەربازگەیەکی جەنگیدا هەیە، رەنگە بتوانرێت لێکۆڵینەوەیەکی زمانەوانی تەواو لەبارەی قەسیدەیەکی (گۆتە)وە ئەنجام بدرێت کەچی ناتوانرێت یەك هەنگاو لە جەوهەری قەسیدەکە نزیك ببیتەوە.

فەرهەنگێکی زمانەوانی هەموو وشەکانی زمانی بەشێوەیەکی زۆر ورد تێدایە، بەڵام قەسیدەیەك کەبەهەمان زمان نووسرابێتەوە رەنگە بەشێکی کەم نەبێت وشەکانی لە لەفەرهەنگێکدا نەبێت، فەرهەنگ هەژارە لەبەردەم دۆزینەوەی ڕێچکەی قەسیدەدا، هەروەها قەسیدە هەڵگری کۆمەڵێك ماناو جەوهەرە کە ناتوانیت پێیان بگەیت. زانستی هەڵکۆڵینو

[٢٢] / فردريك ئينگلز Friedrich Engles: The part played by labour in the transition from Apetoman, Dialectrics of nature, ed. clements Datt (Londonilaurence and wishart, 1941).

زانستی مرۆڤناسی و زانستی دەروونناسی، هەموویان زانستگەلێکن کە تەنها پێناسەی لایەنی دەرەکی مرۆڤ دەکەن کە ئەمانە بەتەنها هیچ مانایەك ناگەیەنن، مرۆڤ وەکو تابلۆیەکی هونەریی یاخود وەکو مزگەوتێك یا قەسیدەیەك وایە، زیاترە لەو چەندیەتی و چۆنیەتیەی کە لێی پێك هاتووە، مرۆڤ زیاترە لە هەموو ئەو زانیاریانەی کە زانست لەبارەیەوە دەیانڵێت.

# میثالیەتی ئەسلی

بەپێی تیۆری پەرەسەندن، باوە گەورەی مرۆڤ بریتیە لە جۆرێك گیاندار کە لە جۆرەکانی تر زیاتر پێشکەوتووترە. بەڵام ئەگەر ڕۆیشتین و بەراوردمان لەنێوان مرۆڤێکی سەرەتایی و ئەو گیاندارانەدا کرد کە لە هەموولایەنێکەوە زیاتر پێش کەوتووترن، ئەوا بۆمان دەردەکەوێت کە جیاوازیەکی جەوهەریی و بنەڕەتی لەنێوانیاندا هەیە. بۆ نموونە بڕوانە ژیانی ئەو گیاندارانەی کە بەشوێن خواردن و بژێویدا دەگەڕێن و ململانێ لەپێناو مانەوەیاندا دەکەن، پاشان بڕوانە مرۆڤێکی سەرەتایی دەبینیت مرۆڤێکی ترسنۆکو شپرزەیە، هەروەها خاوەنی بیرو باوەڕو جیهانبینیەکی غەریبەو نوقمە لەنێو کۆمەڵێك نهێنی جۆراوجۆرو جۆرەها هێمای ئاڵۆزدا. ئەم جیاوازییە لەنێوان ئەو دوو کۆمەڵەیەدا ناتوانین بیگێڕینەوە بۆ تەنها جیاوازیەك لە قۆناغەکانی پەرەسەندندا.

ئێمە دەڵێین ڕاستە مرۆڤ پەرەیسەندووە، بەڵام پەرەسەندن تەنها تایبەتە بە مێژووی مرۆڤ لە ڕووە دەرەکیەکەیەوە، مرۆڤ بەهەمان شێوە دروستکراوێکە، ئەوە لەهۆشیدا چەسپاوە کەبەتەنها ئەوە نیە کە جیاوازی هەبێت لە گیاندارێکی ترو تەواو، بەڵکو مانای ژیانیشی نایەتەدی بەبێ نکوڵیکردنی ئەو ئاژەڵیەی کە لەناویدایە. ئەگەر مرۆڤ –وەکو دەڵێن– بەرهەمی سروشت بوایە، چۆن لەدواییدا دەستی دەکرد بە دژایەتیکردنی سروشت؟ یا گریمان پەرەسەندنی زیرەکی مرۆڤ گەیشتووەتە بەرزترین پلە، دەبینین پێداویستیەکانیشی زیاتر دەکات لەهەردوو لایەنی جۆرو چەندیەوەو هیچیشی لێ نافەوتێت، بەڵکو تەنها شێوەی تێرکردنی ئەو پێداویستیانەی زیرەکانەو ڕێکو پێکتر دەبێت.

بەڵام بیرۆکەی ئەوەی کە مرۆڤ خۆی لەپێناوی کەسێکی تردا بەخت بکات، یاخود هەندێ لە خواست و ئارەزووەکانی واز لێ بهێنێت، یا ـ چێژو لەزەتە جەستەییەکانی کەم بکاتەوە، هەموو ئەمانە هیچیان پەیوەست نین بە بڕیاردانی عەقڵەوە.

بنەمای بوونی ئاژەڵ بریتیە لە توانست و سوودبەخشین بەڵام بەنیسبەت مرۆڤەوە بەو شێوەیە نیە، بەتایبەتی ئەوەی کە پەیوەندی بەخەسڵەتە مرۆڤایەتیەکانیەوە هەیە. غەریزەکانی ئاژەڵ باشترین نموونەن لەسەر (بنەما)ی توانست و سوودبەخشین. ئاژەڵ

هەستێکی زۆر وردو وریاتری هەیە لە مرۆڤ سەبارەت بەزانینی کات، نموونەی زۆریش هەیە لەو بارەیەوە، ریشۆڵە پێش کاتژمێرێك لە ئاوابوونی رۆژ واز لە خواردن دێنێت. هەنگ رۆژانە کارەکانی بەشێوەیەکی زۆر سەرسوڕهێنەرانە ڕێك دەخات. زۆربەی گوڵەکانیش رۆژانە بۆن و بەرامەیان لەچەند کاتێکی دیاریکراودا بڵاودەکەنەوە کە هەنگەکان لەو کاتانەدا دەڕۆن بۆ هەڵمژینی شیلەکانیان، ئەوکاتی شیاوو باشترین جێگا دیاری دەکات، بۆ دیاریکردنی ئاڕاستەی شوێنیش نیشانەی جۆراوجۆر لەسەر زەوی بەکار دەهێنێت. وەکو دیاریکردنی جێگای هەتاو لە ئاسماندا. کاتێکیش ئاسمان بە هەور دادەگیرێت هەنگ پشت بە جەمسەرگیریی تیشکی رۆژ دەبەستێت لە ڕێگەی راکێشانەوە.. وە بەو شێوەیە.

ئەمانە ئەو توانایەن کە لەم جیهانەدا یارمەتی زیندەوەران دەدەن و وایان لێ دەکات کە بتوانن بمێننەوەو لەژیاندا بەردەوام بن.

بەپێچەوانەی ئەمەوە دەبینین کە بنەما رەوشتیەکان لە هەموو کۆمەڵگایەکی سەرەتایی و هەروەها پێشکەوتوویشدا، لە هێزو توانایی مرۆڤ کەم دەکەنەوە، ئەگەر دوو جۆر بوونەوەرمان هەبوو کە هەردووکیان لەیەك پلەی زیرەکیدا بوون، ئەوا ئەو جۆرەیان کە خاوەنی بنەما رەوشتیەکان بێت ئەوەیان خێراتر روو لە هەڵوەشان دەکات. مرۆڤ ئەو کەم تواناییەی - کە لەئەنجامی پابەندبوونیەوە بە بنەما رەوشتیەکانەوە بۆی پەیدا بووە - لە زیرەکی و تواناکانی تری هاوشێوەیدا باربۆی دەکاتەوە.

هەرچۆنێك بێت - ئەوا ئەسڵی زیرەکی ئاژەڵیە نەك مرۆڤیی - لێرەدا دەرگای کۆمەڵێك چیرۆك دەکەینەوە سەبارەت بە زیرەکیی ئاژەڵ کە بۆمان دەردەکەوێت لە تەنیشت ئەو جۆرە رەفتارانەوە کە دەکرێت تەفسیری ئەوەیان بۆ بکرێت کە لاسایی کردنەوە یاخود دووبارە کردنەوەی وێنەی پێشوون، جۆرە رەفتارێکیتر هەست پێ دەکرێت کە ناکرێت دانیان پێدا نەنرێت بەوەی کە رەفتارێکی زیرەکانەن، لێرەدا دەتوانین ئەوە بڵێین کە هەموو رەفتارێك لە بنچینەدا بریتیە لە (فکرە)یەکی پێشەسازیی ئیتر ئەگەر لەلایەن گیاندارانەوە

ئەو ئامرازانە دروست کرابێت یاخود ئەو ئامێرانەی بەکارهێنابێت کە مرۆڤ دروستی کردوون.[٢٣]

مەیمونی شەمپازی دارێك وەکو گۆچان بەکاردەهێنێت بۆ لێکردنەوەی هێشووی مۆز، هەروەها ورچ بەرد بەکاردەهێنێت لەکاتی ڕاوکردنی نێچیرەکەیدا. بەڵگەی زانستی زۆر کۆکراوەتەوە لەسەر ئەوەی چۆن هەنگ و قازو مەیمونەکان زانیاری جۆراوجۆر لە یەکتری وەردەگرن لە ڕێگەی قسەکردنەوە یاخود لە ڕێگەی نواندنی جموجوڵەوە.[٢٤] (د.بلیر) Dr. Bler بەڕێوەبەری باخچەی گیاندارانی نیویۆرك کۆمەڵێك تێبینی گرنگی کۆکردۆتەوە دەربارەی زیرەکی گیانداران و بەتواناییان لە بەکارهێنانی ئەو شتانەی کە لێیەوە نزیکن. کە بە گشتی ئەنجامی ئەو تێبینیانە ئەوە دەگەیەنن کەگیانداران توانایی بیرکردنەوەیان هەیە.

بەو شێوەیە، زمانیش زیاتر بەلای سروشتی ئاژەڵیدا دەشکێتەوە لەوەی کە لەلایەنی رۆحی مرۆڤەوە نزیك بێت، ئێمە شێوەیەك لەشێوە سەرەتاییەکانی زمان لەلای ئاژەڵ بەدی دەکەین. زمانەوانی -بەپێچەوانەی هونەرەوە- دەتوانرێت بەشێوەیەکی زانستیانە شیبکرێتەوە، بەڵکو بەیارمەتی بەرنامە بیرکارییە زۆر وردەکانیشەوە، کە ئەمەیش خەسڵەتی زانستیانە دەبەخشێتە زمانەوانیو، بابەتی زانستیش کاتێك مومکین دەبێت بەتەنها، ئەگەر هاتوو شتێکی دەرەکی بوو.[٢٥]

لێرەدا پەیوەندیەك لەنێوان زیرەکی و سروشتو لەنێوان زیرەکی و زماندا هەیە لەکاتێکدا هەریەکە لە زیرەکی و ماددە یارمەتی دروستکردنی یەکتری دەدەن، بەهەمان شێوە هەریەکە لە زیرەکی و زمانیش دەبنە یارمەتیدەری یەکتری. زمان بریتیە لە (دەستی

[٢٣] / هنری برگسون Henri Bergson: Creative Evolution,trans. Arthar mitchell, (New Yourk; The modern library, 1944).

[٢٤] / بڕوانە لێکۆڵینەوەکانی پڕۆفیسۆر غروشو زنکن بەتایبەتی (کوانراد لورنز): Konrod Lorenz: King Solomon's King: New light in animal wags, trans, marjorie kerr wilson (New Yourk: Crewell, 1952).

[٢٥] / ئاماژە بەوە، دەبینین لە هەندێ لە ئایینەکاندا قسە نەکردن بەمانای رۆژوو گرتن دێت بۆ نموونە: (بێ دەنگ بوون) کە لە هەندێ مەزهەبی مەسیحیدا هەیە.

مێشك) یاخود وەکو برگسون دەڵێت: (کاری مێشك لەوەدا کۆدەبێتەوە لە دیاریکردنی ژیانی ڕۆحیانەماندا لەو چوارچێوەیەدا کەچی سوودبەخشە بۆمان لەلایەنی کردارییەوە).[٢٦]

بەشێوەیەکی گشتیی، لە مرۆڤدا شتێك نیە کە بەهەمان شێوە بوونی لە ئاستە بالاکانی تردا نەبێت لە گیانداران و بڕبڕەدارەکان و جۆرەکانی مێشدا، ئەوەتانێ لە هەردوو حاڵەتەکەدا هەست کردن و زیرەکی هەیە. هەروەها لە ڕێگەیەك زیاتر لە ئامرازەکانی پەیوەندی کردن ، هەروەها ئارەزووی تێرکردنی پێداویستیەکان و تێکەڵبوون بە کۆمەڵگە و، هەروەها هەندێك لە شێوەکانی ئابووریش. بەتێڕواینن لەم گۆشەیەوە بۆمان دەردەکەوێت کە مرۆڤ هاوبەشە لەو شتانەدا لەگەڵ گیانلەبەرانی تردا[٢٧]. بەڵام لەجیهانی گیانلەبەراندا شتێك نیە لە ئەم بچێت ـ هەتا ئەگەر بەشێوەیەکی سەرەتاییش بێت ـ.

هەموو ئەمانە ئایین یا جادوویی یا شانۆی دراماییی، یا تابۆ ئاینییەکان[٢٨]، یا هونەر، یا سنووره رەوشتیەکان وەیان شتانێکی تر کە ژیانی مرۆڤایەتییان لەنێو خۆ گرتووە، ئیتر ئەگەر لە پێش مێژووەوە بێت یاخود لەچاخی تازەدا بێت هیچ یەکێك لەوانە لە جیهانی گیانلەبەراندا بونیادی نیە. پەرەسەندنی گیانلەبەران لەوە دەچێت شتێکی (منطقی)یانەو پلەپلەیی بێت وەتێگەیشتنیش لێی ئاسان بێت، ئەگەر بەراورد بکرێت بە پەرەسەندنی مرۆڤی سەرەتایی کە کۆمەڵێك بیروباوەڕی سەیرو غەریب بەسەریدا زاڵ بووە. کاتێك گیانلەبەرێك ڕاو دەکات بەشێوەیەکی زۆر (منطقی)و عاقڵانە ڕەفتار دەکات. ئەو ناهێڵێت هیچ هەلێکی لەکیس بچێت و، لەکاتی خۆیدا دەیقۆزێتەوە. لێرەدا، هیچ بوارێك نیە بۆ بیروباوەڕی خورافی و بیرکردنەوەی ئا لەو شێوانە: هەنگ مامەڵە لەگەڵ ئەندامەکانی کۆمەڵگەکەیدا دەکات ئەوانەی کە هیچ سوودێکیان نەماوەتەوە، بەشێوەیەکی زۆر ڕەق و توندو تیژانە بە هەموو ساناییەکەوە فڕێیان دەداتە دەرەوەی شانەکەی. هەتگ نموونە ژیانێکی ڕێك و پێکی تەواو ڕێکخراوە، کۆمەڵگەی هەنگ خاڵیە لە هەموو ئەو شتانەی کە ئێمە بەناوی مرۆڤایەتیەوە بانگەشەیان بۆ دەکەین وەکو: پارێزگاری کردنی لاوازو کەم

---

[٢٦] / هنری برگسون Bergson: Creative Evolution.

[٢٧] / لەبەشێکی زۆر ئاشکرادا لە قورئانی پیرۆز (سورەتی الانعام) ئایەتی (٣٨) باس لە دروستکردنی گیانلەبەران دەکات لە چوارچێوەی کۆمەڵگاکانداو بەپێی پلانێك : ﴿ وما من دابة في الأرض ولا طائر يطير بجناحيه إلا أمم أمثالكم... ﴾.

[٢٨] / تابۆ ئاینییەکان: المحرمات.

ئەندامان، مافی مرۆڤو گرنگی پێدان و رێزلێنان... هتد. بە نیسبەت گیانلەبەرانەوە، شتەکان بەهەمان شێوەن کە هەن. بەڵام لای مرۆڤ شتەکان هەڵگری کۆمەڵێك دەلالەتی خەیاڵاوین، هەندێك جار لەدەلالەتە واقیعیەکانیش زیاتر گرنگییان هەیە لەبەرچاوی، زۆر ئاسانە کاتێك کە لە (منطق)ی گیاندارێك تێبگەین کە شەڕ لەپێناوی مانەوەدا دەکات، بەڵام با بزانین ئەم کارە لای مرۆڤی سەرەتایی چۆنە؟

لەپێش ڕۆشتنیدا بۆ ڕاو، ڕاوچیە سەرەتاییەکان پێویست بوو لەسەر خۆیان و خێزانەکانیان کە ملکەچی هەندێ داب و نەریت بوونایە کە لەسەر خۆیان فەرز کردبوو وەکو رۆژوو گرتن و نوێژ کردن و پاڕانەوە. هەروەها دەبوایە جۆرە سەمایەکی تایبەتیان ئەنجام بدایە، دەبوو خەونیان لەو بارەیەوە بدیایە وەئاگاداری نیشانە ئاینییەکان بوونایە. کاتێکیش یارییەکە لەسەرەتای دەست پێکردنەوە بوایە، زنجیرەیەکی تر لە دروشمە ئاینییەکان دەهاتنە پێشەوە. هەتا ئافرەتانیش لەماڵەوەدا ملکەچی ئەوە دەبوون کە بە پارێزبن لە یاساغ کراوەکان، وە ئەگەر پابەند نەبوونایە وایان دەزانی کە ئەمە دەبێتە هۆی ئەوەی کە راوەکەیان سەر نەگرێت و هەروەها ژیانی مێردەکانیان بکەوێتە مەترسییەوە [٢٩].

ئێمە دەزانین کە خەڵك لە کۆمەڵگە سەرەتاییەکاندا لاسایی ئەو گیاندارانەیان دەکردەوە کە هیوایان دەخواست راویان بکردایە لەپێش چوونیانەوە بۆ ڕاو. وە بڕوایان وابوو کە ئەم لاسایی کردنەوەیە کاریگەرییەکی تەواوی دەبێت لە سەرکەوتنی ڕاوەکەیاندا، ئەمەیش ناودەبرا بە (سیحری ڕاو) هەروەها لاوەکانیان دەبوونە ئەندام لەگرووپی ڕاودا، لە پاش ملکەچ بوونیانەوە بۆ جۆرە تەقسێکی ئاڵۆز کە بەرپایان دەکرد.

هەریەکە لە (هوبرت) **(Hubert)** و (موس) **(Muss)** پێناسەی ئەم تەقسانەیان کردووە بە سێ بەشەوە: بۆ پاك بوونەوە، بۆ هەڵبژاردن، بۆ وەرگرتن.. بەو شێوەیە، لەکاتێکدا کە مرۆڤ خەریکی وێنەکێشانو نوێژکردن دەبێت، لەو کاتەدا گیانلەبەر خەریکی دانانی پلانێکی (منگق)یو تۆکمەیە بۆ بە ئەنجام گەیاندنی مەبەستەکەی: لەسەرەتاوە دێتو ناوچەیەك دەپشکنێت، پاشان بەوردی رادەمێنێت، تا نێچیرێك بەدی دەکاتو ڕاوی دەکات.

---

[29] / لوسیان هنری "lacien henry : the origin of religion"

ئا بەو شێوەیە گیانلەبەران دەتوانن راوچیەکی باش‌و سەرکەوتووبن، بەهەمان شێوە ئەو سیفەتە لە مرۆڤی سەرەتاییشدا هەبووە، بەڵام لەهەمان کاتیشدا مرۆڤ بوونەوەرێکە کە هیچ کاتێك بێ‌تاقەتیی رووی تێ نەکردووەو دروستکەری پەرستش‌و ئەفسانەکان‌و، سەماو، بت‌و بیروباوەڕە خورافیەکان بووە.

مرۆڤ هەمیشە لەهەوڵی پرسیارکردندا بووە لە جیهانێکی تر، جیهانێکی حەقیقی بێت یاخود خەیاڵی. ئەمەیش ناگەڕێتەوە بۆ جیاوازی لە قۆناغەکانی پێشکەوتندا بەڵکو جیاوازییەکە لەجەوهەردا.

بیرۆکەی کشتوکاڵ کردن یەکێکە لەو بیرۆکە دەرکەوتووانەی لەپێشکەوتنی کۆمەڵگەی مرۆڤدا، کە لەگەڵیدا بیرۆکەی قوربانیەکانی بەشەری پێوە بەستراوە (هـ.ج ولز) لە کتێبەکەیدا بە ناوی (کورتەی مێژووی جیهان) دەڵێت: نابێت ئەوەمان لەبیر بچێت کە ئەو عەقڵیەتە سەرەتایی و مناڵیە کە دروستکەری خەون و خورافەو ئەفسانەکانە، کەوتووەتە نێو گرفتێکەوە ناکرێت تەفسیرێکی (منطقي)و قەناعەت پێکەرانەی بۆ بکرێت، بەڵام لە ماوەی تێپەڕبوونی (٥) هەزار ساڵ بۆ بیست هەزار ساڵەوە مرۆڤی چاخی بەردینی تازە کاتێك کە وەرزی تۆوکردن دەهاتە پێشەوە دەچوون کۆمەڵێك مرۆڤیان وەکو قوربانی پێشکەش دەکرد، ئەم قوربانیانەیش نەدەبوو مرۆڤی کەم نرخ‌و بێ‌بەهای ناو کۆمەڵگا بوونایە، بەڵکو هەمیشە چاکترین کوڕو کچی لاوو جوانیان هەڵدەبژاردو وە زۆر بەڕێزەوە مامەڵەیان لەتەکدا دەکرد هەتاوەکو شێوە پەرستشێکی وەردەگرت.[٣٠]

ئەو کۆمەڵگایانە پەرەسەندنێکی گەورەیان بینیوە لە بواری قوربانیە بەشەریەکاندا بەتایبەتی لە وەرزەکانی چاندن‌و دروێنە کردندا.[٣١] لە شوێنێکی تری کتێبەکەدا (هـ.ج.ولز) دەڵێت: (شارستانیەتی ئەزەتییە Azte لە مەکسیك بەشێوەیەکی تایبەتی بوو بوویە دەریاچەیەك لە خوێن، ساڵانە هەزاران مرۆڤیان دەکردە قوربانی.. هەروەها بە زیندوویی سکی مرۆڤیان هەڵدەدڕی‌و دڵیان دەردەهێنا کە تا ئەوکاتەیش هەر لێی دەدا، چەندەها کرداری تری سەیر کە بەسەر عەقڵیەت‌و ژیانی ئەو کاهینانەدا زاڵ بوو، وە بەو شێوەیە

---

[٣٠] / هـ.ج. ولز H.G. Wells: Short history of the world. rev. ed. (new Yourk: Pelican books, 1996) p. 51.

[٣١] / هەمان سەرچاوە، لاپەڕە (٥٥).

گومرای کردبوون. کە ژیانی گشتیو بۆنەو ئاهەنگە نەتەوەییەکان بووبوونە مەیدانی ئەو جۆرە کردارە سەیرو ترسناکانە.[٣٢]

بەڵام (جوستاف فلوبیر) (Gustave Flubert)، لە کتێبەکەیدا بەناونیشانی (سلامبۆ Slambo)، پێناسەی ئەوەمان بۆ دەکات کە چۆن کارتاجیەکان Crathginians کاتێك دەچوون بۆ نوێژکردن منداڵەکانیان فڕێ دەدایە ناو دەمی (مولوخ)ی خواوەندەکەیانەوەو دەیانکردە سووتەمەنی ئەو ئاگرە بەهێزو بێبەزەییە کە لەناو دەمیدا کڵپەی دەدا بۆ ئەوەی بارانیان بۆ ببارێنێت. بە سەیرکردنێکی ئەم نموونە ترسناکانەیش، هەڵەیە ئەگەر ئەو بۆچوونانەمان بۆ دروست ببێت کە مرۆڤ گیانلەبەرێکی درندە بووە. چونکە ئێمە شتێکی لەو شێوەیەمان لەناو گیاندارانداا بەدی نەکردووە، ئەمەیش دەبێتە هۆی خولقاندنی ناسازییەك بەڵام ئەو نموونانەی کە هێناومانەوە بریتیین لەو رەوت و رەفتارانەی کە مرۆڤ ناچاربووە بەکردنیان بەهۆی ئەو گومرایی و موعاناتانەوە کە لەو سەردەمەدا باو بووە. ئەوانە شتانێکن کە هەتا ئەمرۆیش لەتراژیدیایەکانی رەگەزی بەشەریدا دووبارە دەبنەوە، هەندێك جار گەلان، هەروەها کەسانی ناو کۆمەڵگایش بەشێوەیەك رەفتاریان کردووە کە هیچ (مەعقول) یەتێکی تێدا نەبووە، هەروەها غەریزەکانیش پاڵنەر نەبوون بۆیان بەڵکو لە دەرئەنجامی توندڕەویی و ئەو هەڵنەیانەوە بووە کە بەبەردەوامیی بۆیان ماوەتەوە. مەسەلەی قوربانیدان لەهەموو ئایینەکاندا هەبووە. سروشتی ئەم کارەیش هەروا بە ئاڵۆزی ماوەتەوە بەبێ بوونی بەڵگەیەك یاخود سەلماندنێك، لە ڕاستیدا ئەمە پەیوەندی بە ڕژێمێکی ترو جیهانێکی ترەوە هەیە. قوربانیدانِ لە ئایینە سەرەتاییەکاندا شێوەیەکی زۆر ترسناکی وەرگرتووە. بەڵام لەگەڵ ئەو پێناسەیەشدا ئەمە دادەنرێت بەهێڵێکی جیاکەرەوە لەنێوان چاخی ئاژەڵی پایەدارو چاخی مرۆڤیدا، قوربانیدان نمایشیش بە دەرکەوتنی بنەمایەکیتر دەکات کە ناسازێت لەگەڵ بنەمای سوودو بەرژەوەندیی و پێداویستیەکاندا : بەرژەوەندی سیفەتێکی ئاژەڵیە، بەڵام قوربانیدان مرۆڤانەیە، بەرژەوەندیی یەکێکە لە بیرۆکە سەرەکیەکان لە سیاسەت و ئابووری سیاسیدا، بەڵام قوربانیدان بریتیە لە یەکێك لە بنەما سەرەکیەکان لە ئاینو ڕەوشتدا.

---

[٣٢] / هەمان سەرچاوە، لاپەڕە (٥٦).

بیرکردنەوەی ناعەقڵیانە لەمرۆڤی سەرەتاییدا شێوەیەکی زۆر سەیرو غەریبی وەرگرتووە. لەنێوان ئەو شتە سەیرانەدا، کە لەکۆتاییەکانی چاخی بەردینی ناوەڕاستدا دەرکەوتوون بریتیە لە پارچە کردنی لەشی مرۆڤ لەلایەن خۆیەوە، خەڵك لەو سەردەمەدا بە دەستی خۆیان پارچەیەك لە لەشی خۆیان دەکردەوە وەکو لێکردنەوەی لووت و گوێ و پەنجەکانیان و، ئەم کارانەشیان هەڵگری کۆمەڵێك ماناو دەلالەتی خورافی بوون لەناو بیرو باوەڕەکانیاندا، کە ئاژەڵ هیچ کاتێك شتی لەو شێوانەی نەکردووە.

بەو شێوەیە هـ.ج.ولز لە کۆتاییدا دەگاتە ئەو پوختەیە[33] ئەگەر ئەمە بەراورد بکەی بەو کارەی کە ڕێویەك دەیکات کاتێك دەکەوێتە ناو تەڵەیەکەوە چۆن هەوڵ دەدات ئەو قاچەی کە پێوە بووە بیقرتێنێت بۆ ئەوەی بتوانێت هەڵبێت، ئەمە کارێکە لە کارەکانی عەقڵ. بەڵام ئەوەی کە مرۆڤی سەرەتایی پێی هەڵدەستێت بە لێکردنەوەی پارچەی لەشی خۆی، ئەوە کردارێکە کە هیچ (مەعقول)یەتێکی تێدا نیە و تایبەتمەندیەکە کە بەتەواوەتی بەدەرە لە چوارچێوە ئاژەڵیەکە.[34]

ئا لەمەوە هەڵەیەکمان بۆ دەردەکەوێت کە ڕەنگە کتوپڕ بەسەر پەرەسەندندا هاتبێت، یاخود پەرەسەندن بۆ دواوە گەڕابێتەوە، یان بەدەرکەوتنی گیانلەبەرێك کە بە توندڕەویەکی میسالیانەوە ویستبێتی بەربەست بخاتە بەردەم پەرەسەندنەوە، دیاردەی دیلانیَ کردن لە ئەوپەڕی لوتکەی پەرەسەندنەوە بۆ ئەمپەڕی وا لە ئاژەڵ دەکات کە هەندێك جار وابزانین کە لە مرۆڤ زیاتر پێشکەوتووترە، ئەمە ناوزەد دەکرێت بە (گرێی مرۆڤی سەرەتایی) بەڵام، هەتا ئەگەر بەلامانەوە غەریبیش بێت، ئەم گرێیە تەعبیرە لەو تایبەتمەندیە تازەیەی مرۆڤ کە بووەتە سەرچاوەی هەموو ئایندارێك بۆی، هەروەك چۆن سەرچاوەی شیعرو هونەریشە، گرنگی ئەم دیاردەیەش بۆئەوە دەگەڕێتەوە کە بە ڕێگەیەکی تایبەتی ئاماژە بۆ ڕەسەنایەتی پەیدابوونی مرۆڤ دەکات، هەروەها ئاماژە بۆ ئەو ناسازیە دەکات کە ئەو پەیدابوونەیان لە ئامێز گرتووە.

---

[33] / هەمان سەرچاوە، لاپەڕە (٦٤).

[34] / بەهەمان شێوە ئەم جیاوازییەش نموونەیەکی روونی ترە لەسەر ئەوە ئاژەڵ دڕندەتر دەبێت کاتێك برسی دەبێت یاخود دەکەوێتە ناو مەترسییەوە، بەڵام مرۆڤ لەکاتی تێری و بەهێزیدا ئەو سیفەتەی تێدادەردەکەوێت: زۆرینەی تاوان کە ئەنجام دەدرێت لەلایەن مرۆڤەوە بەهۆی تێریی و لە ئەنجامی یاری و گاڵتەبازیەوەیە.

ڕەنگە ئەم حەقیقەتانە بە ئاسانیی بمانگەیەنێتە ئەو ئەنجامەی کە گیانلەبەران گۆڕانکارییەکی باشیان بەدەست هێناوە لەکاتی سەرکەوتنیاندا بە پەیژەی پەرەسەندندا، لەکاتێکدا مرۆڤی سەرەتایی چاوەکانی بڕیوەتە ئاسمان و بەستراوەتەوە بە ئیلتیزامە ڕەوشتییەکانییەوە کە هەموو کاتێکی لەبارە بۆ ئەوەی بەچۆکا بێتو ژێرپێ بکەوێت، ئەم بۆچوونە ڕامالەرە شکستە (مرۆڤی)یەو سەرکەوتنی (ئاژەڵیی) لەبەرامبەریدا لە سەرەتای سەردەمی مرۆڤایەتیدا جارێکی تر دووبارە دەبێتەوە لە بانگەشە کردنیدا بۆ تێکشاندنی میسالیەت لە پێناوی پێشکەوتندا. لەو ماوە دوورو درێژەدا کە مرۆڤ تێیدا ڕزگاری بووە لە جیهانی ئاژەڵیی وای دادەنێن کە ئەو گۆڕانکارییە دەرەکیانە (وەکو ڕۆشتن بە پێوەو گەشە کردنی زمان و زیرەکیی) ماوەیەکی زۆری خایاندووە، وە بە زنجیرەیەك گۆڕانکاری وردو بچووکی وادا تێپەڕیوە کە نارەحەتە تێبینی کردنی، ئەوەیش ڕوون نیە کە ئایا ئەو بوونەوەرەی کە هەم لە شێوەی مرۆڤو هەم مەیمووندا بووەو داری لە شێوەی گۆچاندا بەکار هێناوە بۆ ئەوەی قاچەکانی پێ درێژ بکاتەوە تا دەستی بەخۆراك بگات، یاخود هەندێ دەنگی بەکار هێناوە لەگەڵ دەوروپشتەکەیدا بە مەبەستی قسەکردن لەگەڵیاندا، ڕوون نییە کە ئایا ئەو بوونەوەرە مرۆڤ بووە یاخود مەیمون، بوونی هەر جۆرە پەرستشێك یاخود (تابۆ) یەك دەبێتە هۆی لەناو بردنی گومان.

گیانلەبەر هەتا گۆڕاوە بووە بە مرۆڤ ماوەیەکی زۆری خایاندووە، هەتا خاڵێکی دیاری کراو پاشان دەستی بە نوێژکردن کردووە.

بەهای ئەم تێڕوانینە هەرچەندێکبێتو هەرچۆنێك بێت، ئەوا جیاوازی سەرەکی لەنێوان مرۆڤو گیانلەبەردا ناگەڕێتەوە بۆ مەسەلەیەکی جەستەیی یا عەقڵیی، بەڵکو لەسەروو هەموو شتێکەوە بوونی ڕۆحیەتێکە کە خۆی لەشێوەی ویژدانێکی ئایینیو ڕەوشتیو هونەریدا بەدەردەخات. لەهەمان کاتدا ئەوەیش ڕاست نیە گەر وا دابنرێت کە پەیدابوونی مرۆڤ دەگەڕێتەوە بۆ ئەو کاتەی کە هەستاوەتەوەو توانیویەتی لەسەر پێیەکانی بڕوات، یا ئەو کاتەی کە دەستەکانیو زمانو زیرەکی پەرەیان سەندووە، بەڵکو پەیدابوونی مرۆڤ بەستراوەتەوە بە پەیدابوونی یەکەمین ئایینەوە، کە تابۆ ئاینییەکانی تێدا دەستنیشان کراوە.

ئایا لەڕاستیدا جێگەی سەرسوڕمان نیە کە مرۆڤی سەرەتایی لەپێش (١٥) هەزار

ساڵەوە چێژی لە سەیرکردنی گوڵ و گوڵزار وەرگرتووە، پاشان ئەو وێنەو شێوەی گیانلەبەرانەی لەسەر دیوارەکانی ئەشکەوتەکەی هەڵکۆڵیوە، ئا لەم لایەنەوە ئەم مرۆڤە زیاتر نزیکتر بووە لە مرۆڤی حەقیقییەوە، لە مرۆڤی (الابیقوری) کە تەنها بۆ تێرکردنی چێژە جەستەییەکانی دەژیو هەموو ڕۆژێك بیر لە چێژی نوێتر دەکاتەوە، یاخود لەو مرۆڤەی کە ئەمڕۆ لە شارە پێشکەوتووەکاندا لەناو قەفەسێکی چیمەنتۆی شیش ڕێژکراودا دەژیو دابڕاوو مەحرووومە لە سادەترین شعورو هەست کردنێك بە جوانیی.

ئەتەکنسۆن Atkinson لە کتێبی (یاسای یەکەم)دا The first law دەڵێت کە چەندین جۆری جیاواز لە (تابۆی ئایینی) لەنێوان گەلە سەرەتاییەکاندا لە هەموو شوێنەکانی جیهاندا بڵاوبووبوویەوە، بوونی پێویستیەکی هەمیشەیی بۆ (پاك بوونەوە لە شەڕ) یان کەوتنە ناو گوناهەوە لە ئەنجامی دەستێوەردانی تابۆ ئایینیەکان و نزیکبوونەوە لێیان، ئەمانە هەموو دەبنە یارمەتیدەرێك بۆمان بۆ پەیداکردنی هەندێك زانیاری لەبارەی بوونی ژیانی سەرەتاییەوە. بەڵام ئەو بیرۆکەیەی کە زاڵ بووە بەسەر عەقڵیەتە سەرەتاییەکاندا، بریتی بووە لە بیرۆکەی نەفی کردن لە نیشتمان.[٣٥]

بەو شێوەیە، ڕژێمێکی تێرو تەسەل بۆ (حەرامکراوەکان) پێگەیشت کە هەموولایەنە جۆراو جۆرەکانی ژیانی سەرەتایی گرتەوە. لەدواییدا ناوی (تابۆ)ی لێنرا Tobos یان (محرمات) کە (تابۆ) لە بنچینەدا بریتیە لە یاساغکردنێك کە شێوە سروشتێکی ڕەوشتی هەیەو لە وەختێکی زوودا لەناو گەلە سەرەتاییەکاندا پەیدابووە.

مرۆڤ لەژیانیدا وەکو زادەو کوڕی سروشت هەڵسوکەوت ناکات، بەڵکو وەکو غەریبێك وایە تێیدا. شعوری بنەڕەتی بریتیە لە ترس، بەڵام ئەوە ترسێکی بایۆلۆژی نیە وەکو ئەوەی لای گیانلەبەران هەیەو هەستی پێ دەکەن. بەڵکو ترسێکی ڕۆحیو کەونی سەرەتاییە کە بەستراوەتەوە بە نهێنیەکانی بوونی مرۆڤایەتیو پەنهانەکانیەوە. مارتن هایدگر Martin Heideggar ئەمە دادەنێت بە (هۆکارێکی نەمرو ئەزەلیو دیاریکراو بۆ بوونی مرۆڤایەتی) ئەمەیش بریتیە لە ترسێك کە ئاوێتەیە لەحەزی زانیاری وەرگرتنو سەرسوڕمان و هەڵهاتن، هەر هەمان ئەم هەستە تێکەڵاوەیشە کە لە قوڵایی ڕۆشنبیری و

---

[٣٥] / هەستکردنی مرۆڤ بە غوربەتی لەسەر زەویدا ئەو بیرۆکەیەی تێدا زاڵ بووە (نەفیکرابێت لە نیشتمانەکەی) واتە زادەی وڵاتێکی ترە. (وەرگێڕی ك)

هونەرەکانماندا شاراونەتەوە. باری مرۆڤی سەرەتایی بەتەنها خۆی دەتوانێت تەفسیری پەیدا بوونی ئەو (تابۆ) ئاینییانەو هەروەها بیرۆکەی پاك و پیسی و بڵندیی و نەفرەت و پیرۆزیی و هەروەها بیرۆکەکانی تری لەو شێوانەمان بۆ بکات.

ئەگەر بەڕاستی ئێمە نەوەی ئەم جیهانە بووینایە، بۆ ئێمە ئەوا هیچ شتێك پیس و پیرۆز نەبوو، بەڵکو ئەم بیرۆکانە ناسازن لەو جیهانەی کە ئێمە دەیناسین. کە ئەمەیش سەلماندنێکە بۆ ئەوەی کە ئێمە ئەسڵێکی ترمان هەیە کە ناتوانین هیچ شتێك لەبارەیەوە باس بکەین.

ئەو بەرپەرچ و کەموکوڕییانەیش لە بەرەوڕووبوونەوەی ئەم جیهانەدا کە لەڕێگەی ئایین و هونەرەوە تەعبیریان لێ دەکەین، بریتیە لە نەبوونی چەمکی زانستی بۆ مرۆڤ. بۆچی مرۆڤ هەمیشە ترس و نائومێدی خۆی، لە ڕێگەی ئایینەوە دەردەبڕێت. ***باشە بۆچی مرۆڤ لە چ شتێك بە شوێن ڕزگاربووندا دەگەڕێت؟.***

ئەم لایەنەی مرۆڤایەتیی کە ئێمە باسی لێ دەکەین (خەیرو شەڕ، هەستکردن بە بێ چارەیی) ململانێی بەردەوام لەنێوان بەرژەوەندیی و ویژداندا، پرسیارکردن لە بوونمان... هتد) ئەم لایەنە هەمیشە بەبێ تەفسیرکردنێکی عەقڵانی دەمێنێتەوە. پێویستە ئەوەیش بوترێت کە مرۆڤ وەڵامی بۆ جیهانی دەوروبەری بەو شێوەیە نەداوەتەوە کە داروین باسی دەکات. هەتا لەو جۆرە گیانلەبەرانەیشدا کە زۆر پەرەیان سەندووە، ناتوانین بچوکترین پاشماوەی پەرستشێك یاخود (تابۆیەك) بدۆزینەوە. لەکاتێکدا ئەبینین مرۆڤ لەگەڵ خۆیدا ئاینو هونەریش پەیدابوون. بەڵام زانست، مێژوویەکی تازەی هەیەو وردە وردە بە شێوەیەکی ڕێژەیی گەشەی کردووە، مرۆڤو ئایین و هونەر هەمیشە لە پەیوەندیەکی توندو تۆڵدا بوون بەڵام هەتا ئێستایش هیچ گرنگیەك بەم دیاردەیە نەدراوە کە لەناو ئاخنیدا وەڵامی هەندێك لە پرسیارە گرنگەکانی سەبارەت بەبوونی مرۆڤی هەڵگرتووە[٣٦].

---

[٣٦] / بلوتارخ جوان تێبینی ئەمەی کردووە کاتێك کە ڕاستگۆیانە باسی ئەمە دەکات و دەڵێت: (شاری وادەبینیت کە شوورەی نەبووە ،یا بێ پاشا بووە ـ یان شارستانیەتی نەبووە، وە یا بەبێ شانۆ بووە، بەڵام کەس تا ئێستا شارێکی نەبینیوە کە پەرستگاو شوێنی پەرستشی تێدا نەبوویێت.

بڕوانە بلوتارخ: **Plutach's marals, ed willliam w good win (BostanL Little Brown & Co. 1883).** هەروەها برگسون لەپاش ئەو بەنزیکەی نیو سەدە، وتوویەتی: (زۆر کۆمەڵگای مرۆڤایەتیی دۆزراوەتەوە هەتا ئێستاش بەبێ زانست و هونەرو فەلسەفەن، بەڵام هیچ کۆمەڵگەیەکی مرۆڤایەتیی نەبووە کە ئایینی نەبێت، بڕوانە:

لە تێروانینی مادییەتەوە، مێژووی رەگەزی بەشەری لە دەرئەنجامی پێشکەوتنێکی (عەلمانی)یەوەیە[37] بەڵام هیچ کەسێك تەفسیرێکی ئەوەمان بۆ ناکات، کە بۆچی ژیانی مرۆڤی سەرەتایی پڕیەتی لە جۆرەها پەرستش و نهێنی و بیروباوەڕی هەمە چەشن و تابۆی ئایینی؟ بۆچی مرۆڤ ژیان و کەسایەتی بەستووەتەوە بەهەموو ئەو شتانەی کە لە دەورو بەری بوون لە بەردو ئەستێرەو شتانی تر[38]، وە بۆچی بە پێچەوانەی ئەوەوە، مرۆڤی ئەم سەردەمە هەوڵی ئەوە دەدات هەموو شتێك بەچاوێکی ماددی و ئالیانەوە سەیر بکات؟ ئێمە بەدرێژایی چوارهەزارساڵی رابردوو هەوڵی ئەوە دەدەین کە خۆمان رزگاربکەین لە کابوسەکانی مرۆڤی سەرەتایی بەبێ ئەوەی کە لە سروشت و سەرچاوەکانی تێگەیشتبین.

دیاردەی ژیانی (رۆحانی) یاخود هانابردن بۆ ئاسمان. دیاردەیەکی ئاشناو نزیکە بە مرۆڤو غەریبە بە ئاژەڵ - ئەم دیاردەیە هەر بە (یاخی)یەتی دەمێنێتەوەو ناچێتە ژێر هیچ تەفسیر کردنێکی عەقڵانیەوە، وەکو ئەوەی لەئاسمانەوە (وشە بە وشەی) دابەزیبێت. وە لەبەرئەوەی کە بەرهەمی پەرەسەندن نیە، هەروا لەبڵندیدا دەوەستێتو بە (جیاوان) دەمێنێتەوە.

لەپاش لێکۆڵینەوەیەك لە وێنەکانی مرۆڤی (نیندرتاڵ) **Nenderthal** لە فەرەنسا (هنری سمیل) **Henri Smile** گەیشتە ئەو ئەنجامەی کە ژیانی دەروونی مرۆڤی سەرەتایی تەنها کەمێك نەبێت هیچ جیاوازیەکی لەگەڵ ژیانی دەروونی مرۆڤی هاوچەرخدا نیە هەتا ئەو مرۆڤەی کە لە ئەشکەوتدا پێش حەفتاهەزار ساڵ ژیاوە، بەهەمان شێوە گیرۆدەی نێو ئەو (خولگە میتافیزیکیە) بووە کە لە ئێستایشدا نەخۆشی مرۆڤی نویە[39]، ئاشکرایشە کە ئەمە لە ئەنجامی بەردەوام بوونەوە نەبووە لە پەرەسەندنی بایۆلۆژیدا،

---

Henry Bergson: Lesdeax saurcess de la morale. Religion (Paris: Librarie Felix A.L. can, 1932) p.105.

٣٧ / سالمون ریناخ. Salamon Reinach: Calts, mytheset religion (Paris: n.p., 1905).

٣٨ / مرۆڤی سەرەتایی جیهان ناناسێت بەبێ ژیان، واتە: مرۆڤی سەرەتایی جیهان لە رێگەی ژیان و کەسایەتی خۆیەوە دەناسێت. (وەرگێڕی ك) بروانە: U.A. Frank Farth: from myth to philosophy. serloocrootion trans. C subtica Beogradi minerva, 1967). p.12.

٣٩ / ریسمل (Smile) ئەمەی لە کۆنگرەی زانستی هەڵکۆڵینەدا لە ساڵی (١٧٦٠) لە نیس راگەیاند.

بەڵکو بەشێکە لەبەشەکانی ئەو ترازیدیایانەی کە بە پێشەکیەك دەست پێدەکەن سەرەتاکەیان لە ئاسمانەوە هاتووە.

لەمیانەی ئەوکاتە ئاژەڵیەی لە پێش پەیدابوونی مرۆڤەوە، هیچ نیشانەیەك دەرنەکەوتووە کە ئاماژە بە قۆناغێکی تر بکات، کە پەرستش و ڕەوشتە سەرەتاییەکانی تێدا هەبووبێت، هەتا ئەگەر وایش دابنێین ئەو ماوەیە بۆ هەتا هەتایە درێژ بکرێتەوە ئەوا مەسەلەی پەیدا بوونی پەرستش و تابۆ ئاینییەکان پێشبینی ناکرێت.

پەرەسەندن لە گیانلەبەراندا بەرەو لایەنی کامڵبوونی جەستەیی و فکری و هەروەها زیرەکی لە ڕادە بەدەرو گیانلەبەری نموونەیی چووە.[40]

تێڕوانینی (نیچە) بۆ چەمکی (پاڵەوان) لە داروینەوە وەریگرتووە، پەرەسەندن لەگەڵ ئەوەدا کە شتێکی ئاژەڵی و دەرەکییە لە جەوهەریدا، مرۆڤ تێدەپەڕێنێت و بە شێوەیەکی سادەو (منطقی)یانە دەبێت، چونکە لە سنورێکی دیاریکراوداو لە چوارچێوەی سروشتدا دەمێنێتەوە، ئاژەڵی نموونەیی بەرئەنجامی پەرەسەندە، وە بەو شێوەیە بریتی دەبێت لە بوونەوەرێك بەبێ ژیانێکی ڕۆحیانی و زاتی، بەبێ بوونی هیچ مرۆڤایەتیی و ترازیدیاو کەسایەتیەك... بریتیە لەو کورتەباڵا (القزم)ە کە لە بۆری تاقیکردنەوەکەی دکتۆر (فاوست)ەوە دەرچوو، یاخود ئەوەی کە سروشت بەدیهێناوە، بەڵام بەشێوەی کردارێکی خاوتر. بێگومان شاعیری سۆڤیەتی (فوزنسنکی) لەعەقڵی خۆیدا شتێکی هەر لەم شێوەیەی وێنا کردبوو کە دەڵێت: (کۆمپیوتەری داهاتوو لەلایەنی تیۆرییەوە دەتوانێت بە هەموو کارێك هەستێت کە مرۆڤ دەیکات بێجگە لە دوو شت: ئایینداریی و شیعر نووسی[41].

گیانلەبەران بیرۆکەیەکیان سەبارەت بە پیرۆزیی یا خەیرو شەڕ لا نیە، هەروەها هیچ شتێك لەبارەی جوانیەوە نازانن. وە ئەو باوەڕەی کە زانایان دەیڵێن گوایە مەیموون دەتوانێت وێنە بکێشێت. لەسەر بنچینەی ئەو ئەزموونەی کە هەیەتی لەو بوارەدا.

---

[40] / مرۆڤی نموونەیی (پاڵەوان) لەلای نیچە سەربەستەو لەدەرەوەی بازنە ڕەوشتیەکاندایە، هەمیشە لەگەڵ سۆزو بەزەییدا ناتەبایە، دوورە لە هەموو ویژدان و خۆشەویستی و لێبوردنێك، ئەم هەستە کە دەبێتە هۆی لەناوبردنی ژیانی زاتی مرۆڤ، وە لاوازو بێدەستەڵاتان دەچەوسێنێتەوەو زاڵ دەبێت بەسەریاندا. (بەڵام ئێوە نەوەی ڕەگەزێکی بەرزن و نموونە باڵاکەتان بریتیە لە سوپرمان).

بڕوانە نیچە لە کتێبەکەیدا بەناوی: بەو شێوەیە زەردەشت دواوە. هکژا تکلم زرادشت.

[41] / ئەندریە فوزنسنکی Andrei Voznesnsky, n.p.d

سەلمێنراوە کە ئەو بۆچوونە هەڵەیە. بەڵکو ئەوەی کە مەیموونەکان پێی هەڵدەستن و ناونراوە بە (هونەری مەیموونەکان)[42] تەنها بریتیە لە لاسایی کردنەوەیەکی تەواوی مرۆڤو بەدەر لەوە هیچ بوونێکی نییە.

بەپێچەوانەوە دەبینین مرۆڤی ناو ئەشکەوتەکان زانیویانە چۆن وێنە بکێشنو لەسەر ئەشکەوتەکان وێنەکانیان هەڵبکۆڵن، ئەو وێنانەی کە کێشاونی هەندێکیان لە ئەشکەوتەکانی بیاباندا دۆزراونەتەوە، لە (ئەلتامیرا) Altamera لەئیسپانیا، لە (لاسکو) Lascauلە فەرەنسا، لەم دواییشەدا لە (ماشکا)و لەپۆڵەندا هەندێکی تر دۆزراونەتەوە سەبارەت بەو وێنانە زۆربەی زانایان بڕوایان وایە کە مێژووەکەی بگەڕێتەوە بۆ ۳ هەزار ساڵ لەمەوپێش. ماوەیەك لەمەوپێش کۆمەڵێك لەزانایانی شوێنەوار هەندێك ئامێری مۆسیقایان دۆزیەوە لەنزیك شاری (شیرینگۆف) لە ئۆکرانیا کە مێژووی دروستکردنیان دەگەڕێتەوە بۆ بیست هەزار ساڵ لەمەوپێش.

ئارەزووی مرۆڤ بۆ ئارایشتکردنی خۆی، لەپێشتردا هاتووتە ئاراوە زیاتر لە پێویستی خۆ پۆشتەکردن و پارێزگارکردنی لەشی، ئەم حەقیقەتە دەتوانێت هەر لە چاخەکانی پێش مێژووەوە هەتاکو ئەمڕۆ بەدی بکرێت. ئەو پۆشاکانەی کە لەبەری دەکەین بەتەنها بۆ پاراستنی لەشمان نیە، بەڵکو ڕەنگدانەوەی ئەو سەردەمەیە کەتێیدا دەژین و پەیوەستین پێوەی. جل و بەرگەکانمان وەکو وێنەو شیعری لێهاتووە. فەرووی گیانلەبەران و هەروەها تووك و پەڕەکانیان جوانن. بەڵام لە پشت ئەم جوانیوە هەمیشە ئەرکێك هەیە. لە گۆرانیەکانی مرۆڤی سەرەتایی و هەروەها نمایشەکانیدا ناتوانرێت هونەرو پەرستش لە یەکتری جیابکرێتەوە.. یەکەم پەیکەر کە مرۆڤ لە بەرد دروستی کرد ئەو بتە بوو کە دەیپەرست. ئیلهامی ئایینی کە پاشتر بەئاقارێکی هەڵەدا هەنگاوی هاویشت، جوانترین و داهێنەرانەترین ئەو پەیکەرانەیش کە دروست کرابێت پەیکەری خواکان بووە، هەندێك لەو پەیکەرانە لە دورگەکانی ئۆقیانووسی ئارام و لە مەکسیك و لە (ساحل العاج) دۆزراونەتەوە، ئەم شتانە لە ئەمڕۆدا دادەنرێت بە نموونەیەکی باشی هونەری کاریگەری. هەموو ئەوانەی کە ناودەبرێن بە هونەری شێوەکاری لە بنچینەدا بریتیە لە هونەرێکی (بت)

---

[42] /ئاماژەیە بە لێکۆڵینەوەیەکی باڵای زانای سۆڤیەتی بوکین Bukin.

پەرستن. رەنگە هەر لەبەر ئەمەیش بێت کە ئایینی ئیسلام و هەندێ لە ئایینەکانی تریش بوونی ئەو جۆرە پەیکەرانەیان لەلایەنی ئایینییەوە پێ باش نیە چونکە بەلایانەوە بنچینەی شتەکە دەگەڕێتەوە سەر بت پەرستیی. رەنگە وایش پێوست بکات کە بگەڕێینەوە بۆ چاخەکانی پێش مێژوو بۆ ئەوەی بتوانین لە بنچینەی هونەر بکۆڵینەوە لەناو ئاییندا. وە چۆن ئایین و هونەرو رەوشتە سەرەتاییەکان هەموویان یەك سەرچاوەیان هەیە ئەویش بوونی شەوقی مرۆڤە بۆ جیهانێکی نادیار.

جیاوازیی مرۆڤ لەگەڵ ئاژەڵدا دەتوانرێت لەشتێکی تریشدا هەستی پێ بکرێت کە ئەویش (یاخیبوونی مرۆڤ)ە، گیانلەبەر یاخی نابێت لە چارەنووسە ئاژەڵییەکەی. بەتەنها مرۆڤە یاخی دەبێت. تاکە گیانلەبەرێکە کە رەفزی ئەوە دەکات ببێتە ئاژەڵ.[٤٣]

ئەم جۆرە یاخیبوونە خۆی لەخۆیدا کردارێکی مرۆڤانەیە، لەکۆمەڵگا پێشکەوتووەکاندا دەبینین شارستانیەت (کە ئەسڵێکی ئاژەڵیی هەیە) هەوڵ ئەدات هەندێك چەمك و رێسای (نامرۆیی) بەسەر ژیاندا جێبەجێ بکات وەکو (رێکخستن، داماڵین لە فەردییەت، توانستی گشتی، نواندن، رای جەماوەر، حوکم کردنی کۆمەڵگا بەسەر تاکدا... هتد).

(یۆهان هۆی زنجا) کەشفی دیاردەیەکی تری کرد کە بریتیە لە (یاری کردن)، گیانلەبەران یاری دەکەن، بەڵام لەپشتی یاری کردنەکەیەوە پێویستیە بایۆلۆژیەکان هەیە وەك یاری سێکسی و هەروەها فێرکردنی بێچوەکانیان.

بەو شێوەیە، ئەمە بریتیە لە یاریەکی غەریزەیی و لەهەمان کاتیش (وضیفي)یە بەڵام یاری مرۆڤ یاریەکی ئازادە، بریتیە لە یاریەکی نامولتەزیم و هەمیشە هوشیاریەکی لە تەکدایە، ئەمەش مانایەکی رۆحی، جدی و سەنگینی پێ دەبەخشێت یان (ئامانجێکە و ئامانجی تری لە پشتەوە نیە).

جۆرێکی تایبەتی هەیە لە یاری کە پێی دەوترێت (پوتلاتش) **Potlatsh** کە دیاردەیەکی گشتی بووە لە شارستانیەتی کۆندا. سروشتی ئەم یاریەش زیاتر ناعەقڵانیەتی پێوە دیارە کە دەبێتە هۆی زیان بەخشین لەلایەن ئابووریەوە ئەمەش وەك

---

[٤٣] / ئەلبیر کامۆ .(Albert Camas: L'homme revolte Gavimard, 1951).

زۆربەی هونەرو رەوشتە سەرەتاییەکانی ئەو سەردەمە پێك هاتووە لە هەندێ فیکری هەمەجۆر وەك خەیرو شەڕ حەرامو حەلاڵ.

(هۆی زنجا) لەم بارەیەوە شتی تری بۆ زیادکردووە بەهۆی کەشف کردنی لایەنێکی تری ئەم یاریەوە کە بەشێوەیەکی (قۆناغبەندیی) لەلای هۆزێك لە هۆزەکانی هندیە سوورەکانەوە دەکرێت کە هۆزی (کەواکیوت)ە Kawakiut ناوی ناوە (میهرەجانی دیاریەکان) بریتیە لە میهرەجانێکی گەورە تێیدا کۆمەڵێك هەڵدەستن بە پێشکەشکردنی دیاریەکی زۆرو گەورە بەکۆمەڵێکی تر. پاش ماوەیەکی دیاریکراو میهرەجانەکە دووبارە دەبێتەوە ئەمجارە بەپێچەوانەوە کۆمەڵێکی تر هەڵدەستن بەگێڕانەوەی دیاریەکان...

ئەم جۆرە رۆحییەتە، رۆحی بەخشین هەموو لایەنەکانی ژیانی ئەو هۆزە دەگرێتەوە، لە پەرستشو یاساو نەریتەکانیاندا، لە هونەریاندا. میهرەجانی دیاریەکان بریتیە لە پێشبڕکیەك لەپێناوی سەرکەوتندا ئەم یاریەش تەنها بە پێشکەشکردنی یاریەکان تەواو نابێت، بەڵکو ئەوەی سەیرو کاریگەرە ئەوەیە کە دەبێت دیاریەکان لەپاشاندا بشکێنرێت بۆ ئەوەی بیسەلمێنن کە بەبێ بوونی ئەو دیاریانەش ئەوان دەتوانن هەبنو بژین واتە (لێیان زیادە) ئەم کارەش هەمیشە بەهۆی جۆرێك ململانێوە بەهێز دەکرێت، بۆ نموونە ئەگەر سەرۆك هۆزێك دەفرێکی تێکشکان یان گڕی لەکۆمەڵێك کەلوپەل بەردا ئەوا پێویستە لەسەر بەرانبەرەکەی ئەویش هێندەی ئەو شت بشکێنێت لە نرخدا بەلایەنی کەمەوە ئەگەر زیاتر نەشکێنێت.

ئەم جۆرە پێشبڕکیە کە دەگاتە رادەیەك کە ئەو کەسە هەموو سەروەت و سامانێکی بە دەستی خۆی لەناو ببات.[44]

(مارسیل موس) بوونی ئەم جۆرە نەریتە باس دەکات لەلای گەلانی مەلایا لە کتێبی (Essai sur ledon) ئەوە دەسەلمێنێت کە لە شارستانیەتەکانی گریکی و رۆمانی و جرمانی کۆنیشدا هاوشێوەی ئەم جۆرە نەریتانە هەبووە. هەروەها (گرانیت) Granet توانی جۆری ئەو دیاریانە دەستنیشان بکات کە لە نەریتی چینیدا لە کاتی پێشبڕکێدا بەکاردەهێنران و دەشکێنران.

---

[44] (جۆن هۆیزنجا) John Huizinga Homludens, a study of the play element in culture (Bostn Beacon press. 1955).

(بوتلاش) یاخود (میهرەجانی دیاریەکان) لەپێش ئیسلامدا لەناو عەرەبدا لەژێر ناوی (المعاقرة)دا باو بووە (دوو کەس یاخود دوو شوان هەڵدەستان بە پێشبڕکێکردن لەگەڵ یەکتردا بەمەبەستی شانازیکردن بەسەریەکتردا لەرێگەی کوشتنی حوشترەکانی خۆیانەوە. (وەرگێڕی ك)

(موس) دەڵێت: (داستانی مهابهارتا) لەمێژووی میهرەجانێکی گەورەی یاری بوتلاش زیاتر نیە. ئێمە لەبەردەم جیهانێکداین کە خەمی گەورەی ژیانی رۆژانەو بەرژەوەندیی‌و کالای سوودبەخش نیە). زانستی رەگەزناسی بەشەری (Ethnology) سەبارەت بە تەفسیرکردنی (بوتلاش) زیاتر لە جادوویی‌و وێنە ئەفسانەییەکاندا بۆی دەگەڕێت‌و، بابەتی لێکۆڵینەوەکەیشی بەدەستکەوتنی سوودی ماددی نیە).[٤٥]

تێکوپێك شکاندنی کالاو گاڵتەکردن بەشتانی ماددی و سوودبەخش، وە پێشخستنی (مبدء) بەسەر شتەکانداو ـ ئەگەر بە رووکەشیش بێت ـ هەموو ئەمانە شتانێکن کە تەنها تایبەتن بە رەفتارەکانی مرۆڤەوە، هیچ شتێکی لەم شێوەیە لەجیهانی گیانلەبەراندا بەدی ناکرێت.

هەتا ئەم چەند ساڵانەی دوایش وا دادەنرا کە تیۆرەکانی (داروین) تەفسیرێکی کۆتایی بێت بۆ بنچینەی مرۆڤ، هەروەك چۆن بڕوایش وابوو کە تیۆری (نیوتن) بریتیە لە تیۆرێکی کۆتایی بەنیسبەت گەردوونەوە. بەڵام کاتێك کە بیرۆکەی میکانیکی (نیوتن) لەبارەی کەونەوە وای لێهات کە گومان لە راستیەتی بکرێت، بەهەمان شێوە تیۆرەکەی (داروین)یش لەمەڕ مرۆڤ پێویستی بەتازەکردنەوە کرد. تیۆری پەرەسەندن نەیتوانیوە تەفسیرێکی قەناعەت پێکەرانە بۆ دیاردەی دینداریی بکات لەژیانی بەشەریدا، وەنەبوونی ئەم دیاردەیەش لەچاخەکانی تازەدا بۆچی خەڵك وای لێ دێت کە کەمتر هەست بە تێربوون بکات کاتێك کە خۆشیەکانی ژیانی ماددی زیاتر بۆ دەستەبەر دەکرێت؟ بۆچی پێشکەوتن نابێتە هۆی بەهێزکردنی لایەنی مرۆڤایەتی؟ تێڕوانینی هەر یەکە لە (داروین) و (نیوتن) تێڕوانینێکی روون و دیاریکراون و ئەو کاتەی عەقڵی مرۆڤ ئەو دوو تێڕوانینەی پەسەند کرد ئیدی خۆی بەتوانا نازانێت لە رەخنە تێ گرتنیدا.

---

[٤٥] / (مارسیل گرانیت) Marcel Granet Chrnese civilization clondanik. Poul, Trench, Trubner, & (0.,1930)

جیهانی نیوتن جیهانێکی جێگیرو (منطقي)و هەمیشەییە، هەروەها مرۆڤی (داروین) یش سادەو یەك رەهەندە، ئەو لەپێناوی مانەوەدا تێدەکۆشێت، وەپێویستی و ئامانجەکانی تێردەکات لەپێناو جیهانێکی (وظیفي)دا.

بەڵام ئەنشتاین کاتێك هات و وەهمەکەی (نیوتن)ی تێکوپێکدا و گوماناوی کرد. بە هەمان شێوەیش فەلسەفەی رەشبینی و داتەپینی شارستانیەت هەمان کاردەکات بە وێنا مرۆڤیەکەی داریون. مرۆڤ توانای تێگەیشتنی تەواوی نیە، نارازیە، و هەمیشە ترس‌و گومان ئازاری ئەدەن. ئەنشتاین پێی وایە کەئەمە بریتیە لە کەوتنە ناو گێژاوێکی فیکری‌و دیالکتیکی بەردەوامەوە.

مرۆڤایەتی کە بۆماوەیەکی دووروودرێژ کەوتبووە ژێر کاریگەری فەلسەفەی داریونیەوە، ئێستا چاوەروانی (ئانشتاین)ێکی تر دەکات کە بێت و لایبەرێت، وە ئەو فیکرە نوێیە لە بارەی مرۆڤەوە بەبەراورد لەگەڵ فیکری(داروین)یدا وەکو پەیوەندی نێوان گەردوونی (ئانشتاین) و گەردوونی (نیوتن) وایە. کەواتە راستە ئێمە لە رێگەی گرفت و (معاناة)ە - کانمانەوە بەرز دەبینەوەو دەکەوینە ناو خۆشگوزەرانیەوە. لەبەر ئەوەی چونکە ئێمە جیاوازین لە گیانلەبەران. کەواتە نە مرۆڤ تەنها بەو شێوەیە کە داروین باسی دەکات، نە گەردونیش تەنها بەو شێوەیە کە نیوتن باسی دەکات.

# دوانیەتی جیهانی زیندوو

ئایا ئێمە لە ئێستادا یان لە داهاتوودا توانای بەرهەم هێنانی ژیانمان دەبێت؟ وەڵام: بەڵێ، بەمەرجێك ئەگەر توانیمان لە ژیان تێ بگەین، بەڵام ئایا دەتوانین؟ زانستی(بایۆلۆژی) زانستێك نیە لەبارەی جەوهەری ژیانەوە، بەڵکو زانستێکە پەیوەندی بە دیاردەکانی ژیانەوە هەیە، پەیوەندی بەژیانەوە هەیە وەکو بابەت، وەکو بەرهەم هێنراوێك.

لێرەدا هەمان ناکۆکی روو بەڕوومان دەبێتەوە کە لەنێوان مرۆڤو ئاژەڵدا بەراوردمان کرد بەڵام لە ئاستێکی نزمتردا، مەبەست لە ئاستی مادییە لە بەرامبەری ژیاندا. لە مادەدا، وێکچوون و، چەندی و، دووبارەبونەوەو (سەبەبیەت) و میکانیزم دەبینین، لەلایەکی ترەوە ئێمە لەگەڵ ئەفراندن، چۆنیەتی، گەشە، ئیرادە و ئۆرگانیزمدا رووبەڕووین.

ژیان لەڕێگەی بەردەوام بونی مادییەوە کەشف ناکرێت چ میکانیکی بێت یا دیالەکتیکی بێت، وە نە بەو شێوەیەش کەوا دابنرێت ژیان مادەیەکە لەباشترین شێوەدایە لە ڕووی ڕێکخستن و ئاڵۆزیەوە.

(ماتە ووزە)[46] Entropy بەپێی وتەی زانایانی ژیان خاڵێکی سەرەکی و گرنگە لە پێناسەکردنی ژیاندا. هەموو یاساکانی سروشت لە بنەڕەتدا دەگەڕێنەوە بۆ (ماتە ووزە) کە حاڵەتێکی ڕەهایە بۆ خامۆش بوونی تەواو. بە پێچەوانەی ئەمەوە، دەبینین کە خاسیەتی سەرەکی بونەوەری زیندوو بریتیە لە حاڵەتی (الانتروپی) واتە (گۆڕان لە وزەدا)، کە توانای ئەو بونەوەرە زیندووەیە کە دەتوانێت لەشتێکی سادەوە ئاوێتەیەك دروست بکات، لە ئاژاوەو هەڕەمەکی ڕژێمێك بونیادبنێت و پارێزگاریشی لێ بکات (ئەگەر بە شێوەیەکی کاتیش بێت) لە بەرزترین ئاستی وزەدا. هەموو ڕژێمێکی ماددی بەرەو پلەیەکی باڵاتر دەچێت لە (ماتە وزە) لەکاتێکدا هەموو ڕژێمێکی زیندوو ئاڕاستەیەکی پێچەوانە وەردەگرێت، لەبەر ئەوەی چونکە (ئاڕاستەی ژیان بەپێچەوانەی یاسا ئالیەکانەوە دەڕوات)

---

[46] / (ماتە وزە) زاراوەیەکە لە دۆزینەوەی گەرما وزەدا واتە ئەو برە وزەیەی کە ناتوانرێت بگۆڕێت بۆ کارەبا یاخود بریتیە لە میلی وزە لە کەوندا، کە دەگاتە حاڵەتی وەرنەچەرخان و خامۆش بوون. (وەرگێڕی ع)

هەروەکو (کوزینستیزۆف) **Kuznyetzov** دەڵێت کە زانایەکی روسیە لە زانایانی (سبرنیتکا) **Cypernetics**.

لەبەر ئەوەی کەمن لە زانایانی (بایۆلۆژی) نیم هەوڵ ئەدەم تەنها چەند نموونەیەك لە وتەی ئەو زانایانە وەربگرم کە لەم بوارەدا شارەزاییەکی باشیان هەیە.

نەتوانایی زانستی بایۆلۆژی لە تەفسیرکردنی ژیاندا ناکرێت هەروا بەبێ دەنگی بە سەریدا تێبپەڕین. ئەمەوێت لێرەدا ئاماژە بۆ شتێك بکەم کە بە نسبەت منەوە شتێکی کتوپڕ نیە.

لەساڵی ١٩٥٠، (ئەندریە جورج) **Andre Georges** پرسیارێکی ڕووبەڕووی زانایانی بایۆلۆژی و پزیشکان و زانایانی سروشت کردەوە پرسیارەکەیش ئەمە بوو:

ژیان چییە؟ هەموو ئەو وەڵامانە کەبەدەستی گەیشتبوونەوە جۆرێك لە پارێزو ئاڵۆزییان پێوە دیار بوو. لێرەدا وەڵامی هەردوو زانا (بییر لایان)و (جان روستاند) دەخەینە روو وەکو دوو نموونەی هاوشێوە: (ئەم پرسیارە هەر بەنهێنی دەمێنێتەوە، کەمیی زانیاریمان لەو بارەیەوە هەموو تەفسیرکردنێکمان سەبارەت بە ژیان روونی کەمتر پێوە دیار دەبێت لەو زانیاریە غەریزییانەی کە خۆمان هەمانە)[٤٧].

(هەتا ئێستا بەشێوەیەکی تەواوو دیاریکراو نازانین ماهیەتی ژیان چیە، ئێمە ناتوانین پێناسەیەکی تەواوو رێکوپێك سەبارەت بەبوونی ژیان پێشکەش بکەین)[٤٨].

ئەو توانایەی کە لە زیندەوەرێکدا هەیە لە دوورکەوتنەوە لەو گۆڕانە خێرایەی کە دەبێتە هۆی حاڵەتی خامۆش بوونی تەواو، وەکو نهێنییەك ماوەتەوە، مرۆڤ لە چاخەکانی کۆنەوە بڕوایان وایە کە هێزێکی شاراوەی مەعنەوی کە لە سروشت بەدەرە (بە بەراوردکردنی بە رۆح) لە ناوەوەی هەر زیندەوەرێکدا کار دەکات. ئەو زیندەوەرە چۆن دەتوانێت کە دژی دارمانی خۆی بجەنگێت؟...

هەموو کردەوەیەك، یا ڕووداوێك یا گەشەکردنێك لەجیهاندا، هەموو ئەوەی لە سروشتدا ڕوو دەدات لەهەمان کاتدا مانای زیادبوونێك لە ماتەوزەدا دەگەیەنێت... بەڵام زیندەوەر،

---

[٤٧] / (بییرلایان) Pierre Lapin, n.p.d.
(بوریس ج. کوزنتیزوف) Boris Kuznjezovi Einstein, trans. vladrimir Talmy (New Yourk: Phaedra, 1970).
[٤٨] / (جان روستاند) Jean Rostand life, The great adventure. (New Yourk: Scribnner, 1956).

توانای هێشتنەوەی ئەو کردارەی هەیە، بە واتای بەردەوامی لە مانەوەدا لە ڕێگەی وەرگرتنی بەردەوامەوە لە (ماتە وزە)وە لە دەوروبەردا..

لەبەرئەوە دەتوانرێت بوترێت کە زیندەوەر.. وزەی خۆی لە (الانتروبی)یەوە وەردەگرێت) [٤٩].

زانای بایۆلۆژی فەرەنسی (تیلهاردی شاردان) قسەیەکی لەو شێوەیەی هەیە دەڵێت: (سەرەڕای هەموو ئەو ڕێگرانەیش چەمانەوە لە لایەن گەردیلە گەورەکانەوە بەردەوام دەبێت بەرەو ئەو زیندەوەرە فرەخانانە بە بێ وەستان، وە ئەمە تەنها یەکێکە لەو چەماوانەی کە ئازادی و، ڕێکخستنی خودیی و ئاگایی.. لێ پەیدا دەبێت.

هەر بۆیەش، پرسیارەکە ئەمەیە: ئایا هیچ پەیوەندیەك هەیە لەنێوان ئەم بزاوتە ئاڵۆزەی جیهان کە بەئاراستەی ئەو حاڵەتانەن کە زیاتر (گرێ)یاوین و بە ڕووی ناوەوەدان، وە لە نێوان ئەو بزاوتەی تر (لە پێشترەوە بە وردی باسمان لێوەکرد)، کە جیهان بەرەو ئاراستەیەکی دەرەکی و سادەتر ڕادەکێشێت...؟ ڕەنگە نهێنی جەوهەری (کەون) لەم پرسیارەدا شارابێتەوە [٥٠]. (ئەو توانا خێراو خۆییەی خانە لە دروستکردنی ئەندامەکانیداو، ڕەفتاری کۆمەڵایەتی لەهەندێك لە (مێرولەکان)دا، لەنێو ئەو حەقیقەتە بنەڕەتیانەدایە کە لە ڕێگەی سەرنجەکانمانەوە فێریان بووین، کە لە حاڵەتی ئێستادا لەژێر ڕۆشنایی تێگەیشتنەکانماندا تەفسیرێکی تێرو تەسەلمان لەبارەیەوە نیە.

(کارل ماسیرز) لە کتێبەکەیدا بەناونیشانی (چارەسەرکردنی دەروونی گشتی) باس لە خاسیەتێك دەکات بەپێچەوانەی ئەوەوەیە کە پێشتر سەبارەت بە زیندەوەران خستمانە ڕوو، دەڵێت: (هەندێ حەقیقەتی دەروونی بە دیاردەکەوێت وەکو ئەوە وایە تازەبن بەشێوەیەك کە یاخی دەبن لە تێگەیشتن، یەك بەشوێنیەکدا دێن، هیچ کامێکیشیان لەوی تریانەوە پەیدا نەبووە، بۆ نموونە قۆناغەکانی گەشەکردنی دەروونی بۆ ژیانێکی ڕێکو یەکسان، لەگەڵیشیدا گەشەکردنێکی تر بەرەو ژیانێکی نارێك هەیە، ئەم بەشوێنیەکدا هاتنانە کە لە تێگەیشتن یاخی دەبن. لە پاشاندا، بەشێکی دوور درێژ لەژیانی دەروونی

---

[٤٩] / (ئیروین شیرودنجر) Erwin Shrodinger: what is life? The physical aspects of the livivng cell (New Yourk: MacMillan Co., 1945).

[٥٠] /ابیر تلیهارد دی شاردان Pierre Teil hard de chardin Activation of enrgy, trans, Rene Hague (New Yourk: Harcourt Brace Jovanovich, 1971).

هەیە ناتوانرێت لێی تێبگەیت. ئەو حەقیقەتە دەروونیانە ناتوانرێت لە دەرەوەدا لێیان بکۆڵرێتەوە، بەهەمان شێوەیش حەقیقەتە سروشتیەکان لێکۆڵینەوەیان لە ناوەوەدا لەسەر ناکرێت).[51]

لەهەمان کتێبدا، (جاسبرز) بەهەمان شێوە ئاماژە بۆ ئەو جیاوازییە دەکات لەنێوان تێگەیشتن و (Verstehen) ئەوەی دەکرێت بەدەست بهێنرێت لەرێگەی گەشەکردنی دەروونیەوە لەگەڵ شترۆڤە کردن (Erklaren) بەواتای کەشفی ئەو پەیوەندیە بابەتیانەی کە لەنێوان هۆو هۆکاردا لە رێگەی زانستی سروشتیەوە دەکرێت.

(جاسبرز) ئەنجامی قسەکەی لەوەدا کۆ دەکاتەوەو دەڵێت : (ئێمە لێرەدا باس لە سەرچاوە کۆتاییەکانی مەعریفەمان دەکەین لەکاتێکدا کە هەریەکێکیان جیاوازییەکی قوڵیان لەگەڵ ئەوی تردا هەیە)[52].

لە ساڵی (١٩٢٩)دا هەر یەکە لە (لویس دی بروجلی) زانای سروشتی فەرەنسی و (نوبل لوریت Nobel Laureate) وتوویانە: (ئێمە ناتوانین تەفسیری ژیان بکەین لە رێگەی ئەو مەعریفانەوە کە لە هەردوو زانستی کیمیاو سروشتیدا هەمانە)[53].

زانای زیندەوەرزانی سویسری (جاینو) جەخت لەسەر ئەوە دەکاتەوە کەوا جیاوازیەکی جەوهەری لەنێوان (کیمیو-سروشتی)و ژیاندا هەیە، دەڵێت: (پێویستە لەسەر زانایانی سروشتی کە دەرك بەوە بکەن، ئێمەی زانایانی ژیان کۆششێکی زۆرمان کردووە لەپێناو تەفسیرکردنی ژیاندا بەشێوەیەکی سروشتی و کیمیاوی، بەڵام هەمووجار رووبەرووی شتێکی تر بووینەتەوە کە لەتەفسیرکردن یاخی دەبێت. بریتیە لە ژیان، ژیان شێوازێکی رێکوپێکی گرتووەتەبەر نەك تەنها جارێك بەڵکو مەلایین جارو لە ماوەی بەلایین ساڵدا ئێمە

---

[51] / هیگل دەڵێت: ماددە لە دەرەوەی خودی خۆیدایە.. رۆحیش مەڵبەندەکەی لەناو خودی دایە.. رۆح بریتیە لە بوونێك لەناخی خودا بڕوانە: George W.F Hegel: Samtliche werke, ed. Herman G. Lockner. (Stuttgart: F. Frommann, 1961).

[52] / (کارل جاسبرز) Karl Jaspers: General psychology, trans. J. Hoeing and marian E. Hamilton (Chicago: University of Chicago press, 1963).

[53] / لویس دی برودجلی Louis de Broglis: Address delivered at stockholm inreceiving the nobel pize , December 12, 1929, (Matter and light: The New physics, trans. W.H. Johnston (New Yourk: Dover publications, 1946) p.165-179.

رووبەرووی توانایەك دەبینەوە لە بونیادنان ناكرێت لە رێگەی زانستی سروشتی و زانستی كیمیاویەوە تەفسیری بۆ بكرێت[٥٤].

بەڵام (ئەندریەلوف) زانای زیندەوەرزانی فەرەنسی كە خەڵاتی نۆبڵی لەساڵی ١٩٦٠دا بە دەستهێناوەو بەناوبانگە بەكارەكانی لە ئالیەتی بۆ هێڵەكانی ڤایرۆسیو بەكتریادا، دەڵێت: (دەكرێت پێناسەی ژیان بكرێت بەوەی كە دابنرێت بە چۆنیەتێك، یا شێوەیەك، یا حاڵەتی بوونەوەرێكی زیندوو. ئەو بوونەوەرە زیندووەیش رژێمێكی سەربەخۆیەو پێكهاتووە لە چەند بونیادێك و، ئیش و كارەكان بەپشت بەستن بەیەكتری توانایی خستنەوەی زیندەوەرێكی تری نوێیان هەیە.

وەكو هەمیشە وتراوە كە ڤایرۆس بریتیە لە پەیوەندێك لەنێوان ماددە ئەندامیەكانو ماددە زیندووەكاندا، لەڕاستیدا ماددەی زیندوو بوونی نیە، شانە پێك دێت لە چەند رەگەزێك: پرۆتین، ئەنزیم، ناوكە ترش، ئەم رەگەزانەیش هیچ كامێكیان رەگەزی زیندوو نین، بەڵكو (كائن)ە ئەندامیەكەیە زیندووە، ئەم (كائن)ە ئەندامیەش لەهەموو بەشەكانی زیاترە. ئێمە سەركەوتووبووین لە دروستكردنی ئاوێتەیەك لە ترشە ناووكی ڤایرۆسی، وە ئەمیش لەخۆیدا هەقی ئەوەمان پیٚنادات كە باس لە بارەی پێكهاتەی ژیانەوە بكەین، چونكە لەهەموو ئەو تاقیكردنانەوەدا پشت بە ڤایرۆسێك بەستراوە كە رەگەزێكی بۆ هێڵی تایبەتە بەكرداری بە ترشە ناوەكی كردن (Nadetide) كەچی ژیان هەمیشە بەشێوەیەكی كتوپڕیو وا بەخێرایی پەیدا دەبێت كە ئێمە هەستی پیٚ ناكەین. بۆ ئێمە ئاسانە هەندێك بەشی پرۆتینو ترشە ناوك بەرهەم بهێنین، بەڵام هەتا ئێستا نەتوانراوە كە زیندەوەرێك دروست بكرێت.. دروستكردنی (تەنها بەكتریایەك) ئەم كارە هەتا ئێستا نەمانتوانیوە پێی بگەین....[٥٥]

(ئیڤان پاڤلۆڤ) كە زانایەكی دەروونی روسییە خاوەنی تاقیكردنەوە بەناوبانگەكان، لە بارەی ئەم بیٚ تواناییەوە دەڵێت:

---

٥٤/ (جانیو) Gaynot, n.p.d.

٥٥/ ئەندریە لوف Andre Louoff: of microbes and life, ed. Jacques monod and Ernest Borck (New Yourk: Colombia University press, 1971).

(بە درێژایی هەزاران ساڵ مرۆڤ خەریکی لێکۆڵینەوەن لە ڕووداوە دەروونیەکان و دیاردەکانی ژیانی ڕۆحی و ڕۆحی مرۆڤایەتی، نەك تەنها لەلایەن زانایانی دەروونیەوە یاخود ئەو کەسانەوە کە تایبەتمەندن بە گرنگیدان بەم کێشەیە، بەڵکو لە هەموو لایەنەکانی ئەدەب و هونەریشەوە.. بەهەزاران لاپەڕە پڕکراوەتەوە بەپێناسەکردنی جیهانی ناوەوەی مرۆڤ، بەڵام هەتا ئێستا ئەو هەوڵ و کۆششانە نەگەیشتوونەتە ئەنجام، ئێمە نەمانتوانیوە کەشفی یاسایەك بکەین ئەوەی کە ژیانی دەروونی مرۆڤ ڕێك دەکات[٥٦].

هەتا (ئەلیکسی کاریل) گومان لەتوانای مرۆڤ دەکات بتوانێت بەتەواوی لەژیانی ناوەوەی شانە تێبگات، دەڵێت: ئەو شێوازانەی ئەندامەکان بەکاری دەهێنن لە بونیادنانی خۆیاندا نامۆیە بەعەقڵی بەشەری.. کۆمەڵێك ماددە کۆدەبنەوە لەنێو شانەیەکی تاکدا، وە هەڵدەستن بەدروستکردنی یەکەی تری لەهەمان شێوە وەئەندامەکان بەڕێگەیەك گەشە دەکەن مەگەر وێنەی ئەمە لەو چیرۆکە خەیاڵیانەدا هەبێت کە بۆ مندالان دەگێڕرێتەوەو باسی ئەو کردارانە دەکات کە جنۆکە پێیان هەڵدەستن، لێرەدا بەتەواوەتی عەقڵمان لە جیهانی ناوەوەی ئەو ئەندامانەدا بزر دەبێت)[٥٧].

هەروەها ئەلیکسی کاریل پاشان دوورتر بۆئەمە دەڕوات و دەڵێت: ئێمە هەتاوەکو ئێستا نەمانتوانیوە بگەینە ئەو نهێنیانە کە ڕێکخستنی لەشمان لەخۆ دەگرت لە ڕووی پێدانی ماددە خۆراکی و وزە دەماریەکان و هەروەها لایەنی ڕۆحیشەوە. یاسا (سروشتی - کیمیاوی)ەکان دەتوانرێت تەنها بەسەر ماددە مردووەکاندا جێبەجێ بکرێن، بەشێوەیەکی کەمیش بەسەر مرۆڤدا.. لەبەرئەوە، پێویستە بەتەواوی خۆمان لە وەهمەکانی چەرخی نۆزدەیەم و بیروڕاکانی (جان لوب) **Jacques Loeb** و ئەو تیۆرە (سروشتی - کیمیاوی) یە بەراییانە ڕزگاربکەین کە لەسەر (کائن)ی بەشەری نووسراون، کە بەداخەوە هەتا ئێستایش زۆرێك لە زانایانی سروشتی و پزیشکەکان پشتگیری لێ دەکەن)[٥٨].

ژیان موعجیزەیەکە زیاتر لەوەی دیاردەیەك بێت. بۆ نموونە سەیری چاوی مرۆڤ بکە لەناو پانتاییەکی پڕ لە چەوریدایە کە دوو پێڵوو لەسەرەوەو خوارەوەدا پارێزگاری لێ

---

[٥٦] / پاڤلۆڤ **Pavlov: Experimental Psychology**.

[٥٧] / (ئەلیکسی کاریل) سەرچاوەی پێشوو لاپەڕە (١٢٧-١٢٨).

[٥٨] /هەمان سەرچاوە.

ئەمەن، پێڵووەکان، دوو لۆچی پێستین کە لەکاتی نوستنندا چاو دادەپۆشن و لە بەئاگایی‌دا لە ئازار دەیپارێزن، بەکەناری پێڵووەوە برژانگی پێوەیە، کە کورتە مووی چەماوەن لە پێڵووی سەروودا بۆ سەرەوەو لە خوارەوەدا بۆ خوارەوە چەماونەتەوە، برۆش، چاو لە دڵۆپی ئارەقی ناوچەوان دەپارێزێت و بەتەنیشتدا شۆڕ دەبێتەوە، بەڵام رژێنی فرمێسك کەوتۆتە لای ژووروی گۆشەی دەرەوەی کالانەی چاوەوە، لە بۆشاییەکی تایبەتی ئێسکی ناوچەوان و رژێنی فرمێسك بەهۆی بۆرییەکەوە فرمێسك دەرێژێت کە ئەو بۆریانە رووەو قنچکی چاو دەکشێت کە لە توورەکەی فرمێسکدا کۆدەبنەوەو، تەڕی چاو دەپارێزن، وە لەو رەگەزانەی کە فرمێسك پێك دەهێنن ماددەیەکە پێی دەڵێن: (لیسوزیم) Lysozyme کە ماددەیەکە دژی بەکتریایەو چاو دەپارێزێت لە پیسی، فرمێسك وەکو لەناوبەرێکی بەکتریا، لەهەموو دەرمانێکی تر کاریگەریی زیاترەو ماددەیەکە توانای لەناوبردنی سەد جۆر بەکتریای هەیە وە ئەو توانایەی دەمێنێتەوە هەتا ئەگەر بۆ شەش سەد جاریش سووکتر بکرێتەوە.

گۆی چاویش لە سێ چین پێك دێت، یەکەم چینی دەرەوە کە ناودەبرێت بە رەقە، ئەم چینە لە پێشەوەی چاودایەو پێکهاتوویەکی زۆر قۆقزەو لە بەشەکانی تری رەقە روونترە، کە ناودەبرێت بە کۆرنیە، دووەم، چینی ناوەڕاست کە پێی دەڵێن (المشیمیة)، چینێکی رەشە کە لوولە خوێنە تایبەتیەکانی چاوی پێدا درێژبووەتەوە ئەم چینە لە پێشەوەی چاودا بەجۆرێك گونجاوەو رەنگینەی چاوی پێکهێناوە، رەنگینە راستەوخۆ دەکەوێتە پشتی کۆرنیەوە لە بەشەکانی تری (المشیمیة)، بەوە جیادەکرێتەوە کە رەنگدارە، کونێکی بچووکی لە ناوەڕاستدایە کونی بیلبیلە بەگوێرەی بری ئەو رووناکیەی دەچێتە چاوەوە یان بەگوێرەی دووری لەشە بینراوەکە لە چاوەوە.

دەگونجێت ئەم کردارەش بەبوونی ریشاڵی لووسە ماسولکەی ئەڵقەیی و تیشکی، لە رەنگینەدا (القرنیة). کە خاودەبێتەوە بەشێوەی دوابەدواو بە کرژبوونی ئەڵقەییەکە کونی بیلبیلە تەسك دەبێتەوە، وە بەگرژبوونی تیشکە ماسولکەکانی کونی بیلبیلە فراوان دەبێتەوە، وە لە پشت رەنگینەوە پێکهاتێکی جیری روونی دوو روو قۆقز هەیە پێی دەڵێن هاوێنەو، رووی دواوەی لە رووی پشتەوەی قۆقزترە، قۆقزی هاوێنە بەهۆی ئەو ماسولکە تایبەتی‌یانەوە کە نووساوە بە هەردوو سەری هاوێنەوە دەگۆڕێت سێیەم بریتیە لە تۆڕە

چین (ناوەکی: گۆی چاو ناوپۆش دەکات و لەسەرە وردەکانی لقە دەماری بینینی چاو، وەرگرەکانی تیشك پێك دێت. ناوچەی پێشەوەی تەنکترە لە ناوچەی دواوەی. لە تۆڕەدا ناوچەیەکی بچوکی زۆر هەستیار بۆ رووناکی هەیە بەهۆی زۆری تەنۆچکە هەستیارەکانی تیایداو، پێی دەڵێن زەردەپەڵەو لە خوارەوەیەو لەدووریی شەش ملیمەترەوە کوێرە پەڵە هەیە کە پنتی لق هاویشتنی دەمارە بینینە لە چاودا. هەروەها ئەو تەنۆچکە هەستیارانەی تێدا نیە لەبەرئەوە سێبەری تەنەکان کە دەکەونە سەری نابینرێ.

وەبەو بۆشاییەی کە دەکەوێتە پێش هاوێنەوە دەڵێن ژووری پێشەوە، چاو ئەم ژوورەی پڕە لە شلەیەکی لیمف ئاسا کە پێی دەڵێن شلەی ئاوی، بەلام بە بۆشایی پشت هاوێنە دەڵێن ژووری دواوە کە بە ماددە شلەیەکی جولاوە پڕکراوەتەوەو ناودەبرێت بە شلەی شووشەیی.

ئەم شلانە شێوەی چاو دەپارێزنو کارێکی وا دەکەن تیشکی رووناکی بگاتە تۆڕە بێ ئەوەی پەرش ببێتەوە.

هەروەها بۆ نموونە جگەر، کە پەردەی پریتۆن داپیۆشیوە، ئەندامێکی شێوە پێکهاتووە ئیسفنجییەو لە دوو پلی سەرەکی پێکهاتووە. جگەر توورەکەی زراوی تێدایە کە بەهۆی زراوەجۆگەی جگەرەوە پێوەی دەنوسێتو دەشکەوێتە پشت پلی راستی جگەرەوە. جگەر بریتیە لە کارگەیەکی کیمیاویی کە هیچ کارگەیەکی تر ناتوانێت لە بەرامبەریدا بوەستێت، چونکە دەتوانێت هەموو ماددەیەکی تری کیمیاوی هاوسەنگ بکاتەوە. وە ئەندامێکە خاوەنی توانایەکی زۆرە لە لابردنی ژەهردا، هەروەها گەنجینەیەکی خوێنەو هەروەها جێگەی ڤیتاميناتە، وە لەو فرمانانەی کە جگەر پێی هەڵدەستێ بریتیە لە دەردانی ماددەی زراو، ئەویش شلەیەکی خەستی تاڵە، رەنگیشی سەوزێکی تێری زەردباوە، یارمەتی هەرسکردنی ماددەی چەوری دەدات بە کەرت کردنی و کۆکردنەوەی بەشێك لەوگی زراو لە توورەکەی زراودا، هەروەها کۆکردنەوەی کاربۆهیدراتی زیادە لە شێوەی نیشاستەی گیانەوەریدا (گلایکۆجین) وە ئەو پرۆتینانەی لە پێویستی لەش زیاترن دەیانگۆڕێت بۆ (یۆریا) و ئەو یۆریایەش بەهۆی هەردوو گورچیلەوە لە خوێن جیا دەکرێتەوەو لەکاتی میزکردن لەگەڵ میزدا فڕێ دەدرێتە دەرەوەی لەش، هەروەها ئەنزایمی (هیبارین) دروست دەکات کە نایەڵێت خوێنی ناو لەش بمەیەت، هەروەها دوو ماددە پێش مەیین

(پۆرپرۆمبین) و ریشال پێك هێن (فایبرۆنۆجین) دروست دەكات، كە گرنگە بۆ خوێن مەیاندن لەكاتی بریندارببووندا.

دەماخ كە دەكەوێتە بۆشایی كەللەی سەرەوە بەسێ چین پەردەی دەرەكی دەورە دراوە پێی دەڵێن پەردەكانی دەماخ (السحایا). پەردەی دەرەوەیان قایمەو مێشك لە ئازار دەپارێزێت و پێی دەڵێن (دایكە دڵڕەقە). پەردەی ناوەوەیان تەنكەو نووساوە بە رووی دەماخەوەو پێی دەڵێن (دایكە میهرەبان) وە لەنێوان هەردووكیاندا شانەیەكی ئیسفنجی هەیە كە پڕە لە موولوولەی خوێن، پێی دەڵێن (جاڵجاڵۆكەیی) و لەناو ئەم پەردانەشدا شلەیەكی روون هەیە پێی دەڵێن شلەی پەردەكان (السائل السحائی)، دەماخ بەگشتی لەم چەند بەشە پێك هاتووە مێشك كەگەورەترین بەشی دەماخەو لە دوو نیوە گوێ لەخوارەوە پێكەوە لكاو پێك دێتو لای ژوورووشیان درزێك لێكیان جیادەكاتەوە رووی هەربەشەیان لە چەند پلێك پێك دێت، بە كەندۆكەی پێچاوپێچ لێك جیادەبێتەوە، چینی دەرەوەی مێشك بۆرەو پێی دەڵێن توێكڵ و لەشی دەمارە خانەكانی تێدایەو بەشە قوڵەكەیشی سپی و لە تەوەری ئەو خانانە پێك دێت توێكڵی مێشك مەڵبەندی هەستیارەكانی بیستن و بینین و بۆن كردن و دووان و دابینكردنی كارە خۆویستەكانە. هەروەك مەڵبەندی هەمەجۆر هۆشە چالاكیەكانی وەك دەروونە هەڵچوونەكان و ژیریی و بیركردنەوەیشە هەرلایەكی مێشك دەست بەسەر لا پێچەوانەكەی لەش و كەمێكیش بەسەر هەمان لاكەی خۆیشیدا دەگرێت و هەرلایەكی مێشك چوار پلە: ناوچەوانە پل مەڵبەندی بیرو ژیریی و سۆزو بۆنی تێدایە، دیوارە پل دەستی گرتووە بەسەر خۆویستە كردارەكانی نیوەی بەرامبەری لەشدا، لاجانگە پل مەڵبەندی دووان و بیستنی تێدایە، وە هەرلایەكی مێشك بۆشاییەكی تێدایە كە شلەیەكی لیمفاوی روونی تێدایە كە دڕكە شلەی دەماخە، مێشكۆكە دەكەوێتە بەشی خوارووی دواوەی مێشك و لە دوو بەش پێك دێت بەهۆی تەنێكەوە لە ناوەڕاستدا پێكەوە بەندن و رووی مێشكۆكە زۆر چاڵ و چۆڵەو ئیشی مێشكۆكە، دەست بەسەراگرتنی جووڵەی ماسولكە خۆویستەكانی لەشەو، ئەگەر تووشی هەر ئازارێك ببێ لەنگەری لەش تێك دەچێت، لامێشە مۆخیش دەكەوێتە بەشی دواوەی بۆشایی بنكی كەللە سەرەوەو مێشك دەگەیەنێت بە دڕكە پەتك، هەندێ مەڵبەندی گرنگی تێدایە كە دەستیان گرتووە بەسەر هەندێ كۆئەندامی لەشدا. وەك كۆئەندامی هەناسەو سووڕانی خوێن. بەتایبەتی دڵ

و مەڵبەندەکانی هەندێ جووڵەی خۆنەویست. کێشی دەماخ دەگاتە نزیکەی ۱۳۰۰ تا ۱٤٥۰ گرام و پێکهاتووە لە ۱٤ ـ ۱٥ بلیۆن خانە[٥٩].

گیانلەبەران هەندێك دەزگا لە لەشیاندا هەیە بەهێزو کامڵترە لەو ئامێرانەی کەمرۆڤ دروستی کردوون. نموونەیش لەم بارەیەوە زۆرە: ڕووناکی لەلای هەندێك لە گیانلەبەران، جیڕەی کوللە، شیڕەی سیسرکی شەوو کۆمەڵێکی زۆر لە تەڵەو داوو زەمق و شتانی تر کە بۆ جێبەجێ کردنی پێویستیەکانی بەکاریان دەهێنێت.... (ئەندریە تتری) کتێبێکی تەواوی لەسەر ئەم بابەتە داناوە بەناوی (کەرەستەکان لەلای زیندەوەران)[٦٠]. کە ئەمە بەڵگەیە لەسەر ئەوە کە پەرەسەندن بەڕێگەیەکی کوێرانەو ئالیانە پێش ناکەوێت هەروەکو (داروین) بڕوای وابوو بەڵکو پەرەسەندن شوێن بنەمای سوودبەخشین دەکەوێت، ئەو ڕەوتە دەگرێتە بەر کە سوودمەندە بۆ بوونەوەر، ئەمەیش ئاماژەیە بۆ بیرۆکەی دروست کردن (الخلق) کە لە دەرەوەی خواستی مادەدایە[٦١]. لە ماری زەنگۆڵەداردا توانایەك دۆزراوەتەوە سەبارەت بە هەستکردن بەتیشکی سەرو سوورەوە، زانایان لە زانکۆی کولورادو لە وڵاتە یەکگرتووەکان سەلماندویانە کە بوونی ئەو ئامێرە کەشف کەرە لەسەری ماردا کە پێکهاتووە لە دەمارە هەستی زۆر وریا کە لە شانەی تایبەتی پێك هاتووە لە کاتێکدا کە ڕوناکیان بەردەکەوێت دەگۆڕێن. تاقیکردنەوەکان ڕونیان کردوەتەوە کە بەهۆی ئەو ئامێرەوە کاردانەوە لە ماردا لە ماوەی ۳٥ میللی چرکەیەکدا ڕوو ئەدات لە پاش بە دەرکەوتنی تیشکەکە. کە ئەمەیش ژمارەیەکی ( قیاسی)یە لە ماوەی هەر کاردانەوەیەکدا کە لە هەر ڕژێمێکی بایۆلۆژیدا زانرابێت هەتا ئێستا.

لەسەر لووتی ماسی (قرش)دا هەواییەکی کارەبایی هەیە کە یارمەتی ئەدات لە دۆزینەوەی ئەو خواردەمەنیە شاراوانەیەی کە لەناو لمی ژێر دەریاکاندایە. ئەو

---

٥٩ / سەبارەت بەپێکهاتەو چۆنیەتی ئیشو کارەکانی ئەو سێ ئەندامە هەرە گرنگەی لەشی مرۆڤ بۆ ئەوەی بەشێوەیەکی روونتر خوێنەر بتوانێت لێی تێ بگات هەوڵم داوە سوود لەهەندێ کتێبی زانستی تر وەربگرم لەو ڕووەوە کە ئەم زاراوانە لە زمانی کوردیدا نوێن لە ڕووی ناو لێنان و بەکار هێنانەوە. (وەرگێڕی. ك)

٦٠ / (ئەندریە تتری) Andre Tatry: les putils chezlas etres vivants (Tools among giving beings) (n.p,n.d)

٦١ / بۆ زیاتر زانیاریت لەم بارەیەوە بڕوانە: Lacian Caenot: Lnv ention et finalite en biologie (paris:masso) et cieediteairs,1951).

زیندەوەرانەی کە لەناو دەریادان شەپۆلێکی کارەبایی لاواز دەنێرن کە ماسی (قرش) دەتوانێت بیانگرێت و هەستیان پێ بکات بەهۆی ئەو هەواییەوە.

بەڵام دکتۆر (ئەلکسەندەر جوربوفسکی) کە ئەندامە لە ئەکادیمیەی زانستی سۆڤیەتدا، گەڕاوەتەوە سەر ئەو بیرۆکە کۆنەی کە (ئەنیشتاین) و چەند کەسانێکی تر پشتگیریان لێ کردووە، کە دەڵێت: هەندێك خەسڵەتی شاراوە لە پێکهاتەی گەردوون و ماددەدا هەیە. لێرەدا چەند نموونەیەکی گرنگتان لەو کتێبە بۆ وەردەگرین:

بە هەزارەها لە مێرووڵەی سپی هاوکاری دەکەن لە بنیادنانی (قەڵا)ی مێرووڵەدا[٦٢] وە کاتێك کە تەواو دەبێت، دەبینیت وردەکارییەکی زۆری تێدا کراوە. بەشێکی زۆری تەرخان کراوە بۆ تونێل و گەنجینەی خۆراك هەڵگرتن و پووش و پەڵاش و ژووری هێلکەکردن.. هتد. جارێکیان تاقیکردنەوەیەکیان لەسەر ئەنجام درا: قەڵای مێرووڵەیەکیان کرد بە دوو بەشی تەواو لەیەك دابڕاوەوە لەکاتێکدا هێشتا لە قۆناغی سەرەتایی دروست کردنیدا بوون، واتە تەنها بناغەکەیان داڕشتبوو. سەرەڕای ئەویەیش بەسەرکەوتوویی لەکارەکەیاندا بەردەوام بوون، هەموو هۆڵ و تونێل و گەنجینەکان دروستکران و لە هەموو بەشێکیدا بە هەمان شێوەی بەشەکانی تر، بەڵکو زیاتریش لەمە پەیوەندی هاوبەشیان لەنێوان بەشەکاندا دروست کرابوو. لێرەدا ڕەنگە واگومان بەرین کە هەریەکە لەم مێرووڵانە زانیاری تەواوی لەبارەی کاری دراوسێکەیەوە هەیە لە بەشەکەی تردا، چونکە هەردووکیان بەهەمان شێوازو نەخشە کاریان کردبوو، بەڵام دەرکەوتووە هیچ کامێکیان ئاگاداری کاری ئەوی تریان نەبووە، چونکە هیچ پەیوەندیەك لەنێوانیاندا نەبووە، با لێرەدا هەوڵ بدەین تەفسیرێکی ئەم دیاردەیە بکەین..

ئاشکرایە کە هەر مێرووڵەیەك بەتەنها هەموو زانیاریەکی لەبارەی نەخشەی گشتی شارەکەوە نەبووە، بەڵکو هەریەکەیان بەتەنها بەشێکی کارەکەی پێسپێراوەو شارەزایی بەشێکیەتی. لێرەدا دەگەینە ئەو ئەنجامەی کە مێرووڵە تەنها لەناو کۆمەڵەکەیدا زانیاری تەواوی هەیە، بەمانایەکی تر تاکەکان وەکو ئەندامێك لە کۆمەڵەکەدا (زانیارییەکی

---

[٦٢] /قەڵای مێرووڵە: مێرووڵە بە جەستەی خۆیان دروستی دەکەن و جەستەی خۆیان دەبێتە خشتی بونیادنانی، لەم کارەیاندا مرۆڤ عەقڵی سەرسام دەبێتو موعجیزەی بۆ دەرکەوێت. (وەرگێڕ ع)

گەورەیان) هەیە بەڵام هەریەکێکیان بەتەنیا خۆی خاوەنی هیچ نیەو ناتوانێت هیچ کارێك بکات.

بۆ ماوەیەکی زۆر ئەو بیروباوەڕە باوبوو کە گوایە پۆلی باڵندە کۆچەریەکان لە ڕێگەوباندا بۆ ناوچە گەرمەکان باڵندەیەك پێشڕەوییان دەکات کە لەهەموویان بەتەمەنترەو شارەزاترە. بەڵام راستیەکان ئەم بۆچوونەیان نەسەلماند، پرۆفیسۆر (جاموتو هیروسوکی) Jamato Hirosuke کە زانایەکی پەلەوەرناسی یابانیە ئەوەی دۆزییەوە کە باڵندەکان لەکاتی رەوکردندا هیچ باڵندەیەك ڕێنماییان ناکات.

وە ئەگەر باڵندەیەك بینرا کە لەپێشەوەی هەموویانەوە بوو، مانای ئەوە نیە ئەو باڵندەیە سەرۆکی پۆلەکە بێت، بەڵکو هەندێك جار دەبینین ئەوەی لەپێشەوەیە باڵندەیەکی زۆر بچکۆلەیەو رەنگە هێشتا تەواو پەڕی دەرنەکردبێت، دیارە باڵندەیەك بەو شێوەیە تەنانەت ئەو ڕێگایانەیش کە پێشتر پێیاندا تێپەڕیوەو شارەزایانە رەنگە نەتوانێت بچێتەوە سەریان چ جای ئەوەی کە ڕێنمایی پۆلێ باڵندە بکات.[٦٣]

(جوربوفسکی) لەسەر هەمان بابەتی بەردەوام دەبێت و دەڵێت:

لەو حەقیقەتانەی کە زیندەوەرزانی دووپاتیان لەسەر دەکاتەوە ئەوەیە کە پەیوەندی لە نێوان لەدایك بوونی نێرینەو مێینەدا یەکسانە، وەئەگەر ئەم پەیوەندیە لەحاڵەتێکدا تێك بچێت ئەوا کتوپڕ کرداری هاوتایی کردنی سەر لەنوێ دەست پێ‌دەکاتەوە.

ئەگەر ژمارەی مێینە لەناو کۆمەڵگادا کەمی کرد، ئەوا ژمارەیەکی زۆر مێینە لەدایك دەبێتەوە. وەئەگەر نێرینە بەرەو کەم بوونەوە چوو، بەهەمان شێوە ژمارەی نێرینە زیاد دەکاتو وەبەو شێوەیە... ئەو کردارە بەردەوام دەبێت هەتاوەکو هاوتاییەکە دروست دەبێتەوە.

وەکو ئاشکرایشە مرۆڤ وەکو بونەوەرێکی تاك بێ لایەنەو ناتوانێت کار بکاتە سەر دیاری کردنی رەگەزەکەی. بەمانایەکی تر ئێمە (جارێکی تر) لەبەردەم دیاردەیەکداین کە پەیوەستە بەچەند یاسایەکی تایبەت بەخۆیەوە... ئێمە جارێکیتر ڕووبەڕووی کارتێکردنێك دەبینەوە کە لە دەرەوەی توانای هەر بوونەوەرێکی زیندووی تاکەوە دێت.

---

[٦٣] / ئەلکسەندەر جوربوفسکی Alexander G orbousky,n.p.d.

ئەم دیاردەیە لەناو رەگەزی بەشەریدا لەگەڵیدا راهاتوون، زانایانی بواری ئامارکردنی دانیشتوان پێی دەڵێن (دیاردەی سالانی جەنگ) کە لەو سالانەدا بەهۆی شەڕەوە ژمارەیەکی زۆر لە پیاوان دەکوژرێت، بەلام بەخێرایی ژمارەی لە دایك بوونی نێرینە زیاد دەکاتەوە بۆ ئەوەی هاوسەنگییەکە بپارێزرێت[٦٤].

ئەم نموونانەی پێشوو لە یەکەم کتێبی لێکۆڵینەوەی زیندەوەرزانیدا وەرم گرتوون ئەم موعجیزە حەقیقیانە لە سروشتدا، ئایین بەو شێوەیە تەفسیریان دەکات، کۆمەڵە کردارێکن کە لەلایەن عەقڵێکی بالاوە پێی هەڵدەستێت کە بریتیە لە (خوای گەورەو بالادەست).
دەکرێت هەموو تەفسیرە زانستیەکان لەم بوارەدا لەوەدا کورت بکەینەوە کە دەڵێت ئەمانە کۆمەڵێك موعجیزەن و لە خۆیانەوە دروست بوون. ئایا ئەوە گەورەترین خورافە نیە کە عەقڵی مرۆڤی داگیرکردووە؟ داوا لە کەسێك بکەیت کە عەقڵیەتی قەناعەت بەوە بکات کە شتێك لە ئەوپەڕی پلەی وردەکاریی و کامڵیدایە وەکو پێکهاتەی چاوی مرۆڤ یاخود عەقڵی یا هەر ئەندامێکی تری لەش کە ڕێکەوت هێنابێتیە بوونەوە.

وەکو ئەوە وایە کە داوا لەکەسێك بکەیت کە بڕوا بەوە بهێنێت ئەفسانەکانی گریك حەقیقەتێکی واقیعین.

لێرەدا پوختەی هەڵوێستمان دەخەینە ڕوو، بە چەند قسەیەکی فەیلەسوفی گەورەی ئیسلام (ابو حامد محمد الغزالی) دەڵێت: هەموو موعجیزەکان سروشتین، وە سروشت هەمووی بریتیە لە موعجیزە.

سەبارەت بە (ڕێکخستنی زاتی ماددە) و (دروستکردنی زاتی) بۆ هەموو ئەو دەزگا وردو ئاڵۆزانەی کە ئەم جیهانە زیندووەیان پڕکردووەتەوە؟ با بڕوانین لە (ڕێکخستنی زاتی) یاخود (دروستبوونی بە ڕێکەوت)ی تەنها یەك گەرد لە پڕۆتین کە ماددەیەکی بنەڕەتیە بۆ هەموو ئەو زیندەوەرانەی لای ئێمە ناسراون.

(چارلز یۆگین جای) کە زانایەکی سروشتی سویسریە هەوڵیدا بە حساب کردنی ئەگەری دروستبوونی بەرێگەوتی یەك گەرد لە پڕۆتین.

---

[٦٤] / هەمان سەرچاوە.

وەکو زانراوە کە گەردی پرۆتین پێکهاتووە لە چوار ڕەگەزی جیاواز بەلایەنی کەمەوە. وە بۆ ئەوەی حساب کردنەکە ئاسانتر بێت (ئەو) وای دانا کە گەردی پرۆتین تەنها لە دوو ڕەگەز پێك دێت کە بریتیە لە (٢٠٠٠) ئەتۆم بەکێشی ئەتۆمی (١٠) وە بەبێ ڕەچاوکردنی گەردی لە (٠,٩) بەپێی ئەو مەرجە ئاسانانە (جای) ئەگەری دروستبوونی پرۆتین (بەڕێکەوت) بە (٢,٠٢*١٠-٢٣١) دانا. وە ئەگەر ئەو ئەنجامەمان لە چوارچێوەی تەمەنو قەبارەی ئەم زەویەدا دانا. ئەوا دروستکردنی گەردێکی لەو شێوەیە ١٠٢٤٣ بلیۆن ساڵ دەخایەنێت لەژێر هەلو مەرجێکی ٥١٠١٤ لەرزینەوە لە چرکەیەکدا، کەواتە بەپێی ئەمە هیچ ئەگەرێك نیە بۆ ئەوەی کە ژیان بەرێکەوت گەشەی کردبێت لەماوەی (٤,٥) بلیۆن ساڵدا لەکاتێکدا کە ئەو ماوەیە بەتەمەنی زەوی مەزەندە دەکرێت.

(مانفرید ئەیگن Manfred Eigen لە (پەیمانگای ماکس پلان بۆ کیمای سروشتی زیندەیی) کە لە گوتنگنی ئەڵمانیا لەساڵی ١٩٦٨ز خەڵاتی نۆبڵی لەکیمیادا بەدەست هێناوە سەلماندی کە هەموو ئەو ئاوەی لەسەر ئەم زەویەدا هەیە بەشی ئەوە ناکات کە بەرێگەی رێکەوت تەنها یەك گەردی پرۆتینی پێ بەرهەم بهێنرێت، هەتا ئەگەر هەموو گەردوون پڕبێت لە ماددەی کیمیاویو بەشێوەیەکی بەردەوام لەیەکگرتندا بن. ئەوا بە بەلایین ساڵو لەو کاتەوەی گەردوون پەیدا بووە بەس نیە بۆ ئەوەی تەنها یەك جۆرە پرۆتین بەرهەم بهێنرێت.

لە ڕووبەڕووبوونەوە لەگەڵ ئەم حەقیقەتەدا بۆگین گەیشتە ئەو ئەنجامەی کە: پەرەسەندن لەپێشی ژیانەوەیە واتە بوونی (ژیان لە پێش ژیان)دا هەروەك چۆن تیۆرەکەشی هەر بەو ناوەوە ناسراوە.

یۆگین توانای دروستکردنی ژیان دەگێڕێتەوە بۆ ناوکە ترش، بەمەش هەرسێ بنەمای رێکخستنو هەڵبژاردنو ڕەخسان بەیەکجار دەداتە پاڵ ماددە، لەکاتێکدا ئەو بنەمایانە بەهیچ شێوەیەك ناچنە ناو پێناسەی ماددەوە.

هەردوو زانای بەریتانی (فریدریك هویل Frederic Hoyle سەرۆکی پێشووی کۆمەڵەی فەلەکی شایانە، وە شاندرا فیکراما Chendra Vikrama لێکۆڵینەوەیەکیان لەسەر هەمان ئەو گرفتە کردو گەیشتنە ئەو ئەنجامەی کە ژیان لەسەر زەوی گەشەی نەکردووە بەڵکو لەگەڵ ڕاکێشانی غوباری گەردونیەوە لە قوڵایی گەردوونەوە هاتووە.

کەواتە بەپێی ئەو بۆچوونەی ئەوان، ئەوا چالاکی زیندەگی لەگەردووندا دەگەڕێتەوە بۆ پێش دروستبوونی زەوی.

زانای رووسی (بلاندین) **Blandin** دەڵێت: ئەگەر ملیۆنێك کارگە لەسەر زەوی بۆ ماوەی مەلایین ساڵ کاربکەن لەپێکھاتەی رەگەزە کیمیاویەکاندا، ئەوا ئەگەری دروستبوونی ژیان لەناو بۆریەکی تاقیکردنەوەدا شتێکی دانسقە دەبێت بەپێی ئەو حساباتەی (ھولدن) **Holden** ئەو ئەگەرە بریتیە لە (١ بۆ ١٣١٠).[٦٥]

ئەمە بە نیسبەت رێکخستنی زاتی یەك گەرد لە پرۆتینەوە، وە ئەگەر بەراورد بکرێت بە ھەموو بوونەوەر، وەکو ئەوە وایە پارچەیەکی بچووك بە بینایەکی تەواوو کامڵ بەراورد بکرێت.

زانست ـ بەتایبەتی بایۆلۆژی گەردەیی توانیویەتی ئەو کەلێنە گەورەیە کە لەنێوان ژیانو ماددەی مردوودا ھەیە بچووك بکاتەوە، بەڵام ئەو کەلێنە بچووکەی کە ماوەتەوە زەحمەتە تێپەڕین بەسەریداو حساب بۆ نەکردنیشی بە ھەڵەیەکی زانستی دادەنرێت کەچی لەگەڵ ئەمەیشدا ھەڵوێستی رەسمی ماددیەت وەھایە.

دەکرێت بەم شێوەیە تەفسیری ئەو جیاوازییە ئاشکرایە بکەین: ئەگەر لەئەنجامی گەڕانێك بە دوای شوێنەواردا دوو بەردمان دۆزییەوە کەبەشێوەیەکی تایبەتی دانرابوون بۆ مەبەستێك، ئەوا ھەمووومان وەڵاممان ئەوە دەبێت کە ئەمە کارێکە مرۆڤ لەسەردەمی کۆندا پێی ھەستاوە، وە ئەگەر بەنزیك بەردەکەوە ئێسکە پەیکەرێکمان دۆزییەوە کە زیاتر لە بەردەکە وردەکاریی و کامڵبوونی پێوە دیاربوو بەپلەیەك کە بەراور نەکرێت ئەوا ھەندێکمان بیر لەوە ناکاتەوە کە ئەمە دەستکردی کەسێکی بەتواناو بەئاگا بێت، بەڵکو وا سەیری ئەو ئێسکە پەیکەرە کامڵە دەکەن کە ئەوە شتێکە خۆی بەرێکەوت پەیدا بووە بەبێ ئەوەی عەقڵ یاخود ئاگایی کاریگەرییەکیان ھەبێت. ئایا ئەمە ئینکارکردنێکی ئاشکرای مرۆڤ نییە، بەرامبەر بە پەروەردگار؟

تەسکیی بیرکردنەوەو تێڕوانینی مرۆڤی نوێ زیاتر لەوەدا دەردەکەوێت کە بڕوای وایە ھیچ جۆرە پەڕلە (لغز)ێك لەبەردەمیدا نیە، وەکو ئەوەی کە دانایی ئەو کەسە بریتی بێت

[٦٥] / بلاندین Blandin, n.p.d.

لەکۆی زانیاری و نەزانیەکانی پێکەوە، لە ڕاستیدا ئەوە هەمووی نەزانینە، بەڵام مرۆڤ نائاگایە پێی، هەتا وەکو مەعریفەیەکیش سەیری دەکات، لە ڕووبەڕوو بوونەوەی گەورەترین (لغز)دا بەشێوەیەکی زۆر سەرکەش و لەخۆباییانە هەڵسوکەوت دەکات، ئا لەمەدا قەبارەی ڕاستەقینەی نەزانیی و دەمارگیریی مرۆڤ دەردەکەوێت، کە وادەزانێت وەڵامێکی تەواو پڕاوپڕی داوەتەوە.

(پەڕەسێلکە) یەکێکە لەو باڵندانەی کە لە ئەوروپاوە بەرەو ئەفریقا کۆچ دەکات، پاشان لە وەرزی بەهاردا دەگەڕێتەوە بۆ ئەو شوێنەی کە پێشتر هێلانەی تێدا دروست کردووە. باشە چۆن زانی کە پێویستە کۆچ بکات و وە چ کاتێك دەبێت بگەڕێتەوە؟ وە لەگەڵ گەڕانەوەیدا چۆن زانی لەنێوان هەزاران سەربانداو لەشارێکی گەورەدا ئەو بانە بدۆزێتەوە کە هێلانەکەی لەژێریدا کردووە؟ لە وەڵامی ئەم پرسیارەدا مرۆڤی لەخۆبایی بەخۆی دەڵێت: (غەریزە) ڕێنمایی ئەو باڵندەیە دەکات یاخود دەڵێت ئەوە مەسەلەیەکە پەیوەندی بە هەڵبژاردنی سروشتیەوە هەیە. ئەو باڵندانەی (دەزانن) پێویستە بڕۆن بەرەو ناوچەیەکی گەرمتر، ئەمە هۆیەکە بۆ ئەوەی پارێزگاریی لە مانەوەیان بکات، بەڵام ئەوانەی تر کە (نازانن) ئەوانە لەسەرمان هەڵدێنو دەمرن. ئەو غەریزەیەش کە پاڵیان پێوە دەنێت بۆ کۆچ کردن لەئەنجامی ئەو مەعریفە کەڵەکە بووەوەیە کە هی هەزاران نەوەی پێش خۆیانە.

لێرەدا خودی گرفتەکە لەناو ئەم وەڵامە بۆشەدا نیە، بەڵکو لەوەدایە کە ئەو کەسە وای بۆ دەچێت کە وەڵامێکی ڕەهای پرسیارەکەمانی داوەتەوە، بەڵام بێئاگایە لەوەی کە پێش هەموو شتێك پرسیارکردن مەرجێکە لە مەرجەکانی گەڕان بە شوێنی حەقیقەتدا. هۆی دەرکەوتنی تیۆری گشتی ڕێژەیی بەو شێوە فراوانە دەگەڕێتەوە بۆ حەقیەقتێك لەکاتێکدا (ئەنیشتاین) بینی کە هەندێك گیرو گرفت هەیە کە ئەم بیریان لێدەکاتەوە، کەچی بەڵای خەڵکانی ترەوە پێیان وایە کە هەموو شتێك دیاریکراوو ئاشکرایە لە کارە گرنگەکانی ئایینو هونەرو فەلسەفە ئاراستەکردنی ڕوانینی مرۆڤە بۆ پرسیارەکانو (لغز)و نهێنیەکان. کە ئەمە هەندێك جار دەمانگەیەنێتە جۆرێك لە مەعریفە، بەڵام زوربەی جارەکان دەمانگەیەنێتە ئەوەی هوشیاربین بەزانینمان، یاخود بۆ گۆڕینی ئەو نەزانینەمان کەهەستی پێناکەین بۆ نەزانینیەك کە پێی دەزانین کە نەزانینە، هەر ئەمەیشە هێڵی جیاکەرەوەی نێوان نەزان و دانا.. هەندێك جاریش هەردووکیان پێکەوە خاوەنی زانیاریەکی کەم دەبن

سەبارەت بە هەندێك شت، بەڵام نەزانەکە بەپێچەوانەی داناکەوە ـ نەزانینەکەی بەرەو ئەوەی دەبات کە وەکو مەعریفەیەك مامەڵەی لەگەڵدا بکات و کاری لەسەر بکات.

ئەو بەسادەییەکی کوێرانە دەڕوانێتە شتەکانو هیچ تەنگو چەڵەمەیەك نابێتەوە تێیاندا، بەلای ئێمەیشەوە ئەوە کوێرێکە کە موعجیزە نابینێت، لە ئەو جۆرە هەڵوێستانەیشدا زۆرجار هەڵەی ترسناك پەیدا دەبێت لە ژیانی کرداریی و رۆژانەدا، مرۆڤی نەزان متمانەیەکی گەورەی هەیە بە خۆی، بەڵام دانا بەشێوەیەکی وردو بە گومانەوە مامەڵە لە تەك شتەکاندا دەکات وەکو (هاملت)، ئەمەیش خەسڵەتی سەرنجدان ئەبەخشێتە کەسانی نەزان کە ئەمە حاڵەتێکە جیاوازە لەو حاڵەتەی کە پێی دەوترێت تێڕامان. مادام (هەموو شتێك روون و ئاشکرا بێت) کەواتە هیچ پێویست بە رامان و وردبوونەوە ناکات، وە ئەمە ئەو هەڵوێستە عەقڵییەیە کە پێی دەوترێت (مرۆڤی جەماوەریی) یا بەمانایەکی‌تر (رەشۆکی)، ئەم توێژەی خەڵك مێشکیان قاڵ ناکەن بە (لغز) و نهێنیەکانەوە، ئەو هەست ناکات بەهیچ جۆرە سەرسوڕمانێك لەکاتێکدا رووبەڕووی نادیارێك دەبێتەوە، بەڵام ئەگەر گرفتێکی گەورەتر رێگای پێ‌گرت، ئەوا بەشێوەیەك خۆی بیەوێت پێناسەیەکی بۆ دەکات و ناوێکی بۆ دادەنێت و پاشان دەچێتەوە سەر هەمان رەوتی ژیانی و دوایی وایدادەنێت ئیتر گرفتەکە چارەسەر بووە، هەر لەوێیشەوە ئەم جۆرە زاراوانە پەیدا بوون (غەریزە) و (رێکخستنی زاتی مادده) و (شێوەی ئاڵۆز) یا (مادەیەکە کە رێکخستنێکی بەهێزی هەیە).

ئێمە ناتوانین تەفسیری ژیان تەنها بە رێگە زانستیەکان بکەین چونکە ژیان موعجیزەو دیاردەیەکە پێکەوە، زۆرجار سەرسام بوون و واق وڕمان باشترین شێوەن لە شێوەکانی تێگەیشتنمان لە ژیان.

# واتای فەلسەفی مرۆڤایەتیی

(هەوڵدان لەپێناو چێژ وەرگرتن لە هەندێ تابۆو تەقسی ئایینی، تەنها مەبەست لێی دووپات کردنەوەیە لەسەر ئەو جیاوازییانەو ڕاکردن لە ئازار)، ئا بەم دەستەواژەیە دوو گەورە فەیلەسوفی فیکری ماددی کە بریتین لە (ئەبیکۆر) **Epicurus** لە رابردوووداو، هۆلباخ **Holbach** لەچاخی نوێدا بنەمای بنەڕەتی ژیانیان دیاری کردووە. نەك بەتەنیا ژیانی مرۆڤ، بەڵکو ژیانی گیانلەبەرانیش، ماددیەت هەمیشە جەخت لەسەر لێکچووەکانی نێوان مرۆڤ و گیاندار دەکاتەوە.

ماددیەتیش لە هەوڵەکانیدا بۆ جەخت کردنەوە لەسەر بوونی سروشتی ئاژەڵی لە مرۆڤدا، زۆرجار زیادەڕۆیی دەکات[٦٦].

(داروین) مرۆڤی بە ئاژەڵ دانەناوە، بەڵکو وایدادەنێت ئەو مرۆڤەی ئێستا خاوەنی فامو هوشیارییە بنچینەیەکی ئاژەڵیی هەیە، بەسوود وەرگرتن لەو هوشیارییەش، کەسانی تر هاتوونو بەهەمان شێوە هەڵوێستی (گونجاو)یان لە ڕەوشت و سیاسەتدا بەرهەم هێناوە، کۆمەڵگەی مرۆڤایەتی لە گەلە ڕانێك دەچێت بەلام لە شێوەیەکی ژیاری پێشکەتوودا، شارستانیەت بریتیە لە وریابونەوەی مرۆڤ کە لەخۆیدا ڕەتی هەموو تابۆ ئاینیەکانی هەڵگرتووە هەروەها، هێزی لەسەر سروشت و ژیان بەهەستەکان نەك بە ڕوح... هتد.

پەرەسەندن ـ کە یەکبوون (یاخود بەردەوامی) لەنێوان ئاژەڵ و مرۆڤدا دامەزراندووە ئەو جیاوازیانەیشی بەتاڵکردوەتەوە کە لەنێوان سروشت و ڕۆشنبیریدا هەن، بەلام ئەگەر لە

---

[٦٦] / باشترین نموونەیش بۆ ئەم هەڵوێستە ئەو سووربوونو پێداگرتنەیە لەسەر ئەوەی کە پەیوەندی سێکسی ئازادییەکی ڕەهای هەبووەلە ماوەیەك کە لەپێش مێژووەوە بووە (هەموو ئافرەتێك بۆ هەموو پیاوانو هەموو پیاوێکیش بۆ هەموو ئافرەتان). سەرەڕای ئەمە (ئینگلز) بە ئاشکرا دانی بەوەدا ناوە کە هیچ بەڵگەیەکی ڕاستەوخۆ نیە لەسەر ئەوەی کە لەو سەردەمەدا بارودۆخی کۆمەلایەتی بەو شێوەیە بووبێت، هەتا ئێستایش سوورە لەسەر ئەو ڕایەی لەکتێبەکەیدا بەناونیشانی (بنچینەی خێزان). کەواتە ئاشکرایە کە هۆکاری کاریگەر لەکێشەکەدا بڕیارێکی‌ئایدۆلۆژییە نەك حەقیقەتێکی زانستی. بڕوانە: **Engels: The origin of the family. Private property and the state, serboco atian trans. (Zagreb: Napriy ed. 1945) p.28.**

گۆشەنیگایەکی ترەوە بڕوانین، دەبینین ئایین دەیەوێت ئەو جیاوازییە لەنێوانیاندا بگەڕێنێتەوە. لەبەر ئەوە، بەتێڕوانین لەئاکاری دروستکراوی خوایی، بۆمان دەردەکەوێت کە رۆشنبیری پێکەوە لەگەڵ مرۆڤدا، بە ڕەقی دژی هەموو بیرۆکەیەکی پەرەسەندنی مێژویی مرۆڤ دەوەستنەوە. لێرەدا دووبەرەکی لەنێوان رۆشنبیری و ژیاریدا دەست پێدەکات.

لەکاتێکدا (کامۆ) دەڵێت: (مرۆڤ گیانلەبەرێکە کە رەتی ئەو چارەنوسەی خۆی دەکاتەوە) [٦٧]. (هوایتهید) لەو رەت کردنەوەیەدا جەوهەری هەڵوێستە ئاینییەکە دەبینێتەوە (ئەو رەت کردنەوە مەزنە) [٦٨]. وەکو ئەوەی ئایین بڵێت: (بڕوانە بزانە ئاژەڵ چی دەکات تۆ پێچەوانەکەی بکە، کاتێك ئەو نێچیر دەگرێت تۆ رۆژوو بگرە، ئەو پۆخڵەیی و خراپە دەکات بەڵام تۆ چاکەو پاکیزەیی بنوێنە، ئەو بەو شێوەی کۆمەڵ و گەل دەژی تۆ هەوڵ بدە بە تەنیا بژی، ئەو تێدەکۆشێت لەپێناو لەزەت وەرگرتنداو لە ئازارو ناخۆشی خۆی لا ئەدات، بەڵام تۆ پێویستە خۆت بخەیتە نارەحەتیەوە، بەکورتی واتە: گیانلەبەران بە جەستەیان دەژین، بەڵام پێویستە تۆ بە گیان (رۆح) بژیت).

ڕەتکردنەوەی ئەو هەڵوێستە ئاژەڵیە، ئەو (خواستە سلبیە) کە ناتوانرێت بە پێوەری داروین و تیۆرە عەقڵانیەکانی تر تەفسیر بکرێت، حەقیقەتێکی بڕندەیە بۆ ژیانی مرۆڤایەتی لەسەر ئەم ئەستێرەیە. ڕەنگە هەندێ جار مایەی ناخۆشی بێت یان مایەی خۆشی بێت بۆ مرۆڤ، بەڵام وەکو تاکە خەسڵەتێکی تایبەت بەمرۆڤ دەمێنێتەوە.

لەلایەنی واقیعیەوە هاوڕێکیەکی تەواوو لە هەمان کاتدا دورکەوتنەوەیەکی رەها لەنێوان مرۆڤو ئاژەڵدا هەیە. ئێمە لە لایەنەکانی بایۆلۆژی بونیادییەوە لێك چوونێك دەبینینەوە ـ مەبەستم لایەنە ئالیەکەیە ـ بەڵام لەلایەنەکانی ترەوە هیچ لێك چوونێك نابینرێت، ئاژەڵ بوونەوەرێکی بەریئو بێگوناهە، وە لە ڕووی ئەخلاقیەوە بێلایەنەو بوونی وەکو هەر شتێکی تر وایە جگە لە مرۆڤ، بەڵام مرۆڤ هیچ کاتێك بەو شێوەیە نیە. هەر لەو ساتەوەی کە (ئاژەڵیەتی لێ داماڵرا) وە لەو (پێشەکیە درامیەدا کە لەئاسمان بەسەریدا هات) وەیا لەو

---

[٦٧] (ئەلبرت کامۆ) Camus:Hom me rewlte

[٦٨] (ئەلفرید هوایتهید) Alfred white head: Scince and the modern world (new york: macmilian.1926)

ساتەوەی کە ناسراوە (بەدابەزین بۆ سەر زەوی) ﴿ اخرجوا منها جميعا... ﴾، مرۆڤ لە دەسەڵاتیدا نەماوە ئەوە هەڵبژێرێت کە وەکو ئاژەڵێکی بەریئ ڕەفتار بکات. ئەو ڕەوانە کراوێکە کە گەڕانەوە لەدەستی خۆیدا نیە. لەبەر ئەوە هەموو چارەسەرێکی (فرۆیدیانە) (Freudian) بە دوور دەزانرێت. مرۆڤ بێت یاخود ئاژەڵ، بەڵکو لەنێوان دووڕیانێکدا وەستاوە کە ئەتوانێت یەکێکیان هەڵبژێرێت ئەویش ئەوەیە مرۆڤ بێت یامرۆڤ نەبێت.

مرۆڤ بەو شێوە سادەیە کەباسی دەکەن گوایا ئاژەڵێکی کامڵ بووە، ئەگەر بەو شێوەیە بێت، دەبوو ژیانێکی ساکاری هەبوایەو بەدوور بوایە لەهەموو رازو نهێنیەك، کەچی بەو شێوەیە نیە، ئەو (کرمۆکەی زەویەو زادەی ئاسمانە)، چونکە دروست نەکراویشە هەمیشە (کائن)ێکی شپرزەو (مشوش)ە. لەبەرئەوە ئەو (دونادون)ەی کە فەیلەسوفی یۆنانی (ئیقلیدس) بۆی رۆیشتووە بەو شێوەیە نیە. چونکە بەتەنها حەقیقەتی بنچینەییمان نییە کە بیرۆکەی دروستکردنی لەسەر بونیادنراوە، بەڵکو هەروەها هەڵەو گوناهەکانیشمانە. لە چوارچێوەی بیرۆکەی دروستکردندا مرۆڤ وەکو کۆمەڵە تیرێکی بەهێز وایە، کە دەڕژێتە ناو ململانێ ئاکاری و رەوشتیەکانەوەو روبەڕووی ناخۆشیەکانی ژیان و هەموو ئەو تراژیدیاو تاڵیی و ناڕەحەتیانە دەبێتەوە کە دێنە ڕێ‌ی.[٦٩]

بەڵام ئاژەڵ هیچ شتێك لەم بارەیەوە نازانێت، لێرەدا واتاو بەهای ئەو ساتە وەختە دەردەکەوێت کە چاخێکی نوێ‌ی دروستکرد. کێشەی دروستکردن لەڕاستیدا، کێشەی ئازادیی مرۆڤایەتییە. ئەگەر ئەو بیرۆکەیەمان قبوڵ کرد کەوا مرۆڤ ئازادیی نییە، وە هەموو کردەوەکانی لە پێشەوە دیاریکراوە، ئیتر ئەگەر بەهێزێکی ناوخۆیی یا دەرەکیی بێت ئەوا لەم حاڵەتەدا ئولوهیەت (الالوهية) پێویست نابێت بۆ تەفسیرکردنی گەردوون و لێ تێگەیشتنی (بەڵام ئەگەر بڕوامان بەئازادیی مرۆڤ و بەرپرسیاربوونی لەکردەوەکانی هێنا) ئەوا ئێمە بەوە دان بە بوونی (خوا)دا دەنێین چ (لەبەرخۆوە)[٧٠] بێت یان بە راشکاویی بێت.

---

[٦٩] / بڕوانە قورئانی پیرۆز: سورتی الشمس ئایەتی (٧-٨) ﴿ ونفس وما سواها فألهمها فجورها وتقواها ﴾.

[٧٠] / مەبەست ئەوەیە کە لە خۆتدا قەناعەت بکەیت بەڵام دەری‌نەبڕیت. (وەرگێڕ ك)

بەتەنها خوایە کە دەتوانێت بوونەوەرێکی ئازاد دروست بکات، چونکە ئازادی نابێت بەبێ کرداری دروستکردن نەبێ[٧١].

ئازادی دەرئەنجام و هەروەها بەرهەمی پەرەسەندیش نیە، هەتا ئازادی لەگەڵ بەرهەمهێناندا دوو بیرۆکەی ناکۆکن. پەروەردگار نە بەرهەم هێنەرەو نە بونیادنەرە، بەڵکو بەدیهێنەرە. هەندێجار خەڵك ویستوویانە کە بیرۆکەی بەدیهێنان بگێڕنەوە بۆ پیاوانی هونەر. بەڵام هونەرمەند کە پەیکەرێك بونیاد دەنێت هەڵناسێت بە دروستکردنی کەسێتیەك بەڵکو تەنها وێنەیەکی مرۆڤ دروست دەکات. کەسێتی ناتوانرێت دروست بکرێت. وە من نازانم وێنە دەتوانێت مانای چی بگەیەنێت بەبێ (خوا)یەك. مرۆڤ دەتوانێت ئێستا بێت یان لە داهاتوو، لەماوەی ئەم چاخەدا یاخود پاش ملیۆنێك ساڵ لە شارستانیەتی بەردەوام، سەرکەوتوو بێت لەوەدا کە وێنەیەك دروست بکات لەخۆی بچێت، جۆرێك لە مرۆڤی ئالی یان بەشێوەیەکی ناشیرینتر، شتێك کە شێوەی نزیك بێت لە دروستکەرەکەیەوە. ئەم شێوە شێواوە کە بە مرۆڤ دەچێت، خاوەنی هیچ ئازادیەك نابێت، تەنها دەتوانێت بەو کارانەی هەستێت کە لە بەرنامەکەیدا بۆی دانراوە.

لێرەدا گەورەیی کاری پەروەردگار دەردەکەوێت کە ناکرێت دووبارە بکرێتەوە وە یان بەراوردی بکەیت بە هیچ شتێکی تری کە لەمەو پێش هەبووبێت یاخود لەداهاتوودا ڕووبدات لەم گەردوونەدا. لە ساتەوەختێکی ئەبەدییەوە بوونەوەرێکی ئازاد لەم بوونەدا پەیدا بووە. وە بەبێ دەستی پەروەردگارو لەڕێگەی پەرەسەندنەوە مرۆڤ پەیدا نەبووە. لەڕێگەی پەرەسەندنەوە ئەگەر هەبوایە ئەوا ئاژەڵێکی پەرەسەندوو دەبوو، ئاژەڵێکی نموونەیی، یان (کائن)ێکی زیرەك دەبوو لەشێوەی مرۆڤدا، بەڵام بەبێ دڵو بەبێ ژیانێکی ڕۆحیانی.. زیرەکیەك بە دوور لە کەمترین ویژدانی ڕەوشتی، ڕەنگە توانایی زیاتربوایە بەڵام زۆر دڵڕەقو بێ بەزەیی دەبوو. هەندێك کەس ئەوە دێت بە خەیاڵیدا کە بوونەوەری

---

[٧١] / بڕوانە (کارل جاسبرز): (کاتێك مرۆڤ کە بە ئاگا دەبێت بە ئازادی خۆی ئاگاییەکی ڕاستەقینە. ئەوا ئەو لەهەمان کاتدا وای دادەنێت کە قەناعەتیش بەبوونی (خوا) بکات. چونکە (خوا)و ئازادیی دووشتن لەیەك جیانابنەوە)، پاشان دەڵێت: (وە ئەگەر هەستکردن بەئازادیی ببێتە هۆی ئەوەی کە هەست بەبوونی خوا بکەیت، کەواتە ئەمە ئەوە دەگەیەنێت کە لەنێوان ئینکارکردنی ئازادی و ئینکارکردنی (خوا)یشدا هەمان پەیوەندی هەیە.

بڕوانە: Karl Jespress: Introduction to Philosophy serbocroation trans. (Beograd: Proveta, 1967). p.158.

لەو شێوەیە لەسەر ئەستێرە دوورەکانی گەردوونەوە بێت بەرەو زەوی، هەندێکی تریش وای دەبیننەوە کە ئاستی ژیاریی لە قۆناغێك لە قۆناغەکانی گەشەکردندا بتوانێت شتی لەو شێوەیە دروست بکات (وەك لە هەندێك فلیمی خەیاڵی زانستیدا پیشان دەدرێت. (وەرگێڕی ك). نموونەی ئەو بوونەوەرە لەرۆمانەکەی (گۆتە)دا هەیە کە ناسراوە بە (فاوست)، بەڵام (فاوست) نیو مرۆڤەو شێوێنراوە. پێویستە تێبینی ئەوە بکەین کە ناکرێت ئەو رەقییە بێ موبالاتیەی ئەو بوونەوەرە شێوێنراوەی وێنەی مرۆڤ کە لەفیلمە خەیالیەکاندا دەردەخرێت بەراوردی بکەین بە مرۆڤێك کە تا ئەوپەڕی رادە خراپەکارو تاوانبارە، چونکە مرۆڤ دەتوانێت رێگەیەك بگرێتەبەر کە پێچەوانەی یاسا رەوشتیەکان بێت، بەڵام ناتوانێت ـ وەکو ئەوەی ئەو دەیکات ـ دەرچێت لە چوارچێوە رەوشتیەکەو بە دوور بێت لە خەیرو شەڕ، چونکە مرۆڤ ناتوانێت ئەو گۆڕانکاریە لەخۆیدا بکات یا (خۆی بگۆڕێت).

شارەزایی رەوشتە کرداریەکان ئەوەمان نیشان دەدات کەئارەزووی مرۆڤ بۆ تاوانکردنو خراپەکاریی زیاترە لە ئارەزووی هەوڵدانی بۆ چاکەکردن. توانای بۆ کەوتنە ناو هەڵەوە گەورەترە لەو توانایەی کەدەیدات لەپێناو گەیشتن بە بڵندییو رێزپەیداکردن.[٧٢]

کەسێتیە سلبیەکان وادەردەکەون کە حەقیقی تر بن لە کەسێتییە ئیجابیەکان. لەبەرئەوە ئەو شاعیرەی کە وێنەی کەسێتییە سلبیەکان باس دەکات جیاوازە لەو شاعیرەی کە وێنەی پاڵەوانەکان باس دەکات[٧٣]. هەرچۆنێك بێت، بەشەر یان چاکە خوازە یان

---

[٧٢] / بڕوانە قورئان، سورەتی یوسف ئایەتی (٥٣) ﴿ وما أبرئ نفسي إن النفس لأمارة بالسوء إلا ما رحم ربي إن ربي غفور رحيم ﴾

[٧٣] / لەڕاستیدا جێگای سەرنجو تێڕوانینە ئەو هێرشە توندەی کە لەچین لەساڵی ١٩٧٤دا کرایە سەر ئەو رۆمانە چینییەی کە دەگەڕێتەوە بۆ چاخی پانزەهەم بەناونیشانی (ئاستی ئاوی) کە لە رۆژئاوادا ناسراوە لەوەرگێڕانی بیرل بك (Peral Buck) بەناونیشانی (هەموو بەشەریەت بران) All men are brothers. کە یەکێکە لە باشترین ئەو رۆمانانەی کە لە ئەدەبی کلاسیکی چینیدا نووسراون، باسی شۆڕشی جوتیاران دەکات دژی بەڕێوەبردنی ئیمپراتۆریەت لەماوەی چاخی دوانزەیەمی زاییندا، بەڵام لەبەرئەوەی پەیامەکەی باسی ئەوە دەکات کە هەموو خەڵکی برای یەکترن، رووبەڕووی رەخنەلێگرتن بوویەوە بەوەی کە (نموونەیەکی سلبیە لە پەروەردەداو ناوەڕۆکەکەشی باس لە (ناچینایەتی) دەکات، وەخەڵکی برای یەکترنین وەکو لە هێرشەکەدا هاتبوو.

لە مەجەر وەزارەتی پەروەردە بڕیاریدا بەجیاکردنەوەی قوتابیان بەپێی ئاستی چینایەتیان، وە لە شەش کۆمەڵەدا بەپێی پیتەکانی (هجاء) ریزی کردن. بەڵام کاردانەوەی جەماوەری لە بەرامبەر ئەمەدا ـ سەرەڕای پارێزکردنیش ـ

خراپەکارە، بەڵام لە هیچ حاڵەتێکدا بەریئ نیە، دەبێت ئەمەیش مانای کۆتایی ئەو چیرۆکە ئینجیلییە بێت سەبارەت بەدابەزینی مرۆڤو ئەنجامدانی هەڵەی یەکەمی. هەر لەو ساتەوەی کە ئادەم (مرۆڤ) دەرکرا لە بەهەشت، نەیتوانیوە کە دەستبەرداری ئازادی ببێت، وە لە بەردەم تراژیدیاکانیشدا هەڵنەهاتووە. ئەو ناتوانێت وەکو ئاژەڵێك یاخود فریشتەیەك بەریئو پاکیزە بێت، بەڵکو لەسەریەتی کە ئیختیارێك بکات، وە ئەو ئازادییەی هەیەتی بەکاری بهێنێت بۆ هەڵبژاردن کە خێرخواز بێت یان شەرخواز، بەکورتی واتە دەبێت مرۆڤ، بێت بێ بوونی ئەو توانایەشی بۆ هەڵبژاردن بەچاوپۆشین لەئەنجامەکەی. بریتیە لە بەرزترین شێوەیەك لە شێوەکانی بوون لەم گەردوونەدا.

مرۆڤ خاوەنی رۆحە، بەڵام دەروونزانی زانیاریەکی دیاریکراوی لەبارەی رۆحەوە نیە. وە نایشکرێت لەو بارەیەوە زانیاریەکی ئەوتۆ بەدەست بهێنرێت.

دەروونزانیی مامەڵە لەگەڵ هەندێك شێوەی دەرەکیدا دەکات کە پێی وایە ئەوە بریتیە لە ژیانی رۆحیانی، وە هەر لێرەیشەوە کە توانراوە باس لە دەروونزانیی فسیۆلۆژیی و، پێوەری دەروونیی و، تەندروستی دەروونیی و، دیاردە فیزیاویەکانی دەروون بکرێت. بۆ نموونە توانای دەروونزانیی چەندیی، هاوشێوەی بابەتە دەرەکیەکەیە کە بریتیە لە ئالیەتی چەندیی، یان سروشتی ناڕۆحیانەی فیکرو شعوور. لێرەوە هەریەکە لە دەروونزانی مرۆڤ و دەروونزانی ئاژەڵ یەکدی تەواو دەکەن، چونکە دەروونزانیی تەنها گرنگی بە دیاردە دەروونیەکان نادات، جۆن واتسۆن دەڵێت: دەروونزانی مرۆڤ وەکو ئەوەی کە مەزهەبی سلوکی لێی تێدەگات، دەکرێت لەسەر هەمان بنەمای دەروونزانی ئاژەڵی بابیەتی و ئەزموونی دابمەزرێنێت، وە سوود لەو شێوازەی ئەو وەربگیرێت لە لێکۆڵینەوەو بەرنامەو ئامانجەکانیدا. لەبەرئەوە، دوو جۆرە دەروونزانیمان نیە یەکێکیان ئینسانی و ئەوی تری ئاژەڵی بێت و دیوارێکی ئاسنین لە یەکتری جیاکردبنەوەو یەك ئەوی دی نەناسێت، وە بۆ هەریەکێکیان بابەتی جۆراو جۆرو بەرنامەو ئامانجی تایبەتی هەبێت، بەڵکو یەك دەروونناسی جێگای دەگرێتەوە لەناو زانستە سروشتیەکاندا[٧٤]. ئەمە مەسەلەیەکە

---

بەئاشکرا دیاربوو چونکە ئەو پۆلێنەیان بە جیا کردنەوەیەکی رەگەزایەتی دانا، گومانی تێدانیە ئەو شێوازە نوێیانەی بۆ بەرپاکردنی جیاوازی لەنێوان خەڵکیدا دروست بوون پەیوەندی سەرەکیان بە فەلسەفەی بێباوەڕیەوە هەیە.

[٧٤] / جۆن واتسۆن Watson, n.p.d, p.158.

پێویستی بەقسە لەسەرکردن و روونکردنەوە نیە ئەگەر زاراوە ئیسلامیەکانمان بەکار هێنا دەتوانین بڵێین: دەروونزانیی بریتیە لە زانستی (دەروون) نەك زانستی (رۆح)، بەمانای ئەوەی کە زانستێکە کە لەسەر ئاستی زیندەیی (بایۆلۆژیی) نەك لەسەر ئاستی رۆحیانی کەس، لێرەدا سێ بازنەی جیاواز هەیە کە بریتین لە (ئاڵیو بایۆلۆژیو کەسی) وە لەگەڵ ئەم سێ پلەبەندیەی واقیعدا یەکانگیر دەبن: (سروشت و، ژیان، کەسێتی رۆحیانی). وە یەك بیرکردنەوەیی بۆ ئەو دوو سلوکە واتە جێبەجێ کردنی بنەمای زانستیانە، کە ئەمیش بەهەمیشەیی دەچێتە ناو (هۆکاری رەهایی)یەوە، ئەمەیش لەخۆیدا واتە نکوڵی کردنی ئازادی کە بریتیە لە جەوهەری رۆح. وە ئەگەر هەوڵمان دا (لێکۆڵینەوە) دەربارەی رۆح لە سنووری دەروونزانیدا بکەین، ئەوا ئەمە دەبێتە هۆی پێویستی نەفی کردنی بابەتی ئەو لێکۆڵینەوەیە (کە رۆحەکەیە)، بەو شێوەیە دەروازەیەك نادۆزرێتەوە بۆ ئەوەی لەم بازنە نەفرەتیە دەربچین.

یەکسانی و برایەتی لەنێوان خەڵکیدا شتێکی مومکینە، بەڵام ئەوە لەکاتێکدا کە مرۆڤ دروستکراوی خوا بێت، چونکە یەکسانی لەنێوان مرۆڤەکاندا تایبەتمەندیەکی رەوشتیە نەك حەقیقەتێکی سروشتی یا ماددی یان عەقڵیی. بوونیشی بەرپایە وەکو سیفەتێکی رەوشتی مرۆڤ، وەکو باڵاییەکی مرۆیی یان بەهایەکی یەکسان بەکەسێتی مرۆیی. لە بەرامبەری ئەمەدا، ئەگەر روانیمان بۆ خەڵك لەلایەنی مادییەوە یان فیکرییەوە، وەکو بوونەوەرێکی کۆمەلایەتی یان بوونەوەرانی کۆمەڵگەیەك یان ئەندامانێك لە کۆمەڵەیەکدا یان چینێك یان کۆبوونەوەیەکی سیاسی یان نەتەوەییدا، دەبینین خەڵکی لەناو هەموو ئەو ناوەندانەدا نایەکسانن. چونکە، ئێمە ئەگەر بەها رۆحیەکانمان وون کردن (کە ئەوانە حەقیقەتێکن خاوەنی مۆرکێکی ئاینین) ئەوا ئەو بنچینە راستەقینەیەی کە هەیە بۆ یەکسان بوونی مرۆڤایەتیی تێك دەچێت. ئەو کاتە یەکسانی تەنها دەبێتە قسەیەکی سەرزارەکی بەبێ بوونی ناوەرۆکێك، وە بەخێرایی پاشەکشە دەکاتەوە لەکاتێکدا کە رووبەرووی ئەو واقیعانە دەبێتەوە کە ئاماژە بە نایەکسانی ناو کۆمەڵگا دەکەن یاخود ئەو ئارەزووە سروشتیەی کە مرۆڤ تێیدا یە بۆ (زاڵ بوون) یان بۆ (گوێڕایەڵیی) کە لە هەردوو حاڵەتەکەدا هەر نایەکسانی دروست دەبێت، وە هەرکاتێك لەسەر حسابی خۆمان دەروازە ئاینییەکەمان داخست، ئەوا بەخێرایی ئەو جێگایە بە جۆرەها شێوازی نایەکسانی وەکو: رەگەزایەتی و

**نەتەوەگەریی و نابەرابەری کۆمەلایەتی و سیاسی پڕدەبێتەوە.**

**بالایی مرۆڤ نەتوانراوە بەهۆی زانستی زیندەوەرزانی یان دەروونزانییەوە وە یا هەر زانستێکی ترەوە کەشف بکرێت، چونکە بالایی مرۆڤی مەسەلەیەکی ڕۆحییە. بەلای زانستەوە ئەوە ئاسانە، کە لەپاش (تێبینیە بابەتیەکانەوە) بڕیاری ئەوە بدات کە نایەکسانیی کۆمەلایەتی - وە پاشان ڕەگەزپەرستی زانستی - شتێکی مومکین و بەلکو لۆژیکیشە)[٧٥].**

**بنەما رەوشتیەکانی سوکرات و فیساگۆرس و سینیکا Seneca نکولی لە بەهای گەورەییان ناکرێت، بەلام لە پاشان کە دەروانیتە بنەما رەوشتیەکان لە هەر سێ ئایینە ئاسمانیەکەدا (یەهودیەت و مەسیحیەت و ئیسلام)، ئەوا جیاوازیەکی ئاشکرا هەست پێ دەکرێت، ئەوەیش ئەوەیە کە تەنها ئەخلاقیاتی ئایینە ئاسمانییەکانە دەتوانێت بە ئاشکراو بێ هیچ پێچ و پەنایەك یەکسانی لەناو هەموو بەشەریەتدا بهێنێتە دی، چونکە بەو پییە هەموو مرۆڤەکان دەبنە دروست کراوی (خوا).**

**هەتا ئەفلاتونیش دانی بەنایەکسانی کۆمەلایەتیدا ناوە وەکو پێویستیەك، بەلام بە پێچەوانەی ئەمەوە، بۆمان دەردەکەوێت کە بەردی بناغە لە هەموو ئایینە ئاسمانیەکاندا بریتیە لە (ئەسلێکی هاوبەش) بۆ هەموو بەشەرییەت، پاشانیش بەرپاکردنی یەکسانی رەها لەنێوانیاندا، ئەم بیرۆکەیەش کاریگەریەکی جەوهەریی لەسەر هەموو پەرەسەندنە رۆحی و رەوشتی و کۆمەلایەتیەکانی رەگەزی مرۆڤایەتی هەبووە. لە سەروو ئەمەیشەوە وادەردەکەوێت کە مێژووی زانستی رەوشتی کەشفی ئەو پەیوەندیە دەکات لەنێوان بیرۆکەی یەکسانی لەنێو خەلك و بیرۆکەی نەمرییدا (خلود). کە ئەمە بابەتێکە پێوستی بە لێکۆلینەوەیەکی قوولتر هەیە.**

**سیستەمە ئایینی و رەوشتیەکان کە دان نانێن یاخود بۆچوونێکی ئالۆزیان هەیە سەبارەت بە نەمریی، لە پاشانیش دان بەو یەکسانیەشدا نانێن ئەگەر (خوا) یەك نەبێت کە**

---

[٧٥] / تیۆری (پەرەسەندن) ناتوانێت لەگەل بیرۆکەی یەکسانیدا گونجان دروست بکات، هەروەها لەگەل بیرۆکەی مافە سروشتیەکانیشدا. وەئەو (یەکسانیە)ی لە شۆرشی فەرەنسیدا وەکو ئەسلێکی ئایینی سەیری دەکرا، پاشتر لە بەشی (١١)ی ئەم کتێبەدا باس لەوە دەکات.

لەپاشاندا هاوسەنگیەکەی ئەم لا خوارەی ئێرە بهێنێتەوە (تا) ئەوا مرۆڤ هەر بەبێ هیوایەی و نایەکسانی دەمایەوە.

بەبڕوای (نیچە) لاوازەکان ئایینیان دایانهێناوە بۆ ئەوەی فێڵ لەبەهێزەکان بکەن. بەڵام مارکس پێچەوانەی ئەمە دەڵێت.

ئەگەر وامان دانا کە ئایین داهێنراوە، ئەوکاتە تەفسیرەکەی (نیچە) زیاتر قەناعەت پێکەرانە دەبێت. چونکە تەنها لەسەر بنچینەی ئایین لاوازەکان دەتوانن داوای یەکسانی بکەن. بەڵام زانست وەهەموو شتەکانی تر بێجگە لەئایین، جەخت لەسەر نەبوونی یەکسانی دەکەنەوە لەنێوان خەڵکیدا.

بۆچی ئێمە زۆربەی هەژارو کەم ئەندامان لەدەوروپشتی ئەو مزگەوتو کەنیسەو پەرستگایانەدا دەبینینەوە کە روویان تێدەکەین؟

چونکە تەنهاماڵەکانی خوایە کە دەرگا لەسەر ئەوانە دەکاتەوە کە هیچ شتێکیان نیە لەم دونیایەدا کە پشتی پێ ببەستن، ئەوانەی کە لە ماڵ و تەندروستیدا هەژارن، ئەوانەی کە دور خراونەتەوە لە خوانی ئاهەنگ و خۆشیەکان لەم جیهانەدا، کە تێیدا هەموو کەسێك بە ناوو بنەماڵە و زانست و بەهرەکەیەوە بانگ دەکرێت نەخۆش و نەخوێندەوارەکان دەرگای کارگەکانیان بەڕوودا دادەخرێت لەکاتێکدا بە ڕووی کەسانی ساغ و شارەزادا والآی دەکاتەوە، کەچی لەماڵی خوادا کوێرو هەژار بەپەنای پاشاو خانەدانەکانەوە دەوەستن، رەنگە لەلای پەروەردگاریش ئەوان لەپێشترین[٧٦]. گرنگترین مانای ژیاری و مرۆیی پەرستگاو شوێنە ئایینیەکان لەوەدا شاراوەتەوە کە هەمیشە جەخت لەسەر ئەو یەکسانیە دەکەنەوە.

واتای کۆتایی هونەر بریتیە لەوەی کە کەشفی تایبەتمەندیە مرۆڤایەتیەکان لەو کەسانەدا بکات کەوا نارەحەتی تەنگی بەژیانیان هەڵچنیوە، وە کەشفی ئەو نەجابەتە مرۆییە بکات لەلای ئەو خەڵکە بچوکانەی کە لەخۆشیەکانی ژیان بێبەش کراون، بەکورتی کەشفی ئەو رۆحە مرۆڤایەتیە بەها یەکسانە بکات لەناو هەموو بەشەریەتدا.

---

[٧٦] / قورئان، سوورەتی عبس ئایەتی (١-١٠) ﴿ عبس وتولى أن جاءه الأعمى، وما يدريك لعله يزكى أو يذكر فتنفعه الذكرى أما من استغنى فأنت له تصدى وما عليك ألا يزكى، وأما من جاءك يسعى وهو يخشى فأنت عنه تلهى ﴾.

وە هەرچەندە باری مرۆڤ دیندارانە تر بێت لە ژیاندا، ئەوا ئەو نەجابەتە مرۆییە زیاتر دەردەکەوێت تێیدا، ئا لەمەدا بەهای ڕاستەقینەی ئەدەبی کلاسیکی ڕوسی دەردەکەوێت[٧٧]. هەروەها لە ئەدەبی فەرەنسیدا بەتایبەتی لە کەسایەتیە ئەدەبیەکاندا وەکو (گوازیمودو) **Quasimodo** و (فانتین) **Fantine** و (جان فالجان) **Jean Valgean**.

مرۆڤایەتیی تەنها چاکەکردن و لێبوردن و، خۆڕاگرتن نیە، ئەگەرچی ئەمانە هەموو ئەنجامێکی پێویستن بۆی، بەڵکو مرۆڤایەتی، بەپلەی یەکەم، جەختکردنەوەیە لەسەر ئازادی مرۆڤ، واتە جەخت کردنەوە لەسەر ئەو بەهایەی کە دەیخاتە ناو خانەی مرۆڤیەوە.

هەموو شتێك لە کەسێتی مرۆڤ کەم بکاتەوە و دابیبەزێنێتە ئاستێکی نزمترەوە، ئەوا نامرۆڤانەیە، بۆ نموونە شتێکی مرۆییە کە بڵێیت مرۆڤ بەرپرسیارە لەکارو کردەوەکانی و لێپرسینەوەیش لەسەریان پێویستە. بەڵام نامرۆییە کە داوای ئەوەی لێ بکەیت پەشیمان ببێتەوە، یان ڕاکەی بگۆڕێت و خۆی چاك بکات وە یا داوای لێخۆشبوون بکات، ئەوە مرۆییانەترە کە سزا بدرێت لەسەر بیروباوەڕەکەی نەك ئەوەی ناچاربکرێت بۆ ئەوەی وازی لێ بهێنێت بەپێدانی مۆڵەت بەناوی (پاکردنەوەی هەڵوێستەوە). چونکە، سزادان شتێکی مرۆڤایەنەیە، بەڵام لێبوردن زیاتر شتێکی نامرۆڤانەیە، لێکۆڵەرەوەیانی دادگای پشکنین لە رابردوودا پێیان وابوو بۆیە جەستە دەسوتێنن بۆ ئەوەی ڕۆحەکەی ڕزگار بکەن، بەڵام لێکۆڵەرەوەیانی هاوچەرخ، پێچەوانەی ئەمە دەکەن لەبری جەستە ڕۆحەکە (دەسوتێنن).

تەسك کردنەوەی بواری مرۆڤ لەوەدا کە پیشەکەی تەنها بریتی بێت لە بەرهەمهێنانو بەکاربردن، هەتا ئەگەر لەو شوێنەیشدا جێگایەکی باشی هەبێت، ئەوە نیشانە نیە لەسەر مرۆڤایەتی، بەڵکو داماڵینی مرۆڤایەتیەکەیەتی.

ڕاهێنانی مرۆڤ لەسەر ئەوەی کە تەنها بەرهەمهێن بن، وە ڕێکخستنیان لە ڕیزەکانی هاووڵاتیانی چاکەخوازو گوێڕایەڵدا، ئەمانەیش جۆرێکی ترن لە نامرۆیی، بۆ نموونە:

---

٧٧ / لەوتارێکدا بەناوی (گۆشەنیگای رووسی) فرجینیا وولف، باسی ئەم خاسیەتە زیندووە دەکات لەناو پەخشانی کلاسیکی رووسیدا، رۆح کەسێتیەکی دیاری هەیە لەناو پەخشانی هونەری رووسیدا، لەلای تشیکۆف شێوەیەکی نەرمو پاکژی هەیە، لەلای (دیستۆفیسکی) قووڵترو مەزنترە لەشێوەی چەند نۆرەیەکی بەهێزی توندو تووڕەدایە، بەڵام بە هەمیشەیی زاڵە، لە رۆمانەکانی (دیستۆفیسکی)دا باس لە گێژەبای لماوی و دەنگی هەڵقوڵینو بلقەبلقی ئاودا سەرنجمان رادەکێشێت کە دروستکردنی هەموو ئەم شتانە تەنها بۆ براوتێکی رۆحی دەگەڕێتەوە بڕوانە: **Virginia woolf: The common reader (New YourkL Harcoart, Brace and Co. 1925).**

دەکرێت فێرکردن کارێکی نامرۆییانە بێت ئەگەر هاتو شێوازی کردارییەکەی یەکلایی بێت واتە بریتی بێت لە ئاراستەکردن لەسەر شێوازی تەلقین کردنی پرەنسیپی حیزبی، ئەگەر هاتو کەسەکە نەیزانی چۆن بیر بکاتەوە بەشێوازێکی سەربەخۆیانەو وەڵامەکانی بە ئامادەکراوی بۆ پێشکەش کرا، ئەگەر هات و خەڵکێکی ئامادەکرد تەنها بۆ جێبەجێ کردنی پیشەو کارەجیاجیاکانی، لەبری فراوانکردنی ئاسۆی بیرکردنەوەیان و ڕەخساندنی ئازادی بۆیان هەموو جۆرە یاری کردنێك بەخەڵك هەتا ئەگەر لە بەرژەوەندیشیاندا بێت هەرکارێکی نامرۆیانەیە بیرکردنەوە لەبری ئەوان، هەتا ئازادکردنیشیان سەبارەت بەهەموو کاروکردەوەو پابەندبوونێکیان بەهەمان شێوە نامرۆیانەیە، بوونی ئەو ڕێژە مرۆڤایەتیە تیاماندا وامان لێدەکات کە پابەند بوونمان هەبێت، کاتێك خوای گەورە ئازادی بە مرۆڤ بەخشی، پاشان لەسزای سەختی دوا ڕۆژیش ئاگاداری کردەوە [٧٨].

ئێمە پێویستە شوێن ئەو نموونە بالأیە بکەوین کە خوای گەورە بۆی داناوین: با لەمرۆڤ بگەڕێین بۆ ئەوەی بۆ خۆی بیربکاتەوە لەباتی ئەوەی ئێمە هەستین و ئەو کارە لەبری بکەین. بەبێ ئایین وەبەبێ بیرۆکەی (کۆششی بەردەوامی ڕۆحی مرۆڤ) هەر وەك چۆن بڕیاری لەسەر دراوە هەر لە (سەرەتای دەرچوونیەوە لە بەهەشت) هیچ باوەڕێکی ڕاستەقینە نیە کە بەهایەکی بالأ ببەخشێتە مرۆڤ. بەبێ ئەوە ڕووبەڕووی نەفی کردنی هەر جۆرە باوەڕێك دەبینەوە سەبارەت بە مرۆڤایەتی مرۆڤ.

باس کردنی هەر جۆرە مرۆڤایەتیەکی بێ باوەر(ملحد) بریتیە لە کۆکردنەوە لەنێوان دوو شتی ناسازدا، چونکە نکوڵی کردن لە بوونی خوا واتە نکوڵی کردنیش لەبوونی مرۆڤ[٧٩]. ئەگەر مرۆڤیش بوونی نەما ئەوکاتە هەموو باسکردنێك لە بارەی (مرۆڤایەتیەوە) بریتیە دەبێت لەدەستەواژەیەکی بێ ناوەڕۆك.

ئەو کەسەی دان بەدروستکراوی (خلق)ی مرۆڤدا نانێت ناتوانێت لەمانای ڕاستەقینەی مرۆڤایەتیش تێ بگات، چونکە بنەما سەرەکیەکەیشی وون کردووە، ئەوا مرۆڤایەتیش تەسك دەکاتەوە تەنها بۆ (بەرهەمهێنانی شمەك و دابەشکردنی بەپێی پێویست). دڵنیا

---

[٧٨] / قورئان. سورەتی البلد ئایەتەکانی (٤-١٧) ﴿ لقد خلقنا الانسان....... وتواصوا بالمرحمة ﴾

[٧٩] / (نیقولای بردیانیف) Nikolai Berdyaev: The Beginning and The End, R.m. French Harper, 1857) : (New York

بوون لەوەی کە خەڵکی هەمووی بەپێی پێداویستی شمەکیان دەست کەوتووە ئەمە ـ لە خۆیدا ـ کارێکی زۆرگرنگە. بەڵام لەرێگەی ئاشنابوونمانەوە بەکۆمەڵگە خۆشگوزەرانەکانی ئەمرۆ، ناتوانین دڵنیابین لەوەی کە بەو شێوەیە دەتوانرێت بگەین بەجیهانێکی باشترو مرۆیانەتر. ئێمە مرۆڤایەتیمان تێدا کەمتر دەبێتەوە ئەگەر هاتوو بیرۆکەی هەندێك لە ئایدیالیستەکان جێبەجێ بکرێت سەبارەت بە یەکسانی گشتی و (هاوشێوەیی) و (نەبوونی کەسێتی). لەجیهانێکی وادا کە (الدوس هکسلما) لە کتێبەکەیدا (جیهانی نویَ ی ئازا) باسی دەکات، کە هیچ گرفتێکی کۆمەڵایەتی نابینێتەوەو، یەکسانی هاوشێوەیی و ئاسایش باڵ بەسەر هەموولایەکدا دەکێشێت. لەگەڵ ئەوەیشدا ئێمە هەموومان رەفزی ئەو روبینییە دەکەین ـ ئیتر لە رێگەی هۆشیاریمانەوە بێ یان بە غەریزە بێت. ئەو رووبینییە نموونەیەکە بۆ سڕینەوەی تەواوی چەمکی مرۆڤایەتی.

(مرۆڤ بەرهەمی ژینگەکەیەتی) ئەم بۆچوونە سەرەکیە لەمەزهەبی ماددیەتدا بەکار دەهێنرێت وەکو خاڵی لێوەدەرچوونی هەموو تیۆرە نامرۆڤایەتیەکان لە: یاساو کۆمەڵناسی، وە لە پرۆسەی یاریکردن بە بەشەریەت کە لەسەردەمی نازییەت و ستالینیەتدا گەیشتە ئەوپەڕی، وە لە هەموو تیۆرەکانی تری هاوشێوەیدا کە ئەولەویەتی کۆمەڵ دەدەن بەسەر مرۆڤدا، وە جەختدەکەنەوە لەسەر پابەندبوونی مرۆڤ بە خزمەتکردنی کۆمەڵگاکەی... هتد. هەموو ئەو تیۆرانەی تریش کە لەهەمان بازنەدا دەسورێنەوە.

بەلای ئێمەوە راست نیە کە مرۆڤ خزمەتکاریی مرۆڤێکی تر بکات، وە یا وەکو ئامرازێك بەکار بهێنرێت، بەڵکو پێویستە هەموو شتێ بخرێتە خزمەتی مرۆڤەوە. مرۆڤ بەتەنها خزمەتکاری خوایە. وە ئەمەیش مانای کۆتایی هیومانیزمە.

# بەشی دووەم

## ڕۆشنبیری وشارستانیەت

﴿ئێمە ناتوانین شارستانیەت ڕەتبکەینەوە هەتا ئەگەر ئەو خواستەشمان هەبێت، بەڵام تاکە شتێکی پێویست دەتوانرێت بکرێت، ئەوەیە ئەو ئەفسانەیە تێکبشکێنین کە دەوری تەنیوە﴾.

# ئامرازو پەرستش

دوو حەقیقەتی ناکۆك ودژبەیەك هەن کەپەیوەستن بە دەرکەوتنی مرۆڤەوە : ئامرازی یەکەم و پەرستشی یەکەم. ڕەنگە یەکەم ئامرازێکیش بریتی بووبێت لەپارچەیەك تەختە یان پارچە بەردێکی ناڕێك و نەتاشراو، یان هەر پارچە شتێکی تر کەلەسروشت دا هەیە.دروستکردنی ئامرازەکان و بەکارهێنانیان مانای بەردەوامی پەرە سەندنە بایۆلۆژی یەکە دەگەیەنێت،

ئەویش پەرەسەندنێکی دەرەکی و چەندیە، دەکرێت دابنرێت بەشێوازە سەرەتاییەکانی ژیان تاوەکو دەرکەوتنی گیانلەبەری کامڵ. ڕاوەستانی تەواو لەسەپێیەکان و ڕێکوپێك بوونی دەستەکان و سەرهەڵدانی زمان و زیرەکی‌و، هەموو ئەمانە چەند حاڵەت و ساتێکن لەپەرەسەندن و لە چوارچێوەی سنووورە ئاژەڵیەکەدا دەمێننەوە .

مرۆڤ کاتێك یەکەم جار بەردێکی بەکار هێناوە بۆ شکاندنی خۆراکێکی ووشك یان بۆ لێدانی ئاژەڵێك ئەمە بۆ ئەو کاتە کارێکی زۆر گرنگ بووە کە ئەنجامی داوە، بەڵام ئەمە کارێکە تەواو تازەنی‌یە، چونکە باوباپیرە پێشینییەکانی لەگروپە گیانلەبەرەیەکەدا بوون هەوڵیانداوە هەمان شت بکەن. بەڵام کاتێك کەبەردەکەی لەبەرچاوەکانیدا داناوە و وەکو هێمایەك بۆ ڕۆح تێیڕوانیوە، ئەوا بەمە هەستاوە بە کارێك کە ئیتر بووە سیفەتێکی گشتی و پەیوەست بە مرۆڤەوە لەهەمووجیهاندا. ئەمەیش کارێکە تەواو نوێ یە لەڕێڕەوی پەرەسەندنیدا. هەروەها کاتێك مرۆڤ بۆ یەکەم جار هەستاوە بەکێشانی هێڵێك بەدەوری سێبەرەکەیدا لە سەرلمێك، ئەوا بەم کارەی هەستاوە بە کێشانی یەکەم وێنە [1]، پاشان دەستی بە چالاکیە تاکە کەسیە

---

[1] لیۆنارد دافنشی Leonardo da Vinci : The Notebooks of Leonardo da Vinci, ed Jean Paul Richter( New York : Dover Publication, 1970)

کانی کردوە کە تایبەتن بە خۆی و لە هە موو بونە وەرە کانی تری جیا دەکاتەوە بێگومان ئە مەش کارێکە هیچ گیا نلە بەرێکی تر نا توانێت پێی هەستێت بە چاوپۆشینیش لە پلەی پەرەسەندنەکەی، لە ئێستاو لە داهاتوویشدا. دەکرێت لایەنە بایۆلۆژیەکانی دەرکەوتنی مرۆڤ تەفسیر بکرێت بە مێژووی پێشینەی. بەڵام لایەنە ڕۆحیەکانی، ناکرێت وا هەڵبهێنجرێت وەیان تەفسیر بکرێت بە هەر شتێك کەلە پێشەوەیدا هەبووبێت، چونکە مرۆڤ لە جیهانێکی ترەوە هاتووە، لە ئاسمانەوە هاتووە بەپێی دەقە ئاینیەکە.

هەریەکە لە پەرستش و ئامراز نمایشی دوو سروشت و دوو مێژووی مرۆڤ دەکەن : مێژوویەك کەبریتیە لەدرامایەکی مرۆڤی و دەست پێدەکات بەو قۆناغە بەراییەی کە لە بە هەشتدا بووە، پاشان پەرەیسەندوە لەڕێگەی سەر کەوتنی بیرۆکەی ئازادیەوە، کۆتایی دێت بە ڕۆژی لێپرسینەوە لە دوارۆژدا، کە ئەمیش بریتیە لە پاڵنەری ئەخلاقی مێژوو.

بەڵام دووەم، بریتیە لە مێژووی ئامرازەکان وەیا مێژووی ئەو شتانەی کەکۆتاییان دێت بە چوونە ناوەوە بۆ ناو کۆمەڵگەی چینایەتی، وەماتە ووزە، وەکو هەموو شتەکانی تری جیهانی مادی[۲]. ئەم دوو مێژووە هەمان ئەو پەیوەندیەیان هەیە کەلە نێوان پەرستش وئامرازدا هەیە، وەهەمان ئەو پەیوەندیەشە کە لە نێوان ڕۆشنبیری و شارستانیەت دا هەیە.[۳]

---

[۲] بەراوردی ئەم قسەیەی هیگڵ بکە لە کتێبی فەلسەفەی مێژوودا، کە دەڵێت :((گۆڕان کاریەکان لە ڕەگەزی مرۆڤیدا بەشوێن ئەو گۆڕان کاریانەدا دێت کە لە ئامێرەکاندا ڕوو دەدەن))لە گەڵ قسەی(بییر لاکومب) : (( هەموو مێژوو بەرەو مە سیح سەرچاوە دەگرێت و لەوێشەوە هەڵدەقوڵێتەوە)) بڕوانە : George Hegel: Philosophy of History.
Pierre Lacomb : History Considered as Knowledge.

[۳] ووشەی ڕۆشنبیری( Culture) لەلایەن ئەسڵی زمانەوانیەوە بەستراوەتەوە بەووشەی( Gult )پەرستش کەبە لاتینی (Gultus) کەهەردووکیان ئەسڵێکی هاوبەشیان هەیە لەووشەی Kuel هیندۆ ئەورووپیدا.بەڵام وشەی شارستانیەت (Civilization) بەستراوەتەوە بە وشەی Civis واتە نیشتمان، یان هاونیشتمانی.

# رەنگدانەوەی دوانیەتی ژیان

تێکەڵبونێکی نامۆ لەنێوان بیرۆکەی رۆشنبیری و بیرۆکەی شارستانیەتدا هەیە. رۆشنبیری بەو تەمهیدە ئاسمانیە دەست پێدەکات کە هەر یەکە لە ئاین و هونەر و ئەخلاق و فەلسەفەش دەگرێتەوە، وەرۆشنبیری هەر بەوشێوەیە دەمێنێتەوە و گرنگی دەدات بە پەیوەندی مرۆڤ بەو ئاسمانەوە کەلێوەی دابەزیوە، هەموو شتێکیش لەچوارچێوەی رۆشنبیری دایان جەخت کردنەوە یان رەتکردنەوە یان گومان یان تێرامانە لە یادەوەریەکانی ئەو ئەسڵە ئاسمانیەی مرۆڤ.

رۆشنبیریش بەم(لغز) دا دەناسرێتەوە، بەو شێوەیەش بەردەوام دەبێت و بەدرێژایی زەمەن لەکۆششێکی بەردەوام دایە بۆ کردنەوەو تێگەیشتن لەم( لغزە) ە.

بەڵام شارستانیەت، بریتیە لە بەردەوامی ئەو ژیانە ئاژەڵیەی کەوا یەک رەهەندی هەیە، ئەویش بریتیە لە ئاڵو گۆری مادی لەنێوان مرۆڤ و سروشتدا ئەم لایەنە لە ژیان جیاواز دەبێت لە ئاژەڵ بەتەنها لە پلەو ئاست و رێکخستن دا. لێرەدا مرۆڤێک نابینیت کە بەگرفتە ئاینیەکانیەوە شپرزە بوبێت، یان بە گرفتی (هاملت) وە یان بەگرفتی (براکانی کرامازوف) بەڵکو بریتیە لە ئەندامی کۆمەڵگەیەکی خلەفاو، کاروپیشەی مامەڵەکردن دەبێت لەگەڵ شمەکەکانی سروشتدا وەبە کردەوەکانی و بە پێی پێداویستیەکانی گۆرانکاری لەجیهاندا دەکات.

رۆشنبیری بریتیە لە کاریگەری ئاین لە سەر مرۆڤ یان کاریگەری مرۆڤ لەسەر خۆی، لە کاتێکدا شارستانیەت بریتیە لە کاریگەری زیرەکی لەسەر سروشت یان لە سەر جیهانی دەرەکی..رۆشنبیری واتە( هونەری بوون بە مرۆڤ)، بەڵام شارستانیەت بە واتای ( هونەری کارکردن و زاڵ بوون وزاڵ بوون و دروستکردنی شتەکان بەشێوەیەکی ووردو رێکوپێک) رۆشنبیری (دروستکردنی بەردەوامی خودە). بەڵام

شارستانیەت (گۆڕانی بەردەوامی جیهانە) ئەمەیش دژیەکیە :( مرۆڤ وشت، مرۆڤایەتی و پەیوەندی لەگەڵ لایەنی دەرەکی شتەکاندا) [٤].

ئایین و بیروباوەڕەکان و دراماو شیعرو یاریەکان و هونەرە میللیەکان و چیرۆکە میللیەکان و ئەفسانەکان و ئەخلاق و جوانی، ڕەگەزەکانی ژیانی سیاسی و یاسایی کەجەخت لەسەر بەهای کەسێتی و ئازادی و لێبوردن دەکەنەوە، هەروەها فەلسەفە و شانۆ و پیشانگەکان و مۆزەخانەکان و کتێبخانەکان – هەموو ئەمانەیش نمایشی ئەو هێڵە دەکەن کە گەیەنراوە بەرۆشنبیری مرۆڤایەتیەوە کە ( دیمەن) ی یەکەمیشی لە ئاسمان لە نێوان خواو مرۆڤدا ڕوی داوە ئەوە ( سەرکەوتنی شاخە پیرۆزەکەیە، کەوا لووتکەکەی هەر لە بەرزی و بڵندیدا دەمێنێتەوە، ڕۆیشتنە بەناو تاریکیدا بەهۆی مۆمێکی داگیرساوە وە کە مرۆڤ هەڵی گرتوە [٥].

شارستانیەت بریتیە لەبەردەوامی لەپێشکەوتنی تەکنیکیدا نەك لەرۆحی، پەرەسەندنی (داروینی) بریتیە لەبەردەوامی لەپێشکەوتنی بایۆلۆژیدا نەك لەپێشکەوتنی مرۆڤیدا. شارستانیەت نمایشی پەرەسەندنی ئەو هێزە شاراوەیە دەکات کەلە باوباپیرە پێشینەکانمادا هەبوەو ئەوان لەپلەیەکی نزمتری قۆناخی پەرەسەندندا بوون. هەروەها بریتیە لەبەردەوامی بۆ ڕەگەزە ئالیەکان واتە ئەو ڕەگەزە ناهۆشیارانەی کە مانایەکیان نیە لەبونماندا. لەبەر ئەوە، شارستانیەت لە خۆی دا نەخەیرەو نەشەڕ. پێویستە لەسەر مرۆڤ شارستانیەت بونیاد بنێت تەواو وەکو ئەوەی پێویستە لەسەری هەناسە بدات و بخوات. ئەوە تەعبیرە لەزەرورەتێك و ناتەواویەك لە ئازادیماندا. بەڵام ڕۆشنبیری، ئەوا بەپێچەوانەی ئەمەوە: بریتیە لەشعورێکی ئەبەدی بەتوانای هەڵبژاردن و تەعبیرکردن لە ئازادی مرۆڤ. پشت بەستنی مرۆڤ بەماددە

---

[٤] لەبری( الشیئیە) تەعبیری( لایەنی دەرەکی شتەکان) مان بەکار هێناوە ﴿ و. ك ﴾، چونکە( الشیئیە) لەووشەی Chose نەڕەنسیەوە وەرگیراوە بەواتای شت، وەئەم زاراوەیە بۆیەکەمجار زانای کۆمەڵناسی فەرەنسی(دورکاریم) بەکاری هێناوە مەبەستی لێی لێکۆڵینەوەیە لەدیاردەیەك بەشێوەیەکی بابەتیانە، واتە : لەدەرەوەدا تەنها وەکو شتێك.

[٥] ئەندریە مالرۆ) Andre Malraux : Antimemoirs ,Serbocroation trans( Zegreb: Naprijed, 1969).P.2760.

لــەژیانی شارســتانیدا بەشــێوەیەکی بــەردەوام لەزیادبووندایــە، لەســەرژمێریەکدا دەرکەوتوە هەر ئەمەریکیەك - پیاو بێت یان ژن یان منداڵ - نزیکەی ۱۸تـەن ماددەی جۆراوجۆر لەساڵێکدا بەکاردەهێنێت. شارستانیەت لەدروست کردنی بەردەوامی دا بۆ پێداویستیە نوێ یەکان وە ئەو توانایەی کەهەیەتی بۆ سەپاندنی پێداویستی بەسەر کەســانێکدا کەپێشــتر ئــەو پێداویســتیانەی نــەبووە، دەبێتــە هــۆی دروســتکردنی ئاڵوگۆڕێکی بەهێزی مـاددی لـەنێوان مـرۆڤ و سروشـتداو وا لـە مـرۆڤ دەکـات زیـاتر پەیوەست بێت بە ژیانی دەرەکی و ڕووکەشەوە لەسەر حسابی ژیانی( جوانیـة) کـەی • ﴿ بەرهەم بهێنە تابەدەست بهێنیت، بەدەست بهێنە هەتا بەکاربهێنیت ﴾ ئەمە شێوەی ئـەو پەیوەندیەیـە کەلـە پێکهاتـەی شارسـتانیەتدا هەیـە، بـەڵام ڕۆشـنبیری( بـەپێ‌ی سروشتە ئاینیەکەی) هەوڵ ئەدات بۆ کەم کردنەوەی پێداویستیە کانی مرۆڤ و دانانی ڕادەیەك لەپلەی تێربوونی دا، ئا بەم شێوەیەش ڕێگایـەك دەکاتـەوە بۆ فراوان کردنـی ئاسۆی ئازادی ﴿ جوانیـة﴾ ی مرۆڤ. ئەمەش مانای ڕاستەقینەی ئـەو جۆرە ز وهـد و خۆنەویسـتی و خـەڵوەت کێشـانەیە کە لـە مێـژووی هـەموو ڕۆشنبیریەکاندا هـەبووەو ناسـراوە. کەهەنـدێ جاریش شـێوازێکی ئـاڵۆز وەردەگرێت وەکـو( کـەم گرنگیـدان بـە بەپاك و خاوێنی) کەلەلای ڕاهیبەکان و وەلەلای( هیپیەکان) وەکو یەك و بەهەمان شێوە دەبینرێـت. بەپێچـەوانەی حیکمـەت و دانـایی ئیسـلامەوە لـە( جڵـەوکردنی خواسـت و حەزەکانـدا) ئـەوا شارسـتانیەت مەحکومە بـە لـۆژیکێکی دژ - پێویسـتە لەسەریشـی

---

* زاراوەی(( الجوانیة)) بە پێچەوانەی(( البرانیة)) وەیە وەکو دە ڵێێت :( من اصلح جوانیه اصلح الله برانیة) واتە : هەرکەسێك ناوەوەی( ناخی) خۆی چاك بکات خوای گەورەش ڕووی دەرەوەی چاك و جوان دەکات. بەڵام چونکە لە وەرگێرانە کوردیەکەدا ووشەیەکمان نەدیەوە هاوواتای مانا عەرەبیەکەبێت بۆیە لەمەولا لەهەر جێگەیەکدا ئەووشەیە هاتەرێمان وەکو خۆی لەناو کەوانەیەکدا دای دەنێینەوە( و.ك)

هەروەها زاراوەی( الجوانیة) لەوانەکانی دکتۆر عوسمان ئەمین لەپەنجاکانی ئەم سەدەیەدا لەزانکۆی قاهیرە بەکاری هێناوە پاشان لەکتێبەکەی‌دا( الفلسفة الجوانیة) دا دایڕشتۆتەوە پێمان وایە ئەومانایە نووسەر مەبەستێتی گونجاوە لەگەڵ مانای ئەم زاراوەیەدا .( و.ع)

دروشمێکی دژ بەرز بکاتەوە( هەمیشە و بەردەوام ویست و حەزی نویێ ڕەها بکە) [٦].
مانای راست و دروستیش لەپشت ئەم تەوەرە دژبەیەکانەوە دەرکی پێ ناکرێت مەگەر کەسێك نەبێت کەدەزانێت ئەو دوو هەڵوێستە لەودوو نموونەی پێشەوە دا بەرێکەوت نەهاتوون. وەئەوەمان نیشان دەدات کەوا مرۆڤ بونەوەرێکی نەساز و ناجۆرە، وە ئاڵۆزیەکانی سروشتی مرۆڤایەتی لەخۆیدا پەرچ دەکاتەوە.

هەروەکو چۆن ئەو دژیەکیەی نێوان رۆشنبیری و شارستانیەتیش بەهەمان شێوە پەرچدەکاتەوە. هەڵگری رۆشنبیری بریتیە لە مرۆڤ، وەهەڵگری شارستانیەتیش بریتیە لە کۆمەڵگا، مانای رۆشنبیریش واتە ئەو هێزە زاتیەی کەلەرێگەی نەشو نماوە پەیدادەبێت، بەلاّم شارستانیەت بریتیە لە و هێزو دەستەلاّتەی کەهەیە بەسەر سروشتدا لەرێگەی زانستەوە، زانست و تەکنەلۆژیاو شارەکان و ولاّتەکان هەموو یان ئینتمایان بۆ شارستانیەت هەیە. ئامرازەکانی شارستانیەتیش بریتین لە فیکرو زمان ونووسین [٧]. هەریەك لە رۆشنبیری وشارستانیەت ئینتمایان بۆ ئەوەی تریان هەیە وەکو چۆن جیهانی ئاسمان ئینتیمای بۆ ئەم جیهانە دونیاییە هەیە، یەکێکیان ( دراما) و ئەویتریشیان( تۆبیا)یە.

( تاسیرۆس) دەڵێت : ئەو مامەڵەیەی بەربەریەکان لەگەڵ کۆیلەکانیاندا دەیانکرد گەلێك باشتربوو لەو مامەڵەیەی کەوا رۆمانیەکان دەیانکرد لەگەڵ کۆیلەکانیاندا [٨]. و بەگشتی، دەوڵەتی رۆمانی کۆن دادەنرێت بەنموونەیەکی شیاو بۆ کێشانی هێڵی جیاکەرەوە لەنێوانی رۆشنبیری و شارستانیەتدا. تووشی سەرسامیش نابین

---

[٦] لە«رۆژنامەی نیۆرك تایمز» دا( لەو ماوەیەدا) مەقالەیەك دابەزی ئەم دروشمە پێناسە دەکات بەوەی کە( یەکەمین وەسیەتە بۆ چاخی نویێ).

[٧] ( مارشال مالکومات) سەلندی کە نوسین گۆرانکاری دروست دەکات لەشێوازەکانی بیرکردنەوە دا وەبەکارهێنانی جۆرێك لە ئەلف و بیێ دەبێتە هۆی بەرهەم هێنان و پشتگیری عادەتی گوزارەکردن لەزمانێکی( مریێ و مکاني)، بەتایبەتی لەبارودۆخێکی( مکان) ی و( زمان) ی گشتیدا بەبەردەوامی و دەوام. Mclahan: TheGatenberg Galaxy , Serbocroation trans.( Beograd: Nolit. 1713 p. 32.

[٨] تاسیرۆس Tacirus : Aricola and Germana:,Trans. Maurice Hutten(Cambridge,MA:Harvard Univerd University Press,n.d.)

لەتێروانینماندا بۆ ئەو دزێویانەی کەلەناو شارستانیەتی رۆمانیدا هەبوون هەر لە : جەنگەکان و دزی و جەردەیی و تالآنکردنی موڵك و ماڵی خەڵکی و جەورو ناڕەحەتی چـینی کاربەدەسـتان و، جـەماوەری هـەژارو لاوازو، فرۆفیڵـی سیاسـەتمەداران و چەوساندنەوەی مەسیحیەکان و مومارەسەکردنی یاریـەکانی زۆرانبازی هـەتا مـردن، و(نیرۆن) و(کالگۆلا) *. هـەموو ئەم دزێویانـە سەرسامـمان ناکـەن، بـەڵکو بـەوە سـەرسام دەبین کـە لـەپاش ئەوە وە چـەندێك لەرۆشـنبیری ئـەو شارستانیەتە ماوەتـەوە ! ئـەوە (رۆحـی هیلینـی وزیرەکـی رۆمانیـە) کـە جیاکەرەوەیـە لـەنێوان رۆشـنبیری و شارستانیەتدا [٩].

لەسەیرکردنێکی رۆمانەکاندا ئەو بۆچونەت لادروست دەبێت کە ئەوان بەربەریەکی پێشکەوتوون، رۆمایش نموونەی شارستانیەتێکی بەهێزەو مەحروم و بێ بەشە لە رۆشنبیری. بەلآم رۆشنبیری( مایاوی) رەنگە نموونەیەکی بەپێچەوانەی ئەمەوەبێت. بەپێی ئەو زانیاریانەو شارەزایمان لەژیانی جەرمانی و سلافیە کۆنەکاندا وادەردەکەوێت کە ئەمان لەئاستێکی بالآتری رۆشنبیری دابوون لەچاوو رۆمانیەکاندا. هەروەها هیندیە سورەکانیش زیاتر رۆشنبیر بوون لە سپی پێستە داگیرکارەکان.

هەروەها چاخی رێنیسانسی ئەورووپیش نموونەیەکە تەعبیر لەم دیاردەیە دەکات. وە ئەو ماوە رۆشنبیریە زۆرترین ماوەیە کە کاریگەری هەبووبێت لەمێژووی مرۆڤایەتیدا. لەگەڵ ئەوەشدا لەتێروانینی شارستانیەتەوە ئەم ماوەیە دادەنرێت بەماوەی ئاڵۆزی و بەرەو خراپی چوون. چونکە لەماوەی ئەو سەدەیەدا کەدەکەوێتە پێش چاخی رێنیسانسەوە شۆڕشێکی ئابووری راستەقینە روویدا، ئاستی بەرهەم هێنان و بەکاربردن زیادی کرد، هەروەها ژمارەی دانیشتوان رووی لەزیادی کرد، بەلآم لەماوەی هەردوو سەدەی (١٣٥٠–١٥٥٠) دا کەدانرێت بە چاخی رێنسانس زۆربەی

---

* نیرۆن : ئیمپراتۆرێکی رۆمانی بوو بەناوبانگ بوو بەزوڵم وستەم کاری.لە کۆتایی دا خۆی کوشت. کالیگولا : ئەویش ئیمپراتۆرێکی تری رۆمانی بوو بەناوبانگ بوو بەبریاردانی شێتانەو ستەم کردن لەدوایی دا کوژرا.

[٩] ( ئەزۆلد شبنجلر Os Wald Spengler : The Oecline of the West(London: Gorge & Allen Unwin, 1971) P. 32

دەسکەوتەکانی ئەو شۆڕشە ئابورییە لەناوچوون، لەو سەردەمەدا زیاتر گرنگی بە مرۆڤ ئەدرا لەبری جیهان، ناسرابوو بە چاخی قوڵبونەوە لەلایەنی دەرونی و ناخی مرۆڤ، بەشێوەیەك وادەردەکەوت کەچاخی ڕێنسانس هیچ گرنگی بەو ڕووداوانە نادات کەلەسەرزەمین و جیهانی واقیعدا ڕووئەدەن.

لەکاتێکدا زۆربەی کارە هونەریەکان لەڕۆشنبیری ڕۆژئاوادا لەو کاتەدا پێگەیشتن و داهێنران، وە لەزۆربەی دەوڵەتە ئەوروپیەکاندا ڕێژەی ژمارەی دانیشتوان بەرەو کزی ڕۆیشت. بۆ نموونە لەنزیکەی نیوەی سەدەی چواردەدا ژمارەی دانیشتوانی ئینگلتەرا دەگەیشتە چوار ملیۆن کەس، بەڵام پاش سەدساڵ ئەو ڕێژەیە دابەزی بۆ تەنها ٢,١ ملیۆن کەس، هەروەها ژمارەی دانیشتوانی( فلۆرنسا) لەماوەی سەدەی چواردەدا لەسەد هەزار کەسەوە کەم بووەوە بۆ حەفتا هەزار کەس. لەمەوە ئەوەمان بۆ ڕووندەبێتەوە کەوا دوو جۆر( پێشکەوتن) هەیە و هیچ یەکێکیشیان بە ئەوی ترەوە نا بەسترێتەوە بەهیچ جۆرە بەستنەوەیەکی جەوهەری.

# فێرکردن و تێڕامان

شارستانیەت پرۆسەیەکی فێرکاریانەیە واتە پشت بەفێرکردن دەبەستێت، بەڵام رۆشنبیری چالاکیەکی رۆشنگەرانەیە، یەکەمیان پێویستی بە فێربوون هەیە، بەڵام دووەمیان پێویستی بە تێڕامان هەیە.

تێڕامان کۆششێکی (جوانیٚ) ناوەوەی مرۆڤە بۆ ناسینی خودو هەروەها ناسینی شوێنگەی مرۆڤ لەجیهاندا، هەروەها چالاکیەکی تەواو جیاوازە لە شێوازی فێرکردن و فێربوون و کۆکردنەوەی زانیاری لەبارەی حەقیقەتەکان وپەیوەندیان یەك بەیەکترەوە. تێڕامان دەبێتە هۆی حیکمەت و دانایی و وردەکاری و ئارامی دڵ، دەبێتە هۆی جۆرێك لەپاکژکردنەوەی لایەنی (جوانی) مرۆڤ، کەلای گریکەکان بە (Gatharsis) ناوزەدەکراوە. هەروەها بریتیە لەتەرخانکردنی نەفس بۆ گەڕان و قوڵبونەوە لەزات بۆ گەیشتن بە هەندیٚ لە حەقیقەتە ئاینی و ئەخلاقی و هونەریەکان [10]. بەڵام فێربوون و زانست وەرگرتن ڕووبەڕوی سروشت دەبێتەوە بۆ لیٚ تێگەیشتن و گۆڕینی رەوشەکانی بوون، زانست بوارەکانی تێبینی کردن و شیکردنەوەو پۆلێنکردن و ئەزموون پەیداکردن و تاقیکردنەوە دەگرێتەوە. ئەمە لەکاتێکدا کەتێڕامان هەوڵی تێگەیشتنێکی پاك و پوخت دەدات، بەڵکو ئەفلاتونیەتی نویٚ پێیوایە کە ئەمە تێگەیشتنێکی سەرو عەقڵانیانەیە. سەرنجە تێڕامانیەکان

---

[10] ئەم حاڵەتە( نازانستیە) ی عەقڵ لەکاتی چاخی رینسانس دا دەتوانرێت هەستی پێبکرێت لە بڵاوبونەوەی خورافیاتدا( بۆ نمونە بەخت گرتنەوە لە رێگەی ئەستێرەکانەوە زیاتر لەنێوان توێژی بیر مەندەکاندا باوەو رێز لە پێشبینیەکانی دەگیرێت، ئەم کارە لەو سەردەمەدا بەشێوەیەك گرنگی پێدراوە و لەبرەودایە کە لەهیچ سەردەمێکدا ئەوڕەواجەی نەبووە).

بڕوانە : Bertrand Russell : History of Westen Philosophy(London : n..P.1948).P.523.

(ئازادن لەئیرادەو لەخواستدا) [11]ئەمە تێبینیەکە نابەسرێتەوە بەپیشەوە یان بەرژەوەندیەوە. رامان هەڵوێستی زانایەك نی‌یە، بەڵکو هەڵوێستی بیرمەندێك، شاعیرێك یان هونەرمەندێك یان کەسێکی زاهیدو خوداناسە. هەندێك جار زانایەك دەچێتە ناو چەند ساتێك لەتێڕامانەوە، بەلاّم ئەو کارە دەکات، نەك وەکو زانایەك، بەڵکو وەکو مرۆڤێك یان هونەرمەندێك (هەموو مرۆڤەکانیش بەشێوەیەك لەشێوەکان هونەرمەندن) تێڕامان و ووردبونەوە هێزی ئەوەت پێدەبەخشێت کەزاڵ بیت بەسەر دەروونذا، بەلاّم زانست پەیداکردنی هێزە بەسەر سروشتدا، فێربونیشمان لە قوتابخانەکاندا تەنها گەشە بەلایەنی شارستانمان دەدات، و شتێك ناخاتە سەر لایەنی رۆشنبیریمان.

لەم سەردەمەی ئێمەدا خەڵکی فێردەکرێن، بەلاّم لە رابردودا خەڵکی لەسەر تێڕامان راهاتبوون حوکمڕانەکانی( لابوتا) Laputa بەشێوەیەك لەنێو تێڕامانەکانیاندا قوڵدەبونەوە نەیاندەڕوانی یاخود گوێیان نەدەبوو لەو کەسانەی کەلە دەوروبەریان بوون و بە پرسیاری زۆر بیّ تاقەتیان دەکردن [12].

ئەفسانە بۆمان دەگێرێتەوە کە( بوزا) پێش ئەوەی ئیلهامی بۆ بهاتایە بۆ ماوەی سێ شەوو ڕۆژ لە کەناری دەریادا رادەوەستا و لەنێو بیرکردنەوەدا نوقم دەبوو بەبێ ئەوەی هەست بەتێپەڕبوونی کات بکات. (زەینەفون) چیرۆکێکی هاوشێوەی ئەمەمان لە بارەی ( سوکراتەوە) بۆ دەگێرێتەوە و دەڵێت : لە بەیانی یەکێك لە ڕۆژەکاندا (سوکرات) بیری لەشتێك دەکردەوە نەدەگەیشتە ئەنجام، سوکرات لەبەرامبەری ئەمەدا خۆی نەدا بەدەستەوە بەڵکو بەردەوام بوو لەبیرکردنەوە هەر لەبەیانی زووەوە هەتا کاتی ئێوارە، هەر بەپێوە راوەستابوو لەو شوێنەدا بیری دەکردەوە. لەئێوارەدا ئەو رەوشەی ئەو سەرنجی خەڵکی بۆ لای خۆی ڕاکێشا، ئەو هەواڵە لەنێو خەڵکیدا ئەوانەی حەزیان بەزانینی ئەو جۆرە هەواڵانە هەیە بلاّوبووە کەوا سوکرات هێشتا هەر بەپێوە وەستاوەو

---

[11] ( ئارپرشوبنهور) Arthur Schopenhauer : The Works of Schopenhauerged.Will Durant (Garden City.N.Y., Garden City Publishing Company, 1928) .

[12] بایۆت Payot:.The art of beinj man , Serbocroation trans.(Beograd: Rad, 1960) P.21.

لەبەیانی زووەوە بیر لەشتێك دەكاتەوە. لەشەودا كۆمەڵێك لە( ئایۆنیەكان) هاتن بۆ ئەوەی لەدوایین هەواڵی ئەو ڕەوشەی سوكرات ئاگاداربن، سەیریان كرد هێشتا سوكرات هەروەكو خۆی ماوەتەوە، بۆیە بڕیاریاندا بەدیاریەوە دانیشن بۆ ئەوەی بزانن هەر بەو شێوەیە بەپێوە بەدرێژایی شەو دەمێنێتەوە، لەڕاستیدا سوكرات لەسەر ئەو بارەی خۆی هەتا سەر لەبەیانی ڕۆژی دوایی مایەوە. كاتێك تیشكی ڕۆژی نوێ بەدەركەوت، بەنوێژ پێشوازی لەخۆركردو پاشان شوێنەكەی بەجێ هێشت و ڕۆیشت [١٣](تۆلستوی) هەموو تەمەنی خۆی بەسەربرد لەبیركرنەوە لەمرۆڤ و لەچارەنووسی، لەكاتێكدا ( گالیلۆ) – پەیامهێنەری شارستانیەتی ڕۆژئاوا – گرفتی (كەوتنە خوارەوەی تەنەكان) بەدرێژای تەمەنی هزری داگیركردبوو. تێڕامبمێنیت، یان فێرببیت و لێكۆڵینەوە بكەیت، ئەمانە دوو چالاكی جیاوازن، یان دووجۆرن لە ووزە كە بۆ دوو ئاڕاستەی جیاواز تێدەكۆشن، یەكەمیان وای لەبتهۆڤن كرد كەوا سەمفۆنیای نۆیەم دابهێنێت، دووهەمیشیان وای لە( نیوتن) كرد كەیاساكانی ڕاكێشان و جوڵە بدۆزێتەوە. ناسازی و دژیەكی لەنێوان تێڕامان و فێربووندا جارێكی تر خۆی دووبارە دەكاتەوە بەهەمان شێوە لەنێوان مرۆڤ و جیهاندا، لەنێوان ڕۆح و زەیرەكیدا. لەنێوان شارستانیەت و ڕۆشنبیردا.

لێرەدا دێینە سەرباسكردنی ئەوەی كە بابەتی تێڕامان چی‌یە ؟

لەسروشتدا دەتوانین كەوا كەشفی جیهان و مرۆڤ بكەین، لەڕاستیدا هەموو شتەكان دەتوانرێت كەشف بكرێت و ڕەهەندەكانیان بدۆزرێتەوە بێجگە لەزاتی مرۆڤایەتی و كەسێتی ئەو، هەر تەنها لەڕێگەی ئەو زاتەشەوەیە دەگەین بەسەرمەدی و ناكۆتایی، لەڕێگەی زاتەوە هەر لەڕێگەی ئەوەوە تەنها هەست بەئازادی دەكەین و دەرك بەو جیهانەی تر دەكەین كەبەشداردەبین لەگەڵیدا لەیەك میراتدا..بەبێ ئەو زاتە زەحمەتە

---

[١٣] بڕوانە :( زەینەفۆن) Xeno Phone : Hellenica .Anabasis.Apology.and Sympocium,ed.C.L.Brownson andOj.Todd.(CambridgeMA: Harvard University Press,n.d)

بتوانین دان بەبوونی جیهانێکی تردا بنێین لە پشت جیهانی سروشتەوە. چونکە هەموو شتەکانی تر بەتەنیشت زاتی مرۆڤەوە بریتین لەبونێکی دەرەکی و ئاشکرا.

رامان بریتیە لە قوڵبونەوە لە( زات) خوددا، هەوڵدانێکە بۆ گەیشتن و دۆزینەوەی پێناس و حەقیقەتی ژیان و بوونمان. لەبەر ئەم هۆیەیە کە رامان هەوڵی وەڵامدانەوەی ئەو پرسیارانە نادات لە بارەی کۆمەڵگەو بەشەرەوەیە.

ئەو تەنها گرنگی بەو پرسیارانە دەدات کەمرۆڤ دەیانخاتە بەردەم زاتی خۆیەوە. ئەگەر بەووردی لە( ڕامان) وردبینەوە دەبینین کەوا کارێك نی‌یە لە کارەکانی زیرەکی. زانایەك کاتێك نەخشە دەکێشێت بۆ دروستکردنی جۆرێکی نوێ لە فڕۆکە، نایەت تێڕابمێنێت، بەڵکو بیردەکاتەوە، لێی دەکۆڵێتەوە و تاقیکردنەوە ئەنجام دەدات و بەراورد لەنێوان ئەم و فڕۆکەیەکی پێشووتردا دەکات، وەهەموو ئەم چالاکیانەش چ پێکەوەبن یان هەریەکەیان بەتەنها بەتێڕامان دانانرێن. بەڵام راهیب و شاعیر و بیریار و هونەرمەند ئەمانە رادەمێنن، دەیانەوێت بگەنە حەقیقەتی هەرەگەورە، تاکە نهێنی هەرە گەورە. ئەم حەقیقەتە هەموو شتێك دەگەیەنێت و هیچ شتێکیش ناگەیەنێت، هەموو شتێك دەگەیەنێت بەنسبەت رۆحەوە، هیچ شتێکیش ناگەیەنێت بەنسبەت باقیەکەی دیکەی جیهانەوە. لەبەر ئەمەشە کە ڕامان چالاکیەکی ئاینی بووە لەلای ئەرستۆ، جیاوازی لەنێوان عەقڵ و تێڕاماندا بریتیە لەو جیاوازیەی لەنێوانە چەمکی مرۆڤ و چەمکی ئیلاهی‌دا هەیە.

لە( بوزی)یەتیشدا نوێژ تەنها بریتیە لەڕامان، لەمەسیحیەتیشدا ئەو سروتە رەهبانیە تێڕامانیە دەبینین کەوا دیاردەیەکی تەواو لۆژیکییە. ( ئیسپیونزا) ی فەیلەسوفیش پێی وایە کەوا رامان جوانترین شێوەو ئامانجە بۆ ئەخلاق. فێرکردن بەتەنها نابێتە هۆی بەرزکردنەوەی خەڵك، واشیان لێ ناکات کەباشتربن لە پێشویان هەروەها واشیان لێ ناکات زیاتر ئازادبن و زیاتر لایەنی مرۆڤایەتیان بەهێزبێت، بەڵکو زانست وا لە خەڵك دەکات کەبەهێزترو زیاتر بەتوانابن، زیاتر سوودبەخش بن بۆ کۆمەڵگا. مێژوو ئەوەی سەلماندوە کەپیاوانی خوێندەوارو گەلانی خوێندەوار دەتوانرێت زیاتر کاریان لەسەر بکرێت و بەڵکو دەتوانرێت وایان لێ بکرێت کە بکرێنە خزمەتگوزاری بەشەر،

بەڵکو بەتوانایەکی زیاتریشەوە لەگەڵە دواکەوتوەکان. مێژووی ئیمپریالیزمیش زنجیرەیەکە لەچیرۆکی ڕاستەقینەی گەلانی پێشکەوتوو کەهەستاون بەگێڕانی شەڕی زاڵمانەو ماڵوێرانکەرو چەوساندنەوەی ئەو گەلانەی کەئاستی خوێندەواریان کەم بوەو لەڕوی ژیاریەوە دواکەوتوتربوون، گوناهیشیان تەنها ئەوەبوە کە ویستویانە بەرگری لەخۆیان و ئازادیان بکەن. ئاستی بەرزی خوێندەواری و شارستانیەتی ئەو داگیرکەرانەش هیچ کاریگەریەکی نەکردۆتە سەر ئامانج و شێوازەکانی مامەڵە کردنیان، بەڵکو تەنها یارمەتی ئەوەی داون کەتوانای ئەو داگیرکەرانە زیاتر بکات بۆ ئەوەی دۆڕان ونوشوستی دان بەسەر ئەو گەلانەدا بسەپێنن.

## فێرکردنی تەکنیکی و فێرکردنی کلاسیکی

فێرکردن هەر چۆنێك بێت، دیاردەیەکی یەك لایەنی نیە، ئەگەر ئێمە لەنزیکەوە بۆمان ڕوانی ئەوا هەست بەبوونی دوو ئاڕاستەی جیاواز دەکەین، دوو ئاڕاستەی یەکسان بەڵام هەریەکەیان سەربەخۆ لەوی تر. فێرکردنی قوتابخانەکانیش لەجیهانی پێشکەوتووی ئەمڕۆدا زیاتر پشت بەفیکر دەبەستێت و جەخت لەسەر ئەو لایەنە دەکاتەوە، لایەنی مرۆڤی تێدا فەرامۆشکراوە. ئەگەر ئەو زاراوانەمان بەکارهێنا کەلەسەریان ڕاهاتوین دەتوانین بڵێین: زیاتر فێرکردنێکی تەکنیکیەو خەریکە تەواو لایەنە کلاسیکیە( تقلید) [14] یەکەی تێدا فەرامۆش دەکرێت. لەم ڕۆژانەدا زۆر ئاسانە کەوا دابنێین قوتابیەك بەهەموو قۆناغەکانی خوێندندا تێپەڕیوە هەر لەقوتابخانەی سەرەتاییەوە هەتا زانکۆ بەبێ ئەوەی باسی ئەوەی بۆ بکرێت کە پێویستی مرۆڤێکی چاکەکارو ئەمین بێت. ئەو یەکەم جار فێری ئەوە دەکرێت بنوسێت و بخوێنێتەوەو کاری حسابی ئەنجام بدات، پاشان سروشت و کیمیاو زانستی ڕەگەزناسی بەشەری

---

[14] لەهەندێ وڵاتدا لەبری ئەو ووشەیە( Grammer) بەکاردەهێنن ڕەنگە مەبەستیان لێ فێرکردنی بنەڕەتی وسەرەکی بێت یان(...Exact) ڕەنگە مەبەستیان لێ فێرکردنی وورد و ڕاست و دروست بێت.

وجوگرافی و تیۆرە سیاسیەکان و کۆمەڵناسی دەخوێنێت. کۆمەڵێك زۆر لە حەقیقەتەکان لای خۆی کۆدەکاتەوە، لەچاکترین گریمانەیشدا فێری ئەوە دەبێت کەچۆن بیر بکاتەوە، بەڵام ئەم کەسە لەلایەنی رۆحیو رۆشنبیریەوە رۆشن نەکراوەتەوە ئێمە بەشێوەیەکی کەم نەبێت نەمانبیستوە لەبارەی پرۆگرامەکانی مێژوو هونەرو ئەدەب و ئەخلاق و یاساوە. فێرکردنی تەکنیکی هۆکاری سەرەکی و فاکتەری بەشارستانی بوونە، ئەم جۆرە فێرکردنە ئەندام ئامادە دەکات بۆ چوونە ناو کۆمەڵگاوە، فێرکردنێکە دارێژراوە لەپێناو بەجێ هێنانی ئەو مەبەستەدا، شێوازێکی ئاراستەکراوە بۆ ئامانجێك و پەیوەستە بەو ئەحکامانەوە کەبۆی دیاریکراوە، هەموو گرنگیەکیشی بۆ ئەوەیە کەزاڵبێت بەسەر سروشت و جیهانی دەرەکیدا، بەڵام فێرکردنی کلاسیکی، بەپێچەوانەی ئەمەوە لە مرۆڤەوە دەست پێ دەکات و هەر لەمرۆڤیشەوە کۆتایی پێ دێت، بەو مانایەی کەوا جۆرێك لە( بێ ئامانجی مەبەستیەتی). گرفتی پرۆسەی فێرکردنی تەکنیکی لەبەرامبەر فێرکردنی کلاسیکیدا گرفتێکی تەنها هونەری نیە، بەڵکو مەسەلەیەکی ئایدۆلۆژیشە کەلەپشتیەوە فەلسەفەیەکی دیاریکراو هەیە. لەم دوو جۆرە فێرکردنەشدا دژیەکی لەنێوان رۆشنبیری و شارستانیەتدا رەنگدەداتەوە لەخۆیان و لەهەموو ئەو ئەنجامانەیشدا کەلێیان جیادەبێتەوە، دەبینین کەکۆمەڵگای ناپیشەسازی ئەو ئاراستەیەی تێدا زاڵ دەبێت کە بەرەو فێرکردنێکی کلاسیکیانەی دەبات، لەکاتێکدا کۆمەڵگەی پیشەسازی، بەتایبەتیش کۆمەڵگەی سۆشیالیستی. بەرەو فێرکردنێکی تەکنیکی ئاراستە وەردەگرێت. هەرچۆنێك بێت ئەوە بنەمایەکی گشتییەو شایانی هەڵەیە رەنگە هەندێ جاریش روو بەرووی لادان ببێتەوە لەجێ بەجێکردندا، بەڵام ئاراستەی گشتی بەو شێوەیە بەرپایەو ئاراستە وەردەگرێت لەرێگەی راستکردنەوەی ئەو هەڵانەی کەدروست دەبن و لەکاتی مومارەسەو پراکتیکدا دێنەرێ.. بەبەراوردکردنیش لەنێوان بەرنامەکانی خوێندندا لەیەکێتی سۆڤیەتی (جاران) و هەریەکە لە فەرەنساو چین و ژاپۆن بەشێوەیەکی تایبەتی، لەبابەتەکانی مێژوو یاساو ئەخلاق و ئەدەب و زمانی لاتینی و گریکیدا، ئەوا رێژەی ئەو جیاوازیە گرنگەمان بۆ دەردەکەوێت کە لەنێوانیاندا

هەیە. شێوازی لۆژیکی بۆ فێرکردنی تەکنیکی بریتیە لەتایبەتمەندی. لەپێش هەموو شتێکەوە دەتوانین ئەوە ببینین کەزیرەکی و زانست پیشەسازی و هەر سێکیان یەك هێڵ پێك دەهێنن، یەك بە ئەوی تریانەوە پەیوەستە وەکو هۆکارو ئەنجام. بۆ نمونە زانست لەئەنجامی زیرەکیەوە دروست دەبێت، پیشەسازیش تەنها بریتیە لەجێبەجێکردنێکی زانستی. هەر هەمووشیان چەند مەرج و شێوازێکن بۆ کاریگەری و زاڵبوونی مرۆڤ بەسەر سروشتدا، بەسەر جیهانی دەرەوەدا. تایبەتمەندی دەتوانێت حاڵەتێکی باش و بەهێز بۆ تاك دروست بکات لەناو سیستمی کۆمەڵایەتیدا، واتە لەئالیەی کۆمەڵایەتیدا، بەڵام تایبەتمەندی لایەنی کەسێتی مرۆڤ بچووك دەکاتەوەو لایەنی کۆمەڵ بەهێزدەکات و وای لێ دەکات بەتواناتربێت. چونکە کۆمەڵگا هەموو تواناکانی ئەو کەسە لەخۆیدا کۆدەکاتەوە، لە کاتێکدا مرۆڤ وەکو بەشێك لە ئامێری کۆمەڵایەتی وردە وردە بەها کەسێتیەکانی خۆی لەدەست دەدات، دابەشکردنی کارو داماڵینی مرۆڤ لەکەسێتیەکەی و- سەیرکردنی وەکو کرێکارێکی ئیشکەرو گوێڕایەڵ - بەشێوەیەك راپێچی بەرەو پێشەوەی دەکەن، کە لەحاڵەتێکی( تۆبیا)ی نزیك دەکەنەوە بە دوور لەهەموو واقعیەتێك. بەتێڕامانیش لەو فراوانیەی کەبەسەر فێرکردندا هاتووە ئەوا پێویستیمان بەدواداچونێك دەبێت لەو بارەیەوە. لەساڵی ۱۹۰۰، لەهەموو کۆلیژو زانکۆکانی وڵاتە یەکگرتوەکاندا ۲٤ هەزار مامۆستا هەبوو هەروەها نەساڵی ۱۹۲۰دا ئەم ڕێژەیە بەرزبووەوە بۆ٤۹هەزار، چاوەڕوانیش دەکرێت لەکۆتای ئەم سەدەیەدا ئەو ڕێژەیە بەرزبێتەوە بۆ ٤۸۰هەزار مامۆستا، لەساڵی ۱۹۰۰دا کۆی قوتابیەکان لەهەموو کۆلیژو زانکۆکاندا ۲۳۸هەزار قوتابی بوو، لەساڵی ۱۹۵۹دا ژمارەی ئەو قوتابیانە گەیشتە ۳,۷۷۷,۰۰۰لەپاش ئەوەیش بەدەساڵ، ئەو ژمارەیە بەرزبووەوە بۆ ۱٤,٦۰۰۰,۰۰۰قوتابی بەڵام کۆی ئەو برە پارەیەی خەرجکراوە بۆ فێرکردن، لە ژمارەیەکی هێماییەوە کە( ۲۷۰) ملیۆن دۆلار بوو لە ساڵی ۱۹۲۰دا بەرزبووەوە بۆ بڕی ٥/ ٤۲ بلیۆن دۆلار لەساڵی( ۱۹۷۰) [15]دا. بە هەمان شێوە ئەو

---

[15] بروانە بلاوکراوەی : Education office of the Us Department of Health,Education and Welfare.

زیادکردنانەش لە دەوڵەتە کۆمۆنیستیەکاندا ڕوویاندا. بەڵام بە سروشتی ئەو واقیعە دروستکراوە بودجەی فێرکردن بەرەو ئاستێکی نزمترچوو.

ئەو دوو هێزە گەورەیە لەجیهاندا، مەبەست وڵاتە یەکگرتوەکان و یەکێتی سۆڤیەتە (جاران) کە دوو هێزی سەربازی گەورەن، بەڵام ئەو دوو وڵاتە گەورەترین دەوڵەتی دونیانین لە ڕووی ڕۆشنبیریەوە، ئەو دوو دەوڵەتە هەموو هەوڵەکانیان کۆکردۆتەوە لە پێناو پەرەپێدان بەلێکۆڵینەوەی زانستی وفێرکردن، لەیەکێتی سۆڤیەت( ٤,٢٠/٠)، لە وڵاتە یەکگرتوەکان( ٢,٨٠/٠)ی داهاتی نەتەوەییان لەو پێناوەدا خەرج دەکەن. کەسێکی ئەمەریکی کە تەمەنی لە سەرو بیست و پێنج ساڵیەوەیە ( ١٠,٥) ساڵ دەخوێنێت لەناوەندیدا، لە پاش ئەوەش کەسی بەریتانی دێت کە( ٩,٥) دەخوێنێت پاش ئەویش کەسی ڕووسی دێت کە ٥ ساڵ دەخوێنێت[١٦]. کەواتە ئەمە چ جۆرێکە لە فێرکردن ؟ وەکو بنەمایەك، جۆرێکە لەفێرکردن کە بەپێی پێناسەکانی شارستانیەت ئامادەکراوە. لە دەوڵەتە شیوعیەکاندا پێویستە خوێندن بە شێوەیەك بێت کە هەموو تاکێك لە بارەی سیستەمی ئایدولۆژی و سیاسی ئەو دەوڵەتەوە هەموو شتێکی پێ بدرێت و شارەزایی تەواو وەربگرێت، بە پێی بەرژەوندیەکانی ئەو ڕژێمە بجوڵێتەوە. لەدەوڵەتە سەرمایەدارەکانیشدا فێرکردن بەشێوەیەکی گشتی وادانراوە کەلەگەڵ بەرژەوەندیە ئابوریەکانیدا بگونجێت، هەروەها خزمەت بەسیستەمی پیشەسازی بکات، لەهەردوو حاڵەتەکەدا فێرکردن بریتیە لە فێرکردنێکی وەزیفەیی و لە خزمەتی ئەو سیستەمەدا دەبێت، ئەم ئاڕاستەو شێوازە باوە بەگشتی لە زۆربەی وڵاتاندا پەیڕەوی دەکرێت سەرەڕای ئەو ووتارە جوان و ڕووکەشکراوانەیش کە دەدرێن دەربارەی چاککردنی پرۆگرامەکانی خوێندن و فراوانکردنی بۆ ئەوەی هەموو لایەنە جۆراوجۆرەکانی کەسێتی مرۆڤایەتی و خاسیەتەکانی مرۆڤایەتی بۆ فێرکردن بگرێتەوە... هتد. بۆ زیاتر جەختکردنەوەش لەسەر ئەمە، لە دوو سەرچاوەی باوەڕ پێکراوەوە نموونە دەهێنینەوە:

---

[١٦] ئەم زانیاریانە دەگەڕێنەوە بۆ ساڵی ١٩٦٠.

(لینین) زۆر جار ئەوەی دووپاتی دەکردەوە کە فێرکردن ناکرێت و نابێت (بێ لایەن) بێت لە رووی بابەتیەوە نەك سیاسیەوە. لە کۆنگرەی یەکەمی فێرکردنی سۆڤیەتدا کە لەساڵی ١٩١٨دا گیرا،( لینین) یەکەم بنەمای فێرکردنی دانا کەبەم شێوەیە بوو(( کاری ئێمە لەفێرکردندا بریتیە لە تێکۆشان لە پێناو لەناوبردنی چینی بورجوازیدا، ئێمە ئەوە رادەگەیەنین کە هیچ قوتابخانەیەك نیە لەدەرەوەی سیاسەتدا ئەوەش لەو بارەیەوە دەوترێت درۆو دووروییە)).[١٧] داڕشتنەوەی فێرکردن لەنێو چوارچێوەی ئایدۆلۆژیدا وەکو بنەمایەك لەسیستەمی فێرکردنی یەکێتی سۆڤیەتدا هەتا ئەمرۆش ماوەتەوە. ( دیارە نوسەر مەبەستی لەو کاتەیە کە ئەم کتێبەی تێدا نوسراوە.﴿ و. ك ﴾ بەلاَم(جۆن ك. جالبریث) کە ئابوریزانێکی بەناوبانگەو یەکێکە لەباشترین شارەزایان لەسیستەمی پیشەسازی لەجیهانی ئەمرۆدا، دەلێت : ﴿ ... بێگومان قوتابخانەی ئامادەیی نوێ تەواو رەخسێنراوە بۆ ئەوەی بگونجێت لەگەلّ پێداویستیەکانی رژێمی پیشەسازیدا، ئەو وانانەش کە زیاتر گرنگیان پێ دەدرێت بریتین لەزانیاریەکی رووت و بیرکاری و وانە کرداریەکان، ئەمەش تەنها بریتیە لەرەنگدانەوەیەکی داخوازیەکانی بونیادی تەکنیکی ... لەکاتێکدا کەمترین بوارو گرنگی پێ نەدان ئەو وانانە دەگرێتەوە وەکو هونەرو زانستی مرۆڤایەتی ئەمەش لەرووی یەکەم سەیرکردنی گرنگی ئەو بابەتانەوەیە. سیستەمی پیشەسازی هانی فراوانبونێکی گەورە دەدات لە بوارەکانی فێرکردندا، ئێمەش لەم رووەوە پێشوازی لێ دەکەین، بەلاَم ئەگەر نەتوانین ئاگاداری لایەنە خراپەکانی ئەم سیستەمە بین و بە توندی بەرەنگاری نەبینەوە، ئەوا بەتەئکید ئەو سلبیاتانە دەبنە رێگرێك لەبەردەم فێرکردندا، فێرکردن ئیشی ئەوەیە کە خزمەتی ئەو شتانە بکات کەزیاتر خزمەتی ئەو سیستەمەو ئامانجەکانی دەکات، کەمترین

---

[١٧]( فلادیمیر لینین : Vladimirl. Lenin: The Lenin Anthology, ed. Robertc. Tucker newyork : Norton , 1975).

شتێکیش کە ئەنجامی ئەدات ئەوەیە کە ئەو ئامانجانە بخاتە بەر لێکۆڵینەوە [18].
هەرچۆنێك بێت، هەوڵ دەدەین ئەو خەسڵەتە هاوبەشانەی ئەو دوو جۆرە سیستەمی فێرکردنە کەباون دیاری بکەین لەهەردوولادا: پێش هەموو شتێك هەڵبژاردنی ئەو جۆرە شێوازەیە کەتەواو بەشێوەیەك دانراوە کە بەدەوری کێبەرکێ یەکی تێکدەرانەدا دەخولێتەوە ئەم جۆرە فێرکردنە زمانێکی تایبەتیو پیشەسازیانە بەکاردەهێنێت لەزۆربەی بابەتەکانی خوێندندا، ئەو سیستەمی بیناسازیەی کەلە خوێندنگاکاندا دەخوێنرێت و پەیرەوی دەکرێت شێوازێکی وەزیفی و هەڵگوشراوەو تەنها لەگەڵ پێودانگە بەرژەوەندی و تەندروستیەکاندا دەگونجێت، ئەمەیش لەبەرئەوەی کە خوێندنگا یا ئەوەتا خزمەت بەبیرۆکراتیەتی دەسەلاتدارو حوکمڕان دەکات، یان خزمەت بەڕژێمی پیشەسازی دەکات. هەردووکیشیان لەیەك ئامانجدا یەکدەگرنەوە کە ئەویش پێگەیاندنی کەسانی تایبەتمەندن ئەوانەی کەلەخزمەتکردن و پشتگیری تەواوی ئەو دوو ئالیەتەدان.
بەلام قسەکردنە لەبارەی خوێندنگا مرۆییەکانەوە لێرەو لەوێ، تەنها بریتیە لەکۆمەڵە قسەیەکی ئارایشتکراو بەبێ زیادوکەم ئەگەر ئێمە بەچاوێکی هەڵسەنگاندنەوە سەیرێکی ئەو پێکهاتە رۆشنبیریانەمان کرد کە لەو خوێندنگایانەدا دەخوێنرێن دەتوانین بڵێن: خوێندنگا پێکهاتێکی بنەرەتیە لەپێکهاتەکانی رۆشنبیری، هەولی بەرزکردنەوەی ئاستی رۆشنبیری دەدات هەتا رادەیەك کەخوێندن تەنها بریتی نەبێت لەپرۆڤەکردن لەسەر گوێڕایەڵی و پابەندبوون بەو سیستەمەوە، چونکە رۆشنبیری گەشە بە بیرکردنەوەی رەخنەگرانە دەدات، رێگە بەئازادی رۆحی مرۆڤ دەدات، بەلام خوێندنگەیەك کە خۆی چارەسەرێکی ئەخلاقی و سیاسی ئامادەکراو پێشکەش دەکات، ئەم شێوازی فێرکردنە لەتێڕوانینی رۆشنبیریەوە بەخوێندنگەیەکی هەرەمەکی دادەنرێت چونکە ئەو شێوازە کەسانی ئازاد دروست ناکات، بەڵکو کەسانی شوێن کەوتە دروست دەکات، ئەم شێوازە پشتگیری شارستانیەت دەکات بەلام بەزیانی رۆشنبیری دەشکێتەوە.

---

[18] ( جالبریپ) John Calbraith and M. S. Randhawa: The New Industrial State(Boston : Houghton mifflin 1967).PP 339- 341.

# ڕۆشنبیری جەماوەری

لەژێر ڕۆشنایی ئەو ڕونکردنەوانەی پێشوودا خوێنەر خۆی ئەو شوێنگەیەی بۆ دەردەکەوێت کە بە (ڕۆشنبیری جەماوەری) ناودەبرێت، بەڵام ئایا ئەوە لەڕاستیدا ڕۆشتنبیریە یاخود تەنها سیمایەکە لەسیماکانی شارستانیەت؟ بابەتی کامە ڕۆشنبیری مرۆڤە: فەردی یا کەسێتی، واتە ئەو فەردیەتە تاکانەیەی کە دووبارە نابێتەوە، بەڵام بابەتی ڕۆشنبیری جەماوەری ئامانجی، بریتیە لەجەماوەر یان (مرۆڤی جەماوەری) ﴿((Man mass))﴾[19].

مرۆڤ خاوەنی ڕۆحە، بەڵام جەماوەر هیچ شتێکی لانیە جگە لەپێداویستیەکانی نەبێت. لەبەرئەوە، هەموو ڕۆشنبیریەك بریتیە لەگەشەپێکردنێکی سروشتی هەموو لایەنەکانی مرۆڤ، لەکاتێکدا ڕۆشنبیری جەماوەری تەنها بۆ تێرکردنی پێداویستیەکانە.

ڕۆشنبیری بەرەو فەردیەت ئاڕاستە وەردەگرێت، بەڵام ڕۆشنبیری جەماوەری بەئاڕاستەیەکی پێچەوانەی ئەمەدا دەڕوات، شێوازێکی وێکچوو هاوشێوە پەیڕەوە دەکات (دانانی ڕۆحەکان لەقاڵبی هاوشێوەدا). ئا لەم حاڵەدا ڕۆشنبیری جەماوەری لەئەخلاق و لەڕۆشنبیری لادەدات. بەرهەم هێنانی بەکۆ( بۆ کاڵا ڕۆحیەکان) و کۆپی کردن و دووبارەکردنەوەی ئەدەبی زەخرەفەکراوو کەم بەها دەبنە هۆی داماڵینی کەسێتی.

---

[19](Man mass) یان مرۆڤی جەماوەر : ئەم زاراوەیە لە ئەدەبیاتی(( جوزی اورتیجا)) دا بەکار هاتوە، بەو واتایەی کەجەماوەر دەگۆڕێت بۆچەند یەکەیەکی بێ ناسنامەو بێ ڕووخسار وەیان بۆ کۆمەڵێك کەس کە کەسێتیان لەدەست داوە و بچووك بونەتەوە بۆ تەنها چەند کوتلەیەکی ئاسایی و سادە.( مرۆڤی جەماوەری) : بریتیە لە بەرهەمی کۆتایی شارستانیەتێکی بەبێ ڕۆشنبیری، ئازاد لەگومان و ڕەگەزەکانی تری ڕۆشنبیری . بڕوانە
Jose Ortiga Y. Gasset. The Result of the Masses(N. Y Norton). :

جیاوازی ڕۆشنبیری جەماوەری لەرۆشنبیری ئەسڵی لەوەدا دەردەکەوێت کەیەکەمیان سنووررێژییەك لەبەردەم ئازادی مرۆڤایەتیدا دەکات لەرێگەی ئەو ئاراستەیەوە کەوەریدەگرێت و بەرەو هاوشێوەیی و لاسایکردنەوە چونکە لەراستیدا ئازادی بریتیە لەبەرەنگارکردنی هاوشێوەیی.[20]

لێرەدا پێویستە روونکردنەوەیەك پێشکەش بکەین سەبارەت بەو تێکەڵکردنەی کەزۆر جار لەنێوان رۆشنبیری جەماوەری و لەگەڵ رۆشنبیری میللیدا دەکرێت و ئەمەش بەخراپ بەسەر دوهەمیاندا دەشکێتەوە، چونکە رۆشنبیری میللی رۆشنبیرییەکی رەسەنەو زیندوو راستەوخۆیە. بەریئە لەئارایشتکردن و هەروەها لەکارە ئەدەبی و هونەریە نزمەکانKitsch[21]، کەئەمانە بەرهەمی شارە گەورەکانن. رۆشنبیری میللی لەسەر رای هەموان و بەشداریکردنی هەموو لایەك وەستاوە، لەکاتێکدا بنەمای باوو مەبەستی سەرەکی لەرۆشنبیری جەماوەریدا بریتیە لەیاریکردن. لەچوارچێوەی رۆشنبیری میللیدا چەندەها سروود و جۆری سەماکردن و گۆرانی دەبینیتەوە کە موڵکی هاوبەشی گوندێ یان تیرەیەکن. ئەوانەیش کەهەڵدەستن بەنمایشکردنی لەهەمانکاتیشدا هەرخۆیان دەبنەوە بە بینەر تێیدا، ئەوانەش کەلەکاتێکدا بینەرن پێی دەچێت لەکاتێکیتردا لەنمایشدا رۆڵ ببینن.. کاتێك ئاهەنگەکە دەست پێ دەکات هەمووان دێن و بەشداری نمایشەکانی ئەو ئاهەنگە دەکەن کەپێش چەند ساتێ بینەری بوون. بەڵام رۆشنبیری جەماوەری نمونەیەکی تری جیاواز لەمەپێش گەشەدەکات. لەرۆشنبیری جەماوەریدا خەڵکەکان بەتەواوەتی جیان و لەیەکتر جیابونەتەوە بۆ:( بەرهەمهێن ) و(بەکاربەری)ی کاڵا رۆشنبیریەکان، ئایا کەسێك هەیە پێی وایە کەبتوانێت کاریگەری بکاتە سەر بەرنامەیەکی تەلەفزیۆنی

---

[20] بروانە :( ماکس هۆرکهایمر Max Horkheimer : Dialectic of Enlighten ment.trans.john Cumming (New york : Herder and Herder,1972).

[21] زاراوەی Kitsch واتە ئەو کارە هونەری و ئەدەبیانەکە ئاستێکی نزمیان هەیە، وەئەوکارانە کەدارێژراون تەنها بۆ راکێشانی زەوق ووروژاندنی ئارەزووەکانی خەڵك.

ئەگەر بێت و کەسەکە خۆی کارمەندێکی ئەو دەزگایە نەبێت ؟ ئەوەی پیێی دەوترێت دەزگاکانی راگەیاندنی جەماوەری ( وەکو رۆژنامەو رادیۆو تەلەفزیۆنەکان) لەراستیدا ئەوانە دەزگاکانی یاریکردنن بەجەماوەر، بۆ نمونە، لەلایەکەوە چەند کەسێك لەنوسینگەی ( تحریر) یی ئەو دەزگایانەدا کاریان بەرهەمهێنانی پرۆگرامە، لەلایەکی تریشەوە بەمەلایین کەس بەتەنها کاریان سەیرکردنی ئەو پرۆگرامانەیە. بەبێ ئەوەی بتوانن هیچ هەڵویستێکی خۆیان لەبارەی ئەو بەرنامانەوە بخەنە روو.

لەساڵی ١٩٧١دا لێکۆڵینەوەیەك کرا، تێیدا دەرکەوتوە کە هاوڵاتیەکی ئینگلیزی سادە لە هەفتەیەکدا ماوەی ١٦-١٨ کاتژمێر بەسەیرکردنی تەلەفزیۆنەوە بەسەر دەبات [٢٢]، بەشێوەیەك وای لێهاتوە تەلەفزیۆن خەریکە بەتەواوەتی جێگەی ئەدەب دەگرێتەوە، لەپانتایی رۆشنبیریدا بووەتە هاوەڵی و شان بەشانی دەڕوات، هەروەها دەریخستوە هەر لەسێ کەسی فەرەنسی یەکێکیان لەژیانیدا کتێبێکی نەخوێندۆتەوە، گەلی فەرەنسی زۆربەی کاتی لەبەردەم تەلەفزیۆندا بەسەر دەبات [٢٣] هەروەها ئەو لێکۆڵینەوەیە ئاماژەی بەوەیش کردبوو کە بەرێژەی ٠٧٨/٠ی دانیشتوان، دەرکەوتووە کە تاکە ئامێرێکی رۆشنبیری و بنەڕەتی بۆ بەسەربردنی کات بریتیە لەتەلەفزیۆن. لەلێکۆڵینەوەیەکی تردا کەبەبۆنەی( هەفتەی کتێب) وە ساڵی ١٩٧٦ ئەنجام درابوو دەریخستبوو ئەم هەڵوێستەش لە ژاپۆن هیچ جیاوازیەکی نی‌یە لەگەڵ ووڵاتانی تردا. نزیکەی ٠٣٠/٠ژاپۆنیەکان کتێب ناخوێننەوە، لەکاتێکدا هەر یەکەیان رۆژانە دوو کاتژمێرو نیو سەیری تەلەفزیۆن دەکات. پرۆفیسۆر( هۆریکاوا)لەزانکۆی (سان فرانسیسکۆ) گەیشتۆتە ئەو ڕایەی کەپیێی وایە ئامادەیی نەوەی نوێ کەمترە لەئاستی دیاریکراوی زانکۆ. هەر خودی( هۆریکاوا) یش تەفسیری ئەمە بەشێوەیەکی سادە دەکات و دەڵێت : تەلەفزیۆن جێگەی ئەدەب وبیرکردنەوەی گرتوەتەوە، بەمەیش

---

[٢٢] ئەم زانیاریانە لە بلاوکراوەیەکی حکومی وەرگیراوە لەژێرناوی : Society Trends : a statistical annual ، of The British Government. بلاو کراوەتەوە .

[٢٣] کورتکراوەی لێکۆلینەوەیەکە کە گۆڤاری .(Le point, 1975) پیێی هەستاوە.

**توانیویەتی بواری چالاکیە فیکریەکان تەسکبکاتەوە، تەلەفزیۆن ئەمڕۆ وەڵامی ئامادەکراو بۆ هەموو گیروگرفتەکانی ژیان پێشکەش دەکات.[٢٤] ئەم چاخە نمونەی لەو بارەیەمان پێشکەش دەکات، نیشانمان دەدات کە دەزگاکانی ڕاگەیاندنی جەماوەری بۆ ڕۆشنبیری کاتێك لەلایەن حکومەتەوە قۆرخ دەکرێت و بەکاریان دەهێنێت وەکو ئامرازێکی چەواشەکردن و سەر لێشێواندنی جەماوەر. ئیتر پێویست بەهێزێکی زاڵم و دڕندە ناکات وا لەگەل بکات بۆ ئەوەی کارێك بکات کەبە پێچەوانەی وویست و ئیرادەیەوە بێت، چونکە ئەمڕۆ ئەو دەتوانێت بەو کارە هەستێت بەڕێگەیەکی بێ کێشەو ئاسانتر، ئەویش بەئیفلیجکردنی ئیرادەی گەل لەڕێگەی پێدانی حەقیقەتی هەڵەو ئامادەکراوەوە بەشێوەیەکی بەردەوام و بەدووبارەکردنەوەی لەسەریەك و ڕێگرتن لەبیرکردنەوەی خەڵك بۆ ئەوەی نەتوانن خۆیان بیر لەو مەسەلانە بکەنەوە کە پەیوەندی بەخۆیانەوە هەیە، سەبارەت بە خەڵك و ڕووداوەکانی دەوروبەریان دەروونناسی جەماوەر سەلماندویەتی هەروەها چەندین نموونەشمان هەیە کەجەخت لەسەر ئەم ڕایە دەکەنەوە، ئەویش ئەوەیە دەتوانرێت کاریگەری بکرێتە سەر خەڵك لە ڕێگەی دووبارەکردنەوەی بەردەوامەوە بۆ ئەوەی قەناعەتیان سەبارەت بەهەندێ شتی ئەفسانەیەی بۆ دروستبکرێت کە هیچ پەیوەندیەکی بە واقیعەوە نەبێت.[٢٥] هەروەها**

---

[٢٤] ((هوریکاوا)) . Naoyoshi Horikawa: Gendai Masukomy unikes hon ron(n.p.1974)

[٢٥] هەتا ساڵی ١٩٤٥ ژاپۆنیەکان وافێردەکران کە( میکادۆ) لە زنجیرەی خواوەندی ڕۆژە، وەژاپۆنیش لە پێش ناوچەکانی تری جیهانەوە دروستکراوە. قوتابیەکانیش ئەم خۆرافانەیان دەخوێند هەتا لەسەر دەستی مامۆستاکانی زانکۆدا، بەڵام ئەم حاڵەتە ئێستا چۆتە ناو مێژووە بەڵام ئەمڕۆ ئەو خورافیاتانە بەشێوەیەکی‌تر بەدی دەکرێن وەکو پەرستنی سەرۆکەکان لەڕوسیاو چین و کۆریای باکوردا( پەرستنی ستالین، ماوتسیگ تۆنگ، کیم ئالسۆنگ) وەهەموو ئەم خورافاتانەیش لەسەر یەك تەرزن، بۆنمونە :( هەموو وشەیەك کە سەرۆکی گەورە و خۆشەویست مەڤالێ کیم ئیل سۆنگ) لەقوڵایی دڵەکانماندا جێگیردەبێت وەکو چۆن ئاو بەناو زەویەکی تینودا ڕۆدەچێت ... ئێمە سوردەبین لەسەر جێ بەجێ کردنی ئەو پلان و نەخشە گرنگ و هەرە گەورەیە سەبارەت بەگەشەپێدانی سۆشیالیزم کەلەلایەن سەرۆکی خاوەن شکۆ و خۆشەویستمانەوە هاوڕێ کیم ئیل سۆنگەوە داڕێژراوە) لەوتارێکدا کیم جۆن هوی نوسیویەتی . لەتابوتێکی شووشەیی دا لەگۆڕەپانی یەکێك لە کارگەکانی کۆریای باکوردا بەردێك دانراوە لەسەری ئەم دەستەواژەیە نوسراوە : ئەو بەردەی کەهەڤاڵی خۆشەویست و خاوەنشکۆ لەسەری دادەنیشت کاتێ کەقسەی دەکرد.

سایکۆلۆژیەتی دەزگاکانی راگەیاندنی جەماوەری وا سەیری تەلەفزیۆن دەکات (بەتایبەتی) وەکو ئامێرێکی هەرەکارا – نەك تەنها بۆ ملکەچکردنی لایەنی هۆشیاری لەمرۆڤدا – بەڵکو دەتوانێت کاربکاتە سەر لایەنی غەریزیو سۆزدارەیەکانیشی بەشێوەیەك ئەو هەستەی تێدا دروست دەکات ئەو ڕاوبۆچونانەی بەسەریدا سەپێنراون وای لێ دێت کەوا دەزانێت ئەوانە ڕای تایبەتی خۆیەتی [26] هەموو کۆمەڵگە گشتگیریەکانیش زۆربەی کاتەکانی بێ ئیشیان بە سەیرکردن و بەکارهێنانی تەلەفزیۆنەوە بەسەر دەبەن، بەو شێوەیە تەلەفزیۆن وای لێ هاتووە هەڕەشە لەئازادی مرۆڤایەتی دەکات و زیاتر مەترسیدارترە لە پۆلیس و زیندانەکان و سەربازگەکانی بەندکراوە سیاسیەکان. پێم وایە ئەو نەوەیەی داهاتوو کەبەرێوەن – ئەگەر توانای تێفکرین و بیرکردنەوەیان نەمێنێت، ئەوا بەتەواوی تووشی رمان و لەناوچوون دەبنەوە – لەگەڵ ئەم نەوەیەی ئێستادا ڕووبەڕوودەبێتەوە کە بەشێوەیەك ئاڕاستەکراوە هیچ ئامرازێکی خۆپاراستنی پێ نیە لەبەرامبەر ئەو هێزە زیانبەخش و بێ سەروبەرانەدا. ئەگەر دەستورەکان لەڕابردوودا ڕادەیەکیان بۆ زوڵم و زۆری فەرمانڕەواکان دانابێت، ئەوا لەئێستادا پێویستمان بەدەستورێکی نوێیە بۆ ڕێگرتن لەدەرەنجامی ئەو مەترسیە نوێیەی کە هەڕەشەی بەرپاکردنی بەندایەتیکردنێکی رۆحی دەکات لەخراپترین شێوەدا: رۆشنبیری جەماوەری بەوە جیادەکرێتەوە کەپەیوەستە بە حاڵەتێکی عەقڵیەوە کە ( یوهان هویزنجا( ئاماژەی پێکردوە بەناوی هەرزەییەوە Puerility ئەمەیش لەکاتێکدا بوو کە ( هۆیزنجا) تێبینیکرد کەمرۆڤی هاوچەرخ بەشێوەیەکی منداڵانە هەڵسوکەوت دەکات بەمانای سلبی ووشەکە، واتە بەشێوەیەك کەدەگونجێت لەگەڵ ئاستی عەقڵی هەرزەیەکدا، تەنزو گاڵتەبازی بێ تام و سواو، نەبوونی رۆحیەتێکی رەسەن و دڵخۆشکەر، پێویستی بوون بەڕووداوی کاریگەر و بەمەشاعیری بەهێزو حەزکردن بەدروشمی سەرنجراکێش و کۆبوونەوەی جەماوەری،

---

[26] کتێبێکی باشە لەوبارەیەوە سودی لێ وەربگیرێت : Diura Sasinjic: Fishermen For Huma nsouls Beograd: Zadruga , 1977)

**هەروەها گوزارشکردن لەخۆشەویستی و ڕق لێ بوونەوە بەشێوازێك کە زیادەڕەوی تیادا بکرێت زیادەڕەوی لەلۆمەکردن و پیاهەڵداندا، هەروەها شتانی تری لەو شێوەیە کەلەهەست و سۆزێکی نائاسایی جەماوەریەوە سەرچاوە دەگرن.**

**لەکۆتای ئەم باسەدا ڕووبەڕوی دوو هەڵوێستی جیاواز دەبینەوە سەبارەت بەئامێرو تەکنەلۆژیا. ڕۆشنبیری (ترسی لەئامێر) هەیە و، رقێکی غەریزی لەتەکنەلۆژیایە (ئامێر بریتیە لەمەڵەی یەکەم لەرۆشنبیریدا).[27] ئەم هەڵوێستەش لەوەوە هاتوە کە ئامێر لەسەرەتادا ئامرازێك بووە بۆ یاریکردن بەشتەکان بەڵام لەپاشاندا گۆڕا بە ئامرازێك بۆ یاریکردن بەمرۆڤ. کەسانی نموونەی ( تاگور، تۆلستۆی، هایدگر، نایزفستنی، فۆکنر، چەندەهای تر، لەرێگەی فەلسەفەکانیانەوە هەمیشە ویستویانە مرۆڤایەتی لەمە ئاگاداربکەنەوە.**

**لەلایەکی تریشەوە،( هنری لیفیفر) کەبیرمەندێکی مارکسییە بۆچونێکی تەواو پێچەوانەی ئەم ڕایەی هەیە، دەڵێت: ( بەرزترین ئاستی ئازادی دەتوانرێت پیّی بگەیت تەنها لەکۆمەڵگایەکدا کەتەکنەلۆژیا تیایدا گەیشتبێتە ئەوپەڕی پەرەسەندن لەنێو کۆمەڵگەیەکی کۆمۆنیستیدا [28] لەکۆمەڵگایەکی( تۆباوی) کەلەسەر تۆبیا دەژی**

---

[27] بڕوانە : نیکۆلای بردیاییف Nikolai Berdyaev: The Modern Crisis of Culture. : Serbocroation trans.(Beograd Hriscanska 1932

هەروەها بڕوانە :( کنپ کلارك)لەکتێبی( شارستانیەت) دا کەدەڵێت : ئەوانەی کەتوانیان بگەنە قوڵایی پیشەسازی وەڵێی تێبگەن لەوەختێکی زوودا.بریتی بوون لە شاعیرەکان، بلیك Blakeدەڵێت : پێم وایە کە کارگەکان لە کاری شەیتانن، لەپاش ئەوەیەتیپەڕ بوونی بیست ساڵ ئینجا مرۆڤێکی ئاسایی هەست بەو دزێوی و شێواندنە دەکات کەشارستانیەت دروستی کردوە ......

Keneth Clark: Civlization(London: BBC,1962) P.321.

[28] (هنری لیفیفر) Herri Le febvre : Every Dey Life in the modren World Trans,Sacha: Rebinovitch( New York: Harper and Row ,1970)

وەکو نمونەیەکی بالاّ بەشێوەیەکی ڕاستەوخۆ یان ناڕاستەوخۆ، دەبینین لەوێدا کەئامێرەکان و تەکنەلۆژیا دەبنە هاوەڵی سروشتی خەڵك، دەبنە فاکتەر بۆ یاریکردن بەمرۆڤ و بەشتەکان، ئەو سستەمە یارمەتی دۆزینەوەی لێکچوەکان دەدات لەڕێگەی فێرکردن و دەزگاکانی ڕاگەیاندنەوە. ئامێرەکان هاوکاری و کاری بەکۆمەڵیان دەوێت بۆ ژمارەیەکی زۆر لەخەڵك کە ڕێکخراون لەناو ئەو دەزگایانەدا کەلەشێوەی (هەرەوەزیەکان)دان و ئیدارەیەکی مەرکەزی بەڕێوەیان دەبات. لەکۆتاییدا، دەتوانین بڵێن لەم جۆرە سستمانەدا لەڕێگەی کۆمەڵگاوە ( مەبەستم لەدەسەلأتدرانە) دەتوانرێت کۆنترۆڵی تەواوەتی تاك بکرێت لەڕێگەی چاودێریکردنیەوە، ڕاستەوخۆ یان ناڕاستەوخۆ لەسەر ئەو کارانەی کەدەیکات وە ئەو شتانەی کە دەیانڵێت ، یان بیریان لێ دەکاتەوە.

# گوندو شار

شاعیران باسی دۆزەخی شارە گەورەکان دەکەن، لەکاتێکدا مارکسیەکان باس لە (ژیانی گێلانەی گوند دەکەن)[29] هەستکردن بەناخۆشی ژیانی شار دەرەنجامی هەستێکی مرۆڤی ساف و بیٚ گەردە، هەموو مرۆڤێکیش شاعیرە بەمانایەك لەماناكان، مرۆڤ لە ئەمرۆدا وایە هەروەکو چۆن لەرابردویشدا هەر وابووە.. ئەم ڕەخنەگرتن و ناڕەزاییانەش دژبە شارو ژیانی شارستانیانە لەهەستێکی ئاینی و ڕۆشنبیری و هونەریەوە سەرچاوە دەگرێت، شاری ڕۆما لەسەردەمی مەسیحیە پێشینیەکاندا بەمەملەکەتی شەیتان ناودەبراو وایش دادەنرا بەشوێنیدا ڕۆژی هەستانەوەو کۆتایی جیهان بێت، ڕۆژی قیامەت. ڕێژەی دینداریش بەپیٚی قەبارەی شار ڕوو لەکەمبوون دەکات.. ئەمەش دەگەڕێتەوە بۆ فاکتەرە شارستانیەکان کەیارمەتی دابڕانی مرۆڤ دەدەن، هەر کاتێك شار بەرەو فراوانی چوو ئەوەندەیش سروشت و ئاسمانی شار بچوکتر دەبنەوە، دووکەڵ و بینای چیمەنتۆو شیش ڕێژکراوو تەکنەلۆژیاو تاوان بەرەو زیادبوون دەچن، بەنسبەت قەبارەی شارەوە ئەوا پەیوەندیەکی پێچەوانەی لەگەڵ دینداریدا هەیەو پەیوەندیەکی ڕاستەوخۆیشی بەتاوانەوە هەیە[30]. .ئەو دوو دیاردەیە هۆکاری هاوبەشیان هەیە لەو ڕووەوە کەهەردووکیان پەیوەستن بەوەوە کەپیٚی دەوترێت ( جوانناسی بەهۆی ئەزموونەوە) مرۆڤی گوندنشین بوارێکی زیاتری هەیە، بۆ ئەوەی سەیری ئاسمانی بە ئەستێرە نەخشێنراو بکات، سەیری کێڵگە سەوزەکان و

---

[29] بڕوانە :( کارل مارکس) : Karl Marx and Friedrich Enqels : The communxist Man ifesto
Principles of Communism

[30] بەپیٚی هەندیٚ سەر ژمێری تەنها ١٢ بۆ١٣٪ ی دانیشتوانی پاریس دەچن بۆ نوێژی کاسۆ لیکی بەلاّم لە ( لیۆن) ئەو ڕێژیە بەرزدەبێتەوە بۆ ٢٠,٩٪، وە( لەسان نیتین) ئەو ڕێژەیە دەگاتە ٢٨,٥٪ بەلاّم ئەو ڕاگەیاندن و سەرژمێریانەی لەبارەی جەریمەو تاوانەوەیە پلە بەندیەکی پێچەوانەی ئەمەیان هەیە.

گوڵ و رووباروو درەخت و گیاندارەکان بکات، ئەو لەنێو کەش و هەوایەکی سروشتی و رەگەزە جۆراوجۆرەکاندا دەژی( فۆلکلۆر)یش هونەرو تەقسەکانی ژنهێنان و گۆرانی میللی و سەماکردن و، جۆرێك لەرۆشنبیری و ئیستاتیکا پێشکەش دەکات، کەناسراونین بەلای مرۆڤی شارستانیەوە، بەڵام مرۆڤی شاری، لەنێو چوارچێوەی شارێکدا دەژی کە تەنراوە بەزانیارییە سلبییەکان و ئامرازەکانی راگەیاندنی جەماوەری، چواردەوری بەشتە دزێوەکانی بەرهەمە پیشەسازیەکان گیراوە، ئایا ئەو هەستکردنە بەجوانی و ئیقاعی سروشتە کە گەلە سەرەتاییەکان هەیان بووە. لەلای مرۆڤی مۆدێرنی ئەم سەردەمە بەرەو ژاکان و لاوازی نەچووە ؟ لەگەورەترین ئەو هەڵانەش کە لەم چاخەماندا بڵاوە ئەو بیرۆکەیەیە کەدەڵێت مرۆڤی شارنشین بوارێکی زیاتری هەیە بۆ مومارەسەکردنی شارەزایی هونەری و جوانکاری وەکو ئاهەنگە مۆسیقیەکان و مۆزەخانەو پێشانگاکان کەرێژەیەکی کەم لەدانیشتوانی شار هاتووچۆی دەکەن کە دەکرێت دابنرێت بەهەوڵی پرکردنەوەی ئەو بۆشاییەی کەلەئەنجامی( دوورکەوتنەوە لەژیانی جوان و رەونەقداری گوندەوە دروست دەبێت) رەنگە بەشێوەیەکی( لاشعوری) یش بێت، بەڵام لای مرۆڤی گوندنشین ئەمە بەهێزترە کە چێژ لەسەیرکردنی دیمەنی جوان و هەڵاتنی رۆژ وەردەگرێت، هەروەها گەشانەوەی ژیان لەپاش کۆتایی هاتنی وەرزی زستان. لەکاتێکدا زۆربەی دانیشتوانی شار بەهێزترین هەستی وروژاندنیان لەیاری تۆپیپێو بۆکسێندا مومارەسە دەکەن ...پوختەکەی دەمانەوێت بڵێین: *گوندنشین زیندو رەسەنە، بەڵام کارگەرێکی پیشەسازی شاری، کەسێکی ئالی و مردوە.*

لەراستیدا ئەمە لەچوارچێوەی کەشە رۆحیە جیاوازو ئەزموونە جۆراوجۆرەکاندا نەك لەچوارچێوەی ئاستی گوزەران و ئاستی فێرکردنە جۆراوجۆرەکاندا، لێرەدا دەتوانین بپرسین سەبارەت بەتەفسیرکردنی حاڵەتی دینداریانەی کەسێکی گوندنشین و

**کەمی دینداری لەلای کارگەرێکی پیشەسازی شاردا [21]. *ئاین ئینتمای بۆ ژیان و هونەرو رۆشنبیری هەیە. بەڵام بێباوەڕی( ئیلحاد) ئینتمای بۆ رێکخستن و زانست و شارستانیەت هەیە.***

[21] ناکرێت بەتەنها یەکێك لەو دوو دیاردەیە تەفسیریان بۆ بکرێ بەبێ بۆ ڕەخساندنی ئاسایشی ئابووری، ژیانی کرێکارێکی پیشەسازی ئەمین تر نییە لەژیانی مرۆڤێکی گوندنشین لەو لایەنەوە، و بازاڕ دامەزراو نیەو هەلگەڕاوەتەوە وەکو ئاسمان،( مارکس) یش لە ڕوونکردنەوەیەکدا ئاماژە بۆ ئەمە دەکات و دەڵێت : بەنسبەت کرێکارێکی پیشەسازی شاریەوە بازاڕ هێزێکی جادووییانەی هەیەو لەتوانای ئەودا نییە، بەرەنگاری بێتەوەو بەسەریدا زاڵبێت.

# چینی کرێکار

لەبەر ئەوەی چینی کرێکار بەرهەمی شارە، ئەوا زیاتر ناڕەحەتی چەشتوە بەهۆی ئەو کاریگەریە سلبیانەوە کە بە( شارستانیەتی پوخت) ناودەبرێت واتە (ئەو شارستانیەتەی کە خاڵییە لەرۆشنبیری) کارگە کەسێتی ڕووەو نیگەرانی و تاکڕەوی و دەبات. یەکێك لەزانایانی کۆمەڵناسی دەڵێت:( کرێکاران کەملکەچی سیستەمێکی سەپێنەربوون ئەو نەریتانەی کەلەئەنجامی پرۆسەی بەرهەمهێنانەوە بەدەستیان هێناوە. هەمان ئەو نەریتانە دەگوێزنەوە بۆ ناو رێکخستنە کرێکاریەکانیان ئەوان واز لەتواناکانیان دەهێنن بۆ ئەو بیرۆکراتیەی کەبەشێوەیەکی کتوپڕی پێ گەیشت، و ڕۆڵێکی پارێزگارانە دەبینێت چ لەدەوڵەتە سەرمایەدارەکاندا بێت یان لە دەوڵەتە سۆشیالیستیەکاندا [٣٢].( هربرت مارکوز) ئەوەی دەرخست کەوا کرێکاران لەدەوڵەتە سەرمایەدارە پێشکەوتوەکاندا کە کاریگەری تەکنەلۆژیاو کارگەکان زۆر زیاترن، کرێکاران لەو دەوڵەتانەدا وەکو هێزێکی شۆڕشگێڕی نەماونەتەوەو چینی کرێکار دادەنرێت بەنمونەی کۆمەڵە کەسێکی ئیستغلالکراوو یارییێکراو. کەدەتوانرێت بەپیاهەڵدان و قسەی بریقەدار بخەڵەتێنرێن، بەلام زۆر بەکەمی راوێژیان پێ دەکرێت و گوێ لەڕاکانیان دەگیرێت. گەورەترین چینی کرێکار بریتیە لەو دوو چینەی کەلەوڵاتە یەکگرتوەکانی ئەمەریکاو یەکێتی سۆڤیەتدا هەیە، ئەو دوو چینە گەورەیە هیچ کاریگەریەکی حەقیقیان نی‌یە لەبونیادی سیاسی وڵاتەکەیان هەروەها لەو بڕیارانەی سەبارەت بەوان وەردەگیرێت.، [٣٣]دەتوانین یەکێك لەهۆکارە لاوەکیەکانی ئەو بارودۆخەش جگە هۆکارەکانی دابڕان لە ئاین و هونەرەکان بیگێڕینەوە بۆ هەژاری

---

[٣٢] لەپاڵ ئەمیشدا چەند بەڵگەیەکی بەهێز هەیە ئاماژە بەوەدەکات کەوا کاریگەرییەکی گەورە هەیە لەلایەن مافیاکانەوەو هەندێك کۆمەڵی نهێنی، لە بەڕێوەبردنی هەندێ لەشورا کرێکاریەکان لە ئەمەریکادا.

[٣٣] بڕوانە( هربرت مارکیوز) Herbert marcuse : Acritique of pare Tolerence( Boston: Beaconpress,1969)

تیۆری، لەبزوتنەوەی چینی کرێکاردا. ئەمەش حەقیقەتێکە کە نووسەرە کۆمۆنیستەکانی نمونەی ( جۆرز) و( گارودی) و( باسۆ) و( ماللی) دانیان پێداناوە. لەچاوپێکەوتنێکدا لەگەڵ پەیامنێری ڕۆژنامەیەکی ئیتاڵیدا کەناوی( ئیلکۆنتمبرانۆ)یە، نووسەری مارکسی بەناوبانگ ( لۆکاکس) دەڵێت:( لەپاش مارکس جگە لەلینین هیچ کەسێك بەشداری نەکردوە، بەشداریەکی تیۆریانە لەگیروگرفتەکانی پەرەسەندنی سەرمایەداریدا) کاتێکیش چاو بەو (ماوە ستالینیە)دا دەگێڕێت لەیەکێتی سۆڤیەت (لۆکاکس) رایدەگەیەنێت کە:( هەموو بیرۆکەیەکی ئازاد نەماوەو کوژاوەتەوە)، و هەندێ ڕاوبۆچونی تاکەکەسی وەکو یاسا تیۆریەکان مامەڵەیان لەگەڵدا دەکرا. بەو شێوەیە لەکەشێکی وادا نەوەیەك پێگەیشت تێکڕا هەموو هەستێکی ڕووانین و هەڵسەنگاندنی سەبارەت بەوەرگرتنی هەڵوێست لەبارودۆخەکە لەدەستدا بوو. لەراستیدا، لەپاش مارکسەوە -کەئەویش لەنێو چینی کرێکاریدا پێ نەگەیشتوە بەڵکو سەر بەچینی ناوەندە – هیچ بیرۆکەیەکی ڕەسەن و خاوەن بەها نادۆزینەوە کەلەلایەن چینی کرێکاریەوە دەرچووبێت، جگە لەبیرۆکەی ئەو ئیدارە زاتیەی کە لەیوگسلافیادا هەیە، - کەسەرەڕای هەندێ ئاستەنگیش – نمایشی رەوتێکی جیاواز دەکات لەچەند ڕوویەکەوە. هەرچۆنێك بێت، ئەو بیرۆکەیە بەمانای رزگاربوونە لەوەرگرتنی شێوازی نمونەیی و ئایدۆلۆژی داخراو کەمارکسیەت دایناوە بۆ داپۆشینی گەشەکردنی هەر بیرۆکەیەك لەلایەن چینی کرێکارەوە.

ئەو مانگرتنانەش کەڕوودەدەن و هەندێ جار دەبنە هۆی لەراندنەوەی ئابووری سەرمایەداری مۆرکێکی ئابووریان هەڵنەگرتوە، هەمیشە کۆتایی بەرێکەوتنێك دێت سەبارەت بە زیادکردنی کرێی کرێکاران. بەو شێوەیەش کرداری گەشەکردنی ئابووری بەشوێنیدا دژواری رەوشی چینی کرێکار نەهات هەروەکو مارکس بۆی چووبوو، بەڵکو رێگایەکی تر دۆزراوەتەوە بۆ بەدیهێنانی ئاستی چینایەتی لەبری جەنگی چینایەتی لەنێوان کۆمەڵە جیاوازەکاندا لە بەرژەوەندیدا لەناو

کۆمەڵگەدا.[٣٤] ئەو شێوە تەقلیدیەی چینی کرێکاریش، واتە چینی( پرۆلیتاریا) کە لەکارگەکاندا دەچەوسێنرێنەوە، بەپێی وتەی مارکس تا ئەو کاتەبوونی دەبێت (هەتا خۆی هەڵدەوەشێنێتەوە) شێوەیەکی کاتی هەیە، ئامێرەکان جێگای ئیشە دەستیەکان دەگرنەوەو سنوری چالاکیەکانی مرۆڤ تەسك و بچوکتر دەبێتەوە بۆ زاڵ بوون بەسەر سستەم و بەڕێوەبردنی ئەو ئامێرە گەورانەدا.[٣٥]

پەرەسەندنی زانست و تەکنەلۆژیاو (پەرەسەندنی ئامرازەکانی بەرهەمهێنان) نەبونەتە هۆی بەهێزبوونی چینی کرێکار بەڵکو بەرەو لاوازی و نەمانی بردوە. ئەم پەرەسەندنە هێزی کارکردنی پێ نەبەخشیون. بەڵکو بەپێچەوانەوە خاڵی سەرەکی و هەروەها گرنگی کۆمەڵایەتی گوێزاوەتەوە بۆ زیرەکی تەکنیکی و گرنگی دانی تەواو بەو بوارە. بەو شێوەیش. دوا میثالیەتی ڕۆمانسیەتی شۆڕشگێریش رووی لەفەوتان کرد. و لەسەر شانۆکە ( تەکنۆکراتیەت) بەدەرکەوت، یان ئەو هێزە عەقلانیە بێ دڵەی کەتەنها پشت بە پێوەرە زانستیە رووتەکان دەبەستێت، ئەمەش بەرهەمی نمونەیی ئەم شارستانیەتە ڕەخساوەی ئەمڕۆیە.

---

[٣٤] گرنگی ئابووری ئەو مانگرتنە کرێکاریانەش بەو شێوە قەبەیە نیيە وەکو یەکەم جاروا دەردەکەوت – بەپێی ئەو سەرژمێریانەی کەلە پەیمانگای سویدی ساڵی ١٩٧٨دەرچون لەبارەی وڵاتە سەرمایەدارەکانەوە : لەهەر یەکە لەوڵاتانی ئەمەریکاو بەریتانیا و ئیتاڵیا و کەنەدا لەماوەی پێنج ساڵدا لە( ١٩٧٣–١٩٧٨) مانگرتنەکان تەنها ٠/٠١ی کاتی کارکردنیان گرتوە. لەوڵاتی سوید مانگرتن تەنها ٦ خولەکی لەکاتی ئیشکردنی ڕۆژانەی کرێکارێك بردوە، لەکاتێکدا ئەو ڕێژەیەی تێیدا لە سویدا لەئاستێکدایە کە هەر باس ناکرێت.

[٣٥] بەپێ ی هەندێك لێکۆڵینەوە دەرکەوتوە، کرێکارێك ڕۆژانە کەلەسەر ئامێرێك ئیش دەکات کە لەهەموو لایەنێکەوە پێشکەوتوە، تەنها یەك کاتژمێر بەشێوەیەکی چالاك لەسەر ئەو ئامێر کاردەکات لەماوەی هەفتەیەکدا، لەکاتێکدا ٣٨ کات ژمێرەکەی تر تەنها بە تێبینیکردنی ئامێرەکەوە بەسەری دەبات.. پەرەسەندنیش لەم لایەنەوە زۆر خێرایە بەتایبەتی پاش ئەو پێشکەوتنە زۆرەی تەکنەلۆژیا لەبواری کۆمپیوتەردا ناویەتی لەزۆربەی لقەکانی پیشەسازیدا. وادیارە (مارکس)یش کەجەدەلییەکی مەزن بووە نەیتوانیووە پەی بەم پەرەسەندنە بەرێت، نەیتوانیوە ئەنجامێکی شیاو لەو بارەیەوە وەربگرێت. بەو شێوەیەش بۆ چینی کرێکاری ڕوانیوە ڕوانینێکی وەستاوو نەگۆڕ نەك ڕوانینێکی جەدەلیانە.

# ئاین و شۆڕش

شۆڕش بەتەنها رووداوێك نەبووە لەبوارەكانی شارستانیەت یان ئابووری یان كۆمەڵایەتی یان سیاسیدا، هەموو شۆڕشێكی راستەقینەش بریتیە لەئەندامی خێزانێكی گەورە كەبەم سیفەتانەدا دەناسرێتەوە، باوەڕ، هەستكردنێكی گەورە بەهێزو بەهەندوەرگرتن، دوژمنكاری، خواست و ئارەزوویەكی بەهێزو شۆڕشگێڕانە، قوربانیدان و خۆفیداكردن دەتوانین بڵێین ئەم هەست و سۆزانە رەهەندێكی زیاتریان هەیە لەوەی تەنها بەدیدێكی بەرژەوەندی بونییەوە خوێندنەوەیان بۆ بكرێت. هەر كەسێك رۆڵ لەشۆڕشێكدا ببینێت یاخود لەنزیكەوە چاودێری گۆڕانكاریەكانی كردبێت، دەتوانێت جەخت لەسەر بوونی ئەم بەهاو دەرهاویشتە ئەخلاقیانە بكاتەوە، لەو كاتەدا شۆڕش وەكو داستانێكی شیعری دەبینێتەوە نەك تەنها ڕوخاندنێكی ئالی و گۆڕانكاریەكی سادەبێت لەمیكانیزمی دەستەڵاتدا، ئەمەیش ئەوەمان بۆ ڕووندەكاتەوە كەبۆچی كرێكاران لەدەوڵەتە سەرمایەدارەكاندا ناتوانن شۆڕش بەرپابكەن لەلایەكی تریشەوە حەماسی شاعیران و هونەرمەندان و كەسانی دیندارمان بۆ ڕووندەكاتەوە بەرامبەر بەشۆڕش، كەلەسەرەتای راگەیاندا جۆرێك لەبێباوەڕی پێوە دیارە بەڵام ئەگەر لەناوەوە بڕوانینە شۆڕش، نەك وەكو كردەوەیەك بەڵكو وەك بەشێك لە ژیان، ئەوا وەكو درامایەك دەردەكەوێت كەهەمان ئەو كاریگەریەی هەیە كەئاین لەسەر خەڵك بەجێی دەهێڵێت.

بەڵام ئەگەر لەدەرەوە بۆمان ڕوانی بەواتای لەگۆشەنیگایەكی سیاسی و واقعیانەوە. دەتوانرێت بەسیفەتێكی جیاوازو ئامانجێكی جیاواز وەربگیرێت.[٢٦] ئەو كۆمەڵگایەی

---

[٢٦] لەقەصیدەیەكی بەناوبانگدا( دوانزەكەس لێیان)ی شاعیری رووسی ( ئەلسكەندەر بلوك) Alexander Bloke( ئەندامانی پاسەوانی سور مەسیح پێشڕەوییان دەكات) ئەمە ڕوئیای قەصیدەكە بوو بۆ شۆڕشی شیوعیەت كەڕاستەوخۆ لەپاش شۆڕشەكە نوسرابوو. هەر لەوكاتەدا ڕەخنە گرە ڕەسمیەكان هێرشیان كردە سەری بەبیانوی ئەوەی قەصیدەیەكی ئایینیە. وەئێمە نازانین ئایا وەزیری رۆشنبیری لەوكاتەدا( لوناتشاوسكی) Lunatcharski سەركەتوە لەپارێزگاری

کەهەستی هاریکاری وقوربانیدان و چارەنووسی هاوبەش زاڵ دەبێت بەسەریدا دادەنرێت بەوەی کەلە (حاڵەتێکی ئاینی)دایە ئەوە کەشی( سۆزی گەرمی عاتیفەی بەرزە) کەلەحاڵەتی کتوپڕو مەراسیمە ئاینیەکاندا دەردەکەوێت لەکاتێکدا مرۆڤەکان هەستی برایەتی و راستگۆییان تێدا کۆدەبێتەوە. ئەو کۆمەڵگایەی کەکزو لاوازە لەلایەنی دینداریەوە بەهەمان شێوەشە لە ڕووی شۆڕش بەرپاکردنەوە.ئەو دەوڵەتانەی کەمومارەسەی حەماسەتێکی شۆڕشگێڕی دەکەن بەهەمان شێوە مومارەسەی جۆرێك لەهەستی ئاینی زیندووش دەکەن. چونکە هەستی برایەتی هاوکاری و دادپەروەری ئەمانە مەشاعیرێکی ئاینین لەجەوهەردا، بەڵام ئاڕاستەکراون لەنێو شۆڕشێکدا لەپێناوی جێبەجێکردنی دادپەروەری و بەدیهێنانی بەهەشتێکدا لەسەر زەوی هەریەك لەئاین و شۆڕش لەئاکامی نەهامەتی و ئازارو ناڕەحەتیەکاندا سەرهەڵئەدەن و پەیدادەبن، لەزەمەنی سەقامگیربوونی ئاسایش و خۆشگوزەرانیشدا وورده وورده بەرەو مردن دەڕۆن لەکۆمەڵگەدا. ژیانی ئاین و شۆڕشیش بەردەوام دەبێت، تا ئەو کاتەی کەجیهادو تێکۆشان بەردەوام دەبێت. تائەو کاتەی بەئاکام دەگەن، پاشان بەرەو کاڵبونەوەو مردن دەچن. لەقۆناغی جێبەجێکردندا لەواقیعی کرداریدا ئۆرگان و دەزگا جیاجیاکان بەرهەم دەهێنن، هەر ئەم دەزگایانەش خۆیان لەکۆتاییدا بەشداری دەکەن لەدابەشکردن و جڵەوکردنی دەسەڵاتیاندا. دامودەزگا رەسمیەکانیش نەشۆڕشین و نەئاینیشن. ئەگەر لەناو ئایندا ناکۆکیەك یان ناڕەزاییەك هەبوو سەبارەت بەشۆڕش، ئەوا ئەو ناڕەزاییانە لەلایەن ئەو کەسانەوە بەرز دەبێتەوە کەتەنها سەر بەئاینی رەسمین، واتە سەر بە کەنیسەو سیستمە ئیداری و هەرەمیەکەین، یان سەر بەئاینێکی دامەزراوەیی ساختەن و بە پێچەوانەشەوە، ئەو شۆڕشە ساختەیە واتە ئەو شۆڕشەی کە گۆڕاوە بۆ دەزگاو بۆ بیرۆکراتیەت. هەمیشە هاوپەیمانی خۆی لەو ئاینەدا دەدۆزێتەوە کەبەهەمان شێوە گۆڕاوە بۆ دامەزراوەیی و بیرۆکراتیەت. ئەو کاتەش دەبێ ئەو شۆڕشە دەست بکات بەدرۆ خۆهەڵخەڵەتاندن بۆ ئەوەی بتوانێت لەگەڵ ئەو ئاینە ساختەیەدا دەست لەناو دەست بمێنێتەوە.

---

کردنی ئەو شاعیرەدا بەوەی کەقەصیدەکە( تێروانینێکە لەئەنجامی حاڵەتە درامیەکانی شۆڕشەوە لای شاعیر دروست بووە (London: Chattoand Windus.1920).

# پێشکەوتن دژ بەمرۆڤە*

بەپێی وتەی زانای ئەمەریکایی ( جولوس رۆبرت ئۆبنهیمر) داهێنەری بۆمبی هایدرۆجینی دەڵێت : ڕەگەزی بەشەری لەماوەی چل ساڵی رابردوودا پێشکەوتنێکی وەهای بەخۆوە بینیوە لەهەردوو بواری مادی و تەکنەلۆژیدا، کە زیاترە لەو پێشکەوتنانەی بەدرێژای چل چاخی لەمەوپێش مرۆڤایەتی بەدەستیهێناوە. بواری ڕەخساو بۆ مرۆڤ زیادی کرد، لە ١٠- ٤٠ ، گەرمایی لە ١٠-١٠، پەستان لە ١٠- ١٦ زیادیکرد، لەماوەی سی ساڵی داهاتوودا هەموو ئەو ئامێرە میکانیکیە کۆنانە دەگۆڕێن بەجۆرێکی پێشکەوتووتر کە بەهۆی ووزەی ئەتۆمیەوە کاردەکەن ....، ئەمڕۆ ئەو( کێبڵ)ە کارەباییانەی کەمەبەستی کارپێکردنی ئۆتۆمبێلی کارەبای بەژێر جادەکاندا رادەکێشرێت، خەریکە دەچێتە بواری کارپێکردن و جێبەجێکردنەوە[27]، بەڵام (جان رۆستاند) باس لەپەرەسەندنی توانای جادوییانەی بایۆلۆژیا دەکات و دەڵێت: بەهۆی بەکارهێنانی مادەی بۆماوەیی کەسانی فرە زیرەکەوە، رەگەزی بەشەری دەتوانێت خۆی بونیاد بنێتەوە. ئەگەر زانایانیش سەرکەوتووبن لەبەرهەمهێنانی DNAدا بەرێگەی پیشەسازی (کەبریتیە لەبنچینەی کیمیاویی بۆماوەیی لەکرۆمۆسۆمەکاندا)، ئەوا پێشکەوتن و ئەگەری نوێ و بێ سنوور لەژیانماندا دەردەکەوێت، بەشێوەیەك کەهەموو مرۆڤێك دەتوانێت ببێتە خاوەنی منداڵێك بەپێی خواستی خۆی، عەقڵی مرۆڤ کەپێکهاتووە لەدە بەلایین خانە، دەتوانرێت چەند بەلاینێکی تری بۆ زیادبکرێت کەلەشوێنێکی ترەوە وەرگیراوە. یان بەکردارێکی تایبەتی بەرهەمهێنراوە، هەروەها وای لێ دێت چاندنی پارچەو ئەندامی لەشی مرۆڤ کەلە کەسێکی ترەوە بۆی وەرگیرابێت دەبێتە شتێکی ئاسان و کارێکی ڕۆژانە،

* کاتێك نووسەر باس لە پێشکەوتن دەکات تەنها مەبەستی لەپێشکەوتنی ماددی تەکنیکی یە.( و.ع)

[27] بڕوانە ئۆبنهیمر. juli us Robert oppenheimerion Science and Culture, (october. 1962) .Ercounter

هەروەها دۆزینەوەی هۆکارەکانی دابەزین و کەمبوونەوەی چالاکیەکانی مۆخ وادەکات ئەو خەونە کۆنەی مرۆڤ مومکین بێت، خەونی درێژبوونەوەی تەمەن، ئەمەش لەرێگەی کەمکردنەوەی ئەو کاتژمێرانەوە کەمرۆڤ پێویستیەتی بۆ خەوتن.[38] توانا ئابووریەکانی جیهانی پێشکەوتوو وای لێ دێت رێگە بەکەمکردنەوەی کاتژمێرەکانی کارکردن دەدات لەهەفتەیەکدا بۆ (٣٠) کاتژمێر و دابەزینی کاری ساڵانە لە (١٢) مانگەوە بۆ( ٩) مانگ. سەرژمێرەکان دەریانخستوە کەلە ساڵی ١٩٦٥دا، ٦٩ ملیۆن ئۆتۆمبیل وە ٦٠ ملیۆن ئامێری تەلەفزیۆن و ٧,٧ ملیۆن قایخ *لەولآتە یەککگرتوەکاندا هەبووە. لەهەمان ساڵدا ئەمەریکاییەکان تەنها ٣٠ بلیۆن دۆلاریان لەکاتی مۆڵەت و پشودا خەرجکردوە. یەك لەسەر پێنجی شمەکە تایبەتیەکانیان لەوولآتە یەککگرتوەکاندا بابەتی رەفاهی و خۆشگوزەرانی بوون یەکێك لەو سەرژمێریانە دەریخستوە دەوڵەتە دەوڵەمەندەکان – کەیەك لەسەر سیٚ – جیهان پێکدەهێنن لەماوەی ساڵێکدا ١٥ بلیۆن دۆلار لەبابەتی جوانکردن و رازاندنەوەدا خەرجدەکەن. لەو وولآتانەدا ئاستی گوزەران وا دادەنرێت کەپێنجار بەرزبۆتەوە لەچاوسالآنی ١٨٠٠ی زایندا، لەماوەی ٦٠ ساڵی داهاتوودا ئاستی گوزەران پێنجار ئێستا بەرزدەبێتەوەو بەو شێوەیە. لەپاش ئەم تێروانینە گەشبینانە، مافی خۆمانە بپرسین ئایا ئەمە ئەوە دەگەیەنێت کە ژیان پێنج ئەوەندەی ئێستا دەوڵەمەندتر دەبێت و شادی و ئارامی و ئاسودەیی زیاتر باڵ بەسەر بوارەکانی ژیاندا دەکێشێت و مرۆڤانەتر دەردەکەوێت ؟ بەداخەوە رەنگە بۆ ئەم پرسیارە وەلآمێکی دڵخۆشکەرمان پیٚ نەبێت، بۆ نمونە، لەوولآتە یەککگرتوەکانی ئەمەریکادا، کەدەوڵەمەندترین وولآتانی جیهانە لەماوەی ساڵی ١٩٦٥ پێنج ملیۆن تاوان روویداوە، رێژەی زیادکردنی تاوانە ترسناکەکان لەو ولآتەدا (١٤) جار خێراترە لەرێژەی زیادکردنی ژمارەی دانیشتوان

---

[38] بروانە :( روستاند) Jean Rostand: Humanly Poss ible : A Biolo Jists Notes on The Future of man Kind. trans. Lowell Bair .( New York: Saturday Review Press, .1973)

* قایخ : بەلەمی گەورە

(٠١٨٧/٠بەرامبەر ٠/٠١٣) لەهەمان دەوڵەتدا هەر لەماوەی ١٢ چرکەدا تاوانێك ئەنجام دەدرێت هەر لەکاتژمێرێکدا کەسێك دەکوژرێت، لەهەر ٢٥ خولەکێکدا کەسێك هێرش دەکرێتە سەر ناموسی و لاقە دەکرێت، تاوانی دزیکردن هەموو ٥ خولەکێك دزییەك دەکرێت، دزینی ئۆتۆمبیل لەهەموو خولەکێکدا دزیەك دەکرێت[٣٩] لەڕاستیدا زیادبوونی ڕێژەی تاوانکردن لەو وولاتەدا ڕۆژ بە ڕۆژ ڕوو لەزیادی و مەترسی دەکات. لەساڵی ١٩٥١دا لەوولاتە یەکگرتوەکانی ئەمەریکادا هەر لە ١٠٠ هەزار کەس ٣,١ کەس کوژراوە ئەم ژمارەیە لەساڵی ١٩٦٠ دا بەرزبوەوە بۆ ٥ تاوانی کوشتن. لەساڵی ١٩٦٧ گەیشتە ٩ تاوان. لەئەڵمانیای رۆژئاوایش لەماوەی ١٦ ساڵدا تاوانی کوشتن سێ جاری جاران بەرزبوەتەوە لە ساڵی ١٩٦٦دا یەك ملیۆن تاوان تۆمارکراوە، لەساڵی ١٩٧٠دا ئەو ڕێژەیە بەرزبوەتەوە بۆ ٢,٤١٣,٠٠٠ تاوان. لەماوەی ئەم دەساڵەی دواییدا ڕێژەی کوشتنی ئەنقەست ٠٣٥/٠زیادی کردوە. لەهەمانکاتدا ڕێژەی توندوتیژی لەئوسکتلەندا ٠١٠٠/٠زیادیکردوە، رەنگە بەتاڵکردنەوەی سزای لەسێدارەدان لەساڵی ١٩٦٢ دا کاریگەریەکی هەبێت لەسەر ئەم ڕێژەیە بەڵام ئەوەتا کاریگەری نی‌یە لەسەر بەرزبونەوەی ئەم دیاردەیە. لە یەکێك لەریفراندۆمەکاندا بۆ وەرگرتنی رای گشتی لەم دواییانەدا لەفەرەنسا سازکرابوو، هاوولاتیە فەرەنسیەکان دیاردەی توندوتیژی و ترسان لەو دیاردەیە لە سەروی لیستی کێشەکانی رۆژانەیانەوە دانابوو. زیادکردنی ژمارەی تاوانەکان، بەتایبەتی تاوانی لاوان، وای لێ هاتوە بۆتە مایەی نیگەرانی و دڵەڕاوکێ، لەماوەی دە ساڵی( ١٩٦٦-١٩٧٦) تاوانی دزیکردن لەفەرەنسادا بەڕێژەی ٠١٧٧/٠و لەبەلجیکا دووجار ژمارەی تاوانەکان لەنێوان ساڵانی (١٩٦٩-١٩٧٨)دا زیادیکردوە. لەکۆنگرەی نێودەوڵەتی حەوتەمدا بۆ زانایانی لێکۆڵینەوە لەبواری تاوان کەلە ساڵی (١٩٧٣)دا لەبەلگراد گیرابوو هەموو لایەك لەسەر ئەوە یەکدەنگبوون کەتاوان بەشێوەیەکی سەرسوڕهێنەر لەزیادبوندایە لەهەموو وڵاتەکاندا. بۆ لێکدانەوەی ئەم رەوشەش زانا ئەمریکیەکان دانیان بەوەدانا کەئەستێرەکەمان خەریکە

---

[٣٩] ئەم زانیاریانە لە : Yearly Report of FBI, 1965 وەرگیراوە.

پڕدەبێتەوە لەکەسانی لادەرو تاوانکار، خەڵکیش بەگشتی، بەشێوەیەك لەشێوەکان نەزعەی تاوانکردنیان تێدایە، هیچ ڕێگایەکیش نی یە لەبەردەمماندا بۆ دەرچوون لەم کارەساتە.

لەراپۆرتی نەتەوە یەککگرتوەکاندا هاتووە لەژێر ناونیشانی(( ڕەوشی جیهان لەساڵی ۱۹۷۰))دا، هەندێ حەقیقەتی باسکردوە لە دەوڵەتێکی پیشەسازیدا کەناوی نەهێناوە: ژمارەی ئەو لاوانەی پۆلیس مامەڵەی لەگەڵداکردون لە یەك ملیۆنەوە لەساڵی ۱۹۵۵ بەرزبوەتەوە بۆ ٢,٤ملیۆن لەساڵی ۱۹٦٥ [٤٠]. ئەمینداری گشتی نەتەوە یەککگرتوەکان لەراپۆرتێکیدا ڕایگەیاند((هەندێ لەدەوڵەتان کەزۆر پێشکەوتوون گیروگرفتی ترسناکیان هەیە لەبواری تاواندا....سەرەڕای ئەو پێشکەوتنە ماددیەش، بەلاّم ژیانی مرۆڤایەتی زیاتر بەرەو ئاڵۆزی و سەقامگیرنەبوونی ئاسایش دەڕوات. هەموو چەشنێك لەو تاوانانە( چ شەخصی بێت یان کۆمەڵی) لە دزی و ساختەکردن و فەسادو هەموو تاوانەکانی تر، نمایشی ئەو باجەگرانە دەکەن کەمرۆڤ دەیدات لەپێناو ئامرازەکانی ژیانی هاوچەرخ و پێشکەوتندا.[٤١] هەروەها ئەو لێکۆڵینەوەی کە زانای سایکۆلۆژی سۆڤیەتی (هوداکۆف) پیێ هەستابوو دەریخست کەوا فراوانبونێکی ترسناکی خواردنەوەی مەی، بەتایبەتی لەدەوڵەتە پێشکەوتوەکانی پاش شەڕی جیهانی دووەمدا هاتۆتە کایەوە. فرۆشتنی مەی لەسەر ئاستی جیهاندا لەساڵی ۱۹٤۰تا۱۹٦۰یەکاویەك زیادیکردوە، لە ساڵی ۱۹٦٥ ٢,٨جار بەرزبۆتەوە، لە ساڵی ۱۹۷۰دا گەیشتە ٤,٣جار. لە ساڵی ۱۹۷۳ دابەرز بوەوە بۆ٥,٥ جار. دیاردەیەکی لەبەرچاویش هەیە ئەویش زیادکردنی بەکارهێنانی مەیە لەنێو چینی ئافرەتان و

---

[٤٠] الامم المتحدة : U. N Report : The Situation of The World in 1970(Paris : Unesco, n.d) .

[٤١] سکرتێری گشتی نەتەوە یەککگرتوەکان U.N. General Secretary Report :Prevention and Fighting Against Griminality(Paris: Unesco, 1970) .

لاواندا.[42] بە پێی ئەو ڕاگەیاندنانەی کەلەلایەن دەزگای خێرخوازی بەریتانیەوە دەرچوون بەناوی( یارمەتیە پێشکەشکراوەکان) لە ساڵی ۱۹۷۳دا، چوارسەد هەزار ئالودە لەئینگلتەرە هەبووە. زیاتر لە ۸۰ هەزاریان ئافرەتبوون. هەمیشە نیوەی ئەو ژمارەیەش لەکۆتایدا سەریان لەنەخۆشخانە عەقڵیەکانەوە دەردەچێت. هەر لە سێکەس یەکێکییشیان نەزعەی خۆکوشتنی تێدایە. وولاّتی فەرەنسا بە پلەی یەکەم دێت لەلیستی ئەو وولاّتانەدا لەڕووی بەکارهێنان و خواردنەوەی مەیەوە. لەپاش ئەویش ئیتالیاو رووسیا دێت. بەپێی سەرژمێریەکانی مردن بەهۆی مەی خواردنەوە بەرلینی خۆرئاوا بەپلەی یەکەم دێت. لەو ولاّتانەدا ژمارەی ئەو کەسانە بەهۆی مەیەوە گیانیان لەدەستداوە گەیشتۆتە ٤٤,٣ کەس لە کۆی ۱۰۰هەزار دانیشتوان لەپاشان فەرەنسا دێت کەدەگاتە ۳۰حالّەت.[43]گرفتی ئالوودەبوون بەمەیەوە لەم سەردەمەدا بۆتە گرفتی دەوڵەمەندەکان و ولاّتە پێشکەوتوەکان، ئەگەر مەی خواردنەوە و بەکارهێنانی ماددەی بێ هۆشکەر بە مەبەستی چێژوەرگرتن بێت، ئەوە چ چێژێکە دەولەمەندەکان بۆی دەچن ؟، پاشان ئەوان دەیانەوێت لە چ شتێك هەلّبێن ؟ ئێمە لەرابردوودا واراهاتووین کەمەسەلەی خواردنەوەو زۆر بەکارهێنانی مەی ببەستینەوە بە مەسەلەی دواکەوتن و هەژارییەوە و هیوامان بەداهاتویەکی باشتر هەبوو. بەلاّم ئەم کەندەلّەی ئێستا کەندەلاّنێکە هەموو لایەکی گرتۆتەوە، پسپۆڕێکی سویدی لەم بارەیەوە دەلّێت:(لەبەر چەند هۆکارێك کەناتوانین دیاری بکەین یان ناوی لێ بنێین ، دەبینین نیشانەکانی ئەم نەخۆشیە کۆمەلاّیەتیانە لەولاّتێکی وەك سوید دەردەکەوێت زیاتر لەهەر ولاّتێکی تر). ئێستا لەو ولاّتەدا لەهەر ۱۰کەسێك یەکێکیان ئالودەن بەمەیەوە، بۆ ڕووبەڕووبونەوەی ئەم دیاردەیەش حکومەتی سوید بڕیاریدا کە باجیگەورەو گران بخاتە سەر مەی، بەلاّم ئەو هەولاّنەش هیچ ئاکام و کاریگەریەکی بەر چاوییان نەبوو. بەلاّم ئەو ڕەواجپێدانەو بانگەشەکردنە دزێوە کەدەکرێت بۆ ئیباحیەت وەکو ئاشکرایە

[42] بڕوانە( هداکوف) Lydia Hodakov: Sociology of Work

[43] سەرژمێریەکانی ساڵی ۱۹٦۱.

ئەمەیش بەهەمان شێوە لەو وڵاتانەوە سەرچاوە دەگرێت کە زۆر پێشکەوتوون، بۆ نمونە وڵاتانی فەرەنساو دانیمارك و ئەڵمانیای ڕۆژئاوا پێش فەرەنسا بووە – بەپلەی یەکەم دێن لەو بوارەدا، لەساڵی ١٩٧٥ دا ڕێژەی ئەو ململانێ‌ی کە بۆ ڕەواجدان بە ئیباحیەت نمایشدەکران دەگەیشتە نیوەی کۆی هەموو فلیمە نمایشکراوەکان تەنها لە پاریسدا ٢٥ هۆڵی ئامادەکراو هەبوو بۆ نیشاندانی ئەو جۆرە فلیمانە. پزیشکی دەروونناسی بەناوبانگ پرۆفیسۆر( بلانشارد) هەوڵیدا شیکاری ئەم دیاردەیە بکات و وتی: ئەو ئایدۆلۆژیا زاڵە بۆتە هۆی چەسپاندنی زیاتر و زیاتری کەسێتی مرۆڤ و بەرەو ژیانێکی ئالیانەی ڕاپێچکردوە، بە پێی پلانێك هەڵسوکەوت دەکات کەبریتیە لە(خەو – شەمەندەفەر).* سروشتی ئەم پلانەیش بەشێوەیەکە کەوا ئاستێکی دیاریکراوی گوزەران دابین دەکات بەڵام مرۆڤ بێبەش و مەحروم دەکات لەشارەزایی و ڕوژاندنی ڕاستەقینە، هەموو شتێك پێشوەخت ئامادەکراوە، هەتا مۆڵەت وەرگرتنەکانیش ڕێکخراوو دارێژراون، کەسی ئیشکەر ناتوانێت هیچ شتێك بگۆڕێت، لەبەرئەم هۆیەیە زۆربەی کەس بەشێوەیەکی غەریزی پێویستیان بەوە هەیە کە لەخۆیان هەڵبێن بۆ ئەوەی جۆرەها کردەوەی تر مومارەسە بکەن بەدەر لەقاڵبە ڕۆتینیەکە، بۆ تێرکردنی ئەو پێویستیانەش دواجار خۆیان لە گازینۆو ئەو شوێنانەدا دەبینیەوە کەنمایشی فلیمە ڕووت و ووروژێنەرەکان دەکەن.[44] هەتا یاریەکانی( بەخت تاقیکردنەوەیشی) گونجاوە لەگەڵ (پێشکەوتنیان) لەشارستانیەتدا. ئەوەش هەروەها شوێن ئەو ئاراستە گشتییە دەکەوێت بۆ کاری دزێوو ناشرین لەگەڵ ئالودەبوونی مەیی و ئیباحیەت و ئەدەبی هەرزان و نزم و بەرەڵایی تری لەو جۆرە، گەورەترین شارەکانی قومارکردن لەشوێنە هەرە پێشکەوتوەکاندایە لەجیهاندا.(دوفیل) و(مۆنتی کارلۆ)ماکاو (لاس فیجاس). لەشاری ئەتلانتیك فراوانی هۆڵی گازینۆ گەورەکان

---

* واتە مرۆڤ بەشێوەیەك ژیان دەباتە سەر کەبەستراوەتەوە بە زنجیرەیەکی توندو تۆڵەو لە ژیانی ڕۆژانەیداو بەشێوەیەکی وورد کاتەکانی بۆ دیاریکراوە لە نێوان( خەوتن – ئامێرەکانی گواستنەو – کارکردنی ڕۆژانەدا . ( وە. ع).

[44] بلان شارد : Keneth H. Blanchard and Paul Hersey: manay ement of organiz ational Behavior : Utilizing Human Resources ,2nd ed.(Englewood Cliff, NJ: Prentice Hall , 1972)

لەپرادەیەکدا کە جێگەی ٦ هەزار کەسی تیادەبێتەوە کە ئەو یاریانە دەکەن. بەیاننامە رەسمیەکان ئاماژە بەوە دەکەن کەلە ساڵی ١٩٦٥دا فەرەنسیەکان(١١٥) بلیۆن( فرانك) یان لەقومارکردندا خەرجکردوە. ئەمەریکیەکانیش(١٥) ملیۆن دۆلاریان خەرج کردوە. لە هەرسێ کەس یەکێکیان بلیتی( یانصیب)یش دەکڕێت. بەپێی ئەو بەیاننامانە سەبارەت بەو خەرجیانەی کەلەلایەن ئەو کەسانەوە بۆ ئەو یاریانە تەرخانکراوە، دەرکەوتوە گەورەترین گرنگیدان بەیاریەکانی قومارکردن لەووڵاتی سوییدا بڵاوە لەپاش ئەویش ئیسرائیل و دانیمارك دێت. چەمانەوەیش لەمەدا بەپێی ئەو چەمانەوەیە دیاری دەکرێت کەبەسەر شارستانیەتدا دێت لەوڵاتێکەوە بۆ وڵاتێکی تر لەگەڵ هەندێك لاداندا. بەپێی بەیاننامە رەسمیەکان لەساڵی ١٩٦٣دا لەنیویۆرك، ٢٣ هەزار لاو کە ماددەی هیرۆیین و مادده بێ هۆشکەرە قورسەکانی تر بەکار دەهێنن و ئالودەبوون پێیەوەی ناویان لەدەزگاکانی پۆلیسدا تۆمارکراوە. مەزندەکراوە ژمارەی راستەقینەی ئەو کەسانە لە ١٠٠ هەزار کەس زیاترن. لە( کۆلیژی هنتر لە نیۆرك) زیاتر لەنیوەی قوتابیەکانی ماددەی حەشیش بەکاردەهێنن، ئەمەیش بەهەنگاوی یەکەم دادەنرێت بەرەو بەکارهێنانی مادده بێهۆشکەرە قورسەکانی تر لەداهاتوودا. لەپاش جەنگی جیهانی دووهەمەوە لەهەمان ئەو دەوڵەتە دەوڵەمەندو خۆشگوزەرانانەدا نەوەیەکی وەڕس و مەئیوس بەدەرکەوت کەهەموو شتێکی هەیە و کەچی لە هەموو شتێکیشی کەمە، ئەوانە بریتین لە( وجودیەکان) یان ئەوانەی کەپێیان دەڵێن( نەوەی تێکشکاوو بەزیوو)، ئەوانەی کەهەڵگری فەلسەفەی( عەبەسیەتن) ئەمانەش ئەو گەنجانەن کەئەگەری لادانیان زیاترە، ( هیپی)یەکانیش ئەوانەی کەلە واقیع هەڵدێن و گاڵتەیان بەیاساو سستەمەکان دێت. فکرو شێوازەکانی رەفتاریان بەشێوەیەك بڵاودەبێتەوە وەك چۆن تاعون لەشارە گەورەکانی جیهاندا بڵاودەبێتەوە. ئەویش هەڵەیەکی گەورەیە ئەگەر وابزانین - چ لەسەر بنەڕەتی ئەو قسانەبێت کەدەکرێن یان بەروکەش وابێت کەشۆڕشی لاوان لەساڵی ١٩٦٨ لەئەمەریکاو فەرەنسادا شۆڕشێکی سیاسی یان ئایدۆلۆژی و لەسەر بنەڕەتی بیروباوەڕ بووبێت، ئەوەی کەڕوویدا - بەحەقیقەت - زیاتر شۆڕشێکی ئەخلاقی بووە لەئەمەریکا ئەو شۆڕشە بەسەر ئەوەدا

بوو کە پێی دەوترێت (ئەمەریکای ڕێکخراوە)، لە فەرەنسایش شۆڕش دژ بەدامودەزگای ڕێکخراوەییەکان بوو. لەهەردوو حاڵەتەکەشدا شۆڕشێك بوو دژ بەهەندێ لەڕوخساری شارستانی. یان وەکو( ئیجولاملفا)دەڵێت : ئەوشۆڕشە بریتی بوو( لەبەرەنگاریەك دژ بەئەخلاقی بەکاربەری لە کۆمەڵگەی پیشەسازیدا). لەبەر ئەوەی هەندێ کەس نەیاندەتوانی تەفسیری ئەم شۆڕشە لەناوجەرگەی ئەو وڵاتانەدا بکەن کەلە زۆر لایەنەوە لەژیانێکی خۆشو ئاسودەدا دەژین، بۆیە بەوە پێناسەیان دەکرد کە (شۆڕشێکە بەبێ هۆ) هەروەکو (مالرۆ) دەڵێت :( شۆڕشی لاوە ناعاقڵانیەکان) ئەمەیش بەتەئکید وایە، ئەگەر ئێمە دامانماڵی لەلایەنە عەقڵانیەکەی. بەڵام( ئەرپرمیللر) دادوەری ڕەوانبێژو بەئەزمونی ئەمەریکای مۆدێرن لەمبارەیەوە دەڵێت: (گرفتی لادانی چینی لاوان تەنها شارە گەورەکانی نەگرتۆتەوە بەڵکو هەروەها گرفتی سۆشیالیزمیشە)، دەرکەوتنی ئەم دیاردەیە تەنها بە هۆی هەژارییەوە نییە، بەڵکو لەگەڵ دەوڵەمەندیشدا هەمان حاڵەت هەیە، تەنها گرفتێکی ڕەگەزایەتی نییە، یا گرفتی کۆچکردن هەتا گرفتی رەچەڵەك ئەمەریکاییەکانیش نیە. من وادەزانم ئەو گرفتە- لەم رەوشەی ئێستایدا- دەرئەنجامی ئەو تەکنەلۆژیایە کەوا مرۆڤی تووشی ووخیان کردوەتەوە وەکو بەهایەك لەخۆیدا ...بەکورتی، رۆح هەڵوەشاوەتەوە وبەرەو لەناوچون چوە. رەنگە درندەکانی جەنگی یەکەم و دووەمی جیهانی لە زەوییان دورخستبێتەوە ...یان کردە تەکنیکیەکان ئەو رۆحیەتەی مرۆڤەکانیان مژیبێت و هیچ نەمابێتەوە بۆ کەسیان، بێجگە لەوەی کەزەبون بن لەژێردەستی فرۆشیارێکدا. یان ببنە فەرمانبەرێك لەژێر بریاری بەڕێوەبەرێکدا، یان بەهەژارێك لەبەردەم دەوڵەمەندێکدا وەبەپێچەوانەوە – بەکورتی وەکو کۆمەڵێك رەگەز کە بەشێوەیەك لەشێوەکان یاریان پێ دەکرێت، نەك وەکو کۆمەڵە کەسێتیەکی خاوەن بەها لەخۆیاندا) [45]. چۆن دەکرێت

---

[45] گومانی تێدانییە کە ڕۆڵی تەلەفزیۆن لەم بوارەدا مایەی نیگەرانیە، بەپێی لێکۆڵینەوەیەك کەشەش ساڵی خایاندوە و بابەتەکەیشی لێکۆڵینەوەیەك لەسەر توندوتیژی لەبەرنامەکانی تەلەفزیۆندا، لەسەر ئەوە ئایا ئەو بەرنامانە دەبنە هۆی ڕوودانی توندوتیژی لەژیاندا(لە ساڵی ١٩٧٧دا لێکۆڵینەوەکە تەواوبوو)(( ولیام بلسۆن))( William Balson) لەبارەی ئەنجامەکەیەوە دەڵێت : لەڕاستیدا مایەی نیگەرانیە. بەپێی ئەو لێکۆڵینەوە دەرکەوتوە کەوا منداڵێکی

**تەفسیری ئەو حەقیقەتە بکرێت کەوا ژمارەی خۆکوشتن و نەخۆشیە دەرونیەکان بەرەو زیادبوون دەچێت لەگەڵ بەرزبونەوەی ئاستی شارستانیەتدا ؟ زانایەکی دەرونناسی ئەمەریکی گلەیی لەم حاڵەتە دەکات و دەڵێت :(لەگۆشەنیگای دەرونیەوە ئەمە حەقیقەتێکی گرنگە، ئایا ئەو خەڵکانە وایان لێ هاتووە کەمتر رازی بن سەرەڕای بەرەو باشترچوونی ژیان و گوزەرانیان ؟).**

**ئەم دیاردەیە کەبەشێوەیەکی تایبەتی لەهەندێ لەو دەوڵەتە پێشکەوتوانەدا دەردەکەوێت کەلەلایەنی کۆمەڵایەتیەوە رزگاریان بووە لەزۆربەی گرفتە تەقلیدییەکان، ئەم دیاردەیە وامان لێدەکات کە لەناخمانەوە متمانەمان بەپێشکەوتن لەق بێت.**

**لەوڵاتە یەککگرتوەکانی ئەمەریکا، هەر لەهەزار کەس چواریان لەنەخۆشخانە عەقڵیەکاندان، ئەمە لەویلایەتی نیویۆرکدا دەگاتە ٥,٥کەس هەر لەکۆی هەزار کەس زیاتر لەنیوەی جێگاکانی خەواندن لەهەموو نەخۆشخانەکانی ئەمەریکادا ئەوانە پڕیان کردۆتەوە کە تووشی نەخۆشیە عەقڵیەکان بوون. لە هۆلیۆددا گەورەترین رێژە لەژمارەی پزیشکە دەرونیەکانی جیهان لەو ناوەندەدا کاردەکەن. بەپێی راپۆرتێکی رەسمی لێپرسراوانی تەندروستی گشتی ئەمەریکی لەساڵی ١٩٧٨ز دا، دەریخستوە کە هەر لە پێنج کەسی ئەمەریکی یەکێکیان بەدەست دارمانی دەرونیەوە دەناڵێنێت یان نزیکە لەوەوە کە توشی تێکچوونی عەقڵی ببێت. ئەم ئەنجامەش لە سەرچاوەیەکەوە وەرگیراوە کە قابیلی گومان نییە. ئەمەیش لە کۆی ١١١ملیۆن دانیشتوان لە و وڵاتەدا وەرگیراوە کەلە تەمەنی پێگەیشتندان لەنێوان تەمەنی( ١٩-٧٩ساڵیدا).[46] بەڵام سوید، بەپلەی یەکەم دێت لەنێو وڵاتانی دونیادا لەرێژەی**

---

ئەمەریکی ئاسایی ١٨هەزار تاوانی کوشتن لە تەلەفزیۆندا دەبینێت پێش ئەوەی کە خوێندنی قۆناغی ئامادەیی تەواو بکات.

[46] سەرۆکی ئەمەریکی لیژنەیەکی پێکهێنا بۆ تەندروستی عەقڵی کە کارەکەیان ماوەی ١٠ساڵی خایاند و پاشان راپۆرتەکەیان لەساڵی ١٩٧٧دا بلاو کردەوە، ئەو لیژنەیە ئەوەی دەرخست بوو کەئەم جۆرە گرفتانە زۆر زیاترن لەوەی کەچاوەڕوان دەکرا. یەك لەسەر سیّ دانیشتوان ی ئەو وڵاتانە بەلایەنی کەمەوە لەحاڵە تێکی عاتیفی و ناجێگیربوونی

خۆکوشتن و بەکارهێنانی مادده بێهۆش کەرەکان و نەخۆشیە عەقڵیەکان، لەکاتێدا ئەو وڵاتە لەسەروی هەموو وڵاتانی جیهانەوە دەوەستێت لەڕووی داهاتی نەتەوەییەوە، هەروەها لە ڕووی شارەزایی و گرنگی دان بەخوێندن و نووسین، وەلەڕووی بیمەی کارو دابین کردنی کۆمەڵایەتیەوە، لەگەڵ ئەوەشدا لە ساڵی ١٩٦٧ز لە وڵات سوید ١٧٠٢ روداوی خۆکوشتن تۆمار کراوە - ئەم ژمارەیەش بەڕێژەی ٠/٠٣٠ی زیادی کردوە بەبەراورد لەگەڵ ساڵی ١٩٦٠دا. لیژنەی تەندروستی جیهانی لە( جنیف) لە ساڵی ١٩٦٨ دا لیستێکی بڵاوکردەوە بۆ بەراوردکردنی روداوەکانی خۆکوشتن لەهەندێ لەدەوڵەتاندا، ئەو دەوڵەتانەی ناویان لەلیستەکەدا هاتووە بریتین لە: ئەڵمانیای رۆژئاوایی، نەمسا، کەنەدا، دانیمارك، فنلەندا، مەجەر، لەم وڵاتانەدا خۆکوشتن هۆکاری سێیەمە لەهۆکارەکانی مردن لەنێوان ئەو پیاوانەدا کەتەمەنیان لەنێوان ١٥-٤٥ ساڵی دایە، پاش ئەوە نەخۆشیەکانی دڵ و شیر پەنجەدێن. لە راپۆرتی هەمان رێکخراودا لەساڵی ١٩٧٠ز دا، بەڕوونی دەردەکەوێت( کە ئەم دیاردەیە هاورێکە لەگەڵ پیشەسازی و و شارستانی بوون و داروخانی خێزاندا). ئەگەر سەیری ئەم دیاردەیە بکەین لەچوارچێوەی دەوڵەتێکدا یان کۆمەڵگەیەکی دیاریکراودا، دەبینین بەئاشکرا بەرەو زیادبوون دەچێت لەگەڵ پلەی پێشکەوتن و فێربووندا. لەیوگۆسلافیا، بۆ نمونە، دەبینین لە (سلۆڤینیا) کە لە کۆمارەکانی تر زیاتر پێشکەوتووترە رێژەی خۆکوشتن دەگاتە ٢٥,٨ هەر لە ١٠٠هەزار کەس لە ژمارەی دانیشتوان. لەکاتێکدا لە(کۆسۆڤۆ) کە دواکەوتوە و رێژەی نەخوێندەواری دەگاتە ٠٢٤/، تەنها ٣,٤حاڵەتی خۆکوشتن هەیە لە ١٠٠ هەزار کەس لەدانیشتوان، ئەمەیش بەپێی سەرژمێریەکانی ساڵی ١٩٦٧. بەپێ ی لێکۆڵینەوەیەك کە د.( ئەنتونی ریل)

---

دەروونی ترسناکدان. بەپێی لێکۆڵینەوەیەکی پەیمانگای نەتەوەی بۆ تەندروستی عەقڵی لەهەمان ساڵدا دەریخستوە کەزیاتر لە ٣,١ملیۆن ئەمەریکی چارەسەریان بۆ کراوە لەوانەی تووشی نەخۆشی و حاڵەتی عەقڵی جۆراو جۆرهاتوون. وەدەرکەوتوە کە ٨ملیۆن منداڵی ئەمەریکی لە کۆی ٥٤ملیۆن منداڵ پێویستیان بەیارمەتی و دڵدانەوە هەیە بەهۆی نارەحەتی و نائاسایی بوونی باری دەرونیانەوە، وە١٠ ملیۆن کەس بەلایەنی کەمەوە تووشی کێشەو گیروگرفت بوونەتەوە بەهۆی خواردنەوەی مەیی و سەر خۆشیەوە. لەکاتێدا ژمارەی ئەوانەی کە ماددەی هیرۆیین بەبەردەوامی بەکاردەهێنن و ئالودەی بوون گەیشتوەتە زیاتر لەنیو ملیۆن.

بەڕێوبەری خزمەتگوزاری تەندروستی پیێ هەستاوە هاتووە کە:( ژمارەی حاڵەتەکانی خۆکوشتن لەزانکۆکانی بەریتانیادا شەش جار زیاترە لەناوەندی نەتەوەیی، لەکاتێکدا ژمارەی حاڵەتەکانی خۆکوشتن لە زانکۆی (کمبریج) بەتایبەتی، دەجار زیاترە لەژمارەی حاڵەتەکانی خۆکوشتن لەنێوان لاوانی بەریتانی لەهەمان تەمەندا، ئەمەیش حاڵەتێکە کەدەبێتە هۆی دڵەراوکیێو نیگەرانی، لەکاتێکدا هەموو ئەو قوتابیە بەریتانیانە لەنێو خێزانە دەوڵەمەندەکانەوە هاتوون، یان لەرێگەی حکومەتەوە مافی خوێندنیان پیێ بەخشراوە. ئەوە بەهەڵەیەکی گەورەو بەزۆڵمیش دادەنرێت ئەگەر هەموو ئەو نەخۆشیە کۆمەڵایەتیانەو دیاردە نادروستانە باسمانکردن وەکو دەرەنجامێك بیانگێڕینەوە و تایبەتیان بکەین بەشارستانیەتی ڕۆژئاواوە. بەڵکو لەراستیدا، ئەوە تەعبیرکردنێکە لە شارستانیەت بەحوکمی ئەو سروشتەی کە هەیەتی. هەمووی ئەوەی کەوتراوە لەسەر وڵاتە یەککگرتوەکان و ئەڵمانیا و بەریتانیا و سوید بەهەمان شێوە بەسەر ژاپۆنیشدا جیێ بەجیێ دەبێت، هەتا ئەگەر کەوتبێتە بەشی ئەو سەری گۆی زەویشەوە،و لە ناوەندێکی جیاوازیشدا بێت هەرچەندە ئەم دیاریدانە لەشوێنێکەوە بۆ شوێنێکی تر رەنگە شێوەیەکی جیاواز وەربگرن و بکەونە ژێر کاریگەری هەندیێ فاکتەرەوە بەڵام بەبەردەوامی دەمێننەوەو پارێزگاری لەهەمان ئاراستە دەکەن. بۆ نمونە لەژاپۆن، هەندیێ جیاوازی هەیە لەلایەنی پابەند بوون بە رۆشنبیرییە ژاپۆنییە تەقلیدیەکەوە، لەلایەنی بەهێزی پەیوەندی خێزانیەوە لەکۆمەڵگەی ژاپۆنیدا.[٤٧] کارێکی زەحمەت و گرانیشە بتوانین کەشفی هەموو ئەو هۆکارانە بکەین کە لە پشتی ئەم دیاردانەوە هەن و شاراونەتەوە، بەڵام هەرچۆنێك بێت، بەدواداچوون لەم بارەیەوە کراوەو توانراوە لێکۆڵینەوە لەسەر دیاریدەی بەکارهێنانی مادده بیێ هۆشکەرەکان بکرێت لەلایەن ئەو لاوانەوە کەهێشتا لەماڵە باوانداندان (فلادیتا یروتیتش)، کەپزیشکێکی دەروونی یوگۆسلافیە لەم بارەیەوە نووسیویەتی :(ئاژاوەو کیێبەرکیێی خێزانی کەدەبنە هۆی حاڵەتێکی تورەییو

---

[٤٧] بڕوانە (Anasaki: The Crisi of Iapan Caltnre ,(n,p,n.d

نائارامی لەمنداڵداو وای لێدەکات بەشوێن میکانیزمی بەرەنگاری هەڵەدا بگەڕێن، ئەمەیش وەکو پەرچە کردارێکی ئەو حاڵەتەی کەئەو کەسە لەناو ئەو خێزانەدا بۆی دروست بووە ...وون بوونی کۆمەڵگەی باوکایەتی و لێك هەڵوەشانی خێزانی کەئێستا لە جیهاندا بلاوە، دەبێتە هۆی دروستکردنی کەشێك لەڕووخاندنی دەروونی کەوا لەو کەسە دەکات لەهەڵسوکەوت و جیهانی دەرەوەدا بەیەکێك لەم دوو ڕێگەیە تەعبیر لەخۆی بکات : تورەیی و یاخی بوون، یان حاڵە تێك لەبێ موبالاتی بێزاری و خۆبەدەستەوەدان، لەئەنجامدا بۆ هەڵهاتن لەهەموو ئەم حاڵەتانە ئەو کەسە ناچاردەبێت پەنا بباتە بەر بەکارهێنانی مادده بێ هۆشکەرەکان [٤٨].

(روجر روبل RogerRowel بەڕێوەبەری مەڵبەندی (هارفارد بۆ لێکۆڵینەوەی کۆمەلأیەتی) پێشنیار دەکات بۆ دروستکردنی لیژنەیەکی تایبەتی لەئەنجومەنی پیرانی ئەمەریکادا بۆ لێکۆڵینەوە لەکاریگەری تەکنەلۆژیا لەسەر مرۆڤ وکۆمەڵگا، وە ووتی :( بەپێی ئەم رەوشە نوێیانە، تەمەنی مرۆڤ بۆ سێ دەیەی تر زیاد دەکات، بەلأم ژیانێکی نەزۆك بێ مەیل و پڕ لەغەم).

بەپێچەوانەی تێڕوانینی مادیگەریەوە، شارستانیەت و ژیانی رەفاهیانە تەواو گونجاو نین لەگەڵ سروشتی مرۆڤایەتی دا. بۆشایی کۆمەلأیەتی بۆ نمونە گەورەترە – بەشێوەیەکی گشتی لەدەوڵەتە کاسۆلیکیەکاندا – زیاتر لەدەوڵەتە پرۆتستانەکان دا.[٤٩] لەگەڵ ئەوەیشدا حاڵەتەکانی خۆکوشتن و نەخۆشیە عەقلیەکان ئاماژە بۆ ئەخلاقێکی پێچەوانە دەکەن.((مادده)) کە مرۆڤ لێی دروستکراوە ئەوە نیە – یاخود تەنها ئەوە نیە – هەروەکو زانستی بایەلۆژی پەرەسەندنی لەچاخی نۆزدەهەمدا بڕوای وابوو. مرۆڤ ناتوانێت یان جۆرێك لەناڕێکی ڕوو لە ژیانی دەکات ئەگەر تەنها بەهەستەکانی بژی و تەنها لەڕێگەی ئەوانەوە مامەڵە لەگەڵ ژیانیدا بکات هەروەکو

---

[٤٨] NIN. 9/111,1969

[٤٩] جیاوازی دەرامەتەکان لەفەرەنسا بۆ نمونە دوو جار زیاتر لە ئینگلترە و ئەلمانیای رۆژئاوا وەلە هۆڵەندا سێجار بەرزترە لەوڕادەیە.

ماددیەت پیێی وایەو جەختی لەسەر دەکاتەوە :( ئەو ئارەزوانەی جێ بەجێ نابن و نایەنەدی دەبنە هۆی دروستکردنی ئێش و ئازار، ئەوانەیش کەدێنەدی و جێ بەجێ دەبن دەبنە هۆی پەیدابوونی هەستکردن بە تێربوون.[50] رەفاهیەت و هەموو ئەو حاڵەتانەی کەهاوچەشنی ئەمەن دەبنە هۆی کەمکردنەوە، بەڵکو لەناوبردن و بچڕاندنی ئەو پەیوەندیەی کەهەیە بەهەر سستەمێکی خاوەن داب و بەهادارەوە [51].

شارستانیەت دورترە لەوەی بتوانێ مانایەك بەژیانمان ببەخشێت، بەڵکو لەڕاستیدا بریتیە لەبەشێك لە هەرا لەبوونمدا. لە دەستدانی( اختیار) کەسیمایەکی کوشندەیە لە سیماکانی شارستانیەت ئەم خەسڵەتەش بەتەواوەتی لەکاتێکدا دەردەکەوێت کەمرۆ دەستەوسان دەبێت لەبەردەم بەرهەم نەهێنانی چەکە کۆمەڵکوژەکاندا، هەروەها لەو ئیقاعە ترسناکەشدا دەردەکەوێت بۆ تێکدانی ژیانی سروشتی کە مرۆڤی شارستانی پیێی هەڵدەستێت لەنێو ژینگەکەیدا. ئەمە ململانێیەکە لەنێوان شتە ئالی و ئەندامیەکاندا، لەنێوان بنەما پیشەسازی و بنەما سروشتیەکان لەژیانی مرۆڤدا.

بەهۆی غەزوی شارستانیەوە هێڵی دارستانەکانی بەڕازیل ساڵانە لەمەودای ١٠ کیلۆمەترەوە بۆ ١٥ کیلۆمەتر بۆ دواوە دەگەڕێنەوەو ئەو مەودایە دەبێتە روتەن، لە وولاتە یەکگرتوەکانی ئەمەریکادا، ٨٠/٠ی ئاوی خواردنەوە بەهۆی دوکەڵکێشی پیشەسازیەوە پیس دەبێت. ئەو دووکەڵەی کەلە کارگە گەورەکانی مسەوە لە(تنسی) بەرزدەبێتەوە، دەبێتە هۆی گۆڕینی ئەو خاکە بەپیت و دەوڵەمەندە بۆ بیابانێك کەئێستا مەودای ٢٠ هەزار هیکتار زەوی گرتوەتەوە. لەلەندەن (ساڵی ١٩٥٥)، پەیتی ترشەکانی مس و ئەو دووکەڵە لەوە دروست دەبێت و تێکەڵ بە هەوا دەبێت هەورێکی چڵکنی رەش لە ئاسماندا دروست دەکات بووە هۆی کوشتنی زیاتر لەچوار هەزار کەس لەیەك رۆژدا. لەوڵاتە یەکگرتوەکان لەئەنجامی دووکەڵکێشی کارگەو ئۆتومبیلەکانەوە ٢٣٠ملیۆن تەن لەماددەی زیان بەخش بەتەندروستی تێکەڵ بەهەوای

---

[50] ( شوبنهر)

[51] ﴿ ولكن متعتهم واباوهم حتى نسوا الزكر وكانوا قوماً بوراً﴾ سوره الفرقان : ١٨

ئەو وڵاتە دەبێت لەماوەی ساڵێکدا. لە فەرەنسا (١٩٦٠)، ویستگەکانی ووزە بڕی ١١٤هەزار تەن گازی کبریتیان دەرداوەتە ناو هەواوە، زیاتر لە ٨٢ملیۆن تەن لە پاشەڕۆی فڕنەکان. ئەم ژمارەیەش لەساڵی ١٩٦٨دابەرەو زیادبون چوو سەرەڕای وەرگرتنی ڕێو شوێنی پێویستیش بۆ خۆپاراستن لەو زیانانە. لە ناوچەی ( رەور) لە ئەڵمانیا نزیکەی ١٢٧هەزار تەن لەتەپوتۆزی پیشەسازی ساڵانە دەکەوێتە خوارەوە. لەشارەکانی بەریتانیاو سویسرا کە بەهۆی دووکەڵی ئەو ماددە کیمیاویانەوە کە وەکو هەورێکی رەش ئاسمانی ئەو شارانەیان تەنیوە، دەبینین ئەو کەسانەی کەبەهۆی شێرپەنجەی سی‌یەوە گیانیان لەدەست داوە ٤٠جار زیادی کردوە لەماوەی ئەم پەنجا ساڵەی دواییدا، لە وڵاتە یەککگرتوەکانی ئەمەریکادا، ئەم رێژەیە ٥٠ جار زیادی کردوە لەماوەی ئەم بیست ساڵەی دواییدا. بەپێی لێکۆڵینەوەیەك کەلە ناوچەی( یاناجا)ی گەورە لە تۆکیۆ ئەنجام درابوو سەلماندویەتی هەر لە ٤٩کەس ١٠کەسی گەڕۆکی ئەو ناوچەیە پاش ئەوەی پشکنینیان بۆ ئەنجامدرابوو دەرکەوتوە کەماددەی (رصاص) بەرێژەی ٢ بۆ ٧ جار لەناو خوێنیاندا هەیە زیاتر لەو رێژە ئاساییە کە لەهەر کەسێکی تردا هەیە، هۆیەکەیشی گەڕاوەتەوە بۆ ئەو گازانەی کەلە رێگەی دوو کەڵکێشی ئۆتۆمبیلەکانەوە بەهەوادا پەخش دەبێتەوە و دەبێتە هۆی پیسکردن و ژەهراوی کردنی ژینگە، ئۆتۆمبیل لەوەتەی داهێنراوە هەتا ئێستا ئەوەندە خەڵکی کوشتوە زیاترە لەژمارەی هەموو ئەو کوژراوانەی کەلە ئەنجامی هەموو جەنگەکانی ئەم چاخەدا گیانیان لەدەستداوە.[52] شتێکی مەحاڵیشە ئەگەر بمانەوێت لەم شارستانیەتەدا – ئەگەر بەتەنها پشتمان پێ بەست – هێزێك بدۆزینەوە کەبتوانین بەرەنگاری ئەم هەموو بەلایانە ببێتەوە. بەڵکو زیاتر لەمەیش، ئەگەر کورتمان کردەوە لە پەیڕەی ئەو داب و شێوازە باوەی کە شارستانیەت پێیدا سەر دەکەوێت، یەك بەهای ئەخلاقی نادۆزینەوە بتوانێت رێگە لەو رەواج پێدان و بانگەشە بۆکردنانە بگرێت کە بۆ بەرەلایی و

---

[52] ئەم زانیاریانە لە توێژینەوەکانی یەکێك یەکێك لەپسپۆڕانی ئەمەریکی بواری رێگاوبانەوە وەرگیراوە کەئەویش (نوربرت تیمان) (Norbort Timan) ە لە کۆنگرەی نێودەوڵەتی دا لەبارەی( ئاسایشی رێگاوبان) کەلە ساڵی ١٩٧٦لەپاریس گیرا، لەژێر ناونیشانی( چۆن لەم پێش کەوتنە هەڵبێن).

ئیباحیەت دەکرێت، یان بەرەنگاری بلأوبونەوەی مەی و مادده بێهۆشکەرەکانی پێبکرێت. لەراستیدا جۆرێك هەستکردن بەدەستەوسانی و بێزاربوون هەیە بەشێوەیەکی گشتی لەلای زانایانی ئەمەریکی بواری لێکۆڵینەوەی تاواندا . لەکاتێکدا ئەوان ڕووبەڕووی بەرزبونەوەیەکی بەردەوام دەبنەوە لەرێژەی تاواندا – لەراستیدا ئەمە بریتیە لەبێزاری و دەستەوسانی زانست لەڕووبەڕووبونەوەی نەخۆشیە کۆمەلأیەتیەکاندا کە بەوە ناسراوە لایەنی نائەخلاقی دەگرێتەبەر لەتێروانینیداو بەعەقڵێکی ڕووتەوە دەڕوانێتە پەیوەندیەکان لەکۆمەڵگادا.

شارستانیەت ناکرێت لەناوەوەیدا بەتاڵ بکرێتەوە یان لەناو ببرێت، بەڵکو پێویستە ئەمە لەگەڵ دەرەوەیدا بکرێت مەبەستم ئەوەیە لەرێگەی ڕۆشنبیریەوە دەتوانرێت گۆڕانکاری بەسەر دەرەویدا بهێنرێت. لەتێروانینی شارستانیەتدا، زانست ناتوانێت بگەڕێتەوە دواوە بەرەو ئایین یان شارستانیەت بگەڕێتەوە بۆ ئەو خێزانە تەقلیدیەی پێش دەرکەوتنی شۆڕشی پیشەسازی وسەردەمی ڕۆشنگەری، لەم ڕووەوە بازنەکە توند داخراوە بەسەر خۆیدا.

## ڕەشبینی شانۆ

لەو شتانەی مایەی سەرنجدان و ئاماژە پێکردنە ئەوەیە کەفەلسەفەی ڕەشبینی لەو ناوچانەوە بێت کە دەوڵەمەندو پێشکەوتوون، ئەمانەیش زنجیرەیەکن لەو فەیلەسوف و نوسەرانەی کەهەڵگری فەلسەفەی ڕەشبینین (ئیبسن، هیدگر، میلەر، بینتر، بیکت، ئەونیل، بیرگمان، کامۆ، ئەنتۆنیی و......ئەوانی تر). زانایان ئەوانەی کەشوێن ڕووکاری دەرەکی شتەکان دەکەون لەسەر گەشبینیان ماونەتەوە، بەلأم بیرمەندان و، بەتایبەتی تریش هونەرمەندان، دەتوانین بڵێن کەئەوانە چینی ڕەشبینەکانن. ئەگەر بەشێوەیەکی ڕووکەش سەیری ئەم مەسەلەیەمان کرد، ئەوەمان بۆ دەردەکەوێت وەکو ئەوەی کەرەشبینی پەیوەست و لکاوبێت بەو ناوچانەوە کە نەخوێندەواری تێیاندا قەلأچۆکراوە، لەزۆربەی لایەنەکانەوە پێداویستیە کۆمەلأیەتیەکانیان دابینکراوە،

داهاتی تاکەکەسی لەزۆر شوێندا لە ١٠٠دۆلار بەرەوژورە. فەلسەفەی ئەسکەندەنافی فەلسەفەیەکی تەواو ڕەشبین بووە هەر لەکۆتایی چاخی نۆزدەو سەرەتای چاخی بیستەمەوە. لەڕوانگەی ئەو فەلسەفەیەوە چارەنوسی مرۆڤایەتی وادەبینرێتەوە کەچارەنوسێکی تراژیدی و بێ ئومێدی هەیە، ئەنجامی کۆتایی هەموو هەوڵ وکۆششێکی مرۆڤ و بوونی مرۆیی بەگشتی بریتیە لەسەراب و تاریکی و وون بوون. لەڕاستیدا مایەی گاڵتەپێکردنە بەشوێنێك کەفەلسەفەی لەم جۆرەی تێدا دەرکەوێت لەوڵاتێکدا کەهەر لەسەرەتای ئەم چاخەوە لەنەخوێندەواری ڕزگاری بووە، لەکاتێکدا بەشی باشوری ئەوروپا کەلەناو تاریکی و جەهالەتدا دەژیا. لەساڵی ١٩٠٦دا، ڕێژەی نەخوێندەواری لەبلگاریا و سیبریا ٠/٠٧٠بوو، لە ئیتالیا ٠/٠٤٨بوو، لە ئیسپانیا ٠/٠٦٣، لە مەجەر ٠/٠٣٤، لە نەمسا ٠/٠٣٩. ئەمەیش ئەو پرسیارکردنە دەخوازێت ئەگەربێت و پەیوەندی لەنێوان دابینکردنی ژیانی کۆمەڵایەتی لەسوید وەکو دەشزانین ئەوە باشترین سیستەمە لەجیهاندا – هەستکردن بەبێزاری لەژیاندا هەبێت. ئایا هەستکردن بەچێژو خۆشی ژیانی مادی دەبێتە هۆی پەیدابونی هەستکردن بەلەناوچوون وداڕمینی ڕۆحی ؟ یەکێك لەخەسڵەتە دیارەکانی شارستانیەت ئەو نەزمە سست و خاوەیە لەژیانی ناوخۆیی و زاتیانەی مرۆڤدا بەپێچەوانەی چالاکی دەرەکی ژیانی ئابوری و سیاسیەوە. شانۆگەریە عەبەسیەکانیش بریتین لەوێنەی ڕاستەقینەی ژیانی مرۆڤایەتی لەزۆربەی کۆمەڵگە پێشکەوتوەکانی ئەمڕۆدا. ڕەفاهیەت و خۆشگوزەرانی بریتین لەوێنەی دەرەوە، عەبەسیەتیش بریتیە لەوێنەی ناوەوەی ژیان. ئەگەر بەشێوەیەکی جەدەلیش ئەم هەڵوێستەمان دەربڕی ئەوا دەڵێین: هەرکاتێك ڕەفاهیەت و خۆشگوزەرانی زیادیکرد ئەوەندەش هەستکردن بەوەڕەسی و بێزاری زیاد دەکات،. بە پێچەوانەی ئەمەیشەوە، دەکرێت لەکۆمەڵگە سەرەتایی و هەژارەکاندا ئاژاوەو کێشەی کۆمەڵایەتی و کێبەرکێی توندوتیژی هەبێت، بەڵام هەموو ئەو زانیاریانە لەو بارەیەوە هەمانە ئاماژە بەوە دەکەن کەژیان لەو شوێنانەدا پڕیەتی لەخۆشەویستی و مەشاعیری بەهێز و بەفەڕ.

فۆلکلۆر-کەبریتیە لەئەدەبی کۆمەڵگەی سەرەتایی — بەرێگە تایبەتیەکەی خۆی نیشانمان دەدات کەچۆن چالاکی زیندوو بگاتە ئەوپەڕی لەلای مرۆڤی سەرەتایی. هەستکردن بەبێزاری و بێهیوایی بەتەواوەتی بزرو نادیارە لەنێو کۆمەڵگەی هەژارو کەمدەستدا.[٥٣] ئەوە شانۆیە کەتێیدا(تراژیدیا مرۆییەکانی) جیهانی پێشکەوتوو تەعبیریان لێ دەکرێت و دەخرێنەڕوو. رەنگە پاشماوەیەك لەهیوا لەشانۆگەریە کۆمیدیەکان و شانۆگەریە مۆسیقیە تەقلیدیە کۆنەکاندا مابێتەوە. بەلأم شانۆگەریە جدییەکان، ئەوا بەگشتی رەشبینی بەسەریاندا زاڵە. هەتا ئێستایش شانۆ خەریکی پەرتکردنی ئەو مژی کەماڵە* ساختەیەیە کەوا زانست داویەتی بەسەر سیمای شارستانیەتدا. زانست بەزۆری بەو شتانەوە خەریك دەبێت لەبارەی فرەیی و زۆربوونی شمەك و رێژەی تێچونی بەرهەم هێنانی بەکۆ، هەروەها لەبارەی ووزە و هێزی بەشەریەوە، لەکاتێکدا هونەرەکان ئاماژە بۆ وون بونی مرۆیی و، هەژاری فیکر و بەها ئەخلاقیەکان و، توندوتیژی و دڕندەیی و تێکچونی دەروونی لەناوجەرگەی دەوڵەمەندی و بەهێزی جیهانی پێشکەوتوودا دەکەن، شانۆ کەشفی مرۆڤێکی وەڕس و زبر دەکات کەهەمیشە دەرونێکی سەرزەنشتکەر ئازاری دەدات. شاعیران بریتین لەپێوەری هەست لەڕەگەزی بەشەریدا، لە رێگەی ترس و گومانەکانیانەوە دەتوانین ئەو بڕیارە بدەین کەجیهان بەڕێگای مرۆییانەدا ڕاناگوزەرێت، بەڵکو لەسەر ڕێگەی نامۆکردنی مرۆڤ و نامالێنی جەوهەرە مرۆیانەکەیەتی.لەساڵی ١٩٧١دا،نووسەری ژاپۆنی( یاسوناری کواباتا) کەخاوەنی خەلأتی نۆبڵە لەئەدەبدا خۆی کوشت و دوو ساڵ پێش ئەوەیش، لەساڵی ١٩٦٩دا( یوکیو میشیما) کە گەورە ڕۆمان نووسێکی تری ژاپۆنیە بەهەمان شێوە کۆتایی بەژیانی خۆی هێنا. لە ساڵی ١٨٩٥وە، سیانزە ڕۆمان نوس و گەورە نوسەری ژاپۆنی خۆیان کوشتوە، لەناویشیاندا نوسەری(راشومونو) کە

---

[٥٣] لێکۆڵینەوەکانی( گالوبۆ) Galupo لەژێر ناونیشانی (The Whole mankind,s opinion) کەلەساڵی ١٩٧٥ز پێی هەستابوو ئەوەی کەشف کرد بەپێچەوانەی ئەو رۆحە بەدبین و گوماناویەوە کەلکاوە بەژیانی خەلکەوە لەولأتە پێشکەوتوەکاندا، دەبینین گەلە هەژارەکان لەئەمەریکای باشوور و ئەفەریقادا بەچاوێکی گەشبینانەوە دەڕواننە ژیان.

* ماله الكمال : مژی کەماڵ / هەمبانە بۆرینە.

(یونوسوکو ئاکوتاجاوا) یە، لەساڵی ١٩٧٢دا. شیاوی باسە ئەو تراژیدیا بەردەوامەی ناو ڕۆشنبیری ژاپۆنی لەماوەی حەفتا ساڵی ڕابردوودا هاوکاتە لەگەڵ تێکەڵ بوون و چوونە ناوەوەی شارستانیەتی ڕۆژئاواو فیکرە مادییەکان بۆ ناو کلتورو ڕۆشنبیری ژاپۆنی. شارستانیەت هەرچۆنێك بوبێت، ئەوا لەتێروانینی شاعیران و شانۆنوسانی تراژیدیەوە هەمیشە شێوەیەکی نامرۆیی و ترسناکە لەسەر مرۆڤایەتی.(کواباتا) پێش ساڵێك لەمردنی نوسیویەتی :(خەڵکی لەیەکتری جیابونەوە بەهۆی دیواری ئەستورو شیشرێژکراوە، ڕێگا لەبەردەم خۆشەویستی و بەیەك گەیشتندا داخرا، بەناوی پێشکەوتنەوە سروشت بەزێنراوو جوانیەکان پۆخڵەکران). لە ڕۆمانەکەی دا( وڵاتی بەفرین)* کەلەساڵی ١٩٣٥ ز، بڵاوکراوەتەوە (کواباتا) نوسیویەتی: (هەستکردنی مرۆڤ بەتەنهایی و نامۆبوونی لەجیهانی نوێدا لەچەقی فیکرو بیرکردنەوەکانیەوە سەرچاوە دەگرێت). هەموو نوێنەرانی ڕۆشنبیری بڕوایان وایە کە مرۆڤ لە ناو شارستانیەتدا تووشی دۆڕان و نوشوستی هاتووە. (ئەندریە مالرو) لەبارەی چارەنوس و هیواو ئاواتەکانی چاخی نۆزدەوە دەپرسێت و هەر خۆیشی لە وەڵامدا دەڵێت :( ئەنجامەکەی بریتیە لەو ئەوروپایەی لەهەموو لایەکەوە وێرانکراوەو گەوزاوە لەخوێنیدا، ئەنجامەکەی بەتێکشکاندنی مرۆڤ و جەنگ و خوێن ڕشتن تەواو بوو لەبری ئەوەی پێی وابوو کەدروستی دەکات [٥٤]. وێنەیەکی تری لەهەمان شێوە کە(بول فالیری) ڕاستەوخۆ لەپاش شەڕی جیهانی یەکەمەوە وێنەی دەکات و دەڵێت :(لەنێو سیستەمی مەعریفی و ڕۆشنبیری ئەوروپادا هیوایەك هەیە کەبەرەو کزی و کوژانەوە دەچێت لە مەعریفەیەکدا کەنەیتوانیوە هیچ شتێك ڕزگار بکات. زانستێك کەزامدار و لێدراوە هەتا مردن لەتەماحە ئەخلاقیەکانیدا، لەئەنجامی کرداریکردنی دڕندانەی ئەو تەماحانەیەوە پیس و قێزاوی بووە. ئەو میسالیەتەی کە ڕۆژانێکی دوور و قۆناغ و نارەحەتیەکانی ڕۆژگاری بڕیوە ئەمڕۆ دەبینیت قورسترین ئازار دەچێژێت و پرسیار لەبارەی خەونە فریوەکانیەوە دەکات، واقیعیەتێك کە وەهمەکان بەجێیان هێشتوە و لێدراو زامدارەو

---

* بلاد الجلید( کیشوەری بەفرین) : Snow Coantry

[٥٤] لەوتارێکی( ئەندریە مالرو) دا هاتوە کەلە ساڵی ١٩٦٤، لەکۆنگرەیەکی ڕێکخراوی( یونسکو) دا پێش کەشی کرد.

هەڵگری چەندین تاوان و هەڵەیە. شەهوەت و ئینکارکردنی زات، هەردووکیان وایان لێ هاتوە بونەتە مایەی گاڵتە جاڕی. ئاینەکان تووشی پاڕایی و نیگەرانی هاتوون : خاچ دژی خاچە، مانگ دژی مانگە.

هەرچەندە هەندێك هەن گومان لەم حاڵەتە دەکەن، بەلاّم ئەوانەیش تووشی تێکەڵیەك هاتوون بەهۆی ئەو کارەسات و ڕووداوە زۆر خێرایانەوە، بەهۆی ئەو توندوتیژیە زۆرانەوە کەدەبنە هۆی دروستکردنی کێشەی توندو ناکۆکی قوڵ، بەشێوەیەك کە کاریگەریان لە پاش خۆیانەوە ناسرێتەوە. ڕووداوەکان یاری بەفیکرمان دەکەن وەکو چۆن پشیلە یاری بەمشك دەکات : ئەوانەی کەگومان ئامێزانە لەم حاڵە تانەدا دەڕوانن جارێك ئەو گومانەی هەیانە ونی دەکەن و جارێك دەیدۆزنەوە، وایان لێهاتوە کە ناتوانن بەشێوەیەکی سروشتی توانا عەقڵیەکانیان بەکار بهێنن.[٥٥] عەدەمیەت و فەلسەفەی عەبەسیەت، هەردووکیان بەرهەمی ئەو وڵاتانەن کەلە جیهاندا زیاتر دەوڵەمەندو پێشکەوتوون. ئەم فەلسەفەیە باس لەجیهانێکی بێ سەروبەر و نالۆژیکی دەکات، باس لەفەردێك دەکات کەبەسەر خۆیدا دابەشبووە لەڕووی دەرونیەوە ڕووخاوو تێك شکاوە، باس لەجیهانێکی کەڕو لاڵ و بێ دەنگ دەکات. لەڕاستیدا ئەمە فەلسەفەیەکی تەواو ژەهراوی نی‌یە، وەکو هەندێك کەس پێیان وایە. بەڵکو فەلسەفەیەکی قوڵە و توانای رۆشنکردنەوەی هەیە. ئەوە تەعبیرە لە بەرەنگاری مرۆڤ، لەبارەی ناڕەزایی بونیەوە بەم جیهانەی کە بە پێچەوانەی ویست و ئیرادەکانی ئەمەوە دەجوڵێتەوەوگەشە دەکات، ئەمە یاخی بوونە لەو شارستانیەتەی کەتەنها یەك ڕەهەندی هەیە[٥٦]. هەر لەبەر هەمان هۆیشە هەندێ کەس لە عەدەمیەتی نوێدا جۆرێك لەئاینیان دۆزیوەتەوە. وەکو لەپاشاندا دەبینین ئەم فکرەیە بێ بنەڕەت نی‌یە هەریەك لەعەدەمیەت و ئایین بەفیکرەیەکی نامادیانەوە دەڕوانن بوون و بەهەمان ئەم

---

[٥٥] بڕوانە( بول فالیری) Paul Valery : Colleeted Works, ed Jackson Mathews , Vol. 10 .History of Politics ( Newyork: Puntheon Books, 1956)

[٥٦] بڕوانە( کامۆ) هەروەها( مارکیۆز) : Camusl Home Revolte… marcuesione- Diamensional man(Beston : Boacen Press, 1946)

بیرۆکەیەش پێشوازی لەجیهان دەکەن. نیگەرانی سەرەتایی و، ڕوانین و پرسیارکردن لەپاش مردن، هەوڵ وکۆششی بەردەوام بۆ دۆزینەوەی ڕێگەیەك لەدەرەوەی ئەم جیهانەدا کەوای لێهاتوە مرۆڤ تییدا هەست بەغەریبی دەکات [٥٧]. ئەم بیرۆکانە هاوبەشە لەنێوانیاندا. بەڵام ئەو خاڵەی کەدەبێتە هۆی جیاکردنەوەیان ئەوەیە کەعەدەمیەت ڕێگایەك نادۆزێتەوە بۆ ڕزگاربوون، بەڵام ئایین پێی وایە ئەو ڕێگایەی دۆزیوەتەوە. نوشوستی هێنانی ئاشکرای شارستانیەت لەهەوڵی دا بۆ چارەسەرکردنی کێشەی ئاسودەیی مرۆڤایەتی لەڕێگەی زانست و هێز و سامانەوە – ئەگەر زانراو دانی پێدا نرا – ئەوا بەهێزترین کاریگەری دەروونی لەسەر ڕەگەزی بەشەری بەجێ دەهێڵێت. ئالێرەوە دەست دەکەین بەپێداچونەوەی هەندێ لەو بیرۆکەو بیروبۆچونە بنەڕەتیانەمان کە تائێستایش مایەی قەبوڵکردنن لەلای زۆربەی خەڵکەوە. یەکەم فیکرەیەکیش کەپێویستە پێیدا بچینەوە بیرۆکەی زانستی هەڵەیە لەلایەن مرۆڤەوە. مادام شارستانیەت دەستەوەسانە لەچارەسەرکردنی کێشە ئاسودەیی مرۆڤایەتیدا کەواتە دەبێت بیرۆکەی ئایین لەبارەی ئەسڵی مرۆڤەوە ڕاست و دروست بێت و بیرۆکەی زانست نادروست و هەڵە دەربچێت، لە نێوان ئەو دوانەیشدا هەڵبژاردنێکی ترمان نییە.

---

[٥٧] بڕوانە ( کامۆ ) : Camus: The Stranger:( N.Y:. Alfred Knopf, 1946)

# عەدەمیەت ( پوچگەرایی )

لێرەدا بابگەڕێینەوە بۆ خاڵە هاوبەشەکانی نێوان عەدەمیەت (پوچگەرایی) و ئایین، کە ئەمە حەقیقەتێکە عەدەمیەتی نوێ وەکو شێوەیەك لەشێوەکانی ئایین لەناو شارستانیەتدا دەخاتەڕوو. عەدەمیەت بریتیە لەئینکارکردنی ئولوهیەت بەڵکو ناڕەزاییەکە لەبەردەم نائامادەبونی دا، هەروەکو لای (بکیت) دەربڕینی ناڕەزاییە لەبەر نائامادەگی مرۆڤ، یان رەخنەگرتنە لەو حەقیقەتانەی کە مرۆڤ کائنێکی ناتەواوو ناکامڵە. ئەم هەڵوێستە لەدەوری فیکرەیەکی ئاینی چەق دەگرێت لەبارەی مرۆڤ و جیهانەوە نەك لەدەوری فیکرەیەکی زانستیانە. مرۆڤ لەڕوانگەی زانستەوە وەکو هەر شتێکی تر کەلەم جیهانەدا هەیە بونێکی ماددییانەی هەیە و هەست بەبوونی هیچ ناتەواویەك ناکرێت تێدا، بەلأم وەکو لەشیکارکردنەوەی کۆتاییدا بۆمان دەردەکەوێت کەهەموو ئەوانەی زانست باس لەبەدی هاتنیان دەکات لەبارەی مرۆڤەوە شتە نامرۆییەکانن، ئەو ووتە بەناوبانگەی ( سارتەر) کەتیایدا پێناسەی مرۆڤ دەکات بەوەی، عاتیفەیەکی بێکەڵکی بێ هودەیە، دەستەواژەیەکی ئاینیە بەهەردوو رەهەندە لۆژیکی ورۆحیەکەیەوە. لە ماددیەتدا نە عاتیفە یا بێ کەڵکی بوونیان نی‌یە، لەبەر ئەوەیش ناکرێت لەناو زانستدا بێ کەڵکی بوونی هەبێت، چونکە لەبەر ئەوە عاتیفەی تێدا نی‌یە. لەبەرئەوە ماددییەت رەفزی ئەوە دەکات کەئامانجێکی بالأ لەدروست کردنی ئەم جیهانەدا هەبێت، بەمەیش خۆی لەمەترسیەکانی بێ هودەیی و عەبەسی بوون قوتار دەکات. جیهانی ماددیەت و مرۆڤەکانی جیهانێکی کرداری و (وەزیفی) یە ئامانجی ئەو جیهانەش هەر لەوەدا خۆی دەبینێتەوە... ئەو (وەزیفە)یەش کەمرۆڤەکان لەو جیهانەدا (جیهانی ماددیەتدا) پیێ هەڵدەستن (وەزیفە)یەکی ئاژەڵیش بێت... گرنگ نی‌یە. ئەو گوزارەیەی سارتەر: مرۆڤ عاتیفەیەکی بێ هودەیە ئەو فیکرەیەی لێ هەڵدەگۆزرێت کەمرۆڤ و جیهان، لەنێوانیاندا هەماهەنگی و پێکهاتن نی‌یە، وەرگرتنی

ئەم هەڵوێستە توندەش سەبارەت بە جیهان بریتیە لەسەرەتاو دەستپێکردنی هەموو ئاینەکان. بێ هودەیی لەلای (سارتر) و عەدەمیەت لای (کامۆ) وا دەکەن کەبیرۆکەو پرۆسەی لێکۆڵینەوە بەشوێن ئامانج و مانادا گەلاڵە بێت. ئەوەیش گەڕانێکە جیاوازە لەبەدواداگەڕانیکی ئاینی چونکە لەو دوو گەڕانەی پێشەوەدا روبەڕوی فەشەل دەبینەوە. بەڵام هەر بەدواداگەڕانێکی ئاینیانە دادەنرێت، لەئەوەدا کەئەو گەڕان و لێکۆڵینەوانە بەواتای رەتکردنەوەی ئامانجی دونیایانەی ژیانی مرۆڤ دێت. گەڕان و لێکۆڵینەوە لەبارەی خواوە بابەتێکی ئاینیە بەڵام هەموو لێکۆڵینەوەیەك بەکەشفکردن تەواو نابێت. عەدەمیەت بۆ خۆی رەشبینی و نائومێدانە هۆی ئەمەیش ناگەڕێتەوە بۆ جیهان و ئەو سیستەمەی کەبەرپایە، بەڵکو بەهۆی نەمانی خەیرەوەیە لەجیهاندا. هەموو شتێك پوچ و بێهودەیە و فەنایە ئەگەر هاتوو مرۆڤ بۆ هەتا هەتایە بمرێت و مردن مەنزڵگەی هەتا هەتایی بێت [٥٨].

فەلسەفەی عەدەمیەت راستەوخۆ لەبارەی ئاینەوە نادوێت، بەڵام بەئاشکرا تەعبیر لەو بۆچونانە دەکات کەپێی وایە مرۆڤ و جیهان و هەردووکیان بەهەمان پێوەر دروست نەکراون. تەعبیرکردنێکە لەنیگەرانی، نیگەرانیش بەهەموو پلەکانیەوە- بێجگە لەئەنجامەکەی- نیگەرانیەکی ئاینیە. لەلای عەدەمیەت و لەلای ئاین مرۆڤ غەریبە لەم جیهانەدا، لەعەدەمیەتدا غەریبێکی وون و بێ هیوایە، بەڵام لەئاینیدا هیوایەك هەیە بۆ رزگاربوون. بیروبۆچونەکانی (ئەلبیر کامۆ) دەتوانین لێ یان تێ بگەین تەنها لەحاڵەتێکدا ئەگەر وامان دانا کەوا بڕوادارێکی بێ هیواو نائومێدە.

( لەجیهانێکدا کەلەناکاودا وەهمەکان ئاوابوون و رۆشناییەکان کوژابنەوە مرۆڤ هەست بەنامۆبوون دەکات، ئەمە دەرکردنێکە نەئەوەتا دەستبەرداری بیت و نەشوێنێکیش هەیە بۆ هەڵهاتن، هیچ یادەوەریەك نیە دەربارەی نیشتمانی بزرکراو و هیوایەکیش نیە بۆ گەیشتنەوە بەو زەوییەی کەیەکەم جار لێی دەرکرای (زەوی موعودە)ئەگەر

[٥٨] ﴿ أفحسبتم أنما خلقناكم عبثاً وأنكم الينا لا ترجعون ﴾ سوره : المؤمنون : ١١٥.

من درەختێك بوومایە لەنێو ئەو درەختانەدا، ئەو کاتە ڕەنگە ژیانیش مانایەکی بەخشیایە، یان لەئێستا باشتر بوایە ...ئەم کێشەیەش تەشەنەی نەدەکردو دروست نەدەبوو چونکە ئەو کاتە دەبومە بەشێك لەم جیهانەی کەئێستا بەهەموو هێزێکی ناوو ویژدانمەوە بەرەنگاری دەبمەوە ...( هەموو شتێك شیاوەو دەکرێت روبدات مادام خوا نەبێت و چارەنوسی مرۆڤیش مردن بێت)[٥٩]. ئەم دەستەواژەیەی دوایی لەهیچ شتێکدا هاوبەش نییە لەگەڵ ئەو ئیلحادە دروستکراوی کەلەلای بیرمەندە عەقڵانیەکان هەیە. بەڵکو بەپێچەوانەوە، بریتیە لەنەفرەتێکی بێدەنگ لەو ڕۆحەی کەماندووی کردوە لەگەڕان بەشوێن خواداو بێ ئەوەبشیدۆزێتەوە، بریتیە لەبێ باوەڕیەك لەئەنجامی وەرسبونەوە نەك ئینکارکردنی رووت، (ئیلحادی نائومێدانە)یە. بەهەمان شێوە (وجودیەت) یش لەمەسەلەی هەڵبژاردنی ئازادی ئەخلاقیدا هەمان ئەو هەڵوێستە وەردەگرێت کەئاین وەریگرتوە.(سیمۆن دی بوڤوار) دەڵێت: (لەسەرەتادا مرۆڤ هیچ شتێك نەبووە ئەوەیش لەسەر خۆی وەستاوە کەوا لەخۆی بکات کەسێکی خێرخواز بێت یان شەڕخواز ئەمەیش پەیوەندی بەو مامەڵەیەوە هەیە کەدەیکات لەگەڵ ئازادیدا بەوەی قەبوڵی بکات یان ڕەتی بکاتەوە. ئازادی بەشێوەیەکی ڕەها بڕیاری ئامانجەکانی دەدات، هیچ هێزێکی دەرەکیش نییە – هەتا مردنیش بتوانێت ئەو بڕیارانە تێك بشکێنێت کەئازادی دەیاندات ...مادام پێشوەخت ئەوە دیاری نەکراوە کەلەیاریەکەدا براوە دەبێت یان دۆڕاو، کەواتە پێویستە تێبکۆشین و سواری مەترسیەکان بین لەهەموو ساتێکدا).[٦٠] هەتا دوالیزمەی بونیش لای( سارتر) :( بوون لەخود) و(بوون بۆ خود) ئینکارکردنێکی ئاشکرایە بۆ ماددییەت . تەنها زاراوەکانە نوێنن، بەڵام جەوهەر وماهیەت کۆنن و دەتوانرێت بناسرێنەوە.[٦١](هیپی) یش بەشێوەیەك لەشێوەکان

---

[٥٩] بڕوانە( کامۆ): Camus: The Stranger .....

[٦٠] بڕوانە :( سیمون دی بوڤوار ) Simon de Beavvoir: L,exestentia lismeetla Sagessedes : Paris: Gallimard, 1970)) . nation .

[٦١] هەمان شت جێ بەجێ دەبێت بەسەر (اعتراف)کردن بەویژداندا ( هەموو شتێك کەلە ویژداندا ڕوو دەدات ناکرێت تەفسیر بکرێت بەهەرشتێك کەلە دەرەوەیدا بێت، بەڵکو تەنها بەو شتانەی کەلەناویدایە) بڕوانە( سارتەر) : Sartari The

بەردەوامی مەزهەبی وجودیەتە، بەتایبەت لەلایەن شێوازی کرداری و پراکتیکیەوە. رەخنەو نارەزایی دەربڕینی( هیپیە)کانیش دژبە پێشکەوتن بەچاوپۆشین لەو وەرگرتنەی کەشێوەیەکی تیژو عەبەسیانەیە ئەوا یەکێکە لەفەزیلەتە گەورەکانی ئەو بزوتنەوەیە، کەوای لێدەکات ببکاتە دیاردەیەکی رۆشنبیری رەسەن لەم چەرخەدا. ئینکارکردنی پێشکەوتنی ماددی دەتوانێت تەنها پشت بەفەلسەفەیەکی ئاینی ببەستێت، ئەگەر بەلایەنی کەمەوە لەپێشەکیە بنەرتیەکانیشیدا بێت.

ئەم رەخنەگرتنەیش لەشارستانیەت بانگەشەیەك نی‌یە بۆ رەتکردنەوەی، شارستانیەت ناکرێت رەفزبکرێت هەتا ئەگەر ئەو خواستەشمان هەبێت. بەڵام تاکە شتێك کەپێویستەو دەتوانرێت بکرێت بریتیە لەتێکشکاندنی ئەو ئەفسانەیەی کەدەوری تەنیوە. چونکە تێکشکاندنی ئەو ئەفسانەیە دەبێتە هۆی زیاتر مرۆیی بوونی ئەم جیهانە، ئەمەیش کارێکی گرنگە بەسروشتی حاڵی ئینتیمای بۆ روشنبیری هەیە.

---

Emotion, Ouitine of a Theory , trans, Bernard Frechtman( New York: Citadei Press 1971)

هەروەها بڕوانە سارتەر : شانۆی( هوی کلون)(Sarter: Theatre .Paris: Gallimard, 1947) ئەم شانۆ گەریە پێمان دەڵێت هەموو شتێك کەبوونی هەیە لەحەقیقەتدا، تەنها وەکو پەیوەندیەك بوونی هەیە لەنێوان مرۆڤێك و مرۆڤێکی تردا !

# بــەشــی ســێ یــەم

## دیــاریدەی هــونــەر

﴿ زانست هەوڵی دۆزینەوەی یاساکان و بەکارهێنانیان دەدات بەڵام کاری هونەری ڕەنگی سستەمی کەونی دەداتەوە بەبێ ئەوەی هەوڵی کەشف کردن و خستنەڕووی حەقیقەتەکانی بدات ﴾.

# هونەر و زانست

دووجیهان هەیە : جیهانێك بۆ ئامێرو جیهانێك بۆ مۆسیقا، ئەم دوو جیهانە – تەنانەت ئەگەر تا ئەوپەڕی شیکردنەویش لەگەڵیاندا بڕۆین ناتوانین بیانگێڕینەوە بۆ ئەسڵێکی هاوبەش. یەکەمیان، پێوانەیەکی (جێگەیی) چەندیە لەپەیوەندیەکان و بەشەکان و بەپێی لۆژیکی زانستی و سروشتی و بیرکاری. بەڵام دووەمیان پێك دێت لەو ڕیتم و ووشانەی کە ڕێکخراون لەئاوازێکدا یان لەناو قەصیدەیەکدا. ئەم دوو جیهانەیش سەر بە دوو مەقولەی جیاوازن کەبریتین لەزانست و ئایین، بەتایبەتی تر لێرەدا دەڵێین : دەگەڕێنەوە بۆ زانست و هونەر. بوونی جیهانێکی تر (سستمێکی تر) بەتەنیشت جیهانی سروشتەوە، بریتیە لەسەرچاوەی بنەڕەتی بۆ هەموو ئایین و هونەرێك. ئەگەر تەنها یەك جیهان هەبوایە ئەو کاتە هونەریش دەبوویە شتێکی مەحاڵ. لەراستیدا، لەهەموو کارێکی هونەریدا ئیحایەك دەدۆزینەوە کەسەرنجمان رادەکێشێت بۆ جیهانێك کەئێمە نە ئینتیمامان هەیە بۆ ئەو جیهانەو نەلێشی هاتوینەتە دەرەوە، بەڵکو تەنها مۆڵەتێکمان پێدرا تیایدا. هونەر یادەوەرییە، یان شەوقێکە بۆ رابردوو بۆ ئەو جیهانەی تر. جارێك یەکێکیان ووتی: هونەر بانگەشەیەکە بۆ خەڵقکردنی مرۆڤ، هەموو زانستێکیش لەکۆتایی شیکردنەوەیدا دەگاتە ئەوەی کەبوونێك نیە بۆ مرۆڤ، لەبەر ئەوە، هونەر لەپێکدادانێکی سروشتیدایە لەگەڵ ئەم جیهانەداو لەگەڵ هەموو زانستەکانیدا، زانستی دەروونناسی و زیندەوەرزانی، لە پێکدادانادایە لەگەڵ خاوەنەکیشیدا کە (داروین)ە ئەم بەرهەڵستیەش لەراستیدا بەرهەڵستیەکی ئاینیە، ئایین و ئەخلاق و هونەر لقی یەك سولالەن کەلە ئەنجامی کاروکردەی خواییەوە سەرچاوەیان گرتووە. لەبەرئەوە ئینکارکردنی (داریونیەت) لەبەدیهێنانی مرۆڤدا – کەخۆی پاکانەی لەمە کردووە – ئینکارکردنێکی تەواو توندڕەوانەیە نەك تەنها بۆ ئایین، بەڵکو هەروەها بۆ ئەخلاق و هونەرو یاسایش. ئەگەر بەڕاستی مرۆڤ ( بەو شێوەیە بوایە کەداروین باسی دروست بوونی دەکات) ئەگەر

بەهیچ شێوەیەك پاڵ پشتێك نەبێت بۆ مرۆڤ هیچ بوارێك نەبێت بۆ رۆح و (زاتی) ئەو، ئەوا هونەریش ئەو کاتە بوارو بوونی نەدەبوو شاعیران و نوسەرانی تراژیدیاو کارەکانیان بریتی دەبوو لەسەر لێ شێواندنمان و لە هەرایەکی بێ مانا.لەم خاڵە بڕەرو یەکلاکەرەوەیدا ئەو یەکێتیە سەرەتاییەی نێوان هونەرو ئاینمان بۆ دەردەکەوێت، بەڵکو زیاتر توندو تۆڵتریش، لەهەمانکاتیشدا ئەو مەوداو بۆشاییەشمان بۆ ڕوون دەبێتەوە کەلەنێوان هونەرو زانستدایە. ئێمە سێ پلەمان هەیە بۆ حەقیقەت کەناسراو مومکینە لەم بونەوەرەدا: مادەو ژیان و کەسایەتی، زانست یەکەمیان دەکاتە بابەتی خۆی، هونەریش ئەوەی ئەخیریان. ئەویش کە دەمێنێتەوە لەوەهمێك زیاتر نی‌یە یان خراپ تێگەیشتنە، چونکە زانست کاتێك رووبەڕووی مرۆڤ و ژیان دەبێتەوە ئەو شتانەیان تێدا دەبینێتەوە کەمردو و ناشەخصین. جۆری ئەو پەیوەندیەش کەلەنێوان زانست و هونەردایە وەکو ئەو پەیوەندیەیە کە(چەند) لەگەڵ(چۆن) دا هەیەتی. (ئوجست کۆنت) بیرکاری کەشای زانستەکانە - وای پێناسە دەکات کە (پێوانەیەکی ناراستەوخۆیە بۆ چەندێتییەکان) [1].

(جیاکومتی)یش پێناسەی هونەر دەکات بەوەی کە: (گەڕانە بەدوای مەحاڵدا) [2]. لەجیهانی مادیەتدا تەنها (چەند) هەیە، هەموو چەندێتیەکانیش دەتوانرێت بەراورد لەنێوانیاندا بکرێت، بەڵام (چۆن) لێرەدا، تەنها شێوەیەکە لەشێوەکانی (چەند). ئینگلز لەکتێبەکەیدا (جەدەلیەتی سروشت) دەڵێت: (مەحاڵە بتوانرێت گۆڕان بەسەر چۆنیەتی تەنێکدا بێت بەبێ ئەوەی ماددەیەك یان جوڵەیەکی بۆ زیاد بکەیت یان لێی کەم بکەیتەوە، واتە ئەو گۆڕانە روونادات ئەگەر گۆڕانێك بەسەر چەندێتی مادەکەدا

---

[1] بڕوانە( ئوجست کونت) Auguste Comte : AGeneral View of Positivism trans. Y. H Bridges(New york: R Speller,1957).

[2] بڕوانە :(ئەلبر توجیاکومتی) Alberto Giacometi: Alberto Giacometti With an introduction by .Michel Leiris(Basel: Editions Galeries Beteler, 1946)

نەیەت). [3] فەیلەسوفی گریکی( فیساغۆرس) ئەم بنەمای چەندییەی لەسروشتدا بەم شێوەیە دارشتوەکە :( سستمێکی هەما هەنگە لەژمارەکان وپەیوەندیەکانیان لەگەڵ یەکتریدا.[4] هەروەها (مندلیف) زانای کیمیایی روسی کەباوکی (سستمی دەورییە بۆ رەگەزەکان) دەڵێت :( خاسیەتە کیمیاویەکان بۆ رەگەزەکان بریتیە لەچەند وەزیفەیەکی خولی بۆ کێشە ئەتۆمیەکانیان) [5]. کەواتە لەجیهانی سروشتدا، تەنها چەندێتی هەیەو، پاشان چۆنیەتیەکی ڕووکارەکیش.

دووکەس نی‌یە کەلە هەموو لایەنێکەوە وەکو یەك وابن و دوو بەردیش نی‌یە کەلە هەموو شتێکدا هاوشێوەی یەك بن، ئەی ئەوە کێ‌یە کەوا لە گەردەکانی ئاو دەکات جیاواز بن ؟ ئایا بەهۆی ئەو جێگەیەوەیە کەلەبۆشاییدا هەیانە ؟ بەڵام ئەگەر وامان دانا بۆشایی بێ‌کۆتاییە، ئەو کاتە جیاوازیش ماناکەی لەدەست دەدات. زانستی سروشتی مومکینە لەبەرئەوەی کەچۆنیەتیەکان لەسروشتدا بوونیان نی‌یە، زانستی چۆنیەتیەکان یا بیرۆکەی (چۆن)یش مەحاڵە. بەڵام ئێمە دەڵێین سروشت جوانە یان ناشرینە، ئامانجدارە یان بێ‌سەروبەرە، ماناداره یان بێ‌مانایە. کەواتە، دەکرێت لەسروشتیشدا چۆنیەتیەکان هەبێت، هەر بەو شێوەیەشە، بەڵام ئەمە تەنها بەنسبەت یەك بابەتەوەیە، بەنسبەت مرۆڤەوە (لێرەدا نوسەر دەیەوێت بڵێت ئەو چۆنیەتیانەی لەسروشتدا هەن دەگەڕێنەوە بۆ مرۆڤ، مرۆڤ چۆنیەتیەکانی سروشت دیاری دەکات گەرنا دونیای سروشت دونیای چەندیەتیە نەك چۆنیەتی ( وە. ك) چۆنیەتیەکان لەلایەنی بابەتیەوە بوونیان نی‌یە، سروشت بۆخۆی یەك رەگەزو بێ لایەنە.

---

[3] بروانە :( فردریك ئەنجلز) Friedrich Engels : Dialectis of Nature , trans. Clemens Dutt (.London: Laurence and Wishart , 1941)

[4] بروانە :( فردیك یونگ) : Frederick H. Young: Pythagorean Numbers.

[5] بروانە :( دیمتری مندلیف) : Dimitri I. Mendeljev : The Principles of Chemistry , 5th .ed., trans. George Kamenshy,( London: Longmans – Green,1981).

بەقەصیدەیەکدا یان لەئاوازو تابلۆیەکی هونەریدا ڕووبەڕووی نهێنیەك یان چۆنیەتیەك دەبینەوە بەمانای میتافیزیکی ووشەکە، باشە چۆن دەتوانرێت راڤەی ئەو جیاوازیە بکرێت کەلەنێوان تابلۆیەکی ئەسڵی و نوسخەیەکی کۆپیکراودا هەیە بەهۆی چەندەوە؟ نوسخە ئەسڵییەکە خاوەنی چۆنیەتی جوانیەکەیە (هەموو کۆپی کراوێکیش ناشرینە)[٦] ئایا ئەو جیاوازیەی کەدروست بوو لەوەوە هات کەوا شتێك لەنوسخە کۆپیکراوەکەدا زیادیکردوە یان کەمیکردوە، بەمانای چەندی ووشەکە ؟ نەخێر ...بەڵکو جیاوازیەکە لەزەوقە شەخصی و مامەڵەکردنە کەسییەکەدایە کەلەنێوان هونەرمەندو کارە هونەریەکەدا لەنوسخەی ئەسڵی و یەکەمیاندا هەیە و لە نوسخەکۆپی کراوەکەدا نی‌یە.

زانست و هونەر، تێیاندا جەوهەری ئەو جیاوازیە شاراوەتەوە کەلەنێوان نیوتن خاوەنی بیردۆزە ئالیەکان لەمەڕ کەون لە نێوان شکسپیردا، ئەو شاعیرەی کەهەموو شتێك لەبارەی مرۆڤەوە دەزانێت هەیە، نیوتن و شکسپیر، ئەنشتایین و دیستۆفسکی، دوو بیرۆکە دەخەنەڕوو کەهەریەکەیان بەئاڕاستەی پێچەوانەی ئەوی تریاندا دەڕوانێت، یان نمایشی دوو جۆر لەمەعریفە دەکەن کەبەتەواوەتی لەیەك جیان و هەریەکەشیان سەربەخۆیەو پەیوەندی بەئەوی ترەوە نی‌یە، هیچ کامێکیشیان نەپشت بەئەوی تر دەبەستێت ونە شوێنیشی دەکەوێت.

کێشەی چارەنوسی مرۆڤ و نامۆیی لەم کەونەدا پوچەڵیەتی و، مردن و، رزگاربوون لەم کێشەو گرفتانە، هیچ یەکێك لەمانە ناکرێت ببێتە بابەتی زانستێك لەزانستەکان. لەکاتێکدا هونەر – هەتا ئەگەر هەوڵیش بدات – ناتوانێت چاوپۆشی لەم کێشانە بکات. شیعر بریتیە لە (مەعریفەی مرۆڤ) زانستیش بریتیە لەمەعریفەی سروشت. ئەم دوو جۆرە لەمەعریفە هاوسەنگ و هاوکاتن، هەریەکەیان سەربەخۆو جیایە لەوی تر، جیهانی هەریەکێکیشیان هاوڕێك وهاوکات و سەربەخۆیە.

---

[٦] بڕوانە :( ئیمیل تشارتیر) Emile Chartier( Alain): System des beaux art ,( Paris: Gallimard, , 1958).

دەروازەی جۆری یەکەم لەمەعریفە بریتیە لەتێفکرین و شیکارکردن و تێبینیکردن و ئەنجامدانی تاقیکردنەوەکان لەجیهانی ماددەدا، کەبریتیە لە (کۆی شتەکان و کردەوەکان کەپەیوەستن بە پەیوەندیە هۆکارییەکانەوە) بەڵام جۆری دووهەم بۆ ناوەوەی مرۆڤ دەڕوانێت و کەشفی گۆشە شاراوەکانی و نهێنی‌یەکانی دەکات، لێرەدا ئەو تێگەیشتنەمان بۆ دروست دەبێت، یان زۆرجار لەڕێگەی راوێژکردن بەویژدانمانەوە خەملاندن لەو بارەیەوە ئەنجام دەدەین، لەڕێگەی خۆشەویستی و موعاناتەکانمانەوە هەڵیان دەسەنگێنین. مەعریفە لێرەدا بەڕێگەیەکی عەقڵانی زانستیانە بەدەست نایەت[٧].

---

[٧] بەتێڕوانین لەم گۆشەیەوە، فەلسەفە دادەنرێت بەوەی کەلە زانستەوە نزیک تربێت زیاتر لەهونەر، سەرەڕای ئەوەی کەبابەتی لێکۆڵینەوە لەهەر یەکێکیاندا جیاوازە، بەڵام هەردوکیان هەمان میتۆدی عەقڵانی بەکاردەهێنن، وەهەموو بیرکردنەوەیەک چ زانستیانەبێت وەیان فەلسەفیانەبێت، دەبێتەهۆی هەمان ئەنجام یان چەند ئەنجامێکی هاوشێوە. فەیلەسوفە عەقڵانیەکان لەچاخی هەژدەهەمدا شێوازێکیان وەرگرتبوو کەپێی دەوترێت مەنهەجی هەندەسی، هەروەها پێی دەوترێت( البدهی) بەڵگەنەویستی لەباسکردنی تیۆرەفەلسە فیەکانیاندا( ئیسبنۆزا) بەخاوەنی ئەم مەنهەجە دادەنرێت لەباسەکانی کتێبەسەرەکیەکەیدا بەناونیشانی( ئەخلاق) سودی لەم مەنهەجیەتە هەندەسیەوەرگرتوە کەهاو شێوەی هەندەسە ئیقلیدیەکەیە، پاشان پێناسە و بەڵگەنەویستەکانی و تیۆرەکانی داڕشتوەتەوە کەلەڕێگەی پەیڕەوی کردنی ئەم مەنهەجەوە بەرهەم هاتوون. بڕوانە کتێبی( ئیسبنۆزا) : Benedictus de(Baruch) Spinoza Ethics, trans. George Eliot(Salzburg Institut Fur Ang listikund Americanikstik, Universitat Salzburg, 1981)

(نیکولاس مالبرانش) هەمان ئەم مەنهەجەی بەکارهێناوە، وەهەموو بیرۆکەکانی لەبارەی جیهانەوە لەژمارەیەکی کەمی نە و بنەماوەن و ئاشکرایانەوە هەڵگوزیوە کەلەلایەن هەموانەوە قەبوڵ کراوە بڕوانە : Nicolas Malebranch De la recherche de la verite ou l,on trait de la nature de l,esprit de l,homme, et de l,usage qu,il en doit fait Pour l,eviter l,erreur de sciences, de Sciences ,( Paris: J ,Vrin, 1945).) (

( کریستین وولف) تێکڕا سستەمە فەلسەفیەکە پێکهاتوەلە( الکونیات ومبحث الوجود)، هۆکارەکانی نەخۆشیەکان و دەروونناسی و یاساو لۆژیک، لەڕێگەی بەکارهێنانی مەنهەجێکی عەقڵانیەوە بونیادناوە . فەلسەفە، هەتا کاتێکیش دێتە سەر باسکردنی مرۆڤ و ئەخلاق و دەیانکاتە بابەتی خۆی، وەکو زەرورەتێک هەر لەسەر زەوی سروشت دەمێنێتەوە. پاشان دەتوانێت سود لەمەنهەجەکانی بیرکاری و هونەر و) هەڵدۆزینی عەقڵی وەربگرێت، ئەمەیش ئەوەمان بۆ ڕوون دەکاتەوە کەبۆچی فەلسەفە نەیتوانیوە دەکاتە حەقیقەتی تەواو لەبارەی ژیانەوە.

ئەم تایبەتمەندیە( جَوانیة)ی هونەر لەحەقیقەتێکی تری جیاوازو بەرچاویشدا ڕەنگ دەداتەوە، ئەوەیش ئەوەیە کەبۆ ئەفراندنی کارێکی هونەری بوارێك نیەیە بۆ کارکردنی کۆمەڵی. چونکە هەموو کارێکی هونەری بەبەردەوامی پەیوەستە بەکەسێتی هونەرمەندەوە. کاری هونەریش – لەو ڕووەوە کە ئەفراندنەو( پیشەسازی مرۆڤە) [8]. بەروبومی ڕۆحە، لەم ڕووەوە کردەوەیەکە بەش بەش نابێت. بەڵام لەزانستدا، کاری بەکۆمەڵی مومکینە چونکە بابەتی زانست پێکهاتوە لەبەش بەش و پۆلێنکاری، لەبەر ئەوە ڕەخساوو گونجاوە بۆ شیکردنەوەو جیاکردنەوەو دابەشکردن ، زانست تێکڕا – هەر لەسەرەتایەوە تائەمڕۆ – لەزۆربەی حاڵەتدا بریتیە لەبەردەوامیەکی ئالیانە، ئەوەی کە دێت تەواوکاری کاری ڕابردوە. بەڵام ئەمە لەهونەردا مەحاڵە. نەخش و نیگارەکانی سەقفی کەنیسە (سکستین) ناکرێت بەهۆی کۆمەڵێك هونەرمەندەوە وێنە بکێشرێت سەرەڕای ئەوەی کە تەواوکردنی ئەو کارە تەمەنێکی پێچووە، بەڵکو ئەوە تەنها یەك هونەرمەند هەستاوە بەئەنجامدانی. هەر ئەمەیش بەسەر شیعرو مۆسیقادا جێبەجێ دەبێت. ئەمە کێشەی شتێکی فەردی و سادەیەو ناکرێت دابەش بکرێت، کێشەی شتێکە ناکرێت بەش بەش بکرێت و لەهەمانکاتیشدا پارێزگاری لەژیانی بکەیت. ئەو ڕایەش کەبەپێچەوانەی ئەمەوەیە دەڵێت کە کاری بەکۆمەڵی توانیویەتی ئەنجامی باش و سەرکەوتوو بەدەست بهێنێت لەهونەری بیناسازیدا – هەروەکو بوهاوس و چەند کەسێکی تریش پێیان وایە [9]. لەڕاستیدا ئەوە خراپ حاڵی بوونە لەجەوهەری مەسەلەکە. دروستکردنی بینایەك لەئەنجامی بەکارهێنانی کۆمەڵێك کەرەستەی بیناسازی و کاری تەکنیکەوە دێتە بەرهەم، ئەمەیش کارێکە گونجاوەو دەرەخسێت

---

[8](بڕوانە :( مایکل ئەنجیلۆ بیوناروتی) Michelangelo Buonarroti: Complete Poems and Selected Letters of Michel Angelo ,3 rd ed. trans , Creighton. Gilbert( Princeton , NJ : Princeton University Press, 1989).

[9]( ئیکهارد نیومان : Echard Neumann: Bauhaus and Bauhaus People : Personal Opinions and Recollections of Former Bauhaus Members and their Contemporaries , trans. Eva Richter and Alba Lorman.(New york: Van Nostrand Reinhold , 1970).

لەگەڵ کاری بەکۆمەڵدا، بەڵام شێوازو بیرۆکەو لایەنە هونەریەکانی بیناکە، ئەوا هەمیشە کارێکی تاکە کەسیەو دەگەڕێتەوە بۆ ئەو هونەرمەندەی کەپێی هەستاوە زانست هەمیشە، کەشفی ئەو شتانە دەکات کەلێکچوو هاوشێوەو هەماهەنگ و نیشتەجێی هەمیشەیین بەڵام هونەر، (گەشەکردنێکی نوێیە بەردەوامی) [10]. کاری زانست پرۆسەیەکی کەشفکردنە، بەڵام هونەر ئەفراندنە. ئەو تیشکی ئەستێرە دوورەی کەزانست کەشفیکردوە پێشی ئەو کەشفکردنەیش هەر بوونی هەبوە، بەڵام ئەو تیشکەی کەهونەر دەیخاتە سەرمان، ئەو تیشکە لەهەمانکاتدا هونەر خۆی دایهێناوە، بەبێ ئەو ئەفراندنە هونەریە ئەو تیشکە نەدەبوو لەدایك بێت. زانست لەناو پانتاییەکانی بووندا ئیش دەکات، بەڵام هونەر بۆ خۆی داهێنانەو بونیادێکی نوێیە، زانست وردبینە بەڵام هونەر راستگۆیە. بڕوانە بۆ تابلۆیەکی سیمای مرۆڤ یان دیمەنێکی سروشتی ... تاچ رادەیەك راستگۆییان تێدایە !؟ دیارە ئەو راستگۆییەکە لەوێ دایە زۆر زیاترە لەو راستگۆییەی کەلەوێنەیەکی فۆتۆگرافی یان دیمەنێکی سروشتیدا هەیە.

وەکو فێربووین : هونەری ئەکادیمی نادڵسۆز وێنەی سیمایەکی مردوو دروست دەکات یان وێنەی کەسێك دەکێشێت کەبە دوورو بێئاگایە لەکەسێتیەکی زیندوو ئازاد. ئەمەیش لەجەوهەریدا هەمان ئەو داڕمانەیە کەتووشی دەبێت بەهۆی نەفیکردنی ئەو رەهەندە (جَوانیة) وە کە بۆ ئازادی هەیە لەژیانی مرۆڤدا. هەموو شیکارە بایۆلۆژی و دەرونیەکان بەشێوەیەك لەشێوەکان راست دەردەچن، لەگەڵ بەکارهێنانی ووردی و دروستکاریدا و لەگەڵ پێدانی کاتی پێویست و خستنە بەردەستی سەرچاوەی ماددی پێویست بۆ لێکۆڵینەوە. لەگەڵ ئەمەیشدا، ئەو شیکاریانە راستگۆنین، چونکە دوو رەگەزی هەرە گرنگ هەن کەوونن ئەویش بریتیە لەژیان و ڕۆح. لەم لایەنەوە، زانستە ووردەکاریەکان دادەنرێن بەزانستێکی رووکەشیانە.

---

[10] (جان کاسو : Jean Cossou: Art and Confrontaion: The Arts in an Age of Change , Nigel Foxell( Crees Wick, Ny: New york Graphic Society 1970)...trans

هونەر خۆی لەحەقیقەتەکان دەشارێتەوە – بەڵکو بەئەنقەست ئەو کارە دەکات – بەشوێن ڕاستگۆییدا دەگەڕێت لەشتەکاندا. لەبەرئەوە دەبینین کەهونەری تەجریدی زیاتر کار لەسەر ناوەڕۆك دەکات و بەرەولابردنی هەموو ئەو شتانە دەڕوات کەبەشێوە و ڕووکاری دەرەوەی جیهان دەچن، هەوڵ دەدات کەمانایەکی ڕۆحیانە بەشێوەو ڕەنگ بدات، هەروەکو (ستلر) لەو بارەیەوە دەڵێت تەجرید ئەوەیە: وێنە لەهەموو گرنگی پێدانێکی دەرەکی ڕووت بکەیتەوە).[11] زانست هەوڵی کەشفکردنی یاساکان و بەکارهێنانیان دەدات، بەڵام کاری هونەری ڕەنگی سستمی کەونی دەداتەوە بەبێ ئەوەی هەوڵی پرسیارو پەردەلادان لەسەر حەقیقەتەکانی بدات – لەبەر ئەوە، (فرانسیس بیکون) کەبەباوکی زانستی ئەورووپی دەژمێرێت – بەڕونی جەخت لەسەر لایەنی وەزیفی یان سودبەخشی زانست دەکاتەوە، کەدەڵێت:(مەعریفەی ڕاستەقینە تەنها ئەو مەعریفەیەیە کەدەبێتە هۆی زیادکردنی هێزی مرۆۋ لەجیهاندا)[12] لەکاتێکدا (کانت) باس لە(سوودی بێ ئامانجی شتی جوان دەکات).[13] قەصیدەیەکی شیعری، نەکارێکی وەزیفی‌یەو نەپەیوەستە بەبەرژەوەندیەوە، نەسیستەمێکی کۆمەڵیشە [14]. وێنەکێشی فەرەنسی( دی بیفیە) ئەو چەمکە جوان و ڕازاوەیەی هونەر تێك دەشکێنێت بەبێ ئەوەی بەشوێن واژەکاندا بگەڕێت و، دەڵێت :(هونەر لەجەوهەریدا نابێتە هۆی حەوانەوە، و سودی تێدا نیە، دژی کۆمەڵگەیەو ترسناکە، ئەگەر خاڵی بوو لەهەموو

---

[11] بروانە( ویستلر): Whistler :n. P. d.:

[12] بروانە:( فرانسیس بیکون) Francis Bacon : The Advancement of Learning and New Atlantis( London : Oxford University Press, 1966)

[13] بەڵگەی بەهێز هەیە لەسەر ئەوەی کەشەڕ هاندەرێکە بۆ زیاتر لێکۆڵینەوەی زانستی، لەو چەند ماوەییانەدا کەلێکۆڵینەوەی زانستی چڕوپڕ دەستکەوتەکانی تەکنەلۆژیا بەدەرکەوتن هاوکات بوو لەگەڵ جەنگەکان و ڕوو بەڕوو بونەوە توندەکان، وەئەویش کەوا بەئاشکرا دەبێتە سەلمێنەرێك بۆ ئەمە جەنگی جیهانی دووەم و ئەو ئاشتیە تاڵەیە کەبەدوایدا هات.

[14] بروانە( فلادیمیر مایاکوفسکی : Vladimir Mayakovski : How Are Verses mode?, trams, G.M. Hyde( London : J. Gape,1970)

ئەم شتانە ئەوا دەبێتە درۆ یان پەیکەرێك بۆ نمایشکردنی جلو بەرگ)[15]. زانست هەتا ئەگەر بگاتە ئەو پەڕی قوڵبونەوە یان ئاڵۆزی، ئەوا هەست بەناتوانایی زمان ناکات وەکو ئالەتێك بۆ تەعبیرکردن لەخۆی، بەڵام هونەر بەهۆی ئەو تایبەتمەندیە ڕۆحیەوە کەهەیەتی هەمیشە بەشوێن ئامرازی تردا دەگەڕێت بۆ تەعبیرکردن لەخۆی، بەدوای زمانێکی تر ( اضافي) دا دەگەڕێت. زمان دەستی مۆخە ، مۆخیش بریتیە لەبەشێك لەبەشەکانی بونیادی جەستەمان، بەشێکە لەو قەوارە فانیەمان، ووشەو پیتەکان وایان لێ هاتوە کەبونەتە گەورەترین ئامرازی زانست کەیارمەتی مرۆڤ دەدەن بۆ بەردەوام بوونی شارەزاییە زانستیەکان. نووسین هاوڕێك وگونجاوە لەگەڵ زماندا، زمانیش لەگەڵ فیکردا، هەموو ئەمانەیش لەداڕشتنی زیرەکیەوەیە. لەبەر ئەوەیە کەزمان دەستەوسانە لەتەعبیرکردن لەتەنها جوڵەیەك لەجوڵەکانی ڕۆح[16]. لەزماندا هاوواتاییەکی زمانەوانی نیە بۆ سمفۆنیای نۆیەمی بتهۆڤن، ناکرێت ((هاملت)) وەربگێڕێت بۆ سەر زمانی زانست، یان ئەو درامایە بچوك بکرێتەوە). بۆ کۆمەڵێك کێشە لەدەروونناسی و ئەخلاقدا. نوشست هێنانی دەروازەی شیکاری لەم بوارەدا پێویستە شتێکی لێوە فێربین. لەکاتی نمایشکردنی شانۆگەری ( پادشا لیر) دا ((بیتر بروك)) واپێناسەی کرد کە(( چیایەکە ناتوانرێت بگەیتە ترۆپکەکەی، و هەرگیزیش نابەزێنرێت)).[17] بۆ ئەوەی بگەینە جەوهەرێك کەڕۆحی بێت، پێویستە هەریەکە لەفیکرو زمان بەتەنیشت یەکەوە بخەینەڕوو. لەکارەکانی (جۆیس)دا بۆ نمونە، لەڕۆمانە

---

[15] بڕوانە :( ئەندریاس فرانزکی) Andreas franzke : Dubuffet, trans. Robert Erich Wolf(New york:Abraham, 1981).

[16] لەوێنەدا ووشە نائامادەییەکی تەواوی هەیە، جیهانێکی بینراوو تایبەتەو مرۆڤ تێیدا زاتی ڕازی دەبێت، جیهانێکە زاتیانە پەیدادەبێت، حاڵەتێکی میتافیزیکیە ڕەخنەگر ناتوانێت باسی لێ بکات چونکە ئەو پشت بەزمان نابەستێت
بڕوانە:((کامیللی براین)) Camille Bryen. Bryen abhomme, ed. DanielAbadie Brusels: La Connaissance, 1973).

[17] بڕوانە :(بیتر بروك) : Peter Brook : Peter Brooks Production of William Shakes pear s AMidsummer Nights Dream for The Royal Shakespear Company, ed. Glenn Loney(Chicago: Dramatic Publishing Co. , 1974).

ناسراوەکەی دا، ((یولیس)) چەندین ووشەی نامۆمان بەرچاودەکەوێت لەووشەی زمانەکانی تردا.[۱۸]

ئەم حاڵەتە سەرسوڕمێنە کەلە بینینی ئەو وشانەوە دروست دەبێت بەهەمان شێوەی ئەو حاڵەتەیە کەلەکاتی خوێندنەوەی سەرەتای چەند سورەتێکی قورئانیدا دووبارە دەبێتەوە لەکاتێکدا چاومان بەو پیت و پێکهاتەی چەند پیتێك دەکەوێت کەنامەئلوفن لەزمانی عەرەبیدا، ئەخلاق و میتافیزیکا و بیروباوەڕەکان لەرێگەی حەکایەت و نمایشە شانۆییەکانەوە دەگوێزرێنەوە، یان لەرێگەی زمانی سەماوە بەبێ بەکارهێنانی ووشە، هۆیەکیش هەیە بۆ ئەو بیروباوەڕەی کە پێی وایە سەماکردن مێژووی دەرکەوتنی کۆنترە لەزمان. دۆزینەوەی سەما لەچاخە کۆنەکاندا هاوکاتە لەگەڵ بوونی زمانێکی پڕ لەکەموکوڕی و سادەدا. دەستەوسانیش لەبەرزبونەوە بۆ ئاستی هونەر بەبەکارهێنانی ئامرازە عەقڵی و لۆژیکیەکان، کورت ناکرێتەوە بۆ تەنها لەیەك بەش لەبەشەکانی هونەردا، یان لەشێوازێك لەشێوازەکانیدا. ئەو بۆچون و باوەڕە باوەی کەپێی وایە (واقیعیەت) زیاتر نزیکە لەمرۆڤەوەو دەتوانێت لێی تێبگات زیاتر لەکاریگەریەت و سوریالیەت، بیروڕایەکی هەڵەیە ئەگەر هاتوو هونەر لەئەسڵ و جەوهەریدا کرابوویە بابەتی گرنگی پێدان و بەهەندگرتن.. نهێنی (مۆنالیزا) کەمتر نییە لەنهێنی تابلۆی (عذارى أفينون)ی بیکاسۆ کە بووە هۆی دەستپێکردنی شۆڕشی تەعکیبی لەئەورووپادا. جەوهەری کارە هونەریەکان ئاڵۆزن ئاڵۆزیەك کەپەیوەندی بەحاڵەتە ناوخۆییەکانی مرۆڤ و هەستکردنی بەئازادیەوە هەیە، هەموو ئەو هەوڵانەی کەدراون بۆ پێناسەکردنی جەوهەری هونەر پێناسەکردنێکی عەقڵیانە تووشی فەشەل و نوشستی و هاتونەتەوە، وەکو چۆن هەموو ئەو هەوڵانەیش تووشی نوشستی هاتوونەتەوە کەویستویانە بەهەمان رێگەو هەمان شێوە پێناسەی ژیان بکەن.[۱۹]

---

[۱۸] بڕوانە :(جیمس جویس) James Joyce : Ulysses( New York) :( Random House,1946).

[۱۹] پێناسەی( هویژر) ئەوەی سەلماند کەهەرپێناسەکردنێك بۆکاری هونەری بریتیە لەپێناسەیەکی فاشل وە دەڵێت( کاری هونەری شێوە و ناوەڕۆکە، ئیعتراف و وەهمە، دیاری و پەیامە، نزیکە لەسروشتەوەو دووریشە لێیەوە ، ئامانجدارەو

# هونەرو ئایین

ئەو هەولأنە سەرەڕای ئەوەی کەناتەواون و بەڵکو شکستخواردوشن، هەروەکو لەپێشیشەوە باسمان کردن، بەلأم بەڕێگەیەکی ئالۆز ئامارە بەبونی پەیوەندیەکی توندوتۆڵ دەکەن لەنێوان هونەرو ئاییندا،(شیعر بریتیە لەبەرهەمی ئەو پەیوەندیەی کەلەنێوان ڕۆح و حەقیقەتدا و لەنێوان سەرچاوەکەیاندا هەیە ...کە(الله) یە) [٢٠].

((هەموو قەصیدەیەك قەرزارە بەهۆی تایبەتمەندییە شیعریەکەیەوە بۆ ئامادەگی و شەوق وکاریگەریە یەکگرتوییەی کەهەیەتی بۆ حەقیقەتێکی ئالۆز کەناو دەبرێت بەشیعری خالیس). [٢١]

((شیعر هەڵقوڵاوە وەکو ئاگاییەکی ڕاستەوخۆ سەبارەت بەو نهێنیە گەورەیە کەوا ژیانمان لەبارەیەوە دەپرسێت، و لغزێکی گەردونی بەسەریدا زاڵبوە. [٢٢]

((شیعر ئەو هەوڵە کەشفکەرەیە ئەو کلیلەی دۆزیوەتەوە کەوا خۆشی و کامەرانیەکانی ڕابردووت بەسەردا دەکاتەوە)). [٢٣]

---

ئامانجیشی نیە، مێژوییەو نامێژووییشە، کەسیەو سەروکەسیشەوەیە لەهەمانکاتدا، بڕوانە : Arnold Hauser : The Social History of Art, trans. Stanley Good man(New York: Knepf, 1951).

[٢٠] بڕوانە :( جاك مارتیان) : jacques maritain: The Situation of Poetry: Four Essays on the Relation Between Poetry, mysticism, magic and Knowledge trans...(New York : Philosophical Library, 1955).

[٢١] بڕوانە :(( ئابوت بریمۆن)) : Abbot Bremon: Pure Poetry( n.p., n.d) .

[٢٢] بڕوانە :( رولاندد ی بنیفیل)) : Roland de Peneville: Poetic Experience( n.p., (nd.

(( هونەر وەکو بەدیهێنەرێك، بەتایبەتی تر شیعر وەکو ڕێگەیەك بۆ بوون – هەوڵێکی زۆر دەدات بۆ ئەوەی ببێتە بەدیل بۆ ئەو شتانەی کەپیرۆزن ... شیعر – چ وەك مەعریفەیەك دەرکەوتبێت یان وەکو شێوازێکی ژیان یان هەردووکیان پێکەوە – مرۆڤ بەرزدەکاتەوە بۆسەرو ڕەوشە مرۆییانەکەی بۆ ئەوەی ببێتە پیشەیەکی پیرۆز))[٢٤].

ڕەنگە زۆرینەی خەڵك هیچ بیرۆکەیەکیان لانەبێت سەبارەت بەوێنەکێشان یان هەڵکۆڵین یان ئەدەب، بەقەدەر ئەوەیش ڕەنگە بێئاگابن لەهونەری بیناسازیدا، بەڵام لەڕێگەی ئەزمونی لەدایکبوون یاخود مردنەوە، یاخود لەڕێگەی کەسێکەوە، مومارەسەی ئەم شعورە ئاڵۆزو باڵایە دەکەن کەهەموو ئاینەکانی لەسەر وەستاون.[٢٥]

زۆرکەسیش هەن کەپێیان وایە ڕۆمانەکانی (کافکا) دەتوانرێت لێیان تێبگەین تەنها کاتێك ئەگەر وەکو جۆرێك لەچیرۆکە ئاینیە ڕەمزیەکان مامەڵەیان لەگەڵدا بکرێت، هەروەها (کافکا) خۆیشی دەڵێت لەپرسیارەکانیدا جۆرێك لەنوێژ دەبینێتەوە.(( کەون پڕە لەهێماو نیشانەکان ناتوانین تێیان بگەین )).[٢٦]

(مایکل لایریس) سوریالیەکی ناسراوە دەڵێت :( من بڕوام بەهیچ شتێك نییە هەتا بەئولوهیەتیش، بڕوام بەبوونی جیهانێکی تریش نییە. بەڵام بەخۆشیەوە لەبارەی ڕەهایی ومانەوەی هەتاهەتاییەوە دوواوم ...هەستێکی ئاڵۆز بەسەر شعورمدا زاڵبوە

---

[٢٤] بروانە :( جان بابتیست) : jean- BaptistA. Rimbaud: The Poet s Vocation...(Austin: Humanities Research Center,University of Texas press, 1967.).

[٢٤] بروانە :( جایتان بیکۆن) : Gaetan Picon: Contem Porary French Literature, 1945 and after , trans...( New York: 4. Ungar co., 1974).

[٢٥] بروانە( ئەندریە مالرۆ) : Andre malraux: Voices of Silence( New York: Double day, 1953).

[٢٦] بروانە :( فرانزکافکا) : Franz Kafka : Parablesand Paradoxesin German and English ( New York: Schocken Books, 1958).

وای لێکردوم هیوای ئەوەم هەبێت کەموعجیزەی شیعری هەموو شتێك دەگۆڕێت، و من لەجیهانی خلوددا بۆ هەتاهەتایی دەژیم، بەو شێوەیە توانیومە وام لێ دێت کە وەکو مرۆڤێ لەرێگەی وشەکانەوە غەزووی چارەنووسم بکەم ).[27]

کەواتە کێشەکە لەهەمووڵا هەر یەکێکە، کێشەی ئیلهامی مرۆییە کەبەچەند رێگەیەکی جیاواز تەعبیری لێدەکرێت.

ئایین جەخت لەسەر (خلود) و( رەها) دەکاتەوە، ئەخلاقیش جەخت لەسەر چاکەو ئازادی دەکاتەوە، هونەریش جەخت لەسەر مرۆڤ و بەدیهێنان دەکاتەوە. هەموو ئەمانەیش لەبنەڕەتیدا چەند لایەنێکی جۆراوجۆری یەك حەقیقەتی (جوانی)ن، کەبەزمانێك تەعبیری لێکراوە رەنگە ئامرازێکی کەم تواناو هەژار بێت لەتەعبیرکردندا بەڵام تاکە ئامرازێکیشە کەوا فەراهەم ببێت.[28]

لەریشەی ئایین و هونەردا یەکیەتیەکی مەبدەئی هەیە. درامایش ئەسڵێکی ئایینی هەیە، چ لەلایەنی بابەتیەوە بێت، یان لەلایەنی مێژووییەوە. لەڕابردوودا پەرستگاکان یەکەمین تەختی شانۆ بوون. بەئەکتەرو جلوبەرگ و بینەرەکانیشەوە. بەرایی شانۆ دراماییەکان سروتێك بوون کەلە پەرستگاکانی میسریە کۆنەکاندا دەرکەوتوون لەپێش چوارهەزار ساڵەوە. دراما گریکیەکان لەگۆرانیەکانی کۆڕاڵەوە وەرگیراون کەلەستایش کردنی (دیونیسوس)ی خواوەندا دەوتران، شانۆکانیش لەتەنیشت پەرستگاکەیەوە دروستدەکران، نمایشە شانۆییەکان بەردەوام دەبوون لەکاتی ئەو ئاهەنگانەدا کەتایبەت بوون بەپەرستنی(یونیسوس)وە، وەکو بەشێك لەخزمەتی ئایینی).[29]

---

[27] بڕوانە :( مایکل لیریس) : .Michel Leiris: The Age of man , n. p.d

[28] بڕوانە :( جول مونرو) : jules mounerot: La poesie moderne et Le Sacre( n.p.d)

[29] بڕوانە :( موریس بلوك) : Maurice E. Block : Death and Regeneration of Life New York: Cambridge University Press, 1982.

(ئەسڵی دروشمی بۆ شانۆو بۆ رۆشنبیری بەشێوەیەکی گشتی گومانی تێدا نییە، پشت بەبنەڕتێك دەبەستێت لە بەڵگەی مێژووی وورد)[٣٠].

لەڕابردوودا درما نەك (لاهوت) ئامرازێکی تەعبیرکردن بووە لەئایینی حەقیقی و گرفتە ئەخلاقیەکان بەشەر. ئەو سروشتە دوانیەی دراما بەئاشکرا رەنگدەداتەوە لەدەمامکدا [*]، کەئیلهام دەبەخشێت بەئایین و بەدرامایش لەهەمانکاتدا.

لەڕابردودا وێنە سەرەتاییەکان و پەیکەرو گۆرانی و سەماکان بەشێك بوون لەدروشمەکان، لەدواییدا جیابونەتەوە لەپەرستش وسەربەخۆبون. لەکاتێکدا مرۆڤی سەرەتایی وێنەی ئاژەڵێکی دروستکردوە کەویستویەتی و سووربووە لەسەر ئەوەی راوی بکات – کەپێی دەوترا (سیحری ڕاو) لەو کاتەدا ئەوە جۆرێك بوە لەپەرستش، جۆرە نوێژکردنێك بووە بۆ ئەوەی سەرکەوتوو بێت لەکارەکەیدا. هیندیە سورەکان لەکاتی مەراسیمە ئاینیەکانیاندا وێنەی هێڵی ڕەنگاو ڕەنگ و جۆراو جۆریان لەسەر لم دەکێشا. ئەو هێڵانەش دەبونە بەشێکی تەواوکەری دروشمەکان. بالیەی ژاپۆنی کۆن کەپێی دەوترێت( چیجاکۆ)– بەپێی بیرو باوەڕی ژاپۆنیەکان کاتێ هاتۆتەبوون ((لەگەڵ بەدی هێنانی کەوندا)) ئەو شانۆگەریە کۆنانە کەلەو سەردەمانەدا نمایش دەکران تێکەڵەیەك بوون لەگۆرانی و سەماو تەعبیرکردن بەشێوەی جوڵانەوەی بێدەنگ، کەبەشێوەیەکی هێمایی نمایشی ژیانی پۆژی دوایی رۆحی مردوەکانی دەکرد. لەو ماوەی ڕابردودا لەپێش ئیسلامەوە، شاعیری عەرەبی خاوەنی کەسێتیەکی

---

[٣٠] بڕوانە :(( زفۆنکۆلیسیك)) Zvonko Lesic: The ory of Drama Throughout The Centuries ( Sarajvo: N.P. , 1977).

[*] رەنگە نووسەر مەبەستی لەدەمامك ئەو جلو بەرگانەبێت کەئەکتەرەکان لەبەری دەکەن کاتێك دەیانەوێت دەوری کەسێتیەکی تریبینن. ئەمەش هەمان ئەو وەزیفەیەیە کەدەمامکی تێدا بەکاردەهێنرێت لەسروتە سەرەتاییەکاندا ( وەرگێڕ.ع).

بەڕێز وبەهێزبوو ئەمەیش دەگەڕایەوە بۆ ئەو هێزە جادووییەی کەهەیبوو لەپارێزگاری کردنی ژیاندا یان لەوێرانکردنیدا.[٣١]

((گابرییل زایدا)) ماوەیەك لەمەوپێش، چەند هەڵبژاردەیەکی لەشیعری هیندیەکانی مەکسیك بلأوکردەوە و لەپێشەکیەکەیدا دەڵێت :( سیفەتی هاوبەش و گشتی شیعر لای هیندیەکانی مەکسیك بریتیە لەڕەمزیەتی ژیانی هەتاهەتایی و پەیوەندی لەگەڵ تەوتمەکاندا [*] لەڕووەك و ئاژەڵ و دیاریدە سروشتیەکان – کەهەمیشە دەگۆڕێت بۆ سروتە سیحریەکان یان ئاینی یەکان).[٣٢] لەژێر ڕۆشنایی یەکێتی نێوان هونەرو ئاییندا دەکرێت وەڵامی ئەو( لغز) ە بەناوبانگەش بدرێتەوە، ئەو (لغزە)ەیش بوونی( سرودی سرودەکان)ە کەلەنێو تەوراتدا هەیە( ئەو تەوراتەی ئێستا لەبەردەستایە)، کەدەقێکی دونیای ڕووتە بەلأم خاوەنی بەهایەکی هونەری بەرزە، ئەگەر هونەر و ئایین لەیەکتر جیابونایە جیابونەوەیەکی تەواو ئەوا ئەو کاتە(لغز)یش هیچ تەفسیرێکی نەدەبوو، بەلأم ئەگەر لەیەکتری جیانەبونایە جیابونەوەیەکی لەوشێوەیە، ئەوکاتە شتێکیش نەدەبوو پیێ بوترێت (لغز) کەواتە سەیرنی‌یە کەسرودی سرودەکان لەنێو خوێندنەوە ئاینیەکاندا بوونی هەبێت. ئەمە (لغز)ێك بوو بەلای ئەوانەوە کەدەیانویست ڕاڤەی کتێبی پیرۆز بکەن ڕاڤەکردنێکی عەقلأنیانە، بەلأم بەلای ئەوانەوە کەبڕوایان پیێ هەبوو هەستیان بەشتێکی نامۆ نەدەکرد تیێدا.

---

[٣١] بڕوانە(( سمیلا جتس)) : Smilagic:Introduction fo The. Korane( Zagreb : n. p .1975) , P.XXVI.

[*] تەوتم :(( Totem)) شتێکە وەکو گیاندار وەیان ڕووەك دادەنرێت وەکو ڕەمزێك بۆ خێزان یان بۆ خێڵی سەرەتایی، کەسی ناو خێڵەکە بڕوایان وایە کەبەشێوەیەك لەشێوەکان دەچنەوە سەری. تەوتمیەت بریتیە لە کۆمەڵێك لەبیروباوەڕ کەلەدەوری تەوتم دەسوڕێتەوە. ( ئیمیل دورکاریم) کەفەیلەسوفێکی کۆمەڵناسی فەرەنسی‌یە پیێ وایە کەتەوتمیەت شێوەیەکە لەشێوەکانی ئاین کەلەسەرتای ژیانی مرۆڤایەتی‌دا دەرکەوتوە ( وەرگێڕ. ع).

[٣٢] بڕوانە( گابریل زایدا) : Gabriel Zaida: ommibus de Poesia mexicana ( n.P, n.d).

هونەر زادەی ئایینە [٣٣]...ئەگەر هونەر بیەوێت بەزیندویی بمێنێتەوە، پێویستە هەمیشە لەو سەرچاوەیەوە پاراو بکرێت کەلێیەوە هاتووە.

هونەری بیناسازی – لەهەموو رۆشنبیریەکاندا – گەورەترین بەهرە هونەریەکانی لەدروستکردنی پەرستگاکاندا بەرجەستەکردوە، ئەمەیش – بەشێوەیەکی یەکسان – لەهەموو شوێنەکاندا هەستی پێ دەکرێت لەهیندی کۆن و لەکامبۆدیا، هەروەکو چۆن بەسەر مزگەوتەکانیشدا جێبەجێ دەبێت لەهەموو شوێنەکانی جیهانی ئیسلامیدا، لەوپەرستگایانەدا کەدۆزراونەتەوە لەدارستانەکانی ئەمەریکادا پێش گەیشتنی کۆڵمبۆس، هەروەها لەکەنیسەکانی سەدەی بیستەمدا لەهەموو ناوچەکانی ئەورپاو ئەمەریکادا. هیچ کەسێك لەگەورە بیناسازانی ئەمڕۆش ناتوانێت بەرەنگاری ئەم تەحەدایە ببێتەوە.(فرانك لوید) نەخشەی سنجاجوج خانووی شولوم لەئیلکنزپارك، لەبنسلڤانیا کێشاوە،(لوکور بزییە) نەخشەی کەنیسەی نوتردام دی لاهوت لەرونشام کێشاوە کەلەساڵی ١٩٥٥ز تەواو بووە، هەروەها نەخشەی دێری دومینکانی لەئیڤر لەفەرنسا کێشاوە. هەروەها (میلزفان دروە) نەخشەی پەیمانگای تەکنیکی لە ئیلنوی لەساڵی ١٩٥٢ز داکێشاوە.(ئەلفار ئەلتۆ) نەخشەی کەنیسەی (لوثر) لەڤیوکسنکی لەفیلەندا لەساڵی ١٩٥٩دا کێشاوە (فیلیپ جونسون) نەخشەی یەکەم کەنیسەی لەستامفورد لەساڵی ١٩٥٩دا کێشاوە. هەروەها نەخشەی پەرستگای کنیستی ئیسرائیلی لەنیۆیۆرك لەساڵی ١٩٥٤کێشاوە ((رودلف لاندی)) نەخشەی کەنیسەی قدیس فرانسیس ئەسیسی لەبامبولا لەبەرازیل کێشاوە.(( ئیدوارد توروجا)) نەخشەی کەنیسەی هیرالدی لەبیرنیس لەساڵی ١٩٤٢دا کێشاوە وە ((فیلکس کاندیلا)) نەخشەی کەنیسەی (عزرامیلا جروزا)ی لەمەکسیك لەساڵی ١٩٥٣دا کێشاوە بەو شێوەیە، هونەری بیناسازی سەرەڕای ئەوەی کەیەکێکە لەو هونەرانەی زیاتر وەزیفەییەو کەمتر رۆحیەت تێدایە، بەڵام هەمیشە ئەو سیفەتە ئایینیەی خۆی

---

[٣٣] بڕوانە :(( هنری برجسۆن)) : Henri Bergson : Creative Evolution.......

دەسەلمێنێت و دووپاتی دەکاتەوە لەو بینایانەدا کەبەردەوام دروست دەکرێت بۆ شوێنی پەرستش.

هونەر قەرزاریاری خۆی دەگەڕێنێتەوە بۆ ئایین بەشێوەیەکی رووتر، لەرێگەی وێنەو هەڵکۆڵین و مۆسیقاوە. خەریک بووکارە هونەرییە گەورەکانی چاخی رینسانس بەتێکڕا لەناوەرۆکدا کورت دەبونەوە بەتەنها بۆ لەخۆگرتنی بابەتە ئاینییەکان.

ئەم کارانەش بووبونە مایەی پێخۆش حاڵی و پێشوازیەکی گەرمیان لێ دەکرا لەلایەن پاپاکانەوە لەهەموو کەنیسەکانی ناوچەکانی ئەوروپادا. ئایا کەنیسەیەك هەیە لەئیتاڵیاو لەهۆڵەندەدا کەلەهەمانکاتدا وەکو مۆزەخانەیەکی هونەریش دانەنرێت ؟ تابلۆکانی (مایکل ئەنجیلۆ)و پەیکەرەکانی کە هەڵی کۆڵیون نمایشی بەردەوامییەکی دیاری مەسیحیەت دەکەن، دەتوانرێت ئاماژەی بۆ بکرێت بەوەی کە(ئینجیلێکە لەبەردو لەرەنگەکان). ئۆپێرای (هاندل) کەناو دەبرێت بە(ئوراتوریوس)- جۆرێکە لەئۆپێرا رۆحیەکان – دادەنرێت بەمۆسیقایەکی ئاینی گەورە وەکو لە: سول (شامشون)، و مەسیحدا دەردەکەوێت. گەورەترین دانەرانی مۆسیقا لەسەدەی بیستەمدا کە (دبوسی) و(ئسترافنسکی)ن ناوەڕۆکی داهێنانە هونەریەکانیان لەسەر بابەتە ئاینیەکان داناوە، (دبوسی) پارچە مۆسیقای قەدیس سباستانی شەهیدی داناوە، (ئسترافنسکی) سمفۆنیای (المزامیر و القداس)ی داناوە...، (شاجال) وێنەی هەر پانزە تابلۆ سەرەکیەکەی لەو بابەتانەوە وەرگرتووە کەلە ئینجیلدا هەیە ...بەلآم گەورە مۆسیقاری پیانۆ (( ئۆلیڤرمسیائن))- کەیەکێکە لەپێشەنگانی مۆسیقا لەپەنجاکاندا – زنجیرەیەك لەو کارە هونەریانەی کەدایهێناوە ئیلهامی لەتەئەمولاتە ئاینیەکانەوە وەرگرتوە (بیست سەرنج لەمنداڵیەتی مەسیح).

گەورەترین کارەکانی بالیەی کاریگەری هی (موریس بیجار) ە – کەیەکێکە لەگەورە داهێنەرانی لەو بوارەدا... سەرچاوەی ئیلهامەکانی ئەفسانەکانی( ڤاچین) و تەسەوفی رۆژهەلاّتی دووربون، نمونەیش بۆ ئەمە خودی کارەکانیەتی : بودلێر، ناکتی،

(الظافرون).(موندریان) کەیەکێکە لەدامەزرێنەرانی وێنەی تەجریدی و ئەندامی کۆمەڵەیەکی صۆفی‌یە لەهۆڵەندا ...ئەم هونەرمەندە لەهونەردا جۆرێك لە پەرستش و پاکبوونەوە دەبینی. وای دادەنێت کەئامرازێکە بۆ گەیشتن بەحەقیقەتی رەها.

((جان تورب)) – هەروەها ئەمیش هۆڵەندیەکی بەناوبانگە- پەرەی بەچەمکە ئاینی و ئەخلاقیەکان داوە لەوێنەکانیدا لەریگەی رەمزیەتەکەی و تەسەوفەکەیەوە.( کینث کلارك) لەبارەی (رمبرانت)وە نوسیویەتی و دەڵێت: (عەقڵی بەتەواوی چووبووە ناو ئینجیلەوە. بەدوورودرێژی چیرۆکەکانی لەبارەی دەرکەوتنی دڵەوە لەبەردەکرد ...لەتابلۆکانیدا مرۆڤ ناتوانێت بزانێت کەئایا تێیدا سەرنجێك لەسەرنجەکان تۆماردەکات یان سەیری کتێبی پیرۆز دەکات، بەڵکو هەردووشارەزاییەکە لەعەقڵیدا پێکەوە گەشەیان دەکرد.[٢٤](ئیفزکلاین) لەلێکۆڵینەوەکانیدا ئیلهامی لەئاینی(زن)ی بوزی وەردەگرت و لەووزە گەردونیە نامادییەکان تێ ڕادەما، ئەمەیش بەشێوەیەك لەشێوەکان وێنەکراوە لەفەلسەفەی ((برگسون)) لەبارەی (الحدس)وە *، هونەر لەلای (کلاین) جۆشان و بەئاگا هێنانەوەیەکی شاراوەی خالیسە یان جۆرێکە لەگەیاندنی ئیلاهی، زۆربەی تابلۆکانی کەنەخشاندونی دەربارەی موغامەرەی (دروستبوونی گەردونە) بەیارمەتی باوبۆران.

ئەو بیرۆکەیە کەپێی دەوترێت (شانۆی جیهان) بەڕوونی تایبەتمەندی پیرۆزی هێماکانمان بۆ دەردەخات، هەتا یەکێك لەبارەی ئەمەوە دەڵێت :(ئەم چاخەمان چاخی گەشەکردنی هێمای بیرۆکەکان و مەشاعیرە پیرۆزەکانە)...ئەمەیش ئاڕاستەیەکی نوێ و کاتی نی‌یە، بەڵکو حاڵەتێکی بەردەوامە لەئەسڵ و بنەڕەتی سروشتی هونەرەوە هەڵدەقوڵێت. هونەر، ئەگەر ئەو سوکی و بێکەڵکیەمان لێدوور خستەوە، ئەوا پیرۆزەو

---

[٢٤] بڕوانە:( کنیث کلارك) : Kenneth Clark: Civlization(London: n.p , 1969) P.203

* الحدس : واتە هەستکردن و تێگەیشتنی خێرا بەرێگەیەکی رۆحی و ناڕاستەوخۆی هەستاکان( و.ك) المنجد فی اللغە.

لەسەروعەقڵەوەیە. [35] ئەوەی هونەر پێمان دەڵێت و ئەو ڕێگایەی کەلێیەوە شتەکانمان پێ‌دەڵێت بەشێوەیەکە لەسەرو توانای بڕوا پێکردنمانەوەیە،، وەکو ئەوەی لەوەرگرتنی پەیامێکی ئاینییدا بین، بڕوانە بۆ تابلۆ گەچینە ژاپۆنیە کۆنەکان، یان پارچەیەك لەهونەری (ئەرابیسك)ی ئیسلامی لەدەروازەی بەردەم کۆشکی سور لە(غە رناطە)، یان بۆ دەمامکیك لەدورگەی میلانیزیا یا بۆ سەماکانی خێڵێك لەئۆگەندا، یان تابلۆی لێپرسینەوەی ڕۆژی دوایی (مایکل ئەنجیلۆ) یان تابلۆی جێرینکای (بیکاسۆ)، یان گویێ بگرە بۆ مۆسیقای ((دبوسی)) لەشەهیدبوونی قەدیس سباستیاندا، یان بۆ گۆرانیەکی ڕۆحی زنجی، لەو ساتەدا ڕووبەڕووی(لغز)و شتێکی ئاڵۆزو تەماوی دەبینەوە کەلەسەرو لۆژیك و مەعقولەوەیە وەکو ئەوەی لەکاتی نوێژکردندا هەستی پێ‌دەکەیت. ئایا کارێك لەکارە هونەرییە تەجریدیە ناعەقڵی و نازانستیەکان وەکو دروشمێکی ئاینی دەرناکەوێت ؟ تابلۆیەکی هونەری بەشێوەیەك لەشێوەکان، جۆرێکە لەجۆرەکانی ئەو دروشمانەی کەنوسراون لەسەر قوماش، هەروەکو چۆن سەمفۆنیاش چەند دروشمێکی ئاوازییە.

هونەر ئەفراندنێك نی‌یە بۆ جوانی، بەتایبەتی ئەگەر وامان دانا کەجوانی پێچەوانەکەی ناشرین نی‌یە، بەڵکو روکەشیە. ئێمە ناتوانین دەمامکەکانی (ئەزەتیە) وەکو جوانیەك پێناسە بکەین یان دەمامکەکانی (ساحل العاج)، یان ئەو پەیکەرە بچوك و بیێ چاوانەی کە(جیاکوەمتی) هەڵیکۆڵیون، هەموو ئەمانە تەعبیرن لەگەڕانێکی رەسەن بەدوای حەقیقەتدا، چونکە نمایشی هەست و شعورێکی زاتی و ناوخۆیی دەکات، یەکبوونە بەڕوداوێکی گەردونییەوە کەپەیوەستە بەچارەنوسی مرۆڤەوە،، بەشێوەیەکی سادە ئەوە هەستکردنێکە بە باڵایی بوون.

---

[35] سەدەی هەژدەیەم –سەدەی مۆسقار باخ– بەتەنها تاکەنمونەیەك نیەلەسەر ئەمە، بەڵام بەتەئکید دیارترین بەڵگەیە، ئەویش بەهۆی ئەو ناسازیە تیژەوە کەبەخۆیەوەبینی: لەوسەردەمەدا ئاراستەی فیکر ناائاینی بوو ژیان مەدەنیانە دەگوزەرا، بەڵام هونەر چووبووە لایەنگیری ئاینەوە.

ئەم پەیوەندیە (جَوانیة) لەنێوان هونەرو ئاییندا هەروەها دەتوانین دەرکی پێبکەین لەحەقیقەتێکی تردا، ئەویش ئەو کەم گرنگیدانە پیشەییەیە کەهونەرمەندان بەڕووکاری دەرەوەی خۆیانی دەبەخشن بەبەراوردکردنی لەگەڵ ئەوەی کەپێی دەوترێت (گەماری پیرۆز) لەهەندێ سستەمی ئاینیدا، بەتایبەتی لەهندۆسیەت و مەسیحیەتدا.

هونەرمەندان و ڕاهیبەکان هەموویان لەبەرچاوی خەڵکی ئاساییدا لەیەك توخمن، هەرچەندە ئەم وێکچوونە لەسەرەتادا غەریب دەربکەوێت، ئەوا لەقوڵایی ڕەهبانیەت و بوهمیەتدا یەك بیرۆکە هەیە. لەکاتێکدا(جولیۆسی دووەم)، بەدوی (مایکل ئەنجیلۆدا) دەگەڕاو پەلەی لێدەکرد (بۆ تەواوکردنی کارە هونەریەکەی))، مەبەستی ئەوە بوو کەپاڵی پێوەبنێت بۆ ئەوەی هەموو بەهرە تایبەتیەکانی بخاتەگەڕ بۆ وەگەڕخستنی تواناکانی لەکارە هونەریەکانیدا، بەڵام زوڵم و چەوساندنەوەی هونەرمەندان لەلایەن دەوڵەتەوە، هەمیشە ئەوکارە ئامانجێکی دژی هەبووە ئەویش بۆ ناچارکردنیان بووە هەتا واز لەپەیامەکەیان بهێنن.

هونەرمەندان لەچاخەکانی ناوەڕاستدا هەستیان بەدەسەڵاتی ئەو سیستمە کۆگیریە نەدەکرد بەهۆی باڵادەستی کەنیسە لەو سەردەمەدا، بەڵکو زانایان بەزۆری کەوتبونە بەردەم ئەو فشارانەوە، وایش دەردەکەوێت کەزانایان لەیەکێتی سۆڤیەتدا کەمترین کەس بوون کەبەر فشاری ئەو سستەمە کۆگیریەی دەسەڵات دەکەوتن لەو سەردەمەدا.

لەکۆتایی چاخەکانی ناوەڕاستدا، لەکاتێکدا کەدادگاکانی پشکنین دانرابوون و ئازارو ئەشکەنجەدانی زانایان گەیشتبویە ئەوپەڕی، قوتابخانەی ئیتالی گەورەترین کارە هونەریەکانی لەو سەردەمەدا داهێنا، لەژێر حوکمی (ستالین) و((ئەزدانۆڤی))ی

هاوەڵیدا.[36] زانستی سۆڤیەتی گەیشتبویە بەرزترین رادە لەبەرهەم هێنانی ووزەی ئەتۆمی و زانستە گەردوونیەکاندا. بەلام هونەری سۆڤیەتی، بەسیفەتی ئەوەی کەهونەرە کەوتبوویە ژێر گەورەترین فشارەوە، بەحوکمی ئەوەی ئینتمای بۆ جیهانێکی تر هەیە. کەنیسە هەمیشە هەوڵی ئەوەی ئەدا کەوا لەهونەر بکەن ببێتە خزمەتکاری (لاهوت)، لەیەکێتی سۆڤیەتیشدا هەوڵیان ئەدا کەوا لەهونەر بکەن ببێتە خزمەتکاری سیاسەت. لەکاتێکیشدا کەدەسەلاتدارە حکومیەکان رایانگەیاند کە ((ریالیزمی شۆسیالیستی))- بەپێی زاراوەی ستالین- .... تاکە مەنهەجێکی تاك و دروستە بۆ هونەری سۆڤیەتی، ئەمەش سەپاندن و دووبارەکردنەوەی هەڵەیەکی لەهەمان ئەو جۆرە بوو کەکەنیسە بەرامبەر بەزانست نواندی.

هەموو ئەو جیاوازیەش کەلەنێوانیاندا هەبوو ئەوە بوو کەلەیەکەمیاندا ڕووبەڕووی هونەر بوبووەوە لەدووهەمیشیاندا ڕووبەڕوووی زانست. بەلام ئەمە لەئەنجامی خراپ تێگەیشتنەوە بوو، چونکە ئیلحاد هەرگیز لەجەوهەرو سروشتی هونەر تێنەگەیشتوە، ئاینیش لەزانست تێ نەگەیشتوە.(بیکاسۆ) دەیتوانی خۆی بڕوات بۆ یەکێتی سۆڤیەت بەلام هونەرەکەی (بیکاسۆ) نەیدەتوانی بچێتە ناو ئەو ولاتەوە. یەکێتی سۆڤیەت هەڵوێستی سیاسی (بیکاسۆ) ی پێ قەبوڵ بوو بەلام هونەرەکەی پێ قەبوڵ نەبوو، هونەر بەو شێوەیەی کەهەیە بەچاوپۆشین لەئاگای هونەرمەندەکەو ئارەزوو بیرکردنەوەکانی – هونەر وەکو پەیامێکی پیرۆز دەمێنێتەوە، وەکو شایەتیەك دژ بەسنووورداری و ڕێژەیی مرۆڤ، وەکو هەواڵێك لەسیستمی گەردونیەوە، تێڕوانینێکی گەردونیانەیە لەهەمەکیەت و هەندەکیەتیدا، تەحەدایەکی ئەو تێڕوانینە مادییە یە بۆ گەردوون کە (نەفی) خوا دەکاتەوە.

ڕۆمانەکانی (فیودۆر دستویفسکی) مەسیحی خرابووە لیستی رەشەوە لەیەکێتی سۆڤیەتدا لەبەرهەمان ئەو هۆیەی کەتابلۆکانی (مارك شاجال) ی هاوڕێشی خستبویە

---

[36](ئەزدانۆف) Zhdanov یەکێك بوو لەکەسە هەرەنزیکەکان لەستالینەوە سکرتێری کۆمیتەی ناوەندی حیزبی شیوعی ڕوسیا بوو، ناسرابو بەپالەوانی ئەشکەنجەدان و ڕاونانی هونەرمەندان و فەیلەسوفان و نووسەران و مۆسیقار و بیرمەندان لەپاش شەڕی دووهەمی جیهانیەوە.

لیستی رەشەوە، لەزوڵم و چەوساندنەوەی (باسترناك)و (سۆلنزنستین) هەمان ئەو تراژیدیانە دەردەکەونەوە بەڵام بەلۆژیکێکی پێچەوانەوە. لەچێوەی (برونو) و ((گالیلیو))دا چەند رووداوێکی هاوشێوە هەن کەشیاوی بەراوردن لەنێوان (ئەزدانۆفیەت) ودادگای پشکنیندا. (ئەزدانۆفیەت) توندوتیژیە دژی هونەرمەندان و بیرمەندان بەناوی ئیلحادی دەوڵەتەوە. لەکاتێکدا توندوتیژی دادگاکانی پشکنین (ئەزدانۆفیە)تێکبوو دژ بەزانایان بەناوی کەنیسەوە وەکو ئاینێکی دامەزراوەیی.

## هونەرو ئیلحاد (لەیەکێتی سۆڤیەت)

دابەزینی ئاستی هونەرو نەبزواندنی توانا هونەریەکان و برەودان بەزانست و زانیاری و فێرکردن هەروەکو شارستانیەت دیاریکردوە یەکێکە لەو خاسیەتانە کە (ئیلحادی دەوڵەت)ی پێدا دەناسرێتەوە، رێژەی ئەوانەی کەگرنگیان پێ‌دەدرێت و فێری خوێندنەوەو نووسین دەکرێن لەدەوڵەتە شیوعیەکاندا ئەوەندە بەرزبۆتەوە کەتوانای بەئەنجام گەیاندی هەموو شتێکیان هەیە لەو بوارەدا. بەپێی سەرژمێریەکانی یەکێتی سۆڤیەت لەساڵی ١٩٦٥،٦٠ملیۆن بەشەر لەفێرگەکاندا ناونوسکراون. بەڵام فێرکردنێکی یەك لایەنەو لەشێوەی تەڵقینکردنێکی سیاسی مەزهەبی خاڵی لەرەخنە. لەنمونەی دەوڵەتێکی شارستانی وایشدا بەئاشکرا ئەوە دەردەکەوێت کەهونەر و رۆشنبیری لەپاشەکشێدایە. ئەم حاڵەتەیش بەشێوەیەکی تایبەتی لەو پەیوەندیەدا دەردەکەوێت کەلەنێوان دەسەڵات و لەنێوان هاوڵاتیاندا هەیە، بەشێوەیەکی روونتر لەسەرکێشەی ئازادی مرۆڤ بەوپێیەی کەکێشەیەکی جەوهەریە لەمرۆڤدا. ئەدەب بەپێی رای رەسمی - لەیەکێتی سۆڤیەتدا بێجگە لەرای رەسمی رایەکی تر نی‌یە - ئامرازێکە بۆ کارتێکردنی سیاسی رۆژانە لەسەر جەماوەر. بەپێی بریاری لیژنە مەرکەزی حیزبی شیوعی ساڵی ١٩٣٢، هەموو ئەو کۆمەڵە ئەدەبیانە کە هەبوون هەڵوەشێنرانەوە، لەجێگایدا یەکێتیەك دروستکرا بەناوی یەکێتی نووسەرانی سۆڤیەتەوە. ئەمەیش هەڵوەشاندنەوەیەك بوو بەمانای پیت بەپیتی ووشەکە، لەنێوان ئەو حەوت سەد نوسەرەی کەئامادەی کۆنگرەی یەکەمی نووسەرانی یەکێتی سۆڤیەت بوون لەساڵی ١٩٣٤زدا، تەنها ٥٠کەسیان

بەزیندوویی مابوون و ئامادەی کۆنگرەی دواتربوون لەساڵی ١٩٥٤ز دا. زۆربەیان لەهەڵمەتی پاکتاوکردنی ستالینیەتدا مردبوون [٣٧]. ((ریالیزمی سۆشیالیستی)) راگەینرابوو بەتاکە مەنهەجێك بۆ هونەری سۆڤیەتی.. وەکو شێوەیەك لەشێوەکانی هونەری پابەند بەمەزهەبەوە ، جۆرێك لەرۆمان بەرهەم هات کەباسی پیشەسازی و کێڵگە هەرەوەزیەکانی دەکرد کەپێی دەوترا(کولخوز). لەکۆنگرەی نووسەرانی سۆڤیەتدا لەساڵی ١٩٦٥،تیوری (ناپاڵەوانیەتی) لەئەدەبی سۆڤیەتدا لابراو، کۆنگرە گەیشتە بڕیارێك کە ((خاسیەتی ئەدەب))ی سۆڤیەتی بریتیە لەنیشتمانپەروەری و نواندنی کاری پاڵەوانانە).

فیلم بریتیە لەگرنگترین جۆرەکانی هونەر وەکو (لینین) دەڵێت، بەلام کەمترین جۆرەکانی هونەرە کەخاسیەتی هونەری تێدابێت، ئەگەر پێویست بێت. هونەر خزمەتی شتێك یان کەسێك بکات . بۆ نموونە ئایدۆلۆژیەتێك یان حکومەتێك . ئەوا فیلم باشترین هونەرێکە کەدەکرێت پەنای بۆ ببرێت.

رەخنەگری سینەمایی سۆڤیەتی (( ر. ن. یورنجییف)) لەیەکێك لەکتێبەکانیدا لەبارەی فلیمی کۆمیدیەوە دەڵێت (ستالین) ئەوفلیمانەی خۆش نەدەویست کەگرنگیان بەبابەتە هاوچەرخەکان دەداو لەئەنجامیشدا دەبونە مایەی نانەوەی سەرئێشەو دروستکردنی کێشەو ململانێکان. لەبری ئەوەیش، (ستالین)جەختی لەسەرئەوە دەکردەوە کەدەبێت فلیمەکان گرنگی بەنمایشکردنی ئاهەنگ و مەراسیمەکان و جەژنەکان و ئاهەنگەکانی ژن هێنان و سەما فۆلکلۆریەکان و گۆرانی و کۆرسە کۆمەڵیەکان بدەن. لەبەرئەوەی ستالین سەیری هەموو فلیمەکانی دەکرد پێش ئەوەی نیشانی جەماوەر بدرێت، رێنمایی و ئاراستەکاریەکانی بەشێوەیەك دەسەپاند کەوەکو یاسایەك سەیر دەکران لەئەنجامیشدا بەرهەم هێنانی فیلم تووشی دابەزینێکی گەورەبووەوە (ترس لەرەخنە) بووە دیاردەیەکی خراپ و قورس لەسەردڵ و دەروونی هونەرمەندان.

---

[٣٧] بروانە : ئینیسکلۆپیدیای (سربو — کراوتی) چاپی زەغریب، جزمی پێنج لاپەرە:٦٤١.

روسیا لەچەرخی نۆزدەهەمدا وولاتێکی هەژارو نیمچە دواکەوتووبوو، لەگەڵ ئەوەشدا توانی کەسانی وەکو (پوشکین) و(تشیکوف) و(تولستوی)و(دستویفسکی) و(تشایکۆفشکی)و(رمسکی کورساکوف) پێشکەش بەجیهان بکات بەڵام ئەمڕۆ، ئێمە لەکۆتایی نیوەی دوهەمی سەدەی بیستەمداین، ناتوانیت ئاماژە بۆ یەك هونەرمەند یان نووسەر بکەیت لەئاستی نووسەرانی پێشەنگ لەئەدەبی رووسیدا ...ئەگەر ناوێك هەبێت کەتائێستاش دیارو بەناوبانگ بێت ، ئەوا دەگەڕێتەوە بۆ ئەو بلیمەتیە رۆحیەی کەگەلی رووسی هەیانە، وەکوو بنەمایەکی بەڵگەنەویستیش ئەگەر شێوازێکیش لەو ئاستەدا بەدی بکرێت هەمیشە ناکۆك و ناتەبا دەبێت لەگەڵ ئەو سیستەمەدا وەکو چۆن ئەم حاڵەتانەش بەهەمان شێوە لەلای(باستر ناك) و(سولزنستین) و(فوزنسنکی) هەبوون. زەوی روسیا بەپیتە، بەڵام کەشەکەی بەنسبەت شاعیران و، هونەرمەندانەوە کەشێکی نەزۆکە.

بەرزبونەوەی ئەستێرەی زانستی سۆڤیەت و پوکانەوەی چەرخی هونەرەکان لەپاش شۆڕشەوە دەستی پێکرد، روسیای سۆڤیەت توانی ژمارەیەکی زۆر لەزانایانی سروشت و زانایانی بواری ئەتۆم و کەسانی سیاسی بەرهەم بهێنێت، بەڵام شاعیران و وێنەکێشان و مۆسیقیەکان نەك هەر بواریان بۆ نەڕەخسێنرا بەڵکو ڕووبەڕووی پاکتاوکردن و چەوسانەوەیش هاتنەوە. بوونی ئەم چۆڵەوانیەش، مایەی سەرنجە، بەتایبەتی لەکێڵگەی فەلسەفەدا، کەکێڵگەیەکی تەواو بایەرە، مەگەر تەنها چەند مامۆستایەکی فەلسەفەی زانکۆکان و پەیمانگا فەلسەفیەکان لەپانتاییەکی بچووکدا بوونیان هەبێت. لەیەکێتی سۆڤیەتدا..

**ئەمڕۆ ﴿ هەڵبەتە نووسەر مەبەستی کاتی نووسینی ئەم کتێبەیە(.وە. ك) ﴾ تاکە یەك فەیلەسوف نیيە بتوانێت شانبەشانی فەیلەسوفەکانی وێنەی (هایدگەر) یا( مارکوزا یا(سارتەر) بوەستێت. هەرچۆنێك بێت، فەیلەسوفانی یەکێتی سۆڤیەت ناکرێت بەراوردبکرێن بەو هاوەڵانەیان کەتوانا فیکریەکانیان لەبوارەکانی زانست و هەندەسەو سیاسەتدا خستۆتەگەڕ.**

**لەو پرۆسەیەدا توانرا هەموو دیاردەکانی ژیانی فیکری لەو وڵاتەدا لەناو ببرێت و لەجێگەیدا (ریالیزمی سۆشیالیستی)بسەپێنرێت. ئەوەیش ڕوون دەکەمەوە کەگرنگی دانی جەماوەر لەم بارەیەوە لەنەسازیەکی بەردەوامدایەو، پاشان ئەو هەوڵانە پێگەیشتن بۆ وورووژاندنی گرنگی پێدان لەرێگەی بەرزکردنەوەی کۆمەڵێك دروشمەوە وەکو: ((چەندە بەرزو جوانە ئەو سەکۆیەی کەئاڵای ریالیزمی سۆشیالیستی بەسەرەوە دەشەکێتەوە)).[٣٨]**

**نوسەرانی وێنەی (جریکورکو) و (بویکو) و(مالکیڤ)و (تراسوۆ) (سیشنکی) ئەمانە نە لەئەورووپاو نەلەیەکێتی سۆڤیەت خۆیشیدا ناسراوو نەبوون - بەڵام لەلایەن رەخنەگرە رەسمیەکانەوە ڕووبەڕووی ستایش و پیاهەڵدانێکی زۆربونەوە چونکە ئەم نووسەرانە گرنگیان بەبابەتەکانی (بەرهەمهێنانی پیشەسازی)دەداو، ناوەڕۆکی بابەتەکانیان پێکهاتبوو لەبونیادنانی دامەزراوە پیشەسازیە هەرە گەورەکان و ((رەنگدانەوەی ژیانی چینی کرێکاران لەگوندەکاندا)). ئەم بەرهەمانەیشیان کەدەنوسران ((بەپێی خواستی کۆمەڵگا)) بوون پێیان دەوترا ((سوکزا کن)) [٣٩] وەکو (کورزیف) کەکەسێکی ئەکادیمیە دان بەوەدا دەنێت و دەڵێت : (( ئەوەی زیاتر مایەی نیگەرانیە زۆربەی ئەو تابلۆیانەی کەنمایشکران لەپێشانگاکەدا دووبارەبوونەوەی شێوازی جۆراوجۆری هەمان ئەو کارانە بوون کە پێشتر دروستکرابوون)).**

---

[٣٨] ئەم دروشمانە بەرزکرابونەوە لەسەر پێشانگای کارە ئەدەبیەکانی سۆڤیەت لەمانییز ساڵی ١٩٧٤.

[٣٩]((سوکزاکن)) Soczakez زاراوەیەکە لەیەکێتی سۆڤیەتدا بەوکارانە دەوترێت کەبەپێی خواست بەرهەم دێن و خەسڵەتی هاوشێوەیی ولاسایی و دووبارەبونەوە تێیدازاڵە، وەکەمترین ئیلهامی ڕاستەقینەی تێدا بەدی دەکرێت.

(بوریس ئولینیك)ی شاعیر بەم شێوەیە گازندەی خۆی لەو تەکنیکی ڕەش و سپی‌یە دەکات لەوێنەگرتنی ژیاندا، لەو خۆڵەمێشی و سەر کێڵی و سەتحیەتەداو دەڵێت: (لەئاسمانی شیعری سۆڤیەتی‌دا تەنها چەند ئەستێرەیەکی کەم شەوق و هاوشێوە دەردەکەوێت، شیعری ڕاستەقینە بوونی نی‌یە، ئەوەی کەهەیە تەنها هۆنینەوەو نەزم و لاسایکردنەوەی شیعرن). کۆمەڵێك لەنوسەرانی سۆڤیەت کەبریتی بوون لە(ئەندریە فۆزنسکی)و (بیلا ئەحمەدو لینا)و (ڤاسیلی ئەکسیونۆف) و(ڤازل ئەسکەندەر)، چەندانی تر کەبەشداریان لەو گازندە نامەیەدا کرد لەساڵی ۱۹۷۹ز لەبڵاوکراوەیەکدا کەپێی دەوترێت راپۆرتی ساڵانە (Almanac)) دەربارەی ڕەوشی ئەدەب لەیەکێتی سۆڤیەتدا، پێیان وایە کەئەدەبی سۆڤیەتی گیرۆدەیە بەدەست (نەخۆشیەکی درێژخایانەوە کەدەتوانرێت دەستنیشان بکرێت بەوەی کەترسی ئەدەب و ئەو بەستەڵەکبوونە مۆنەیەکە بۆتە هۆی بەرهەمهێنانی حاڵەتێك لەبێ ڕەواجی و ترسنۆکی و بێ‌دەنگی بوون))[٤٠]. ئەم دابڕینە لەهونەر بەهەمان شێوە تووشی هونەری بیناسازیش هاتووە. بیناسازی لەهەموو شوێنەکانی جیهاندا بەرەو وەزیفەیی و پێکهاتەیەکی بیناسازی و پەتی و ڕووت چووە، بەڵام هیچ کاتێك ئەوانە ناگەنە ئەو دزێوی و ناشرینکردنەو کوشتنی ئەو ڕۆحیەتەی کەلەو شارە دروستکراوانە و بەشە نوێیانەی لەشارەکانی ناوو دەوڵەتە سۆشیالیستەکاندا هەستی پێ‌دەکرێت، ئەگەر بەراوردی بکەین بەهەموو ئەو بینایانەی کەلەناوچەکانی تری جیهانی پێشکەوتوودا هەن. لەو شارانەدا ئەو بینا ڕەق و تەقانەی کەلەسەریانەوە ڕەنگێکی خۆڵەمێشیان لێ‌بەرزدەبێتەوە، دیمەنێکی بێ‌ڕەونەقیان هەیەو دەبنە هۆی دروستکردنی حاڵەتێك لەوەڕسی و هەستکردن بەبێ تاقەتی. هەندێ پزیشکیش بۆ هۆکاری دروست بوونی ئەم حاڵەتە هێنراونەتەوە، لەوانە: خواستێکی زۆر بۆ خانوو بەرەو شوێنی نیشتە جێ‌بوون، کەمی تەرخانکردنە داراییەکان، شێوازەکانی بیناکردن ...شتانی تری لەو

---

[٤٠] بڵاوکراوەی Almanacناسرابوو بەوەی ئامرازێکە ئەوجەدەل و بەرانبەرکێ گەرم و بەهێزەی لەنێوان کۆمەڵێك لەنوسەرەئەمەریکاییەکان و وەلەنێوان بەڕێوبەرایەتی ڕێکخراوی مۆسکۆدا بۆ نوسەران ...وەلەهەریەکە لەیەکێتی سۆڤیەت و وڵاتە یەکگرتووەکان دا چاپ دەکرا.

شێوەیە. بەڵام دەرکەوت کەئەم پۆزشانە ڕاست نین و بێ بناغەن، چونکە هەموو ئەو کۆشکە جوانانە مێژووی دروستکردنەکەیان دەگەڕێتەوە بۆ ئەو ماوانەی کەهەژاری تێیاندا زۆر بووە. هەروەها دەشتوانرێت کۆشك و تەلاری جوان لەکەرەستەی کۆن و پێشوەخت بەکارهێنراو دروست بکرێتەوە. بەڵام ئەوەی لێرەدا دەبینینەوە بریتیە لەهەڵوێستێکی بەئاگایانە کەلەبێ ئاگاییەوەیە . دەتوانرێت کورت بکرێتەوە لەم پرسیارەدا : ئەگەر مرۆڤ خۆی خاوەنی رۆح نەبێت، ئیدی چۆن پێ لەسەر ئەوە دابگرین کەدەبێت شارەکان رۆحیان هەبێت !؟ هەرچۆنێك بێت، لەکاتێکدا باس لەهونەر دەکەین پێویستە ئەوە جیابکەینەوە لەنێوان گەلی ڕووسی و لەنێوان حکومەتی سۆڤیەتیدا، گەلی روسیا پڕە لەهەست و سۆزی ئایینی و هونەری، لەکاتێکدا حکومەت دژی ئایینە بەوەیش دەبێتە دژی هونەریش، گرنگی دانی گەل بەئەدەب گرنگیەکی فرە و لەڕادەبەدەرەو نزیکە لەهستریاوە بەپێی گوزارشتی(( ڤاسیلی ئەکسیونوف)). ئەم دیاردەیەش شایانی سەرنجدان و لێکۆڵینەوەیە ... بەهۆی کپکردنەوەی دینداریيەوە لای گەلی رووسی گەل لەڕێگەی ئەدەبەوە مومارەسەی ئەو شتانە دەکات کەڕێی لێگیراوە لەئاییندا مومارەسەیان بکات، لەگەڵ سەپاندنی بەزۆری ئیلحاددا ئەوا هونەر دەبێتە بەدیلی ئەو چەسپێنراوە.[41]

---

[41] ئەم بەدیله رەنگە هۆکارو شێوەی جیاوازی هەبێت، بەڵام هەمیشە سروشتی وعەفەویە، کنپ کلارك سەرنجی دابوو کەلەدەوڵەتە کاپۆلیکەکاندا یانەی ئۆپێرا شوێنی کەنیسەکان دەگرێتەوە،(( کاتێك ئەویان دەبێە مۆدەیەکی کۆن))لەو وڵاتانەدا یانەی ئۆپێرا وەکو کاتدرائی لێدێت کەلە ڕابردودا جوانترین وگەورەترین بینابووە لەشاردا بڕوانە : Kenneth Clark: Civilization, P.236.

# جیهانی ماددی هونەر

رۆشنبیری خاوەنی هونەرە، شارستانیەتیش زانست یان بەدەربڕینێکی وردتر زانستی کۆمەڵناسی زانستی کۆمەڵناسی بریتیە لەرەنگدانەوەیەکی ئەمینانەی رۆحی شارستانیەت یان لەناوبردنی رۆحیەتەکەی، جیاوازیش لەنێوان دەروازی هونەری و دەروازەی کۆمەڵناسیدا لەو دابەشبوونە بنەڕەتیەی جیهاندا رەنگدەداتەوە، هەروەها ئەو حەقیقەتەیشمان بۆ دەخاتەڕوو کەلێکۆڵینەوە تێیاندا بەرەو دوو ئاراستەی دژ بەیەکمان دەبات: یەکەمیان بەرەو مرۆڤمان دەبات وەکو کەسێتیەکی فەردی، دوهەمیشیان بەرەو مرۆڤمان دەبات وەکو ئەندامێك لەکۆمەڵگەدا.

بەنسبەت شاعیرەوە، ئەوەی کەناودەبرێت (بەمرۆڤی ئاسایی)خورافە ودرۆیە. مرۆڤ لای شاعیر مرۆڤێکی تاك و خاوەن تایبەتمەندیەکی جیایە. بەڵام کۆمەڵناسی، لەمرۆڤدا (لەژیانیشیدا هەروەها) تەنها گشتی و چەندی دەبینێتەوە، چاو لەوە دەپۆشێت کەبەڕاستی بوونی هەیە کەبریتیە لەو کەسێتیە زیندوو تاك و خاوەن تایبەتمەندیە، کەتێکەڵ بەفەردێك یان کەسێکی تر نابێت. هونەر نەگەل و نە رەگەزی بەشەری نابینێتەوەو نایکاتە بابەتی خۆی، بەڵکو مرۆڤێکی تاك دەبینێتەوە کەلەتەنیشتیەوە مرۆڤێکی تری تاك هەیە، لەریزێکدا کەکۆتایی نایەت لەکەسێتی و سیمای جۆراجۆر، هونەرمەند بەلایەوە وایە کەفەرد ناکرێت کۆبکرێتەوە یان بگۆڕێت بۆ حاڵەتێکی ناوەند، بۆ مرۆڤێکی ئاسایی، پاشان ئەوە مانای چی دەگەیەنێت کەوێنەی سیمای مرۆڤێك بکێشێت بەبێ ئەوەی وابکەیت کەبتوانیت بیناسیت وەکو کەسێتیەکی تەنهاو جیاواز لەهەموو سیماکانی تر ؟ زانستی کۆمەڵناسی دەیەوێت کەشفی شتە گشتی وهاوبەشەکان بکات، بەڵام هونەر دەیەوێت کەشفی تایبەتی و فەردیەکان بکات.

مرۆڤ حەزناکات پۆڵێن بکرێت، خەڵکی هەست بەبێزارییەکی کتوپڕدەکەن بەو بەیاننامانەی لەسەر بنەماکانی چەندیەتی و لەسەر حساب و ژمارەکاری دانراون، گرنگی بەسیفەت و شێوازە گشتی‌یەکان و پێوەرە پێوانەییەکان دەدات.

هیچ کەسێك حەزناکات بەوەی کەماوڵاتیەکی سادەبێت. ڕقبونەوە لەزانستی کۆمەڵناسی وادیارە شێوازێکی توندو بەهێزتر وەردەگرێت لەلای شاعیران و هونەرمەندان. (ریلکە) لەنوسینێکیدا دەڵێت :((لەلای باوباپیرانمان، ماڵ، کانیە گشتیەکە، بورجە بەناوبانگەکەو، هەتا جلوبەرگیش و قاپوتەکانیان – هەموو ئەمانە بەنسبەت ئەوانەوە شتانێکی بەبەهاو خاوەن گرنگیەکی زۆربوون، کەتێیدا رەسەنایەتیەکی قوڵ هەیە وەکو ئەوەی کەلەهەر یەکێکیاندا شتێك هەبێت کەجیای بکاتەوە، شتێکی مرۆیی.

بەڵام لەئەمڕۆدا، شتەکان لەئەمەریکاوە دێن و کۆدەبنەوە، شتانێکی پوچ و بێ‌بەها، بەڵام ژیانێکی وەهمی دروست دەکەن ...ئەو خانوەی کەلەسەر شێوەیەکی ئەمەریکی نەخشە کێشراوە، سێوی ئەمەریکی یان ترێی ئەمەریکی، لەهیچ یەکێکیاندا جێگەی ئەو خانوە یان ئەو میوەیە یان ئەو هێشوە ترێیە ناگرێتەوە کەلەدڵ و دەروون و هیواو ئاواتەکانی باوباپیرانماندا چەسپی بوون.[٤٢]

(( و. هـ.ا.ودین)) دەڵێت :(نابێت خۆیەدەستەوە بدەیت یان وەڵامی پرسیارەکان یا ئەو(لغز) انە بدەیتەوە دەربارەی ئیشوکارەکانی ئەم جیهانە، هەرگیز ملکەچ و ڕازی مەبە بەچوونە ناوەوە بۆ تاقیکردنەوەکان، خۆشنودو ئاسودە مەبە بەدانیشتن لەگەڵ

---

[٤٢] بڕوانە :(( راینر ماریا ریلکە)) Rainer Maria Rilkei Letters of Miso...(Wiesbaden : Insel-Verlag, 1966).

خاوەن سەرژمێریەکاندا، هەڵمەستە بەئەنجامدانی تاوانی زانستی کۆمەڵناسی.[٤٣]
زانست و فەلسەفە لەبارەی جیهانی دەرەوە یان لەبارەی مرۆڤەوە دەدوێت، بەلاّم لێدوانێکە بەشێوەیەکی گشتی راوبۆچونەکانی لەوبارەیەوە دەڵێت بەلاّم هونەر، بەوچاوەوە ناڕوانێت بۆ شتەکان، ئەو شتەکان بەوشێوەیە دەبینێتەوە کەهەن ...هونەر هەرگیز بەشێوەیەکی گشتی نادوێت بەڵکو لەبارەی مرۆڤێکی دیاریکراوەوە دەدوێت و لەتایبەتمەندیەکانیدا قوڵ دەبێتەوە، بۆ نمونە لەبارەی (( ئولیڤر تویست))، یان ((یوجین ئونجین)) یان(( فیودورکرامازوف)) ە وە دەدوێت.

درەختی لیمۆ کەشاعیرێك باسی دەکات هەمان ئەو درەختی لیمۆیە نیە کەوا لەجیهانی ڕووەکدا باس دەکرێت و لێکۆڵینەوەی لەسەر ئەنجام دەدرێت، بەڵکو درەختێکی خاوەن بۆن و بەرامەیەکی خۆش و سێبەرێکی پان و بەرینە لەباخچەی شاعیردا، کەراهاتووە لەسەر ئەوەی لەژێریدا دابنیشێت و بیر لەخەونەکانی بکاتەوە، لەپاشاندا هونەر لامان زیاتر واقیعیانە تر دەردەکەوێت، چونکە هەموو شتێك کەبوونی هەیە لەڕاستیدا بونێکی بێ تاك وبێهاوتایە. ئەمانەیش چەند نموونەیەکن کەزیاتر مانای ئەمەمان بۆ ڕوون دەکەنەوە.

لەڕۆمانی ((جەنگ و ئاشتی)) ی تولستویدا کۆمەڵێکی زۆر کەسایەتی دەردەکەون، هەریەکێك لەو کەسایەتیانەیش خاوەن پێکهاتەو تایبەتمەندیەکی جیاوازن. لێرەدا پێناسەی یەکێك لەو کەسایەتیانە دەخەینەڕوو کەلەو ڕۆمانەدا هاتووە ئەویش کەسێتی دبلۆماسی( بلیبین)ە، ئەو یەکێکە لەو دبلۆماسیانەی کەدەزانن چی دەکەن و چۆن کارەکانیان ئەنجام دەدەن ، سەرەڕای ئەو مەیل و ئارەزوەیشی کە بۆ تەمەڵی هەیەتی بەلاّم بەدرێژایی شەو لەسەر کورسیەکەی لەکتێبخانەکەیدا دەمێنێتەوەو خەریکی کاردەبێت ... ئەو بەقەدەر ئەو حەزەی بۆ کارکردن هەیەتی ئەوەندەش حەزی

---

[٤٣] بڕوانە :(( و.هـ.اودین)) W.H.Auden: Under Which Lyre? A reactionary tract for the times( Cambridge: Harvard, 1946).
(

لەقسەکردنە. بەڵام تەنها لەکاتێکدا کە قسەدەکات، وادەردەکەوێت قسەخۆش و رۆوبگۆیە، لەکاتێکدا لەگەڵ کەسانی تردایە، هەوڵ ئەدات کەمەلێك بۆ خۆی بدۆزێتەوە بۆ ئەوەی شتێکی گرنگ بڵێت ...لەو کاتەدا دەست بەقسەکردن دەکات ... قسەکانی (بلیبین) هەمیشە پڕن لەنموونەو تەعبیری ووردو جوان و سەرنج ڕاکێش. بەڕەنگ و سیمایەکی لاواز و ماندوو زەردباوەوە کەچرچ و لۆچێکی زۆری تێکەوتووە هەمیشە وادەردەکەوێت کەبەنەرمی دەست بەسەر ئەو چرچ لۆچانەدا هاتبێت و خاو کرابنەوە، وەکو چۆن ئەو سپێتیە دەردەکەوێت لەنێوان پەنجەکانماندا لەپاش خۆشتن ... جوڵانەوەی ئەو چرچ و لۆچانەی دەموچاوی بریتین لەتاکە چالاکی نهێنیەکانی ناو سیماودەموچاوی.[٤٤] ئەمەیش وەسفێکی ((ئولیڤار بنتلاند))ە لەڕۆمانی((پایزێکی زوودا)) ((... ئەگەر رکەبەرێکی هەبێت لەناو ئەو قەرەباڵغیەدا کەپڕاوپڕی ناو ئەم خانووە دێرینەیە کەدەنگ دەداتەوە لەناوخۆیدا، ئەوا بریتیە لە (ئولیڤیا بنتلاند) — دایکی (سیبل) — ئەو زۆربەی کاتەکانی لەبەسەرکردنەوەو چاودێریکردنی میوانەکانیدا بەسەردەبات ... ئەو تەواو دەزانێت کەئاهەنگی سەماکردنەکە تەنها هەموو شتێك نی‌یە کەپێویستە پی‌ی هەستێت، شتێك نییە کەتێیدا سەرنج ڕاکێش بێت ... شتێك نی‌یە تێیدا لەو شتە ماددیانەی کەباق و بریقی پی‌دابێت وەکو جل و بەرگی سەوزو ئەڵماس و قژی سوورو بریقەدار وەکو قژی (( ساڤین کالیندر)) بەڵام ((ئولیڤیا)) بەرەو ئەوە چووە کەئافرەتێکی نەرم و نیان و خاوەن جوانیەکی سروشتی و دڵگیربێت. جوانی ونەرم و نیانیەکەی بەشێوەیەکی لەسەرخۆو هێواش دڵ داگیر دەکەن. تۆ بۆ یەکەم جار هەستی پی‌ناکەیت لەناو میوانەکاندا، بەڵکو وردە وردە تێبینی دەکەیت و دەردەکەوێت، وەکو ئەوەی لەگەڵ عەترێکی ئاڵۆزدا بەرەو دەروونت بەرزبببێتەوە.[٤٥]، ئەگەر شتێك پێناسەکرا، ئەواپێناسەیەکی گشتیانەی بۆ ناکرێت،

[٤٤] (( لیوی تولستوی)). Leo Tolstoy: War and Peace . trans.(New york:modern Library, 1940)

[٤٥] (( لویس برومفلید)) Louis Bromfield : Early Autumn..(New york: frederick..., 1926).

بەڵکو بەشێوەیەکی وردو دیاریکراو دەبێت، ڕەنگە ئەو شتەیش شتێکی سادەو بچکۆلە بێت وەکو سندوقی قەڵەم ڕەصاص، لەڕۆمانی(( ریتشارد لویلین))دا(( چەندە دۆڵەکەمان سەوزبوو))، دەڵێت :((سندوقێکی جوانی لێبوو کەدرێژیەکەی نزیکەی هەژدە( بوجە) و پانیەکی سێ( بوجە) دەبوو، جێدەستێکی پێوەبوو دەجولاَ بۆ ئەوەی سندوقەکە بکرێتەوە، ئەو جێدەستە تەنانەت شوێنی پەنجەکانیشی لەسەر هەڵکۆڵرابوو، سندوقەکە لەدوو چین پێکهاتبوو، لەچینی ژێرەوەدا سێقەڵەمی سووری نوێ وچاك و جوانی لێبوو کەهیچ شوێنەواری ددانێکیان لەسەر نەبوو، لاکانیان ڕێك وپێك، لەتەنیشتیانەوە دوو قەڵەمی سەوز دانرابوون سەرەکانیان بەپارچەیەك مسی زەرد داپۆشرابوو ... لەو سەری قەڵەمەکانەوە جێگەیەکی بەتاڵ هەبوو بۆ دانانی خەتکوژێنەوەکان ... بەلاَم چینی سەرەوە لەسندوقەکەدا، پێنج قەڵەمی جوانی تێدابوو، سێدانەیان زەردبوون، ودانەیەکیان سورو، ئەویتریشیان شین ....[46] ئەگەر وەسفی شوێنێك کرا، ئەوا دەبێت ئەو شوێنە دیاریکراوبێت بەشێوەیەکی وردو وێنەی ئەو جێگایە نیشان بدرێت : بۆ نمونە،(( لەرۆژی شەممەدا نزیکەی کاتژمێر چواری پاش نیوەڕۆ ... لەسەر شۆستەی ویستگە تەختەیی‌یە کورتەکەدا، ئافرەتێکی بچکۆلەی لێبوو کەبەرگێکی شینی ئاسمانی لەبەردابوو بەشێوەیەکی لارولوێر دەڕۆیشت بەرێگاداو، پێدەکەنی‌ودەستەسرێکی بەدەستەوەبوو رایدەوەشاند ... لەهەمانکاتدا زنجیەکیش لەوێ بوو کە مەتەرییەکی مەیلەو زەردی لەبەردابوو، جووتێ پێلاَوی زەرد و کلاَوێکی سەوزی لەسەردابوو ... لەکاتێکدا ئافرەتەکە هێشتا خەریکی رۆیشتنبوو لەسەر ئەو شێوەیە، خۆی کێشا بەپیاوەکەدا لەژێرچرایەکدا کەبەدیوارەکەوە هەڵواسرابوو ... لەو چرایانەی کەلەسەر رێگاوبانەکان بەشەودا دادەگیرسێن. لێرەدا لەیەککاتدا بەشێوەیەکی کوت و پڕ لەبەردەمتدا دیوارێکی تەختەی تەرکە بۆن و بەرامەیەکی بەهێزی لێوەدێت، ئەو چرایەو، ئەو قژە زەردە

---

[46] (( ریتشارد لویلین)) Richard Llewellyn: How Green Was My Valley( New york: Macmillan , 1940).

بچکۆلەیەش لەنێودەستەکانی زنجیەکدا دەبینێتەوە لەژێرئاسمانێکی بروسکاوی و هەڵچوودا.[47] ئەمەیش کەسێتیەکی ترە کەبەشێوەیەکی زۆر وورد وێنەکراوە لەهەمان ڕۆماندا: ( کاتژمێریەك و نیوبوو ...لەقاوەخانەکەی – مابلی – سەندەویژم دەخوارد ...هەمووشتێك دەتوانم بڵێم ئاسایی بوو ...هەرچۆنێك بێت، هەموو شتێك هەمیشە ئاساییە لەناو قاوەخانەکاندا بەتایبەتی قاوەخانەکەی (مابلی) ...ئەوەیش دەگەڕێتەوە بۆ فەزڵ و لێهاتووی بەڕێوەبەرەکەی (مسیو فاسکیل) .... کەپیاوێکە لەچاوەکانیدا تەعبیرێکی بازاڕی دەردەکەوێت، لەچاوەکانییدا متمانەو بڕوا بەخۆبوون بێپەروایی دەخوێنرێتەوە ...ئێستا کاتی پشودانی نیوەڕۆ هاتووە ...ئەمە لەچاوە سوورەکانیدا دەردەکەوێت.. بەڵام هێشتا بەناومێزو کورسیەکاندا بەشێوەیەکی چالاك و ڕێکوپێك دەگەڕێت ...سەرنجی ووتووێژی مشتەریەکانی دەدات کەپێکەوە بەبێ دەنگی دەدوێن...[48].

ئەمەی تریش وەسفی دیمەنێکی سروشتیە: (( کاتژمێر یانزەی سەر لەبەیانی بوو ...ڕۆژ لەپشتەوەی (بیێر)دابوو تۆزێك بەلای چەپیدا کەوتبوو، تیشکە ڕۆشنەکەی بەناوهەوایەکی پاکدا ڕەوانە دەکرد ....لەبەردەم( بیێر)دا پانۆرامایەکی گەورە لەزەوی درێژبوەتەوە کەبەچواردەوریدا وەکو قادرمە بەرزبوەتەوەو دەڵێی شانۆیە ...لەوسەرەوەدا ئەو ڕێگە گەورەیە دەردەکەوێت کەدەڕوات بۆ( سمولتسك) پاش ئەوەی ئەو بەرزییە قادرمەییانە دەبڕێت بەرەو گوندێکی بچووك دەکشێت کەکەنیسەیەکی سپی تێدایە ....دەکەوێتە ئەو شوێنەی کەبەنزیکەی پەنجا هەنگاو بۆی شۆڕدەبیتەوە، پاش ئەوەی بەپردێکی بچووکدا تێدەپەڕێت پاشان بەپێچاوپێچەکەدا دادەبەزێت و سەردەکەوێتەوە تادەگاتە گوندی (ڤالیوڤو) ...کەدەتوانرێت لەدووری شەش کیلۆمەترەوە ببینرێت ... پاشان لەپشت گوندی

---

[47] بڕوانە :(( جان پول سارتر)) Jean Paul Sarter : Nausea( New York: French and Euaropean , 1939).

[48] هەمان سەرچاوە.

(ڤالیوڤۆ) ڕێگەکە بەناو دارستانێکدا پەرش دەبێتەوە کەپەلو پۆی درەختەکانی لەسەروە بەهۆی وشکیەوە زەرد هەڵگەڕاون- لەلای ڕاستەوەی ڕێگاکە لەو دارستانەدا - لەدوورەوە - لەبەردەم ڕۆژەکەدا خاچێك و بورجی جەرەسی دێری(( کالۆشا)) دەردەکەون ...لەناو گۆڕەپانی دۆڵەشینەکەدا لەلای ڕاست و چەپی ڕێگاکەوە دووکەڵی تۆپ و بۆردومانەکان لەچەند شوێنێکی جیاوازدا دەردەکەون کە بەرزبوەتەوە لەبڕێکی زۆری بێ‌شوماری چەك و جبەخانەکانی ئێمە و دووژمن. لەلای ڕاستیشەوە بەئاڕاستی ڕووباری ((کالوشا)) و موسکو ، زەوی بەشێوەی بەر و تاوێر دەردەکەوێت ...لەنێو ئەو بەردەڵانانەدا گوندی (( بزیوڤو)) و(( زهارینو)) دەردەکەون ... هەر لەوێشەوە دەتوانرێت ئەو چرە دوکەڵە ببینرێت کەلەگوندی سووتاوی ((سمیونوڤسکی)) بەرز دەبێتەوە)[49].

لەکۆتاییدا، ئەمەیش وەسفی ژورێکە لەناوەوە: (( بییر)) بەباشی شارەزای ناو ئەم ژوورەیە ... کەدابەشکراوە. بەپایەی ڕاست و چەماوەو فەرش ڕێژکراوە بەفەرشی فارسی ...لەگۆشەیەکی ژوورەکەدا لەپشت پایەکانەوە کورسیەکی دانیشتنی بەرزی لێیە کەلەتەختەی ماهۆجینی دروستکراوە ...لەژێرپەردەیەکی ئاوریشمیندا کەڕۆشنکراوەتەوە بەڕەنگێکی سووری ڕوون وەکو چۆن کەنیسەکان لەکاتی نوێژی خۆرنشیندا بەو ڕەنگە ڕۆشندەبنەوە ...لەژێر تیشکێکی لاوازدا قەرەوێڵیەکی لاکێشەی لێیە لەجۆری ڤۆلتیر کەتازە قاچی نوێی بۆ دروستکراوەتەوە قاچەکانی سپی و پاك و بێ‌گەردن وەکو بەفر ...لەسەر ئەم چرپایە کەتا نیوەی بەبەرگێکی سەوز داپۆشراوەو ڕەنگی جەستە کەڵەگەتەکەی باوکی (بییر)ی لەسەر دەردەچێت کاتێك کەڕادەکشێت لەسەری ...ئەوە (ئەلکۆنت (( بیزولۆف)) ە بەو قژە خۆڵەمێشیەوە کەپەخشان بووە بەسەر تەوێڵیدا بۆ ئەوەی سیمای شێرمان بیر بهێنێتەوە ... ئەوە هەمان ئەودەموچاوە زەردە مەیلەو سوورەیە ...ئەو دەموچاوەی کەبەچرچە چرووپرو

---

[49] بڕوانە : تولستوی : جەنگ و ئاشتی ...Tolstoy: War and peace

نەجیبیەکەیدا جیادەکرێتەوە.[٥٠] ئەم چەند نموونە کەمە کەوەرگیراون لەهەندێ لەو ڕۆژنامانەی کەبەڕێکەوت بەردەستمان دەکەون و دەیانبینین شتانێکی تایبەت و جیانین لەکارەکانی( تولستوی) یان( سارتەر) یان(برۆمفیلد) یان(لیۆلین) بەڵکو بریتیە لەدیاردەیەك کەلەبارەی هونەرمەندەوە بەڵکو هونەرەوە لەجەوهەریدا بۆمان دەدوێت، چەندە هونەرمەندەکە گەورەو مەزن بوبێت ئەوەندەیش توانای بەدواداچوونی ئەم یاسا ناوخۆییەی هەبووە کەتایبەتە بەهەموو هونەرێکەوە لە: فەردی بەرجەستەبوو، کەسی، ڕەسەنی، بێهاوتایی.

بەڵام زانست و فیکر بەلایەکی تردا ئاراستە وەردەگرن دژ بەو ئاراستەیەی پێشەوەیە کەباسمانکرد بەرەو( التجانس) هاوڕەگەزی، بۆ ئەوەی هەمیشە کەشفی ئەو هاوبەشانە بکات کەلەناو شتەکاندا هەیە. بەبێ شك ڕەسەنایەتی لەخۆ دەگرێ ... هیچ شتێك دووبارە نابێتەوە، نەپێناسەیەك یان هەڵوێستێك، هیچ شتێك نیە کەهەتاهەتایە هاوشێوەو هاویەك بمێنێتەوە لەگەڵ شتەکانی تردا. ئەم بڕوایەش لەسروشتی خودی هونەردا شاراوەتەوە لەکاتێکدا هاوشێوەیی و دووبارەبوونەوەو هاویەکی، شتانێکی بنەڕتین لەگریمانەی زانستیدا. لەنێوان ئەم دوو لایەنەشدا نزیك بوونەوەیەك لەپلەکاندا دەست پێدەکات لەئالیەوە بەرەو کەسی، دەبینین کەماددەو یاساکانی لەلایەکەوەن و ژیانیش بەبالاترین دەسکەوتەکانیەوە کەبریتیە لەکەسێتی لەلایەکی ترەوەیە، هەتا لە(ئالیانە) دووربکەوینەوە زیاتر ئازادی و داهێنان گەشە دەکەن. لەپاشاندا، لەم جەمسەرەی ژیانەوە. جەمسەری کەسێتی، تەنها ڕەسەنایەتی بوونی هەیە، پێچەوانەی ئەمەیش هەر ڕاستە : چەندە دووربکەوینەوە لەکەسێتی ئەوەندە چاودێری و سستم و گونجان دەردەکەون، لەم جەمسەرەدا هیچ شتێك حوکم ناکات بێجگە لەشتانی ڕووت و یەتی و یەکسان و ئالی نەبێت.

---

[٥٠] هەمان سەرچاوەی پێشوو

# درامای سیمای مرۆڤایەتی

هونەر لەکێشەو گرفتی کەسێتیەوە وەرگیراوە، لەڕۆمانی(( جەنگ و ئاشتی)) دا پێنجسەدو بیست ونۆ کەسێتی دەردەکەون لە(کۆمیدیای ئیلاهی)دا جیهانێکی بێشومارە لەکەسێتی جۆراوجۆر، هەر یەکێکیان نەفسێکەو بەهەڵەو لێپرسراویەتەکانی خۆیەوە خەریکە، هەتا وامان لادەردەکەوێت کەدیمەنی ڕۆژی قیامەتەو لەگەڵ بەلایین خەڵکدا ئەوانەی پێشتر لەم دنیایەدا ژیاون و مردون.

ئەو تابلۆ گەچینانەی کەبە بنمیچ و سەقفی کەنیسەی( سکستین) ەوە دروستکراون و دیمەنەکانی خەلق و بەدیهێنانیان لەسەر نەخشێنراوە، لەوێنەی مۆزەخانەیەکدا دەردەکەوێت کەنمایشی کۆمەڵە روخسارێکی تاك و لەیەك جیاواز دەکات – مەبەستم کەسێتیەکانە – فەردیەت وا لە ڕوخسار دەکات کەجیابێت و خاوەنی تایبەتمەندیەکی سەربەخۆبێت، ئەوەش بەهۆی ئەو ژیانە زاتی و( جوانیە)وە هەروەها ئەو ئازادیەوەیە کەپێی دەبەخشێت.

کەسێتی هاوشێوە نیە لەگەڵ سیمای مرۆڤی دا، بەڵکو ئەو خواستەیە ڕەنگ ئەداتەوە لەسەر ئەو سیمایە. ئەو پەیوەندیەی کە هەیە لەنێوان کەسێتی و سروشتدا وەکو ئەو پەیوەندیەیە کەلەنێوان عەقڵ و مادەدا هەیە، هەروەها لەنێوان چەند و چۆندا هەیە، لەنێوان ئاگایی و دۆگماییدا هەیە، لەنێوان دراماو تۆبیادا هەیە. کەسێتی بریتیە لەفەردیەت و عەفەویەت و ئازادی، بریتیە لەموعجیزە.

هونەر لەبارەی کەسێتیەوە دەدوێت، ئاینیش لەبارەی دەروونەوە، جیاوازیش نیە لەنێوانیاندا بەڵکو جیاوازیەکە لەچۆنیەتی و شێوازی تەعبیرکردنەکەدایە لەهەمان بیرۆکەو حاڵەت. ئایین بەئاڕاستەی دەرووندا دەڕوات هونەریش دەیەوێت پێی بگات

... و بیهێنێته بەرچاوەکانمان. چەندە هونەر هەوڵی داوە کەخۆی لەپشتی سیمای مرۆڤیەوە بدۆزێتەوە. لەهونەرە سەرەتاییەکاندا، سەرەکیترین بەش کەگرنگی پێدەدرا لەلەشی مرۆڤدا بریتی بوو لەسەر، لەکاتێکدا بەشەکانی تری جەستە بچووك دەکرایەوە تەنها بۆ پایەیەك کەسەری لەسەر جێگیر دەکرا. شێوەی چەند هێڵێکی سادە وەردەگرێت یان تەواو پشتگوێ دەخرێت ئەو سەرە هەڵکۆڵراوانە کەلە ((جریهۆن)) دۆزراونەتەوە مێژوویان دەگەڕێتەوە بۆ شەش هەزار ساڵ لەپیش زایینەوە، ئاماژە بەوە دەکەن کەمرۆڤی چاخی بەردین بڕوای وابووە سەر شوێنی جێگیربوونی ڕۆحە ئەوانەی پەیکەرە بەردینەکانیان لەدوورگەی (ئیستر)دا دروستکردوە هەموو گرنگیەکیان بە ڕوخساری پەیکەرەکانیان داوەو تەواو شوێنەکانی تری جەستەیان فەرامۆشکردوە. هەموو هونەرمەندە گەورەکانیش هەر لە(فیدیاس) و(براکستیلس) هەتا(رفائیل) و(مایکل ئەنجیلۆ) و(دافنشی)، هەموویان لەدەوری یەك بابەتی گرنگ کۆبونەتەوە، کەبریتیە لەسیمای مرۆڤ وجیهانە ( جوانی) دەرونیەکەی.

ڕەنگە ئەو بەناوبانگیەی( مۆنالیزا) بگەڕێتەوە بۆ ئەوەی کەسەرکەوتووترین هەوڵێك بووە بۆ وێناکردنی نهێنی ژیانی ناوەوەی( جوانی) مرۆڤ. هەندێ لەلێکۆڵەرەوان ئاڕاستەی هونەری ئەمەریکیان لەماوەی دە ساڵی ڕابردوودا – بەتایبەتی لەوێنەکێشاندا – بەوە پێناسە کردوە گەڕانەوەیەکە بۆ درامای ڕوخساری مرۆڤ. ئەوە تەنها گەڕانەوەیەکی ترە بۆ هونەر بەو شێوەیە، بابەتی هەر کارێکی هونەری – بەچاوپۆشین لەوەی بۆی دیاریکراوە یاویستراوە تێیدا بەکاربهێنرێت – هەمیشە بابەتێکی دەروونیو تاکە کەسیەو هەرگیز بابەتێکی کۆمەڵایەتی و سیاسی نیە. ڕەنگە گرێکە تێیدا یان ڕووداوەکە کۆمەڵایەتی بێت، بەڵام هونەر هەمیشە گرنگی بەلایەنە ئەخلاقیەکانی گرفتەکە ئەدات. هونەر حاڵەتێکی دەروونیە هەتا ئەگەر لەکاتێکیشدا لایەنی جەستەیی بگرێت و بیکاتە بابەتی خۆی. هەندێکیش بەڕووکاری دەرەوەی هەندێ وێنە چەواشە بووبون، دەیانووت کە( روبنز) وێنەکێشی جەستەیە و(رمبرانت) وێنەکێشی دەروونە. بەڵام هەموو وێنەکێشێك کەوێنەی کەسێتیەك

دەکێشێت، لەهەمانکاتدا وێنەی دەروونێکیش دەکێشێت. بابەتی دراما لەجەوهەریدا – بەئیعتباری ئەسڵە ئاینیەکەی – لەشیکارکردنی کۆتاییدا پەیوەندییەکە لەنێوان ئازادی (جوانی) مرۆڤ و لەنێوان حەتمیەتی جیهانی دەرەکیدا. لەشانۆییەکانی شکسپیردا گرنگی نادەین بەڕووداوەکان، بەڵکو هەموو گرنگیەکان کۆدەکەینەوە لەسەر پاڵنەرەکان و ئەو دەرونە شاراوەیەی کەبەشێوەیەکی گێرەشێوەن و خراپەکار دەردەکەوێت لە واقیعیەتەوە، بەشێوەیەك وای لێدێت کەخودی تاوانەکە گرنگیەکی(لاوەکی) دەبێت[51].

لەم بارەیەوە (یۆجین ئۆنیل) تەعبیر لەهەمان ئەم بیرۆکەیە دەکات و دەڵێت: ((پێویستمان نابێت بەڕووداوەکان، بەڵکو تەنها خودی کەسێتیەکان بەسن)).

کەسێتی شتێك نیە ...لەهونەردا لەشێوەی من وتۆدا دەردەکەوێت[52]. ئەمەیش ڕاڤەی ئەو ئاڕاستە بەردەوامەمان بۆ دەکات بۆ سڕینەوەی جیاوازی لەنێوان ئەو کەسەی کاری نواندنەکە ئەنجام دەدات لەگەڵ بینەردا، بەستنەوەی بینەر وەکو بەشداریکەرێکی ڕاستەوخۆ لەئەفراندندا ﴿ هەتا لەوێنەکێشاندا هەروەکو وێنەکێشی ئەمەریکی ((روزنبرج)) پێی هەڵدەستا ﴾ لەگوندەکانی ئەفەریقادا کاتێك کۆمەڵێك لەسەماکەران ڕوودەکەنە گوندەکە خەڵکەکە تێکرا پەیوەندیان پێوەدەکەن و لەکۆتاییدا کەسێك نامێنێتەوە کەجیابێت بەڵکو هەموویان دەبنە بەشێك لەنمایشکەرانی سەماکە...ئەمەیش بریتیە لەبنەمای یەکێتی کاری هونەری، یەکێتی لەنێوان هونەرمەندو بینەردا، ئەمەیش بنەمایەکە لەسروشتی میتافیزیکیانەی هونەرەوە هەڵدەقوڵێت و سەچاوە دەگرێت.

---

[51] بڕوانە :(( تشارلز و ماری لامب)) Charles and Mary Lamb: All Shakespear s Tales( New yerk: Fredrick A Slokes Co., Hampton Publishing, 1911).

[52] بڕوانە :(( مارتن بوبر)) Martin Buber: I and You, trans : W. Kaufmann( New york: Scribner, 1970)

ئەمە چ جۆرێکە لەبنەماکان ئەم بنەمایە ؟ ئەم پەیوەندیە کەلەنێوان هونەر و لەنێوان ئەوەی کە پێی دەڵێن حەقیقەتی بابەتیانە. ئەم حەقیقەتە بابەتیەی – کەهەریەکە لەزانست و فەلسەفە جۆرێك لەڕەهاییان پێداوە – بەلاّم بەنسبەت هونەرەوە ئەمە تەنها بریتیە لەوەهمێك : دیمەنێکە یان خوایەکی ساختەیە. تاکە حەقیقەتێك کەهونەر دانی پیادادەنێت بریتیە لەمرۆڤ و ئەو شەوقە ئەبەدییەی کەهەیەتی بۆ تەئکیدکردنەوەی زاتی خۆی و..رزگارکردنی خۆی ...بۆ ئەوەی نەبێتەوە بەعەودالّی ئەم(( حەقیقەتە بابەتیە)) هەموو تابلۆیەك بریتیە لەهەوڵدانێکی مەحالّ (بۆ ئامادەکردن و، هێنانە کایەی موعجیزەیەك کەناوی دەنێین کەسێتی).

لەقولاّیی هەموو تابلۆیەکی هونەریدا کەسێتیەك هەیە لەجیهانێکی غەریبدا، ئەو ململانێیەی کەلەئەنجامی ئەم پەیوەندیە بنەڕەتیەوە کەلەنێوان کەسێتی و ئەم جیهانەدا پەیدا دەبێت. بەبێ ئەمە بوونێك نییە بۆ هونەر. ئەوەی لەپاش ئەمەوە دەمێنێتەوە، تەنها بریتیە لەتەکنیك. هەر ئەم خەسڵەتەیشە کەدەبێتە هۆی ئەوەی کەتابلۆ بەناوبانگەکانی ((رمبرانت))، لەو وێنە هەرزانانە جیابکاتەوە لەهەندێ لەپێشانگاکاندا دەیانبینینەوە سەرەڕای ئەو زیرەکی و ووردەکاریانەش کەتێایاندا بەکارهاتوون. هەتا ئەگەر هاتوو نەکرا تەئکید بکرێتەوە لەو ململانێیەی کەباسمانکرد، ئەوا هەر بەشێوەیەکی ناوخۆیی و( جوانی) یانە بونی هەیە، چونکە هەموو تابلۆیەکی روخسارو دەموچاو بەرەو ئەوە دەچێت کەتێیدا رەنگی مرۆڤێکی رەسەن بداتەوە کەنمایشی شعورو فەردیەت و ئازادی دەکات، ئەمەیش ناجۆرو نەگونجاو دەبێت لەگەڵ سروشت و جیهاندا.

لەبەرئەوە، ئەم ڕۆحە ئەو نەفسە نییە کەزانایانی دەروونناسی لێکۆڵینەوەی لەسەردەکەن، بەڵکو ئەو( ڕۆح)ە راستەقینەیە کەبەها بالاّکانی مرۆڤ و لێپرسراوەتیەکانی تێدا لەئامێزگرتووە [٥٣]. ئەو ڕۆحەیە کەهەموو پێغەمبەران و

[٥٣] (( ... پم سواه ونفخ فیه من روحه وجعل لکم السمع والّبصار والّفئده قلیلاً ماتشکرون)) سوره السجد: ٩

ئاینەکان باسیان لێوەکردوە، هەروەك چۆن هەموو شاعیرانیش باسیان لێوەکردوە. جیاوازی لەنێوان ڕۆح و نەفسدا وەکو جیاوازی لەنێوانی شێوازە جۆربەجۆرەکانی دەروون لەلای زانای دەرونناسی (( یۆنگ)) و کەسایەتیەکانی (دستۆفسکی) وایە لەڕۆمانی ((تاوان و سزا)) دا. دەروونە جۆراوجۆرەکانی ( یونگ) بونەروەری خراپەکار وئالی و دوو ڕەمەندن بەلاّم ئەوانی تر مرۆڤانێکی ڕاستەقینەن و لەململانیّ و کێشمە کێشێکی بەهێزو بەردەوامدان لەنێوان ئازادی و هەڵەو تاواندا ....کەسانێکن ....دروستکراوی خودان.

# هونەرمەند و کارەکەی

لەکاتێکدا بیر لەسروشتی هونەری ڕۆژئاوایی دەکەینەوە ناسروشتی یا سەرو سروشتی، یەکسەر ئەوەمان بۆ دەردەکەوێت کەتێگەیشتن لەکاری هونەری بەو پیێەی بابەتێکە کەلەجیهانی دەرەوەدا بونیادنراوە ئەمە ئامانجێکی مەبدەئی نییە بۆ هونەر، بەڵکو ئامانجی هونەر بریتیە لەداهێنانێك لەناو خۆیدا، بەلاّم کارە هونەریەکە خۆی، دەرئەنجامێکی( لاوەکی) ئەو داهێنانە زاتیەیە،

﴿ بەمانایەکی تر واتە بەرجەستەکردنی هونەر نابێتە ئامانجێکی سەرەکی هونەر بەڵکو خودی داهێنانەکە ئامانجە (.وە . ك) ﴾ هونەر بریتیە لەشەوق و خواست یان ئارەزوو ئەمانەیش شتانێکی ناوخۆیین لەڕۆحدا نەك دەرەکی بن لەجیهانی دەرەوەدا. بەمەیش هونەر پارێزگاری لەسروشتی خۆی دەکات هەتا لەکاتی نائامادەگی کاری هونەریشدا. بۆیە غەریب نابێت بەلامانەوە ئەو کارانەی کە (بولوك) پیّی هەڵدەستا کاتێك دەیویست وێنە بکێشێت بەسەرپارچە قوماشێکدا دەڕۆیشت، یان بۆری ڕەنگەکانی دەهێنا بەسەر پارچە قوماشەکەدا.(( روزنبرج)) بەقۆناغێکی لەو جۆرە دەستی پێکرد بەزنجیرەیەك لەپارچەی سپی بیّسەرو بەرو قەبارەو پانتایی جیاواز.( ئیفیزکلین)

کتێبێکی لەساڵی ١٩٥٤زاینیدا لەپێشانگایەکدا لەمەدرید بڵاوکردەوە کەپێکهاتبوو لەدەپەڕەی یەك ڕەنگ.(( جون کیدج))ی ئەمەریکی لەپارچەیەکیدا کەداینابوو بەناوی ((٤خولەك و ٣٣چرکە)) لەبەردەم پیانۆیەکدا دانیشت ئەو ماوە زەمەنیە بەبێ ئەوەی بجولێت و پاشان لێ بووەوەو نمایشەکە تەواوبوو !! هەر لەم جۆرەش ئەو وتەیەی کەدەڵێت ((نەجولانی هاملت پڕە لەڕووداوو جولان))، هەروەها هەر ئەمەیش جێبەجێ دەبێت بەسەر ئەو حاڵەتەی بێ دەنگی و نەبوونی ڕووداوەدا کەلەشانۆگەریەکانی ((ئەنتون چیخوف)) دا هەیە. کەلەچەند شوێنێکدا دیمەنی وای تێدایە کەتەنها بریتیە لەبێدەنگیەك ...هیچ شتێك لەسەر تەختی شانۆکەدا ڕوونادات، لەگەڵ ئەوەشدا شانۆگەریەکە بەردەوام دەبێت، لەو دیمەنانەدا قسەو وتووێژ ڕێڕەو ناوخۆییەکەی وەرگرتووە، چونکە هیوا، خۆزگە خواستن و توڕەیی و شەرمەزاری و عارو بێزاربوون ئەمانە ڕووداونین بەڵکو حاڵەت و کارلێکێکی (جوانی) و ناوەوەی خودی مرۆڤن. لەشانۆگەری (( نوح))ی ژاپۆنیدا دیمەنی تێدایە ئەکتەر بۆ ماوەی بیست دەقیقەیەك جولانەوە ئەنجام نادات ...لەدرێژەی ئەو ماوەیەدا تەعبیر لەململانێ ناخۆییەکانی خۆی دەکات.

ئەم هەڵوێستە ... کەهەتا لەعەبەسیەتیش نزیك دەبێتەوە. لەهونەردا بوونی هەیە، بونێکی ناوخۆیی کەجەخت لەسەر(جوانی) و زاتیەت دەکات و ئینکاری( بَرانی) و بابەتی دەکات. پارچەیەکی یەکڕەنگ لەشێوەیەکی نارەسمیدا تەنها دەتوانین بەو شێوەیە لێی تێبگەین، بەوەی کەئینکاریکردنێکی رەهای جیهانی دەرەکییە، ئەمەیش ئینکارکردنێکە ناتوانرێت تەعبیری لێبکرێت بەشێوەیەکی لەوە ڕوون و ئاشکراتر. چالاکی وێنەکێشان لەخۆیدا – نەك تابلۆ کێشراوەکە – بریتیە لەهونەر بەمانا ڕاست و دروستەکەی. هەر کارێکی هونەریش دەمێنێتەوە لەشێوەیەکی جێبەجێ نەکراوو نابەرجەستەدا، لەحاڵەتی (شەوق)دا دەمێنێتەوە، بەڵام ناکرێت بگۆڕێت بۆ بەرهەم هێنانێکی بەکۆمەڵ.

نابێت هونەر سیفەتە بیٚهاوتاییەکەی خۆی وونبکات. نەبوونی ئەم بیٚهاوتاییەش نابێتە هۆی بەتاڵکردنەوەی بوونی (کارەکە) بەڵکو لە بەرگرتنەوەی نوسخەی تریان چەندین نوسخەی تر دەبێتە هۆی بەتاڵکردنەوەی. ئێمە لێرەدا دەگەینە ناسازییەك، واتە تێکدان و شێواندنی کاری هونەری بەهۆی گرتنەوەی چەندین نووسخەی ترەوە لیٚی.

ئەتوانین ئەوەی لەپێشەوە باسمانکرد کورت بکەینەوە لەمەدا، هەموو ئەو ئیلهامانەی هونەرمەندو ئەو وەهم و خەیاڵانەی کەلەناخیدا دەسوڕێنەوە، بریتین لەبەئەنجام گەیشتنی کۆتایی بۆ کاری هونەری و پێدانی مۆرکێکی تایبەتمەندانە بەخۆی و بەهونەرەکەی.

(( شویترز))دەڵێت :(( هەرچی هونەرمەندە هەڵەنیـیە بریتیە لەهونەر)).[٥٤] لەبەرئەوە، پارچەکانی ئەو پاسکیلە کە( بیکاسۆ) هەستاوە بەتەشکیلکردنی بەدەستی و پاشان مۆری خۆی لێداوە، ئەمە بووەتە کارێکی هونەری. هەروەها نمونەی تری لەم جۆرە بهێنمەوە، ئەو سەرە گایەی کەلەمۆزەخانەی(لیوز لیدس) لەپاریس هەیە. ئا لەم خاڵەدا (هەموو شتەکان لەدەوری ئەوە دەسوڕێنەوە کەنیەتەکە لەسەری پێکهاتووە) هونەر و ڕەشت و ئاین یەك دەگرنەوە.

( لیس البر ان تولوا وجوهکم قبل المشرق والمغرب)[٥٥]. نیەت یان ئیلهام وەکو بەهایەك دەمێننەوە ناکرێت ملکەچ بکرێت و سنووردار بکرێت لەڕەفتارو سلوکی مرۆڤیدا، هەتا ئەگەر شوێنەواریشی دەرنەکەوێت لەجیهانی دەرەکیدا. هونەر بریتیە لەئەفراندن. واتە ئەو چالاکیە ئەفرێنەرانەیە لەناوخۆیدا، ئەخلاقیش (بریتیە لەو نیەتەی کەلەدڵدا جێگیربووە)، هەر ئەویشە کەبەهای تەواو راستەقینە دەبەخشێتە کارێك هەتا ئەگەر

---

[٥٤] بڕوانە :(( کورت شویترز)) ( Kurt Schwitters: Das Literische Werk , ed . Friedhelm Lach Koln :M. Dum Schauber, 1973 ).

[٥٥] بڕوانە قورئان سورەتی( البقره) ئایتی ١٧٧.

هەوڵێکی (فاشل) یش بێت یان کۆشش و قوربانیەك بێت کەنەگەیشتبێتە ئەنجام. ئێمە، لەکاتێکدا ئەگەر لایەنێکمان وەرگرت کەنائەسڵی و ناجەوهەریە لەئەخلاق و هونەرو ئایندا، ئەگەر گێڕامانەوە بۆ جەوهەرەکەی بەتەنها، ئیلهام و خۆزگەو نیەت دەبینینەوە، یان لەیەك ووشەی کورتکراوەدا( ئازادی) کەبریتیە لەکرۆك و پێکهاتی کۆتای و ڕەسەن. بەو شێوەیە، پێناسەی ئەخلاق و هونەر و ئایین یەکێکەو بریتیە لەمرۆڤایەتی خالیس و پوخت.

هەتا ئەو کارە هونەریانەی کەسروشتیان وایە دووبارە ببنەوە وەکو( مۆسیقا)، ئەوا لەڕێگەی کەسێتی هونەرمەندەکەوە تازە دەبێتەوە( ئەوەی کەعەزفی دەکاتەوە).( ارثر روبنشتین)، دەڵێت: سەرەڕای ئەوەی کەچەندین جار هەستاوە بەعەزفکردنەوەی سەمفۆنیای چوارەمی (بتهۆڤن) بەڵام هیچ جارێك وەکو شێوەی پێشوتر عەزفی نەکردۆتەوە.(مایرهولد) شانۆکەی تەرخانکردبوو تەنها بۆ نمایشکردنی شانۆگەری (هاملت) تێیدا. لەهەموو جارێکدا دەرهێنەرێکی نوێ دێت و شانۆگەریەکی نوێی لێدەردەهێنێت. ئەمەش مومکینە، چونکە هونەر لەکارەکەدا نی‌یە، بەڵکو، لەژیانی (جوانی) کەسێتی هونەرمەندەکەدایە، ئەم کەسێتیەش ئازادییەکی پاك و بێ‌خەوشە. ئەنجامەکەیش ئەمەیە : هونەرمەندو بینەر پێکەوە مومارەسەی کارە هونەریەکە بکەن بەشێوازێکی نوێ تر.

لەکاتێکدا قسە لەبارەی کارەی هونەریەوە دەکەین، لەواقیعدا ئێمە قسە لەبارەی داهێنەرەکەیەوە دەکەین. لەبارەی ئەو مرۆڤەوە کە دایهێناوە،( بیکاسۆ) دەڵێت: ئەو کاتێك دەڕوانێتە تابلۆکانی (سیزان) سەری سوڕدەمێنێت لەو شەوق و حەماسەتەی کەزاڵ دەبێت بەسەر (سیزان)دا کاتێك هەڵدەسێت بەکێشانی ئەو تابلۆیانە.

هەروەها( بیکاسۆ) دەڵێت: ((گرنگ ئەو کارە نی‌یە کەوێنە کێشەکە پی‌ی هەستاوە، بەڵکو لەوە گرنگتر خودی هونەرمەندەکەیە کەکی‌یە)).[٥٦] لەتێڕوانینی بیکاسۆدا کاری هونەری گرنگە تەنها، لەو ڕووەوە کەڕەنگدانەوەی کەسێتی هونەرمەندەکەیە. کاری هونەری هەتا دەبێتە ڕەنگدەرەوەی ژیانی ئەخلاقی هونەرمەندەکەیش لەبەرئەوە (بوریس باسترناك) دەڵێت :(پیاوی دڕندەو خراپەکار ناتوانێت ببێتە شاعیرێکی گەورە).[٥٧] کاری هونەری لەهەمانکاتیشدا بریتیە لەخودی هونەرمەندەکە. لەبەرئەوە، زۆربەی جار کارێك بەخاوەنەکەیدا دەناسینەوە، لەبری ئەوەی ناونیشانی تابلۆ هونەریەکان بڵێین دەڵێین تابلۆی (سیزان) یان تابلۆی ((دورەر))یان تابلۆی ((روبنز)). کاتێك دەڵێین (( رمبرانت)) باسی (پاسەوانی شەو) ناکەین، ئێمە تەنها بەهێنانی ئەو ناوە هەموو شتێکمان لەبارەی تابلۆکەوە وتوە. ئەمە بریتیە لەجەوهەر، ئەوانی تر بێجگە لەمە شتانی لاوەکین . هونەر ئینتیمای بۆ جیهانی ڕاستگۆیی و(جوانی) هەیە نەك جیهانی واقیعی و دەرەکی. لەبەرئەوە دەتوانین هێڵێکی جیاکەرەوە لەنێوان هونەری ڕاستەقینەو هونەری ساختەو ڕووکەشدا دابێێن. لەنێوان قەصیدەیەکی ئیلهاماوی و قەصیدەیەکی بەپی‌ی خواست دروستکراودا.( لەبەرچی هەموو کۆپیکراوێك ناشرین بووە) وەکو( ئاین) ئەمەی بەناڕەزاییەوە ڕاگەیاند ( ئیلین ناوێکی وەرگیراوە بۆ ئیمیلی چارقیبر) جیاوازی لەنێوان ئەسڵ و کۆپیکراودا تەنها لەلایەنی ئەفراندنەوە هەیە. بەڵام لەلایەنی بابەتیەوە، جیاوازی نی‌یە، ئەگەر هەیشبێت، ئەوا جیاوازیەکی بچووك و کەمە.

هەمان ئەم بنەمایەش بەسەر کارە نزم و کەم بەهاکانیشدا جی‌بەجی دەبێت لەهونەردا، ئەو کارانەی کەپێیان دەوترێت(( Kitch))، هەموو ئەو هەوڵانەش کەدرا بۆ

---

[٥٦] بروانە :( بابلۆ بیکاسۆ) Pablo picasso : Picasso on Art: Selection of Views. ed.Dore Ashton( New York: Viking Press,1979)

[٥٧] بروانە( بوریس باستر ناك) Boris Basternak; Letters to Georgian Friends, trans. David .Magarshak( New York:Harcourt,Brace and World, 1966)

پێناسەکردنی (( کتش)) بێئاکام بوون هەتا (( ئبراهام مولن)) هات و توانی ئەو گرفتە چارەسەر بکات، کاتێك کەشفی ئەوەی کرد کە( کتش) شتێك نیە، بەڵکو پەیوەندیە لەنێوان مرۆڤ و شتدا، پێناسەیەکە بۆ ئەو پەیوەندیە نەك خۆی( ناو) بێت.[58]

ناکرێت وێنەیەك یان شێوازی وێنەکردنێك لەخۆیدا پێناسەی بکرێت بەوەی کەهونەرێکی ڕاستەقینەیە یان ساختەیە، بەڵکو هەڵوێستی هونەرمەندە کەبەرامبەر بەجیهان و بەرامبەر بەکارە هونەریەکەی وای لێدەکات ئەو حاڵەتە دەست نیشان بکات. دووبارەکردنەوەو لاسایی و ئەکادیمیەت، هەموو ئەمانە ساختەو ڕووکەشن لەهونەردا، بەچاوپۆشین لەشێوازو یان جۆری هونەری کەبەرهەمەکە ئینتیمای بۆ هەیە لەلایەنی (الاسمیة) وە. نموونەی ئەم جۆرە کارانە مەحروم و بێبەشن لەئیلهامی ڕاستەقینەو لەئازادی، کەئەو دوانەیش دوومەرجی پێویستن بۆ ژیانی (جوانی) هونەر، هەر (ئەکادیمیەتێکیش لەهونەردا بەمانای مردنی دێت).[59]

ئەو هونەرمەندەی کەدڵسۆزی وون دەکات، ئەو کاتەیش ئەو کارەی بەرهەمی دەهێنێت بۆ ئەم جیهانە مردوو دەبێت. ئەمەیش هەمان ئەو هەڵوێستەیە بەنسبەت ئەو نوێژەمانەوە کەدەیکەن بۆ خوا، نوێژ بەبێڕۆح وبەبێ ئامادەبونێکی(جوانی)، نوێژێکی بەتاڵ و بێمانا دەبێت. ئەکادیمیەت لەهونەردا، وەکو دووڕوویکردن و ڕوپامایی وایە لەئاییندا.[60]

---

[58] بڕوانە :( ئبراهام مولن) : Abraham Moles. Information Theory and Eathetic Perception- trans- Joele.E. Cohen( Urbana, IL:University of Illinois Press, 1966).

[59] بڕوانە: بیکاسۆ : Casso: Art and Con frontation

[60] ئەم حاڵەتە جیاوازە لە( شارستانیەت) دا، شتەکان بەهاو نرخێکی بابەتیان هەیە بەچاوپۆشین لەوانەی کەهەستاون بەئەنجام دانی، بۆ نمونە : هێڵی شەمەندەفەرو ڕێگاوبان لەکەناری ڕۆژئاوای وڵاتە یەککرتووەکاندا دروستکرا کەبەهەلاین خەڵك لێی سوودمەندبوون و بەهۆیەوە سیمای ژیان لەئەمەریکادا گۆڕا، ئەوەی بەئەنجامدانی ئەو کارە و ڕاکێشانی ئەو هێڵانە هەستابوون پیاوانی بانکەکان و پارەپەرستەکان بوون کەمەبەستیان بەدەست هێنانی قازانج و سەرمایەبوو.بەلام هیچ یەکێك لەو پاڵنەرە تایبەتیانەیان نەبووە هۆی ئەوەی کاریگەری هەبێت لەسەر ئەو پرۆژانە.

گرنگییەتی سەرەتاو ئەوەلّی بۆ ئەفراندن وەکو جولّەو بزاوتێکە بۆ ڕۆح، گرنگییەتی (لاوەکیش) بۆ کاری هونەری ئاڵۆزو وەکو واقیعە لەجیهانی دەرەکیدا، هەردوکیان دەوردەبینن لەبەدیهێنانی کاری هونەری نائاشکرادا لەڕووی تێگەیشتنەوە. پێویستە لێرەشدا هەڵوێستەیەك بکەین لەسەر ئەوەی کەهیچ کارێکی هونەری نی‌یە ڕێژەی لێ‌تێگەیشتنی تەواو بێت، بەو مانایەی هەموو کەس بتوانێت وەکو خودی هونەرمەندەکە لێی تێ‌بگات. چونکە (( کاری هونەری مەسەلەیەکە پەیوەندی بەجیهانی ناوەوەو شاراوەی مرۆڤەوە هەیە مەسەلەیەکی(جوانی)یە ...نهێنیە ...پەیوەندی بەبڕواوە هەیە)).[٦١]

تێگەیشتن و کەشفکردنی لەلایەن کەسانی ترەوە تەنها بەشێوەیەکی ڕێژەیی دەبێت (( شیریکو)) یەکێکە لەپێشەوایانی هونەری وێنەکێشی ئیتالی و، دامەزرێنەری ئەوەیە کەناسراوە بە( وێنەی میتافیزیکی) دەڵێت :((یەك کەس هەیە کەدەتوانێت لەتابلۆکانم تێ‌بگات، ئەو کەسەش خۆمم)).[٦٢]

هەموو کارێکی هونەری، بەمانایەك لەماناکان، بریتیە لەسەربوردێکی زاتی. ئەو درامایانەی کەوا نوسەرە تراژیدیەکان نوسیویانە، بریتیە لەڕەنگدانەوەی ئەو ناخۆشی و ناڕەحەتیانەی ژیانی تایبەتیان. لەم بارەیەوە( ئینجازیو سیلۆن) دەڵێت :(سەرەڕای ئەوەی من شتێکم لەبارەی ژیانی تایبەتیمەوە نەنوسیوە، بەلاّم هەموو کەسێتیەکان لەڕۆمانەکانمدا لەبارەی ژیانمەوە دەدوێن). شیعر ڕازی دەروونە، ڕازێکی بێدەنگیشە لەزۆربەی کاتدا. حەقیقەتێکی کامڵە تەنها لەلای خودی شاعیرو لەجیهانە تایبەتیەکەیدا. (ئەلبرتۆجیاکومتی) دەیەوێت چیمان پێ بڵێت لەڕێگەی پەیکەرە بچوکەکانیەوە کەچاویان نی‌یە ؟ هەر خۆی لەڕێگەی پێناسەکردنیەوە بۆ هونەر

---

[٦١] ئەم دەستەواژەیە دەگەڕێتەوە بۆ نمونەوانی فەرەنسی( ئادەم).

[٦٢] بڕوانە :(جیور جودی شریکو) Ciorgio de Chirico: De Ohirco: Essays by Maurizio Fagiolo dell, Arco, et Willian S. Rubin(New York: museum of Modern Art, 1982)).

بەشێوەیەکی هەندەکی وەڵامی ئەم پرسیارە دەداتەوە بەوەی کە (( چالاکیەکی ئاڵۆزەو گەڕانێکە بەدوای مەحاڵدا و هەوڵدانێکی بێهودەیە بۆ دەستەوەدان لەئاگر ...ڕۆحە ... جەوهەری ژیانە))[٦٣].

لەم گەڕانە بێهودەیەدا.. لەم چالاکیە مەحاڵەدا هەموو مرۆڤێك بەتەنها دەوەستێت، هەموو کەس ڕێگەی تایبەتی خۆی دەگرێتەبەر. لەپاشاندا، ناڕەزایی خوێنەران لەقەصیدەیەك و لەبینینی تابلۆیەك یان پەیکەرێك بەوەی کەڕوون نی‌یە و لێی تێناگەن، بەڵکو ئەوە لەبنەڕەتدا لەئەنجامی تێنەگەیشتنیانەوەیە لەجەوهەری هونەر. ئەفراندن بریتیە لەئامانجی ڕەسەن و بنەڕەتی لەهونەردا، لەکاتێکدا کاری هونەری بریتیە لە(هێما کامڵ نەبووەکەی). لەکردەی ئەفراندندا هونەر بەشێوەیەکی تەواو دەردەکەوێت وەخۆشی و ئاسودەیی هێشتا نەتەرێنراوە، بەڵکو بەشێك لەوە کاتی دەست پێکردن بەکارەکەدا پەیدا دەبێت و ڕوودەدات. زۆر جاریش ناڕەحەتە بتوانین لەمانای وێنەی کەسێك یان پەیکەرێك تێبگەین و وەریبگرین، چونکە لەو کاتەدا کارەکە جیابۆتەوە لەهونەرمەندەکەو لەکردەی ئەفراندنەکە. بەسەرکردنەوەو سەردانی لەمۆزەخانە هونەریەکان وا لەمەشاعیرمان دەکات هەست بەجۆرێك لەدابڕان و بێلایەنی بکەین چونکە (( ئاگرە پیرۆزەکەی)) ئێستا نادرەوشێتەوە لەوێدا.((جان دی بیفیە)) لەبارەی ئەمەوە دەڵێت: ((ئەوانە لەساتێك لەساتەکاندا تابلۆ بوون بەڵام ئێستا بەو شێوەیە نەماون))[٦٤].

هەرکارێکی هونەری دەرەنجامی ئاگرێك بووە کەجارێك گەشاوەتەوە لەڕۆحدا، بەڵام ئەوەی لەڕێگەی ئەو کارەوە بەرجەستە دەبێت یان وێنا دەبێت هەمان ئەو ئاگرە نی‌یە، بەڵکو شایەتیەکە، یان شوێنەوارێکە تەنها دەتوانێت نزیکمان کاتەوە لەخودی ئاگرەکە، ئەگینا جیاوازە لێی و مەگەر تەنها بەشێوەیەك لەشێوەکان بچینەوە سەری.

---

[٦٣] بڕوانە : ژمارەی دوو لەپەراوێزی ئەم بەشەدا.

[٦٤] بڕوانە : ژمارە(١٦) لەپەراوێزی ئەم بەشەدا.

# شــێواز و وەزیــفـە

دەکرێت تێبینی ئەو جیاوازیە بکرێت لەنێوان هونەرمەندەکە و لەنێوان کارەکەیدا لەکاری هونەریدا، ئەوەی کەدەناسرێت بەو جەدەلەی دەربارەی ئەولەویەتی شێواز یان وەزیفە هەیە. شێواز لەبەرامبەری وەزیفەدا یەکسانە بەمرۆڤ لەبەرامبەری شتدا. شێواز تایبەتمەندییەکی کەسی و فەردییە، بەڵام وەزیفە شتێکی ناکەسیەتیو بابەتیە. شێواز ئەفراندنە و وەزیفە دەکەوێتە ژێر شیکارکردن و تاقیکردنەوەو بەرهەمهێنانەوە. شێواز بەوە پێناسە دەکرێت کەبەشکۆ، جوان و ڕازاوەیە، پاکژە، تەجروبەکراوە، بەڵام وەزیفە دەکرێت زیاتر ووردبینی تێدابێت لەلایەنی تەکنیکیەوە. شێواز ئاڵۆزەو وەزیفە مەعقولە ((شێواز بریتیە لەمرۆڤ))[٦٥] وەزیفەش بریتیە لەواقیع یان حەقیقەتی بابەتیانە[٦٦]. دەتوانین بەراورد لەنێوان دووجۆر چالاکی سەربەخۆ جیادا بکەین : تەشکیلی جوانکاری و کەماڵی تەکنیکی. جۆری یەکەمیان، بەرەو هێنانە دی ئەو شەوقەی مرۆڤ هەوڵ ئەدات . کەتەفسیرێك نیە بۆی- بەرەو جوانی، لەکاتێکدا جۆری دوهەمیان لەو چالاکیە، هەوڵی پڕکردنەوەی پێداویستیە ڕۆژانەیی و وەزیفیەکانی مرۆڤ دەدات.

---

[٦٥] بڕوانە :(( جورج ل. بیفون)) : Georges L. Buffon: Oecuvres Choisies, Precedees du discurs qui a obtenu le prix d,eloquence decerne Par I,Acadernie francaisc..(Paris: Delagrave n.d).

[٦٦] ئاسان نیە بتوانین پێناسەیەکی تەواو و ڕازی کەر بۆشێواز بکەین، ئەمەیش پێناسەیەکی گرنگی(( ورنرنیلز)) Wener Nihls:((پەیوەندیەکی هۆکارەکی هەیە لەنێوان سستەمی شێوەکان و لەنێوان ئاڕاستە ڕۆحیەکان دا لەهەرسەردەمێکدا ...وەهەموو شێوەیەك تەعبیرە لەئاڕاستە ڕۆحی و ویژدانیە دیارەکان و بەرجەستەکردنە بۆ پێداویستیە ڕۆحیەکان وەبۆ شیکارکردنیمێژووی)) بڕوانە :(( ورنرنیلز)) werner Nihis : The End of The Functionalist Era, n.p.d.).

شێوازی جوانکاری بەرەو هەمەڕەنگی و فەردییەت دەڕوات، بەڵام کەماڵی تەکنیکی بەرەو شێوازی ئاسایی و گشتی و پەتی و لاسایی کردنەوە ئاڕاستە وەردەگرێت. ئەگەر سەیرێکی ئەو دوو ئاڕاستەیەمان کرد لەژێر رۆشنایی ئەو بیرۆکانەدا کەلەبەشی دووەمی ئەم کتێبەدا خراونەتەڕوو، تووشی سەرسوڕمان دەبین بەتێبینی ئەوی ئەگەر ئەو دوانە بەرەو دورکەوتنەوەو جیابونەوە چوون، یەك لەوی دیٚ، دەبنە هۆی خستنەوەی ئەنجامێك کەخاڵییە لەژیان. هونەری بیناسازی کەباشترین نمونەیەکە لەسەر ئەمە بەهۆی ئەو خاسیەتە تێکلاٚوەیەوە کەهەیەتی : کلێشەی بیناسازی کەتەنها تەعبیرکردنێکە لەجوانی و، ڕووتکراوەتەوە لەلایەنە وەزیفیەکەی، هەر لەگەڵ گوێزانەوەی ئەو نەخشەسازیەدا خێرا دەگۆڕێت بۆ زەخرەیەکی نزم و بیٚ ڕەونەق، بیناکەوای لیٚدێت وا دەردەکەوێت کەپیشەسازیانەو بەتاڵ بێت وەکو ئەو دیکۆرکاریانەی کە لەشانۆدا بەکاردەهێنرێت.

لەلایەکی ترەوە دەبینین، کەماڵی تەکنیکی و وەزیفیانەی خالیس و پەتی ئەو بینایانەیان لیٚبەرهەم دێت کەساردن و رەنگدانەوەی هیچ کەسێتیەکیان پێوە دیار نییە، بینای هاوشێوەو بیٚڕەونەق کەبەسەیرکردنیان هەستی بێزاریت لادروست دەبێت.(میلزڤان دەر روە) کەیەکێکە لەوانەی ناسراوە بەوەزیفیانە لەبیناسازیدا دەڵێت: ((ئەگەر ئێمە دڵسۆزبین، ئیتر پێویست ناکات کەنیسەیەك جیاوازی هەبێت لەگەڵ کارگەیەکدا)).[٦٧]

بەو شێوەیە جارێکی تریش . هەموو ئەو دابەشبوونە مەبدەئیانەی جیهان دەگەڕێنەوە بۆ ئەوەی کە رەنگبدەنەوە لەسەر ئەو ناسازیەی نێوان شێوازو وەزیفە.

---

[٦٧] بڕوانە :(( لودفیج میلزڤان د روە)) Ludvig miles van der Rohe: Miles von der Rohe , ed Martin Pawley( New York;Simon & Shuster, 1970)..

# هونەرو ڕەخنە

دەکرێت ئەو حەقیقەتانەی- کەلەپێشەوە ئاماژەمان پێدان - هۆکاری نوشست هێنانی ڕەخنەی ئەدەبی و سنووردداربونیمان بۆ تەفسیر بکەن، ڕەخنە هەوڵدانێکە بۆ لێکدانەوەی کارێك لەکارەکانی هونەر. بەڵام هەر لەسەرتاوە لەتوانایدا نەبووە هەستێت بەم کارە بەهۆی پەیڕەویکردنی ئەو میتۆدە عەقڵانیەی کەهەیەتی. ئەو دەیەوێت( بیر) لەشتێك بکاتەوە کەئەو شتە لەجەوهەریدا بەرهەمێك نییە لەبەرهەمەکانی (فیکر) [٦٨].

کاری هونەری بەنسبەت هونەرمەندەوە روئیایەکی (جَوانية) کەبەهۆی ئەزموون و موعاناتەکانەوە پەیدابووە، نەك دەرەنجامی شیکارکردن یان بیرکردنەوەی لۆژیکیانە بێت، ((ئەو زادەی ئازارو ژان و ناخۆشیەکانە)).[٦٩] ئەمەیش هۆی ئەوەیە لەوەدا کەرەخنە دەبێتە هۆی کێشمەو تەنگژە زیاتر لەوەی بتوانێت رۆشناییەك بخاتە سەرکاری هونەری لەکاتێکدا دەیەوێت تەفسیری بکات...((ڕەخنە کاری هونەری دەکوژێت)). (ئەنشتاین) لەوتەیەکیدا بۆ ((تۆماس مان)) گازندە دەکات پاش ئەوەی هەوڵی داوە کتێبێکی(( فرانز کافکا)) بخوێنێتەوە، دەڵێت :(( نەمتوانی بیخوێنمەوە ...عەقڵی بەشەری موعەقەد نییە بەو ڕاددەیەی کەبتوانێت لە (کافکا) تێبگات !)) ئەمەیش هەڵوێستی ئەو ڕەخنەگرانەیە کەتوانیویانە (کافکا) تێبپەڕێنن. ((ئەلفرید کاسیم)) لەنوسینێکیدا دەڵێت: خوێندنەوەی خۆم بۆ کافکا ئاسانتربووە لەوخوێندنەوانەی کەزۆربەی ڕەخنەگران و موفەسیرەکانی بۆیان کردوە (کافکا) بەو شێوەیە دەیڕوانی بۆ نوسینەکانیان وەکو نمونەیە لەسەر دابڕانی لەبەشەر.

---

[٦٨] (( ئەندریە مارشان)) Andre marchandدەڵێت :(( وێنەکێش بیرمەند نییە وەبیر(فیکر) سودی نییە لەوێنەدا، بەڵکو ئەو نورەی کەلەڕۆحەوە تیشك دەهاوێت و بڵاودەبێتەوە). هەروەها بسییە دەڵێت : (( وێنەکەمەندکێشی عاتیفەمرۆییەکان دەکات، وەپێویستە لەسەر مرۆڤ هەمیشە بگەڕێتەوە هەمیشە بۆسەرچاوەکان کەپاکترو ڕاستگۆترن — شارستانیەتەکەمان نوقم بووە لەفیکردا، وەکەسی( مفکر) یش، دورترە لەوەی بتوانێت لەڕەمزیەتی هونەر تێبگات)) بڕوانە(( جولیوس بیسیە)) Julis Bissier: Brush Drawings ....(London: Thomas Hudson, . 1966) .

[٦٩] بڕوانە :(( بیکاسۆ)) : Picasso : picasso on Art.

(دستویفسکی) جێگەی ستایش و ڕەزامەندی خوێنەرەکانی بوو، بەڵام ئەوانەی ڕەخنەیان لێدەگرت و توێژینەوەیان لەسەر بابەتەکانی دەکرد سەرچاوەی ئازاربوون بۆی، لەیادەوەریەکانیدا کەلەساڵی ١٨٧٦زاینی نووسیویەتی دەڵێت :(هەمیشە پشتگیری لەنوسینەکانم پشتگیری خوێنەری بوون نەك ڕەخنەیی).[٧٠]

هونەر پێویستی بەبینەرانی ناڕەخنەیی هەیە. چونکە بینەری ڕەخنەگر ئەو کارە هونەریە لەلای دەگۆڕێت بۆ زنجیرەیەك کارەسات و تەعالیمی ئەخلاقی، نیازو مەبەستەکانی هونەرمەند فەرامۆش دەکات. لەبەرئەوە دەتوانین بڵێین بینەری ئاسایی یان خوێنەری ئاسایی، ئاسانترە بۆی دەرك بەپەیامی ڕاستەقینەی کاری هونەری بکات زیاتر لەڕەخنەگرێکی خاوەن مەعریفەیەکی فراوان. ئەو خوێنەرو بینەرانە، لەبەرئەوەی هەوڵنادەن (تێبگەن)لەکارە هونەریەکە، ئەوا سەرکەوتوودەبن لەبەشداریکردن لەتەجروبەکردنیدا. ئەو جیاوازیە لەنێوان ڕەخنەگرو بینەردا لەچێژ وەرگرتنیاندا لەشانۆگەریەك یان قەصیدەیەك دەگەڕێتەوە بۆ ئەوجیاوازیە گەورەی کەلەنێوان ئەو دوو هەڵوێستەدا هەیە.

ڕەخنە و هونەر پێکەوە کۆنابنەوە، وەکو چۆن لاهوت و ئاینیش بەهەمان شێوە کۆنابنەوە.( فوکنر) ئا لەم ڕوانگەیەوە بەتەواوەتی ڕەخنەگرانی شوبهاندوە بە کەشیشەکان ( قەشەکان). کێشە ئەخلاقیەکان دەتوانرێت بەباشی تەعبیریان لێبکرێت، بەباشی، لەڕێگەی دراماو شانۆوە، یان لەڕێگەی ڕۆمانەوە( پێویستە ئەوەش بزانرێت کەقورئان و ئینجیل کتێبی لاهوت نین ئەوەش خاڵێکە تێیدا هونەرو ئایین یەك دەگرنەوە)، یان ڕەنگە ئەوە بسەلمێنێت کەپەیوەندی نێوانیان پەیوەندیەکی پشتگیری و تەواوکارییە. مەسیحیەت لەڕاستیدا دەکرێت وەکو مێژوویەکی حەزرەتی مەسیح –

---

[٧٠] بڕوانە :( دستویفیسکی) Feodor Dostoevski : The Diary of a Writer…(New York :C. Scribner s Sons 1949).

درودی خوای لێبێت. بوونی هەبێت نەك وەکو لاهوت * مەسیح و ئینجیل لەلایەك (پۆڵس) و کەنیسە لەلایەکی تر.

بۆ ئەوەی هەموو ئەمانە کورت بکەینەوە لەو خاڵە هاوبەشانەدا کەلەنێوان ئاین و هونەردا هەیە، دەڵێین هونەر، لەگەڕانیدا بەشوێن ئەو شتانەدا کەمرۆیین، وای لێهاتوە بووەتە گەڕیدەیەکیش بەشوێنی خوادا، ئەگەر واقیعیش ئاماژە بۆ بوونی هونەرمەندانی بەناو بێباوەڕ بکات، ئەمە نابێتە هۆی گۆڕینی هەموو شتێك، چونکە هونەر (ڕێگەیەکە بۆ ئیشکردن نەك ڕێگەیەك بۆ بیرکردنەوە).[٧١]

تابلۆی نائاینی و پەیکەری نائاینی و، هەروەها قەصیدەی شیعری لەو شێوەیەشمان هەیە، بەلاّم هونەری نائاینی بوونی نییە، دیاردەی (هونەرمەندی مولحید)یش دیاردەیەکی زۆر دانسقەیە، دەتوانین بیگەڕێنینەوە بۆ ناسازیەك لەمرۆڤ خۆیدا، ئەوەیش نەسازیەکە دەربازبوون لێی نییە، هەروەها دەگەڕێتەوە بۆ ئەو سەر بەخۆییە ڕێژەییە کەلەحاڵەتێکی عەفەویەوە سەرچاوە دەگرێت و شێوازێکی لۆژیکی وەردەگرێت، سەرەڕای ڕەسەنیەتی ئەو عەفەویەتە کاریگەرەیش، ئەوا هەڵوێستی گشتی مرۆڤ هەر بەجۆرێك فۆرمەلە دەبێت کەوەلاّمدانەوەیەتی بۆ دەرئەنجامی ئەو فشارانەی کەلەنێوان زەوی و ئاسماندا دەیهێنن و دەیبەن. ئەگەر نکوڵی بوونی حەقیقەتی ئاینی کرد، بەهەمان شێوەش نکوڵی بوونی حەقیقەتی هونەریش دەکات.

---

* اللاهوت : ئەسڵی ئەم ووشەیە لە( لا ە) وە بەواتای( اله) واتە( خوا) هاتووە( واو – تا) ی موبالەغەی بۆزیادکراوە وەکو( ملکوت و جبروت) واتە خواناسی، ئەو زانستەیە لەبارەی ئەو بڕوایانەوە دەکۆڵێتەوەکەپەیوەستن بەخواوە.کەسی لاهوتی : واتە ئەو کەسەیزانایە بەو بیروبڕوایانەی کەپەیوەندیان بەخواوە هەیە( و.ك) لە( منجد) ەوە وەرگیراوە.

[٧١] بڕوانە :( شارتێر) Chartier(Alain) Sustien des benix - arts.

# بەشی چوارەم

# ئـــــەخـــلاق

(( دەکرێت کەسانێکی مولحید هەبن لەهەڵس و کەوت و مامەڵەی کۆمەڵایەتیاندا (ئەخلاقی کرداریان) هەبێت، واتە : وەکو کائینێکی کۆمەڵایەتی ئەخلاقداربن بەڵام هیچ سستمێکی ئیلحادی نیە بتوانێت لەبنچینەدا پارێزگاری لەبنەما ئەسڵی و جەوهەریەکەی ئەخلاق بکات )).

# ئەرك و بەرژەوەندی

ئێمە هێشتا سیماو رووخسارەکانی هەردوو سستەمە جیاوازەکەمان بۆ روون نەبۆتەوە، ئەو دووسستەمەی کەهەموو حەقیقەتەکان لەوانەوە سەرچاوەی گرتووە : بەدیهێنان بەهەموو ئەوەی دەیگرێتەوە لەئازادی و عەفەویەت و ئاگایی و فەردیەت، لەلایەکەوە، هەروەها پەرەسەندن (التطور) بەهەموو ئەوانەیش کەدەیگرێتەوە لەسەبەبیەت و کەمتەرخەمی زاتی و کەمتەرخەمی لەبڕی ووزەو هاوڕێکی وگونجان لەلایەکی ترەوە. کەواتە ئەرك و بەرژەوەندی دووئەڵقەن لەناو ئەم دوو زنجیرەدا، ئەرك بریتیە لەزاراوەی بنەڕەتی لەزانستی ئەخلاقدا، بەرژەوەندیش بریتیە لەزاراوەی بنەڕەتی لەزانستی سیاسیدا.

ئەرك و بەرژەوەندی ئەگەرچی ناتەباو نەگونجاو بوون پێکەوە، بەڵام دوو هێزی بزوێنەرن بۆ چالاکی مرۆیی، ناکرێت تێکەڵ بەیەکتر بکرێن. ئەرك هەمیشە بەرژەوەندی تێدەپەڕێنێ، بەرژەوەندیش هیچ پەیوەندیەکی نییە بەئەخلاقەوە. ئەخلاق نە وەزیفیەو نەعەقڵانیە. بۆنمونە : ئەگەر مرۆڤێك ژیانی خۆی خستە ناو مەترسیەوەو خۆی کرد بەناو ماڵێکی گڕگرتوودا، لەپێناوی ڕزگارکردنی منداڵی دراوسێکەی، پاشان هاتەوەو جەستەی منداڵەکەی بەمردووی هێنایەوە، ئایا دەبێ بڵێین ئەم کارە بێسوودە، لەبەر ئەوەی سەرکەوتوو نەبووە ؟ ئەوە تەنها ئەخلاقەکە بەهادەبەخشێتە ئەم قوربانی دانە بێسوودە، ئەم هەوڵە بێئاکامە کەسەرکەوتوو نەبووە، تەواو وەکو ئەو نەخشە بیناسازیە وایە کەجوانی دەبەخشێتە داروپەردووی دێرینەو کۆن.[1]

دیمەنی ئەو دادپەروەرییە بەزیووە، کەدڵمان پێوەبەستراوەتەوە سەرەڕای بەزینیشی، حەقیقەتێك نییە لەحەقیقەتەکانی ئەم جیهانە. چ شتێك لەم جیهانەدا (سروشتی، لۆژیکی، زانستی، فیکری ...) چ شتێك تێیدا دەتوانێت پاساو بۆ رەفتاری پاڵەوانێك

[1] ((أ- بيريت)) A. Perret,n.P.d

بهێنێتەوە کەدەدۆڕێت لەبەرئەوەی پابەندبووە بەدادپەروەری و فەزیلەتەوە ؟ ئەگەر ئەم جیهانە تەنها لەشوێن و کاتدا بوونی هەبێت، ئەگەر سروشت گوێ نەداتە دادپەروەری، بوونی هەبێت یان نەبێت، ئەوا قوربانی دانی پاڵەوانێك بێ'مانا دەبێت. بەڵام ئێمە نکوڵی لەوە دەکەین و بەدووری دەزانین ، کە قوربانیدان بەبێ'مانابێت، دەبێت ئەوە ئیلهامێك بێت لەلایەن خواوە، ئینتیمای بۆ جیهانێکی تر هەیە بێجگە لەم جیهانەی دونیامان، جیهانێکە خاوەنی کۆمەڵێك ماناو یاسای جیاوازە لەم جیهانە سروشتیە بەهەموو یاساو پەرژەوەندیەکانیەوە. ئێمە ئەم کارە دژوارە قەبوڵ دەکەین و بەهەموو لایەنێکانمانەوە بەباشی دەزانین، بەبێ ئەوەی بزانین بۆ، بەبێ ئەوەی پرسیار بکەین لەبارەی هەر راڤەکردنێك لەم بارەیەوە. گەورەی کاری پاڵەوانانە لەسەرکەوتنیدا نییە، بەڵکو زۆرجاریش بێ'بەرهەم دەبێت، هەروەها لەمەعقولیەتیدا نییە، چونکە زۆرجاریش نامەعقوڵ دەردەچێت. دراما کە (ستایشی پاڵەوانی دەکات) پارێزگاری لەیەکێك لەرووناکترین شوێنەوارەکانی ئولوهیەت دەکات لەم جیهانەدا، لەمەدا بەهای گەردونی دراما شاراوەتەوە کەهیچ بەهایەکی تری پێ'ناگات، لێرەدا گرنگیەتی شاراوەتەوە لەلای هەموو خەڵك و لەهەموو جیهاندا.

هەردەبێت بوونی جیهانێکی تر مومکین بێت، ئێمە ناتوانین پاڵەوانە تراژیدیەکان بەبەزیو دابنێین بەڵکو ئەوان سەرکەوتوون.

بەڵام لەکوێ سەرکەوتوون ؟ لەکام جیهاندا ئەوان سەرکەوتوون ؟ ئەوانەی کەئاسایش و ئازادی خۆیان لەدەستداوە . بەڵکو ژیانیان لەدەستداوە . بەچ مانایەك ئەوان سەرکەوتوون ؟ ئاشکرایە کەلەم جیهانەدا ئەوان سەرکەوتوونین. ژیانی ئەو پاڵەوانانەو قوربانی دانەکانیان بەشێوەیەکی تایبەتی وامان لێ'دەکات کەوا هەمیشە هەمان پرسیار دووبارەبکەینەوە : ئایا بۆ بوونی مرۆیی مانایەکی تر هەیە ؟ مانایەك جیاواز لەم مانا رێژەیی و سنووردارە. یان ئەو پیاوە گەورەو ئازایانە تەنها نمونەیەکی دۆڕاوو(فاشل)ن؟.

ئەخلاق وەکو دیاردەیەکی واقیعی لەژیانی مرۆڤایەتی‌دا، ناکرێت راڤەیەکی عەقڵی بۆ بکرێت، لەوانەیە لەمەدا (حوجەی) یەکەم و عەمەلی بێت بۆ ئایین، رەفتاری ئەخلاقی، یان ئەوەتا بیّ‌مانایە یان ئەوەتا لەبوونی خوادا مانای هەیەو ئالەمەدا خەیاری سیّ‌هەم نی‌یە، یان ئەوەتا ئەخلاق بڕوخێنین، بەو پیّ‌یەی کەوا کۆمایەکە لەدەمارگیری، یان بەهایەك بخەینە ناو هاوکێشەکەوەو دەکرێت ناوی بنێین نەمری، ئەگەر مەرجی ژیانی نەمری مسۆگەرکرا، ئەگەر جیهانێکی تر بێجگە لەم جیهانە بوونی هەبوو، و خوا بوونی هەبوو، بەمەش ئەو کاتە رەفتاری مرۆڤی ئەخلاقیش مانای دەبێت و پاساوی بۆ دەبێت.

کەمینەیەکی کە من لەو خەڵکانەی کەبەپیّ‌ی یاسای فەزیلەت کاردەکەن، بەلاّم ئەم کەمینەیە فەخرو شانازی رەگەزی بەشەری و شانازی هەموو مرۆڤێکن. کەمن ئەو ساتانەش کەتیایاندا بەرزدەبینەوە بەسەرخۆمانداو گویّ نادەینە بەرژەوەندی و سودە ساتە وەختیەکان. ئەم ساتانە بریتین لەو پاشماوانەی کەلەژیانماندا دەمێننەوە و بەسەرناچن. ناکرێت مرۆڤ بیّ‌لایەن بێت بەنسبەت ئەخلاقەوە، لەبەرئەوە، یان ئەوەتا ڕاستگۆدەبێت لەئەخلاقی‌دا یان کەسێکی درۆزن دەبێت، یان درۆو ڕاستی تێکەڵ دەکات، ئەمەش حاڵەتێکی بلاّوترە لەناو مرۆڤەکاندا.

خەڵکی بەشێوەیەکی جیاواز هەڵسوکەوت و مامەڵە دەکەن لەگەڵ یەکتردا، بەلاّم هەمیشە بەیەك شێوە دەربارەی داد و حەق و ڕاستی و ئازادی و یەکسانی قسە دەکەن: دەسەلاّتداران و پاڵەوانەکان بەحوکمی دڵسۆزی و پشتگیریان بۆ حەق ئەمە دەکەن، سیاسیەکان و سەرکردەی شۆڕشە هەرەمەکیەکان بەدووڕوویی و بەپیّ‌ی پاڵنەری بەرژەوەندیەکانیان هەمان شت دەکەن.

ئەخلاقی ساختە کە دووڕووەکان و سەرکردە هەڕەمەکی و بەرژەوەندی خوازەکان مومارەسەی دەکەن، گرنگی کەمتر نی‌یە لەو بابەتەی کەئێمە مشتومڕی لەسەر دەکەین. خۆدەرخستن و ڕواڵەتبازی و سووربوون لەسەر خۆشاردنەوە لەژێر دەمامکی

ئەخلاقیدا، ئەمەیش لەو هەڵمەتە ڕاگەیاندنانەدا دەردەکەوێت کەلەژێر ناوی دادپەروەری و یەکسانی و مرۆڤایەتیدا دەکرێن... هەموو ئەمانە جەخت لەسەر حەقیقەتی ئەخلاق دەکەنەوە، هەروەکو چۆن موعانات و جوامێری پاڵەوانەکان و شەهیدەکانیش جەختی لەسەر دەکەنەوە.

مێژووی سیاسی، بەتایبەتی لەچاخی نوێدا پڕ پڕە لەنمونە لەسەر ئەوەی دوژمنانی ئازادی پێی هەڵدەستن ئەوانە کەبەهۆی دەزگا سیخوڕی و داپڵۆسێنەرەکانیانەوە دەسەلأتیان بەسەر خەڵکیدا گرتووە و زاڵبوون بەسەریاندا، لەهەمان کاتیشدا بەهۆی دەزگاکانی تری ڕاگەیاندنیانەوە بەدەنگی بەرز بانگەشە بۆ ئازادی و دادپەروەری دەکەن. دووڕوویی کەڕووکەشکردنێکی ئەخلاقیە لەهەمانکاتیشدا، بەڵگەیە لەسەر بوونی ئەخلاقی ڕاست و دروست، هەروەکو چۆن پارەی ساختە نرخێکی کاتی هەیە بەنسبەت پارەی یاساییەوە کەبەهایەکی هەمیشەیی هەیە، دووڕوویی بەڵگەیە لەسەر ئەوەی کەهەموو مرۆڤێك چاوەڕوانی یا داوای ڕەفتارێکی ئەخلاقی دەکات لەلایەن هەموو خەڵکانی ترەوە.

# نیەت و کار

لەجیهانی سروشتدا شتانێك هەیە کەوا بونێکی بابەتیان هەیە، زەوی بەدەوری خۆردا دەسوڕێتەوە، ئەمە شتێکە لەحەقیقەتدا وایە ئێمە بزانین پێی یان نەزانین بمانەوێت یان نەمانەوێت، ڕەنگە نکوڵی لێبکەین، بەلأم ناتوانین خۆمانی لێ گێل بکەین یان گۆڕانی بەسەردا بهێنین، بەلأم لەجیهانی ئەخلاقدا، ئەم حەقیقەتانە مانایان نیە، چونکە نەخەیرن و نەشەڕ، بەڵکو بونیشیان هەر نیە، لەجیهانی (جوانی) ماندا، شتەکان بونێکی بابەتیان نیە، چونکە ئەوە ئێمەین کە ڕاستەوخۆ بەشداری لەبونیدا دەکەین کەئەم جیهانە (جوانی)یە پێك دەهێنین، ئەمەیشە کەبریتیە لەگۆڕەپانی ئازادی مرۆڤایەتی.

لەجیهانی(بَرانی)دا ئەو کارانە دەکەین کەپێویستە لەسەرمان ئەنجامیان بدەین، لەم جیهانەدا دەوڵەمەندو هەژار هەیە، زیرەك و تەمەڵ هەیە، فێرخوازو نەزان هەیە، بەهێز و لاواز هەیە (هەموو ئەم شتانە لەسەر وویستی ئێمە ناوەستن، تەعبیر لە زاتیەتی رەسەنی ئێمە ناکەن. لەبەرامبەر ئەم جیهانەدا جیهانێکی (جوَانی)مان هەیە، جیهانێکە لەسەر بنەمای ئازادی و هەڵبژاردنە یەکسانەکان وەستاوە، بریتیە لەئازادیەکی تەواو وکامڵ، چونکە هیچ سنورێکی ماددی یان سروشتی ڕێگری ناکات.

ئازادی لەنیەت و ئیرادەدا تەعبیر لەخۆی دەکات، هەموو مرۆڤێك شەیدای ئەوەیە یان ئاواتی ئەوەیە بەشێوەیەك بژی لەگەڵ ویژدانیدا هاوڕێك بێت و بگونجێت و بەپێی یاسا ئەخلاقیە دیاریکراوەکان بێت. ڕەنگە ئەمەیش بەکردارکردنی بەلای هەندێکەوە ئاسان نەبێت، بەڵام هەموو مرۆڤێك ڕێزی بەهای و دامەزراویەتی دەگرێت. زۆرێك لەخەڵکی نازانن بەچ ڕێگەیەك ستەم دووربخەنەوە، بەڵام هەموو خەڵکی لەتوانایدایە رقیان لەستەم بێت و بەدرێوی بزانن لەناخیاندا. لەمەیشدا واتای پەشیمانی خۆی حەشار دەدات. مرۆڤایەتی لەحاڵەتی کەماڵدا نی‌یە بەدور نی‌یە لەهەڵەکردن. ئەگەر هەڵەتکردو پەشیمان بویتەوە، ئەمە ئەوە دەسەلمێنێت کەتۆ مرۆڤیت. بڕوانە بۆ کەسێتی ((الیوشا کرمازۆف))و کەسێتی(( میشا کرمازۆڤ)): ((الیوشا)) خۆشحاڵ و ڕازییە لەکەسێتی خۆی کەخەریکە لەکەماڵ نزیك دەبێتەوە، لەکاتێکدا ((میشا))مرۆڤانە دەتەقێتەوە، سەرەڕای هەمو ئەوانەی تێیدایە لەهەواو ئارەزوو هەڵە بەڵام بەیەقینەوە، هەست دەکات کەزۆر نزیك ترە لەبەزەیی و لێخۆش بوونی خواوە.

چەندین شتمان لەڕابردودا ئەنجام داوە کەلەحەقیقەتدا نەمان ویستووە ئەنجامی بدەین؟ چەندین شتیش هەبوون و ئاواتەخوازبووین ئەنجامیان بدەین، کەچی هەرگیز ئەنجامممان نەداون؟ کەوابوو، لێرەدا دوو جیهان هەیە : جیهانی دڵ و جیهانی سروشت. حەزو ئارەزوو هەرگیز بەتەواوەتی نایەنەدی، بەڵام ئەوە حەقیقەتێکە لەجیهانی دڵماندا، حەقیقەتێکی کامڵە. لەلایەکی ترەوە هەندێ کردار بەشێوەی ڕێکەوت ڕوودەدات، کردارێك کەمەبەست نەبووە ڕوبدات کەچی بەتەواوەتی لەجیهانی

سروشتدا ڕووی داوە، بەڵام بەهیچ شێوەیەك لەجیهانەکەی تردا، جیهانی( جوانی) ماندا ڕووی نەداوە.

ئەم پەیوەندیە لەنێوان ئیرادەو کردەوەدا پەرچی ئەو ناسازیە بنەماییە دەکاتەوە کەلەنێوان مرۆڤ و جیهاندا هەیە، ئەمەیش بەشێوەیەکی یەکسان لەهەریەك لەئەخلاق و هونەرو ئاییندا دەردەکەوێت. نیەت و خواست و تەقوا، لەڕووی( جوانی) یەوە پەیوەست و نزیکن لەیەکترەوە پەیوەندیشیان یەکێکە لەرەنگدانەوە مادییەکانیاندا : لەرەفتاردا، لەکاری هونەریدا لەدروشمە پەرستشیەکاندا. یەکەمیان ئەزمونێکی رۆحیە و، دوهەمیشیان ڕوداون لەجیهانی دەرەکیدا.

لێرەدا پرسیارێك دەوروژێت: ئایا بەپێی نیەتەکان کەلەدڵدا دروست دەبن حوکم بەسەرکردەوەکاندا بدەین، یاخود بەپێی ئەنجامەکانیان کەلەو کردارانە کەوتونەتەوە ؟ هەڵوێستی یەکەم بریتیە لەپەیامی هەموو ئاینێك، بەڵام هەڵوێستی دوهەم بریتیە لەدروشمی هەموو ئایدۆلۆژیەت و شۆڕشێك، لێرەدا دوو لۆژێکی دژبەیەك و نەگونجاو هەن، یەکەمیان ئینکارکردنی جیهان تییدا ڕەنگدەداتەوە، ئەوی تریشیان ئینکارکردنی مرۆڤ. بۆیە پێویستە لەسەر زانست و تیۆری مادیەت کەلەسەر مەسەلەی رەسەنیەتی و نیەت و مەبەست لەرەفتاری مرۆیدا قسەی خۆیان هەبێت. لەکۆتاییدا گەیشتنە ئەوەی کەنیەت بنەمایەکی سەرەتایی و رەسەن نییە بەڵکو شتێکە لای ئەوان راڤە کردنێکیان بۆی نییە، شتێکە نزیکترە لەوەی ئەنجام بێت، وەك لەوەی کە هۆکاربێت. لێرەوە سەرچاوەی کرداری مرۆیی - لای ئەوان - بریتی نیە لەنیەت بەڵکو دەکەوێتە ناوچەیەك لەپشت نائاگاییەوە کەبریتیە لەناوچەی جەبریەتی گشتی.

بەڵام ئاین بە پێچەوانەی ئەوەوە بڕیار دەدات. جەخت لەسەر ئەوە دەکاتەوە کەمەڵبەندێکی (جوانی) لەهەموو مرۆڤێکدا هەیەو جیاوازە لەهەموو جیهان. ئەو مەڵبەندەیش قوڵترین شتە لەمرۆڤدا، کەبریتیە لەدەروون. نیەت هەنگاوێکە بەرەو قوڵایی خوو، لەوێدا مرۆڤ کردەوە بونیاد دەنێت، یاجێبەجێی دەکات ولەڕووی

(جوانی) یەوە جەختی لەسەر دەکاتەوە. لەجیهانی دەرەکیدا تەنها پێی هەڵدەسێت ڕەنگە ئەنجامیشی نەدات، بەلام لەجیهانی( جوانی)دا کردارەکە ئەنجام دراوەو کۆتای پێهاتووە.

بەبێگەڕانەوە بۆ ئەو جیهانە (جوانی)یە هەموو کردارەکانی مرۆڤ دەبنە کردارێکی ئالیانە، دەبنە تەنها ڕێکەوتێك لەجیهانی( بڕانی)و فانینماندا. .مرۆڤ بەوە نی‌یە کەدەیکات بەڵکو بەوەیە کەدەیەوێت، یان دەیخوازێت بیکات، بەوەیە کە بەتامەزرۆییەوە خواستی دەکات. لەئەدەبدا نوسەر تەنها خۆی بەگرێی چیرۆکەکەوە نابەستێتەوە، بەڵکو قوڵ دەبێتەوە لەدەروونی پاڵەوانەکەیداو پێناسەی لایەنە شاراوەکانی دەکات و دەیانخاتەڕوو. ئەگەر ئەمە نەکات، ئەوا ئەوەی کەدەینوسێت تەنها گێڕانەوەیەکە بۆ مێژوویەکی زەمەنی پڕ لەڕووداو، نابێتە کارێکی ئەدەبی.

((ئەرنۆڵد جیولنکس)) پێی وایە کەبوونی ڕاستەقینەی ئێمە تەنها لەسەر دەرك و ئیرادە دەوەستێت و بریتیە لەپێکهاتەیەك کەوامان لێدەکات دەستەوسان بین بەهەستان بەو کردارانەی دوورترن لەسنووری ئاگایمانەوە، هەموو فرمانەکان خەریکە وایان لێدێت کەدووربن لەتوانامانەوە، چونکە هەموویان موڵکی مەشیئەتی خوایین، لەبەرئەوە ئەخلاق لەکرداری دڵسۆزانەدا نابێت، بەڵکو تەنها لەنیەتی دڵسۆزانەدایە.

((هیوم)) تەعبیر لەبیرۆکەیەکی هاوشێوەی ئەمە دەکات، هەر بۆیە دەڵێت: ((کردار لەخۆیدا بەهایەکی ئەخلاقی نی‌یە، بۆ ئەوەی بەهای ئەخلاقی مرۆڤ بناسین پێویستە لەسەرمان لەناوەوەی بڕوانین، بەلام ئێمە ناتوانین بەشێوەیەکی ڕاستەوخۆ ئەم کردارە بکەین بۆیە بۆ کردارەکانی دەڕوانین، بەلام ئەو کردەوانەی لەوەوپێش و ئێستایشی تەنها کۆمەڵێك هێمان لەسەر ئیرادەو خواستی ناوەوەی ئەو کەسە، لەپاشان هەروەها ئەمانەیش هێمایەکن بۆ هەڵسەنگاندنی ئەخلاقی.[٢]

---

[٢] بڕوانە(( دافید هیوم)) David Hume: Treutise on Human Nature( London: J. M. Dent and Sons, 1926).

ئەو کارەی لەسەر نیەت پێکهاتووە، کارێکە لەجیهانی ئەبەدیەتدا ئەنجام دراوە. بەڵام ئەنجامدانی دەرەکیانەی، مۆرکێکی سەر زەویانە لەخۆدەگرێت کەمەرجدارەو رەسەنیەتی تێدا نییە رێکەوتە، هەر مانای نییە. نیەت ئازادە، بەڵام ئەنجامدانی دەچێتە ژێر رکێفی چەند کۆت و پێوەندو یاساو مەرجێکی واقیعیەوە. نیەت بەهەموویەوە موڵکی ئێمەیە. بەڵام بەئەنجام گەیاندنی بەدەوری چەند شتێکدا دەسوڕێتەوە کەغەریبە بە ئێمەو نمایشکارییەکە لەخۆیدا، کەهەرگیز ناتوانێت وەکو خۆی نمایشی ئەو نیەتە بکات کەلەدڵماندایە.

مرۆڤ لەسنووری تێگەیشتنیدا بۆ چاکە هەتا ئەگەر ئەم چاکەیە لەدیدگای کەسێکی تریشەوە بەخراپە لەقەڵەم بدرێت، هەروەها مرۆڤ خراپە لەوەدا کەویستویەتی ئەنجامی بدات لەشەڕو خراپە، ئەگەر لەدیدگای کەسانی تریشەوە وادەربکەوێت چاکە کارەو چاکە ئەنجام ئەدات یان چاکەی بۆ ئەوان هەبێت.

تەوەرەی کێشەکە لەجیهانە تایبەتیە (جوانی) یەکەی مرۆڤدایە، لەچوارچێوەی ئەم پەیوەندیەدا – کەبریتیە لەپەیوەندیەکی (جوانی) ڕۆحی – مرۆڤ بەتەواوی بەتەنها دەوەستێت، ئازادە وەکو هەموو کەسانی تر. ئەمەیش واتای ئەو وتەیەی (سارتەر) دەگرێتەوە کەدەڵێت: هەموو مرۆڤێك لێپرسراوە، لێپرسراویەتێکی رەها، (( لەدۆزەخدا قوربانیانی بێگوناه و تاوانکارانی بێ گوناه نییە))[٢].

---

[٢] بڕوانە :(( جان پول سارتەر)) Jean –Paul Sarter:Huis Clos in Theatre( Paris: Gallimard, 1947).

# مەشقپێکردن و پەروەرشت

لەوانەیە زۆربەی ئەوانەی کەلەکتێبە کۆنەکاندا دەیبینین مایەی سەرسوڕمان و سەرسامی بن، چیرۆکی هیدایەت و بەئاگاهاتنەوەی ئاکاری و ئەخلاقی، کەتێیدا زەبر بەدەسترین و دەسەڵاتدارترین ستەمکارو خراپەکار لەماوەی شەو رۆژێکدا دەگۆڕێت بۆ گەواهیدەری بەنەوازەش و بەرگری کار لەدادپەروەری.

ئەم گۆڕانەیش هەمیشە روداوێکی عەفەوییە. لێرەدا هیچ پرۆسەیەکی چاکسازی یاخود قەناعەتپێکردن لەئارادا نییە، ئەمە بزاوتنێکە لەقوڵایی رۆحدا، مەسەلەی تەجروبەیەکە هاوکاتە لەگەڵ بوونی ووزەیەکدا کەخاوەنی سروشتێکی (جوانی) و بێخەوشەو بەو هێزە تایبەتیەی گۆڕانکاری تەواو بەسەر مرۆڤدا دەهێنێت. ئەمە گۆڕانکاریەکە کەلەخودی مرۆڤەوە هەڵدەقوڵێت لەبەرئەوە، هیچ کردارێك یارێکەوتێك یامەرجێك یان هۆکارو ئەنجامێك رۆڵیان لەو گۆڕانکاریەدا نییە، هەتا ناچێتە ناو راڤەیەکی عەقڵیشەوە، جەوهەری ئەم درامایەش بریتیە لەئازادی و ئاکار. چاکەو خراپە لەناوەوەی مرۆڤدایە، هیچ پەراوە پێکردن و مەشقپێکردنێك، یاخود یاسایەك یان کاریگەریەکی دەرەکی نییە کەبکرێت لەرێیەوە مرۆڤی پێچاك بکرێت، بەڵکو هەموو ئەوەی کەئەم شتانە دەتوانن بیکەن تەنها بریتیە لەگۆڕینی رەفتار.

فەزیلەت و رەزیلەت هیچ یەکێکیان بەوێنەی ئەو شەکرە بەرهەم نایەن کە(تاین) و(زولا) باسی دەکەن.[٤]

---

[٤] بڕوانە : هەریەك لە (( امیل زولا)) و(( هیبولایت تاین)) Emile Zola:Le Ventre de Paris(Paris :Fasquelk 1953) , and Hippolyte Taine : Notes on paris( New York : H. Holt and Co., 1879)

((تولستوی)) لەرۆمانەکەیدا (زیندوبونەوە) ئەوەمان بۆ روندەکاتەوە کەچۆن مامەڵەکردنی نامرۆڤانە لەگەڵ بەندیەکاندا و یاریکردن پێیان دەبێتە هۆی داماڵینی مرۆڤایەتیان °.

بەئاگاهاتنەوەی رۆحی و هیدایەت دوو شتی خۆیین و دەکرێت لەساتەوەختێکداو لەناکاو وەکو هەڵوێستێك لەمرۆڤدا دەرکەون، بەرهەمی بزاوتنی رۆحن، لەدیدگای ئاینەوە، هەموو کاریگەریەکی دەرەکی بۆ لەناوبردنی شەڕ وەکو سیفەتێك کە لەمرۆڤدا هەیە بێبەرهەم دەبێت، ئەمەیش واتای ((بەرگری نەکردنە لەشەڕ)) کەلەمەسیحیەت و و بوزیەتدا هەیە، ئەمەیە هۆکاری ئەوەی کەبۆچی مەشقپێکردن کاریگەری لەسەر هەڵوێستی ئەخلاقی مرۆڤ نی‌یە.

تۆ دەتوانیت سەربازێك لەرێگەی مەشقپێکردنەوە والێ بکەیت کەژیربێت، زیرەك و وریابێت، بەهێزبێت، بەڵام ناتوانی وای لێبکەیت کەدڵسۆزبێت، شەریف بێت، کەسێکی حەماسی و ئازابێت. ئەمانە هەمویان سیفاتی رۆحین. زەحمەتە لەرێی بڕیارەوە یاخود لەرێی تۆقاندنەوە یان زۆر لێکردن و توندوتیژی و هێزەوە، هیچ بیروباوەڕێك بتوانرێت بسەپێنرێت. هەر پەروەردەکارێك بگریت چەند نمونەیەکت دەداتێ سەبارەت بەمنداڵ کەچۆن دژی رێنومایی و ئەو ئامۆژگاریانە دەوەستنەوە کەئاراستەیان دەکرێت، چۆن لەسەر ئەو ئینکاری و پێداگرتنە سلبیە گەشەدەکەن و لەئەنجامی ئەوەوە گرنگی بەرەفتارێکی تەواو دژو پێچەوانە دەدەن. ئەمەیش دەگەرێتەوە بۆ ئەو (تایبەتمەندییە مرۆڤایەتیە)ی مرۆڤ خۆی.

ناکرێت مەشق و پەراوە بەمرۆڤ بکرێت وەکو چۆن ئەمە بەئاژەڵ دەکرێت. ئەم کەمتەرخەمی و ناتەواوییە لەمەشقپێکردندا و گومان پەیداکردن لەکاریگەری فێرکردن بەڵگەی رۆشن و ئاشکران لەسەر ئەوەی کەمرۆڤ گیاندارێکە رۆحی پێبەخشراوە،

---

° (( لیو تولستوی)) Leo Tolstoy: Resurrection... New York: Norten, 1966)

مەبەستم ئازادییە[٦]. لەبەر ئەوە هەموو پەروەرشتێکی ڕاست و دروست لەجەوهەریدا بریتیە لەپەروەرشتێکی زاتیانە، ئەمەش ناسازە و ناکۆکە لەگەڵ مەشقپێکردندا.

ئامانجی پێگەیاندنی ڕاست و دروست بریتی نی‌یە لەگۆڕینی مرۆڤ گۆڕانێکی ڕاستەوخۆ، چونکە لەبەر ئەوەی ئەمە مومکین نی‌یە، بەڵکو پاڵنەرێك لەناوەوەی کەسەکەدایە کەپێکهاتووە لەو هێزە (جوانیة) ی کەلەئەنجامی ئەزمونەوە ڕۆڵ و کاریگەری لەسەر ئەو کەسە دروست دەکات و بڕیارێکی (جوانی) دروست دەکات لەپێناوی چاکەو لەڕێگەی نموونەو ئامۆژگاری و بینین و شتانی تریشەوە. ناکرێت بەبێ ئەم شێوازە گۆڕان بەسەر مرۆڤدا بهێنرێت. لەوانەیە گۆڕانکاری بەسەر ڕەفتاریدا بێت، بەڵام ئەوە گۆڕانێکی ڕووکەشانەو کاتی دەبێت. ئەمەیش چونکە ئەو ڕفتارەی کەلە قوڵایی ئیرادەمانەوە سەرچاوە نەگرێت، گۆڕانێکە لەڕێگەی پێگەیشتنەوە پەیدا نەبووە، بەڵکو لەڕێگەی مەشقپێکردنەوە بەرهەم دێت. پەروەرشت لەئەنجامی بەشداری کردن و کۆششی ئێمەوە پێدەگات، پاشان شوێنەواری ئەمە هەمیشە جیاوازەو بەشێوەیەك دێت کەناتوانرێت پێشبینی بکرێت. بانگەشەکەرانی فەردیەت باوەڕیان بەهیدایەتی مرۆڤ و بەتازەکردنەوەی ناوەوە هەیە، لەکاتێکدا وەزعیەکان (الوضعیون) باوەڕیان بەگۆڕانکاری لەڕەفتاردا هەیە ئەو فەلسەفەیەی کەپشتی پی‌دەبەستن — لەدیدگای خۆیانەوە — ڕوون و ئاشکرایە: ئەگەر هاتوو تاوانەکە لەئەنجامی هەڵبژاردنی ئازاد یاخود ئیرادەی خراپەو شەڕەوە بێت، ئەوا دووبارەکردنەوەی فێرکردن بەهۆی ئامرازە دەرەکیەکانەوە، ئەگەری سەرکەوتنی کەم و دەگمەنە. وەبە پێچەوانەوە ئەگەر هاتوو تاوانەکە لەئەنجامی ئەخلاق یا نەریتێکی خراپەوە بێت، ئەوا دەکرێت تاوان کارەکە دووبارە فێربکرێتەوە لەڕێگەی گۆڕینی ڕەوشەکەوە یا پێکنانەوەی نەریتی نوێوە. ئەمەیش بریتییە لەو جیاوازیەی کەلەنێوان هیدایەتی

[٦] مادیەکان بڕوایان بەتوانای گشتگیری ومەشق پێکردن هەیە، پێیان وایە دەکرێت مرۆڤ لەڕێگەی مەشق پێکردنەوە ئاڕاستە بکرێت، بۆ نمونە( کلود ملفتوس) Claude Helvitius لەکتێبی( الّ نسان) دا DeL, Homme، لەکاتێکدا مەسیحیەکان پی‌یان وایە کەمەشق پێکردن تەواو بی‌توانایە لەو بوارەدا.

(جوانی)و مەشق پێکردندا هەیە. هەموو تەکتیکێك یان ڕێ و شوێنێك بۆ دووبارەکردنەوەی فێرکردن کەلەلایەن فەرمانبەرو لێپرسراوانی حکومەتەوە فەرز دەکرێت . بەتایبەتی سوپاو پۆلیس . هەمیشە لەسەر مەشقپێکردن دەوەستێت، نەك لەسەر پەروەرشت.

پەروەرشت کاریگەریەکی ناسك دەکاتە سەر دەروونی مرۆڤ کەناکرێت بپێورێت. پەروەرشت کارتێکردنێکی ناڕاستەوخۆیە، لەڕێگەی خۆشەویستی و پێشەنگی و لێبوردن و سزاوە دەچێتە ناودڵەوە، بەمەبەستی بەرپاکردنی چالاکیەکی (جوانی) لەدەرونی مرۆڤدا.

بەڵام مەشقپێکردن و ڕاهێنان بەو پێیەی کەلەجەوهەریدا سیفەتێکی ئاژەڵیە، بریتیە لەسیستمێك لەکاروکردەوەی جۆراوجۆر کەدەیگێڕێتەوە بەر بۆ سەپاندنی ڕەفتارێکی دیاریکراو بەسەر کائینی بەشەریدا، کەپێیان وایە ئەوە ڕەفتارێکی ڕاست و دروستە. پێگەیشتن ئینتیمای بۆ مرۆڤ هەیە، بەڵام مەشقکردن زیاتر بۆ ئاژەڵەکان داڕێژراوە. لەڕێگەی فێرکردنەوە دەکرێت هاوڵاتیان ڕێك بخرێنەوە ئەوانەی کەگوێ ڕایەڵی یاسان. بەڵام نەك لەڕێگەی پاڵنەری ڕێزەوە ئەم کارە ئەنجام بدرێت، بەڵکو لەڕێگەی ترس خستنەبەر یان عادەت پێگرتنەوە. ئەگینا لەوساتەدا کەناچاردەکرێن بۆ ڕاهێنان لەپێناو مەبەستێکدا ڕەنگە هیچ ڕەزامەندیەکی خۆیان لەپشتیەوە نەبێت و پێ‌دەچێت ویژدانیان مرد بێت و مەشاعیریان کزو لاواز بوبێت. بەڵام یاسا شکێنی ناکەن، نەك تەنها لەبەر ئەوەی کەوا خۆیان وان بەڵکو لەبەر ئەوەی ڕاهێنراون بەو شێوەیە کەپابەندبن بەو یاسایانەوە. لەئەدەبدا هەندێ جار کەسایەتی دەبینین کەوا دەردەخرێن کە لەهاوڵاتیانی داوێنپاك و بەئەخلاق بن، بەڵام لەراستیدا خراپەکارن و خاڵین لەهەموو بەهاو ئەخلاقێك، بەپێچەوانەیشەوە کەسایەتی تر دەبینین هەڵەو تاوانکارن بەڵام ئەو کەسانە لەناخیاندا کەسانی چاکەکارو نەجیبن، لەپاشاندا دووجۆر دادپەروەری هەیە: دادپەروەری مرۆڤ و دادپەروەری خوایی.

یەکەمیان بۆ کارو کردەوەکان دەڕوانێت و تەنها لایەنی دەرەکی و ڕواڵەت دەخوێنێتەوە ، بەلاّم دووەمیان بۆ جەوهەری بوونە مرۆڤیەکە دەڕوانێت. ڕوبەری (جوانی) مرۆڤ زۆر گەورەو بەرفراوانە و نزیکە لە بێکۆتاییەوە، لەبەر ئەوە بەتوانایە لە ئەنجامدانی دزێوترین و دڕندانەترین تاواندا، هەروەها لەهەمانکاتیشدا دەتوانێت جوانترین و جوامێرانەترین قوربانیش پێشکەش بکات ... گەورەیی مرۆڤ لەبنچینەدا لەکاروکردەوە چاکەکانیدا نی‌یە، بەڵکو لەو توانایەیدایە کەهەیەتی بۆ هەڵبژاردن. هەر کەسێك هەوڵی کەمکردنەوەی ئەم توانایە بدات یاخود سنوری بۆ دابنێت، بەمە ڕێزی مرۆڤ دەهێنێتەوە خوارەوە. خەیروچاکە لەدەرەوەی ئیرادەی مرۆڤدا بوونی نی‌یە ناکرێت لەڕێگەی هێزەوە بسەپێنرێت. ﴿ لااكراه في الدين ﴾ [7] هەمان یاسایش بەسەر ئەخلاقدا جێبەجێ دەبێت. مەشقپێکردن و ڕاهێنان، هەتا ئەگەر ڕەفتاری ڕاست و دروستیش بسەپێنێت ئەوا هەر لەبنچینەدا نائەخلاقی ونامرۆییە.

# ئەخلاق و عەقڵ

چەمکی ئازادی مرۆڤایەتی جیاناکرێتەوە لەبیرۆکەی ئەخلاق، سەرەڕای ئەوەی ئەم بیرۆکەیە ملکەچی چەندین گۆڕانکاری بووە، بەلاّم ئازادی هەر بە(جێگیری) ماوەتەوە لەکاتی هەموو گۆڕانکاریان پەرەسەندنێکدا کەلەماوەی مێژووی ئەخلاقناسی‌دا ڕوویان داوە هەروەکو چۆن مەسەلەی شوێن و چەند لەسروشت ناسیدا ڕەگەزێکی گرنگن، بەو شێوەیەش ئازادی بەنسبەت ئەخلاق ناسیەوە گرنگە.[8] عەقڵ دەرك بەشوێن و چەندی دەکات، بەلاّم لەئازادی تێناگات، ئەمەیش هێڵی جیاکەرەوەیە لەنێوان عەقڵ و ئەخلاقدا. وەزیفەی عەقڵ بریتیە لەکەشفکردنی سروشت و ئالیەت و زانستی

---

[7] بڕوانە قورئان، سورەتی البقرە : ٢٥٦

[8] جەوهەری ڕۆح بریتیە لەئازادی و جەوهەری ماددەیش بریتیە لەچەند بڕوانە( هیگل) : George Hegel. Samtliche Werke..(Stuttgart: F.Frommann,1961)

بەراوردکاری و تەواوکاری. بەواتایەکی تر عەقڵ خۆی لەهەموو شتێکدا دەدۆزێتەوە. لەبەر ئەم هۆیەیە کەعەقڵ هەمیشە لەشوێنی خۆیدا دەسوڕێتەوە لەناو سروشتدا تەنها دەتوانێت کەشفی خۆی بکات، مەبەستم ئەوەیە تەنها لایەنی ئالی شتەکان دەگرێت و لەو ناوەندەدا کاردەکات و شارەزایە. لێرەدا ئەو ناسازییە ڕوون و ئاشکرایە دەردەکەوێت لەهەندێ لەتیۆرە ئەخلاقیەکاندا کەکۆتایی جەدەلە لۆژیکیەکەیان بەچەند بەرەنجامێکی ئاڵۆزدێت، وەکو گرنگیدان بەخەڵکی تر لەئەنجامی نەزعەیەکی خۆپەرستیەوەیە، هەروەها ئینکارکردنی چێژ. یەکسانە بەخواستی چێژ. ئەمەیش هەرهەمان ئەو ناسازییە کەوای لە(ڤۆڵتێر)کرد ڕاوبۆچونە ئاڵۆزە بەناوبانگەکەی کورت بکاتەوە لەمەداو بڵێت: ( قوربانی دانی مرۆڤ بەخۆی لەئەنجامی پاڵنەرێکی بەرژەوەندی زاتیەوەیە).[٩] شیکارکردنی (منطقی) عەقڵی بۆ ئەخلاق دەبێتە هۆی ڕووت کردنەوەی بەهاکانی ئەخلاق و بێ‌ماهیەتکردنی و دابەزاندنی بۆ سروشت و خۆپەرستی و خۆبەزل زانین. عەقڵ لەسروشتدا کەشفی بنەمای سەبەبیەتی گشتی (الكلیة القدرة) دەکات لەمرۆڤیشدا کەشفی سروشت دەکات : غەریزەکان یا (ئەو هێزە دوو فەرماندارە : چێژو ئازار) کەجەخت لەسەر کۆیلەیەتی مرۆڤ و کوشتنی ئازادی دەکاتەوە. ئەمە هەمان ئەو ئالیەتی بیرکردنەوەییە کە( ئولوهیەتی) گۆڕی بۆ( هۆکاری یەکەم)( ئەو بزوێنەرەی کەنابزوێت) ڕۆحی دابەزاند بۆ دەروون، هونەری بچووك کردەوە تەنها بۆ کارو تەکنیك. هەوڵدان بۆ ڕاگیرکردنی ئەخلاق لەسەر بنەڕتێکی عەقڵی ناتوانێت لەوە زیاتر دووربکەوێتەوە کەناودەبرێت بەئەخلاقی کۆمەڵایەتی، ئەو بنەما سلوکیانەی کەپێویستن بۆ پارێزگاریکردن لەکۆمەڵێکی دیاریکراو، کەئەوە لەواقیعدا جۆرێکە لەسیستمی کۆمەڵایەتی.

---

[٩] بڕوانە :( فرانسوا ماری ئارویی دی فولتێر) Francois Marie Arouet de Voltaire: Oeuvres Completes de Voltaire, Vols 17-20: Dictionnaire Philosophique(Paris: Garnier freres, 1885).

-بەهۆی ئەمەوە – ناتوانین بڵێین ئەخلاق بەرهەمی عەقڵە. عەقڵ دەتوانێت پەیوەندی لەنێوان شتەکاندا تاقی بکاتە و دیارییان بکات، بەڵام ناتوانێت بڕیارێکی بەهایی دەربکات، لەکاتێکدا کێشەکە کێشەی بەچاك زانین یان بەدزێو زانینی ئەخلاقی بێت. بۆ نمونە، هەموو مرۆڤێك لەوە تێدەگات ئەو بنەمایەی کە هەوڵ دەدات ڕۆحی خەڵکی بخاتە ناو چەند چوارچێوەیەکی هاوشێوەوە، ناکرێت ڕێگەی پێ بدرێت، بەڵام هەمان ئەم بنەمایە ناکرێت پاساو و سەلماندنێکی عەقڵی بۆ بهێنرێتەوە. مەحاڵە پاساوی زانستی بتوانێت ئەوە بسەلمێنێت کە شتێك بێخەیرو و چاك نییە بەمانای ئەخلاقی ووشەکە. هەروەکو چۆن بەهەمان شێوەیش مەحاڵە بکاتە جیاوازیەکی زانستی وورد لە نێوان هونەرو (کیتش)دا (واتە ئەو کارە نزم وبێبەهایانەی کەدەدرێنە پاڵ هونەر)، یان لەنێوان جوانی و ناشرینیدا، سروشت و عەقڵ هەردووکیان وەکو یەك ناتوانن ڕاست و هەڵە و خێرو شەڕ لەیەکتر جیابکەنەوە ئەم سیفەتانە لەسروشتدا بونیان نیە. باشە مرۆڤ مانای چی دەگەنێت . وەکو کەسێتیەك بێهاوتا و دووبارە نەبووە بەنسبەتی زانستەوە ؟ – بۆیە هەر دەبێت زانایەك شتێك بێت زیاتر بێت لەزانیاریەکەی، پێویستە زیاد لەهەموو شتێك مرۆڤ بێت بۆ ئەوەی بتوانێت تێبگات لەم حەقیقەتە. ئەو نمونەیەی کەبڵاوەو دەڵێت مرۆڤی چاك و چاکەکار هەمیشە بەختەوەرە، مرۆڤی خراپەکار هەمیشە ناشاد و ناخۆشە ژیانی، ناتوانین لێی تێبگەین ئەگەر بەشێوەیەکی عەقڵی بیرمان لێکردەوە. ئاکارو ئەخلاقی مەسیحیەت عاسی دەبێت لەکاتێکدا هەوڵ بدرێت لەڕێگای زاراوە زانستیەکانەوە فێریان ببیت، چونکە هەموو بانگەوازە ئەخلاقیەکانی مەسیحیەت لەکەسێکی (ئایدیالی) دا بەرجەستەکراون، کەوا کەسێتی حەزرەتی مەسیحە. بەهەمان شێوەش، سێ بنەماکەی شۆڕشی فەڕەنسی، کەبریتین لە( ئازادی و برایەتی و یەکسانی) ناکرێت بەشێوازێکی زانستیانە هەڵبهێنجرێن، ناکرێت بەڕێگەیەکی زانستیانە پێیان بگەین..بەڵکو ڕەنگە زانست زیاتر بڕیارێك دەربکات کەبەپێچەوانەی ئەو بنەمایانەی پێشەوەبن کەباسمانکرد، واتە : نایەکسانی و، سیستمی کۆمەڵایەتی ڕەهاو، نامۆکردنییە مرۆڤیەکان لەکۆمەڵگەیەکی تەواو ڕێکخراودا.

ئایا( ژان فالژان) [10] دەیتوانی پەنا بۆ زانست ببات بۆ ئەوەی چارەسەری ئەو کێشە ئەخلاقیەی بکات کەتووشی هات ؟ ئایا پێویست بوو کە قوربانی بەبەرژەوەندی ژمارەیەك لەخەڵك بدات لەپێناو رزگارکردنی مرۆڤێکی بەریئو سادەدا ؟ زانست لەبەرامبەر ئەمەدا چ وەلاَمێك هەڵدەبژێرێت ؟ ئایا زانست بەلای ئەوەدا ناشکێتەوە کەناودەبرێت بەبەرژەوەندی هاوبەش ؟ ئەو گرفتەی کەتەرحکراوە لەتایبەتمەندی زانست نی‌یە، زانستیش لەم بارەیەوە وەلاَمی نی‌یە. ئەگەر مومکینیش بوایە - ئەوا بەپێچەوانەی خواست و ئارەزووی هەموو مرۆڤێکەوە دەبوو. ئەوەی( ڤیکتۆر هۆگۆ) بەرێگەیەکی وروژێنەر لە(گەردەلوولێ لەکەللەسەردا) [11] وەسفی دەکات ململانێ یەك نی‌یە لەعەقڵی مرۆڤدا، بەڵکو ململانێ‌یەکە لەنێوان عەقڵ و رۆحدا، پێکدادانێکی وێرانکەرە لەبەڵگەو بەڵگەکاری کەئینتیمای بۆ دوولایەنی ناکۆك و نەگونجاو هەیە لەکەسێتی مرۆڤایەتیدا. لەبنچینەدا ئەوە وتووێژێکە لەنێوان عەقڵ و ویژداندا، وتوێژێکە کەدوو جۆر جەدەلی جیاواز نۆرەی تیادەکەن لەبەرئەوە، ناکرێت بەراوردبکرێن چونکە ئینتمایان بۆ دوو جیهانی جیاواز هەیە، جیهانی زەوی و جیهانی ئاسمانی. تەنها مرۆڤ دەتوانێت هەستێت بەهەڵبژاردن بۆ خۆی و، لەخۆیدا لەکاتێکدا روبەڕوی ئەم گرفتە داخراوە دەبێتەوە. ئەو بڕیارەی (ژان فالژان) دابەزینێك بوو بۆ عەقڵ و سەرکەوتن بوو بۆ عەقڵ ، سەرکەوتنێك ناکرێت ڕاڤە یاخود پاساوێکی عەقڵی بۆ بکرێت. بەلاَم سەرەڕای ئەوەیش بڕیارێکە هەموو خەڵکی پشتگیری لێدەکەن و بەچاکی دەزانن و بەبێ دەنگی پشتیوانی لێدەکەن، ئێمە هەموومان دەبێت هەستێکی ناوخۆیمان هەبێت کەجەخت لەسەر ئازادیمان بکاتەوە، ئایا دەتوانین بەرێگەیەکی زانستی راڤەی یاخود بەڵگە لەسەر ئەم هەستە جەخت لێکراوەمان بهێنێتەوە، ئەگەر ئالۆزیش بێت و نارەحەت بتوانرێت دیاری بکرێت ؟ هەموومان هاودەنگین لەسەر ئەوەی کەڕاست (نی‌یە) سزای کەسێك بدرێت کەبەهۆی هەڵەیەکەوە تووشی تاوانێك

---

[10] بڕوانە(( ڤیکتۆر هۆگۆ)) : Victor Hugo: Les miserables(Paris:Garnier-Flamnarion, 1972).

[11] بڕوانە کتێبی حەوتەم لەڕۆمانی( ڤیکتۆر هیگۆ) سەرچاوەی پێشوو بەرگی ژمارە ١، لاپەڕکانی ٢٤٧-٢٦٤.

هاتبێت. لەگەڵ ئەوەیشدا ئەم هەڵوێستە لۆژیکیە ڕوون و ئاشکرایە ناکرێت زانستیانە پاساوی بۆ بکرێت، ئەوەی دڵ وەریدەگرێت و قەبوڵی دەکات زانست ناتوانێت بیسەلمێنێت یاخود تەفسیری بۆ بکات، ئایا دەکرێت ئێمە هەڵنەستین بەو ئەرکە ئەخلاقیانەمان چونکە عەقڵ ناتوانێت پاساوی بۆ بکات یان پشتگیری ئەم دەنگە(جوانیە) مان بکات ؟

ئێمە ئەوە ناکەین، کەواتە ئێمە پارێزگاری لەهەڵوێستێك دەکەین بەبێ‌ئەوەی بزانین بۆچی، سەرەڕای ئەوەیش کەدژی عەقڵمانە، هۆی ئەمەیش دەگەڕێتەوە بۆ ئەو متمانەیەی کەلەناخمانەوە هەڵدەقوڵێت، بەهۆی بڕوامانەوە.

کەواتە پەیوەندی عەقڵ چی‌یە بەبڕیارە ئەخلاقیەکانەوە ؟(هیوم) بەڕونی و بەوردی وەلامی ئەم پرسیارە دەداتەوە، دەڵێت(( تاوان بەنسبەت عەقڵی ئێمەوە زیاتر نی‌یە لەکۆمەڵە پاڵنەرو بیرۆکەیەك یان کردەوەیەك کەدەگەڕێتەوە بۆ کەسێکی دیاریکراو و هەڵوێستێکی دیاریکراو. ئێمە دەتوانین لەم پەیوەندیە بکۆڵینەوەو ڕاڤەی ئەسڵی ئەم کردەوەیە و ئەنجامدانی بکەین. تەنها، لەو ساتەدا کەبوار دەدەین بەسۆز و عاتیفەمان بێتەگۆو دژیوی ئەو کارانە دەربخات، لەم حاڵەتەدا دەتوانین وەسفی کارەکە بکەین بەوەی خراپەیەکی ئەخلاقیە).( هیوم) لەسەرئەمە دەڕوات و دەڵێت :(( هەموو ئەوەی لەتوانای عەقڵماندا هەیە ئەوەیە دەستنیشانی پەیوەندیەکان بکەین لەنێوان شتەکاندا و بیانخەینەڕوو، بەلام لەحکومدانی بەهاییدا (واتا هەڵسەنگاندنی بەهای شتەکان) ئەوا ساتەوەختێکی نوێ لەدایك دەبێت وسەرهەڵدەدات، ساتەوەختێکە لە ئەحکامە حەقائیقیەکاندا فەراهەم نابێت. ناکرێت تەفسیری بۆ بکرێت تەنها بەهۆی ئەو هێزە کاریگەرەوە نەبێت کەکار لەسەر مەشاعیرمان دەکات).[12] ( فرانسیس هتشۆن) لەکتێبەکەیدا( سیستمی فەلسەفەی ئەخلاقی) دا دەڵێت : هەروەك چۆن بەهای باڵا لەچێژی هونەری و زانستیدا تەواو ڕوون و دیارە بەبەراوردکردنی بەچێژی خواردن ،

---

[12] بڕوانە :( داڤید هیوم) David Hume: Treatise On Human Nature.

ئەمەیش بەهەمان شێوە وایە بەنسبەت ئەو جیاوازیەی کەلەنێوان (خەیر) و چەمکەکانی تردا هەیە... [١٣]. لەو وتەیەی( هیتشۆن)وە ئەوە حاڵی دەبین کەتوانای تێگەیشتن لەبەها ئەخلاقیەکان پشت نابەستێت بەزیرەکی و فێربوون، ئەحکامە ئەخلاقیەکان لەڕێگەی عەقڵەوە نایەن، بەڵکو کۆمەڵێك بڕیاری ناوخۆیین و ڕاستەوخۆ لەجیهانێکی زاتیەوە پەیدا دەبن. ناسازی و نەگونجان لەنێوان زانست و ئەخلاقدا لەژیانی ڕۆژانەیشدا ڕەنگ دەداتەوە. بۆ نمونە – زانست قەبوڵی پیتاندنی دەستکرد بۆ منداڵانی ناوشوشە دەکات، هەروەها قەبوڵی کوشتنی بەزەییانە* دەکات (Euthanasi) هەموو ئەمانە لەبەرهەمی زانستن و بەبێ زانستیش لەتوانادا نەدەبوو کە بیریان لێبکرێتەوە. لەلایەکی ترەوە دەبینین هەموو کەسێکی ئەخلاقی – بەچاوپۆشین لەو هەڵوێستە باڵایەش کەهەیەتی لەئاییندا – دەبینین ڕەفزی هەموو ئەو شتانە دەکاتەوە، بەوپێیەی ناسازو نەگونجاون لەگەڵ ئەو بنەمایەدا کەژیانی مرۆڤایەتیان لەسەر وەستاوە. لەم ڕوانگەیەوە ئەخلاق و ئاین و هونەر هەموویان بەشداری دەکەن لەهەمان بیرۆکەدا، ئەگەرچی هەریەکەیشیان بەشێوازی جیاواز تەفسیری خۆی بۆ دەکات. ناکرێت ئاین قەبوڵی ژیانی( صناعی) یاخود کوشتن بکات، چونکە ژیان و مردن موڵکی خودان نەك مرۆڤ. لەتێڕوانینی ئەخلاقیشەوە، پیتاندنی دەستکردو کوشتنی بەزەییانە بەتاوانێکی دژ بەمرۆڤایەتی دادەنرێن، چونکە تێیاندا مرۆڤ لە ئاستە مرۆڤیەکەی دادەبەزێنرێت بۆ ئاستی شتەکان، ئەمەیش دەبێتە هۆی

---

[١٣] بڕوانە( فرانسیس هتشۆن) Francis Hutcheson: A System of Moral philosophq :( New York A M. Kelley, 1968)Vo1,Part VI.

* کوشتنی نەخۆشێك کەبەدەست نەخۆشیەکی خراپەوە دەناڵێنێت و بێ ئومێد بووە لەچاك بوونەوەو چارەسەر، یاخود بەزەیی پێداهاتنەوەی بۆ نەهێشتنی ئەو ئێش و ئازارانەی کەبەردەوام هەیەتی و چارەسەر ناکرێت، ئەمەیش بەڕێگەیەکی هێواش، ئەم کێشەیە تائێستایش لەجیهانی ڕۆژئاوادا بەهەڵواسراوی ماوەتەوە و لایەنگرو دژی هەیە.لایەنگرانی هەوڵ دەدەن لەلایەن حکومەتەوە یاسایەك دەربچێت وکوشتنی بەزەیی بەتاوان لەقەڵەم نەدرێت. لەلایەنی مومارەسەی کردارییەوە ئەم تاوانە لەکاتێکەوە بۆ کاتێکی تر ڕوودەدات و بەهۆیەوە دادوەرەکان هەروەکو شتێکی عادەتی چەند حوکمێکی سوك و ئاسان بەسەر ئەنجامدەرانیدا لەپزیشکەکان دەردەکەن( وە. ع).

**گاڵتەکردن بەمرۆڤ وخراپەکردن بەرامبەری. بەنسبەت هونەرمەندیشەوە : ژیان و مردن نهێنیەکن و پێویستە وەکو خۆیان بمێننەوە. بەناوبانگترین سێ وتووێژی (هاملت) لەبارەی مردنەوەیە. بەڵام زانست وای دادەنێت کەمردن شتێکی ئاساییە ڕووداوێکی بایۆلۆژییە لەجیهانی مادەدا. بەوشێوەیە ئەو بۆشاییە کەلەنێوان ئەو دوولایەنەدایە کامڵەو بەراوردکردنیش لەنێوانیاندا مەحاڵە .**

**نەزۆککردن( یۆجینی)[**] ئەو تاقیکردنەوانەی کەلەسەر مرۆڤ دەکرێت و، پیتاندنی دەستکرد و، کوشتنی بەزەییانە، ئەمانە هەموویان کۆمەڵە شتانێکی تەواو عەقڵانی ولۆژیکین، هیچ بەڵگەیەکی زانستیش یاخود عەقڵانی نیە لەدژیان بێت. ئیدی چۆن زانست دەتوانێت قەدەغەی خراپی جێبەجێکردنیان بکات ؟(ناتوانێت ئەمە بکات). ئەکادیمیەی فەرەنسی بۆ زانستە ئەخلاقی و سیاسیەکان وویستی هەڵوێستی خۆی ڕابگەیەنێت دژی پیتاندنی دەستکرد، بەڵام ئەو بەڵگانەی کەهێنانیەوە هیچیان زانستی نەبوون، ووتی :( پیتاندنی دەستکرد تاوانێکە دژی بنەمای هاوسەرگرتن و خێزان و کۆمەڵگایە).**

**((کینو)) بەبیرۆکەیەکی هاوشێوەی ئەمە هەڵوێستی خۆی دەردەبڕێت و دەڵێت:(لەنێوان هەستکردن بەڕێزگرتنی ژیان و دایکایەتیدا، لەنێوان لۆژیکدا شتێکی هاوبەش نی‌یە. من بڕوام وایە مەسەلەی کوشتنی بەزەییانە کەلەهەندێ حاڵەتدا خۆی فەرزدەکات، ناکرێت بەهیچ شێوەیەك لەڕووی یاساییەوە ڕێگەی پێبدرێت)[١٤]. کوشتنی بەزەییانەو، پیتاندنی دەستکردو، نەزۆککردن و، چاندنی ئەندام و، لەباربردن و ...هتد ئەمانە تەنها لەبوارەکانی زانستن تەنها لەلایەنی تەکنیکیەوە ...بەڵام**

---

[**] (یۆجینی) لە(یۆجینا) Eugenias ماتووە کەبریتیە لەلێکۆڵینەوەی بۆماوەیی مرۆڤ، بەئامانجی ڕێکخستنی ڕەگەزی بەشەری لەڕێی پەروەردەی هەڵبژاردنەوە. بەواتای هەڵبژاردنی باشترین نموونە و وەرگرتن لەگەشەکردنی خراپترینیان.(وە. ع)

[١٤] بڕوانە :( لوسیان کینو) : Lucien Cuenot:(( L Eugenique Revue d, Anthropologue 1935-36.

جێبەجێکردنیان، ئەوە بۆ خۆی کێشەیەکی ئەخلاقیە. زانست بۆی نی یە هیچ بڕیارێك بدات لەم بوارەدا..هەر پلانێك بۆ مامەڵەکردن لەگەڵ مرۆڤ وەکو مێگەل شایەنی بێزلێکردنەوەیە، لەهەمانکاتدا ئەمە تیاماندا دەبێتە هۆی بریندارکردنی مەشاعیرو کەرامەتی کەسێتیمان.[15] ( ئەوەشمان لەبیرنەچێت) کەپیتاندنی دەستکرد لەپزیشکی بەیتاڵیەوە هاتە ناومانەوەو پێمان گەیشت. بەو شێوەیە کێشەکە وەکو ململانێیەك لەنێوان مرۆڤایەتی و بایۆلۆژیادا، یاخود لەنێوان فەردیەت و ماددیەتدا دەمێنێتەوە. ئەمە هەمان ئەو کێشەیەیە کەمرۆڤ ڕووبەڕوی بۆتەوە هەر لەسەرەتاوە. بەرژەوەندی یان بەجێهێنانی ئەرکی ڕۆحی ؟ بایۆلۆژیا پێشکەوتن بەمرۆڤ دەبەخشێت لەسەر حسابی ڕۆح و نەجابەتە مرۆییەکەی. (مرۆڤیش ڕەفزی ئەو پێشکەوتنەڕێ پێدراوە دەکات ئەگەر هات و پێویست بوو لەسەری بەو شێوەیە دەستی بکەوێت کەببێتە هۆی تێکشاندن و نەهێشتنی لایەنە مرۆڤیەکەی. بەڵام ئایا سبەینێش بەهەمان شێوە ئەمە ڕفزدەکات.. ئایا بەهەمیشەیی ڕەفزی دەکات ؟).[16] لێرەوە دەردەکەوێت کەسروشتیە مەسیحیەکان و شاعیران و هونەرمەندەکان هەمان هەڵوێست وەربگرن لەبەرامبەر ئەم پێشکەوتنەدا. لەتێڕوانینی مەسیحیەکانەوە ئەمە بریتیە لە (سروشت و گەڕانی شەیتانی) لەلای شاعیران بریتیە لە (کەڵکەبونێك لەدڵڕەقیەکی بەرنامەڕێژکراو).[17] هەروەها شتێکی سروشتییە کەماددیەکان دڵخۆش بن بەو پێشکەوتنە بەڵێنپێدراوانەی کەپەرەسەندنە نوێیەکان دەیڕەخسێنن لەزانستی بایۆلۆژیدا. پێشکەوتنی زانستی هەرچەندە ئاشکراو دیاربێت، ناتوانێت وا لەئاین و ئەخلاق بکات کەزەروری نەبن، زانست خەڵکی فێرناکات کەچۆن بژین، و لەکاری ئەو نیە کەپێوەرە

---

[15] بڕوانە :( جان ڕوستاند) Jean Rostand : Humanly Possible: A Biologist s Notes on The Future of Mankind, trans. Lowell Boir( New York: Saturday Review Press. 1973).

[16] هەمان سەرچاوە.

[17] بڕوانە :( ڕیمی کۆلین) : Remy Collin :Plaidoyers Plaidoyers Pour la vie humaine n. p. n. d). and Voznesensky)) . و فۆزنسنکی لە قەصیدەی(( اوزا))

بەهاییەکانمان پێشکەش بکات. ئەمەیش لەبەرئەوەی چونکە ئەو بەهایەی کەژیانی ئاژەڵی بەرزدەکاتەوە بۆ ئاستی ژیانی مرۆڤایەتی هەر بەنادیاری دەمێنێتەوەو ناتوانین لێی تێبگەین بەبێ ئاین. ئاین دەروازەیەکە بۆ جیهانێکی تر بالاتره لەم جیهانە، ئەخلاقیش مانای ئەمە دەگرێتەوە.

# زانست و زانایان یان ( کانت ) و دوو رەخنەکەی

**دووجۆر عەقڵ هەیە: عەقڵێکی پوخت (خالیس) و عەقڵێکی (کردەیی).**

فیکر نکوڵی ئولوهیەت دەکات و مرۆڤ و ژیانیش جەخت لەسەر بوونی دەکەنەوە. ئەوەی تەفسیری ئەم هەڵوێستەشمان بۆ دەکات زۆرجار لەتێبینیکردنی ئەو جیاوازیەوە بۆمان دەردەکەوێت کەلەنێوان زاناو زانستدا هەیە، لەو سۆنگەیەوە کەزانست بریتیە لەمیتۆدو کۆمەڵێك لەدەرئەنجام.

هەموو ئەوانەی کەزانایەك دەیانڵێیت یان بیری لێدەکاتەوە یان بڕوای پێی هەیە لەدونیای زانستدا مەرج نیيە وەکو زەرورەتێك تێیڕوانرێت و بەگرنگ بیگرێت، چونکە زانست تەنها یەك لایەنە لەلایەنەکانی دەرك و تێڕوانینی هەمەکی ئەو زانایە سەبارەت بەجیهان، ئەوەیش بەرهەمی هەندێ وەزیفەی عەقڵین و لەڕێگەی ڕەخنە و بەراوردو پۆلێنکارییەوە پێیگەیشتووە. لەم چوارچێوەیەدا، عەقڵ هەموو ئەوانە دەخاتەلاوە کەپێویست دەکات ڕاڤەیەکی( سەرو سروشتی) یان بۆ بکرێت، تەنها ئەو شتانە دەهێڵێتەوە کەپشت بەزنجیرەیەك لەهۆ سروشتیەکان و هۆکارەکانیان دەبەستێت،و لەڕێگەی ئەزموون و تێبینی کردنەوە دەسەلمێنرێت، لەهەر کاتێکدا ئەگەر ئەوە مومکین بوو بێت، ئەوەی کەدەمێنێتەوەو جێگیردەبێت پاش ئەو هەموو پاڵفتە وردە بریتیە لەزانست. لەبەرئەوە لەنێو دەستەکانی زانستدا جگە لەسروشت شتێکی تر نامێنێتەوە، هەموو شتەکانی تر لەناوپەنجەکانیدا دەربازدەبن ئەویش بریتیە لەسنووری سروشتی زانست. زانست بەشێوەیەکی عادەتی لەم سنوورەدا دەوەستێت . بەڵام کەسی زانا– لەبەرئەوەی مرۆڤە – ئەوا بەردەوام دەبێت لەمەسیرەی ژیانیدا.( ئوبنهیمر) هیچ پێویستی بەفەلسەفەی هیندی نەبوو کاتێك خەریکی دروستکردنی بۆمبی ئەتۆمی بوو، بەڵام ڕەنگە پێویستی بەم فەلسەفەیە بووبێت لەوەدا کەپەیوەندی بەبەکارهێنانی ئەو بۆمبەوە هەیە، ئەو لەقۆناغێکی درەنگی ژیانیدا

بەتەواوی وازی لەزانستەکانی ئەتۆمی هێناو، ژیانی تەرخانکرد بۆ لێکۆڵینەوە لەفەلسەفەی هیندی. بەڵام ئەنشتایین (خاوەنی تیۆری ئەتۆمی) بیرکردنەوەی خۆی لەکارە ئەدەبیەکانی(دستۆفسکی)دا قوڵکردبووەوە، بەتایبەتی (براکانی کرمازۆف). ئەوەیش کەڕوونە ڕۆمانەکانی ئەم نووسەرە روسیە گەورەیە شتێکی تێدانی‌یە هاوبەش بێت لەگەڵ بارستایی ووزە یان خێرایی و ڕوناکی دا – یان شتی تری لەو شێوەیە – ئەو کەسەی گرنگی ئەدا بەتراژیدیا ئەخلاقیەکانی (لایفان کرامازۆف)(ئەنیشتاین)ی زانا نەبوو بەڵکو( ئەنیشتاین)ی بیرمەندو مرۆڤ بوو، یا هونەرمەندبوو، هەموو مرۆڤێکیش هونەرمەندە بەپلەیەك لەپلەکان، جیاوازیەکی بەرچاو و دیاریش هەیە لەنێوان لێکۆڵینەوەی زانستی و بەکارهێنانی دەرئەنجامەکانیدا، ئەو پاڵنەرەی لەپشتی لێکۆڵینەوەی زانستیەوەیە بریتیە لەتێگەیشتنی جیهان، بەڵام ئەو پاڵنەرەی لەپشت بەکارهێنانیەوەیە. بریتیە لەداگیرکردن و دەست بەسەراگرتنی جیهان، لەبەرئەم هۆیەیە کەسی زانا بەهەمان ئەو چاوەوە ناڕوانێتە زانست کەخەڵکی تر سەیری دەکەن. زانست بەزۆری بەنسبەت کۆی خەڵکیەوە زیاتر نی‌یە لەکۆبونەوەی کۆمەڵێك دەرئەنجام لەجۆری چەندی ئالی. بەڵام بەنسبەت کەسی زاناوە کەهەڵدەستێت بەڕۆڵی بکەر، زانست لێکۆڵینەوەو شارەزایی و تێکۆشان و ئەزموون و هیوایە کەبەپیریەوە دەچێت.. قوربانی‌دانە. لەوشەیەکی کورتدا دەتوانین بڵێن ژیانە. لەسەرو هەموو شتێکەوە بریتیە لەسەر چاوەی بەختەوەری بوون بەمەعریفە. هەستکردنێکی باڵایە بەبەرزترین بەها ئەخلاقیەکان. لەم بەختەوەریەدا زانا بەرزدەبێتەوە بەسەر خۆیدا دەبێتە بیرمەندێك یافەیلەسوفێك یاخود هونەرمەندێك. لێرەدا ئەو جیاوازیە لەخۆوە پەیدادەبێت و پێ‌دەگات لەنێوان ئەوەی کەزاناکە کەشفی دەکات بۆ خۆی و لەگەڵ ئەوەی کەوا کەشفی دەکات بۆ کەسانی دی.

کاتێك تین وگەرمای زانست ڕوو لەساردبونەوە دەکات ودەگۆڕێت بۆ کۆمەڵێك مەعریفە و دەرئەنجام.. کاتێك کەلەخودی زاناکەو ژیانی دادەبڕێت و بەجیا گەشەدەکات. و دەبێتە بێ‌لایەن، لەکۆتایشدا هەر ئەم بێ‌لایەنیە وای لێ‌دەکات کەهەڵبگەڕێتەوە لەئاین و

دژایەتیشی بکات. زانست لەرێگەی ئەو رەفزکردنەیەوە کەلەسروشتیەوە هەڵدەقوڵێت بۆ ئەوانەی کەلەپشتی سروشتەوەن، لەرێگەی ئەو بێدەنگیە بەردەوامەیەوە سەبارەت بەپرسیارە جەوهەریەکان ( لەژیانی مرۆڤدا) بەشداری دەکات لەپێکهێنانی بیروبۆچونی ئیلحادیدا، ئەمەیش نەک وەکو زەرورەتێك لەلایەن خودی زاناکانەوە فۆرمەلەبێت، بەڵکو بەتەئکید لەلای خەڵکانی ترەوە ئەمە دروست دەبێت، بەدەر لەزاناکان. نموونەی تەقلیدی لەسەر ئەم دوانیەتیە – مەبەستم لێی ئەو پێکدادانەیە لەنێوان فکرو ژیاندا، یان لەنێوان سروشت و ئازادیدا – زیاتر لەلای فەیلەسوفی ئەڵمانی (کانت) لەهەردوو رەخنەکەیدا( رەخنە لەعەقڵی خالیس و رەخنە لەعەقڵی کردەیی) دا دەردەکەوێت. لەرخنەی دووهەمیدا،( کانت) بیرۆکە ئاینیەکانی لەبارەی ئولوهیەت و نەمری و ئازادیەوە زیندووکردۆتەوە، کە هەمان ئەو بیرۆکانەن کەلەرەخنەی یەکەمیدا بەتەواوەتی سرِیبونیەوە (کانت)ی لۆژیکی و زانا ئەوەیە کەلە(رەخنەی عەقلی خالیس)دا قسەی کردوە، بەلأم (کانت)ی مرۆڤ و بیرمەند ئەوا لە(رەخنەی عەقلی کردەیی)[١٨] دا قسەی کردوەو بیروڕای خۆی دەربڕیوە. رەخنەی یەکەم ئەو ئەنجامە دەخاتەڕوو کەحەتمیە و دەرباز بوون نییە لێی بۆ هەموو عەقڵ و لۆژیکێك، رەخنەی دوهەمیشیان جەخت لەسەر دەرخستنی ئەو هەست و سۆز و ئەزموون و و هیوایانە دەکاتەوە کەزاڵ دەبێت بەسەر ژیانی مرۆڤدا. رەخنەی یەکەم دەرئەنجامی تێڕوانینێکی بابەتیانەیە بۆ واقیع ... ئەنجامی شیکردنەوەی واقیع و بەشبەشکردنیەتی. بەلأم رەخنەی دووەم، ئەوا بەروبومی ئەو مەعریفە (جَوانیة) و یەقینیەیە کەلەرۆحدا جێگیربووە، وەلأمێکە لەمەڕ ئەو پرسیارانەوە دەربارەی گەردون لەهەمەکیەتیدا، هەروەها دەکەوێتە ناو بواری تێبینی و ئەزموونی مرۆڤایەتیەوە..

---

[١٨] بڕوانە :( ئەمانوێل کانت) Immanulel Kant: The Critique of Pure Reason-. Chicago Encyclopaedia Britanica 1955).and The Critique of Practical Reason –( Chicago Encyclo Paedia Britanica, 1955) .

ئەم دوو رەخنەیە هیچ کامێکیان ئەویتریان هەڵناوەشێنێتەوە، بەڵام هەردوکیان پێکەوە شانبەشانی یەکتر دەوەستن لەبڵندیاندا، بەرێگەی تایبەتیەکەی خۆیان تەئکید لەسەر دوانیەتی جیهانی مرۆڤ دەکەنەوە.

# ئەخلاق و ئاین

ناکرێت ئەخلاق بنیات بنرێت تەنها لەسەر ئاین نەبێت، لەگەڵ ئەوەیشدا ئاین و ئەخلاق بریتی نین لەیەك شت، ئەخلاق وەکو بنەمایەك، ناکرێت بوونی هەبێت بەبێ ئاین، بەڵام ئەخلاق وەکو ممارەسەیەك یان حاڵەتێکی دیاریکراو لەرەفتار، ئەوا بەرێگەیەکی راستەوخۆ پشت بەدینداری نابەستێت. ئەو بەڵگەیەی کەپێکەوە بەیەکیان دەبەستێتەوە بریتی‌یە لەجیهانەکەی تر... جیهانێکی باڵا... لەبەرئەوەی جیهانێکی ترە ئەوا جیهانێکی (ئاینی)یە لەبەرئەوەی باڵایە، ئەوا جیهانێکی( ئەخلاق)یشە. ئالەمەدا پاڵپشتی هەرکەیە لەئاین و ئەخلاق بۆ یەکتری دەردەکەوێت، هەروەکو چۆن سەربەخۆیی هەریەکەشیان لەوی تر دەردەکەوێت. لەم پەیوەندی پاڵپشتیکردنەدا جۆرێك لەجێگیربوونی( جوانی) هەیە، ئەوەیش جێگیربونێکە ئالۆو بیرکاری یان لۆژیکی نی‌یە، بەڵکو جێگیربونێکی کردارییە، لێرەو لەوێ پەرش دەبێتەوە، بەڵام بەخێرایی ئەو پاڵپشتیە زوو بێ یاخود درەنگ خۆی ئامادە دەکاتەوە. ئیلحاد دەبێتەوە هۆی نکولیکردن لەئەخلاق، بەڵام هەموو زیندوبونەوەیەکی ئەخلاقی راستەقینە هەمیشە بەهەستانەوەیەکی ئاینی دەست پێ‌دەکات، ئەخلاق خۆی ئاینە، گۆڕاوە بە کۆمەڵێك بنەماو رەفتار، واتە گۆڕاوە بۆ کۆمەڵێك هەڵوێستی مرۆڤایەتیانە بەرامبەر کەسانی تر ئەمەیش بەپێ‌ی حەقیقەتی بوونە (ئیلاهی)یەکە. جائەگەر ئێمە پێویست بێت لەسەرمان ئەرکە ئەخلاقیەکانمان بەجێ‌بهێنین . بەچاوپۆشین لەو نارەحەتی و مەترسیانەی کەڕووبەڕوومان دەبنەوە .( ئەمەیش دادەنرێت بەرەفتارێکی ئەخلاقی جیا لەو رەفتارەی کەبەرژەوەندی دەبێتە پاڵنەری)، ئەم بانگەشەیەش

ناکرێت پاساوی بۆ بکرێت ئەگەر ئەم جیهانە تاکە جیهانێك بێت و جیهانێکی تر نەبێت، ئەگەر هاتوو ژیانمان تێیدا هەر ئەم ژیانەبوو. لێرەدا خاڵی لێوە دەرچوونی هەریەکە لەئاین و ئەخلاق دەردەکەوێت. ئەخلاق لەگەڵ حەرامکراوەکاندانن لەدایك بووە تائەمڕۆیش هەر بەو شێوەیە ماوەتەوە. حەرامکراوەکان ئاینین لەسروشت ولە ئەسڵیاندا ... ئەوەیشمان لەیاد نەچێت کەهەشت لەدەی وەسیتەکان لە(تەورات)دا حەرامکراوەکان. ئەخلاق هەمیشەکە مرۆڤ وابەستە دەکات بنەما یان حەرامکردنێکە ناسازە لەگەڵ ئەو غەریزە ئاژەڵیەدا کەلەسروشتی مرۆڤدا هەیە. دەکرێت لێرەدا ئاماژە بۆ ئەخلاقی مەسیحی بکرێت وەکو نمونەیەك، نەك تەنها وەك یەکێك لەنمونەکان، بەڵکو وەکو بەناوبانگترین و ڕونترینی ئەو نمونانەی مێژوی ئاین پڕە لەم حەرامکراوانە وادەردەکەوێت وەکو ئەوەی بێ‌مانابن. بەڵام لەگۆشەنیگای ئەخلاقیەوە، هیچ حەرامکراوێك نی‌یە بێ‌مانابێت، بەسروشتی حاڵ، دەکرێت بوونی مانایەکی عەقڵانی هەبێت بۆ حەرامکراوەکان، بەڵام بەرژەوەندی بەهیچ شێوەیەك ئامانجی جەوهەری نی‌یە لەو حەرامکراوانەدا، .ئەخلاق ئەوە نی‌یە وەکو(ریواقیەکان) پێناسەی دەکەن بەوەی کە (ژیانە لەگونجانیدا لەگەڵ سروشت)[19]، بەڵکو زۆر جار ژیانە دژی سروشت، بەمەرجێك کەووشەی (سروشت) بەمانا ڕاست و دروستەکەی خۆی وەربگیرێت.[20] ئەخلاق وەکو مرۆڤ ئەویش هەروەها ناعەقڵانیە، ناسروشتیە، بەڵکو(سەروسروشتیە). نەمرۆڤی سروشتی و نەئەخلاقی سروشتی بوونی. مرۆڤ لەسنووری سروشتدا مرۆڤ نی‌یە، بەڵکو لە باشترین گریمانەدا ئاژەڵێکە خاوەن عەقڵ. بەهەمان شێوەش ئەخلاقی ـ سنووردارکراو بەسروشت ـ ئەخلاق نیە بەڵکو زۆرجار

---

[19] بڕوانە :( وتنی جننجزأوتس)
Whitney Jennings oateos ,ed: The Stoica and Epicurean Philosphers: The Complete Extant Writings of Epicurus, Epictetus, Lucretius, Marcus Aurelius(New York: . Modern Library, 1957) .

[20] هەندێك دەڵێن ووشەی( سروشت) لە ٥٢ واتای جیاوازدا بەکاردێت. ئێمە لێرەدا لەم چێوەدا مەبەستمان لێ‌ی هەموو ئەو حەقیقەتانەیە کەلەپشتی جەوهەری مرۆڤەوەن، وەئەمەیش بەواتای جیهانی دونیایی مرۆڤ، کەجەستە و زیرەکی و هەموو ئەوشتانە دەگرێتەوە کەبەپەیوەندیان بەودوانەوەهەیە.

شێوەیەکە لەشێوەکانی خۆپەرستیی. خۆپەرستیەکی داناییانەو روناککەرەوە. لەلای (داروین) لە(ململانێ لەپێناوی مانەوەدا) سەرکەوتن بۆ باشترین نیە (بەمانا ئەخلاقیەکەی) بەڵکو ئەوەی بەهێزترەو باشتر توانای گونجان و سازانی هەیە سەردەکەوێت و دەمێنێتەوە[٢١]. پێشکەوتنی بایۆلۆژی - ئەویش - نابێتە هۆی بەرزکردنەوەی مرۆڤ بەو ئیعتبارەی کەیەکێکە لەسەرچاوەکانی ئەخلاق.

مرۆڤی ((داروین)) دەگاتە بەرزترین پلەکانی کەماڵی بایۆلۆژی (سوپرمان) یاخود مرۆڤی بالآ ، بەڵام بێبەش و مەحروم دەمێنێتەوە لەسیفەتە مرۆڤایەتیەکان، پاشان مەحرومیش دەبێت لەبالآیی مرۆیی. بالآیی مرۆیش ((بەخششێکە)) ناتوانرێت پێی بگەیت تەنها لەرێگەی خواوە نەبێت. پێشکەوتنی کۆمەلآیەتی، وەکو درێژبونەوەیەکی پێشکەوتنی بایۆلۆژی، پارێزگاری لەپەیوەندیەکی هاوشێوە دەکات لەگەڵ ئەخلاقدا. (ماندفیل) پیاوێکی ئەخلاقی ئینگلیزییە پرسیار لەو بارەیەوە دەکات: (گرنگی ئەخلاق چیە بۆ پێشکەوتنی کۆمەڵگاو پەرەسەندنی شارستانی ؟)) هەرخۆیشی بەشێوەیەکی سادە ئەم وەڵامە دەداتەوەو دەڵێت :(( هیچ شتێك، بەڵکو رەنگە زیان بەخشیش بێت)).[٢٢] لەلای (ماندفیل) هەموو ئەو ئامرازانەی کەلەبارەیەوە دەدوێن و واپێشان دەدرێن کەئامرازی خراپن گەورەترین کاریگەریان هەیە لەسەر هاندانی کۆمەڵگا بەرەو پێشکەوتن، چونکە ( ئەوەی کەدەبێتە هۆی زیادکردنی پێداویستیەکانی مرۆڤ ئەوە گەورەترین شتە کەهەوڵ دەدرێت بۆ بەرەو پێشخستنی) بۆ ئەوەی بەشێوەیەکی وردتر ئەمە دیاری بکەین دەڵێین( ئەوەی جەختی لەسەر دەکرێتەوە شەڕی ئەخلاقی و ماددین لەم جیهانەدا، بریتین لەو هێزە بنەڕەتی و بزوێنەرانەی کەوامان لێ دەکەن دەمانکەنە کۆمەڵێك بونەوەری کۆمەلآیەتی). ئەگەر هەموو پێشکەوتنێکی بایۆلۆژی یان تەکنیکی

---

[٢١] بروانە بۆ :(( تشارلز داروین)) لەکتێبەکەیدا(( بنچینەی جۆرەکان)) : Charles Darwini on The Origin of Spasies by means Natural Selection or The Preservation of favoured Races in The Struggle for Life( London : Oxford University Press, 1925).

[٢٢]( ماندیل ) : Mandeville, Bernard: The Fable of The Bees ...( London: Penguin Books, 1970)

لەتیۆری (داروین) وەربگیرێت لەهەڵبژاردنی سروشتی کە تێیدا بەهێز لاواز دەچەوسێنێتەوە، بەڵکو لەناویشی دەبات، ئەوا دەبێت ئەخلاق دژ بەخاڵی بنەڕەتی بوەستێتەوە لەپێشکەوتندا. ئەخلاق هەمیشە هەتا ئێستایش بانگەشە بۆ پاراستنی کەسانی لاوازو کەم توانا دەکات، بۆ بەزەیی پێداهاتنەوەو سەرپەرشتیکردن. بەو شێوەیە. ئەخلاق و سروشت لەپێکدادانێدا بوون هەر لەسەرتاوە.( ئەوە دەنگی سروشتە کەدەڵێت :(( خۆت رزگارکە لەویژدان و سۆزو بەزەیی... ئەم مەشاعیرانەیە کەزاڵ دەبن بەسەر ژیانی ناوەوەی مرۆڤداو وای لێدەکات بەشێوەیەکی زاڵمانە رەفتار بکات.. لاوازو بێدەسەلاتان بچەوسێنەرەوەو سەریکەوە بەسەرجەستەیاندا. [٢٣]

جیاوازی لەگەڵ ئەخلاق لێرەدا تەواو روونو دیارە: لاواز بێدەسەلاتان لە ناوبەرە لەبری پارێزگاری و پاراستنیان ئەم دوو بانگەشە دژبەیەکە، بایۆلۆژی لەڕۆحیو، ئاژەڵی لەمرۆیی و، سروشت لەرۆشنبیری و، زانست لەئاین جیادەکەنەوە. هەموو ئەوەی کە(نیچە) کردیو بەشێوەیەکی جێگر چەسپاندی یاساکانی زانستی بایۆلۆژیا و بەرئەنجامەکانی بوو لەسەر کۆمەڵگای مرۆڤایەتی.[٢٤] دەرئەنجامەکەیشی وەلاخستنی خۆشەویستیو بەزەییو پاساو دروستکردن بوو بۆ توندوتیژیو خراپەکاری... مەسیحیەت لای (نیچە)، بەتایبەتی ئەخلاقی مەسیحیەت ((ئەو ژەهرە کوشندەیەیە کەچووتە ناوخوێنو جەستەی بەهێزی رەگەزی بەشەرییەوە..)).

ئەفلاتون لە((گفتوگۆی فیدون))دا لەبارەی ئاکاری ڕەسەنەوە دەدوێت، دەڵێت : ئازایەتی ئاسایی شتێك نییە جگە لەترس، میانەیی ئاساییش شتێك نییە جگە لەئارەزوویەکی شاراوە بۆ چێژ، ئەم جۆرە لەفەزیلەت شتێك نییە جگە لەبازرگانی نەبێت. تارمایی فەزیلەتە یان فەزیلەی بەندەکانە. بەڵام مرۆڤی ئەخلاقی لەسەر شێوەی ڕاست و دروست، یەك شەوق ئاراستەی دەکات و دەکەوێتە ژێر کاریگەریەوە ئەویش

---

[٢٣] بڕوانە( نیشتە)) Friedrich W. Nietzsche Thus Spoke Zarathustra

[٢٤] ئەگەر ئەفکارەکانی( نیچە) درێژکراوەیەکی فەلسەفیانەی داروین بن ئەوا هیتلرو نازیەتەکەی( ئیشتقاقێکی سیاسی هەردوو مەزهەبەکەیە).

ئەوەیە: خۆی دووربخاتەوە لەشتە مادیەکان و بنوسێت بەو شتانەوە کە ڕۆحین.. جەستە گۆڕی ڕۆحە، ڕۆحیش بەهۆی ئەو کۆت و وابەستە بوونە زەویەیەوە ناتوانێت بگات بەئامانجەکانی. مەعریفەی ڕاستەقینەش نایەت یاخود پێ‌ی ناگەین تەنها دوای مردن نەبێت، ئەمەیش هۆی ئەوەیە کەپیاوی ئەخلاقی گوێ نادات بەمردن و لێ‌ی ناترسێت. بۆ ئەوەی بژی و بیربکاتەوە ژیان و بیرکردنەوەیەکی ڕاستەقینانە بەواتای ئەوەی کەهەمیشە ئامادەبێت بۆ مردن. شەڕ بریتی‌یە لەو هێزەی حوکمداری ئەم جیهانە دەکات، ئەخلاقیش بریتی نی‌یە لە (ئیمکانیەتێکی) سروشتی بۆ مرۆڤ وناکرێت بینا بکرێتە لەسەر عەقڵ.[25] زانستی ئەخلاقی نەکراوە سەلماندنێکی عەقڵی بۆ بکرێت بەسروشتی حاڵیش ناکرێت بەپێ‌ی ئەو میتۆدە سەلماندنی لەسەر بکرێت. ئەفلاتون لێرەدا ئاماژە بەبەڵگەو سەلماندنی میتافیزکی دەکات لەبەرامبەر سەلماندنی (انثروبولوجی)دا. ئەمەیشە وای لێ‌دەکات کەببێتە پێشەنگی ئەخلاقناسی پشت بەستوو بەبیرۆکە ئاینیەکە. ئەمەیش پەرەسەندنێکی گونجاو بوو لەگەڵ فیکری ئەفلاتوندا، وەکو زانراویشە ئەفلاتون بڕوای بەبیرۆکەی بوونی پێشینەیی شتەکان هەیە (لەجیهانێکدا کەناوی ناوە جیهانی( المثل) واتە جیهانێکی(نموونەیی) بەمەیش هەموو زانیاریەکمان لەم جیهانەدا تەنها یادکردنەوەیە ((بۆ ئەو شتانەی کە لەمەوەپێش هەبوون لەوجیهانە بالاّو باشترەدا)) بەڵگە نەویستێکی زەروریش دەبێتە تەواوکاری ئەم بیرۆکەیە کەبریتیە لەبیرۆکەی نەمری).[26] بەوشێوەیە، تەئەمولاتە ئەخلاقیەکانی ئەفلاتون وایان لێ‌کرد بەرەو هەڵوێستێکی ئاینی بەرن.[27] دووبیرمەندی تریش هەن هەمان ڕێگایان گرتۆتەبەرکە بریتین لە(ئیبکتیتوس) و(سنیکا)، کەتەئەمولێکی لەهەمان شێوە گەیاندنی بەئاینێکی دیاریکراو کەبریتیە لەمەسیحیەت.

---

[25] بڕوانە ئەفلاتون Plato: Phaedo, trans. R. S. Bluck( London : Routledge and Paul, 1955)

[26] فەیلەسوفی ئیسلامی گەورە( ابن رشد) هەمان کێشەی باسکردوە، لەتێڕوانینی ئەودا ئەخلاق جەوهەری ئاینی گەردونیە بڕوانە Averroes on Plato,s Republic, trans. Ralph Lerner( Ithaca,NY: Cornell University press, 1974)

[27](بیری ئابیلارد) پێ‌ی وایە کەئەفلاتون مەسیحیە.

ئەوەش زیاتر دەبێتە بەڵگە لەسەر ئەم بۆچونە بوونی چەند ڕایەکە جەخت لەسەر ئەوە دەکاتەوە کە( ئیبکتیتوس) بەنهێنی لەسەر ئاینی مەسیحی بووە، وە( سنیکا) پەیوەندی و نامەگۆڕینەوەی لەگەڵ (بۆڵس)دا هەبووە.( سان جیرۆم) ئەوەی سەلماند کەناوی (سنیکا) لەلیستی نوسەرەکانی کەنیسەدا هەبووە.[28] مەسیحیەت دادەنرێت بەنمونەیەکی دیار، بۆ گونجانی تەواوو ئاڵوگۆڕکردنی دوولایەنەی بەهێز تاڕادەی یەکێتی لەنێوان ئاینێکی گەورەو ئەخلاقێکی گەورەدا، هونەری چاخی ڕێنیسانس کەئیلهاماتەکانی خۆی لەبابەتە ئینجیلیەکانەوە وەرگرتوە، سەلماندی کەهونەری گەورە بەهەردووکیان دەگاتەوە. لەلایەنی مێژوییەوە، بیرۆکەی ئەخلاقی دادەنرێت بەکۆنترین بیرۆکەکانی مرۆڤایەتی، هیچ شتێکیش پێش ئەمە ناکەوێت بێجگە لەبیرۆکەی ئاینی، کەزۆر کۆنەو پێشی مرۆڤ خۆیشی کەوتوە.. هەردوو بیرۆکەکە لەماوەی مێژوودا بەیەکەوە چەسپیون. لەمێژووی زانستی ئەخلاقناسیدا، بەشێوەیەکی کرداری بیرمەندێکی جدی نەبووە کەهەڵوێستی نەبێت سەبارەت بەئاین، ئیتر لەڕێگەی وەرگرتنی زەرورەتی ئاینیەوە بێت وەکو کۆمەڵە بنەمایەکی ئەخلاقی یان لەڕێگەی هەوڵێکەوە بوبێت بۆ سەلماندنی پێچەوانەکەی. لەبەرئەوە دەکرێت بوترێت کەمێژوی زانستی ئەخلاقناسی بەگشتی چیرۆکێکی پێکەوە بەستراوە بۆ بەیەکداچونی فیکری ئاینی و ئەخلاقی.

لێرەدا سەرژمێریەکان وەرناگرین بۆ سەلماندن لەم بوارەدا، بەڵام دەکرێت ئەوە بڵێین کەپیاوانی ئەخلاق و دیندارەکان زۆر بەڕێزو بڵاون لەهەموو جێگەیەکدا، بەڵام(مولحد) و بێباوەڕەکان بەوشێوەیە نەبوون هەرگیز. لەماوەی چەرخی نۆزدەیەم و بیستەمدا لەئەوروپادا بزوتنەوەیەك دەرکەوت بەناوی بزوتنەوەی ئەخلاقی عەلمانیەوە کەجەخت

[28] بڕوانە :( سانجیرۆم) Saint Jerome: Hieronymi De Virais Ilustribus Liber(Leipzig B.G . Teubner: B. G.Teubner, 1879).

لەسەر سەربەخۆیی ئەخلاق دەکات لەئاین.[29] لەگەڵ ئەوەیشدا، هەمان ئەم بزوتنەوەیە ئەوەمان بۆ کەشف دەکات کەهەموو بیرۆکەیەك یان چالاکیەکی ئەخلاقی هەردەبێت بەرەو ئەوە بڕوات کەشێوەی ئاینێك وەربگرێت یان ڕێك بکەوێت لەگەڵیدا. هەرچۆنێك بێت، ئەوەی کەدەردەکەوێت لەناسازی و نەگونجان لەگرتنەبەری ئەم بیرۆکانەو و بەپەسەندتر زانینیان لەنێوان زانست و ئایندا، دیاردەیەکی تەواو گرنگەو( شایانی ئەوەیە لێکۆڵینەوەی لەسەر بکەین). لێرەدا تەنها ئاماژە بەو ڕوداوانە دەکەین کەلەقوتابخانە فەڕەنسیەکاندا رویاندا . ئاڕاستەکردنی ئاکاری و ئەخلاقی جێگای ئاڕاستەکردنی ئاینی گرتەوە. دەبینین کتێبەکانیان لەم بوارەدا هەمان ئەو شێوازەیان گرتۆتەبەر کەلەکەنیسە مەسیحیەکاندا پەیڕەوی دەکرێت و وانەی پێدەوترێتەوە. بەو شێوەیە دەبینین ئەو نەزعە عەلمانیە کەسورە لەسەر ئەوەی هەڵویستێك وەربگرێت جیابێت لەئاین کەچی لەکاتی پیادەکردن و مومارەسەدا سەر ئەو هێڵە دەکەوێتەوە کەبەرەو ئاین دەڕوات ئەگەرچی ئەمە بەڕێگەیەکی نائاگایش بێت. لەبەرئەوە، دەکرێت ڕەچاوی ئەوە بکەین کەپیاوێکی ئاینی ئەخلاقی نەبێت، بەپێچەوانەیشەوە، چونکە ئاین جۆرێکە لەمەعریفە، ئەخلاقیش بریتیە لەو ژیانەی کەمرۆڤ بەپێی ئەو مەعریفەیە زیندوی دەکاتەوە، لێرەدا ئەو جیاوازییە دەردەکەوێت کەلەنێوان مەعریفەو مومارەسەدا هەیە. ئاین وەڵامدانەوەی ئەو پرسیارەیە : چۆن بیردەکەیتەوەو چۆن باوەڕدەهێنیت ؟ لەکاتێکدا ئەخلاق وەڵامی ئەو پرسیارەیە : چۆن حوکمی حەزەکان دەکەیت و چۆن ئامانج دیاری دەکەیت، یان چۆن دەژیت و چۆن هەڵسوکەوت دەکەیت؟، ئیلهاماتەکانی جیهانی غەیب لەدەوری ئەو داواکارییە کۆدەبنەوە کەبەو شێوەیە بژین بەپێی ئەو ڕوئیا گەردونیە فراوانە بێکۆتاییە، لەگەڵ ئەوەیشدا، ئەم داوایە ڕێك ناکەوێت لەگەڵ ئەو ڕوئیایەدا.

---

[29] ئەم بزوتنەوانە لەفەرەنسا و ئینگلتەراو ئەمەریکا و ئەڵمانیا و ئیتالیا بەدەرکەوتن لەماوەی سەدەی ١٩ و ٢٠ دا وە بەشێوەی ناوی جۆراو جۆر ناسراون وەکو : کۆمەڵەی ڕۆشنبیری ئەخلاقی، دەزگاکانی بوژندنەوە و، کۆمەڵە ئەخلاقیەکان..هتد..

ئەخلاقیاتە بەرزەکانی مەسیح ئەنجامێکی ڕاستەوخۆی هۆشیاریەکی ئاینی بوو لەسەر هەمان پلە لەبەهێزی و ڕونیدا. لەگەڵ ئەوەیشدا، پێشکنەرانی لێکۆڵینەوە ئەوانەی هەستان بەکردارەکانی چەوساندنەوەی ئاینی ئەوانیش هەروەها دڵسۆز بوون بۆ بیروباوەڕە ئاینیەکەی خۆیان، ئێمە کەجەخت لەسەر ئەمە دەکەینەوە ئەوەیش پشت گوێ ناخەین کەهەیە لەم ڕێڕەوەدا لەنەگونجانی تیژو دژ، ئەم ئایەتە بخوێنەوە:(..الذين امنوا وعملوا الصالحات..) ئەمە بەهەمان دەستەواژە یاخود بەهەمان مانا زیاتر لەپەنجا جار لەقورئاندا دوبارە دەبێتەوە. وەکو ئەوەی تەئکیدمان بۆ بکاتەوە بۆ ئەوەی یەکێتی لەنێوان دووشتدا بکەین کەخەڵك ڕاهاتووە لەسەر ئەوەی لێکیان جیابکاتەوە. ئەم ئایەتە تەعبیر لەسەر ئەوە دەکات یان ئەو جیاوازیەمان بۆڕون دەکاتەوەکە لەنێوان ئایین (باوەڕ) و لەنێوان ئەخلاق ((کرداری چاکە))دا هەیە لەهەمانکاتیشدا فەرمانمان پێدەکات سەبارەت بەوەی کەزەرورە ئەو دوانە پێکەوە لەگەڵ یەکدا بڕۆن. هەروەها قورئان دێت کەشفی پەیوەندیەکی تری پێچەوانەمان بۆ دەکات لەنێوان ئەخلاق و ئایندا، سەرنجمان ڕادەکێشێت بۆ ئەوەی کەمومارەسەی ئەخلاقی دەبێتە پاڵنەرێکی بەهێز لەسەر دینداری : (لن تنالوا البر حتى تنفقوا مما تحبون) مانای ئەم ئایەتە لێرەدا ناڵێت:( بڕوا بهێنە بۆ ئەوەی ببێتە خێرخوازو چاکەکار) بەڵکو بەپێچەوانەوە دەڵێت:(چاکەو کرداری چاك بکە دەبیتە بڕوادار). لەم خاڵەدا وەڵامی ئەو پرسیارە دەبینینەوە چۆن دەکرێت بۆ مرۆڤ کەباوەڕەکەی بەهێز بکات ؟ وەڵامەکەیشی ئەمەیە :( خەیرو چاکە بکە خوا دەبینیتەوە لەبەردەمتدا).

# ئەخلاق و ئەوەی ناودەبرێت بە بەرژەوەندی هاوبەش

عەقلانیەت ئینکاری ئەخلاقی کرد و ئەم ئینکارکردنەیشی زیاتر لەوەدا دەرکەوت لەسرینەوەی ئەو دوانیەتیەدا لەنێوان ئەرك و بەرژەوەندیدا هەیە، تەسککردنەوەی ئەخلاق بۆ تەنها سود یان چێژ. لەپاشاندا زاڵبوو بەسەر ئەو رەوشە سەربەخۆیەیی ئەخلاقیشدا، بەدرێژیی مێژووی ئەخلاقناسی ئەم نەزعەیە هەبوە. هەر لە(ئەرستۆ) وە هەتا(برتراند راسل).( دینزیش فۆن هولباخ) کەیەکێکە لەنوسەرە بەراییەکان مەزهەبی ماددی لەرۆژئاوادا، بەشێوەیەکی تەواو روون و ئاشکرا شەرحی ئەم ئاراستەیە دەکات. پاش ئەوەی جەختی لەسەر ئەو دروشمە بەناوبانگە (بەتەنها بەرژەوەندیە پاڵنەرە بۆ رەفتارە مرۆییەکان) کردەوە هەروەها بەرەو گەشەپێدانی ئەم سیناریۆیە رۆیشتوو ووتی :((ئەو ئیحساسات و ئینتباعانەی مرۆڤ لەشتەکانەوە وەریان دەگرێت، هەندێکیان دڵخۆشکەرن و هەندێکیان بەئازارن، مرۆڤ هەندێکیانی بەلاوە چاکەو حەز دەکات درێژترین ماوە بمێنێتەوە یان جارێکی تر دەربکەوێتەوەو دوبارە ببێتەوە، لەکاتێکدا رقی لەهەندێکی تریانە و ئەوەندەی کەبتوانێت پەرێزی لێدەکات. بەمانایەکی‌تر، مرۆڤ هەندێك مەشاعیر و ئینتیباعاتی دیاریکراوو ئەو شتانەیش دەبنە هۆکاری ئەوحاڵەتە خۆشی دەوێت، هەندێ ئینتیباعات و مەشاعیری تر و ئەوانەیشی دەبنە هۆکاری دروست بوونی ئەو حاڵەتە خۆیشی ناوێت.

بەحوکمی ئەوەی مرۆڤ لەکۆمەڵگایەکدا دەژی، دەورە دراوە بەبونەوەری هاوشێوەو هەستیاری وەکو خۆی. هەموو ئەو بونەوەرانەیش بەشوێن چێژدا دەگەڕێن و هەموویشیان لەئازار دەترسن. هەموو ئەوانەی کەدەبنە هۆی چێژ پێگەیاندنیان ناویان لێناوە (خەیر) و هەرشتێکیش دەبێتە هۆی ئازار پێگەیاندنیان ناویان لێناوە( شەڕ)...

ئەوان بەهەموو ئەو شتانەی کەسوودی هەمیشەیی تێدایە بۆیان پێی دەڵێن:(فەزیلەت) ئەوەی کەزیانی تێدایە بۆیان پێی دەڵێن : ڕەزیلەت...)).

((هولباخ)) بەرەو ئەوە دەڕوات و پێی وایە کە(( ویژدان بریتیە لەئاگایی بە کاریگەری ڕەفتارمان کە دەکەوێتە سەر ئەو خەڵکانەی لەدەوروبەرمان هەن، هەروەها لەسەر خۆیشمان، پەشیمانیش بریتیە لەو ترسەی هەستی پێدەکەین تەنها بەهۆی بیرکردنەوەوە لەوەی کەڕەفتارمان وا لەخەڵکی بکات حەزمان پێنەکەن یان توڕەبن لێمان))[٣٠]. هەروەها((بنتام)) خاوەنی مەزهەبی سوود لەئەخلاقناسیدا- ڕون و لۆژیکیە لەم بوارەداو، دەڵێت : (سروشت مرۆڤی ملکەچی دوو گەورەو سەرداری خۆی کردوە کەبریتین لە : چێژو ئازار. هەر ئەو دوانەیشن بەتەنها کەحوکمی کردارەکانمان دەکەن)[٣١].

فەیلەسوفی فەڕەنسی ((هلفتیوس)) بەرەو ئەوە دەڕوات لەسەدەی هەژدەهەمدا کەهەموو ڕەفتارێکی مرۆیی هەمیشە ئاراستەی شتێك دەکرێت کەمترین بەرگری هەبێت. هیچ کەسێك هەڵناسێت بەکارێك مەگەر باوەڕی وابێت بەهۆی ئەوچالاکیەوە چێژی زیاد دەبێت، یاخود لەئازاری کەم دەبێتەوە. هەروەکو چۆن ئاو بەشاخدا سەرناکەوێت، مرۆڤیش ناتوانێت دژ بەم یاسایە کەلەسروشتیەوە سەرچاوەی گرتووە کاربکات.

ئەم تێڕوانینە وا لەئەخلاق دەکات کەتەنها خۆپەرستیەکی پاك و بێخەوش بێت. بەرژەوەندی تاکێکە ڕوون و ئاشکرایەو بەپێی بەرژەوەندی کەسەکە لێکدراوەتەوەو خەملێنراوە و پاشان عەقڵ دێتە ناو ئەم مەسەلەیەوە بۆ ئەوەی عەقڵی خواست بگۆڕێت بۆ چێژ بۆ داوایەکی ئەخلاقی، زیرەکی و یادەوەری ڕێگا خۆش دەکەن بۆ

---

[٣٠] بڕوانە :(( پول هنری)) Paul Henry, Thirty( Dietrich von Holbach) the System of Nature , or Laws of the Moral and Physical World ...trans( Boston: J.P. Mendum, 1889).

[٣١] بڕوانە((جیرمی بنتام)) : Jeremy Bentham: An Introduction to the Principles of Morals and Lagislation...( London : Athlone Publishing, 1970).

ئەوەی مرۆڤ لەو گۆشەنیگایەوە کەبەسەریدا دەکرێتەوە ڕابردوو و داهاتویش ببینێت، سەرەڕای ئێستایش. بەو شێوەیە ڕەفتاری مرۆڤ تەنها بەرژەوەندیە هەنوکەییەکانی ئێستای نابنە پاڵنەر بۆی بەڵکو ئەو کۆتاییە خۆشەیشە لەهەمەکیەتیدا [٣٢]. لەژێر ڕۆشنای ئەم بەدواداگەڕانەدا، مرۆڤ مەشاعیری ئازار و چێژ دەگۆڕێت - کەچەند حەقیقەتێکی بایۆلۆژی ئاژەڵی داریونین - بۆ مەفهومی خەیر و شەڕ.

خەیر و شەڕیش هیچ نین جگە لەچێژ و ئازار کەبەهۆی دەرک و زیرەکی و بیرکردنەوەو لێکدانەوەوە زیادیان کردوەو مەفهومەکەیان گۆڕاوە.

بەو شێوەیە، ئەخلاقیاتی سوود پەنگ دەخواتەوە لەسنووری سروشتدا ڕوانیەکانیشی کورت دەبێتەوە تەنها لەنێو دیوارەکانی ئەم جیهانە دونیاییەدا. ناتوانێت سنوورەکانی بەرژەوەندی تێ بپەڕێنێت بۆ ئەوەی ببێتە ئەخلاقیاتێك بەمانای ڕەسەنی ئەم ووشەیە.

هەموو ئەزموونە مرۆڤایەتیەکان لەبواری ئەخلاقدا ناساز و نەگونجاون لەگەڵ ئەم بیرۆکە مادییەدا، دەبینیت لەزۆر لەمەسەلە ئەخلاقیەکاندا خەڵك نەوازشی نواندوەو چێژی لەئاکارە ئەخلاقیەکان دور خستۆتەوە. بۆ نمونە چ چێژێك هەیە لەزوهدو دونیانەویستی و هاوسەرنەگرتن و قوربانی دانی ماددی و ڕۆژوداو، لەزۆربەی جۆرەکانی ئینکاریکردنی جڵەوگرتنی نەفسیو، قوربانیدان لەپێناو بنەماو بیروباوەڕدا یاخود لەپێناو خەڵکانی تردا...؟

ئەخلاقی سوودبەخش یاخود ئەو کارانەی لەپێناو سووددا دەکرێن و دەخرێنە چوارچێوەیەکی ئەخلاقیەوە ناجۆر و نەگونجاوە لەگەڵ مەفهومی مرۆڤی هاوچەرخدا بۆ ئەخلاق، بەقەدەر ئەوەیش ئەمە ناسازو نەگونجاوە لەگەڵ تێگەیشتنی مرۆڤی سەرتاییدا بۆ هەمان چەمك.

---

[٣٢] ئەم تیۆرە لەئەخلاقدا وا لەبەدەست کەوتنی خۆش بەختی دەکات کەبنەڕەتێك بۆ ڕەفتاری ئەخلاقی و سەنگی مەحەك بۆی.

لەڕابردوودا مرۆڤی سەرتایی بوو کە زنجیرەیەکی تەواوی لەحەرامکراوەکان (تابۆ) و پابەندبوونەکانی دلهێنا کەبەهیچ شێوەیەك ئەم تابۆیانە لەگەڵ بنەمای سوووددا نایەنەوە. لەبەرئەوە، ئەستەم ئەبێت لەسەر مرۆڤی هاوچەرخ لەپشتی ئەم شتانەوە هەر مانایەکی بەسوود یاخود عەقلانی و ئامانجدار بدۆزێتەوە. ئەخلاق قازانج بەخش نیە، ئایا دەتوانین بۆ نمونە بڵێین کەئەو دروشمە باو و بلاوەی(( ژنان و مندالان لەپێشدا)) بەسوودە لەلایەنی کۆمەڵایەتیەوە ؟ ئایا ئەوە دەبێتە مایەی سوود کەدادپەروەربیت یاخود ڕاستی بڵێیت ؟.. ئێمە دەتوانین چەندین هەڵوێست بەدی بکەین کەتێیاندا زوڵم و درۆکردن بەسودترن. بۆ نمونە، لێبوردنی ئاینی و سیاسی و ڕەگەزی و نیشتیمانی بەسود نین ئەگەر بەپێی ماناي باوی ووشەکە لێکی بدەینەوە. بەلام ئەگەر ئەوکەسانەی ململانێت لەگەڵدا دەکەن بێت و لەناویان بەریت، ئەوا ئەوە زیاتر بەسوودە، ئەگەر لەگۆشەنیگایەکی عەقلانی ڕوتەوە سەیری ئەم مەسەلەیە بکەین.

بەلام لێبوردن – لەحالەتی فەراهەم بوونیدا – ئەوا مومارەسەکردنی بەهۆی پاڵنەری بەرژەوەندیەوە نابێت، بەڵکو لێبوردن بەهۆی پاڵنەرێکەوەیە لەلایەن بنەم و باوەڕەوە یاخود بەهۆی پاڵنەرێکی مرۆییەوە دەبێت، یاخود بەهۆی ئەوەوە دەبێت کەپێی دەڵێن :( بێمەبەستی ئامانجدار).

پارێزگاریکردنی پەککەوتەو بێتواناکان، یاخود سەرپەرشتی کردنی کەم ئەندامان و نەخۆشەکان، ئەوانەی کەهیوای چاك بونەوەیان لێ ناکرێت هەموو ئەوانە بەمەبەستی گەڕان نی‌یە بەشوێن دەسکەوتنی سووددا. ئەخلاق ناکرێت ملکەچ بکرێت بۆ پێوەرەکانی سوود. بەلێ.. ڕەنگە هەندێ جار ئاکاری ئەخلاقی وابێت کەسوود بەخش بێت. بەلام ئەمە ئەوە ناگەیەنێت شتێك بوەتە ئەخلاقی لەبەرئەوەی لەماوەیەك

لەماوەکانی ئەزمونی مرۆڤایەتی‌دا سەلماوە کەئەو شتە سوود بەخشە. بەپێچەوانەوە.. ئەو جۆرە حاڵەتانە ڕودانیان دەگمەنە.[٢٣]

ئەو بیروباوەڕە گەشبینیەی کەپێی وایە لەنێوان سوود لەلایەك و ڕاستگۆیی‌و ئەمانەت پاراستن لەلایەکی ترەوە پێکەوە گونجان هەیە، سەلماوە کەئەوە باوەڕپێکردنێکی ساویلکانەیە بەڵکو زیانبەخشیشە.

کاریگەرییەکی ڕوخێنەریشی هەیە لەسەر دەرونی خەڵك چونکە ئەوان بەبەردەوامی پێچەوانەی ئەمە دەبیننەوە. بەڵام مرۆڤی ڕاست و دامەزراو بەڕاستی، بریتیە لەو مرۆڤەی کەبەرەو قوربانی‌دان دەڕوات، ئەگەر ڕووبەڕووی فریودانیش بووەوە دامەزراوو خۆڕاگر دەبێت لەسەر دڵسۆزی بۆ ئەو بنەمایانەی کەبڕوای پێیەتی، نەك بۆ بەرژەوەندی خۆی کاربکات. ئەگەر فەزیلەت بەڕاستی قازانج بەخشبوایە، ئەوا هەلپەرستەکان پێشبڕکێیان دەکرد بۆ هەڵکوتانەسەری بۆ ئەوەی ببونایەتە نمونەی فەزیلەت. ئەزموونەکانی زانایانی بواری تاوان فێرکەرو تاڵن لەهەمانکاتدا، بەپێی ڕاپۆرتی پۆلیسی شیکاغۆ لەساڵی ١٩٥١ دا زیاتر ٠/٠٩٠ی تاوانەکانی تاڵانیکردن بەبێ دەستگیرکردنی تاوان بارەکان ماونەتەوە.

هەوڵەکانی (کیفوفر) Kefauver دەریخست کەتاوانبارە ئەمریکیەکان بەملیۆنەها دۆلار بەتاڵان دەبەن و زۆر بەئاسایی و بەئارەزووی خۆیان بەبێ ویژدانانە خەرجی دەکەن و پێی ڕادەبوێرن بەو شێوەیە، وەکو زانایانی بواری تاوان بۆیان دەرکەوت کەتاوان دەبێتە هۆی دەستخستنی قازانج وکارێکی بەقازانجە بەتایبەتیش بەنسبەت ئەوانەوە کەسەرپەرشتی ڕێکخستنی تاوانەکە دەکەن و خۆیان بەشداری تێداناکەن. وەکو باندەکانی مافیاو هەندێکی تر لەباندەکانی ئەنجامدانی تاوان. یەکێك لەزانایانی بواری تاوان لەئەمریکا جەختی لەسەر ئەمە کردەوەو ووتی: ((وادەردەکەوێت کەچەندە

---

[٢٣] زۆر جار ئەو پەندە لەناو خەڵکیدا دووبارە دەبێتەوە کەدەڵێت ( شێت و دەست پاك بران). لەگەڵ ئەوەیشدا، هەردەبێت دان بەو حەقیقەتەدا بنرێت کەدانایی میللی هەرگیز ڕەواجی بەخیانەت و گەندەڵی نەداوە.

لەپشتی تاوانێکی کوشتنەوە دەسکەوتی مادی زۆرتربێت، ئەوەندەیش هەلی دەستگیرکردنی تاوانبارو سزادانی کەمتر دەبێتەوە)).

لێرەدا پرسیارێك دروست دەبێت ئەویش ئەوەیە: ئەی دەبێت دەربارەی دەستکەوتی تاوانەکانی تر کە یاساپێژیان بۆ کراوەو لەچوارچێوەیەکی یاساییدائەنجام دەدرێت وەکو هونەری بەرەڵایی و، نوسینە بەدئەخلاقیەکان و خۆنواندنی ئافرەتانی ڕووت و چیرۆکەکانی تاوان و چەندەهای تری لەو شێوانە ؟ دەرکەوتوە کەفلیمێکی ڕووت دەیان جار هەرزانتری تێدەچێت و بەرهەم هێنانی کەمتری دەوێت لەچاو فلیمێکی ئاساییدا، دەسکەوتەکەیشی دەیان جار لەدەسکەوتی فلیمێکی ئاسایی زیاترە [٢٤]. لەوانەیە ڕونترین نمونەیش لەسەر( ئەو تاوانانە) ئەوەبێت کەبەشێوەیەکی فراوان ئەنجامدەدرێن: وەکو جەنگە دوژمنکاریەکان و داگیرکردنی وڵاتان و چەوساندنەوەی کەمینەکان...باشە ئێمە دەتوانین بڵێین کەئیسپانیەکان لەلەناوبردنی هیندیە سورەکانی مەکسیك لەناوەڕاستی ئەمریکاو خواروی ئەمریکادا قازانجیان نەکردوە، یاخود جێنشینە سپی پێستەکان سودیان وەرنەگرتوە لەقەلاچۆکردنی نەخشە بۆکێشراوی هیندیە سورەکانی دانیشتوانی ئەمریکای باکوور، یاخود هێزە ئیمپریالیزمەکان لەدەست بەسەراگرتن و تالأنکردنی وڵاتە داگیرکراوەکانی ژێردەستیان هیچ سودێکی مادیان دەست نەکەوتبێت؟.

کەواتە لەمەوە دەتوانین بگەینە ئەم ئەنجامە کەتاوانکردن پەیوەندیەکی ڕاستەوانەی بەمەسەلەی سوودو قازانجەوە هەیە و قازانج بەخشە، بەلأم بەو مەرجەی کەخودا نەبێت.

دەکرێت بینای ئەخلاقیاتی سوود لەسەر بنەمایەکی عەقڵی بکرێت هەتا ئەگەر لەسەر ئاستێکی تیۆریش بێت. بەلأم مەحاڵە لەسەر بنەمایەکی عەقڵی لەحاڵەتی نائامادەگی ئولوهیەتدا ئەخلاقیاتی خۆنەویستی نەك خۆویستی بینابکرێت، یان ئەو ئەخلاقیاتەی

[٢٤] ئەم هەوڵی ئاشکراکردنە لەساڵی ١٩٧٦ لەپاریس ئەنجام درا.

کەلەسەر قوربانی‌دان دەوەستێت هەروەکو چۆن پێویستیشە کەئەخلاق بەوشێوەیە بێت.

ئەرستۆ لەکتێبە بەناوبانگەکەیدا (ئەخلاقی نیقۆماخوس) ناکۆك ودژ لەگەڵ خۆیدا دەوەستێتەوە، هاتووە (الغیریة) واتە خۆنەویستی و خۆشەویستی خەڵك و یارمەتی دانیانی لەئەنانیەت و خۆپەرستیەوە وەرگرتوە چونکە (الغیریة) لای ئەو لەزاتیەتی مرۆڤەوە دەست پی‌دەکات، پاشان دەڵێت :(( ... پیاوی ئەخلاق لەپێناو هاوەڵەکانی و نیشتمانەکەیدا کاری زۆر دەکات و قوربانی بەماڵ و سامان و هەموو ئەو شتانەی کەهەیەتی دەدات و بەخۆش حاڵیەوە لەپلەوپایەی خۆی دێتە خوارەوە بۆ کەسانی تر، لەسەرو هەموو ئەوەیشەوە، ئەگەر پێویست بکات لەپێناو کەسانی تر و لەپێناو نیشتیمانەکەیدا دەمرێت)) [٣٥]. ئەوەی لێرەدا زۆر روون و ئاشکرایە ئەوەیە کەئەم هەڵوێستانە پەیوەستێکی لۆژیکی نایان بەستێتەوە بەیەکەوە، هەموو ئەوانە لەیەك سەرچاوەو بناغەوە نەهاتوون. زۆرێك لەبیرمەندان تێبینی ئەم ناسازی و دژواریەیان کردوەو قسەی خۆیان لەسەر کردوە، لەوانە (شلیهر ماخر) کەرەخنە لە((کۆمای فەزیلەتەکان)) [٣٦] ی ئەرستۆ گرت. هەروەها(( فردریك یودل)) تێبینی ئەوەی کرد کە((ئەرستۆ)) نەسازی و دژەیەکی تەواو دیارە بەبۆچونەکانیەوە کاتێك چەند دەرەنجامێکی پاڵەوانی لەبنەمای ئەنانیەتی ئەخلاقیەوە وەرگرتووە کە (ئەمە بەتەئکید ناکرێت لەوبنەمایەوە وەربگیرێت). [٣٧]

کاتێك (ئەرستۆ) ووتی :((هەتا لەگەڵ هەڵوێستی پاڵەوانانەیشدا ئێمە کێڵگەی خۆویستی و ئەنانیەتمان بەجێ نەهێلاوە، چونکە ئەوانەی کەژیانی خۆیان لەپێناو

---

[٣٥] بروانە :(( ئەرستۆ)) : Aristotle: The Nicomachean Ethics, trans. David Ross( London : Oxford University press. 1954).

[٣٦] بروانە :( شلیهر ماخر) : Friedrich Schleihermacher : on Religion: Speeches to its Cultured Despisers, trans..( New York: Ungar. 1955).

[٣٧] بروانە :( فردریك یودل) : Friedrich Jodle : Leben und Philosophie David Hume( Halle: C. E. M. Pfeffer. 1972).

کەسانی تردا بەخشیوە. ئەوا گەورەتر و جوانتریان بۆ خۆیان هەڵبژاردوە)). کاتێك ئەرستۆ ئەم قسانەی کردوە بەوە چەمکی ئەنانیەت و خۆویستی لەپشت واتا ڕاستەقینەکانی خۆیانەوە لەئاگایی هەموو مرۆڤێکدا گەورە کردوە. ئەگەر هاتوو مرۆڤێك هەڵی کوتایە سەر خانویەکی گرگرتوو بۆ ئەوەی منداڵی دراوسێکەی رزگاربکات، ئایا ئێمە دەتوانین بڵێین ئەم مرۆڤە لەڕووی خۆویستیەوە و لەپێناوی خۆیدا ئەمەی کرد ؟ لەوانەیە بتوانین ئەمە بڵێین، بەڵام بەیەك مانا مەبەستم ئەوەیە کەئەگەر هات و بەجێهێنانی ئەرك بریتی بێت لەخۆشەویستیەك بۆ خێروچاکە، ئەوە بریتیە لەبەرژەوەندی باڵا هەروەها بریتیە لەبەرژەوەندی ئەو کەسە (پاڵەوان)ە ی کەقوربانی بەخۆی داوە. لەم حاڵەتەدا دەگونجێت پێکدادان لەنێوان قوربانیدان و بەرژەوەندیدا نەمێنێت، چونکە ئەو کاتە بەرژەوەندی بەپێی واتا باوەکەی لێك نادرێتەوە، بەڵکو بەرژەوەندی بەپێی واتا ڕەهاکەی دەبێت، واتە بەرژەوەندی ئەخلاقی

جیاکردنەوە لەنێوان بەرژەوەندی باووبەرژەوەندی ئەخلاقیدا ((ئەگەر ئەم دەربڕینە ڕاست و قەبوڵ بێت)) ئەوا جیاکردنەوەی نێوان دوو جیهانیش پێویست و فەرزدەکات: جیهانی فانی و لەناوچوو و جیهانی هەتاهەتایی و هەمیشەیی. لەکاتێکدا کەتەنها ئەو جیهانە باڵایەی تر هەبێت ، دەتوانین لەبارەی قوربانی دانەوە بدوێین وەکو کردارێك کەمرۆڤێك پێی هەستاوە لەپێناوی بەرژەوەندی خۆیدا بەبێ ئەم واتایە، ئەوا سنورێك هەیە ناکرێت تێپەڕێنرێت، کەئەویش بریتیە لەژیان.

ئێمە بەو شێوەیە پێناسەی ئەخلاقی ڕەسەن دەکەین بەوەی کەڕەفتارێکە دەبێت دژی بەرژەوەندی شەخصیو تاکەکەسی بێت. لەگەڵ ئەوەیشدا، دیاردەیەکی تر هەیە وادەردەکەوێت هاوشێوەی ئەمەبێت سەرەڕای ئەوەیش لەجەوهەریدا تەواو جیاوازە لەمە، ئەویش بریتیە لەوەی کەناودەبرێت بە ( ڕەفتاری کۆمەڵایەتی).

لەژیانی کۆمەڵایەتیماندا مرۆڤ بەپێی بەرژەوەندییە کۆمەڵایەتیەکەی هەڵسوکەوت ناکات، ڕەفتاری کۆمەڵایەتی مرۆڤ بەرەو بەدیهاتنی پێداویستیە (شەخسی) و

تایبەتیەکانی ئامانج وەردەگرێت. بەڵکو لەبازنەیەکی کۆمەڵایەتی فراوانتردا وای لێدێت کۆمەڵگە دەبێتە تەعبیرکەرێك لەهەموو پێداویستیە شەخسیەکان کەدەکرێت بەکاروکردەوەیەکی باشترو گەورەتر بهێنرێتە دی. ئەم هەڵوێستە نوێیە (ئەرك) ی جیاوازو جۆراوجۆر بۆ ئەندامەکانی کۆمەڵگا دەخوڵقێنێت و بیرمان دەخاتەوە (بەحوکمی هاوشێوەبونی ووشە کە) بەداواکاریە ئەخلاقیەکان یاخود (ئەرکەکان). لێرەدا، ئەو چالاکیانەی لەپێناو بەدیهاتنی بەرژەوەندی تاکەکەسی و شەخسیەکاندا تێدەکۆشێت لەشێوەی ئەرك و پابەندبوونە کۆمەڵایەتیەکاندا دەردەکەوێت. ئەم ئەرکە کۆمەڵایەتیانە هاوتاو یەکسان نابێت لەگەڵ بەرژەوەندی تایبەتی و(شەخسی) مرۆڤدا ( لەو ناوەندە کۆمەڵایەتیەدا هەمیشە قوربانی و بەخشینەکانی فەرد زیاترن لەوەی کەدەکرێت وەریبگیرێت و قەبوڵی بکات)، رەنگە هەمان ناوەند بەحوکمی ئەو پابەندبوونەوە کەبۆ فەردی دەرەخسێنێت ببێتە هۆی بێزاری و نارەزایی ئەوکەسە کەئەندامە لەو کۆمەڵگایەدا و دژبە بەخواست و ئارەزووە هەنوکەییەکانی بوەستێتەوە، لێرەدا ئەو وەهمە دەردەکەوێت کەدەڵێت بۆ نمونە فلانە فەرد بەشێوەیەك هەڵسوکەوتی کرد نەك بەپێی بەرژەوەندیەکانی، بەڵکو لەپێناو بنەما باڵاکەدا. بەڵام واقیع، ئاوەهایە، کۆمەڵگە شێوەیەکی دیاریکراوە بۆ بەدی هێنانی بەرژەوەندیە کەسیەکان. کەش و بارودۆخە گشتیەکە نەگۆڕاوە بەڵکو تەنها شێوەکەیە گۆڕاوە بۆ گەیشتن بەهەمان مەبەست. ئەوەی پێی دەوترێت بەرژەوەندی هاوبەش بریتیە لەبەرژەوەندی شەخصی کە یەکسانە لەئەنانیەت و خۆویستیدا نەك لەئەخلاقیاتیدا (واتە زیاتر پاڵنەری خۆویستیە لەپشتیەوە نەك پاڵنەرە ئەخلاقیە حەقیقیەکان.( وە. ك)).

کاری بەکۆمەڵی لەپیشەسازی زیرەکیە نەك هەڵقوڵاوبێت لەدڵ و رۆحەوە. کەدەبێتە هۆی بەدیهێنانی گەورەترین بەرژەوەندی تایبەتی بۆ گەورەترین ژمارە لەخەڵك لەکۆمەڵگادا، ئەمەیش ئەوەیە کەپێی دەڵێن ((المبدأ الأعظم)) واتە: بنەمای

هەرەگەورەو باڵا.[38] لەپشتی ئەمەوە پاداشت ئامادەکراوە ئامادەکردنێکی باش لەگەڵ بوارپێدان بەپەراوێزێك بۆ ئەو هەڵانەی کە ئەگەری ڕوودانیان هەیە، یاخود خراپی بەکارهێنان لەلایەن ئەو کەسانەوە کەکاری کۆمەڵی دیاری دەکەن.

ئەوەی کەزیرەکی بەڕێگەیەکی ناتەواو ناکامڵ لەژیانی مرۆڤدا فەراهەمی دەکات ئەوا غەریزە بەشێوە تەواو کامڵەکەی لەمەملەکەتی ئاژەڵیدا فەراهەمی دەکات. نمونەیش لەسەر ئەمە لەڕەفتاری کۆمەڵایەتی مێرولەو هەنگ و گیانلەبەرە وشکانیەکانی تردا دەردەکەوێت کەلەناو بڕەکانیاندا دەژین. ئەو نمونانەیش کەگیانلەبەران پێشکەشمانی دەکەن لەڕفتاری کۆمەڵایەتیاندا ، ئەوەمان بۆ دەسەلمێنن کەئێمە بەهیچ شێوەیەك ڕووبەڕوی دیاردەیەکی ئەخلاقی نابینەوە، جیاوازیەکەیش دیارو ئاشکرایە: ئەو پاڵنەرەی هەیە لەپشت ڕەفتاری کۆمەڵایەتیەوە بریتیە لەبەرژەوەندی، بەپێچەوانەی ڕەفتاری ئەخلاقیەوە، کەلەسەر بەرژەوەندی بینا نابێت. ڕەفتار بەناوی ئەنانیەت و خۆپەرستیەوە شتێکەو، ڕەفتار بەناوی ئەرکەوە شتێکی ترە، یەکەمیان پشت بەبەرژەوەندی و پێویستی و سستم و عەقڵ دەبەستێت، بەڵام دووەمیان، تەنها کاتێك مومکین دەبێت کەبەناوی خواوە بکرێت. خاڵێکی تریش هەیە کەدەبێتە یارمەتی دەر بۆ جیاکردنەوە لەم بوارەدا.

ڕەفتاری ئەخلاقی هەمیشە لەسەر کەماڵی ڕۆحی دەوەستێت، ڕێك وگونجاوە لەگەڵ چاکەی نمونەیی و ڕاستگۆیی و دادپەروەریدا.[39] لەلایەکی تریشەوە، ڕەفتاری کۆمەڵی لەسەر ڕێکخستن دەوەستێت ڕەنگە هەندێ جاریش تاوانکاریانە بێت، بەڵام لەزۆربەی حاڵەتدا نائەخلاقیەیان دژی ئەخلاقە. بەرژەوەندی هاوبەش ناکرێت بکرێتە یان ببێتە

---

[38] دانەری ئەم هاوکێشەبەناوبانگە(( جیرمی بنتام)) ەکەیاساییەکی ئینگلیزی و فەیلەسوف و مادی و خاوەن تیۆری سودە لەزانستی ئەخلاق ناسیدا. هەروەها بڕوانە : پەراوێزی ٣١لەم بەشەدا.

[39] کردەوەی ئەخلاقی هەق و ڕاستەقینە ئەوکردەوەیە بەرەو کەماڵی مرۆڤی تێدەکۆشێت و ئامانج وەردەگرێت بڕوانە ((لیبنتز)): Gattfried W. von Leibniz: New Essays Concerning Human Understanding ed. Karl Gerhardt , vol ,.5...( La Salle , IL: open Court Publishing Co., 1949)

بەرژەوەندی هەموو بەشەر یان هەموو مرۆڤەکان بگرێتەوە، بەڵکو هەمیشە دەچێتە چوارچێوەی بەرژەوەندی کۆمەڵێك کەسی دیاریکراو و داخراوەوە کەڕەنگە کۆمەڵێکی سیاسی یان نیشتیمانی، یاخود چینێکبن لەخەڵك.

((تولستوی)) لەبارەی (بەخواکردنی دەوڵەت) یان بەخواکردنی (بەرژەوەندی گشتی)یەوە دواوە.[40] بەرژەوەندی هاوبەش بۆ کۆمەڵێك لەخەڵك یان بۆ نیشتیمانێك لەسەر حسابی مافی کۆمەڵ و گەلێکی تر تەواو دەبێت، بەو مانایەی پێویست دەکات خەڵکانێکی ترو گەلانێکی تر دەستبەسەر بکرێن، بەڵکو هەتا دەگاتە ڕادەی لەناوبردنی ئەندامانی ئەو کۆمەڵگایانەی کەدەست درێژیان دەکرێتە سەر لەلایەن گەلە سەردەستەکانەوە. مێژووی نوێی گەلان –بەتایبەتی مێژووی ئیمپریالیزم و داگیرکاران – پڕیەتی لەنمونەو کرداری لەوشێوەیەی کەبەناوی (بەرژەوەندی هاوبەشەوە) ئەنجام دراون کەدەتوانین بەنمونەی شێوازێکی تاوانکاری ئاشکراو ڕوون وەریبگرین، لەمێژووی هاوچەرخدا، نمونەی دیارو ئاشکرا دەبینین لەسەرئەوەی کەلۆژیکی بەرژەوەندی هاوبەش دەگونجێت ببێتە هۆی شەڕوو پێکدادانی گەورەو هەمەلایەن، لەدوایدا وەکو فێڵێك ئاشکرابێت و بەرئەنجامی تراژیدی و ناخۆشی لێبکەوێتەوە.

((مانفستوی کۆمۆنیست)) ڕایگەیاند کەوا چینی کرێکار وازی لەئەخلاق هێناوە بەوپێیەی کەفێڵ و هەڵخەڵەتاندنێکی بورجوازیانەیە، پاشان لەکۆنگرەی دووەمی نێو دەوڵەتی‌دا پێداچونەوەی کرد لەم خاڵەدا بۆ ئەوەی جەخت لەسەر بنەمای دادپەروەری بکاتەوە، (بنەمای ئامانج پاساوی ئامراز دەکات) ڕەت بکاتەوە)، لەگەڵ ئەمەیشدا جارێکی تر((لینین)) گەڕایەوە بۆ هەڵوێستی ((مانفستوی کۆمۆنیست) بەجەختکردنەوەی لەسەر ئەوە کەتەنها ئەخلاقە یارمەتی چینی (پرۆلیتاریا) دەدات

[40] بڕوانە :( لیوتولستوی) : Leo- Tolstoy: The Christian Teaching ...( New York AMS Press, 1968)

بۆ سەرکەوتن.[٤١] ئەمەیش لەو ڕێگەیەوە کەخودی ئامانجی شیوعیەتی کردە پێوەرێکی ئەخلاقی.

بەجێبەجێکردنی ئەم بنەمایە، (ستالین) گەیشتە دەرئەنجامەکەی بەوەی کەلەبەرژەوەندی سەرکەوتنی چینی (پرۆلیتاریا) یە - لەپاشاندا ڕەواو ئەخلاقیشە - بەهێزکردنی دەزگاکانی حکومەت و پۆلیس بەشێوەیەك کەلەوەپێش شتی وانەبیسترا بێت، و ڕێگرتن لەهەر ڕەخنەیەك کە ڕووبەڕوی حکومەت و پیاوانی دەسەڵات بکرێتەوە. پارێزگاری لەبیرۆکەی مەعصومیەتی حکومەت و پیاوەکانی لەهەڵە بکرێت، هەروەها حاڵەتێکی دەروونی وا لەلای خەڵکی دروست بکرێت کەبەچاوی پەرستشەوە بڕواننە سەرکردەو مەعصومی بکەن لەهەموو هەڵەیەك و تێکڕای تواناو هێزو دەسەلاّتەکان بگەڕێننەوە بۆ ئەو، بەهەمیشەیی کەشێکی پڕ لەترس بسازێنرێت بۆ ئەوەی ڕێگە بگرێت لەهەر هەوڵێکی بەرەنگاری و ڕووبەڕوونەوەی جەماوەر، هەر لەنێوان ماوەیەك و ماوەیەکی تردا کرداری پاکسازی کۆمەڵی ڕێکبخرێت بۆ ئەو کەس و کۆمەلاّنەی کەحەزیان پێ‌ناکرێت، یان پاکسازی گەلێك بەتەواوی بکرێت، هەروەها لەڕێگەی بەخشینی پلەی بەرزو ئیمتیازاتەوە پیاوانی سوپاو پولیس و دەزگا سیاسیەکان و ئەو کەسە گوێڕایەلاّنەی لەچینی ڕۆشنبیراندا هەن گەندەڵ بکرێن و وەکو ئامرازێکی چاوسورکەر بۆ جەماوەر بەکاربهێنرێن، وەزارات و ئیدارات و شوێنی تایبەتی بسازێنرێت بۆ دروستکردنی خۆشەویستی و هاوحەزی و هاوەڵیەتی چینێکی جیاواز بۆ ئەوانەی لایەنگر و دڵسۆزی تەواوەتی دەوڵەتن. هەموو کەناڵەکانی هەواڵ وزانیاری گەیاندن قۆرخ بکرێن و وایان لێ‌بکرێت گۆرانی بەبالاّی دیموکراسیەت و ئازادی و مرۆڤایەتی و چاکەو بەرژەوەندی گشتی و داهاتووی گەش و پرشنگداردا بڵێن، دەربارەی فەزڵ و چاکەی سەرکردەو پیاوانی دەسەلاّت بڵێین و بەبالاّیاندا

---

[٤١] بڕوانە :(( لینین)) Vladimir I. Lenin: The Proletarian Revolution and Renegade Kautsky (. New Yourk : International Publishers . 1934)

هەڵبدەن، دەوڵەتی تری بێگانە داگیربکرێت و پاشان بوترێت کەئەو داگیرکردنە بەخواست و ئیرادەی ئەو گەلە خۆی بووە...

پێویستە لەسەر دەزگاکانی ڕاگەیاندن بەسەرەمرەو پێداگرتنەوە ئەمە دوبارەبکەنەوە لەپێناو سەرکەوتنی بەرژەوەندی چینی کرێکاریدا، مادام ئەمە کارێکی ڕەواو ئەخلاقیە.[٤٢]

لەکاتێکدا ئەخلاقی ئاینی بنەمای بەرەنگاری شەڕ ڕادەگەیەنێت کەبنەمایەکە دەتوانرێت تێبینی بکرێت بەشێوەیەکی ڕوون و دیار یان بەناڕاستەوخۆیی لەهەموو ئەو ئەخلاقیاتانەدا کەلەسەر بناغەی ئایین دروستبوون، بەڵام ئەخلاقی سوود واتە ئەو ئەخلاقەی کەلەسەر بنەمای سوود دروست دەبێت و ئەو دەبێتە پاڵنەرو جولاندنی، ئەم جۆرە ئەخلاقە بناغەی بنەمایەکی دژ دادەڕێژێ کەبریتیە لە ئاڵوویری. سوودوویستەکان ئەوانەی پەیڕەوی بنەمای سوود دەکەن لەئەخلاق و هەڵسوکەتیاندا، بەشێوەیەك کەبواری گومانی نەمێنێت جەخت لەسەر ئەوە دەکەنەوە کەهەرکەسێك پەیڕەوی پێوەرە ئەخلاقیەکان بکات لەکاتێکدا کەهیچ کەسێك پەیڕەویان ناکات، ئەوا ئەو کەسە بەشێوەیەك ڕەفتار دەکات کەدژی عەقڵە. ئەمەیش دەرەنجامێکی نەگۆڕە لەتێڕوانینی سودگەراییدا . سەرەڕایی ئەمەیش ئەو حەقیقەتە بەشێوەیەکی ڕوون و ئاشکرا ئەوەمان بۆ دەردەخات کەئەخلاقی سوود گەراییانە ئەخلاقێکە لەپێناوی

---

[٤٢] لەنامیلکەیەکدا کەئاڕاستەی هاولاتی سۆڤیەتی کراوە، بڕیاردەدا کەوا ئەرکی بالای هەمووکەسێك ئەوەیە دڵسۆزبێت بۆچینی کرێکار، ئەم ئەرکە بالایە وەکو دەبینی ئەرکێکی سیاسیە نەك بڕیارێکی ئەخلاقی. وەکاتێك دەسەلات ڕایدەگەیەنێت کەئەو نوێنەرایەتی بەرژەوەندیەکانی چینی کرێکار دەکات، ئەوا هەنگاوی دوایی ئەوەیە داوابکات کەوا دڵسۆزی بۆئەو بریتیە لەئەرکی بالای هەموو هاولاتیەك. ستالین بەوشێوەیە دەستیکرد بەخراپ بەکارهێنانی دەستەلاتەکەی تائەو ڕادەیەی کەدرێژترین مێژووی تۆمار کرد لەماوەی حوکمڕانی شیوعیەت لەیەکێتی سۆڤیەتدا.
هەروەها لێرەدا نمونەیەکی تازەترمەیە لەکتێبێکی قوتابخانەدا کەدەربارەی ئەخلاقی مارکسیانەیە و بۆ قوتابخانە دواناوەندیەکان ئامادەکراوە لەمەجەر لەساڵی ١٩٧٨تێیدا دەڵێت : منال( کوڕیاخود کچ) بەهیچ شێوەیەك ڕاست نیە و نابێت هەولبدات یاخود بیەوێت دایکی بکوژێت مەگەر کاتێك نەبێت کەئەو دایکە(( ناپاك بێت بەچینی کرێکار)) ئەم کتێبە بوو بەهۆیوروژاندنی هێرشێکی توند و وای لەحکومەت کرد بەناچاری لەقوتابخانەکاندا ڕایبکێشێتەوە.

سووددا پەیڕەو دەكرێت. ئەخلاقێكی راستەقینە نییە، بەڵكو زیاتر ئینتیمای بۆ سیاسەت هەیە، وەك لەوەی كە ئینتیمای بۆ زانستی ئەخلاقی هەبێت.

ئەگەر مەسەلەی ئاڵوویڕ بكەیتە بنەمای رەفتاری ئەخلاقی ئەمە مانای ئەوە دەگەیەنێت تۆ وات لەئەخلاق كردووە كەوا ڕێژەیی بێت، تۆ دایدەبڕیت لەبنەما جەوهەریەكەی خۆی كەلێیەوە ئەو هێزە پابەندكراوەی وەرگرتووە كەئامانجدانی هەركردەوەیەك لەسەر بنەمایەكی ئەخلاقی رەسەن بێت. مرۆڤ وەكو ئەركێكی سەرشانی ڕاییپەڕێنێت نەك لەسەر بنەمای سودو ئاڵوێر ئەنجامی بدات هەروەها لەئەدەبیاتی ئینگلیزیدا ئەخلاقی سوود ناوبراوە بە (( ئەخلاقی دەرەنجامەكان)) بەواتای ئەوەی شتێك دەبێتە ئەخلاقی یان نائەخلاقی بەپێی ئەو ئەنجامە چاكانەیان خراپانەی كەلێی دەكەوێتەوە. بەڵام وەكو لەپێشەوە بینیمان، ئەخلاق و ئەخلاقی رەسەن بەهیچ شێوەیەك گوێ نادات بەو دەرئەنجامانەی كەلەواقیعدا دەكەونەوە هەتا رادەی نكوڵی كردن لەكردارەكانیش بەوپێیەی كە ئەوا نەتەنها تەعبیری دەرەكین بۆ ڕەفتاری مرۆڤی. بەڵكو ئەخلاقی ڕەسەن ئەو ئەخلاقەیە كەگرنگی خۆی لەسەر نیەت دەوەستێنێ ((انما الأعمال بالنیات)) واتە: ((دیاریكردنی كردەوەكانمان لەسەر چۆنیەتی نیەتەكانمان وەستاوە. ( وە. ك))) ئەگەر بتەوێت كارێك بكەیت و بەكردەوە ئەنجامی بدەیت .. ئەوە شتێكی مرۆییە، بەهەردوو ئیرادەو كار بواری ئەخلاق كۆتایی پێدێت، ئیتر دەرەنجام و بەدواهاتەكان ئەوانە كاروبارێكن لەدەستی خوای گەورەدان.

# ئەخلاق بەبێ خوا

ئەزموونی کرداری لەجیهانی ئەخلاقیدا نموونەی زۆری پێشکەش کردووین لەسەر ئەخلاقیەتی خەڵکانێك کەگرنگی بەتەعالیمی ئاینی نادەن یاخود بڕوایان بەخوا نی‌یە، لەم حاڵەتەدا هیچ ئاکارو هەڵوێستێك بەشێوەیەکی هەمیشەیی چەسپاوو جێگیرنی‌یە، بەڵکو ناسازی و لێکترازانێك هەیە لەنێوان بیروباوەڕی ناوی ڕاگەیەنراو لەگەڵ ڕەفتاری خاوەنەکەیدا. بۆ نمونە، خەڵکانێك هەن زۆربەتوندی دەستیان بەئاینەوە گرتووە بەڵکو لەوانەیە لەبانگخوازانیش بن لەبانگەوازی ئایینیدا، لەگەڵ ئەوەیشدا نابینیت ڕەفتاریان لەشتێکدا جیاوازی هەبێت لەگەڵ ڕەفتاری مادییە بێ بەزەییەکاندا، هەروەها پێچەوانەی ئەمەیش هەر ڕاستە :خەڵکانێکی زۆر هەن کەسەر بەفیکری ماددی و بیرکردنەوەیەکی ماددیانەیان هەیە، لەگەڵ ئەوەیشدا دڵسۆزیەکی زۆریان تێدایەو ئامادەییان هەیە بۆ هەڵگرتن و چەشتنی ناڕەحەتی و موعانات و خەباتکردن لەپێناوی خەڵکیدا. ئا لەم تێکەڵی و نەهاتنەوەی مانا لەگەڵ کردارەکانداو ناجێگیربونەدا کۆمیدیای مرۆڤایەتی پێدەگات و گەشەدەکات و عەقڵی بیرمەندە جدییەکان سەرسام دەکات، بەڵکو هەتا ئەوانەیشیان کەزۆر ڕۆشنبیرن. کەوابوو لەمەوە بۆمان دەردەکەوێت کەپەیوەندیەکی (( ئۆتۆماتیکی)) خودکاری نیە لەنێوان بیروباوەڕو ڕەفتارماندا. ڕەفتامان وەکو زەرورەتێك لەدەرەنجامی هەڵبژاردنی ئاگایمانەوە فۆرمەلە نابێت، بەڵکو زۆر جار دەرەنجامی ئەو پێگەیشتن و هەڵوێستانەیە کەدرووست بوون لەقۆناغی منداڵیدا، زیاتر لەوەی کەدەرئجامی ئەو بیروباوەڕە فەلسەفی و سیاسیە ئاگاییانە بێت کەلە قۆناغێکی دواتردا لەقۆناغەکانی ژیاندا پێ‌دەگەن. ئەگەر کەسێك فێری ئەوەبوو کەڕێز لەکەسانی بەتەمەن بگرێت. پارێزگاری لەقسەی خۆی بکات، بەپێی سیفەتەکانیان حوکم بەسەر خەڵکیدا بدات. خەڵکی خۆش بوێت و یارمەتیان بدات، ڕاست گۆبێت و ڕاستیەکان چەواشە نەکات و ڕقی لە دووڕویی بێت و حەزی

پێنەکات، کەسێکی سادەو بێباك بێت، ئەگەر لەسەر هەموو ئەم ئەخلاقە جوان و باشانە پێگەیشت ئەوا ئەمانە دەبن بەخەسڵەت و سیفەتی ئەو کەسە لەداهاتوودا، بەچاوپۆشین لەو بیرۆکە سیاسیانەی یان ئەو فەلسەفە تیۆریانەی کەلەدوایدا هەڵیدەگرێت و قەناعەتی پێدەکات، ئەم ئەخلاقیاتانە (ئەگەر بەچاوێکی شیکارییەوە بۆمان ڕوانی) دەبینین کەقەرزاری ئاینەو لەوەوە وەرگیراوە و. گوێزراوەتەوە. فێرکردن دیدو ڕوانین و فەزڵ و چاکە ئاینییە ڕەسەنە دیاریکراوەکان لەو شتانەدا کەپەیوەستە بەپەیوەندی لەنێوان مرۆڤ و مرۆڤەدا گوێزراوەتەوە، بەڵام لەگەڵیدا خودی ئاینەکەی نەگوێزاوەتەوە کەسەرچاوەی هەموو ئەم ئەخلاقیاتانەیە. لەم حاڵەتەدا یەك هەنگاو هەیە لەنێوان وازهێنان لەم ئاینەو لەنێوان وازهێنان لەئەخلاقیەتەکاندا. هەندێك کەس هەنگاونانێ بەهیچ یەکێك لەم دوو ئاڕاستەیەدا، بەڵکو هەروا دەمێننەوە (دابەشبوون) لەنێوان ئاینێك کەشوێنی ناکەون و پەیڕەوی ناکەن و ئەخلاقیاتی ئەو ئاینیەدا کە بەردەوامن لەپەیڕەویکردنیدا، سەرەڕای ئەوەی کەبڕوایشیان نی‌یە بەو بنەڕەتەی ئەم ئەخلاقەی لەسەر وەستاوە. ئەم هەڵوێستە بوار ئەدات بۆ دەرکەوتنی دوو دیاردە کەلێکۆڵینەوەکە دژوار دەکەن: بێباوەڕ(ملحد)ە بەئەخلاقەکان ، بڕوادارەکان ئەوانەی کەئەخلاقیان نی‌یە.

لەپاشاندا، ئەو پرسیارە دەمێنێتەوە کەئایا( ئەخلاق بەبێ خوا مومکین دەبێت؟) ئەم پرسیارە دەخرێتە بەردەم وتووێژی تیۆرییەوە، ئەمەیش چونکە ناکرێت تاقیکردنەوەیەکی کرداری لەم بوارەدا بکرێت، و بگەڕێینەوە بۆ ڕووداوە مێژوویی دیاریکراوەکان کەپشتگیری لەڕایەك بکەن و لەیەکێکی تری نەکەن.

ئێمە حاڵەتێك بەدی ناکەین لەماوەی مێژووی مرۆڤایەتیدا دەربارەی کۆمەڵگەیەکی نائاینی ڕووت هەبێت، نازانین دەوڵەتێك هەبێت کەنەوە لەدوای نەوە پۆڵەکانی خۆی لەسەر ڕەتکردنەوەی ئاین و دوورکەوتنەوە لەئاین پەروەردە کردبێت تاوەکو وەڵامێکی دڵنیاکەرمان پێبدات لەسەر ئەو پرسیارە کەئایا ئەخلاق بەبێ ئاین هەبووە ودەبێت یاخود بوونی ڕۆشنبیریەکی ئیلحادی و کۆمەڵگەیەکی ئیلحادی مومکینە ببێت.

ئەم کۆمەڵگایانە -بەچاوپۆشین لەو دیوارانەی بەدەوری خۆیدا کێشاویەتی وخۆی خستۆتە ناویانەوە - ناکرێت لەدەرەوەی شوێن و کاتدا بمێنێتەوە، رابردوو لێرەدا ئامادەیی هەیە و بەرێگەی جۆراوجۆر بلاودەبێتەوە، جیهان هەمووی لێرەدا ئامادەیی و بوونی هەیە و کار لە ئێستا دەکات، بەمەبەستەوە بێت یاخود بەبێ مەبەست بێت.

من دەوێرم کەزۆر جەخت لەسەر ئەوە بکەم کەرەفتارەکان و یاساکان و پەیوەندییە مرۆییەکان و سیستمی کۆمەلایەتی هەر کۆمەڵگایەك کەهەموو ئەندامەکانی لەسەر کاڵفامی و نەزانیەکی تەواو پێگەیشتبن و لەتێروانینی خۆیانەوە بروانن دونیاو بریار لەسەرشتەکان بدەن، هەموو ئەمانە جیاوازدەبن جیاوازیەکی ریشەیی لەگەڵ هەرشتێکدا کەناسیومانە یاخود رێمان لێکەوتووە لەئەمرۆدا، ئیتر چ لەکۆمەڵگە دیندارەکاندا بێت یاخود لەوکۆمەڵگایانەدا کەلەژێر زاڵگەو کاریگەری بیروباوەرە ئیلحادیەکاندا دەژین[٤٣].

بەڵکو رەنگە زۆرێك لەخەڵکی لەوانەی کەپابەندیش نین بەتەعالیمی ئاینییەوە تووشی شۆکێك ببن ئەگەر روبەرِوی ئەفکارو بیروبۆچون یان یاساکانی کۆمەڵگایەکی تەواو مولحدو بێ باوەر ببنەوە، یاخود لەناکاودا رووبەرووی وێنەی جیهانێك ببنەوە کەتەواو بێباوەر و ( مولحد) بێت[٤٤].

---

[٤٣] هەتا ئەمە بەسەر زمانیشدا جێ بەجێ دەبێت، بۆ نموونە بەدابەزین و کورتکردنەوەی پەیوەندیە مرۆییەکان بۆ تەنها پەیوەندی وەزیفی، دەکرێت زمان کورت بکرێتەوە بۆ ٠٫١/٠ ی فەرهەنگی ئێستای. دەکرێت تێبینی ئەم هەژاربوونە زمانیە بکرێت لەوەدا کەناو دەربرێت بەزمانی تایبەتکراو یا (وەزیفی) وەکو چۆن لەزمانی زانستەکانی تەکنیکی و زانستە کۆمەلایەتیەکاندا هەیە. بەو شێوەیە، هەژاری زمان دەگەرێتەوە بۆ زیاتر( تەرکین) و گرنگیدان بەشار و وونبوونی لادێ کەسەرچاوەی هەمیشەییە بۆ ئۆرگانیەتی زمان و کلتورەکەی.

[٤٤] بێگومان رونیا و تێروانینی عەبەسیانەی( جۆرج اورویل) دەگەرێتەوە بۆ سیماو رووکارەکانی ئەم کۆمەلگایە. بروانە: ((جورج اورویل)) : George Orwell , Nineteen Eighty four, ed. Irving Howe( New York Harcourt, Brace and World , 1963).

کەسانێك هەن (ملحد) و بێباوەڕن بەرامبەر بەئەخلاق، بەڵام ئیلحادی ئەخلاقی (واتە بوونی ئەخلاقیات لەدەرەوەی ئایین) بوونی نییە. هۆکەیشی ئەوەیە کەئەخلاقیاتی نائاینی لەسەرچاوەکەیدا دەگەڕێتەوە بۆ ئایین. ئاینێك دەرکەوتوە لەڕابردودا پاشان وون بووە لەجیهانی لەبیرچونەوەدا، بەڵام هەرجێگە پەنجەکانی بەجێهێشتوە وکاریگەرن لەسەر ئەو شتانە کە لەدەوروبەرەکەیدا بوون، لەڕێگەی خێزان و ئەدەب و فلیمەکان و نەخشی بیناسازیەوە کاریگەر دەبێت و بڵاو دەبێتەوە... هتد.

ڕاستە ڕۆژەکە ئاوابووە بەڵام ئەو گەرماییەی کەلەناوجەرگەی شەودا بڵاودەبێتەوە سەرچاوەکەی تیشکی ڕۆژی ڕابردووە. ئێمە لەناو ژورێکدا پاش ئەوەی ئاگری ناو ژورەکەیش دەکوژێنرێتەوە هەر هەست بەگەرمایی دەکەین. ئەخلاق ئاینێکە تێپەریووە، هەروەکو چۆن خەڵوز لەناوجەرگەی زەویدا بەروبومی چاخەکانی ڕابردووە. هیچ ڕێگایەکیش نییە بۆ ئەوەی فێرکردنێکی تەواو ئیلحادی بۆ نەوەکان بونیادبنرێت تەنها بە خولقاندنی چەند مەرجێکی دەروونی سازێنراو نەبێت، ئەمەیش لەڕێگای تێکدانی تەواوو لەناوبردنی هەموو پاشماوە کلتورییە ڕۆحیەکانەوە کەبەدرێژایی هەموو چاخەکان کۆبونەتەوەو بۆمان ماونەتەوە. ڕەگەزی بەشەری بەدرێژای هەزارانساڵ لەژێر کاریگەری ئاینەکاندا ژیاوە. ئاین توانیویەتی هەموو لایەنەکانی ژیانی ئەخلاقیو یاسایی و بیروباوەڕی و هەتا زمانیش دابین بکات. لەپاشان، مافی خۆمانە پرسیار بکەین، ئایا دەکرێت ئەمڕۆ نەوەیەکی (ملحد) (بەرهەم بهێنین) کەتەواو بێباوەڕبێت لەهەموو لایەنێکەوە ؟ بۆ ئەوەی هەوڵێکی لەم جۆرە سەرکەوتوو بێت، ئەوا پێویستە ئەو نەوەیە لەکەشێکدا پێبگات کەتەواو دابڕاوبێت و بەدووربێت لەئینجیل و لەقورئان و لەهەموو کتێبە ئاینیەکانی تر، نابێت ڕێبدرێت بەهیچ کەسێك لەوانەی کەدەکەونە ژێر ئەم ئەزمونەوە بەبینینی تەنها یەك کاری هونەری، نابێت گوێ لەیەك سیمفۆنیایان پارچە مۆسیقایەك بگرن، هەروەها نابێت تەماشای یەك شانۆگەری بکەن هەر لەسەردەمی( سوفوکلس) Sophceles تاسەردەمی((بکیبت)) (Beckeft ) دەبێت، هەموو ئەو شتانەی مرۆڤ بونیادی ناوە لەئەنتیکەی بیناسازی بەناوبانگ و،

هەموو ئەو کتێبە ئەدەبیانەی نوسەران دایان ناوە لاببرێت لەبەرچاویانداو لێیان بشارێتەوە.

بەواتایەکی تر، دەبێت لەکەشێکی وادا پێ بگەن و گەشەبکەن تەواو بێ ئاگاو دابڕاوبن لەهەموو ئەو شتانەی ناوی دەبەین بە بەرهەمی تاعبیرکردن لەرۆشنبیری مرۆڤایەتی. ئەمەیش لەبەرئەوەی چونکە مەیلی فیتری مرۆڤ ڕووەو ئاین ڕەنگە ببێتە هۆی ئامادەکردن و دروستکردنی روئیایەك سەبارەت بەجیهانێکی تر کەجیاوازە لەو جیهانە (مولحد) و بێباوەڕەی کەهەوڵ بۆ دروستکردنی دەدرێت، ڕەنگە ئەو ڕوئیایەشی بۆ دروست ببێت تەنها بەهۆی خوێندنەوە یابینینی لێدوانێکی (هاملت) لەبارەی مردنەوە، یاخود بە ڕوانین بۆ تابلۆیەکی ((مایکلَ ئەنجیلۆ))یان بە زانینی بنەما یاساییەکان لەبواری تاواندا .. بەلام، ئەمە بەو شێوەیە نییە لەگەڵ زانستدا. هیچ مەترسیەك نییە لەسەر پاشەڕۆژی( ملحد)کان لەناسینی هەموو زانستەکانی ماتماتیك و یان زانستە تەکنیکیەکان یان لێکۆڵینەوەی شتێك لەزانستی کۆمەڵناسی سادەکراوەدا یان لەئابووری سیاسیدا. شۆڕشی رۆشنبیری چینی لەشەستەکاندا زۆر دوور نییە لێمانەوە، دەتوانین بڕیاربدەین بەسەر ئامانجە ڕاستەقینەکانی و دەرئەنجامەکانیدا. ئەوەی کەگومانی تێدا نییە، یەکێك لەئامانجەکانی ئەو شۆڕشە بریتی بوو لە لەناوبردنی کەلەپورو کلتوری ڕۆحی چین، کەوایان دەبینیەوە ئەو کلتورە تەواو ناساز و دژە لەگەڵ فەلسەفەی ڕەسمی((ماوتسی نونگ)) وئایدۆلۆژیاکەیدا[45]. بەشێوەیەکی هێواش و بێ هیچ ئاستەنگێك جۆرێك لەئاین بەدەوری خۆیا پەرش دەکەنەوە لەکۆمەڵگەدا.

بیرۆکەی شۆڕشی رۆشنبیری – لەجودابونیدا لەهەردوو شۆڕشی سیاسی و کۆمەلایەتی – توانراوە دیاری بکرێت بەشێوەیەکی ڕوون، ئەویش ئەوەیە کەلەتوانادا نییە سیستمێکی ئیلحادی بونیاد بنرێت کەگونجاو بێت لەگەڵ خۆیدا، لەکاتێکدا هەتا

---

[45] شۆڕشی رۆشنبیری چین لەنێوان چەندین شتی تردا کارەکانی( تولستوی) و( شکسپیر) و( بتهۆفن) یش یاساغ کرد، ئەمەیش شتێکی لۆژیکییە لەگۆشەنیگای ئەو شۆڕشەوە.

(مارکس) خۆیشی ڕزگاری نەبووە لەکاریگەریەکانی نەریتە ڕۆشنبیرییە چەسپاو و جێگیرەکان. بەلاَم بەتەواوەتیش نازانین کام سەرچاوە ڕۆحیانە یان فیکریانەیە کەئیلهامی لێوەرگرتون لەنوسینە سەرەتاییەکانیدا، بەلاَم ئەوەندە هەیە کاریگەری لێکۆلێنەوەی زانستە مرۆڤایەتیەکان و ئەدەب دیارە لەکارە سەرەتاییەکانیدا [٤٦] . بۆ نموونە لەتیۆرەکەیدا لەبارەی نامۆییەوە (الأغتراب) Alienation خەریکە لەتێکڕایدا وەکو تیۆرێکی ئەخلاقی مرۆییانە دەردەکەوێت، لەبەرئەوە تەواو نامۆیەو حالەتێکی چاوەڕوان نەکراوە لەفەیلەسوفێکی ماددیەوە. وەکو دەردەکەوێت کە(مارکس) خۆیشی – لەگەلْ تێپەڕینی سالەکاندا – وای لێهاتووە هەستی بەو گومڕاییەی کردوە لەڕۆژانی لاوێتیدا. ئاشکرایشە کەوا جیاوازیەکی ڕوون و دیار لەنێوان (مارکسی لاو) و (مارکسی پێگەیشتوودا) هەیە، ئەمەیش بەپێی ڕاوبۆچونی ئەو ڕەخنەگرانەی کەوا (مارکس) یان خوێندۆتەوە. ئەم پرۆسە ناوخۆییە بۆ پێگەیشتن، لەحەقیقەتیدا ئەوە دەردەکەوێت لەفڕێدان و لابردنی کلتورە میسالیەکەدا (لەبنەڕەتیدا ئاین و ئەخلاقیە) قەبولکردنی زیاتر بۆ تیۆرە مادییەکان کەگونجاوە لەگەلْ خۆیدا. ئەم نەوەیەی ئێستا کەبەناو نەوەیەکی نائاینیە، بەلکو هەتا مولحیدەکانی ئەم نەوەیەش لەسەر نەزانین و نەناسینی ئاین پێنەگەیشتوون، بەلکو زۆر جار لەسەر دوژمنایەتیکردنی پێگەیشتوون واتە هەر لەسەرتاوە وا فێرکراون دژایەتی ئاین بکەن. ئەوان، ئەگەر بنەماکانی حەزرەتی مەسیحیان لەخۆشەویستی و برایەتی و یەکسانی بەناوی خواوە وەرنەگرتووە، ئەوا لەبنچینەیشدا ڕەفزی ئەم بنەمایانەیان نەکردوە. بەلکو بەجۆرێکی وەهمی و غەریب پارێزگاریان لەم بنەمایانە کردوە بەناوی زانستەوە. لەبەر ئەم هۆیە، مافی ئەوەمان نیە و ناتوانین کەئەم نەوەیەو جیهانەکەی دابنێین بەبەلگەیەك لەسەر

---

[٤٦] مارکس خۆی ئەوەی ووتوە کە( ئەسخیلوس) و( گۆتە) و( شکسپیر) لەباشترین نوسەرەکانن بەلایەوە. وە( مارکس) سالاَنە یەکجار بەزمانە یۆنانیەکەی( ئەسخیلوس) ی دەخوێندەوە. وەزۆرجار شیعرەکانی( هومیروس) و( ئەفید) ی دەخوێندەوە. کاریگەری ( جان جاك رۆسۆ) دیارە لەکارە سەرەتاییەکانی ( مارکس) دا، بۆ نموونە فیکری( ڕۆسۆ) Jean Jacques Rousseau ، لەبارەی بنچینەی( نایەکسانی کۆمەلاَیەتی و بنچینەی مولکداریەوە) بڕوانە:( ڕۆسۆ)
On the origin of Inequality , On Political Economy. The Social Contract , trans. G D. H. Cole( Chicago: Eneyclopaedia Britanica, 1955) _

یمکانیەتی بوونی رۆشنبیریەکی ئیلحادیانە. لەواقیعدا، ئەم نەوەیەی ئێستاو ۆشنبیریەکەی بەشێوەیەك پێگەیشتوون کەکاریگەربوون بەئاین و بەبنەما ئەخلاقییە نەرِتیەکانی بەرێگەیەکی بیٚدەنگ، و هەست پیٚنەکراو، بەڵام جێگیر. دەکرێت پێناسەی ئەم هەڵوێستە بکەین بەنسبەت ئەم نەوەیەوە بەوەی کەئایدۆلۆژیەتێکی نوێی هەڵگرتووە، بەڵام پێوەرە تەعلیمی و ئەخلاقیەکان کۆنن. بونیادنەرەکان دێرینن تەنها نەخشەسازیەکەیە نوێکراوەتەوە. لەمومارەسەکردنی کرداری و زیندوودا هەموو سیستمێك وێکچوو گونجاوتر دەبێت لەگەڵ گەلدا زیاتر لەوەی لەگەڵ ئەفکارو ئیدوانەکانی خۆیدا هاوارێك و گونجاوبێت. کەواتە ئەگەر جەوهەری مرۆڤ لەئەخلاقیەتیەکانیدا بێت (نەك لەئایدۆلۆژیاکەیدا یان لەهەڵبژاردنە سیاسیەکەیدا)، ئەوا دەتوانین بڵێین ئەم جیهانەی ئێستا کۆمەڵە خەڵکانێك دروستیان کردوە پێشینەیین بەڵام بەبیرۆکەو بۆچونی نوێوە، ئەو کەسانە میسالیەت و قوربانی دانیان بەکارهێناوە وەکو ئامرازێکی کاریگەر بۆ جیٚبەجیٚکردن و بەدیهێنانی ئەو بیرۆکانەی کەلەهەمانکاتدا تەعبیر لەسەر نەبوونی چەمکی میسالیەت و قوربانی‌دان دەکەن ورەتی دەکەنەوە.

هەندیٚ کەس پێیان وایە کەبەکارهێنانی ((حوافز)) پاڵنەری مەعنەوی لەچین و یەکێتی سۆڤیەتدا – ئیسیغلالکردنی هەست و شعوری ئاینیی خەفەکراوی جەماوەرە لەلایەنی سیستمی دەسەڵاتەوە لەو دوو وڵاتەدا – باشە لەگۆشەنیگای ئیلحادەوە دوورخستنەوەی پاڵنەرە مادیەکان و بەکارهێنانی پاڵنەرە مەعنەویەکان چ مانایەك دەگەیەنێت ؟! ئەوە سروشتیە کەهەوڵ بدەیت بۆ بەدیهێنانی ئامانجە ئاینەکان رێگاو ئامراز و پاڵنەرە میسالیەکان بەکاربهێنیت و بیانگریتەبەر ، بۆ بەدیهێنانی ئامانجە مادیەکان پاڵنەری سوودو بەرژەوەندی بەکاربهێنیت، جگە لەمە بەکارهێنانی شێوازێکی تریان تێکەڵ کردوون و هەڵگێرانەوەی ئەو دوو شێوازە بەجۆرێکی تر کەلەپێشەوە ئاماژەمان بۆ کرد بریتی دەبێت لەناسازی ودژیەکیەکی روون و ئاشکرا.

ئەو پرسیارەی، ئایا ئەخلاق بەبێ ئاین بوونی هەیە، دەکرێت بەهەمان مانا تەرح بکرێت بۆ پرسیارێکی تر بەم شێوەیە ئەگەر مومکین بێت داوابکرێت لەمرۆڤێك بەناوی مرۆڤێکی ترەوە هەستێت بەو شتانەی کەئاین داوایان دەکات بەناوی خواوە بکرێن، (بەومانایەی کاتێك ئەخلاقی نائاینی بونی دەبێت و مومکین دەبێت کەئەوداواکاریە ئاکاری و ئەخلاقیانە کەلەناو ئایندا بەناوی خواوە داوا لەمرۆڤ دەکرێت پێیان هەستێت و پابەند بێت پێیانەوە، لەبری ئەوە بەناوی مرۆڤێکی ترەوە یان بەناوی خودی مرۆڤەوە داوای جێبەجێکردنیان بکرێت، ئەگەر شتێکی وا مومکین بوو ئەو کاتەیش دەتوانین بڵێین ئەخلاقی نائاینیش بوونی هەیە، بەڵام ئایا ئەمە تا چ ڕادەیەك دەکرێت ببێت، یاخود خەڵکی قەناعەت پێ بکرێت، کەپابەندی ئەو داواکاریە (مرۆڤی) یا نەبێت ؟)(( وە ك)).

کاتێك ماددیەکان هەوڵی ئەوەیاندا بینای سیستمێکی ئەخلاقی بنێن، گەڕانەوە بۆ ئەم هاوکێشەیە سەرەڕای ئەوەی نمونەیەکی ئاشکرایە لەسەر ئەوەی کارێکی لەوجۆرە نەسازو نەگونجاوە. پێشنیاری ئەوەیان کرد پەناببەن بۆ ویژدانی مرۆڤ لەبری ترسان لەخوا وەکو پاڵنەرێك بۆ هێشتنەوە و سەقامگیرکردنی ڕەفتار. لەچوارچیوەی ئەم هاوکێشەیەدا یەکێك لەوانە هات و ئەم بیرۆکەیەی تەرح کرد : من بەدڵنیاییەوە جەخت دەکەمەوە لەسەر ئەوەی کەئیلحاد لەخۆیدا واتە بەرزکردنەوە بەمرۆڤ و بەئەخلاقە مرۆڤایەتیەکان. ئەگەر هاتوو-من وەکو مرۆڤێکی ئازاد - گوێم لەدەنگێکی ناوخۆیی بوو فەرمانم پێدەکات، بەبێ ئەوەی کەسێکی تر لەدەرەوەدا ئەم فەرمانەم پێبکات، پێم دەڵێت دزی مەکە یان خەڵك مەکوژە، کەواتە من هەستم بەمە کردوە لەناوەوەی خۆمدا وە نەمگێڕاوەتەوە وەرم نەگرتووە لەهیچ جۆرێك لەجۆرەکانی (( ڕەها)) ئیتر چی کۆمەڵایەتی بێت یان ئاینی، ئەوا ئەمە نابێتە هۆی دابەزاندن لەڕێزی مرۆڤ. بەڵکو ئەوە مانای ئەمە دەگەیەنێت کەمن بەو شێوەیە هەڵسوکەتمکردوە لەسەر بناغەی

بینایی بوون لەئاگایی و ویژدانمدا.[47] لەپاش هەموو ئەمانەوە کەباسمان کرد، تەنها ئەوەمان پێدەکرێت پرسیار لەخۆمان بکەین کەکێ لەچەمکەکاندا هەڵەی کردوە، ئایا ویژدان و ئاگایی هەندێ بەشی ئەم جیهانە واقیعیە مادییەن ؟ ئایا ئیمان و بڕوا بوون بەمرۆڤ لەجیاتی بڕوابوون بەخوا شێوەیەکە لەشێوەکانی ئاین بەڵام لەپلەیەکی نزمتردا؟ پەنابردنی مادديەكان بۆ مرۆڤ لەجیاتی گەڕانەوە بۆ لای خوا، وادەردەکەوێت نامۆبێت لەژێر ڕۆشنایی ئەو وتەیەدا کە (مارکس) خۆی تەئکیدی لەسەر دەکاتەوە کاتێك وتی: هیوابوون لەمرۆڤایەتی داماڵراو بۆ مرۆڤ، وەهمێکە کەمتر نىیە لەوەهمێکی ئاینی ڕووت، ئەم وتەیەش دەگونجێت لەگەڵ مەفهومی ئەو هاوکێشەیەی کەدەڵێت :((ئەگەر خوابوونی نەبێت ئەوا مرۆڤیش بوونی نابێت))[48].

جەختکردنەوەی (( لینین)) لەسەر ئەوەی کەسۆشیالیزمی زانستی هیچ پەیوەندیەکی نىیە بەئەخلاقەوە، هەروەها لە((مانفستۆی کۆمۆنیست))دا کەتێیدا هاتووە دەڵێت : کرێکاران ئەخلاق ڕەتدەکەنەوە، دوو حەقیقەتی ئاشکراو دیارن ناکرێت ئینکاریان بکرێت. هەمیشە ئەوەیان دووپات دەکردەوە کەوا : دەرکەوتنی شیوعیەت لەئەنجامی حەتمیەتی پەرەسەندنی مێژووییەوە بەرهەم هاتووە نەك بەپاڵنەری هۆکارە ئەخلاقیيان مرۆییەکان دروست بووبێت، کارە تەقلیدیەکانی (مارکس) —بەجیا لەو کتێبانەی کەڕۆژانە دەستاودەستی پێدەکرێت و بەکاردەهێنرێت – بەڕونی ئەوە دووبارەدەکەنەوە کەوا یاسای ئیستیغلال یان فریودان مافی سروشتی هەیە لەپەیوەندییە مرۆڤایەتیەکاندا، هەموو مرۆڤێك بەبەردەوامی هەوڵی فریودانی بەرامبەرەکەی دەدات تا ئەو کاتەی هێزێك دێت و ڕای دەگرێت. لێرەدا جێگەیەك

[47] ئەم وتەیە دەگەڕێتەوە بۆ پرۆفیسۆر(( فۆکۆ بافیسفیتش)) لەکۆنگرەی( دایەلۆکی مولحدەکان و پیاوانی ئاین)کەلەساڵی ١٩٧١ زاینی لەبەلگراد بەسترا.

[48] لەڕاستیدا دەرئەنجامی ئەم هاوکێشەیە لەدونیای ئەمڕۆدا لەبەرابیەکانی دەرکەوتنیدایە لەوەتەی عەقلانیەت ((ناخودایی)) بەچەمکە(( نیچە)) یەکەی خەریکە دەبێتە جێی قەبوڵکردن و قەناعەتی زۆرینەی بیرمەند و ڕۆشنبیران و وەکو سستمێك خەریکی چەسپاندنی پایەکانی خۆیەتی لەهەموو دونیادا( بێگومان سەرتا لەڕۆژئاواوە)) بەلاکەی تریشدا واتە لای دوهەمی هاوکێشەکە کەچەمکی( مرۆڤە) بەمانا ڕۆحی ومرۆییەکەی لەق بووە و لەناوا بوندایە.(( وە.ك))

نابینینەوە ((بۆ دەنگی ناوخۆیی ویژدان)) یان لێبوردەیی، یاخود مرۆڤایەتی سروشتی (هیومانیزمی سروشتی) و ئەوانەی هاوشێوەی ئەمانەن ! بەڵکو ((ئیستیغلال))و فریودانەکە بە ستەمکاری و هەژمونداریەوە دەمێنێتەوە هەتا ئەو کاتەی لێیدەدرێت و لەناودەبرێت، وەکو دەرئەنجامێکی گۆڕانکاریەکان لەپەیوەندیە بابەتیەکاندا.

ئەم ئیستغلالکردنە پشت نابەستێت بەئیرادەی خەڵك و، بەئەخلاقیاتەکانیان، هەروەها پشت نابەستیت بەهیچ سیفەتێکی خودی هاوشێوەی تر لە( فێربون یان کەسێتی یان ڕەئی..) پشت نابەستێت بەپەیوەندیە سروشتیەکانی خەڵك وەکو پەیوەندییە نەتەوەیی و خێزانیەکان. کاتێك (مارکس) لەکتێبەکەیدا (سەرمایە) چەند نمونەیەکی پێشکەشکرد لەسەر ئیستیغلالکردنی منالْ (لەلایەن دایکە برسیەکانیانەوە) ئالەمەدا ئەو مەبەستەی هەبووە سەرنجمان ڕابکێشێت بۆ ئەو کاریگەرە ڕەهایەی یاسای ئیستیغلال کەهەیەتی بەسەر کۆمەڵگەی مرۆڤیەوە [٤٩] . لەبەر ئەوە، ئێمە سەرمان سوڕدەمێنێت لەهەندێ لەمارکسیەکانی ئەمڕۆ کەهەوڵدەدەن بۆ بیناکردنی ئەخلاق گوایە ئەمە گەڕانەوەیە بۆمرۆڤ بۆ مرۆڤایەتی خالیس و پوخت. [٥٠]

---

[٤٩] بڕوانە :(( کارل مارکس)) Karl Marx: Capital( Moscow : . Progress pub. , 1965)

[٥٠] وەنەبێت لەلای( ئینگلس) یش بیرۆکەیەکی باشتر هەبێت لەبارەی ئەخلاقەوە، ئەوەتانێ دەڵێت :( لەسەر بنەڕەتی بینابیەك لەئاگایی و لەویژدانەوە دەبینین کەهەموو چینێك وەهەتا هەموو پیشەیەك خاوەنی ئەخلاقیاتێکی تایبەت بەخۆیەتی، وەهەرکاتێك بتوانن سنووری ئەو ئەخلاقیاتانە دەبەزێنن و هەڵدێن لەسزاکەی. خۆشەویستی کە ئیشی ئەوەیە هەموو شتێك یەکبخات کەچی لەجەنگ وململانێ و کێشە خێزانیەکان و لەتەلاقدا هەروەها لە گەورەترین ڕێژەلەئیستغلال کردنی مرۆڤ لەلایەن مرۆڤەکانی ترەوە لەهەموو ئەمانەدا کەشفی حەقیقەتی خۆی دەکات بڕوانە :(( ئینگلس)).
Friedrich
Engels . Ludwig Feuerbach and the Outcome of Classical German Philosophy..(New York : International Pub. , 1941).

لەکاتێکدا مارکس بەبەردەوامی جەختی دەکردەوە لەسەرئەوەی کە گەڕانەوە بۆ مرۆڤ یان مرۆڤایەتی یان ئاگایی شتانی تری لەو شێوەیە، بریتیە لەئیشکردنێك لەناو میسالیەتدا بەهەمان شێوەی ئایین. ئێمە لەمەدا لەگەڵ ئەو ڕایەی مارکسدا هاودەنگین، بەڵام مارکسیەکانی ئێستا ناتوانن لەگەڵ ئەم ڕایەدا ڕێك بکەون لەبەر چەند هۆکارێکی کرداری. (( مارکس)) ئەو کاتە لەسەرکورسیەکەی خۆی لەکتێبخانەی بەریتانیا دانیشتبوو ئەیتوانی بڵێت کەئەخلاق بوونی نیە، بەڵام ئەو کەسانەی هەوڵیاندا فیکرەکانی( مارکس) جێ بەجێبکەن و کۆمەڵگەیەك لەسەرئەو بناغەیە بونیاندبنێن، نەیانتوانی ئەم ووشەیە بەهەمان ئەو ئاسانییە خۆی رابگەیەنن. جا بۆئەوەی کۆمەڵگەیەك پێبگەیەنن و پارێزگاریشی لێبکەن، پێویست بوو لەسەریان کەزیاتر داوای میسالیەت و قوربانیدان لە خەڵك بکەن، بەڵکو ڕەنگە زیاتریش لەوەی کەپێغەمبەرێك بەناوی ئاینەوە داوایکردوە لەگەلەکەی. لەبەرئەم هۆیە، پێویست بوو لەسەریان هەندێك لەبەڵگەنەویستە مادییە ڕون و ئاشکراکان لەبیرخۆیان ببەنەوە. لەبەرئەوە، پرسیارە حەقیقەیەکە ئەوە نی‌یە کەئایا مولحدێکی (مادی) مافی ئەوەی هەیە کەبەناوی ئەخلاقەوە یان مرۆڤایەتیەوە ڕێنموویی و ئامۆژگاری بکات، بەڵکو پرسیارەکە ئەوەیە کەئایا دەتوانێت ئەمە بکات و بشمێنێتەوە لەسەر ئەوەی کەلەسەریەتی، مەبەستم ئەوەیە لەسنووری مەزهەبە مادیەکەدا بمێنێتەوە و لێی دەرنەچێت؟ ئەوجیاوازیە ناسراوەی لەفەلسەفەی (ابیقور)دا هەیە ئەوەمان بۆ دەردەخات کەوا ئاشتی لەنێوان مەزهەبی مادی و ئەخلاقدا ناکرێت بۆ ماوەیەکی درێژ بمێنێتەوە. ئەم فەیلەسوفە یۆنانیە کۆنە (٣٤٢- ٧٠ ٢پ. ن) سەرەڕای ئەوەی نەزعەیەکی مادی هەبوو، بەڵام پارێزگاریشی لەهەڵوێستێکی دیاریکراو لە ئەخلاق کردوە. ئەو قوتابیەکانی فێرکردوە کەوا بەختەوەری لەچێژدا هەیە، بەڵام ئامۆژگاریشی کردون بەوەی کەوا چێژ لەهێوری عەقڵ وەربگرن کەخۆی ناوی نابوو ((ئاتاراکسیا)) Ataraxia ، ئەو خۆی بەهای چێژە ڕۆحیەکانی بەرزکردۆتەوە بەسەر چێژە هەستیەکاندا، واتە ئەو چێژانەی لەڕێگەی هەستەکانەوە بەمرۆڤ دەگەن، بەڵام قوتابیەکانی ئەم فەیلەسوفە هاتن ئەم نەسازی و دژەیەکیان لەفەلسەفەی

مامۆستاکەیان دارِنی و ئەخلاقیاتەکانیان لەداواکردنی چێژدا کورتکردەوە، بەو شێوەیە ((الابیقوریة)) ئەمڕۆ بووە (مرادف)) هاومانایی بۆ چێژە هەستیەکان ((المتع الحسیة)) [٥٠] بەوپێیەی کەبریتیە لەژیانی میسالیانە. پەیوەندیەکی لۆژیکی یان یەککەوتنێکی ناوخۆیی هەیە لەنێوان ((مەزهەبی چێژ))و لەنێوان فەلسەفەی مادییانەی ((ابیقور))دا. بەپێی ئەو فەلسەفەیە گەردوون هەموو ئەو دیاردە جیاوازانەی کەتێیدایە، بەرهەم یاخود دەرئەنجامی ئەو جوڵەو بزاوتە ئالیەی گەردیلە مادییەکانە لەناو فەزایەکی بۆشدا.

ئەم رێکەوتنە بوونی نیە لەنێوان فەلسەفەی ماددی (ابیقور) و لەنێوان ئەوەی کەبانگەشەی بۆ دەکرد لە( ئاتاراکسیا) یاخود ئەولەویەتی بەها رۆحیەکان. لەبەرئەوە دەتوانرێت بوترێت، ئەو تۆمەت بارکردنەی کەئاراستەی قوتابیەکانی (ابیقور) کراوە بەوەی کەفەلسەفەی مامۆستاکەیان شێواندوە هیچ پاڵ پشتێکی نیە، چونکە ئەوەی ئەوان کردویانە تەنها وایان لێکردوە کەگونجاو بێت لەگەڵ خۆیدا، بەمانایەکی تر ئەو ناسازیەیان راستکردۆتەوە کەتێیدا هەبووە. چونکە هەر دەبێت ماددیەت لەکۆتاییدا نکوڵی لەئەخلاق بکات.

بەو شێوەیە دەگەینە دوو دەرەنجام : یەکەمیان ئەوەیە کەئەخلاق وەکو بنەمایەك بوونی نیە بەبێ ئاین، لەکاتێکدا ئەخلاقی کرداری بۆی هەیە، کە بوونی هەبێت لەکاتی نائامادەیی ئاییندا.

ئەم جۆرە لەئەخلاق بەشێوەیەکی کزو لاوازبوونی هەیە بەحوکمی کەمتەرخەمی زاتیەوە ئەمەیش بەهۆی دابڕینیەوە لەو سەرچاوەیەی کەئەو هێزە مەبدەئیەی پێبەخشیوە. دەرئەنجامی دووەم : ئەوەیە ناکرێت سستمێکی ئەخلاقی لەسەر ئیلحاد

---

[٥٠] (( الحسی)) واتە هەستی، ئەوەی دەرکی پێدەکرێت لەرێگەی هەستی دیارەوە پێچەوانەکەی هەست پێکردنی عەقڵییە، مەزهەبی هەستی یان(( الحسیە)) : مەزهەبی ئەو کەسانەی کەپێیان وایە هەموو مەلەکە عەقڵیەکان لەرێگەی ئیحساس و هەستەوە دروست دەبن﴿ وە. ك / المنجد ﴾.

بونیادبنرێت. لەگەڵ ئەوەیشدا، ئیلحاد ئەخلاق بەتاڵ ناکاتەوە بەلانی کەمەوە لەنزمترین شێوەیدا، مەبەستیشم لەمە سیستمە کۆمەڵایەتیەکە. زیاد لەمەیش، دەبینین کەوا ئیلحاد ئەگەر بخرێتە بواری مومارەسەکردنەوە، ئەوا لەکاتێکدا کەدەیەوێت بینای کۆمەڵگە بنێت پەنادەبات بۆپارێزگاریکردن لەوشێوازە بەرپایانەی کەلەئەخلاقی کۆمەڵایەتیدا هەن، لەکاتێکیشدا ئەو ئامرازێکی بەدەستەوە نی‌یە بۆ پارێزگاریکردن و پاراستنی خودی ئەو بنەما ئەخلاقیانە، ئەگەر هاتوو تووشی رەخنە لێگرتن و گومان لێکردن بوون. ئیلحاد تەواو دەستەوسانە لەبەردەم هێرشی بانگەوازکەرانی سودگەراییو خۆپەرستی و نائەخلاقی تەواودا، دەبێ چی پێبکرێت لەبەردەم ئەم لۆژیکە ئیفلیجەدا ؟ ئەگەر بێت و من تەنها ئەمڕۆ بژیم و دەبێت سبەینێ هەربمرم و بڕۆمە گۆشەی لەبیرچونەوەوە، ئیتر بۆچی بەو شێوەیە نەژیم کەبۆم دەلوێت بەبێ هیچ کۆت و پەیوەندێك تا ئەو کاتەی کەبۆم دەچێتە سەر ؟ ئەو شەپۆلی ئیباحیەت و بەرەڵاییە ئەوەی ناودەبرێت بە( ئەخلاقی نوێ) بۆ ئازادی سێکسی، لەسنووری دەوڵەتە ئیشتراکیەکاندا بەزەبری هێزو زۆرو لەرێگەی چاودێری خستنەسەرەوە راوەستێنرا – واتە بەرێگەو شێوازی دروستکراو–، هیچ سستمێکی ئەخلاقی نیە کەوا رازی بێت بەو شەپۆلی نائەخلاقیە. سەرەڕای هەندێ بیانوبەڵگەیشی کەهێنراوەتەوە بۆپاڵپشتیکردنی ، ئەوا بەڵگانە دەمێننەوە تەنها بەهۆی نەمانی رەخنەی ئازادو کراوەوە. لەراستیدا، تەنها پێوەرە ئەخلاقیە بۆماوەییەکانە کەلەئاگایی خەڵکدا دەمێننەوە، دەوڵەتیش لەسەر ئەو پێوەرە ئەخلاقیانە دەمێنێتەوە بەهۆی پاڵنەری زەرورەت و تەنها لەپێناو مانەوەی پایەکانی ئەو سستمە کۆمەڵایەتیانەی کەلەسەر ئەو پێوەرە ئەخلاقیانە بونیادنراون، لەهەردوو حاڵەتەکەیشدا ئەو سستمە ئەخلاقیە کەوا ماوەتەوە دژو نەگونجاوە لەگەڵ ئایدۆلۆژیەتی رەسمیداو جێگای نابێتەوە تێیدا.

ئێستا پاش ئەوەی رێگامان بەخۆماندا بابەتەکان ئاسان بکەینەوە، ئەوا لەکورتەی هەموو قسەکانماندا دەگەینە ئەوەی کەوا ئەخلاق شتێك نی‌یە جگە لەئاینێکی تر.

## بەشی پێنجەم

# رۆشنبیری و مێژوو

﴿ رۆشنبیری پەرەسەندنی تێدا نییە، مرۆڤیش رەگەزی نەگۆڕە لەمێژووی جیهاندا﴾

# مرۆڤایەتی سەرەتا

هەریەکە لەعەقلانییەکان و مادییەکان پێیان وایە کەمێژوو لەسەر هێڵێکی ڕاست دەڕوات، پەرەسەندنی جیهانیش لەسفرەوە دەستی پێکردوەو هاتووە. مێژوو- بەدەر لەچەند بزوتنەوەیەکی پێچاوپێچ و نوشوستییەکاتیەکان - پابەندە بەجوڵەیەکی بەردەوام بەرەو پێشەوە. ئەمەیش ئەوە دەگەیەنێت کە ئێستا هەمیشە شتێکە زیاترە لەڕابردووە کەمترە لەداهاتوو.

دەتوانین باشتر لەم هەڵوێستە تێبگەین کاتێك ئەوەمان وەبیردێتەوە کەمێژوو لەلای ماددیەکان بریتیە لەپەرەسەندنی ماددی ژیانی مرۆڤایەتی، ئەوان زیاتر گرنگی ئەدەن بەمێژووی شتەکان یان مێژووی کۆمەڵگا نەك بەمێژووی مرۆڤ خۆی. ئەمەیش بریتی نییە لەمێژووی ڕۆشنبیری مرۆڤایەتی، بەڵکو ئەوە مێژووی شارستانیەتە.

مێژووی مرۆڤ یان مێژووی ڕۆشنبیری لەسفرەوە دەستی پێنەکردوەو بەسەر هێڵێکی ڕاستوڕێکدا سەرناکەوێت. کاتێك کۆمەڵگەی مرۆیی بۆ یەکەم جار ڕزگاری بووە لەسروشت لەزۆر ڕووەوە جیانەدەکرایەوە لەو برە ئاژەڵانەی تر کەلەدەوری بوون. بەڵام لەهەمانکاتدا چەند سیفەتێکی مرۆڤی و تایبەت بەخۆی و هەندێ بەهای ئەخلاقی تێدا دەرکەوتن کەعەقڵ پێیان سەرسام دەبێت. مرۆڤ بەسەرمایەیەکی ئەخلاقی و مەبدەئی گەورەوە هاتە ناو مێژووەوە، لەو باو باپیرانەیەوە بۆی نەمابونەوە کە وادادەنرێت گوایە ئاژەڵ بوون. زانست ڕووبەڕووی سروشتی کۆمەڵگاکانی مرۆڤایەتی بووەوە لەسادەیی و ڕەسەنایەتیاندا لەساتەوەختێکدا کەهێشتا کۆمەڵگاکانی مرۆڤایەتی و ئاژەڵی هاوسێی یەکتربوون، بەڵام زانست دەستە وەستان بوو لەتەفسیرکردنی ئەو

سروشتەدا، ڕەفزکردنی زانستیش بۆ گریمانەی ئاینی هەر لەسەرەتاوە بۆتە ڕێگرێك لەبەردەمیدا بۆ تێگەیشتن لەم دیاردەیە.[1]

(( لویس مۆرگان)) لەباسکردن و پێناسەکردنی خێڵەکۆنەکاندا - کەوا دەردەکەوێت ئەو خێڵانە شانەی یەکەمی ئەو کۆمەڵگایانەی پێش مێژوو بوون لەهەموو جیهاندا - خاسیەتەکانی ژیانی ئەو کۆمەڵگا کۆمەڵایەتی و ئەخلاقیانەمان بەم شێوەیە بۆ دەگێڕیتەوە : خێڵ سەرۆك خێڵەکەی هەڵدەبژێرێت و پاشان دایشی دەماڵێت لەسەرۆکی، ئەو سەرۆکە پاش داماڵینی دەبێتە ئەندامێکی خێڵ و، پاشان دەگەڕێتەوە بۆکەسێکی ئاسایی وەکو ئەو خەڵکانەی تر.

- ژن هێنان و پەیوەندی سێکسی حەرام بووە لەنێوان ئەندامەکانی خێڵدا، ئەو حەرامکراوەنەیش هەموو کەسە هۆشیارەکانی خێڵ پێوەی پابەندبوون، هیچ کەسێك نەی توانیوە سنووری ئەو حەرامکراوانە ببەزێنێت.

- هاوکاری لەنێوان یەکتری و پاراستنی یەکتری لەنێوان ئەندامانی خێڵدا، بەڕێژەیەك کەدەگاتە ڕادەی خۆبەقوربانی کردن لەپێناوی یەکتریدا.

- ئازایەتی سەربازەکان و مامەڵەی چاك لەگەڵ دیلەکاندا( دیلی شەڕ ناکوژرێن).

- هەموو ئەندامانی خێڵ ئازاد و یەکسانن، پەیوەندیەکی برایانەی توندوتۆڵ بەیەکتریانەوە دەبەستێتەوە.

[1] ئەو یادەوەرەریە ئاڵۆزانەی لەبارەی ماوەی سەرەتای مرۆڤایەتیەوە لەشێوەی ئەفسانە و چیرۆکی خورافی داڕەنگ ئەدەنەوە لەلای هەموو گەلان بەگشتی، وەکو چیرۆکی چاخی زێڕینی باوپیرانە پێشینەکان کەلەتەوراتدا هاتووە. ئەو بیروباوەڕە باوەی کەدەڵێت ڕابردوو خراپ بووە ئەم بۆچونە تەنها لەگەڵ تیۆری پەرەسەندندا دەرکەوتووە))، وەکو (( برتراند رسل)) لەکتێبەکەیدا جەختی لەسەر دەکاتەوە :(( مێژووی فەلسەفەی ڕۆژئاوایی و پەیوەندی بە ئەخلاقی سیاسی و کۆمەڵایەتیەوە لەکۆنترین چاخەکانەوە هەتا ئێستا)).

- وەرگرتنی ئەندامێکی نوێ لەخێڵدا لەرێگەی ئاهەنگ گێرانێکی ئاینی یەوە دەبێت. دروشمە ئاینیەکانیش زۆرجار لەشێوەی سەماکردن و نمایشکردن دا دەردەکەون، دروستکردنی بت و پەیکەری نوێ دەردەکەوێت لەکۆمەڵگەی خێڵدا.

- کۆنگرەی خێڵ لەنوێنەرە نهێنیەکان وەیان پیێ دەوترێت( ساشیم)( سەرۆکە نهێنیەکان) پێکدێت، ئەنجومەن بڕیارەکان بەئاشکرا دەردەکات لەو کاروبارانەدا کەبەرژەوەندی هاوبەشی تێدایە بەئامادەبونی هەموو ئەندامەکانی خێڵ، بڕیارەکانیش پێویستە کۆی دەنگیان لەسەر بێت ئینجا وەردەگیرێن.[٢]

(ئینگلز) سەری سوڕدەما لەم وەسفانە، هاواری دەکرد و دەی ووت : ئای کە پێکهاتەیەکی جوانە.. ئەم پێکهاتە خێڵەکیە بەم هەموو سادەییە منداڵیەیەوە ! بەبێ سەرباز و بەبێ پۆلیس و بەبێ چینی خانەدان و بەبێ پاشاو( وصی) و کاربەدەستی ولایەتەکان، بەبێ قازی و بەبێ بەندیخانە و بەبێ کێشە، هەمووشتێك بەشێوەی ئاسایی و سروشتی خۆی دەڕوات بەڕێوە.. هەموو ناکۆکی و کێشەکان کەدروست دەبن لەرێگەی خۆیانەوە یان سەرۆك خێڵەکانیانەوە چارەسەر دەکرێن.. کەسانی هەژارو کەم دەست بونیان نیيە مادام ئەندامانی خێڵ و سەرۆکەکانیان هەموویان هەست بەلێپرسراوێتی دەکەن بەرامبەر بەگەورە ساڵان و نەخۆشەکان و ئەوانەی بەهۆی جەنگەدەرکیەکانەوە تووشی کەم ئەندامی بوون.. هەمووان یەکسانن و ئازادن، لەناویشیاندا ئافرەتان..هیچ کەسێك لەناویاندا دیل و کۆیلە نیە.. وەهیچ ئارەزوویەکیش نیيە بۆ زاڵبوون بەسەر خێڵەکانیتردا و ملکەچ پێکردنیان.. حەقیقەتی ئەم جۆرە لەپیاوان و ژنان کەلەئامێزی ئەو کۆمەڵگایانەدا پەروەردەدەبن، بەوەدا دەردەکەوێت یاخود بەوەدا دەسەلمێنرێت لەسەرسوڕمانی هەموو ئەو سپی پێستانەی کەلەنزیکەوە ئەو کۆمەڵگایانەی هیندیە سورەکانیان ناسیوە. وەهەتا

---

[٢] ئەم وەسف و پێناسەیە دەربارەی خێڵەکانی( ئیرۆکوین) Iroquois ە لەئەمەریکای سەرو کەدادەنرێت بەنمونەیەکی هاوشێوەو تەقلیدی خێڵەسەرتاییەکان. بڕوانە(( لویس مۆرگا)) Lewis H. Morgan : Ancient Society( Chicage: C.H. Kern, 1907 ).

ئێستاکەیش هەرلەو شێوە پاکیزەییەیدا ماوەتەوە.. سەرسام بونیان بەوبەهێزی کەسێتی و دامەزراویەیان کەهەیانە، وەبەئازایەتی ئەوبەربەریانە [٣].

ئەوحەقیقەتانەی کە( مۆرگان) وەسفی کردون لەکتێبەکەیدا، ڕەنگی داوەتەوە لەسەر بیری یەکێك لەهاولاّتیەکانی کە( فنیمور کۆبر)ە ئەویش لەیەکێك لەڕۆمانەکانیدا تەعبیری لێکردوە لەڕێگەی وێنەی پرلە( حیویە)و سەرسوڕهێنەرانەدا [٤]. بەبێگومان ((رالف والدۆ ئیمرسون)) یش هەروەها لەهزریدا ئەمریکیە سور پێستەکان هەبوون کاتێك نوسیویەتی و دەڵێت: (( سروشتی مرۆڤایەتیم لەهەموو شوێنەکاندا بینی... لەهەموو شوێنێکدا هەمان شت بوو.. بەلاّم لەهەر شوێنێکدا لەسەر سروشتە پاکیزەییەکەی مابوو بێتەوە، ئەوا زیاتر بەهاو سیفەتە بەرزەکانیشی تێداماوەتەوە.[٥]

بیرۆکە کۆمەلاّیەتیەکان لەلای(( تولستوی)) [٦] کاریگەربوون بەو ڕەوشەی کەهەستی پێکردبوو لەژیانی جوتیارە روسە سادەکاندا ، ئەوانەی کەهێشتا( دونیا) خراپی نەکردبوون. لێرەدا، لەهەموو شوێنێکدا بەها ئەخلاقی و مرۆییەکان شان بەشان دەڕۆن لەگەڵ ئاستە سادەکان لەپەرەسەندنی ماددی وکۆمەلاّیەتیدا.

لەکتێبی (( مێژووی گشتی ئەفەریقا)) [٧]، بەچەندین حەقیقەتی سەرنج ڕاکێش دەگەین لەبارەی ڕۆشنبیری گەلە سەرتاییەکانەوە. بۆنمونە ئەوەی زیاتر دیارە، لەدەوڵەتە

---

[٣] بروانە( فردیك ئەنگلز) Friedrich Engles: The origing of the Family ....

[٤] بروانە :( جیمس فنجور کوبر) James Fenimore Cooper : The Complete Works of J. F. Cooper( (New York : G. P. Putnam s sons, 1893).

[٥] بروانە :((رالف والد ئیمرسون)) Ralph Waldo Emerson : The Conduct of Life, Nature, and.other Essays( London: J- M. Dent, and Co. 1908)

[٦] بروانە(( لیوتولستوی)) LeoTolsoy:((My Confession)) , The Complete Works of Count Tolstoy.. Vol

[٧] ئەم کتێبە لەبلاّوکراوەی ڕێکخراوی یونسکۆیە کەپێکهاتووە لەهەشت بەش.

ئەفەریقیەکاندا هەموو لایەنەکان - ئیتر ئەگەرچی سپی بن یان ڕەشبن یان هەر ڕەنگێکیتر - هەموویان ڕێزلەمیوان و میوانداری دەگرن و هەروەها ڕێز لەمافی هاووڵاتیەکانی خۆیشیان دەگرن. لەکاتێکدا، کەسانی بێگانە لەڕۆمای کۆندا وەیان لەوڵاتی گریك دادەکران بەکۆیلە، ڕەنگە ئەم حەقیقەتە و چەندین حەقیقەتی تری لەم شێوەیە وای لەزانایەکی ئەڵمانی کردبێت کەپسپۆڕە لەلێکۆڵینەوەی ئەفەریقیدا ئەویش(( لیوفروبنیوس)) بڵێت(( ئەفەریقیەکان مەدەنی ترن هەتا سەر ئێسقان، وەئەو بیرۆکەیەی دەڵێت کەئەوانە بەربەرین هیچ نییە جگە لەخەیاڵ و ئەفسانەی ئەورووپی)).[8] دەتوانین لێرەدا بپرسین دەربارەی سروشتی ئەو بەها هاوشێوانەی کەلەنێوان هیندیە سورەکانی ئەمەریکادا، وەیا لەنێوان تایەفەکانی دانیشتووی ئەفەریقا و تاهیتیدا، یان جوتیارە روسیە سادەکاندا، یان لەنێوان نزمترین چینە کۆمەڵایەتیەکانی هیندا هەیە .. ئەسڵی ئەم بەهایانە کامەیە ؟ بۆچی لەبەراییەکانی مێژووی یەکەمەوە دەردەکەوێت، بۆچی بەرەو کەمبونەوە دەچێت لەڕووی چەندیەوە لەگەڵ پەرەسەندنی مێژوویدا ئایا لەئەسڵێکی ئاژەڵیەوە هاتووە ؟ لەکاتێکدا هەموو شێوە جیاوازەکان ( بۆچاودێری) کەتێبینی دەکەین لەلای هەندێ لەگیاندارەکان لەسەر بناغەی سوود دروست بووە، هیچ جۆرە مرۆییەکی تێدانیە. ( مورگان) بەم کۆمەڵە وشانە کۆتایی بەکتێبە بەناوبانگەکەی هێنا: حوکمی دیموکراسیانەو، برایەتی لەکۆمەڵگەدا، یەکسانی، فێرکردنی خەڵك بەگشتی، ئەمانە دەمانگەیەننە ئاستێکی بەرز لەکۆمەڵگادا کەماوەیەکی زۆر ئەزموون و عەقڵ وزانست ئامانجیان بووە و هەوڵیان بۆ داوە. نوێبونەوەی ئەو ئازادی و برایەتی و یەکسانیەیە کەلەژیانی خێڵە کۆنەکاندا هەبووە بەڵام لەئاستێکی باڵاتردا[9].

---

[8] ئاسانە تێگەیشتن لەوەی کە( فروبنیوس ) ووشەی( مدنی) بەکارهێناوە لەبری ووشەی( رۆشنبیری) بروانە(( لیوفروبنیوس)) Leo Frobenius : The Chidhood of Man, trans. A. H. Keane(( New York Meridian Books, 1960)

[9] بروانە( مورگان) Morgan : Ancient Society .

بەوشێوەیە (مورگان) وادەبینێتەوە کەئازادی و یەکسانی و برایەتی لەکۆمەڵگە پێشکەوتووەکاندا لەڕێگەی سێهێزەوە بەدی دێت کەبریتین لە: ئەزموون و عەقڵ و زانست. بەلأم ئێمە لەئێستادا بەلانی کەمەوە دەتوانین جەخت لەسەر دوو شت بکەینەوە، یەکەمیان، ئەوەیە کەئازادی و یەکسانی و برایەتی لەکۆمەڵگا سەرەتاییەکاندا لەڕێگەی ئەزموون و عەقڵ و زانستەوە نەهاتووە. دوهەمیشیان ئەو ماوەیەی کەتێپەریوە لەو کاتەوەی کتێبەکەی( مۆرگان) بلأوبۆتەوە هەتا ئێستا - کەماوەیەکە پڕیەتی لەئەزموون و عەقڵ و زانست - نەیتوانیوە بیسەلمێنێت بەجۆرێك لەجۆرەکان لەسەر ڕاستی پێشبینیە گەشبینەکانی (مۆرگان). ئەوانەی کەمێژوویان نوسیوەتەوە کەسانی مەدەنی ئەم سەردەمەن، (بەربەریەکان) نەیان نوسیوەتەوە، ڕەنگە ئەمەیش بمانگەیەنێتە ئەو حەقیقەتانە سەبارەت بەو دەمارگیریانەی کەلەناو ئەو مێژووەدا بەکارهاتووە. ئەو هەربەوە وازناهێنێت کەوا گەشەکردنی کۆمەلأیەتی و تەکنیکی تەنها لەشارستانیەتدا مۆلبدات بەبێحسابکردنێك بۆ (( بەربەریەت)) بەڵکو هەمان حاڵەت درێژ دەکاتەوە بۆ ئەو ئاکامە ئەخلاقیانەی کەلەدژیەکی نێوان خێروشەڕدا خۆیان دەنوێنن. ئەگەر دەوڵەتێك هەستابێت بەڕووخاندن وتێکدانی رۆشنبیریەك یان بەخوێن رشتن و دروستکردنی قەسابخانەیەك، بەوە پێناسەی دەکەن کەهەستاوە بەکردەوەیەکی بەربەریانە.

لەلایەکی ترەوە، ئەگەر داوامان لەیەکێك کرد شتێك لەلێبوردەیی و مرۆڤایانە بنوێنێت، ئەوا پێی دەڵێین کەوا(( ڕێگەیەکی شارستانیانە بگرێتەبەر)). سەیریش لەوەدایە، ئەو دەمارگیریانە بەردەوام دەبن بەشێوەیەکی سەرسەختانە، سەرەڕای بوونی ئەو هەموو حەقیقەتانەیش کەتەواو ڕەتی ئەمە دەکەنەوە. مێژووی کیشوەری ئەمەریکا بەتەنها ڕێ ئەوەمان پێدەدات کەئەنجامێکی تەواو پێچەوانەی ئەمە بەرهەم بهێنین. ئایا هەر ئیسپانیە داگیرکەرە شارستانیەکان نەبوون کەبەهەموو ئامرازەکان بەشێوەیەك کەمێژوو لەوەو پێش بەخۆیەوە نەی دیوە هەستان بەوێران کردن و تێکدانی نەك تەنها رۆشنبیری (( مایاوی))و(( ئەزەتی))، بەڵکو هەموو ئەو گەلانەیشیان لەناوبرد کەلەو

ناوچانەدا دەژیان ؟ ئایا سپی پێستەکان نەبوون (ئایا بڵێین لەوڵاتە خاوەن شارستانیەکانەوە هاتبوون ؟) کاتێك چوونە ئەمەریکاوە، بەڕێگەیەکی پلان بۆ ڕێژراو هەستان بەلەناوبردنی هیندیە سوورەکان کەنیشتەجیٚی ڕاستەقینەی ئەو وولآتە بوون، ئەو خێڵانەی کە(مورگان) لەبارەیانەوە نوسیویەتی، لەو هەڵمەتی پاکتاوکردنەدا شێوازی دڕندانەی وایان بەکاردەهێنا کەهیچ کەسێك لەپێش ئەوانەوە بەکاری وا و لەوشێوە هەڵنەستاوە لەمێژووی نویٚدا ؟ حکومەتی ئەمەریکی - هەتا نیوەی سەدەی نۆزدەیەم -ڕێژەیەك پارەی تەرخانکردبوو بۆ ئەوەی هەستێت بەهێنانی پێستە سەری هیندیەك.

لەماوەی سیٚسەدەی رابردودا، بازرگانی کردن بەکۆیلە ڕەشەکانەوە بەشێوەیەکی ناشرین بەردەوام بوو شان بەشان لەگەلٚ گەشەکردنی شارستانیەتی ئەورووپی- ئەمەریکیدا، وەکو بەشێکی دانەبڕاو لەو شارستانیەتە. ئەم بازرگانیە دزێوو نامرۆییە بەردەوام بوو تا ساڵی ١٨٦٥. ژمارەی ئەوانەی بوونە نێچیرو کەوتبوونە ناوداوی ڕاوی بەشەرییەوە ( بەمانای پیتی ئەم ووشەیە) لەو ماوەزەمەنیەدا مەزەنەدەکرا بە ١٣ بۆ ١٥ ملیۆن مرۆڤی ئازاد، ( بێگومان ژمارەی ڕاستەقینەی ئەو ڕێژەیەش زۆر زیاترە لەوە). لێرەشدا جارێکی تر ئەو کردارە وەحشی و دڕندانە ئاڕاستەکراوە لەلایەن کۆمەڵگایەکی شارستانی پێشکەوتووەوە دژ بەو کەسە ئازادو بیٚزیانانە لەگەلە سەرەتاییە (بەربەریە)کاندا. دەتوانین بۆ ئەمەیش ئیمپریالیزمی نویٚ بەنموونە بهێنینەوە، بەمانای ڕووبەڕووبونەوە لەنێوان شارستانیەتی ئەورووپی و لەنێوان ئەوانەدا کە بەگەلە دواکەوتوەکان ناودەبرێن، ناشارستانین یاخود شارستانیەتیان کەمە. ئەم ئیمپریالیزمە داگیرکەرە ڕێگە بەخۆی دەدات لەهەموو جێگەیەکدا بەتووندوتیژی و فێلٚ و تەڵەکە بازی و دووڕوییەوە ڕووبەڕووی ئەو گەلە سەرەتایی و لاوازانە ببێتەوەو، ئەمەیش لە لەناوبردنی هەموو بەها ماددی و ڕۆشنبیری و ئەخلاقیەکانی ئەو گەلە لاواز و سەرەتاییانەدا دەردەکەوێت .

دەمارگیریشمان بەرامبەر بەچاخەکانی ناوەڕست لەبنەڕەتدا دەگەڕێتەوە بۆ هەمان شت. ئایا ڕاستە کەچاخەکانی ناوەڕاست چاخی تاریکی و مەینەتی و ناڕەحەتی بوون؟، ئەمە پرسیارێکە و هەروەك چۆن گۆشەنیگایەکیشە. بەپێوەری شارستانیەت، چاخەکانی ناوەڕاست بەتەئکید دادەنرێن بەچاخی تاریکی و مەینەتی و ناڕەحەتیەکان. یاوەکو( هلفتیوس) کەیەکێکە لەفەیلەسوفە ماددیە بەراییەکان لەم بارەیەوە دەڵێت :( سەردەمێك بوو کەتێیدا مرۆڤەکان گۆڕابوون بۆ ئاژەڵ، یاساکان نمونەیەك بوون لەپێچەوانەی هەموو پێودانگ و پێوەرێکی عەقلی [10]، بەڵام ( نیکۆلای بردیائیف) کەفەیلەسوفێکی مەسیحییە و هەروەها (جان ئەرب) . وێنەکێش . ڕاوبۆچونێکی تری تەواو جیاوازیان هەیە سەبارەت بەهەمان ئەو ماوەیە [11]. ئێمە هەمیشە وێنەیەکی یەك لایەنی سادەکراوەمان هەیە دەربارەی چاخەکانی ناوەڕاست بەڵام سەرەڕای هەژاری و ناڕەحەتی و خراپی باری تەندروستی لەهەموو جێگەیەکدا، ئەوا کۆمەڵگەکانی چاخی ناوەڕاست لەڕووی ڕۆحی و دەروونیەوە ساغ و ئاسودەبوون. ئەو چاخە چاخی بەهێزی ڕۆح بوو، کەبەبێ بوونی ئەوەیش نەماندەتوانی لەو هێزو ئیلهامانە تێبگەین کەمرۆڤی ڕۆژئاوایی گەیاندە ئەم چەرخە نوێیەی ئێستای. چاخی ناوەڕاست توانی کۆمەڵێکی زۆر کاری گەورە دابهێنێت لەبواری هونەردا، تێیدا پێکهاتنێك دروستبوو لەنێوان فەلسەفەیەکی گەورە کەفەلسەفەی یۆنانیەو ئاینێکی گەورەدا کەئاینی مەسیحیە. شێوازی( الغوطی) – کەیەکێکە لەداهێنانە هەرە گرنگەکانی مرۆڤایەتی – لەبەرهەمی چاخەکانی ناوەڕاستە.

---

[10] بڕوانە :(( هلفتیوس) : Claud Adrian Helvetius: De L ,homme ...

[11] ئەووێنەکێشە دەڵێت :(( من دژی ئامێرو شتەئالی و هاوکێشە کیمیاویەکانم ... من چاخەکانی ناوەڕاستم خۆش دەوێت، لەو چاخەدا هونەرەکانی چنین و نەخشاندن و هونەرەکانی هەڵکۆڵینم خۆش دەوێت(( بڕوانە)) (جان ئەرب) Jean Arp : on Arp: Poems, Essays, Memories.. New York :Viking Press, 1972).

[12] ئەم چاخە، بەبێ پێشکەوتنی زانستی و تەکنیکی توانی شتێك دابهێنێت کە(ئەلفرید نورث هویتهید) پێناسەی کردوە بە (پێشکەوتنێکی چۆنایەتی) [13].

ئەگەر لەمرۆڤی ڕۆژئاواییدا شتێك لە(فاوست) هەبێت، ئەوە دەگەڕێتەوە بۆ ئەو ڕاچەنینە ڕۆحی و سیاسیە گەورانەی کەچاخەکانی ناوەڕەست بەخۆیەوە بینیویەتی. بەبێ چاخەکانی ناوەڕاست ئەم چاخە نوێیە بەلانی کەمەوە ئابەم شێوەیە نەدەبوو کەئێستا پێی ناسراوە [14].

---

[12] بڕوانە :(( کنیپ کلارك)) Kenneth Clark: Civilzation : A personal View( New York: Harper and Row, 1970)

[13] بڕوانە(( هویتهد)) Alfred North Whitehead : The Future of Religion( r. P. , n. d) .

[14] ئێمە لێرەدا بمەبەستمان لەچاخەکانی ناوەڕاستی ئەورووپایە، وەچاخەکانی ناوەڕاست بەو مانایە هەموو جیهانی نەگرتۆتەوە. بۆ نموونە لەوسەردەمەدا پارچەیەکی فراوان لەزەوی کەلەهیندەوە درێژ دەبێتەوە هەتا ئیسپانیا تێیدا ژیان و شارستانیەتی ئیسلامی گەشاوەتەوە.

# هونەرو مێژوو

هونەر - بەمانایەك لەماناكان - دەكەوێتە دەرەوەی كات، هەروەها مێژوویش، ڕوو لەبەرزی و نزمی دەكات، بەلاّم هیچ پەرەسەندن و مێژوویەكی نی‌یە بەمانا سادەكەی ئەو زاراوانە، هونەر بەپێچەوانەی زانستەوە كەمتر سوود لەئەزموون و مەعریفەی كەسێكی تر وەردەگرێت. لەزانستدا هەموو شتێك جیاوازە، زانست لەسەر بەردەوامی ڕاوەستاوە.[15] كەچی هەر لەچاخی بەردینەوە هەتا ئەمڕۆ، هیچ زیادەیەك نابینین لەهێزی دەربڕین و تەعبیركردنی هونەری‌دا لەڕێگەی بەرەوپێش چونەوە بەدەست هاتبێت.

شارستانیەت چاخی بەردین و چاخی ئەتۆمی هەیە، بەلاّم رۆشنبیری هیچ بەرەوپێش چونێكی لەو شێوەیەی نی‌یە، لەڕوانگەی هونەرەوە چاخی بەردینی تازە بەدواكەتوو تر دادەنرێت لەهونەرەكانی چاخی بەردینی كۆن، سەرەڕایی ئەوەی پێش هەزاران ساڵ كراوە، كەچی زۆر سەرنج ڕاكێشتر و ڕەسەنتر دیارن لەهونەرەكانی چاخی بەردینی تازە، شیعر هەمیشە پێش دارِشتن كەوتووە. لەهەموو جێگایەكدا مرۆڤ سەرەتا بەگۆرانی دەستی پێكردوەو پاشان حەكایەتی گێڕاوەتەوە، شیعر هیچ كات پشتی بەئەزموون و سەرچاوەی تر نەبەستووە، وەكو لەپاشاندا بۆمان دەردەكەوێت كەئەم بەدەربوونە لەكات هەروەها بەسەر بیرە بنەڕەتیەكانیشدا دەچەسپێت لەناو ئاین و ئەخلاقدا. بەڵگەش هەیە لەسەر ئەوەی كەهەموو ئاینێك لەسەرەتایدا سادەو بێ‌گەردبووە، بەلاّم لەدواییدا لەئەنجامی مومارەسەكردنیەوە تووشی شێوان و ئاڵۆزی

---

[15] لەزانستدا هەموو شتێك جیاوازە. زانست لەسەربەردەوامی ڕاوەستاوە، ئەگەر بێت و زانست ئامرازەكانی یادەوەری و نوسین لەخزمەتكردنیدا نەبێت بەبەردەوامی نەزانست دەبێت وەنەشارستانیەت پێشكەوتن پێكدێت لەتوانای بیركردنەوەو توانای بەردەوامی بوون.

هاتووە ( ئەم تیۆرە ئاینەکانی پێش یەکتاپەرستی دەگرێتەوە) هەروەك چۆن کەسانی نموونەی(لانج) و(شمیت) و(بروس) و (کوبرز) کەسانی تریش باسیان لێوەکردوە [16].

بەکورتی لەمەدا ئەوەمان بۆ دەردەکەوێت کە (مێژووی رۆشنبیری) چەمکێکی ناسازە، ئەوەیش کەدەکرێت بنوسرێتەوە، لەم بوارەدا تەنها کلێشەیەك بێت بۆ رووداوە رۆشنبیریەکان. (جاك رسلر) دەڵێت :(( لەوەتەی نەخش و پەیکەری فیرعەونەکان دۆزراونەتەوە، کەدەگەڕێتەوە بۆ چوار پێنج هەزار ساڵ، کەچی دانی پێدانراوە کەئەوانە بەهایەکی هونەری ڕاستەقینەیان هەیە، هەتا هەندێك لەهونەرەکانی ئەم سەردەمەیش بەهرەو کارە هونەریەکانیان لەوانەوە وەرگرتووە کەلەسەر دیواری گۆڕستانەکان نەخشێنراوون، هەروەها لەو پەیکەرە ناسکانەی کەلەقوڕی ووشکەوەبوو مەڕمەڕو ئاڵتوون دروستکراون. ئەم هونەرە لەچاخی (تحتمس الثاني) و( تحتمس الثالث) هەندێك جار وادەبیننەوە کەجۆرێك لە وردیو نەرمی تێدایە و، هەندێ جاریش جوان و بەهێزە ( وەکو لەچاخی خۆفۆدا دەردەکەوێت)، هەندێ جاری تریش واقیعیەو کەمتر ڕەمزیەتی پێوەدیارە ( هەروەکو لەماوەی حوکمڕانی ((ئەخناتون)) دا دیارە) [17].

ئەمەریکا کاتێك دۆزرایەوە – لەڕووی شارستانیەوە –پێنج هەزار ساڵ دواکەتووتر بوو لەجیهانی ئەوکاتە، لەو کاتەدا هێشتا نەگەیشتبووە ئەوەی بگاتە چاخی ئاسنین.[18] بەڵام ئەم پێوەرە زەمەنییە ناتوانرێت بچەسپێنرێت بەسەر هونەری ئەمەریکیدا، پەرستگای (بونامباك) کەوێنەکانی بەکۆنترین وێنە دەژمێرێن

---

[16] بڕوانە ئەندرۆلانگ Andrew Lang The Making of Religion( New York : AMS Press, 1968)

هەروەها( ولهام شمیت) Wilhelm Schmidt: The origin and Growth of Religion: Facts and Theories..( New York: Cooper Square publishers, 1972).

[17] بڕوانە :(جان ریسلر) Jacques Risler : La Civilisation arabe( n.p.,n. d.) .

[18] بڕوانە :( هـ.ج.ولز. H.G Wells :Short History of the world..( New York : pelican Books,1946).

لەکیشوەری ئەمەریکادا. بەچەندەها تابلۆی گەچینی جوان و ناسك ڕازاوەتەوە، لەساڵی ١٩٩٦ لەپاریس پێشانگایەك کرایەوە بۆ هونەری هەڵکۆڵینی (مایاوی) چەندەها تابلۆی جوانی تێدا نمایشکران کە دەوڵەمەندن بەرۆشنبیریەك ( کات) ڕێگەی نەداوە ببێتە شارستانیەت، یەکێك لەبینەرانی ئەو پێشانگایە بەم شێوەیە سەرنجی خۆی دەردەبڕێت: ئەم هونەرە جدی و ناسکە کە بوارە تەعبیریەکەی فراوانکردوە لەسادەییەکی سەرسوڕهێنەرەوە بۆ شێوازێکی ((باروکی)) پڕ لەزەخرەفە، هەتا ئەمڕۆش هەر بەنهێنی ماوەتەوە . هیچ کەسێکیش نەیتوانیوە ئەوەمان بۆ ڕوون بکاتەوە کەئەم هونەرە لەماوەی چاخی چوارەمدا لەدارستانەکانی (بیتن) Peten و(شیاباس) داChiapas چۆن پەیدا بووەو سەری هەڵداوە. هونەرێکە لەناوچەیەکدا پێگەیشتووە کەپڕیەتی لەمەڵبەندی بەهەیبەت بۆ مومارەسەکردنی دروشمە ئاینیەکان، چەندین پەرستگا بونیادنراون لەسەر ئەهرامەکان و بەپەیکەری نەخشێنراو و نوسینی هیرۆگلافی ڕازێنراونەتەوە. پێشانگای پاریس بۆ پەیکەرەکانی (المایا) پێکهاتووە لەهەندێ نموونەی جوان : نەخش و نیگاری وورد و قەشەنگ، پەیکەری بچووك لەبەردی ڕەق، دەمامکی لەمەڕمەڕ دروستکراو وەکو ئەوەی کەهەموو شتەکان بیانەوێت نامەیەکمان لەڕابردووەوە پێبگەیەنن... دەتوانین دوو ئاڕاستەی تێدا ببینینەوە کەخەریکە دژبەیەك بوەستنەوە لەهونەری هەڵکۆڵین لای (مایا): ئاڕاستەی یەکەم گرنگی داوە بەنەخش و نیگاری وورد وکلێشەی قەشەنگ و جوان و پایەی بەردینی ڕازێنراوە بەنەخش و نیگاری یادهێنەرەوە، دووەم، گرنگی بەپەیکەری سەر و دەم و چاو داوە. لەئاڕاستەی یەکەمدا، دەبینین هونەری سروتە ئاینیەکان بونیادنراون لەسەر بنەڕەتی کۆمەڵێکی تەواو لەنەریتە (تقالید) کان...شێوازی هونەری لەم ئاڕاستەیەدا ناسازێت ناسازیەکی تەواو لەگەڵ ئەوپەڕی ئەو سادەییەی کەوا سەرەکانی پێ جیادەکرێتەوە، بەتایبەتی ئەوانەی لەمەڕمەڕی (صناعی) دروستکراون، کەدەمامکێکن لەهەمانکاتدا هەم ئازارو هەم سەکینەتیشی تێدا دەبینیەوە یاخود هەردوو حاڵەتەکەی تێدا ڕەچاودەکەیت،وە واقعیەت تا ئاستێکی دوور تێدەپەڕێنێت... بەڵام وادەردەکەوێت کەوێنەی سیماو دەموچاوبن کۆمەڵێك کەس بن

**هەروەها لەو کۆمەڵەیەدا وێنەی دوو سەر هەڵکۆڵراوە کەجیادەکرێنەوە لەوانی تر زیاتر بەو ڕەگەز کاریگەریانەی تیایاندایە، هەردووکیان لەسەرشێوازی (بارۆکی) هەڵکۆڵراون، نەغمەیەکی زیندوومان پێدەگەیەنن لەناو ئەو کۆمەڵەیەدا. کەتاک و بیٚهاوتان لەجوانیدا.**[19]

**((نیچە)) پیٚی وایە، دراماو تراژیدیای (هیلینی)نمایشی گەورەترین دەسکەوتەکان دەکەن لەهونەردا، ڕۆشنبیری مرۆڤایەتی لەبەرزترین وێنەدا دەتوانین بیگێڕینەوە تەنها بۆ رۆشنبیری هیلینی.**[20] **لەشاعیرانی سەردەمیش کەسیان نەگەیشتونەتە گەورەیی(هۆمیرۆس) یان تراژیدیا کلاسیکیەکانی (گریك).**[21] **ڕازێکی شاراوەیە : لەو ماوەیەدا شارستانیەت تووشی دابەزین دەبێتەوە، هونەر خۆی لەچڵەپۆپەدا دەبینێتەوە. بەبۆچوونی( هیگڵ)) یۆنانی کۆن چاخی زێڕینی فەلسەفە بووە.**[22]

---

[19] وەرگیراوە لەنوسینێکدا لەسەر ئەو پێشانگایەی کەباسمانکرد لەپاریس و لەگۆڤاری( Nouvel observateur) دابلاوکراوەتەوە.

[20] بڕوانە : یەکەم کارەکانی(( نیشتە)) : Friedrich Wilhelm Nietzsche: The Birth of Tragedy From the Spirit of Music and the Genealogy of Morals: An Attack, trans. Francis Golffing ( Garden City, NY: Doubleday , 1956)

هەروەها(مارکس)یش قسەیەکی لەم جۆرەی هەیە لەبارەی پارچە هونەریە کۆنەکان وەپیٚی وایە ئەوانە نمایشی (( نموونە و پێوەرانێك دەکەن ناتوانرێت پیٚیان بگەیت))، لێرە دا وادەردەکەوێت کەوا( مارکس)کاریگەری ئەو پارچە هونەریانە وای لێکردوە نەی توانیوە لەمانای حەقیقی قسەکانی خۆی تیٚبگات، ئایا رۆشنبیری ڕەنگ دانەوە ی شارستانیەت و سەرخانی ئەو نیە ؟ باشە ئەگەر وایە،( ئەوا چۆن دەکرێت یان دەبێت لەبارەی( ئەو نمونانەوە کەناکرێت پیٚیان بگەین) بدوێین، لەکاتێکدا ئەو نمونانە کۆمەڵگەیەك بەرهەمی هێنا ون کەوا کۆیلەیان هەبوە !؟

[21] بڕوانە :(( ئەندیە مۆروا)) Andre Maurois: The Art of Writing , trans..(New York : Dutton, 1960.)

[22] بڕوانە(( هیگڵ)) : George W . F Hegel: Lectures On The History of Philosophy, trans New York : Humanities Press, 1966))....

((رۆجر كايلوس)) نووسيويەتى (( بەنسبەت فەلسەفەوە هەميشە ڕەسەنە -جگە لەمنيش كەسانى تريش گەيشتونەتە ئەنجامێكى دياريكراو ئەويش ئەوەيە، فەلسەفە لەپاش ئەفلاتونەوە هيچ پێشكەوتنێكى بەخۆيەوە نەبينيوە، لەوانەيە هۆى ئەمەيش بگەڕێتەوە بۆ ئەو حەقيقەتەى سروشتى هونەر خۆى كەبەردەوامى نىيە و لەسەر بەردەوامى نەوەستاوە، بەڵكو هەميشە لەتازەوە دەست پىدەكاتەوە.[٢٣]

نوسينە ئەخلاقيەكانى(( شيسپرون)) هەتاوەكوئەمرۆيش بەكەڵك دێن، لەكاتێكدا ئەو نوسينانەى كەباسى ڕێكخستنى كرێكاران و ڕژێمى وڵات دەكەن چەند بابەتێكن پەيوەنديان بەڕەوت و شێوازێكى شارستانى ئەو سەردەمەوە هەيە - تووشى لێك دابڕانێكى مێژوويى هاتووە.[٢٤]

كتێبێك هەيە هى نوسەرێكى ڕۆمانى نەناسراوە بەناونيشانى ((De Rebus bellicis كە پێكهاتوە لەهەندێ وێنەى چەكە سەربازيەكان. ئەم كتێبە لەئێستادا تەنها نرخە مێژوويەكەى ماوەتەوە، بەڵام ناتوانين هەمان ئەم قسەيەش دووپات بكەينەوە لەبارەى كتێبى ((سنيكا)) بەناونيشانى ((لەبەختەوەريدا)) ياخود بسەپێنين بەسەر شيعرەكانى((فرجيل))دا.

نموونەى تريشمان هەيە وەكو ئالەتى( الهارب)كە( ئالەتێكى مۆسيقيە) يان ئالەتێكى هاوشێوەى كەڕاستەوخۆ لەپێشى ئەمەوەيە ودەگەڕێتەوە بۆ هەزارەى سێهەمى پێش

---

[٢٣] بڕوانە (( رۆجو كايلوس)) : Roger Cailois and Custave Edmond Van Grunebaum , The Dream and Human Society(Berkley: Univ- California Press, 1966)

ئەم كتێبەدانراوە لەسەر كارەكانى كۆنگرەيەك لەژێرناوى(( خەون و كۆمەڵگەى مرۆڤايەتى)) كەوا سەنتەرى ڕۆژهەڵاتى نزيك لەزانكۆى كاليفۆرنيا لەخۆى گرتبووە ئامادەى كردبوو( لە ١٧- ٢٣يۆنيۆ ١٩٦٢).

[٢٤] بڕوانە :(( ماركس تليوس شيپرون)) : Marcus Tulius Ciceron: De finibus Bonorum et malorum, trans..(London: W. Heinemenn, 1914)., and idem, De senectute, de amicitia, de. divinatione, trans..( London: W. Heinemann, 1914) .

زایین، هەروەها کۆمەڵێك چامەی ژاپۆنی هەیە بەناونیشانی((ماینۆشۆ)) Manyoshu، کە پێکهاتوە لەهەزار قەصیدە ((زۆربەیان لەجۆری هۆنراوەی گۆرانین)) هەتا ئەمڕۆیش بەیەکێك لەهەرە جوانترین شیعرە جیهانیەکان دادەنرێت.[25]

لەچاخی دەیەمی زاینی (دڵیتاریکی و شەوەزەنگ)دا واڕوویدا کەوا هونەر بگاتە ڕادەی کامڵبوونی، جوانترین و داهێنانەترین کارە هونەریەکان کەلەوسەردەمەدا ئەنجامدراون لەڕادەیەکدان کەهیچ جوانی و داهێنانێکی تر ناتوانێت پێیان بگات..(ئەو لوتکە چیاییە بەرزو بڵندانە کە لەناوەڕاستی کۆمەڵێك خانووی بچکۆلەداجێگیربوون.[26]

شانۆگەریە تراژیدیەکانی((سوفوکلیس)) و(( ئەسخیلوس))، دەکرێت لەهەرچاخێك لەچاخەکاندا بتەوێت دایبنێیت و بگونجێت لەگەڵیدا، هیچ شتێکی ناوێت کەبگۆڕێت جگە لەجلو بەرگی ئەکتەرەکان نەبێت.

((یۆرپیدۆس)) Euripides شانۆنامەیەکی نووسی بەناونیشانی((ئافرەتانی تروجان))، پاشان سارتەریش بەهەمان ناونیشان شانۆنامەیەکی تری نووسی. بەم شێوەیە لەچوارچێوەی هونەردا دوو هونەرمەند دەتوانن لەیەك بەرهەمدا بەشداربن، کەزیاتر لەبیست سەدە لەیەکەوە دوورن، دەتوانن دوو نووسەری هاوبەش بن لەیەك

[25] بڕوانە(( مانیو شو)) : The Mnyoshu: The Nippon Gakujutsu Shinkokai : translation of One Thousand Poems with the Texts in Romaji..( London : Columbia University Press, 1965)

[26] مێژوو نوسان چاخی دەیەمی زاینی دادەنێن بەچاخی تاریکی و بەربەریەت وەکو چاخی شەشەم، هۆی ئەمەیش دەگەڕێتەوە بۆئەوەی کەئەمان مەسەلەکە لەگۆشەنیگای مێژووی سیاسیەوە سەیری دەکەن و وەری دەگرن، بەڵام ئەگەر ئەوکتێبەمان خوێندەوەکە( پوشکین) ناوی دەبات بەکتێبی هونەر ئەوا بۆچونێکی تری پێچەوانەی ئەمە مان بۆ دروست دەبێت، وەبەپێچەوانەی هەموو ئەوەی چاوەڕوانی دەکەین ئەوا چاخی دەیەم توانیویەتی کاری هونەریوا دابهێنێت کەلەنایابی و جوانیوسەرکەوتن و تەکنیکیدا یەکسان بێت لەگەڵ کارە هونەریەکانی هەرچاخێکیتردا.. بەڵکو ژمارەی ئەو پارچە هونەریانە لەوسەردەمەدا مایەی سەر سوڕمانن : بڕوانە(( کنیپ کلارك)) لەکتێبەکەیدا. Civilization..P. 34.

کاری هونەری‌دا، بەو شێوەیە لەبارەیانەوە بنوسین :(ئافرەتانی تروجان).[27] لەنوسینی ((یۆربیدۆس)) و((سارتەر)). بەلاّم ئەمە لەزانستدا جی‌بەجیّ نابێت. بۆ نمونە چی ماوەتەوە بۆمان لەسروشتناسی (ئەرستۆ)، یان گەردووناسی((بتلّموس))، یان پزیشکناسی(( گالینۆس)) ؟(( برتراند رسل)) باس لەدوو کار دەکات لەکارەکانی ئەرستۆ لەبواری زانستدا، ئەوانیش کتێبی ((فیزیا)) و (( ئاسمانەکان))، دەلّێت : لەژێر رۆشنایی زانستی تازەدا یەك ووشە نی‌یە لەم دووکتێبەدا ئەمرۆ بەراست دابنرێت.[28]

بۆ نموونە لەکتێبی ((ئاسمانەکان)) ((ئەرستۆ)) ئەوەمان بۆ شیدەکاتەوە هەموو شتەکان کەدەکەونە ژێر مانگەوە ملکەچی ژیان و مردن دەبن، لەکاتێکدا هەموو شتێك بکەوێتە سەروو مانگەوە لەدایك نابێت و لەناویش ناچێت (هەتاهەتایە). یان تەفسیری (ئەرستۆ) بۆ هێزی راکێشان کەدەلّێت : هەموو شتێك (بارێکی سروشتی) خۆی هەیە وە( بارەکەی تر وەرگیراوە بۆی)) ، کاتێك بەردێك دەکەوێتە خوارەوە هەولّدەدات بارەکەی خۆی وەربگرێتەوە کەئەویش بریتیە لەئاستی زەویەکە[29]. ئایائەم تیۆرە ئەتوانێت بوەستێت لەبەرامبەر تیۆری (نیوتن)دا لەبارەی (هێزی راکێشانەوە) ؟

هونەر لەناوچە دواکەوتوەکانەوە بەرەو ناوچە پێشکەوتوەکان دەروات لەجیهاندا، لەرۆژهەلاّتەوە دەچێت بۆ رۆژئاوا، یان لەباشورەوە بۆ باکور. بەلاّم زانست بەپێچەوانەی ئەمەوەیە. شتەکان بەشێوەیەکی عادەتی لەناوچەکانی پەستانی بەرزەوە دەجولّێن بەرەو ناوچەکانی پەستانی نزم پاشان دەبینین مۆسیقای رۆژهەلاّتی و،

---

[27] بروانە(( ئافرەتانی تروجان)) The Trojan Women , Adopted by Jean- Paul Sarter, trans.. .(New York: Knopf, 1967)

[28] بروانە(( برتراند رسل)) Bertrand Russell : A History of Western Philosophy.

[29] بروانە :(( ئەرستۆ)) Aristotle: On the Heavens, trans…(London: W. Heinemenn, n. . d)

هەروەها مۆسیقا سەماییەکانی هیندۆس و سەما ئەفریقیەکان و هونەرەکانی دورگەی ئۆقیانوسە خەریکە دەچنە ناوجەرگەی ئەوروپاوە.[٣٠]

هونەری (( الاقیانوسە)) کەناوچەیەکە دادەنرێت بەدواکەوتووترین ناوچە لەجیهاندا، بەلام لەرووی هونەریەوە بەرهەمەکانی لەنێو مۆزەخانەکانی ئەوروپاو ئەمەریکادا جێگای خۆیانکردۆتەوە شان بەشانی ئەو پارچەو بەرهەمە هونەریانە کەهی ئەوناوچانەن بەپێشکەوتوو دادەنرێن لەجیهاندا. شارستانیەتی رۆژئاوا تەواو پارێزراو نیەو دژ بەبلاوبونەوەی ئەم هونەرە رەسەنە دەستەوسان ماوەتەوە. دۆزینەوەی هونەری ئەفەریقی کاریگەری هەبوو پەرەسەندنی هونەری ئەوروپی و ئەمەریکی نویدا . تا رادەیەك . دەتوانرێت دابنرێ بەسەرچاوەیەك لەسەرچاوەکانی بزاوتی شۆرشگێری لەهونەری رۆژئاوایدا. لەهەمانکاتدا، ناتوانین بەراوردێکی جدی بکەین لەنێوان ئەوروپاو ئەفریقادا لەو شتانەدا کەپەیوەندی هەیە بەزانست و ئابوری و تەکنەلۆژیاو رێکخستنەوە . ئەمە بەراوردێکە بابەتی نییە.(( ئیلی فور)) دەلێت : دەمامکێکی ئەفریقی لەکەناری عاجدا وەکو تابلۆیەکی گەچین وایە کەلەسەقفی

---

[٣٠] ئەم چەند کۆیلەیەش لەخوارەوەدا لەگەشتێکدا بۆ ئەفەریقا ئاماژە بەهەمان ئەم بیرۆکەیە دەکەن: ((بەناوبانگترین پێشانگا هونەریەکان لەرابردودا وادادەنرا کەباشترین ئەو شتانەی کەنمایش کراون ئەوکارە– هونەریانەنن کەلەسەر داری ئەبنوس هەلکۆلراون لەلایەن تایفەی( ڤاکوندی) لە(تەنزانیا) کەلەژێر ئەو خانوە سادەوساکارانەدا دەژین کەلەگەلا و پرچی قامیش دروست کراون بەدرێژای ئەو رێگەیەی دەروات بەرەو( دار السلام)، بەشێوەیەکی دامێنەرانەی وا دروستی دەکەن کەلەوەپێش نەبوویێت. ئەو هونەرمەندانە لەپەیکەرە ئەبنۆسیەکانیاندا پەرچی ئەو ململانێ یە ئەکەنەوەکە لەنێوان خەیر و شەرِدایە، وەئەو پەیوەندییە توندو تۆلەی نێوان ژیان و مردن و، خۆشی وناخۆشی، پێکدادان و پێکەوەگونجان ...هاوولاتیەکانیتری خەلکی تەنزانیا رێزێکی زۆر دادەنێن بۆئەم تایفەیە بەهۆی ئەو هونەرەیانەوە، وەبەهۆی ئەو بروایانەیانەوە کەلەعەقلیاندا جێگیر بووە بەوەی کەتایفەی(( ڤاکوندی)) خاوەنی ئەو پیشە بەهەیبەت و سامدارە و ئەوهێزەن کەجادوە پێشینیەکان هەیان بووە.

کەنیسەی (( سکتیتن))دا نەخشێنراوە هەمان هەستی سەرسوڕمان لەدەروناندا دروست دەکات.[٣١]

ڤیستیڤاڵی نێودەوڵەتی بۆ هونەری ئەفریقی - کەلەساڵی ١٩٦٦لە (داکار) گیرا . ڕووداوێکی تاك و بێوێنە بوو لەبواری ڕۆشنبیریدا. لەهەمانکاتدا، پێشانگای پیشەسازی و بازرگانی ئەفریقی هەتا شایەنی ئەوە نەبوو بچوکترین گرنگی پێ بدرێت و بۆی بڕوانرێت. ئەگەر ئەفەریقا دواکەوتووبێت لەتێڕوانینی زانست و تەکنەلۆژیاوە، ئەوا لەبواری هونەردا هیچ کاتێك بەو شێوەیە نییە. هونەر ئیعتراف بە(دواکەتوویی) و ( پێش کەوتوویی) ناکات. ئەفریقای ڕەش هێزێکی گەورەو مەزنە لەبواری مۆسیقای فۆلکلۆری و هونەرو سەمادا. ڕەنگە دارستانەکانی (ئیریانی ڕۆژئاوا) چاکترین مۆزەخانەی سروشتی پارێزراوبێت بۆ ڕۆشنبیری مرۆڤایەتی( لەپێش مێژووە).

شارستانیەت لەو شوێنەدا هیچ هەنگاوێکی نەناوە لەدوای چەرخی بەردینەوە، بەڵام بابزانین ڕەوتی ڕۆشنبیری تێدا چۆنە ؟ وەڵامی ئەم پرسیارە کەسێك دەمانداتەوە کەخۆی زیاتر لە(٢٠) ساڵ لەویٚ ژیانی بەسەربردووە، دەڵێت :(هەستکردن بەجوانی زۆر بەهێزە لەنێوان ئەو کەسە سەرەتاییانەدا، کارە هونەریەکان خاوەنی بایەخێکی تایبەتین. چەند کتێبێك لەبارەیەوە دانراوە بەڵام نەیانتوانیوە بایەخ و حەقیقەتی تەواوی ئەم کارە هونەریانە دەربخەن کەهەیانە لەهەمەجۆری و دەوڵەمەندیی دا. جۆرەها پەیکەری جوان دەبینیت کەلەبەرد و تەختە دروست کراون هەروەها ئەو وێنە و نەخشەکاری و پەیکەرە بچوکانە دەبینیت کەخاوەنی جوانیەکی سەرنج ڕاکێشن. بەڵام سەماکانیان و شێوازی جوڵانەوەیان لەناو ئەو جلوبەرگانەیاندا کەلەشێوەیەکی واجواندا نەخشێنراون و ڕێکخراون نمایشی دیمەنێك دەکەن کەلەسەروی بڕوا پێکردنەوەیە).

---

[٣١] بڕوانە :(( ئیلی فور)) Elie Faure: History of Art, trans. Walter Pach, Vol.5 : The Spirits of the Forms(London : Harper and Brothers, 1930).

**کەواتە ئایا بۆمان هەیە بڵێین : زانایان تەنها ئینتیمایان بۆ چاخی خۆیان هەیە، بەڵام شاعیران و هونەرمەندان بۆ هەموو چاخ و سەردەمێك ؟**

# ئەخلاق و مێژوو

**بابەتی ڕۆشنبیری، بابەتێکی نەگۆڕە ئەویش ئەوەیە بۆچی ئەژین ؟ بەڵام شارستانیەت بریتیە لە پێشکەوتنێکی بەردەوام و پەیوەستە بەپرسیارێکی ترەوە ئەویش ئەوەیە : چۆن بژین ؟ یەکەمیان پرسیارێکە لەبارەی مانای ژیانەوە، دوهەمیشیان لەبارەی چۆنیەتی ئەم ژیانەوەیە. دەتوانین شارستانیەت بشوبهێنین بەهێڵێك کەبەردەوام لەبەرزبونەوەدایە، هەر لەدۆزینەوەی ئاگرەوە، پاشان ئاشی ئاوی، ئاسن، نوسین و ئامێر و، هەتا ووزەی ئەتۆمی و گەشتی ناو فەزاوە. بەڵام ڕۆشنبیری، لەگەڕانێکی هەمیشەیی و بەردەوامدایە دەگەڕێتەوە بۆ دواوەو پاشان لەنوێوە دەست پێدەکاتەوە. مرۆڤ وەکو بابەتێك بۆ ڕۆشنبیری بەهەڵە (نمطي) و کردارە چاکەکانیەوە و گازندەو گوناهەکانیەوە، هەموو ئەوشتانەی کەبوونە( جوانی) یەکەی پێك دەهێنن، بەڵگەن لەسەر ئەوئەولەویەتە بەلاکە، دەتوانین بڵێین : خەسڵەتێکی نەگۆڕاوی هەیە و قابیلی گۆڕان نی‌یە.**

**هەموو کێشەو گیروگرفتەکان کەلەئەمڕۆدا ناسراون لەپێش هەزار ساڵیشەوە لەئەخلاقدا بوونیان هەبووەو ناسراو بوون. هەموو مامۆستایانی بەشەریەت، ئیتر ئەگەر پێغەمبەر بووبن، وەکو موسا و عیساو محمد ﴿ سلاوی خوایان لەسەر بێت ﴾ وەیا پێغەمبەر نەبووبن وەکو ﴿ کۆنفۆشیوس ﴾ و ﴿جوتا مابوزا ﴾ و( سوکرات ﴾ و ﴿کانت ﴾ و ﴿ تۆلستۆی ﴾ و ﴿ مارتن پۆپر﴾ کەنوێنەریی ماوەیەکی درێژ لەزەمەنیان کردوە هەر لەسەدەی شەشەمی پێش زاینەوە هەتا ئەم سەردەمەی ئێستا( مارتن بوبر لەساڵی ١٩٦٥دا کۆچی دوایی کردوە) هەموویان بەشەریەتیان فێری هەمان ئەخلاق**

کردوه. حەقیقەتە ئەخلاقیەکان حەقیقەتی نەگۆڕن [٣٢] هەربەمەیشە کە جیادەبنەوە لەبنەماو سیستەمە کۆمەلاّیەتیەکان و شێوازەکانی بەرهەم هێنان.

هۆی ئەمەیش دەگەڕێتەوە بۆ ئەو( لغزە مرۆڤایەتیەی) کەهەر لەگەلْ ساتەوەختی بەدیهێناندا ئەویش پەیدابوە، ئەو(پێشەکیە ئاسمانیە) یا ئەو کردارەی کەپێش هەموو مێژووی مرۆڤایەتی کەوتووە، ئەمەیش لەتوانای عەقلْ و زانست و ئەزموون دا نیە کەبتوانن یارمەتیمان بدەن بۆ نزیکبونەوەو باشتر تێگەیشتن لەهەموو ئەمانە. حەزرەتی عیسا ﴿درودی خوای لەسەر بێت﴾ هێشتا منداڵ بوو کەزمانی بەووتنی حەقیقەت پژا، کاتێکیش تەمەنی گەیشتە سی ساڵی و حوکمی لەخاچ دانی درا لەبارەی ئەو حەقیقەتەوە شتێکی زۆر کەم نەبێت زیاتری نەوت، هیچ پێویستیەکی بەمەعریفە و ئەزموون نەبوو بۆ بەدەستهێنان و گەیشتن بەحەقیقەتە گەورەکان لەبارەی خواو مرۆڤەوە. چونکە ئەم حەقیقەتانە ناکرێت لەڕێگەی مەعریفە و ئەزموونە پێیان بگەیت. ئایا ئەمە هەر ئەو حەقیقەتانە نین کەلەلای فەرمانڕەوایان و فێرخوازان پەنهانن و کەچی لەلای کەسانی ساکارو سادە روون و ئاشکران؟ [٣٣] ئەحکامە ئەخلاقیە جەوهەریەکان بەکاریگەری شوێن وکات یان بارودۆخە کۆمەلاّیەتیەکان گۆڕانکاریان بەسەردا نایەت، بەپێچەوانەی ئەوەو کەدەیبینین لەسیستەمە کۆمەلاّیەتی و سیاسیەکاندا لەو جیاوازیە گەورانە کەلە پلەکانی پەرەسەندندا هەیە.. هەتا لەهێما ئاینی و بیروباوەڕەیەکانیشدا . دەبینین لێکچونێکی سەیر هەیە لەبنەما ئەخلاقیەکاندا لەهەموو جێگایەکی جیهاندا. (( ئیبکتیۆس)) و((مارکوس ئۆرلیوس)) یەکێکیان بەندەیە و ئەویتریشیان پادشایە، کەچی هەردووکیان سەبارەت بەتەعالیمە ئەخلاقیەکان بەیەك شێوە بۆ خەلْك دواون دەتوانین بلێین، هەمان ووشەیشیان لە

---

[٣٢] لەجیهانی واقیع( دەرەکی) دا هەموو شتێك جیاوازە : وە گۆڕان بریتیە لەیاسای ژیانی ئابووری. بروانە : ( جون کینیث جالبرایپ) - John Kenneth Galbraith, The New Industrial State( Boston: Houghton Miffin 1967)

[٣٣] بروانە ئینجیلی لۆقا : ١٠-٢١.

ئامۆژگاریەکانیاندا بەکارهێناوە [٣٤]. ئەو جیاوازیانەی کەهەیە سەبارەت بەتێگەیشتن لەخەیر و شەڕ، ڕێ پێدراوو یاساغکراو، تەنها لەمەسەلە کەم گرنگەکاندا بەرچاومان دەکەوێت. ئەو نموونانەیش کەبۆمان دەهێنرێتەوە لەبارەی پشت بەستن وکاریگەری بوونی پێوەرە ئەخلاقیەکان بەو بارودۆخە مێژوویانەی کەپێیدا تێپەڕیوە، بەهیچ شێوەیەك پەیوەندی نی‌یە بەبنەما سەرەکیەکانەوە لەئەخلاقدا بەڵکو تەنها پەیوەندی بە ئەخلاقیات و هەڵسوکەوتە ڕەسمیەکانەوە هەیە، [٣٥] بەڵام لەمەسەلە زۆرگرنگەکاندا، دەتوانین کە هاوشێوەیی وهاوڕێکیەکی تەواو ببینینەوە [٣٦].

ئەم تەئکیدکردنەوەیە زیاتر لەلای (( کانت)) دێتەدی لەبنەما بەناوبانگەکەیدا (پابەند بوونی ڕەها) کەئەمە بنەمایەکە هەروەها لەلای بیریارەکۆنەکانیش بوونی هەبووە.((کانت)) بۆ یەکەمجار لەکتێبەکەیدا (بنەماکانی میتافیزیکای ئەخلاق)) دا پێناسەی کردوەو دەڵێت : ( تەنها بەو شێوە کاربکە بەپێی بنەمایەك کەدەتەوێت ببێتە یاسایەکی گشتی).

---

[٣٤] سەرەڕای ئەوەی خەڵك بەشێوەیەکی جیاواز هەریەکە سەبارەت بەماهیەتی ئولوهیەت دەدوێن، بەڵام سەرەڕای ئەوەیش هەموویان دەزانن کەخوا چی دەوێت لێیان بیکەن و ئەنجامی بدەن بڕوانە تولستوی Leo Tolstoy: Thoughtson God , the Complete Works.. Vol.16( New York: AMS press, 1968).

[٣٥] بڕوانە :( مارکو اورلیوس)): Marcus Antonius Aurelius : Meditatios: trans.( London: Dent, 1967). and Titus Lucretius Carus :The Discourses of Epictetus, trans..( Chicago : Encyclopaedia Britanica ,1955)

[٣٦] هەندێ لەوبنەمایانە ئەمانە دەگرێتەوە : ڕاستی بڵێ، دورکەرەوە لەخراپە، سادەو ساکاربە، بەهەمان شێوەی خۆت سەیری خەڵکی بکە، تێکۆشە بۆ ئازادی، بەرنگاری لەمافی خۆت و مافی کەسانی تریکە، هەوڵ بدەبۆ بەدەست هێنانی نان و گوزەران، ڕێز لەکاری کەسانی تر بگرە، ڕێزی باوکت و گەورەساڵان بگرە، پارێزگاری لەپەیمان و پابەند بونەکانت بکە، داڵدەی لاوان و بێ نەواکان بدە، سۆز و خۆشەویستی بنوێنە لەبەرامبەر خەڵکیدا، دڵخۆش مەبە بەکۆست وناڕەحەتیەکانی خەڵك، ئیرەیی مەبە بەناز نیعمەتی خەڵکی، دوور کەرەوە لەخۆبایی بوون و خۆ بەگەورەزانین، لەکاتی نەخۆشیدا بەئارام بە هەڵ مەزنێە بەدەسەڵاتداراندا، هەژاران مەچەوسێنەرەوە، ڕێزی خەڵکی مەگرە لەبەرئەوەی ناودارو دەوڵەمەند و خانەدانە، باخاوەنی ڕاوبۆچونێکی تایبەت بەخۆت بیت، لەکاتی ناخۆشیەکاندا هاوسەنگیت ڕاگرە، خۆپەرست مەبە ...هتد ئایائەم بنەمایانە گۆڕانکاریان بەسەردادێت بەپێی ڕەوشەکانی سیستمی ئابووری ؟

پاشان لەکتێبێکی تریدا بەناوی (( نقد العقل الخالص)) بەم شێوەیە پێناسەی دەکات و دەڵێت: بەشێوازێك كاربكە بەپێی ئەو بنەمایەی كەویستووتە شیاوبێت بۆ ئەوەی ببێتە بنەمایەك بۆ دارشتنی یاسایەكی گشتی.[٣٧] كاتێك ((تالیس)) كەیەكێكە لەحەوت حوكمڕانەكانی گریك (لەساڵی ٦٢٤پ ز لەدایك بووە) پرسیاری لێكرا دەربارەی ئەوەی چۆن دەتوانین ژیانێكی زیاتر دامەزراوتر فەراهەم بهێنین ؟ لەوەڵامدا ووتی :( كاتێك كارێك نەكەین كەئەو كارە لەلای خەڵكانی تر بێزراوو نەشیاوبێت)[٣٨].(بیتاكۆس) كەحەكیمێكی ترە جەخت لەسەر هەمان ئەم بنەمایە دەكاتەوە بەم شێوەیە دەڵێت :(كارێك نەكەین كەخەڵكانی‌دی لەسەركردنی سەرزەنشتكراون)[٣٩].

((شیپرون)) كەلە رۆمای كۆندا ژیاوە دەڵێت :( هەموو ئەو شتانە كەلەخەڵكی دەگریت لەسەركردنیان، پێویستە خۆیشت پارێز بكەیت لێیان و نەیانكەیت)[٤٠].

بەڵام بیریاری یەهودی( هیلیل). كەلەفەلەستیندا ژیاوە لەكاتێكی نزیك لەسەردەمی مەسیحەوە . كاتێك یەكێك لەبێباوەڕەكان پرسیاری لێ دەكات كەبەكورتی جەوهەری ئاینی بۆ ڕاڤە بكات، دەڵێت :( ئەوەی كەحەزناكەیت پێت بكرێت تۆیش بەهاوسێكەتی مەكە). تەورات لەكۆی هەموویدا لەم بنەمایەوە سەرچاوە دەگرێت ئەوەی تر كەدەمێنێتەوە ڕاڤەو لێكۆڵینەوەی ئەم بنەمایەیە. حیكمەتەكە هەمان شتە (كۆنفۆشیۆس) لەچین خەڵكی فێر دەكرد، كەهاوچەرخی بوزایە (فیساغورپ) :((ئەوەی نامەوێت بەخۆمی بكەم بەكەسانی تریشی ناكەم)) [٤٢]. ئەمە هەمان ئەو بنەمایەیە

---

[٣٧] بروانە(امانویل كانت ) Immanuel Kant: Foundations of the Metaphisics of Morals, trans… (Indianapolis: Babbs- Merrill, 1969), and idem,the (Chicago : 1955).Encyclopaedia Britanica ,,

[٣٨] بروانە(( دیوجینس اللایرپی)) Diogenes Laertius : Lives of Eminent philosophers, trans….(Londan: W.Heinemann, 1959),I.36

[٣٩] هەمان سەرچاوەی پێشوو.

[٤٠] بروانە(( شیپیرون)) Cicero: Di Finibus bonorum et malorum ….

٤١ بروانە :(( التلمود)) : (part Sabbath)) The Babylonian and Jerusalim Talmud , ) trans ….(Jerusalem :El, Am, 1965)

کەمەسیح ﴿ درودی خوای لێبێت ﴾ خستویەتیە ڕوو لەووتە بەناوبانگەکانیدا ((مامەڵەلەگەڵ کەسانی تردا بەو شێوەیە بکە کەحەزدەکەیت کەسانیتریش بەهەمان شێوە مامەڵەت لەگەڵدا بکەن)). [43]

---

٤٢ بڕوانە :(( لون یو)) : Lun J Yu: Thoughts And Talks of (Confucius( n. p. , n. d

[43] بڕوانە : ئینجیلی(( متی)) و(( لوقا)) .Matheur : 7: 2 and , Luke : 6: 31

# هونەرمەندو ئەزموون

لەژیانی هونەرمەندا پەرەسەندن نی‌یە، وەپەرەسەندن لەژیانی هونەرمەندیشدا نی‌یە، هەموو هونەرمەندێك هەمیشە لەنوێ وە دەست پێدەکاتەوە بەشێوەیەك وەکو ئەوەی کەهیچ کەسێکی تر لەپێشیەوە لەکاری ئەفراندندا پێشی نەکەوتبێت. هونەرمەند ئەزموونی خۆی نەبێت هی کەسێکی‌تر بەکارناهێنێت. بەڵام لەزانستدا، ئەوا ئەزمونی کەسانی ترو کۆبونەوەی ئەزمونەکان مەرجێکی سەرەکی و پێش وەختیە ئەزمونی کەسانی

تر کەبەکاردەهێنرێت لەهونەردا واتە لاسایی‌و دووبارەکردنەوەو ئەکادیمیەت، یان تەنها بەووشەیەك واتە مردنی هونەر.

((بیکاسۆ)) لەمومارەسەی وێنەکێشاندا، لەقۆناغەکانی هونەری تەکعیبی‌و تەکعیبی نوێ و، کاریگەری و سوریالی و، واقیعی نوێ‌دا تێپەڕیوە. لەگەڵ ئەمەیشدا ناتوانین باس لەپەرەسەندن و باشتربوون و گۆڕان لەکەماڵێکی کەمترەوە بەرەو کەماڵێکی زیاتر بکەین لەکارەکانیدا، ئەمەیش وەکو هەموو ڕەگەزەکانی تر لەناو ڕۆشنبیریدا، لێرەیشدا هەروەها درامای گەڕانی بەردەوام و سەرسامی بوونە. ئەم هونەرە ئەفرێنەرە ملکەچ نابێت بۆ ئەزموون یان بۆ مێژوو، ئەم خاسیەتە مرۆییانەی هونەر وامان لێدەکات کەچاوێك بەهەندێ حەقیقەتی گرنگدا بخشێنینەوە. لەزانستدا دەبینین زانستێك بۆ کەسانی گەورە و زانستێك بۆ منالان هەیە. چونکە لەبەرئەوەی تێگەیشتنی زانست و وەرگرتنی دەرەنجامەکانی و بەکارهێنانە کرداریەکانی پشت بە فێرکردن و تەمەن وئەزموون دەبەستێت، بەڵام لەهونەردا شتێکی وانی‌یە بەناوی مۆسیقا بۆ گەورەکان و مۆسیقا بۆ منالان. ئەو تاقی کردنەوانەی کەکرابوون لەسەر کارە مۆسیقیەکانی(( باخ))

و((موزار)) و((بتهۆڤن)) و((دبوسی)) و((شوپان)). دەریانخستبوو کەمنداڵانیش وەکو گەورەکان، یان ئەوەتا تێدەگەن لەمۆسیقای کلاسیکی یان تیّ ناگەن. کۆمەڵێك لەکارە بەناوبانگەکانی ((بتهۆڤن)) کەپێکهاتووە لە(٣٢) سووناتا - کەلەباشترین کارە هونەریەکان دادەنرێت لەمێژووی مۆسیقادا- بەکاردەهێنرێت وەکو ئامرازێك بۆ فێرکردنی((کۆنشرتۆ)) بۆ قوتابیە منداڵەکان، هەروەها لەهەمان کاتیشدا بەکار دەهێنرێت وەکو برگەی مۆسیقی کەمۆسیقیە جدیەکانی پیانۆ دەیژەنن. (( بیکاسۆ)) کاتێك دەستی بەوێنەکێشان کرد لەتەمەنی دوو ساڵاندا بوو هەتا پێش ئەوەیش کەبتوانێت بەباشی قسە بکات.((ئۆڤید)) باس لەشیعری شەش کێشی دەکرد لەکاتێکدا منالانی تری هاوتەمەنی تازە زمانیان بەقسەکردن دەپژا. (موزار) هەندێ تەئلیفاتە مۆسیقیەکانی لە( کۆنشرتۆ) لەکاتێکدا دانا هێشتا لەتەمەنی شەش ساڵاندا بوو. هونەر مەعریفە نیە بەڵکو بریتیە لەتێگەیشتن، بەڵام تێگەیشتن بەدڵ و خۆشەویستی و سادەیی ڕۆح. (زۆرێك جوتیارێك کاتێك لێدەبێتەوە لەئیشی ڕۆژانەی پارچەیەك تەختە دەگرێت بەدەستیەوەو وێنەی شتێکی لێ هەڵدەکۆڵێت، بۆ ئەمەیش پێویستی بەدەساڵ لەخوێندنی ئەکادیمیانە نیە بۆ ئەوەی فێری ئەم هونەرە ببێت. ئەمەوێت بڵێم هونەر ڕەخساوە بۆ هەموو مرۆڤێك ، بۆ ئەمەیش زیرەکیەکی دیاریکراو و فێرکردنێکی دیاریکراو زەرور نیە).[٤٤] جۆری ئەم بیرکردنەوەیەش (تۆلستۆی) و قوتابخانەکەیمان بەبیردەهێنێتەوە لە(یاسنایابۆلینا) کەڕاهاتبوو لەسەرئەوەی گفتوگۆی گەرم لەگەڵ منداڵاندا بکات لەسەر قوڵترین مەسەلە ئاینی و ئەخلاقیەکان.[٤٥]

---

[٤٤] بڕوانە(( ئەندریاس فرانزکی Andreas Franzke: Dubbuffet, trans :( New York: Abrams, 1981).

[٤٥](( لیو نیکولافیتش تولستوی)) موناقەشەی لەگەڵ منداڵاندا دەکرد لە( یاسنایا پولینا)دەربارەی گرنگترین ئەو گیروگرفتانەی لەژیانی مرۆڤایەتی‌دا، کەهەستاوە بەموناقەشەکردنیان لەگەڵ شوێن کەوتوەکانیدا. هەموو بیرۆکەیەك موناقەشەی دەکراو، چارەسەری دەکرا، وەباسی دەکراو، سادەدەکرایەوە پاشان لیونیکولافیتش دەینوسیەوەو بەشێوەیەکی گونجاو کەبەهەموو عەقڵێك بخوات. بڕوانە بیترۆڤ، تولستوی Petrov, Tolstoy( n. p. , n. d).

تێگەیشتنی هونەرو ئاین و ئەخلاق لەڕێگەی زیرەکی و لۆژیکەوە نایەت، بەڵکو لەڕێگەی ژیانی (جوانیة)یانەی مرۆڤەوە دەبێت. لێرەدا لۆژیکێك نی‌یە لەبەردەم لۆژیکێکی تردا، بەڵکو دڵ و ڕۆحێکە لەبەرامبەر دڵ و ڕۆحێکی تردا. مەبەست لەهێنانەوەی ئەو حەقیقەتانەی پێشەوە ئەوەیە ئەوەیە کەهەڵگەڕانەوەیەك لەتێگەیشتنماندا دروست بکات سەبارەت بە(پەرەسەندن) لەڕۆشنبیری مرۆڤایەتی‌دا. ڕۆشنبیری پەرەسەندنی تێدا نی‌یە، مرۆڤیش بریتییە لەڕەگەزی جێگیر لەمێژووی جیهاندا.

بەشی شەشەم

# دراماو تۆبیا

﴿تەنها یەك تۆبیا نییە، تێشیدا ئەو سوشیالیزمە زانستیەی بانگەشەی بۆ دەکرێت کە مامەڵە لەگەڵ گرفتی ئەخلاقیدا بکات، تۆبیا دوورترە لەوەی پێوەرەکانی خەیرو شەڕ بیگرێتەوە، بەڵکو هەموو شتێك تێیدا پلانرێژکراوە﴾

# کۆمەڵگەی تۆباوی

ئایا شەڕ لەناوەوە دێت.. لە قوڵاییە تاریکەکانی دەروونی مرۆڤەوە سەرهەڵدەدات، یاخود ئەو لە دەرەوە دێت.. لە بارودۆخە بابەتیەکانی ژیانی مرۆڤایەتیەوە؟ ئە م پرسیارە خەڵکی دابەش دەکات بۆ دوو دەستەی گەورە: باوەڕدارەکان و مادییەکان. باوەڕدارەکان پێیان وایە کە خەیرو شەڕ هەردوکیان لەناو مرۆڤدا هەن. هەر بۆیە لێرەشەوە، ئەمانە نکوڵی ناڕەحەتی دەکەن لەبەر ئەوەی ئاڕاستەکراوە بۆ دەرەوە، ئەمەیش جەنگێکە لەگەڵ (شەڕ)ێکی خەیاڵیدا کە بوونی نی‌یە. بەڵکو پێویستە ناڕەحەتی ئاراستەی دەرونی خۆمان بکەین لە شێوەی پەشیمانی یان زوهدو لەخۆگرتنەوەدا. جەخت کردنەوە لەسەر ئەو بیرۆکەیەی شەڕ بونێکی دەرەکی هەیە، هەروەها مرۆڤ دەبێتە خراپەکارو شەڕەنگێز، چونکە ئەو بارودۆخەی کە دەورەی داوە بارودۆخێکی خراپە.. ئەم جەخت کردنەوەیە لەسەر ئەوەی مرۆڤ بەرهەمی رەوش و بارودۆخە دەرەکیەکەیەتی، لە ڕوانگەی ئاینەوە دادەنرێت بە زۆرترین ئەو بیرۆکانەی هاتووە بەعەقڵی مرۆڤدا کە "ئیلحاد"ی و نامرۆیی بێت. ئەم بیرۆکەیە مرۆڤ بچوك دەکاتەوە بۆ تەنها شتێك.. بۆ خزمەتگوزارێکی بەفیڕۆچووی کۆمەڵە هێزێکی دەرەکی میکانیکی کوێر. "شەڕ لەناو مرۆڤدا" و "شەڕ لەژینگەی کۆمەڵایەتیدا"، دوو دەستەواژەی دژ بەیەکەن کەیەك ئەویتریان دور دەخاتەوە. ئەم دوانە هاوڕێکن لەگەڵ دوو دیاریدەی تردا کە لە نێوانیاندا ناکۆکی و پێکدادان هەیە ئەوانیش بریتین لە: دراما و تۆبیا[1] دراما رووداوێکە دەکەوێتە ناو دەرونی مرۆڤایەتیەوە، بەڵام تۆبیا، ڕوداوێکە دەکەوێتە ناو کۆمەڵگەی مرۆییەوە. دراما بەرزترین شێوەیەکە لەشێوەکانی بوونێکی مومکین لەم گەردونەدا، بەڵام تۆبیا، بریتیە لەخەونێك یان تێڕوانینێك بۆ بەهەشت لەسەر زەویدا(*). هیچ درامایەك لەناو تۆبیادا بوونی نیەو" پێچەوانەی ئەمەیش راستە کەهیچ تۆبیایەکیش لە دراماوە پەیدانەبووە. بەڵکو ئەمە پێکدادانێکە لەنێوان مرۆڤ و جیهاندا وە لەنێوان تاك و کۆمەڵگەدا [2].

لێرەدا با هەندێ لەوەی (ئەفلاتون) لە کۆمارەکەیدا وتوویەتی بخەمە روو**:

با بنەماکانی کۆمارەکە بهێنینە زەینی خۆمانەوە.. ئەم بنەمایانە بریتین لە پێداویستەکانمان.. بەڵام، چۆن کۆمارەکە هەموو ئەو پێداویستیانەمان بۆ فەراهەم دەکات؟

ئایا پێویست نیه کۆمەڵێك بەکشتوکاڵ کردنەوە خەریك بن، وە هەندێکی تریشیان لە بیناسازی و ڕستن و چنیندا کاربکەن.. هەموو کەس ـ لەپێناو ئەوانی تردا ـ هەڵدەسێت بە بەجێگەیاندنی ئەو پیشەیەی کە تەنها خۆی دەتوانێت رایپەڕێنێت.. لەسەر سەربازەکان پێویستە کە لەگەڵ دوژمنەکانیاندا ڕەق و توندوتیژ بن و لەگەڵ هاوەڵەکانیاندا نەرم و میهرەبان بن ـ بۆ ئەوەی ئەم خاسیەتانەیش ـ مەبەستم دڵ رەقی و میهرەبانیە ـ بەدەست بهێنن پێویستە لەسەریان لە هەمان کاتیشدا فەیلەسوف بن، بۆ ئەوەی بتوانن دوژمن و دۆستەکانیان لە یەکتر جیابکەنەوە. وە بۆ ئەوەی بتوانن پاسەوانی و پارێزگاریش لە وڵاتەکەیان بکەن پێویستە ئەم سەربازانە فێر بکرێن.. سەرەتایش لە فێرکرندا گرنگترین شتە تێدا.. زۆرجار وادەبێت کە چیرۆکێکی خەیاڵی بێت ئەو سەرەتایە، لەبەرئەوە، پێویستە لەسەر دەوڵەت کە چاودێری ئەو نوسەرانە بکات کە ئەو چیرۆکانە دەنووسن.. فەرمانڕەواکان مافی ئەوەیان هەیە کە درۆ بکەن لە پێناو بەرژەوەندی دەوڵەتدا. بەڵام ناکرێت رێگە بێجگە لە ئەوان بدرێت کە درۆ بکەن.. چونکە ژێردەستانیش دەبێت گوێڕایەڵی فەرمانڕەواکانیان بکەن، لەبەرئەوە، پێویستە هەر بەشێك لە کتێبەکە کە بەپێچەوانەی ئەمەوە دەڵێت لێی لابرێت. لەکاتێکدا دەبێت خواوەندەکان و پاڵەوانەکان وا وێنا بکرێن کەوا گەیشتوونەتە باڵاترین پلە لە نەجابەت.. هەروەها پێویستە هەموو ئاوازە مۆسقیە غەمگین و نەرم و تەمەڵەکان قەدەغە بکرێن و بگۆڕێن بەگۆرانی مەردانەو مارشە سەربازیەکان.. خواردنەوەی مەی قەدەغەیە.. پێویست ناکات هاوڵاتی نەخۆش بێت یان لە ژێر چارەسەری پزیشکیدا بێت، چونکە بەمە زیان بە دەوڵەت دەگەیەنێت. هاوڵاتی یان ئەوەتا دەبێت کاربکات، وە یان دەبێت بمرێت.. لەبەرئەوە خۆکوشتن باشترە بۆ کەسێك کە نەخۆشیەکەی درێژەی کێشا، یان مندالێکی نەخۆش لێ کەوتەوە.. هەروەها فێرکردن لە هەڵبژاردنی فەرمانڕەوایان و سەربازەکان و لە هەڵبژاردنی منالەکانیاندا یارمەتیدەر دەبێت. ئەگەر نەیشیانتوانی هەستن بەو کاروپیشیانە، پێویستە بگەڕێنەوە بۆ چینی بەرهەم هێنەکان. بەم شێوە سستمە لە فێرکردن نەوەی ئاییندە باشتر دەبێت لەم نەوەیەی کە لە پێشیەوە بووە، هەروەها توخم و رەگەزی باشترمان دەست دەکەوێت لە رووەك و گیانلەبەران لە رێگەی گەشە پێدانی رەگەزە هەڵبژێردراوەکان لێیانەوە..[٣].

میکانیزمی تۆبیا کامڵە بەڵام نامرۆییە. ئەگەر ئازادی بریتی بێت لە جەوهەری دراما، ئەوا سستم و هاوشێوەیی بریتین لە رەگەزی بنەڕەتی لە تۆبیادا.

لەسەرەتای چەرخی شانزەدا، "توماس مور" کتێبێکی بڵاوکردەوە -سەرەڕای بچوکی قەبارەکەی دادەنرا بە کتێبی سەردەم- بابەتەکەی بریتی بوو لە "دەوڵەتی میسالی لە دورگەیەکی تۆباویدا". بەشی دووەم لە کتێبەکەدا زیاتر بە گرنگ دادەنرێت، لێرەدا کورتەی ناوەڕۆکەکەی لەم چەند دێڕەی خوارەوەدا دەخەینە روو: دورگەی تۆبیا لە شێوەی نیوەی مانگدایە، دابەش دەبێت بۆ ٥٤ شاری گەورەی هاوشێوە لە قەبارەو شێوازی ژیاندا. شارەکان دەکەونە ناوەوەی ناوچە گوندنشینیەکانەوە، کە خانوو ئامرازەکانی کشتوکاڵیان تێدایە. کرێکارەکانی کشتوکاڵ رێکدەخرێن لەناو چەند کۆمەڵەیەکدا، هەر کۆمەڵەیەکیش پێکهاتووە لە ٤٠ ئەندام، لە سەرو هەر کۆمەڵەیەکیشەوە ژن و پیاوێك بۆ خزمەت گوزاری دادەنرێن، هەر کۆمەڵەیەکیش دوو کۆیلەی پێ دەدرێت. بیست ئەندام لە هەر کۆمەڵەیەك دەگەڕێنەوە بۆ شارە گەورەکان پاش ئەوەی دوو ساڵ بەسەر دەبەن لە زەویە کشتوکاڵیەکاندا. بیست کەسی تری نوێ لە شارەکە دەردەچن بۆ ئەوەی جێگەی ئەوان بگرنەوە بۆ ماوەی دوو ساڵی تر. بەو شێوەیە، کرێکارانی کشتوکاڵی بەشێوەیەکی هەمیشەیی نابێت. مریشکەکان بەبێ دایك هەڵدەهێنرێن لەناو جۆرێك لە جۆرەکانی دایەنگەدا. هەمو کەسێك ئەوپەڕی توانای خۆی دەخاتە گەڕ بۆ ئەوەی زیاد لە پێویست بەرهەم بهێنێت بۆ شارەکە، هەتا بتوانرێت زیادەی ئەو بەرهەمە کە هەیە دابەش بکرێت بەسەر شارەکانی تردا. لەکاتی دروێنەیشدا، زۆرترین ژمارەی هاوڵاتیان هاوکاری دەکەن بۆ ئەوەی کارەکە لە کەمترین ماوەدا جێبەجێ بکرێت. پایتەختەکەیش کە شاری "ئامورتو"یە دەکەوێتە سەر روبارێك لە نزیك دەریاکەوە. خاوەن سستمێکی پێشکەوتووە بۆ سەرچاوەکانی ئاو.. خانوەکانی تەواو پاکوخاوێنن و ریزکراون لە ریزی رێکوپێکدا لەملاولای رێگاکانەوە (شۆستەکانەوە). شەقامەکان هەموویان فراوانیان بە قەدەر یەکە (بە پانی ٣٠ پێ) خانووەکان دەرگایان پێوە نییە، چونکە موڵکی تایبەتیان تێدا نییە. هەموو دە ساڵ جارێکیش دانیشتوانەکان بەسستمی تیروپشك دەگۆڕێنن. هاوڵاتیەکان پارێزگاری لە باخچەکانیان دەکەن، وە هەر کۆمەڵەیەك لە خانووەکان پێشبڕکێ دەکەن لە گرنگی پێدان و چادێری باخچەکانیان، وە پێویستە لەسەر هەمووان، پیاوان و ژنان فێری پیشەیەکی دیاریکراوبن، لە سەرویشیانەوە پیشەی بیناسازیو ئاسنگەری و دارتاشی و چنینی خوری و کەتان. لەسەر هەموو خێزانێکە کە خۆی هەستێت بە ئامادە کردنی جل و بەرگەکانی، کە لەهەمان ئەو جل و بەرگانەیە لە هەموو شوێنێکی دورگەکەدا هەیە، بەڵام

ەنها بەپێی تەمەنی کەسەکە و هەروەها لە وەرزەکان و، لە ڕوی رەگەز و حاڵەتی ژن و
ێنخوازیەوە ئەو جلوبەرگانە جیاوازیان دەبێت. هەموو رۆڵەکانی ئەو دورگەی تۆبیایە شوێن
یشەکانی باوکیان دەکەون. پێویستە لە سەریان کە لە رۆژێکدا شەش کاتژمێر کاربکەن،
سێ کاتژمێر بەیانیان و سێ کاتژمێر پاش نیوەڕوان، لە نێوان ئەو دوو کاتەدا دوو کاتژمێر
ۆ حەسانەوەو خواردن دانراوە. کاتژمێر هەشتی شەو دەخەون، هەشت کاتژمێر دەخەون.
ەکاتی کارکردنیشدا جل و بەرگی لە چەرم دروستکراو لەبەردەکەن کە بۆماوەی حەوت
سالْ بەکاردەهێنرێت. لە هەموو شارێکیشدا شەش سەد خێزان نیشتەجێین، هەر
خێزانێکیش پێکهاتووە لە ١٠-١٦ ئەندام، کە یەکێك سەرداریيان دەکات. پێویستە لەسەر
خێزان ئاگاداری ئەوە بێت ئەندامەکانی لەو ژمارەیە زیادتر نەکات و لەوەیش کە پێویستە
کەمتر نەکات. ئەگەر ژمارەکەیش لەوەی پێویستە زیادی کرد، ئەوا زیادەکەی دابەشدەکرێت
بەسەر ئەو خێزانانەدا ژمارەیان کەمترە، بۆ هەر٣٠ی خێزانێکیش شوێنێکی کۆبونەوەی
گەورە هەیە، کە لەوێدا فەرمانڕەواکە دەژی، هەموویان لەکاتی بانگەوازێکی گشتیدا بۆ
خواردنی ژەمەکان پێکەوە لەو جێگەیەدا ئامادە دەبن. هەڵبەتە ڕێ بەئەندامەکان دەدرێت
ژەمەکانیان لەماڵی خۆیاندا بخۆن، بەڵام ئەمە شتێکە شایستە نیيە، زیاد لەمەیش
ئامادەکردنی خواردن کات دەکوژێت. هەروەها هاوڵاتیان دەتوانن بۆ هەموو شوێنەکانی
"تۆبیا" بڕۆن بەلام دەبێت مۆڵەت لە لایەن حکومەتەوە وەربگرن[٤].

هاوشێوەی ئەم جۆرە تۆبیایانە لە هەندێ لە کۆمەڵگاکانی ئێستادا لە زۆر بوون و
ئاشکرا دیارە، ئازادی جڵەوکراو" لە بەرژەوەندی کۆمەڵگە"، پەرستنی سەرکردەکان،
ڕێکخستنی کۆمەلایەتی توندوتۆڵ، هەڵوەشاندنەوەی پەیوەندیە خێزانیەکان و باوکایەتی،
هونەر لە خزمەتی دەوڵەتدا، هەڵبژاردنی داریونی، کوشتنی بەزەییانە، فێرکردنی
کۆمەلایەتی بە شێوەیەك کە خێزان رۆڵی نیيە تێیدا، سەروەری دەوڵەت بەسەر تاکدا،
قەبوڵ کردنی پێشکەوتنی تەکنیکی، یەکسانی هەردوو رەگەزەکە لە دابەش کردنی
کۆمەلایەتیدا بۆ کارکردن، موڵکایەتی هاوبەش، خۆ بەخشین بۆ کاری جەستەیی کۆمەڵی،
کێبەرکێ، موڵکایەتی کۆمەڵی ئامرازەکانی بەرهەم هێنان، هاوشێوەیی، چاودێری.. هتد.

دراما مامەڵە لەگەڵ مرۆڤدا دەکات و، تۆبیاش مامەڵە لەگەل جیهاندا دەکات، لە تۆبیادا،
دونیای گەورە و فراوانی ناوەوەی مرۆڤ بچوك دەبێتەوە بۆ ئەوەی بگۆڕێت بۆ خاڵێکی
پەراوێزی بێبەها. گریمانەی پێش وەخت لە تۆبیادا ئەوەیە کە مرۆڤەکان "رۆح"یان نیيە،

لێرەیشەوە هیچ گیروگرفتێکی مرۆیی یان ئەخلاقی لە تۆبیادا بوونی نییە. مرۆڤەکان لێرەدا ناژین، بەڵکو لەناو پیشەکانیاندا کاردەکەن. ئەوان ناژین لەبەرئەوەی مەحروم و بێ بەشن لە ئازادی. هاووڵاتی لێرەدا خاوەنی کەسێتی نییە، لەبری ئەوە (سایکۆلۆژیەتێک)ی دەدرێتە پاڵ کە لەسەر پیشەکەی وەستاوە لە پرۆسەی بەرهەم هێناندا.. بەمانای بەرهەم هێنانی نوسخەیەك لەخۆی (التوالد). خەیروشەڕ لای ئەو مانایەك ناگەیەنن. هەر تۆبیایەك، لەناویشیدا "سوشیالیزمی زانستی"، بایەخ نادات بەگیروگرفتە ئەخلاقیەکان، تۆبیا دورترە لەوەی پێوەرەکانی خەیرو شەر بیگرێتەوە بەڵکو هەموو شتێك تێیدا بەرنامە ڕێژ کراوە.

لەلای "مارکس" کێشەو قۆناغی کۆتایی لە مێژودا بریتیە لە شیوعیەت، فەراهەم کردنی شمەك بۆ هەموو کەس، بەدیهێنانی چێژی مادی[٥]. بەڵام لای (هیگڵ)، مانای کۆتایی بۆ مێژوو بریتیە لە سەرکەوتنی پیرۆکەی ئازادی، یان بە تەعبیرێکی تر بریتیە لە: دراما[٦]. سوشیالیزم، سەپاندنی یاساکانی جیهانی مادییە بەسەر ژیانی مرۆڤایەتی و کۆمەڵایەتیدا. لە تێڕوانینی شیوعیەتەوە ئاشتیەکی هەمیشەیی نمایشی کۆتایی پەرەسەندنێك دەکات لەوێنەی جیهانێکی مادیدا کەلە ئایندەیەکی دوریدا بەهاتنەکایەی (کۆمەڵگەیەی ناچینایەتی) کۆتایی دێت، ئەمەیش بریتیە لە "یاسای کلوسیوس" لە "ماتە ووزەدا" کە جێبەجێ دەبێت بەسەر ژیانی کۆمەڵایەتیدا. بەڵام ئایین، بە پێچەوانەی ئەمەوە ئەوا کۆتایی هەموو شتێك لە (ماتەووزە) یان لە ئاشتی هەمیشەییدا نابینێتەوە، بەڵکو لە ڕۆژی دواییدا دەیبینێتەوە، لە یەکسانی ڕەهادا یان لە هاوسەنگی گشتیدا نابینێتەوە، بەڵکو لە دراماداا دەیبنێتەوە. دراما لە ڕوی جەوهەرو مێژوییەوە، بریتیە لە دەرئەنجامی ئایین، بەڵام تۆبیا، جۆرێکە لە زانست. (لمبرت کیوتلیت) Lambert Quetelet کتێبێکی لە بواری کۆمەڵناسیدا نووسی و ناونیشانێکی لۆژیکی لێ نا کە بریتیە لە "فیزیای کۆمەڵگە" کە هەموو ووشەیەك تێیدا لەبارەی کۆمەڵگەوە پشت بە دەرئەنجامەکانی زانستی سروشتناسی و ئاژەڵناسی دەبەستێت.

تۆباویاتی سیاسی بوونی هەیە، کە بە ئەفلاتون دەست پێدەکات و بە کەسانی وەکو (توماس مور)، و (توماس کامبانیللا) و (فرانسوا فورییر) و (سان سیمون) و (روبرت اوین) و (مارکس)دا تێ دەپەڕێت[٧].

پێویستیشە چیرۆکە زانستییەکان لەنموونەی چیرۆکی "ئەتلانتیس"ی "بیکۆن" بۆ ئەمە زیاد بکەین[٨] تەکنۆلۆژیاو پێشکەوتن هەموو ڕۆژێك ئامێرە زانستی و تەکنیەکان دادەهێنن

که تێیدا مرۆڤ زەلیلەو فەردیەتی خۆی لە دەست دەدات و دەگۆڕێت بۆ بەشێك لەو میکانیومە. (الدوس هکسلی)، مرۆڤی ئاینده وا دەبینێت که مرۆڤێکی دروستکراوی دەبێت، دروستکراوی خودی ئەو تەکنەلۆژیایه که بەدەستی خۆی دروستی کردوه. له ڕێگەی ئەو پێش کەوتنانەوه که له زانستی کرۆمۆسۆنەکاندا بەدەست هاتووه، وای لێ دێت که لەکارگە گەورەکاندا کرۆمۆسۆمی بەشەری بەرهەم بێت بەپێی نموونەیەك که پێش وەخت کلێشەکەی دیاری دەکرێت. هەروەها زانست یارمەتی دەردەبێت له دروستکردنی بونەوەری مرۆیی تەواو هاوشێوەدا، واته (لەبەرگرتنەوەی دوبارەی بونەوەری مرۆیی تر کەخاوەن کەسێتی سەربەخۆی خۆیان نین)، بەڵام لەبری ئەوە، بەهرەمەندن له باشترین خاسیەتەکان[٩].

دکتور "داڤید کلاین" David Klaein بەڕێوەبەری پەیمانگای پزیشکی کرۆمۆسۆمەکان له جنێف . هەڵدەستێت به تاقیکردنەوەیەك که تێیدا ناوکێك لەخانەی هێلکەی بۆقێك دەردەهێنێت و دەیگۆڕێت بەناوکێك له هی بۆقێکی تر، بەمەیش کۆرپەلەکە ئەو خاسیەتە کرۆمۆسۆمانەی پێ دەبەخشرێت که خواستی لەسەر هەیە. لەکاتێکیشدا ئەو تاقیکردنەوانە بەتەواوەتی سەرکەوتن بەدەست دەهێنن، له تواناداا دەبێت لەماوەی چل بۆ پەنجا ساڵی تردا . بەپێی قسەی "د.کلاین" گیانلەبەرو بونەوەری مرۆیی بەرهەم بهێنرێت، که خاسیەتەکانی پێش وەختیان دیاریکراون. ئەم نموونە میسالیانە دەکرێت یەك لەگەل یەکدا هاویەك بکرێن. (الدوس هکسلی) توانستە تەکنۆلۆژیەکانی تۆبیا دەباتە ئاستی سەخافەتەوەو بەشێوەیەکی لەخۆباییانە دەڵێت "له ساڵی ٢٥٠٠دا جیهانێکی نوێ و ئازا حوکمی زەوی دەکات، که بنەماکانی بریتین له یەکسانی و هاوشێوەیی و سەقامگیری. زانستی بایۆلۆژیش دەبێتە زانستی سەرەکی لەو جیهانەدا، مرۆڤ دەتوانێت (له دایەنگا)دا بەپێی چەند پێوەرێکی یەکگرتوو بونەوەری مرۆیی هاوشێوە بەدەست بهێنێت. وە بە هەزاران لەو جمگە هاوشێوانە لەسەر هەمان ئەو ئامێرانە کاردەکەن و، بە هەمان کار هەڵدەستن..)[١٠].

لەم (جیهانە جوانەدا) خەڵکانی گوناهکار بوونیان نی‌یە، رەنگە هەندێ کەسی کەم ئەندام هەبن، بەڵام ئەوانە لێپرسراو نین له کارەکانیان، سزا نادرێن لەسەری. بەڵکو به ئاسانی جیادەکرێنەوە لە ئامێرەکە. لە جیهانێکی لەم شێوەیەدا، نە خەیرو نە شەڕ بونیان نابێت..

هەروەها نە ئیلهام و نە گیروگرفت و نەگلەیی و سەرپێچی بونیان نییە. لێرەدا دراماو مرۆۋ و مێژوەکەی لەناودەبرێت و بانگی تۆبیا دەدرێت.

# تۆبیاو ئەخلاق

بە پێچەوانەی بیرۆکە باوەکەوە، مرۆۋ ئارەزومەندی جیهانێکی وەزیفی نیە، بەڵکو پێچەوانەی ئەم رایە دەخوازێت، هەروەها مرۆۋ بوونی وەکو ئاژەڵێکی کۆمەلآیەتی شتێکی زۆر نامۆیە. ئە گەر حەزی کۆبونەوەیش لای بەوە وەرگیرا کە ئەوە مانای حەزی ژیان دەگەیەنێت لەناو برێکدا، یان کۆمەڵەیەك یان شانەیەکی هەنگدا، ئەوا ئەمە روکارێکی ئاژەڵی بایۆلۆژیە زیاتر لەوەی رووکارێکی مرۆیی بێت، باشە کامەیە ئەوەی کە دەکرێت بەراورد بکرێت بە ژیانی کۆمەلآیەتی هەنگێك یان مێرولەیەك، یان کۆبونەوەی ژمارەیەك لە خانەکان لە کائینێکی زیندودا.. کە ئەو لەحاڵەتێکی تەواو گونجاودا بێت لەگەڵ خۆی و لەگەڵ دەرەوەی خۆیدا؟ "هوبز" کە فەیلەسوفێکی مادییە بەردەوام ئەم دەستەواژەیە دووبارە دەکاتەوە کە: "مرۆۋ بە سروشتی خۆی کائینێکی کۆمەلآیەتی نییە"[11]. مرۆۋ لە حەقیقەتیدا تاکێکە کە هیچ رێگایەك نیە بۆ دورخستەوەو داماڵینی لەو فەردیەتەی، ئەو ڕەتی ژیان دەکاتەوە لەناو بڕداو ناشتوانێت هەستێت بەوە، بەلآم جۆرێك لە خەڵك هەیە کە لایەنە مرۆییەکەیان تێدا لاوازە لە خەڵکانێکی تر، بەمەش وەزیفەیی و سستمی و هاوشێوەیی و سەروەری دەوڵەتی بەسەر تاکەکاندا پێ قەبوڵە. لەبەرئەوەش کە جۆرێکی تر لە خەڵك هەیە زیاتر توانای کارتێکردنیان هەیە، دەتوانن راوبۆچونەکانیان بسەپێنن بەسەر ئەو کەسانەی تردا کەوا کەمتر کارامەن لەو بوارەدا. سەربازەکان هەمیشە لە شاعیرەکان کارامەتر بوون. ئەم حەقیقەتە تراژیدیە بەهێزی و لاوازیمان بۆ دەخاتە ڕوو لە هەموو ئەوەی کە مرۆۋ و مرۆیانەیە.

سەربازێك لە سەربازگەکەیدا هەموو پێداویستە سەرەکیەکانی بۆ دابین دەکرێت، لە شوێن و چێشتخانەو جل و بەرگ و کار، هەروەها لێرەدا سستم و ئاسایش و رێکخستنی

کارگێڕی و تەندروستی هەیە، هەتا هەندێك لە جۆرەکانی یەکسانی و هاوشێوەیش-
ەگەڵ ئەمەیشدا، ئەوا زۆربەمان پێی وایە کە سەربازگەکان و هەموو ئەو
تایبەتمەندیانەیش کە تیایاندایە دادەنرێت بەخراپترین نموونەی کۆمەڵگەیەك کەدەکرێت
بیهێنیتە خەیاڵتەوە. هەندێك لە کۆمەڵگە هاوچەرخەکان لە سەربازگەیەکی گەورە زیاتر
ین، یان نزیکترن لەوەی کە لە سەربازگە بچن. هەموو ئەو دروشمانەیش کە هەڵدەدرێن بە
بالآیداوە پێی دەڕازێنەوە ناتوانن لە جەوهەری بگۆڕن.

مرۆڤایەتیو ئەخلاق پەیوەستن بە مرۆڤەوە یان بە بانگەشەی مرۆڤایەتیەوە. بەڵام
ئەندامی کۆمەڵگەیان دانیشتوی "تۆبیا"، مرۆڤ نیە بە مانای ڕاستەقینەی ئەم ووشەیە،
ەڵکو گیانلەبەرێکی کۆمەڵایەتیە یان "گیانلەبەرێکی عاقڵە"، مرۆڤ یان کەسێکی ئەخلاقی
ەبێت یان نائەخلاقی، بەڵام ئەندامی کۆمەڵگەیەکی تۆباوی جگە لە وەزیفەکەی شتێکی
ر نازانێت.

ئەخلاق هەر لە بنەماکاندا خۆی نواندوە. ئەگەر چالاکیەکانیشمان لە ئیرادەو ئاگایی
خۆمانەوە سەرچاوەی نەگرت، وە ئەگەر پێویست بوو ئەو کارە بکەین کە دەخرێتە
سەرشانمان بۆ ئەوەی جێبەجێ بکەین- وەکو ئەوەی لەکۆمەڵگەی تۆبیادا ئەم حاڵەتە
هەیە . ئەوا هەموو بنەمایەك، تیاشیدا خودی ئەخلاق، بێمانا دەبێت. هەتا مرۆیترین
ڕەفتارێك ئەگەر لەکۆمۆنەوە دەرچوو ناکرێت دابنرێت بە ڕەفتارێکی ئەخلاقی . ئەمەیش
مانای ئەو جەختکردنەوەی مارکسیەتە بەوەی کە لەشیوعیەتدا ئەخلاق نیە، شیوعیەت
ئەخلاقی لەناوبردو نەیهێشت. چونکە خەڵکی لەناو ئەو سستمەدا ئینتیمایەکی
ڕاستەوخۆیان یەك بۆ یەکتری هەیە، نەك لە ڕێگەی بنەماکانەوە. مێرولەیەك کە
بەشێوەیەکی ڕێکوپێك و کامڵ وەزیفەکەی جێبەجی دەکات لەناو کارەکەیدا ئەمە
مەسەلەیەکی ئەخلاقی نیە، چونکە مێرولە بەو پەڕی سادەییەوە ناتوانێت بەشێوەیەکی
ر هەڵسوکەوت بکات. لە کاتێکدا هەنگێك کە هەنگێکی نەخۆش فڕی دەداتە دەرەوەی
شانەکەوە، ئەوا بەمە شتێك ناکات دژ بە ئەخلاق بێت. بە هەمان شێوە (ئەو قوربانیەی) کە
هەنگێك پێی هەڵدەستێت لە پێناو کۆمەڵەکەیدا و "ئە و کارە دڵسۆزانەی" ئەنجامی
ەدات، ناکرێت وەربگیرێت وەك جۆرێك لە ئەخلاق، بەڵکو ئەوەی لێرە بوونی هەیە تەنها
وەزیفەیەکە لە میکانیزمی کۆمەڵایەتیدا. ئەمەیش بریتیە لە مانای حەقیقی ئەو
دەستەواژەیەی "لینین"، کە دەڵێت: سۆشیالیزمی زانستی لە تێکڕایدا "یەك گەرد

ئەخلاقی تێدا نیە"، ئەمەیش دەستەواژەیەکە بویە مایەی وروژاندنی خراپ حاڵیی بوونێکی زۆر، بەڵام لە راستیدا روونترین دان پێدانانێکە بەو پەیوەندیەی لە نێوان شیوعیەت و تۆبیادا هەیەو ئەو دوانە بەیەکەوە دەبەستێتەوە[١٢].

مارکسیەت تۆبیایە، لەبەرئەوەی زانستیە یان لە لایەنێکەوە زانستی تێدایە. هەموو تۆبیایەکیش زانستیە، چونکە وا بۆ ژیانی مرۆڤایەتی دەڕوانێت کەوا کورت کرابێتەوە لەسەر رووداوە دەرەکیەکانی -واتە مەسەلەی (بەرهەم هێنان و بەکاربردن و دابەشکردن)-، لەبەر ئەوەی ئەم لایەنەیش کە خۆی لە سەری کورتکردوەتەوە لە سەری دەکرێت چارەسەر بکرێت لەرێگەی زانست و جێبەجێ کردنی شێوازەکانیەوە لە: پلانەکان و پەیوەندیەکان و هاوسەنگیەکان و، فشارەکان و بەرنگاریەکان، و هۆکارەکان و میانگیریەکان و، دامەزراوەکان و یاساکان و زیندانەکان و لێپێچینەوەکانەوە[١٣].

جێبەجێکردنی بەڵگەنەویستە مادییەکان بەسەر کۆمەڵگادا دەبێتە هۆی جۆرێك لە سوشیالیزم یان شیوعیەت، هەمان ئەم بەڵگەنەویستانەش ئەگەر جێبەجێ کرا بە زۆر بەسەر ژیانی تاکدا، ئەوا دەبێتە هۆی ئەوەی کە راهاتوین لەسەر ناونانی بە (ئەبیکوریەت) و ئەبیکوریەتیش مادییە بە مومارەسە. هۆی ئەمەیش ئەوەیە چونکە مرۆڤ ئەندامە لەکۆمەڵگەدا لەلایەنی تیۆری و مەرجیەوە تەنها، بەڵام لەواقیعی ژیاندا تاکێکی سەربەخۆیەو حەزی لەژیانێکی فەردی هەیە زیاتر لەژیانێکی کۆمەڵایەتی، لەبەرئەوە "ئەبیکوریەت" فەردگەراییە، لەکاتێکدا (سوشیالیزم) دەرئەنجامێکی کۆمەڵایەتی فەلسەفەی مادییەتە.

"ئەگەر من خاوەنی یەك ژیان بم ئەوا ئەو ژیانە موڵکی خۆمە بە تەنها" ئەمە زیاتر لۆژیکیە لەهەر قسەیەکی تر لە بارەی قوربانیدان لە پێناو نەوەکانی ئێستا یان داهاتووە. مرۆڤ لە کۆمەڵگەیەکی هەمیشە بەشەوقدایە بۆ ئەوەی بژی و بیر بکاتەوەو هەڵسوکەوت بکات وەکو تاك. لە سەروی ئەمەیشەوە، مەیلێکی بەردەوامی هەیە بۆ بەزاندنی یاساو پێوەرە مۆراڵیەکان. هەر سستمێکیش رەچاوی فەردییەتی مرۆڤ نەکات و بیەوێت کە تەنها وەکو ئەندامێك لە کۆمەڵگادا سەیری بکات سەرەڕای هەموو حەقیقەتە دژەکانیش، ئەوا بە گریمانەیەکی هەڵە دەست پێ دەکات. هیچ سودێکیشی نیە گەڕانەوە بۆ نموونەی هەنگەکە یا مێرولەکە، بە دڵنیاییەوە ئەگەر ئەو هەنگە توانای بیرکردنەوەی هەبووایەو پەیوەست نەبوایە بە غەریزەکانیەوە ئەوا وازی لە کار دەهێنا. ڕەنگە هەوڵی خواردنی ئەو

هەنگوینەی بدایە کە هاوەڵەکانی کۆیان کردوەتەوە لە شانەکە تردا. هەروەها هەنگی سپی نەدەچوو بەرەو پیری مەرگ بۆ ئەوەی کۆمەڵگەکەی رزگار بکات، ئەگەر ئازادی هەڵبژاردنی هەبوایە ئەوا بە دڵنیاییەوە ژیانی هەڵدەبژارد لەبری مردن. بەڵام مرۆڤ، لە کاتێکدا قسەی زۆر دەکات لە بارەی بەرژەوەندی کۆمەڵەوە، بەڵام لە واقیعی ژیاندا لە پێناو بەرژەوەندی تایبەتی خۆیدا کاردەکات. ئەمەیش حەقیقەتێکە فاکتەری هەموو کێشەوگرفتەکانی کاری بەکۆمەڵی‌یە لە سیستمە سۆشیالیستەکاندا.

(گرفتی بڵاویش لەهەموو دەوڵەتانی لەم جۆرەدا بریتیە لەنەمانی هەستکردن بەرپرسیاریەتی). ئەم دژ وەستانەوەیە لە کۆمەڵگە ئاژەڵیەکاندا مومکین نیە، ئەمەیش لەبەرئەوەی ئاژەڵەکان توانای هەڵبژاردنیان نیە هەتا بەپێی بەرژەوەندیە تایبەتیەکانیان بجولێنەوەو بەچاوپۆشی لە بەرژەوەندی کۆمەڵگا، بەڵام مرۆڤ ئەم هەڵبژاردنەی لەدەست دایە -ئەمەیش حەقیقەتێکە ناکرێت لە هیچ حاڵەتێکدا پشت گوێ بخرێت- بەوپێیەش، مرۆڤەکان لە هەڵوێستێکدان دەتوانن کەسستمێکی گونجاو دابهێنن بۆ بونەوەرەکان کە بەهرەمەند کراون بەتوانای ئیختیارو هەڵبژاردن، یان ئەو توانایە تێك بشکێنین لە رێگەی هێزەوە یان لە رێگەی مەشق پێکردنەوە. ئەوانیش هەمیشە یەکێك لەو دوو رێگایە دەگرنە بەر. بیرمەندە سوشیالیستەکانیش هەمیشە هەستیان بەوە کردبوو کە سایکۆلۆژیەتی تاکەکان یان ئەوەی ناودەبرێت بە زانستی دەرونزانی فەردی کەلە حەقیقەتدا گوزارشت لەو ئارەزووە بۆماوەییە دەکات لە ئازادی و فەردیەت کە لە ناخی مرۆڤەکاندا هەیە . رێگرێکی سەرەکیە لە رێگای ئەو بەهەشتە کۆمەڵی و هیوا پێ بەخشراوەی سۆشیالیزمدا. ئەمەیش هۆکاری ئەو هەمیشە وتووێژانەیە لە بارەی کۆمەڵگەو بەرهەمهێنان و دابەشکردن و جەماوەرو توێژەکان و.. هتد، لە کاتێکدا خۆیان لە هەموو قسەو وتوێژێك لادەدەن کە لەبارەی گیروگرفتەکانی خەڵکیەوەیە وەکو ئەوان فەردن، ئەوان "مافەکانی گەل" دەخەنە ڕوو بۆ ڕووبەڕوو بوونەوەی (مافەکانی مرۆڤ) و "مافەکانی کۆمەڵ" بۆ ڕووبەڕوو بوونەوەی "مافە مرۆییەکان".

بەنسبەت مرۆڤەوە، هەموو بریارێك کە پێك دێت لە هەڵبژاردنی (ناڕەحەت و گرانەکەیان) و هەموو زاڵ کردنێکی بەرژەوەندی کۆمەڵایەتی بەسەر بەرژەوەندیە فەردیەکاندا، ئەوا لە رێگەی ململانێیەکی ناوەکیەوە دێت لە نێوان پاڵنەرە جۆراوجۆرەکاندا لە چوارچێوەی سستمە مۆراڵیەکاندا. لە ڕووبەڕوبونەوەی ئەم

حەقیقەتانەیشدا مادییەکان دەستیان کرد بە قسەکردن لە بارەی هۆشیارییەوە، مەبەستیشیان لەم زاراوەیە زیاتر هۆشیاریی کۆمەڵایەتی بوو، بەمانای هەستکردنی تاك بەو ئینتیمایەی کە هەیەتی بۆ کۆمەڵگەو بەوەی کە ژیانی بەو شێوەیە دێتە دی و کامڵ دەبێت لە ڕێگەی ئەندامی بونیەوە لە کۆمەڵگادا. بەڵام، لەبەرئەوەی ئاگایی تەنها هاوواتایەکە بۆ ئەخلاق، ئەوا مادییەکان بەمە لێ بوونەوە (واتا دەستبەرداری ئەوە بوون) بۆ خستنە ناوەوەی ڕەگەزێکی تەواو نامۆو ڕیز نەکراو لە لیستی مەزهەبی مادیدا. ئەگەر لەحەقیقەتدا مرۆڤەکان ئەندام بن لەکۆمەڵگەدا . وەیان لە توانایاندا نەبێت لەو حاڵەتە دەربچن و تەنها دەبێت وابن- ئەوا سوشیالیزم ئەوکات مومکین دەبوو. بەڵام ئەم تێڕوانینە بۆ مرۆڤ تێڕوانینێکی یەك لایەنیە، لەبەرئەوە وێنەیەکی نادروست پێش کەش دەکات سەبارەت بە واقیعی مرۆڤ -بەو پێیەی کە مرۆڤ تاکێکی بێلایەنەو بەو پێیەی کە توانای هەڵبژاردنی هەیە، هەروەها بەو پێیەی کە بونەوەرێکی مۆراڵیەو توانای ئەنجامدانی کاری چاك و خراپی هەیەو بەو پێیەی کە ئەو لە تەنها ووشەیەکدا -مرۆڤە- ئەوا سوشیالیزم لەو فۆرمە نەگۆڕاوەکەیدا نامومکینە.

## شوێنکەوتەو یاخیەکان

جۆرێك لە مرۆڤەکان هەیە سەرسام دەبن بە سوڵتەو حوکمی بەهێز، حەزیان لە ڕێکخستنی ڕێك و پێك و شەیدای سستماتیزە کردنی دەرەکین کە هاوشێوەی ڕێکخستنی سوپایە، لەو جۆرە سیستمەدا دیار دەبێت کە کێ فەرمانەکان دەردەکات و وە کێ جێبەجێیان دەکات. ئەم جۆرە کەسانە ئەو شوێنە نوێیانەیان خۆشدەوێت و حەزی پێدەکەن کە بەستراونەتەوە بەشارەکانەوە، کە خانووی هاوشێوەو ڕێك و ڕیز بەندو هاوئەندازەیان تێدا کراوەتەوە لەیەك دەچن. هەروەها حەزیان لە جل و بەرگی ڕەسمی و تیپی مۆسیقای سوپاو نمایش و کارە نمایشیەکانە.. هەروەها لەو جۆرە درۆیانەیە کەوا ئارایشتی روخساری ژیان دەکەن و وای لێ دەکەن زیاتر جێگای قەبوڵ کردن بێت. ئەوانە بە شێوەیەکی تایبەت حەزدەکەن کە "هەموو شتێك بەپێی یاسا بێت" ئەو جۆرە کەسانە خاوەن عەقڵیەتێکی شوێن کەوتووانەن.. بە شێوەیەکی سادە حەزدەکەن کەوا شوێن

کەوتە بن. حەزیان لە ئاسایش و سستەم و دامەزراوەکان هەیە، حەزیان لە ستایشی هەیە لە لایەن گەورەکانیانەوە، حەزدەکەن جێگای سۆزی ئەوان بن، لە سەروی ئەمەیشەوە ئەمان دڵسۆزو بێ زیان و بەوەفان، هاووڵاتی خاوەن ویژدانی زیندوون.

شوێنکەوتەکان حەز دەکەن سوڵتەو دەسەڵات هەمیشە بەسەریانەوە بێت، دەسەڵاتدارانیش حەز دەکەن کەوا شوێنکەوتەیان هەبێت. ئەمانە هەموویان پێکەوە هەماهەنگن وەکو ئەوەی چەند بەشێك بن لە هەمەکیەت.

لەلایەکی تریشەوە، کەسانێکی تر هەن بەدبەخت و نەفرەت لێکراون، لە شۆڕشێکی بەردەوامدان دژ بەشتێك، کە بەبەردەوامی سەردەکێشن بۆ شتی نوێ، ئەم جۆرە کەسانە بەکەمی باس لە نان دەکەن، بەڵام بەزۆری باس لە ئازادی دەکەن، بەکەمی باس لەئاشتی دەکەن و بەزۆریش لەکەسێتی مرۆڤایەتی. ئەو بیرۆکەیە قەبوڵ ناکەن کەوا پاشایە پلەوپایەکانیان پێ دەبەخشێت، بەڵکو بە پێچەوانەوە، بانگەشەی ئەوە دەکەن کە ئەوان نان بدەی پاشان، (ئەوە حکومەت نی‌یە کە ئێمە بەرز دەکاتەوە، بەڵکو ئەوە ئێمەین کە پشتگیرو بەرز کەرەوەی حکومەتین). ئەم زەندیق و لادەرانە دەسەڵاتیان خۆشناوێت، دەسەڵاتیش ئەمانی خۆشناوێت. لەئاینەکاندا (شوێنکەوتەکان) کەسەکان و دەسەڵاتداران و بتەکان بەرزو پیرۆز رادەگرن، بەڵام شەیدایانی ئازادی تەنها ئەو پلەوپایە شایستەیە بە خوای رادەبینن و شکۆداری دەکەن.

## کۆمەڵگەو کۆمەڵ

پێویستە جیاوازی بکەین لە نێوان کۆمەڵگەیەکدا کە بریتیە لە کۆمەڵێکی دەرەکی لە کەسانێك کە بەرژەوەندی پێکەوە کۆیکردونەتەوە، لەگەڵ کۆمەڵێکدا کەوا بریتیە لە کۆمەڵێکی ناوخۆیی و لە کەسانێك کە کۆبونەتەوە لەسەر بنەڕەتێك لە هەست کردن بە ئینتیما. کۆمەڵگە لەسەر خواستە مادیەکان وەستاوە، بەڵام کۆمەڵ لەسەر خواستە رۆحیەکان خۆی بونیادناوە، لەسەر شەوق و حەزێکی زاتی کۆبونەتەوە. خەڵکی لە ناو کۆمەڵگەدا ئەندامانێکی وونن بەرژەوەندی کۆیان دەکاتەوەو لە کاتێکیشدا بەرژەوەندی بخوازێت بڵاوەیان پێ دەکات. بەڵام لەناو کۆمەڵدا خەڵکی بران و یەك فیکرو بیروبۆچوون

کۆیاندەکاتەوەو هەروەها متمانەیەکی بەهێز لەنێوانیاندا هەیە، بەکورتی: هەستکردنیان بەوەی هەموویان یەك کەسن. کۆمەڵگە بوونی هەیە لەبەرئەوەی ئاسانە بۆمان بەدەستخستنی ئەو شتانە کە بەسودن بۆمان هەروەها زامنی مانەوەشیمان دەکات، بۆ نموونە منداڵ ناتوانێت درێژە بە ژیانی بدات و بمێنێتەوە بەبێ یارمەتی کەسانی تر، هەروەها گەورەیش ناتوانێت بژی ژیانێکی ئاسان بەبێ هاوەڵێتی و هاوکاری خەڵکانی تر. هەر ئەمەیش سەرچاوەی کۆمەڵگەیە بەمانا دەرەکیەکەی (سەرچاوگەی بیرۆکەی کۆمەڵایەتیە). لەبەرئەوە دەتوانین لەمەوە ئەوە هەڵێنجین، کە تەماح و خواستەکانی مرۆڤ بۆ ژیان لەناو کۆمەڵگەدا لە بوونە حەقیقیەکەی خۆیەوە سەرچاوە ناگرێت، بەڵکو زەرورەت و پێویستی‌یە ئەوە دەخوازێت. بۆ نموونە هەوڵدان بۆ بەشداری کردن لە کۆمەڵگەدا لەوێوە نایەت کە لایەنی جەوهەریەتی مرۆڤە، بەڵکو لەپێناو ئەو سودانەدایە کەکۆمەڵگە فەراهەمی دەکات [١٤]. کۆمەڵگە یاساکانی باشترین حوکمی دەکەن. یاساکانی شوێن کەوتەیی و فریودان، یان لە باشترین گریمانەدا ئەو یاسایانەی کە ڕێ دەدات بە بەشداری کردن لە بەرژەوەندیەکاندا.

بەڵام تەنها (کۆمەڵ)ەکە دادپەروەری و یارمەتی یەکتری و هاوکاری و برایەتی دەناسێت. بێگومان زۆرێك لە خراپ حاڵی بونیش گەشەی کردوە لە ئەنجامی تێکەڵ کردنی نائاگاییانەوە لە نێوان ئەم دوو زاراوەیەدا [١٥].

مەسیح لەبارەی خۆشەویستیەوە دوواوە لەنێوان خەڵکیداو لەسەر هەقیش بوو، "هوبز"یش لە بارەی "جەنگی هەمووان دژی هەمووان" یان "مارکس" لە بارەی فریودانی دەرەکیەوە قسەیان کردو ئەوانیش هەورەها لەسەر هەق بوون. بەڵام لە کاتێکدا مەسیح بیری لە کۆمەڵێ خەڵك دەکردەوە، ئەوا "هوبز" و"مارکس" بیریان لە کۆمەڵگە دەکردەوە. (ئادەم سمیث)یش کەشفی ئەوەی کرد کە پاڵنەرەکانی خۆشەویستی و فاکتەرەکانی تۆڵە کردنەوە هێزانێکن کەوا پەیوەندیەکانی نێوان خەڵك ڕێك دەخەن. بەڵام ئەم پاڵنەرانە هێزانێکن لە کۆمەڵدا هەن و لە کۆمەڵگەدا بوونیان نی‌یە [١٦].

شارستانیەت، کەوا کۆمەڵگەی دروست کردوە، ئەو پەیوەندیە ناوخۆییە کەسییە ڕاستەوخۆیانە تێك دەشکێنێت کە لەنێوان خەڵکدا هەیە، وە لە بری ئەوە کۆمەڵە پەیوەندیەکی دەرەکی شوناس وون و ناراستەوخۆ بونیاد دەنێت.

پەیوەستەگیەکان لەجۆری یەکەمدا لەپەیوەندیە خێزانیەکان و ئاهەنگی جەژنەکان و ئاهەنگەکانی یادی لە دایکبون و ژنهێنان و مردندا خۆی دەنوێنێت کە هەموو تاکەکانی کۆمەڵ بەشداری تێدادەکەن، هەروەها خۆی دەنوێنێت لە ئاڵوگۆڕکردنی ئەو یارمەتیە راستەوخۆیەو چاودێریەوە کە لە مرۆڤێکەوە بۆ یەکێکی تر ئەنجام دەدرێت. بەڵام لەبری ئەم پەیوەندیانە کەوا لە مرۆڤ دەکەن ببێتە بونەوەرێکی مرۆیی، ئەوا شارستانیەت دەزگاوو دامەزراوە دروست دەکات بۆ چاودێری‌و، تەنها کۆمەڵگە یان تۆبیایەك بەرهەم دەهێنێت. گرنگیدانی شارستانیەتیش بە بونیادنانی دامەزراوەکان بۆ چاودێری کردن رەهەندێکی مرۆیی پێ دەبەخشێت بە شێوەیەك لە شێوەکان. کۆمەڵە مەسیحیە بەراییەکانیش باشترین نموونەن لەسەر کۆمەڵە رۆحیەکان بەمانا حەقیقیەکەی، بەڵام هەتا ئەم کۆمەڵانەیش تێیاندا جۆرێك لە ئەنجامدان دەبینینەوە بۆکۆمەڵە ئەرکێکی هاوبەش کە سیمایەکی کۆمەڵایەتی پێ بەخشیوە. ئەمەو، شتانێکی تری هاوشێوەی ئەمە، وای لە هەندێ کەس کردوە کە لە مەسیحیەتی یەکەمدا بزوتنەوەیەکی سوشیالیستی ببیننەوە، هەروەکو چۆن لە یەکسانیەتی مەسیحیەتدا جۆرێك لە کۆمۆنیستیەتی بەراییان دەبینیەوە. ئەمەیش بەسروشتی حاڵ بیرکردنەوەیەکی هەڵە یان بە هەڵە حاڵی بوونە لە جەوهەری شتەکان.

## کەسێتی و "تاکی کۆمەڵایەتی"

لە مێژووی ئەوروپادا بیرۆکەی تۆبیا گەڕێنراوەتەوە بۆ مەسیحیەت(۱۷)، ئەمەیش حەقیقەتێکی تراژیدیە لە مێژوویدا. "شاری خۆر"ی "کامبانیللا" نموونەیەکە لە تێڕوانینێکی دژ بە مەسیحیەت، ئەمیش لەبەر ئەوەی کە مەملەکەتی زەوی بەهەند دەگرێت لە بری مەملەکەتی ئاسمانی، بەپێی ئەمەیش ئەوا مامەڵە لەگەڵ کۆمەڵگەدا دەکات نەك لەگەڵ مرۆڤدا. "شاری خۆر" نکوڵی کردنە لە ئامانجە بنەڕەتیەکان لەمەسیحیەتدا. ئەمەیش سەرەتای سەرهەڵدانی تیۆرە ئابوری و کۆمەڵایەتیەکانە لە ئەوروپادا. ئایین بەرەو رێکخستنی جیهانی دەرەکی ناچێت. بەڵکو بریتیە لە شعورو پابەند بوون، نەخۆش گوزەراندنی مادییەو نە رێگەیەکیشە بۆ گوزەرانێکی باشتر.

مەسیحیش چاکسازێکی کۆمەڵایەتی نییە، وەکو چۆن شۆڕشی فەرەنسی و پێشکەوتنی زانستیش فاکتەرێك نەبوون بۆ گەیشتن بە نموونە باڵاکانی مەسیحیەت لە ئاشتی و خۆشەویستی. لەکاتێکدا کە مەسیح خەریك بوو بە چارەنووسی نەفسی مرۆڤایەتی و ڕزگاربوونەوە، ئەوا تۆبیا تەنها خەونێکی مرۆیی سادەبوو لە بارەی کۆمەڵگەیەکی نموونەییەوە کە گونجان و ئاشتی هەتا هەتایی باڵی بەسەردا بکێشێت. لێرەدا شتێکی هاوبەش نیە لەنێوان ئایین، وەکو مێژوو بۆ شەهیدانی مرۆڤایەتی، وە لەنێوان "سەرکەوتنێکی" وەهمی سادەی تۆبیادا، یەکەمیان ئینتیمای بۆ مەملکەکەتی ئاسمان هەیە، بەڵام دووەمیشیان ئینتیمای بۆ مەملەکەتی زەوی هەیە، هیچ هاوبەشییەکیش نیە لە نێوانیاندا.

دراما بیرۆکەی "ئاسایشی کۆمەڵایەتی" ناناسێت، تۆبیاش بیرۆکەی نەجابەتی مرۆیی ناناسێت. لەبەرئەوە "مارکس" لە بارەی "ئیستیغلال کراوەکانەوە" دەدوێت و، "دستویفسکی"یش لەبارەی "زەلیل و سەرزەنشت کراوانەوە"[١٨]. " تۆبیای کۆمەلایەتی ئەو پەیوەندیانە پەرچ دەکاتەوە کە خەڵك وا لێ دەکات بۆ ئەوەی ئازاربکێشن و ئیستغلال بکرێن، لەکاتێکدا یاسای سروشتی ئەو پەیوەندیانە بونیاد دەنێت کە تێیدا زەلیل و سەرزەنشت کراوان نەبن[١٩].

لەکاتێکدا "کامبانیللا" ڕۆمانەکەی لەبارەی کۆمەڵگەی نموونە (میپالی)یەوە دەنووسی، بێگومان کاریگەر بوو بەو دەستەواژە مەسیحیەی کە دەڵێت "دراوسێکەتت خۆش بوێت" بەڵام ئەم قەشە هەژارە، بە هەموو سۆزێکیەوە، نەیتوانی کە لەکۆمەڵگە نموونەییەکەیدا ئەوە ببینێت کەوا خەڵکی نەبوونە دراوسێ " هاوەڵی یەکتری" بەڵکو لەناوچوون.. لەنێوان پەیوەندیەکانی بەرهەم هێنان و بەکار بردن و دابەشکردنی کرێکاراندا پەرتەوازە بوون. دراوسێکەی هەستی نە بەخۆشەویستی و نە بە رقی نەکرد. نە چاکەکار بوو نەخراپکار وە نە خاوەنی ڕۆح.. بەڵکو تاکێکی وون بوو، ئەگەر کامڵیش بوو بێت.. تاکێکە بوو کە لەناو"شاری خۆر"دا جێگەیەکی هەبوو، هەروەها وەزیفەیەکی هەیە کەوا لە بێشکەوە هەتا دەچێتە گۆڕەوە خەریکی بەجێگەیاندنیەتی.

ئەگەر ئەمەیش دەروازەی تۆبیا بێت، ئەوا بەشێوەیەك خۆی دەردەخات وەکو وێنەی یەك لای حەقیقەتەکە، کەدراما لایەنەکەی تری پێکدەهێنێت. کارەکانی "شکسپیر" و "دستویفسکی"ش وێنای لایەنەکەی تری دەکەن، چونکە جیهان وەکو دراما وێنا دەکەن.

لە ڕۆمانەکانی "دستویفسکی"دا دەرونی مرۆڤایەتی لەناو ئێش و ئازارە زۆرەکانیدا بەدیار دەکەوێت و بەرز دەبێتەوە، گرفت و ڕوداوە ناوخۆییەکانی بەشێوەیەك گەورە دەبن کەوا جیهانی دەرەکی بە هەموو ئەو دەوڵەمەندی و هەژاری و دەوڵەت و دادگایانەو ئەو سەرکەوتن و تێك شکانانەی تێدایە.. وەکو وەهمێك دەردەکەوێت کە لەپەراوێزی واقیعدا بێت. وێنەی جیهان لە ڕوانگەی دراماوەو وێنەی لە ڕوانگەی تۆبیاوە هیچ شتێکی هاوبەشیان لە نێواندانییە، و هەردوکیان لە دوولایەنی دژ بە یەکدان، دژ بەیەك دەوەستنەوە وەکو چۆن (چەند) لەگەڵ (چۆن)دا و دژ دەوەستێتەوە، مرۆڤ لەگەڵ کۆمەڵگەدا، و ئازادی لەگەڵ پێویستیدا. لە هەمان پەیوەندیەکی دژی لەو شێوەیەدان. لە تۆبیادا ئەوەی دەبینرێت تەنها جیهانە، بەڵام مرۆڤ، ئەوا خاڵێکی پەراوێزییە تێیداو یارمەتی دەرك پێکردنی فۆرم و پلانەکان دەدات. لە دراما‌دا مرۆڤ لە گەورەییدا هەموو جیهان تێیدا نوقم دەبێت و دەیگۆڕێت بۆ دیدێك یان دیمەنێك یان بۆ تەنها وەهمێك[٢٠].

تۆبیا ڕاستە بەڕادەی ئەو ڕاستیەی هەیە لەو بیرۆکەیەدا کەدەڵێت مرۆڤ "ئاژەڵێکی خاوەن عەقڵە" لە ڕاستیدا تۆبیا لەدوو هەقیقەتەوە سەرچاوەی گرتوە کە هەردوکیان گەشەکردوی خودی ئەم جیهانەن، کە ئەوانیش: خواستەکانی مرۆڤە کە (هەمیشەیش خواستە سروشتیەکانن)، و هەروەها زیرەکی مرۆڤ (یان ئەو تەماحەی کە هەیەتی بۆئەوەی خواستەکان بەشێوەیەکی عەقڵانیانە بهێنێتەدی). لەبەر ئەوەی مرۆڤیش هەمیشە خواستی هەیە بە بەردەوامی، ئەوا پێویستە لە سەری لەناو کۆمەڵگەدا بژی، وە لەبەرئەوەی بونەوەرێکی زیرەکە ئەوا تەماحی بونیادنانی باشترین و ڕێکخراوترین کۆمەڵگە دەدات. بەو مانایەی کۆمەڵگەی (جەنگی هەمووان دژ بە هەمووان) حوکمی ئاوابوونی بەسەردا دراوە. بنەماکانی کۆمەڵگای نموونەیی بریتیی نین لە ئازادی یان فەردییەت، بەڵکو بریتین لە سستەم و هاوشێوەیی[٢١].

لەژێر ڕۆشنایی ئەو حەقیقەتانەی پێشەوەدا، دەردەکەوێت کە پەیوەندیەکی ڕاستەوخۆ هەیە لە نێوان تۆبیاو تیورەکانی پەرەسەندندا لە بارەی بنچینەی مرۆڤەوە. هەروەکو چۆن هەمان ئەم حەقیقەتە زانای بایۆلۆژی "ردولف فیرشو"[٢٢] تێبینی کردووە. لە ڕاستیدا (داروین) بیرۆکە کۆمەڵایەتیە دواینەکانی بەمانایەك لەماناکان سازاندووە، وە بۆئەوەی مرۆڤ شیاو بێت بۆ ئەزموونە کۆمەڵایەتیە جۆراوجۆرەکان، یان بۆ ئەوەی ببێتە هاوڵاتیەکی لەبار بۆ هەر تۆبیایەك . ئەوا دەبێت بەپێی تیۆرەکەی "داروین" سازو

داریژراو بێت. بەڵام مرۆڤی راستەقینە، لە فەردییەت و رومانسیەتێکی یاخیدایە بەشێوەیەك کە دەست نادات بۆ تۆبیا، وە بۆ ئەوەی ببێتە ئەندامێکی لەبارو شیاو بۆ کۆمەڵگە. دیارە لەناوبردنی هەموو شتێکی مرۆیش، بەتایبەتی تر فەردیەتی مرۆڤ و ئازادیەکەی، بریتین بن لە مەرجی بنەڕەتی بۆ تۆبیا.

لەبەرئەوە، تۆبیا قەناعەتی مولحدە نەك هی باوەڕدار، بەڵام ئەگەر مرۆڤ فەردێك بێت نەك "ئاژەڵێکی کامڵ" ئەوا ئەم باوەڕیش تەنها وەهمێکە. لە ساتە وەختی بەدیهێنانەوە ئیدی کۆمەڵگەی نمونەیی بویە شتێکی مەحاڵ.. ساتە وەختی "بە مرۆڤ بوون" هەر لەو ساتە وەختەوە مرۆڤ روبەڕوی ململانێیەکی ئەبەدی بویەوە کەوا دوودڵی و تێکشکان لە هێنان و بردنیایەتی.. ئەمەیش بریتیە لە درامای مرۆڤایەتی. (وقلنا اهبطوا بعضكم لبعض عَدو..)[23] کۆمەڵگەی نموونەیی زنجیرەیەکی بەردەوام و ماندووکەرو کۆتایی نەهاتووە.. زنجیرەیەکە تێیدا کەسێتی مرۆڤەکان دادەماڵرێت نەوە دوای نەوە.. زنجیرەیەکە تەنها بەرهەم هێنان و بەکاربردنی تێدایەو پاشانیش تیاچوون لەناو تاریکاییەکانی مردندا.. یان نەمرییەکی (هەڵە). حەقیقەتی بەدیهێنان و ئیرادەی خوای گەورە لە بوونی مرۆڤدا، وایانکردوە کە ئەم میکانیزمە وەهمی و مەحاڵ بێت. لێرەشەوە دەمارگیری هەموو تۆباویەتەکانی دژ بە ئایین و نکوڵی کردنی ئولوهیەت هاتوون. بەو شێوەیەیە، لە کاتێکدا پێغەمبەرانی تۆبیا بانگەشەی ئەوەیان کرد کە کۆمەڵگەو بەرژەوەندیەکانی بریتین لە بەهای باڵا، ئەوا خوا وویستی مرۆڤ خاوەنی ئەو بەهایە بێت. خودا ئازادی بەخشیە مرۆڤ بۆ ئەوەی ئەم جیهانە بکاتە (فیتنە)، وە بۆ ئەوەی جەخت لەسەر ئەوە بکاتەوە کە مرۆڤ و رۆحی مرۆڤ بریتین لە بەهای باڵا کە لەسەرو هەموو باڵاکانەوە[24].

ئەو بیروباوەڕی کە پێی وایە بەدیهاتنی تۆبیا شتێکی مومکینە، گەشبینیەکی ساویلکانەیە لەسەر نکوڵی کردنی دەرونی مرۆڤایەتی وەستاوە. ئەوانەیش رۆحی مرۆڤایەتی و کەسێتی مرۆڤایەتی پشت گوێ دەخەن هەر ئەوانەن کە بڕوایان بە "دەستەمۆکردنی" مرۆڤ و ریزکردنی لەناو کۆمەڵگەدا هەیە بۆ ئەوەی ببێتە پارچەیەك لە ئامێری کۆمەڵایەتی.

بەپێچەوانەی ئەمەیشەوە، ئەگەر بڕوات بە رۆحی مرۆڤ هێنا، میکانیزمی ئەوا ئەمە بەشێوەیەکی کرداریی مانای ئەوە دەگەیەنێت کە ووشیارییت بەبوونی پانتاییەکی گەورە

کەتێپەڕاندنی زەحمەتە، لە سەرپێچی و گومان و ترس و یاخیبوون. ئەگەر زانیت تایبەتیترین تایبەتمەندی مرۆڤ فەردیەتەکەیەتی کە ناتوانێت دەستبەرداری ئەو حاڵەتە بێت، ئەوا مەحاڵی لە قاڵبدانی مرۆڤ یان دەستەمۆو ماڵی کردنیت بۆ دەردەکەوێت، ئەو هەر ئەوەندە ژیانی خۆش گوزەرانی و ئارامی بەدەست هێنا، هەتا لێی دەبێزرێت و ئیدی بەلاقرتیەوە لەو حاڵەتەوە دەڕوات بەرەو گەڕان بەشوێن ئازادی و مافە مرۆڤایەتیەکانیدا. مرۆڤ "ئاژەڵێکە رەتی ئەوە دەکاتەوە کەوا بێت".

# تۆبیـاو خێـزان

خێزان شانەی بنەڕەتی بۆ کۆمەڵگە نیە وەکو هەندێك لە دەستورە کۆنەکان بانەگەشیان بۆ کردوە[٢٥]. بەڵکو خێزان و کۆمەڵگە دوو شتی دور لەیەکن، ئەمەیش لەبەر ئەوەی بنەمای پەیوەست کردن لە خێزاندا بریتیە لە خۆشەویستی و عاتیفە، بەلام لە کۆمەڵگەدا بریتیە لە بەرژەوەندی یان عەقڵ یان هەردوکیان پێکەوە.

هەموو پلەیەکی پەرەسەندن لەکۆمەڵگەدا لە بەرامبەریدا دەبێتە هۆی بەرتەسک بوونەوەی خێزان بە هەمان رێژە، لە حاڵەتێکیشدا ئەگەر بنەمای کۆمەلایەتی بەهەموو دەرئەنجامەکانیەوە جێبەجێ کرا -واتە گەیشتە حاڵەتی تۆبیا- ئەوا خێزان ئیدی لەناو دەچێت. خێزان، بەو پێیەی دایەنگەی پەیوەندیە رومانسی و کەسێتیەیە خزم و لێك نزیکەکانە، ئەوا لە دژایەتیدایە لەگەڵ هەموو بنەماکانی تۆبیادا. "ئینگلز" دان بەم حەقیقەتەدا دەنێت و دەڵێت: "خێزان لە مێژووی بەرایی‌یەوە و هەر لە زەمەنی کۆنەوە بەرەو چوونەوە خۆیەکی رێژەیی بەردەوام دەچێت لە رێگەی تەسك بوونەوەی بەردەوامی بازنەکەیەوە. لە راستیدا ئەم بازنەیە لە بنەڕەتدا لەتێکرای خێڵ پێك دەهات، وە لە چوار چێوەیدا هەردوو رەگەزەکە پەیوەندی ژن و مێردیان هەبوو، پاشان پرۆسەی دورخستنەوە رێڕەوی خۆی وەرگرت و دەستی پێکرد، لە پێشەوە لە خزمە دورەکانەوە دەستی پێ کرد و پاشان وردە وردە بەرەو خوارتر هات هەتا گەیشتە نزیك ترین خزمەکانی خێزان.. ئەم بازنەیەش بەردەوام لە بچوك بونەوەدایە بەشێوەیەك وا لێ دێت کۆمەڵگە لە پەیوەندیەکی خێزانی مەحاڵدا دەبێت لە لایەنی کرداریەوە. وە لە کۆتایشدا

وای لێ دێت کە تەنها تاك دەمێنێتەوە لەگەڵ پەیوەندیەکی بەرەڵادا (بەرەگەزەکەی ترەوە).. لەئەنجامی ئەم پرۆسەی هەڵوەشاندنەوەیەشدا ئیدی پەیوەندی ژنخوازیش نامێنێت و دەوەستێت"[٢٦].

وەکو هەرشتێکی تر لە تۆبیادا. ئەوا سکپڕی و منداڵ بوون بە دورە لە هەرجۆرە سۆزو عاتیفەیەك، لەبەر ئەوەی تەنها وەزیفەیەکە یان شێوەیەکە لە شێوەکانی بەرهەم هێنان. ئەگەر پەرەگرافێك لەو بارەیەوە لە (کۆمارەکەی ئەفلاتون)دا بخوێنینەوە: "پێویستە ژنانی تەمەن بیست ساڵ هەتا چل ساڵ، بخرێنە ژورێکی تایبەتیەوە لەگەڵ پیاوانی تەمەن بیست و پێنج ساڵ هەتا پەنجاو پێنج ساڵ. ئەو منداڵانەش لە دەرئەنجامی ئەمەوە لە دایك دەبن پێویستە لە پەیمانگاکانی دەوڵەتدا پەروەردەو فێر بکرێن، ڕێیان پێ نادرێت دایك و باوکی خۆیان بناسن. وە ڕێکەی پەیوەندیە سێکسیەکان دەدرێت بۆ ئەو ئافرەتانەی تەمەنیان لە بیست ساڵ کەمترەو ئەو پیاوانەیش تەمەنیان لە پەنجا ساڵ زیاترە، بەڵام ئەنجامی ئەم خۆشەویستیە پێویستە لەناو ببرێت، وە ئەگەر منداڵێکیش لە ئەنجامی ئەم پەیوەندیەوە لەدایك بوو، ئەوا پێویستە بەجی بهێڵرێت هەتا لە برساندا دەمرێت. چونکە ژیانی خێزانی و خۆشەویستی خێزانی هەر دەبێت لەناوببرێت"[٢٧].

"ئینگلز" ڕونترە لەمەدا، ئەوەتا دەڵێت: "فاکتەرەی یەك لاکەرەوە لە مێژوودا. بە پێی مەزهەبی مادی. بریتیە لە بەرهەم هێنان و دوبارە بەرهەم هێنانەوە بۆ خواستەکانی ژیانی ڕاستەوخۆ، بەرهەم هێنانیش پرۆسەیەکی دوولایەنە: ڕووی یەکەمی، بەرهەمهێنانی ئامرازەکانی بوون دەگرێتەوە لە شمەکی خواردن و جلوبەرگ و شوێنی نیشتەجێ بوون، و ئامرازەکانی بەرهەمهێنان. ڕوی دوهەمیشی، پێك دێت لە بەرهەمهێنانی خودی کائینە بەشەریەکان. واتە زۆربوونی جۆر"[٢٨]- پاشان "ئینگلز:" بەردەوام دەبێت و دەڵێت: "دەبێتە شتێکی ڕون و ئاشکرا کە بۆ ڕزگارکردنی ئافرەت هەر دەبێت بۆ ئەمە مەرجی یەکەم جێبەجێ بکرێت کە بریتیە لە خستنە ناوەوەی هەموو ئافرەتان بۆ ناو بواری چالاکی گشتی، ئەمەیش مانای ئەوە دەگەیەنێت خێزانی دابڕاو و گۆشەگیر وەکو یەکەیەکی ئابوری و کۆمەڵایەتی هەڵوەشێنرێتەوە.. بەگۆڕینی ئامرازەکانی بەرهەم هێنانیش بۆ موڵکداری گشتی ئەوا ڕۆڵی خێزان دەوەشێت لەوەی کە ببێتە یەکەیەکی ئابوری بۆ کۆمەڵگە. ئەوکاتەیش بەڕێوەبردنی ماڵەکان دەبێتە پیشەسازیەکی کۆمەڵایەتی.. فێرکردنی منداڵان و سەرپەرشتی کردنیان دەبێت کارێك لە کاروبارەکانی

گشتی.. کۆمەڵگەش چاودێری هەموو منداڵەکان بە یەکسانی دەکات، ئیدی ئەو منداڵانە شەرعی بن یان منداڵی ناشەرعی[29].

زیاد لەمەیش مارکس بەرەو ئەوە دەڕوات کە لە ناوبردنی خێزان یان لاواز و قەتیس کردنی، واتە سازکردنی مرۆڤ بۆ کۆمەڵگە، یان گۆڕینی بۆ "بونەوەرێکی کۆمەڵایەتی بە هەموو لایەنێکیەوە" بەمەیش هەموو بنەچەکانی بوونی مرۆیی، لە کۆمەڵایەت و مادی و مەعنەویەوە، لە خێزانەوە دەگوێزێت بۆ کۆمەڵگە.

بەڵام "سیمون دی بوڤوار" ژنە نوسەری فەرەنسی ناسراو بە چالاکیەکانیدا لە بواری رزگارکردنی ئافرەتان لەفەرەنساو دەرەوەی فەرەنسادا . کەسێکی تەواو ڕاکشاوە لەبۆچوونیداو، لەو بارەیەوە دەڵێت : "ئافرەت بەکۆیلەیەتی دەمێنێتەوە هەتا ئەوکاتەی خورافەی خێزان و خورافەی دایکایەتی و غەریزەیی باوکایەتی لەناو دەبرێت"[30].

شارستانیەت تەنها نابێتە هۆی لەناوبردنی خێزان لە لایەنە تیۆریەکەیەوە، بەڵکو ئەمە لە واقیعشدا پراکتیزە دەکات. یەکەمجار پیاوبوو خێزانی بەجێهێشت و پاشان بەشوێنیدا ئافرەت و دوا جاریش منداڵان. دەتوانین لەچەندین لایەنیشەوە ئەم پرۆسەی لەناوبردنی خێزانە بەدی بکەین.. بۆ نموونە ژمارەی حاڵەتەکانی ژن هێنان و دروست کردنی خێزان لە کەم بونەوەیەکی بەردەوامدایە، لەگەڵ زیادبوونی حاڵەتەکانی تەڵاق دا، هەروەها زیاد بوونی ژمارەی ئەو ژنانەی کاردەکەن، بەرزبوونەوە ژمارەی ئەو منداڵانەی بە شێوەیەکی ناشەرعی لەدایك دەبن، هەروەها زیادبوونێکی بەردەوامی ژمارەی ئەو خێزانانەی کە تەنها دایك بەڕێوەیان دەبات.. هتد[31]. پێویستە لێرەدا ژمارەی ئەو کەیبانووە بێوەژنانە کەم تەمەنانەی بۆ زیاد بکەین کە بەهۆی زۆربوونی ڕوداوەکان و بەرز بوونەوەی قوربانیەکانی جەڵتەی دڵ و نەخۆشیەکانی شێرپەنجەوە مێردەکانیان نەماوە، هەموو ئەمانەیش پەیوەندیەکی توندیان هەیە بەشێوازەکانی ژیانی شارستانیەوە.

لەساڵی ١٩٦٠دا ژمارەی حاڵەتەکانی مارەبڕین لە "کالیفۆرنیا" یەکسانە بە ژمارەی حاڵەتەکانی تەڵاق بەشێوەیەکی زۆر خێرایش ئەم ڕێژەیە دەگوێزرێتەوە بۆ ناوەندەکانی تر لە بەرزترین ناوەندەکانی شارستانیەت لە جیهاندا. بەو شێوەیە، ڕێژەی حاڵەتەکانی تەڵاق بەرز بویەوە بۆ ڕادەی حاڵەتەکانی ژن هێنان، بەرز بوونەوەیەکی کتوپڕو جێگیر لە هەموو شوێنەکاندا، بۆ نموونە ئەم ڕێژەیە لە ئەمەریکادا لەساڵی١٩٦٠ بریتیە لە ٢٦٪، وە لە ساڵی ١٩٧٥دا ئەم ڕێژەیە بەرز بویەوە بۆ ٤٨٪. هەروەها لە یەکێتی سۆڤیەتدا

(جاران) ساڵی ١٩٦٠ ڕێژەی حاڵەتەکانی تەڵاق بۆ ژن هێنان ١٠٪ بوو، ئەم ڕێژەیە لە ساڵی ١٩٧٣دا بەرزبویەوە بۆ ٢٧٪. لە سویسرایش لە ماوەی ئەم دە ساڵەی دوایدا ژمارەی حاڵەتەکانی تەڵاق دوو ئەوەندە زیادی کردوە (٣٢) ە لەکاتێکدا لە پۆڵەندا لەماوەی ئەم بیست ساڵەی دوایدا چوار ئەوەندە زیادی کردوە. وە لەماوەی سێ دەیەی (١٩٤٥-١٩٧٥)دا ژمارەی حاڵەتەکانی تەڵاق لە (چیکۆ سلۆڤاکیا"دا سێ ئەوەندە زیادی کردوە. وە لە (براگ) لەنێوان هەر سێ حاڵەتێکی ژنهێناندا، یەکێکیان چارەنووسی بە تەڵاق دەگات. وە لە ڕاپرسیەکدا کە لە فەرەنسا ئەنجامدرا لەنێوان کچانی خوێندنگاکاندا، تێیدا ڕێژەی ئارەزو بۆ سەربەخۆیی و ژیانی بەرەڵایی، لەسەرو ڕێژەی هەموو خواستەکانەوە بوو، لەکاتێکدا خواستی شوکردن لە خوارەوەی لیستەکەدا هاتبوو[٣٣].

"پەیمانگای ستۆکهۆڵم بۆ توێژینەوەی کۆمەڵایەتی" ئەنجامی ئامارێکی بڵاوکردبویەوە کە ساڵی ١٩٧٢ ئەنجامی دابوو لێیەوە ئەوەمان بۆ دەردەکەوێت ئەو ئافرەتانەی کە دەچن بۆ خانەکانی لەش فرۆشی، لە زۆربەی حاڵەتەکاندا، ئەو ئافرەتانەن کە دەست کورتن، تەنها لەبەر ئەوەیش ڕاهاتوون لەسەر لەش فرۆشی کە ئەم شێوازەیان لە شێوازەکانی ژیانی بەرەڵایی بەلایانەوە خۆشترە.

هەروەها بەپێی ئەو بەیاننامانەی کەوەرگیراون لە "ئەنجومەنی کۆمەڵایەتی نەتەوە یەککگرتووەکانەوە"، (Lw(Ecosoc بەشداری کردنی ژنان لە ژیانی ئابوریدا لە ماوەی ئەم بیست و پێنج ساڵەی دوایدا بە شێوەیەك گەشەی کردوە زیاتر لەوەی کە چاوەڕوان دەکرا. لە ساڵی ١٩٧٥دا ڕێژەی ژنانی کارگەر لە فەرمانبەریدا ٣٥٪ بوو لە کۆی گشتی هەموو کرێکاران، دەکرێت بوترێت کە ڕێژەی ژنانی کارگەر لە یەکێتی سۆڤیەتدا بریتیە لە ٨٢ ژن لەهەر ١٠٠ ژنێك کە توانای کارکردنیان هەیە. ئەم ڕێژەیەش لە ئەڵمانیای ڕۆژهەڵاتی "پێشوو"دا گەیشتە (٨٠٪)، پاشان بە شوێنیدا بولغاریا بە ڕێژەی (٧٤٪) و پاشان مەجەر (٧٣٪) و ڕۆمانیا (٧٣٪) و بولندا (٦٣٪)، بە شوێنیشدا هەریەکە لە فنلنداو سوید و تیشکوسلوڤاکیا و دانیمارك و یابان دێت. بەڵام لە کۆی ئەو دەوڵەتانەی کە ئینگلتراو سویسراو نەمساو ئەمریکاو ئەڵمانیای ڕۆژئاوا (پێشوو)، ئەوا نزیکەی نیوەی کۆی ئەو ژنانەی کارگەرن (لە نێوان ٤٩-٥٢٪)دایە. ئەوەیش تێبینی دەکرێت کە ڕێژەی ئیش پێکردنی ژنان لە دەوڵەتە شیوعیەکاندا زیاترە لە چاو وڵاتەکانی تردا، سەرەڕای ئەوەیش ئەم وڵاتە زیاتر پێشکەوتووتر نیە لەنێوان وڵاتانەی تردا کە

لەپێشترەوە ناومان هێنان. دیارە ئەمەیش دەگەڕێتەوە بۆ کاریگەری ئایدیۆلۆژیەتی شیوعیەت و هەڵوێستی لە بەرامبەر خێزان و دامەزراندنی ژناندا. لێرەدا حەقیقەتێکی تری هاوشێوەیەش هەیە کە ناتوانرێت تەنها بەپەرەسەندنی تەکنۆلۆژی تەفسیر بکرێت، ئەویش ئەوەیە کە لەیەکێتی سۆڤیەت و لە ئەمەریکایشدا ژمارەیەکی زۆر لە منداڵانی ناشەرعی هەیە کە ڕێژەیان دەگەنە(١٠٪). یەکێتی سۆڤیەتی پێشوویش* پلەی یەکەم لەم گرفتەدا داگیر دەکات لەناو وڵاتانی جیهانی پێشکەوتوودا، هۆکارەکەیش دەگەڕێتەوە بۆ ئەوەی کە شارستانیەتی گشتی لەوێ بەرەو هەڵوێستێکی ئایدیۆلۆژی نێگەتیڤ بەرامبەر مەسەلەی ژن هێنان و خێزان ئاراستە بووە.

دیاردەی لێکهەڵوەشانی پەیوەندی خێزان لە چین و کۆریا دەرئەنجامی هەمان ئەم هۆکارانەیە. بۆ نموونە لە چین، بە ملیۆنان خێزان لەحاڵەتی لێکدابڕاندا دەژین: باوك لە بەشێکی دەوڵەتدا کاردەکات و دایکیش بە منداڵەکانیەوە لە بەشێکی تردا، تێکڕای خێزانیش ناتوانن یەك بگرنەوە تەنها لە ساڵێکدا جارێك نەبێت، هۆی ئاشکرای ئەمەیش دەگەڕێتەوە بۆ پێویستی ئابووری دەوڵەت یان بەرژەوەندی گشتی.

بەپێی هەندێك لەو لێکۆڵینەوە ئاماریانە لە ئەمەریکادا، دەرکەوتووە کە ژمارەی ئەو منداڵانەی هەڵهاتوون لە ماڵەکانی خۆیان بە شێوەیەك زیادی کردوە لە ماوەی ئەم پێنج ساڵەی دوایدا، گەیشتۆتە ڕادەی ٢ ملیۆن منداڵ لە ساڵی ١٩٧٦دا.

لە نموونەی ئەم جۆرە ڕەوشە نالەبارو داڕماوەیشدا بەتەمەنەکان خۆیان لەخراپترین حاڵدا دەبیننەوە، گەورە ساڵان هەمان مافەکانی گەنجانیان هەیە لەم جیهانەدا، بەڵام شارستانیەت(*)، کە بەتاڵ بووەتەوە لە پێوەرە ئەخلاقیەکان، هیچ شتێك ناناسێت بێجگە لە پاڵنەرە عەقڵانیەکان نەبێت، ئەم جیهانە دەپێوێت لەسەر پێوەری گەنجان و میزاجی ئەوان. پزیشکێکی دەرونی یوگسلافی دەڵێت: "لەسەر شانۆی چێژدا گەورەترین بوار هەیە بۆ زۆرترینی ئەو کەسانەی بەگوڕو چالاکن . ئەوانیش بریتین لەلاوان و لەش ساغەکان". ئەو ڕەوشانەی کەوا سێکس دەخاتە سەرو هەموو بەهاکانەوە ئەوا . بە سروشتی حاڵ . هەموو رویەکی موجامەلەو دواندن دەکاتە لاوان، هەموو رویەکی گاڵتە پێ کردنیش دەکات گەورە ساڵان. لەو ڕەوش و بارودۆخەدا ڕاگەیانرا کە ڕێزگرتنی گەورە ساڵان لە گەورەترین دەمارگیریەکانمانە، لەکاتێکدا ئەگەر ڕۆحی مرۆڤایەتی بوونی نەبێت و هیومانیزم چەمکێکی بێ بەها بێت، ئەوا گەورە ساڵان کەمترین شتانێکن پێویستمان

پێیان دەبێت لەم جیهانەدا. ئێمە لێرەدا لە بەرامبەر پەیژەیەکداین بۆ بەهاکان، نە ئایین هەڵوێستی خۆی دەگۆڕێت لە پەیژەی ئەو بەهایانەو، وە نە شارستانیەتیش لێی دادەبەزێت.

هەموو ئاینەکان وایانداناوە بەو پێیە کە خێزان هێلانەی پیاوە، دایکیش مامۆستای یەکەمەو ناکرێت بگۆڕێت بەکەسێکی دیی یان دەزگایەك تر، بەڵام تۆبیا، ئەوا بەردەوام بە رەواج پێدانەوە باس لە فێرکردنی کۆمەڵایەتی و دایەنگاو خانووی منداڵان و شتانی لەو شێوەیە دەکات. بە چاوپۆشیش لە راوبۆچوونی تایبەتیمان لە بوونی ئەو دەزگایانە، ئەوا شتێکی هاوبەش لە نێوان هەموویاندا هەیە ئەویش بریتیە لە نائامادەگی دایك و خستنی منالآنە بۆ ژێر چاودێری فەرمانبەران.

(ئەفلاتون) یەکەم کەس بوو کە تۆبیای داهێنا کە بریتیە لە (کۆمارەکەی)، هەروەها یەکەم کەس بوو پێناسەیەکی رێك و پێکی بیرۆکەی فێرکردنی کۆمەڵایەتی کرد. ئەم بیرۆکەش رەنگی دایەوە لە نووسینی سوشیالیستەکاندا لە ماوەی هەردوو سەدەی نۆزدەهەم و بیستەمدا. ئەمەیش دیاردەیەکی مەشروعە، مادام مرۆڤ "ئاژەڵێکی کۆمەڵایەتی" بێت "وەکو بەشێك لە وجودیشی ئەم بیرۆکەیە راستە" ئەوا مەشق پێکردن و فێرکردنی کۆمەڵایەتی و دایەنگەو، ئەوەی پێ دەڵێن کۆمەڵگەی نموونەیی (میثالی)، کۆمەڵە چارەسەرێکی گونجاون. بەڵام خۆشەویستی باوکایەتی و خێزان، فێرکردنی ئایینی و هونەری، فەردییەت و ئازادی، جگە لە رۆمانسیەتێکی (فضولی) لەکۆمەڵگەیەکی نموونەییدا کە هەرکەسێك تێیدا ئیش و کارەکانی خۆی بەبێ هەڵە رادەپەڕێنێت شتێکی تر نیە، لەم سستمە کامڵەدا یان ئەو میپالیەتەی کە بەرپایە لەسەر هاوشێوەی کردنی تەواو "مەبەست لە هاوشێوەیی ئەوەیە کە دووشت یان زیاتر وەکو یەکێکیان لێ بکرێت لە روی ئەرك و وەزیفەو ماهیەتەوە بۆ نموونە ئەو خشتانەی کە دواجار خانوویەك دروست دەکەن هەموویان یەك شێوەو یەك ئەرك و یەك ماهیەتیان هەیە "و.کوردی". داماڵینی کەسێتی لەکۆمەڵگەیکی وادا ئەوەی دایك و خێزان پێی هەڵدەستن تەنها بریتین لە وروژاندنی کێشەو گرفت و پێکدادان.

دایك مرۆڤ دەخاتەوەو پەروەردەی دەکات، بەڵام دایەنگە ئەوا ئەندامێك دەسازێنێت لە کۆمەڵگادا، هاووڵاتیەك دروست دەکات دانیشتووی تۆبیابێت. دایەنگە کارگەیەکە یان ئامێرێکی فێرکردنە. لە شەستەکاندا "ستانسلو جستراڤوڤیتش سترومیلین" نوسویەتی و

دەڵێت: "ئێستا کە ئەولەویەتی ڕەهامان بەخشیوە بەشێوازەکانی کۆمەڵایەتی بۆ فێرکردن لەسەرو هەمووشێوازەکانی ترەوە، ئەوا پێویستە لە سەرمان ئەم شێوازانە لە داهاتوودا بەخێراییەك بڵاوی بکەینەوە کە بتوانین لە ماوەی ١٥-٢٠ ساڵدا وای لێ بکەین فەراهەم بێت بۆ هەموو هاووڵاتیان کە لە بێشکەوە دادەبەزن هەتا تەمەنی پێگەیشتنیان".

پاشان ئەم ئەکادیمیە پایە بڵندە بە شانازیەوە پەرە بە ڕوئیا ترسناکەکەی دەدات و دەڵێت: "هەموو هاووڵاتیەکی سۆڤیەتی پاش بە جێهێشتنی نەخۆشخانەی منداڵ بوون، دەخرێتە دایەنگەو پاشان دەنێرێت بۆ قوتابخانەی پێش سەرەتایی یان "خانەی منالان"، پاشان بۆ قوتابخانەی ناوخۆیی، وە لەوێ بڕوانامەی پێ دەدرێت بۆ ئەوەی خاوەن ژیانی سەربەخۆی خۆی بێت.. پاشان دەنێرێت بۆ کارگە یان بۆ پەیمانگەیەك بۆ خوێندنی باڵا".. بەو شێوەیە نەدایك دەبینین و نەخێزان، ئێمە شتێك نابینین کە بوونی نەبێت. لە بری پەروەردە یان پێگەیاندنی مرۆڤ، ڕوبەڕوی پرۆسەیەکی تەکنولوژی دەبینەوە وەکو ئەوەی ئێمە خەریکی بەرهەمهێنانی مریشکی ماڵی. بەهای ئەم هەڵوێستە "شارستانیەش" بەرامبەر خێزان ئەو دەستەواژە مارکسیە بەناوبانگە لە کتێبی "سەرمایە"دا پێمان ئاشنا دەکات کە دەڵێت: "منداڵان لە هەردوو ڕەگەزەکە پێویستە بپارێزرێن لە دایك و باکیان". هەندێك بەڵگەو نموونە هەن دەکرێت بهێنرێنەوە کە ئاماژە دەکەن بەوەی کە یەکێتی سۆڤیەت لەهەڵوێستی خۆی گۆڕیەوە بەرامبەر خێزان، بەڵام ئەمە دادەنرێت " لە چوارچێوەی ئایدیۆلۆژیەتدا" بەجۆرێك لە لادان. بەڵام ئەگەر هاتوو قسە کردنمان لەبارەی بنەماکانەوە بوو، ئەوا جەوهەری مەسەلەکە لەوەدا نەشاراوەتەوە کە نەفرەتی خێزان لە لای "ئینگلز" یان "ستروملین" ڕاستە یان هەڵەیە، بەڵکو لەوەدایە ئایا "ئینگلز" دەتوانێت هەڵوێستێکی پێچەوانەی هەبێت لەسەر خێزان بە ڕەهایی؟ ئەمەیش لەبەرئەوەی "ئینگلز" تەنها دەرئەنجامەکانی لە شارستانیەتێکی خاوەن یەك شێوازی جێگیرەوە وەردەگرت (یان لە تۆبیا.. کە ئەویش هەمان شتە).

شارستانیەت نایەتەدی بەشێوەیەکی کامڵ و تەواو تەنها بە زاڵ بوون نەبێت بەسەر کەسێتی مرۆڤایەتیدا.. چونکە مرۆڤ و کەسێتی‌یەکەی ناگونجێن لەگەڵ ئامێرو بیناو دام و دەزگاکانیدا، لەگەڵ هەرەوەزیەکانی و بەرژەوەندیە گشتی‌یەکانیدا، لەگەڵ دادپەروەری دەوڵەت و سستمەکەیدا..

ئەمەیش هۆکاری سەرهەڵدانی ئەو جەنگەیە کە راناوەستێت لەنێوان مرۆڤ و لەنێوان ئەو (دوژمنایەتیە بەرنامەرێژکراوەدا)، وەکو "ئەندریە موزنستسکی" رایدەگەیەنێت.

هەڵوێستمان لە بەرامبەر ژن و مێردیو خێزان و فێرکردن و دایك و باوك و ئەوانەی چوونەتە ساڵەوە لەسەر دیدو جیهانبینیمان دەوەستێت بۆ مرۆڤ.. واتە لەسەر فەلسەفەمان بەرامبەر بە مرۆڤ. بۆ نموونە، دوو جۆر لە ژن و مێردایەتی جیاواز هەیە: لە لایەکەوە. ژن و مێردایەتی هەیە کە بە شێوەیەکی مەدەنی دەکرێت (وەکو سستمی ژن و مێردایەتی نوێ لە سوید)، . لەلایەکی تریشەوە. ژن و مێردایەتیەکی پیرۆزمان هەیە وەکو (ژن و مێردایەتی کاثولیکی). ئێمە لێرەدا لەوە ناکۆڵینەوە کە کام لەو دوو جۆرە راست و دروستن، بەڵکو ئەمانەوێت جەخت لە حەقیقەتێکی گرنگ بکەینەوە، ئەوەش ئەوەیە کە مەزهەبی عەقڵانی ناتوانێت بڕوانێتە حاڵەتی ژن و مێردایەتی تەنها وەکو پەیمانێك نەبێت، لەکاتێکدا مەسیحیەت ئەم حاڵەتە وەکو پەیوەندیەکی پیرۆز دەبینێتەوە. لەبەرئەوە لەکاتێکدا "ئینگلز" بانگەشەی ئاوابوونی خێزانی کرد، هەڵە نەبوو لەگۆشە نیگای فەلسەفە رەسمیەکەوە. بەڵام زانایانی کۆمەڵناسی سۆڤیەت . ئەوانەی ویستیان سستمی خێزانی کۆن بگێرنەوە لە وێنەی "د. ئورلانیس" و کەسانی تر ئەوانە هەڵەبوون لەبەر ئەوەی مادام مرۆڤ لە "ئاژەڵێکی کامڵ" زیاتر نیە، ئەوا (پێناسە کردنە ئەکادیمیەکەی "سترومیلین" تاکە چارەسەری راستەو دروستە.. ئێمە نازانین بەهای ناوخۆیی ئەو کەسانە چی‌یە کە ئەم کارگە سەیرە بەرهەمیان دەهێنێت، بەڵام دەزانین کەوا رێژەیان لە کەم بونەوەدایە لەم رۆژانەدا بەرێژەیەکی بێزارکەر. چونکە ئافرەت حەز ناکات منداڵێکی بێت و یەکسەر پاش لەدایکبوونی لە دەستی بدات. لەبەر ئەوە دەبینن . لە هەموو وڵاتە پێش کەوتووەکاندا . رێژەی لە دایك بوون بەرەو دابەزین دەچێت، ئەمەیش دەگەرێتەوە بۆ رەوش و بارودۆخی دایکان یان ئارەزووی دەرباز بوون بۆ ژیانی بەرەڵایی‌و پابەند نەبوون . ئەمەیش دەرئەنجامێکی راستەوخۆی نائامادەگی بەها ئایینی و رۆشنبیریەکانە.

لە زۆرێك لە دەوڵەتە ئەوروپیەکاندا دەبینین ئەنجامی تێکرای رێژەی لەدایك بوونەکان سلبیە "بییر سونی" مامۆستای زانکۆ لە سۆربۆن پێی وایە – رەگەزی سپی روبەڕوی مەترسی لەناوچوون دەبێتەوە، هاوڕاست لەگەڵ قسەکانی ئەو مامۆستایەدا دەبینین تێکرای رێژەی لە دایك بوون لە ئەڵمانیادا لە مەترسیدایە بەشێوەیەك ئەڵمانیەکان لە

ەدەی داهاتوودا لە ناودەچن. بەپێی سەرژمێریەکان کراوە پێشبینی دەکرێت
انیشتوانی فەرەنسا کە ئێستا ڕێژەیان دەگاتە ٥٢ ملیۆن ئەو ڕێژەیە دادەبەزێت بۆ ١٧
لیۆن لە نیوەی یەکەمی سەدەی بیست و یەکدا. وایش دەردەکەوێت کە ئەم ڕێژە پێش
بنیکراوانە زیادەڕۆییان تێدابێت، بەڵام بەیاننامە سەرژمێریەکان نزیکمان دەکاتەوە لە
ەیشتنە ئەم ئەنجامە. بۆ نموونە ژمارەی دانیشتوانی ئەڵمانیا ساڵی ١٩٧٦ دابەزیوە، بە
ەراورد لەگەڵ سەرژمێریەکانی ساڵی ١٩٧٥دا، بە ڕێژەی ٠,٣٣٪ (واتە زیاتر لە ٢٠٠
ەزار کەس)، هەروەها ڕێژەی دابەزین ساڵی ١٩٧٥، بە بەراورد لەگەڵ ساڵی ١٩٧٤،
ریتیە لە٠,٥٦٪، ئەم دابەزینەیش لە بەرلین بەرزتر بوو بە ڕێژەیەك گەیشتە ١,٧٪ [(٣٤)*].

پەرلەمانی سویدی گەیشتە ئەوەی کەوا گرنگە لەلیستی کارەکانیدا گیروگرفتی
یادبوونی ژمارەی تووشبووان بە نەخۆشیە عەقڵیەکان لە ئەستۆ بگرێت. ئەمە لە
وڵاتێکدا رودەدات کە تێیدا کەمترین ڕێژەی مردنی منداڵان هەیە، وە تێیدا ریژەی کەسانی
تەمەن مامناوەندی بەرزترین رادەیە لە جیهاندا، خوێندن تێیدا بەخۆڕاییە لە هەموو
ئاستەکان، ماوەی١٥٠ ساڵە ئاشتی تێدا بەرقەرارە، هیچ گیروگرفتێکی وای تێدا نی‌یە کە
پەیوەندی هەبێت بەقەرەباڵخی دانیشتوانەوە، بەرهەمی کرێکاران تێیدا بەرزترین رادەیە
لەجیهاندا، هەروەها ئاستی داهاتی تاك تێیدا یەکێکە لە بەرزترین ئاستەکاندا لە
جیهاندا.. لەگەڵ ئەوەیشدا پەرلەمان تێیدا نیگەرانە لە بەرزبوونەوەی ڕێژەی نەخۆشیە
عەقڵیەکان، لێکۆڵینەوە لەم دیاردەیەش دەخرێتە ئەستۆی دکتور "هانز لومان" وە کە
پزیشکێکی دەرونی بەناوبانگە —هەموو ئەوەیش کە دکتور لەو بارەیەوە وتی ئەوەیە کە
لە سوید، زۆربەی ئەو ئافرەتانەی شوویان کردوە لە وەزیفە کاردەکەن (لە دەرەوەی
ماڵدا)، لەبەرئەوە گۆڕەپانی چالاك و ئۆرگانیەتی خێزان تووشی کارگەریەکی ترسناك
هاتووە: زیاتر لە ٥٠٪ ی دایکان لە سوید کە منداڵیان هەتا تەمەنی سێ ساڵ هەیە لە
فەرمانبەرانن، وە ٧٠٪ی ئەو دایکانەی کە منداڵیان هەتا تەمەنی ١٧ ساڵ هەیە لە
فەرمانبەرانن.

"هانز لومان" لە یەکێك لە راپۆرتەکانیدا رایدەگەیەنێت و دەڵێت: "لە راستیدا
توانیومانە بۆ منداڵەکانمان کۆمەڵگەیەك دروست بکەین کە لە ساردوسڕی و دوژمنایەتدا
بۆ منداڵان گەیشتووەتە ڕادەیەکی ناسروشتی".

له راپۆرتێکی سەرژمێری ساڵانەدا لە سوید هاتووە کە هەر یەکێك لە دوو منداڵی سویدی تاقانە منداڵە لە خێزاندا. هەمان ئەم حاڵەتەیش دەیە لە تشیکوسلوڤاکیا. بۆ نموونە ژن و مێرد لە تشیکوسلوڤاکیا وای دەبینیت ئەو خێزانەی سێ منداڵی هەیە یان زیاتر موماسەرەی خۆشی و ژیانێکی نامەعقول دەکات. لە کەشێکی ئاوادا، بەیاننامە سەرژمێریەکان ئاماژە بەوە دەکەن سوید لە ساڵی ١٩٩٠دا ناتوانێت پارێزگاری "بەرێژەی لە دایکبوونی ئاسایی" دانیشتوانەکەیەوە بکات. شارستانیەت ئافرەتی گۆڕی بۆ بابەتی سەرسام کردن یان ئیستغلال کردن، بەڵام ئافرەتی بێ بەش کرد لە کەسێتیەکەی، کە ئەمە تاکە شتێکە کەشایانی رێزو ستایش بێت. ئەم رەوشەیش لە بەرچاوە بەشێوەیەکی بەردەوام و وای لێهاتووە زیاتر ئەم حاڵەتە دەربکەوێت لە کەرنەڤاڵەکانی هەڵبژاردنی شاجوانانداا یان لە هەندێك پیشەی دیاریکراوی ئافرەتاندا وەکو "مودیلات". لەم حاڵەتانەدا ئافرەت نەماوەتەوە وەکو کەسێتیەك یان هەتا وەکو کائنێکی مرۆیی، بەڵکو ئەو هێشتا زیاتر نیە لە (ئاژەڵێکی جوان).

شارستانیەت بەشێوەیەکی تایبەتی سوکایەتی کردوە دەربارەی دایکان، ئەو فەزڵی پیشەی فرۆشتن یان مۆدیل کاری دەدات بەسەر دایکایەتیدا، "مودیل"، یان بێتە مامۆستا بۆ منداڵی کەسانی تر، یان ببێتە سکرتێرە یان کرێکارێکی پاککەرەوە. ئەوە شارستانیەتە رایگەیاند کەدایکایەتی کۆیلەیەتیە، هەروەها پەیمانیدا کە ئافرەتی لێ رزگار بکات. هەروەها شانازی دەکات بەژمارەی ئەو ئافرەتانەوە کە داییبڕیون (دەڵێت ڕزگارم کردن) لەخێزان و مناڵان، بۆئەوەی پەیوەندی بکەن بە تابورەکانی فەرمانبەرانەوە.

بەپێچەوانەوەی ئەم ئاراستەیەوە رۆشنبیری هەمیشە دایك شکۆدار دەکات و کردوویەتە هێماو نهێنی و کائینێکی پیرۆز. وە باشترین دروشمی بۆ تایبەت کردوە، وە زۆرترینی کارە موسیقیە خۆش و دڵگیرەکانی بۆ داناوە، هەروەها زۆترین تابلۆ هونەری و پەیکەرە جوانەکانی پێ ناوزەد کردووە. لە کاتێکدا ئازارەکانی دایك بەردەوامن لەجیهانی شارستانیەتدا (بیکاسۆ) تابلۆ هەرە جوانەکەی "دایکایەتی" دەنەخشێنێت و بەبالای شکۆدارکردنی دایکایەتیدا هەڵدەدات کاتێك دەڵێت: "بە نسبەت رۆشنبیرییەوە هێشتا دایك زیندوە".

"خانەی گەورە ساڵان" هاوشان لەگەڵ "خانەی منداڵان"ی بێ بەش کراودا دەڕوات، هەردووکیشیان پێکەوە ئینتیمایان بۆ هەمان سستەم هەیە، لە حەقیقەتدا هەردوکیشیان

وو حاڵەتن بۆ هەمان جۆر لە چارەسەرکردنەکان. هەردوو خانەی گەورەساڵان و خانەی
نداڵان لە دایك بوون و مردنی دەست کردمان بەبیر دەهێننەوە. هەردوکیان تێیاندا
نوێنی حەسانەوە فەرهەم کراوەو گەرمی و خۆشەویستی تێیاندا لەناوبراوە. هەردوکیان
ژ بە خێزانن، هەردوکیشیان دەرئەنجامی رۆڵی گۆڕاوی ئافرەتن لە ژیانی مرۆڤایەتیدا.
ە هەردوکیشیاندا سیمایەکی هاوبەش هەیە کە ئەویش ئاوابوونی پەیوەندی
اوکایەتی‌یە: لە دایەنگەدا منالانی بێ باوك هەن و، لە خانەی گەورە ساڵانیشدا باوکانی
ێ منداڵ. هەردوکیشیان بەرهەمی (قەشەنگی) شارستانیەت و نموونەی باڵان لە هەموو
ۆبیایەکدا. خێزان و دایکایەتی هەردوکیان ئینتیمایان بۆ چەمکە ئاینی‌یەکە هەیە، بەلام
ایەنگەو بە فەرمانبەرەکانیشەوە ئینتیمایان بۆ چەمکێکی تر هەیە.

١) زاراوەی (تۆبیا) لێرەدا بەمانا بنچینەییەکەی بەکارهاتووە وەکو تێڕوانینێك بۆ سستمێکی میثالی، بۆ کۆمەڵگەیەکی مرۆیی لەسەر شێوەی کۆمەڵگەیەکی ئاژەڵی کامڵ کە لەشانەکانی هەنگ و حەشارگەی جۆرێك لە کولەو هێلانەی مێرولەدا.. هتد ئەم حاڵەتە دەبینینەوە.

*لە مێژووی فەلسەفەی ئیسلامیدا زاراوەی تۆبیا وەردەگێرێت بۆ "شاری نمونەیی یان شار خەیاڵ" وەکو لای "فارابی" هەیە، بەڵام وەرگێرانی زاراوەکە لە Utopia (یۆتۆپیا)وە گۆڕاوە بۆ (تۆبیا) لەبەر دوو هۆ: دانپێدانانی لە کۆمەڵگەی زمانی عەرەبیدا لە "معجم الفلسفي" کە لە قاهیرە لە ساڵی ١٩٨٣ بڵاوبوەتەوە، دووهەمیشیان لەبەرئەوەی زیاد بۆ کردنی (نموونەیی و خەیاڵی) بۆ زاراوەکە رەنگە ببێتە هۆی شێواندنی فیکر. بەو شێوەیە دەمانەوێت سەرنج بۆ ئەوە ڕاکێشین "میپالیەت" کە دەگەڕێنرێتەوە بۆ کۆمەڵگەی تۆباوی شتێکی گەورە نیە وەکو ئەوەی کە بە زەینی خوێنەردا دێت، میپالیەت لەکلتوری رۆژهەڵاتیماندا شتێکی جوان و خۆشەویستە، بەڵام لە عەقڵی رۆژاوایدا پەیوەستە بەشتی خەیاڵی و مەحاڵەوە، لەکاتێکدا ئێمە میپالیەت گەورە دەکەین لە رەوشت و رەفتارماندا رۆژئاواییەکان لێی رادەکەن، وەگەر پێناسەی شتێکیان کرد بەوەی میثالیە ئەوا مەبەستیانە بڵێن کە ئەو شتە خەیاڵەو مەحاڵە جێبەجێ بکرێت لە واقیعدا (وەرگێری–ع).

٢) ئەم دژیەکیە لەنێوان دراماو تۆبیادا تەنها دژایەتیەکی تیۆری نیە. لەکاتی (شۆڕشی رۆشنبیری‌دا) شانۆی چینی خەریك بوو بەرەو نەمان بچێت، ئەوەی لەسەر شانۆ نمایش دەکرا هیچ پەیوەندیەکی نەبوو بە دراماوە هەروەها رێگە لەو شانۆگەریانە دەگیرا کەوا نمایشی ژیانی تاکەکەسی یان خێزانی دەکرد. پاڵەوانەکان بە وێنەی بونەوەری کامڵ و بێ خەوش و هەڵە خۆیان نمایش دەکرد. نموونەی ئەم جۆرە شانۆیانە (رەش و سپی) هەر ململانێکی زاتی و ناوخۆیی دور دەخەنەوە.

*نوسەر نموونە لە کۆمارەکەی ئەفلاتونەوە وەردەگرێت رەنگە لەبەر ئەوە بێت کە یەکەم (تۆبیا)یە لە مێژووی فیکری مرۆیی‌دا ناسرابێت (وەرگێری–ع).

٣) بڕوانە (ئەفلاتون).

Plato: The Republic, trans. Paul Sharey (London: W. H. Hinneman, 1946).

٤) بڕوانە (سیرتوماس مور).

Sir Thomas More: Utopia, treans. Paul Turner (Baltimore: Penguin Books, 1965).

٥) بڕوانە (مارکس و ئینگلز).

Marx and Engels on Maltus: Selections from the writings of Marx and Engles dealing with the theories of Thomas Robert Maltus.. (London: Laurence and Wishart, 1953).

٦) بڕوانە (هیگڵ).

George Wilhelm Friedrich Hegel: Lectures on Philosophy of History.. (London: H. G. Bohn, 1944).

٧) بڕوانە (سیرتوماس مور).

Sir Thomas More: Utopia, in Ideal Commonwealths (New York: Kennekat Paress, 1968).

وە (توماس کامبانیللا)

Tommaso Campanilla: Civitas solis, in famous Utopia.. (New York: Tudor Publishing Co. 1937)

وە (فرانسوا فوربییر)

Francois Marie Charles Fourier: The Utopia Vision Selected Texst.. Love and Passionate Attraction.. (Boston: Bacon Poress, 1917),

وە (روبرت ئوین)

Robert Owen: A New View of Society.. (London: J. M. Dent and Sons, 1927).

٨) بڕوانە (فرانسیس بیکون).

Francis Bacon. The Advacement of Learning and New Atlantis (London: Qxford University Press, 1966).

٩) بڕوانە (الدوس هکسلی)

Aldous Huxley: Brave New World (London: Chatto and Windus, 1932).

١٠) هەمان سەرچاوە.

١١) بڕوانە (توماس هوبز).

Thomas Hobbs: De homine- Man and Citizen.. (Garden City, N.Y.: Anchor Books: 1972).

١٢) بڕوانە (هوارد سیلسام)

Haward Selsam et al: Dynamics of Social Change: A Reader in Marixist Social Science, from the writing of Marx, Engles and Lenin (New York: International Publishers, 1970).

هەروەها بەراورد بکە لەگەڵ ئەم دەقەدا کە قسەی تیۆریستێکی یاسایی سۆڤیەتی بەناوبانگە -لە نێوان هەردوو جەنگە جیهانیەکەدا کە ئەوەیش "یوگین باشوکانیس" دەڵێت: ئەگەر پەیوەندی لە نێوان تاک و چیندا لە پلەیەکی بەرزی ژیان و هێزدا بوو ئەوا وردە وردە سنوورەکانی

خود نامێنێت، بەو شێوەیە وای لێ دێت بەرژەوەندی چین هاوڕێك دەبێت لەگەڵ بەرژەوەندی ناکدا، ئیدی پاش ئەمە هیچ بوارێك نامێنێتەوە بۆ قسەکردن لەسەر پابەندبوونە ئەخلاقیەکان، ئەوکات دیاردەی ئەخلاقی هیچ بونێکی نامێنێت.
-بڕوانە "یوگین باشوکاینس"

Eugene Pashukanis, Algemeine Rechtslehre and Marximus (n.p., 1929). p. 141.

١٣) دروشمی سوشیالیزم و شیوعیەت چڕکراوەتەوە لە وەزیفەی بەرهەم هێنان و بەکاربردندا: "بەرهەم بهێنە بەپێی توانات و خەرج بکە بە پێی کارەکەت (بە پێی پێداویستی)، یان هاوکێشە بەناوبانگەکەی لینین کە دەڵێت: "شیوعیەت + مارکس + کهربا و".

١٤) بڕوانە (توماس هوبز).

Thomas Hobbs: De cive- Philosophical Rudiments Concerning Government and Society.. (Gardin City, N.Y.: Anchor Books: 1977).

١٥) بۆ وێناکردنی ئەو جیاوازیەی لە نێوان کۆمەڵگەو کۆمەڵدا هەیە، سەرنجی خوێنەران بۆ دیاردەیەك رادەکێشین لە ئەمریکاو ئەویش ئەو شەپۆلە جۆربەجۆرە رەگەزی و فرە رۆشنبیریەیە کەوا لە ئەمریکادا بڵاوبوەتەوە، قوڵترین پاڵنەریش بۆی وەکو "ڤکتور تیرنر" دەڵێت: بریتیە لە گەڕان بە دووی کۆمەڵ و پێویستی بوون بۆ کۆبوونێکی ئۆرگانی، یان وەکو تیرنر ناوی دەبات بە (Communitas) پێناسەیەی دەکات کە: "کۆمەڵێکە گەشەیەکی زاتی و خۆیی هەیە، کە دژ بە رێکخستن و دژ بە مادەیە. "پێکەوەیی" یان بوونی کۆمەڵی لە تایبەتمەندیەکانی ئاین و ئەدەب و دراماو هونەرە جوانەکانە، هەروەها دەتوانین شوێنەوارە قوڵەکانی ئەمەش لە ئەخلاق و یاساکان و پەیوەندیەکاندا بدۆزینەوە، هەتا لە ئابوریشدا، بڕوانە "ڤکتور تیرنر".

Victor Turner: Dramas, Fields, and Mitaphors Symbolic Action in Human Society (Ithace, NY: Cornel University Press, 1974).

هەروەها سکرتێری پەیمانگای "سیمپونیان" لە رونکردنەوەیەکیدا دەڵێت "هیچ رێ و شوێنێکی سەرکەوتوو نیە بگیرێتەبەر بۆ رووبەڕووبونەوەی رۆشنبیری جەماوەری بێجگە لە فیستیڤاڵەکانی هونەرە میللی‌یەکان کە پارێزگاری مانەوەی پێکهاتەی فرە رۆشنبیری و تیاشیدا ئەو هەمە رەنگیە جوان و سەرسوڕمێنەر دەکات. ئەم جۆرە فیستیڤاڵانە هەوڵی دۆزینەوەی کۆمەڵەکان و ئۆرگانیزەکردنەوەیان دەدات. ئەم دەستەو کۆمەڵانە دادەنرێت بەچەند پاڵپشتیەکی بەهێز دژ بەدیوەزمەی دەوڵەتە گەورەکان و دامەزراوە گەورەکان"، بڕوانە "سیدی دیلون".

Sidney Dellon Ripley: The Sacred Grove: Essays on Museums (New York: Simon & Schuster, 1969).

وادیاره پێویست بوو گەیشتنە ئاستی ئەمەریکی لە پەرەسەندن بۆ زانینی رادەی پەیوەندی لە نێوان کۆمەڵگەو کۆمەڵدا هەروەها بۆئەوەی تێبگەین کە پەرەسەندنی کۆمەڵگە نابێتە هۆی (کۆمەڵ)ی بوونی لەو جۆرە بەڵکو دوردەکەوێتەوە لێی. ئەو بزوتنەوە جەماوەریە بۆ گەران بە شوێن رەگ و ریشەکانی تاکدا، وەکو "الیکس هیلی" لە رۆمانەکەیدا (الجژور) باسی لێوە دەکات، هەروەها زیندوکردنەوەی نەرتیەکان و هونەرە میللی‌یەکان بە شێوەیەکی هەڵەشانە سەری هەڵدا لە شەستەکاندا بە پشتگیری کردنی لە لایەن سەرکردەکانیەوە کە توانیان وا لە دەسەلاتداران بکەن یاسایەك دەربکەن بۆ هاندانی هەمەجۆری رەگەزی.

١٦) بڕوانە (ادم سمیث):.

Adam Smith: The Theory of Moral Sentiments (New York: Garland Publishers, 1971).

١٧) بڕوانە (توماسو کامبانیللا)

Tomasso Campanella: Civitas Solis..

١٨) بڕوانە (فیودور دستویفسکی).

Feoder Dostoevsky: (Collections of Treatises) Vol. 3.. (The Humilated and the Insulted (Moscow: Goc Iza vo choodoj, 1956).

١٩) بڕوانە (ارنست بلوك)

Ernest Block: Natural Lew and Human Dignity (Beogred: n. p. 1977), p,7.

٢٠) ئاینەکان هاوڕان لەگەڵ زانستی فەلەك ناس کۆندا کە وای داناوە زەوی (و مرۆڤ) سەنتەری گەردونن، لێرەوە دوژمنایەتی بەردەوامی کەنیسە بۆ (کوبر نیکوس) لەوێوە بوو کە ئەو تیۆرەی هێنابووی دژ بەم بڕوایە بوو.

٢١) پێویستە لێرەدا ئەوە بهێنینەوە یاد کە نموونەی کۆمەلایەتی بالا لای ئەبیکۆر ئازادی نی‌یە بەڵکو ئاشتیە.

٢٢) بڕوانە (رودلف ڤیرشو).

Rudolf Luduig Karl Virchow: Disease, Life, and Man.. trans.. (Stanford, Stanford University Press, 1958).

٢٣) بڕوانە: قورئان، سورە البقرە، الآیە (٣٦).

٢٤) شارەزایی و ئەزموونەکان ئاماژە بۆ ئەوە دەکەن ئەو کۆمەڵگایانەی بە ئەزموونی یەکتاپەرستیدا نەچوون باشتر لە بارن بۆ بەرپاکردنی تۆبیا تێیاندا، لەو روەوە ئاسانە سەپاندنی گوێڕایەڵی هاوشێوەکردن و یاری کردن بە مرۆڤ، وە پەرستنی سەرکردەکان و، مەشق کردن، کە ئەمانەیش کۆمەڵە پێوەرێکن بێ بوونیان تۆبیا مەحاڵە.

٢٥) لە دەستووری یەکیێتی سۆڤێتدا ١٩٧٧ (هەرەوەزی) جێگەی خێزان دەگرێتەوە.

٢٦) بڕوانە (فردریك ئینگلز)

Friedrich Engles: The origin of The Family..

٢٧) تۆبیا ڕەتی خۆشەویستی دەکاتەوە لەبەرئەوەی پەیوەندیەکی کەسیە نەك پەیوەندیەکی کۆمەڵایەتی.. وە یەکێك بوو لە ئامانجەکانی "شۆڕشی ڕۆشنبیری" لە چین – کە ئەمەیش گەورەترین هەوڵە هەتا ئێستا بۆ گەیشتن بە تۆبیا– دوبارە فێرکردنەوەی لاوان، ڕەتکردنەوەی خۆشەویستی بەو پێیەی کە "ئاراستەیەکی بورجوازیانەیە"، بەڵکو تەنها ڕێ بە خۆشەویستی دەدرێت ئەگەر هات و ئەو خۆشەویستە بۆ نیشتمان و سوشیالیزم و سەرۆك (ماوتسی تۆنگ) بوو، بەڵام خۆشەویستی لە ئەسڵە سروشتیەکەیدا ئەوا " گژوگیای ژەهراویە" لەپاشماوەکانی کۆمەڵگەی بەسەرچووە پێویستە لەناو ببرێت. هەتا لەئەدەبیشدا خۆشەویستی لەنێوان پیاوو ژندا مەسەلەیەکی یاساغ کراو بوو بۆ ماوەیەکی دورو درێژ، ئەو کتێبانەی کە باسی لەو بابەتانە دەکرد لە بازاڕدا دەکێشرایەوەو نەدەهێڵرا بفرۆشرێت. بەڵام پاشان مردنی "ماوتسی تۆنگ" ڕۆمانەکانی تۆلستۆی" "من کارنینام" لە کتێب فرۆشیەکاندا بەدەرکەوتەوەو، ئەو کەسانەی دەوەستان لە ریزدا بۆ کڕینی زۆرجار ریزەکە درێژیەکەی دەگەیشتە سەد مەتر.

٢٥) بڕوانە: (ئینگلز).

Engles: Introduction to the 1884 ed. of his Origin of the Family..

٢٦) هەمان سەرچاوە.

٢٧) چاوپێکەوتنێك لەگەڵ "سیمون دی بوڤوار" لە گۆڤاری New York Magazine Saturday Review,

٢٨) لە سەرژمێری خێزانیدا سەبارەت بەو حاڵەتە (نزیکەی ٥ لە هەر ١٠٠٠ کەسێك)، بۆ ئەمەیش سویسراو سوید لە خوارەوە پلەکانی ئاستی جیهانیەوە دەوەستن.

٢٩) هەروەها بە ڕێژەی ٤١,١٪ تەلاق لە نێوان هەر دە هەزار کەس لە دانیشتواندا، بۆ ئەمەیش سویسرا لەسەروی لیستەکەوە دێت لە نێوان دەوڵەتانی ئەوروپادا "ئەم ڕێژانە لە سەرژمێریەکانی حکومەتەوە وەرگیراونساڵی (١٩٧٦).

٣٠) راپۆرت "ب. جازو" لە کۆنگرەی نێودەوڵەتی کە لە ساڵی ١٩٦٠ لە (بۆن) گیرا.

*ڕەنگە هێنانەوەی نموونەی (یەکێتی سۆڤیەت) لە لایەن نوسەرەوە بۆکاتی خۆی کە ئەم کتێبەی نوسیوە گرنگی تایبەتی و کاریگەری خۆی هەبووبێت، چونکە سەردەمی نوسینی ئەم کتێبە دەگەڕێتەوە بۆ هەمان ئەو سەردەمە. بەڵام بە نسبەت ئێمەوە کە ئێستا دەیخوێنینەوە ئەوا دەکرێت وەکو فاکتەرەکانی داڕمینی ئەو سستەمە شمولی و زەبەلاحە سەیری بکەین. (وەرگێڕی کوردی).

*لێرەدا مەبەست لە شارستانیەت (Civllization) ئەو مەفهومەیە کە لە جەوهەریدا دەسوڕێتەوە بە دەوری شێوازی ژیانی شارداو هەموو ئەو شتانەیش کە ئەو جۆرە شێوازی ژیانە پەرچی دەکاتەوە لە بەهاو رەفتارو سستەم و دامودەزگاکان و هتد.. ئاراستەی وەرگێڕانی چەمکی (Civllization) بۆ وشەی (الحچارە) لە زمانی عەرەبیدا بەبڵاوترین ئاراستە دادەنرێت لەو وەرگێڕان و نوسینە عەرەبیانەی کە لەسەرەتای نیوەی دووەمی سەدەی بیستەمەوە نوسراون. بۆ دڵنیا بونەوەیش لەوە دەتوانیت بڕوانیتە کتێبی (الحضارة- الثقافة- المدنية) لە نوسینی (نصر محمد عارف) لە هەمان کتێبدا لە لاپەڕە (٦٧) دا هاتووە کە: (هەموو فەرهەنگەکانی زمان کە لە نیوەی دووەمی سەدەی بیستەمدا نوسراون وشەی (Civilization) یان وەرگێڕاوە بۆ وشەی (الحضارة)ی عەرەبی، ئەمەیش بەو پێیەی کە (حضارة) بریتیە لە کۆی ئەو دیاریدە کۆمەڵایەتیانەی کەوا مۆرکێکی مادی و زانستی و هونەری و تەکنیکیان لە کۆمەڵگەدا وەرگرتووە، وە نمایشی قۆناغێکی (راقی) کەشخە دەکات لە پەرەسەندنی مرۆییدا.. بۆیە منیش پێم وابوو وشەی (شارستانیەت) لەو روەوە هەمان هاو واتای وشەی (حضارة)ی عەرەبی و (Civilization) ئینگلیزیە بە پشت بەستن بەو بۆچوونانەی سەرەوەیش لە وەرگێڕانی ئەم کتێبەی (بیگۆڤیچ)دا "الاسلام بين الشرق و الغرب" لە هەموو شوێنکدا لە بری وشەی (حضارة) شارستانیەتم بەکارهێناوە.

هەروەها بۆ زیاتر پاڵپشت کردنی ئەم بۆچونەش لێرەدا ئەو رایەی (سلامە موسى)یش لە کتێبی: (الثقافة و الحضارة، القاهرة مجلة الهلال، دیسمبری، ١٩٢٧ م/ لاپەرە ١٧١ دەهێنمەوە) کە دەڵێت: (شارستانیەت مادەیەکی هەست پێ کراوە لە ئامێرێکدا کە دادەهێنرێت یان بینایەك کە دروست دەکرێت یان سستەمی حکومەتێك کە مومارەسە دەکرێت، وە ئاینێك کە دروشم و رێو رەسم و نەریتی و دام و دەزگای خۆی هەیە، بەو پێیە شارستانیەت لایەنی پراکتیکی و هەستی و درەکی و مادی شتەکان دەگرێتەوە). لێرەیشدا تێبینی ئەوە دەکرێت کەوا (سلامە موسى) لەمەدا شوێن پێی قوتابخانەی ئەڵمانی هەڵگرتووە کە پێی وایە (Culture) پەیوەستە بە شتە زهنییەکانەوەو (Civillizatiom) یش کە وشەی (حضارة)ی بۆ بەکارهاتووە لە عەرەبیدا پەیوەستە بە شتە مادییەکانەوە. ئەگەر بە وردیش کتێبەکەی (بیگۆڤیچ) بیخوێنیتەوە ئەوا ئەویش لە وشەی (حضارة) هەمان ئەم چەمکەی مەبەستەو تارادەیەکی زۆریش دەتوانین بیبەستینەوە بە وشەی (شارستانیەت)ی کوردیەوە، چونکە ئەگەر وشەی (شارستان-یەت) بە وشەیەکی داڕێژراو دابنرێت ئەوا وشەی (شارستان) لە کوردی و فارسی دا هەر بە مانای (شار) دێت و پاشکۆکەیشی لە هەموو حاڵەتێکدا تەعبیرە لە شێوازو چۆنیەتی ژیانی (شار)، واتە (چۆنیەتی ژیانی شار) یان (چۆنیەتی ژیان لە شاردا) ئەگەر ئەو وشەیەش بە لێکدراو دابنرێت ئەوا لەو حاڵەتەیشدا هەر هەمان مەفهوم دەگەیەنێت (وەرگێڕی کوردی).

*سترومیلین (١٨٨٧-١٩٧٤) ئەکادیمیەکی سۆڤیەتی لە گەورە پیاوانی حکومەتی سۆڤیەت بوو بۆ ماوەیەکی دوورو درێژ.

(٣١) ئەم بەیاننامانە وەرگیراون لە پەیمانگای فیدراڵیەوە بۆ سەرژمێری لە (ڤسبادن).

* لە ساڵی ١٩٨٦ دا ئەڵمانیا یاسایەکی دەرکرد کە بە پێی ئەو یاسایە (٦٠٠) مارك مانگانە دەدرێتە هەر دایکێك بۆ هەر منداڵێکی کە لە دایك دەبێت، بەڵام کاتێك ئەو دەرئەنجامەی کە خوازیاری بوون بەدی نەهات، ئەوا ئەو برە بەخششەیان بەرز کردەوە بۆ (١٠٠٠)مارك لە مانگێکدا، ئەمەیسش پێش یەکبوونی لەگەڵ ئەڵمانیای ڕۆژهەڵاتدا.

یەکێك لە گۆڤارەکان وێنەیەکی کاریکاتۆریان بۆ پۆلێکی قوتابخانەی ئەڵمانی کێشابوو کە هەردوو ڕەگەزەکەی تێدا بوو . کوڕو کچ .

. کوڕەکان (تەربوش) یان لەسەردا بوو.

. کچەکانیش (سەرپۆش)، لەژێریدا نووسرا بوو : (ئەڵمانیا لە ساڵی (٢٠٠٠ك ) واتە ئیسلام زاڵ بووە بەسەر ژیانیاندا، ئامانجیشی ترساندن بوو لە دەرەنجامەکانی کەمی منداڵ بوون.(بڵاوکەرەوە عەرەبیەکە).

# بەشی حەوتەم

## موسا - و

## عیسا - و

## موحەممەد ﷺ

﴿ دەكرێت ئاین كاریگەربێت لەجیهانی دونیادا لەكاتێكدا ئەگەر ئەو خۆیشی بووە دونیایی ﴾

# لێرەداو ئێستا

ئیسلام دوو مێژووی هەیە: مێژوویەکی پێشین بە دەرکەوتنی موحەممەد (د.خ)، وە مێژوویەك پاش کۆچکردنی، ئەم مێژووەی پاشەوەیان بریتیە لەمێژووی ئیسلام بە مانا بەرتەسکەکەی، ناکرێت تێگەیشتنێکی تەواویش هەبێت بۆی ئەگەر هاتوو توێژەر مەعریفەیەکەی باشی نەبوو بەمێژووی ئیسلامە پێشینەکە، بە شێوەیەکی تایبەتی تریش ماوە یەهودی و مەسیحیەکەی.

ئەم سێ ئاینە هەستان بەگێڕانی ڕۆڵی سەرەکی لە مێژووی مرۆڤایەتیدا، لە ڕێگەیەوە مرۆڤ بووە تەومرێك بۆ مێژوو، هەروەها فێربوو کەوا بڕوانێتە مرۆڤایەتی لە تێکڕایدا وەکو هەمەکیەك. لە ڕێگەیەوە مرۆڤ مانای ژیانی (جَواني) ناوخۆیی و ژیانی (بَراني) دەرەکی ناسی و مانای پێشکەوتنی (جَواني) و پێشکەوتنی (بَراني) ناسی، هەروەها ئەو پەیوەندی و سنوورانەیش کە لە نێوانیاندا هەیە.

لێرەوە سەرکەوتن و تێکشکانی مێژووی یەهوودیەت و مەسیحیەت بۆ مرۆڤ برینی بوو لەمانای ئەزموونێکی ئیسلامی تەواو، بەم شێوەیە موسی، عیسی، محەممەد ـ سڵاوی خوایان لەسەر بێت ـ سێ ڕەهەندی بەرجەستە کراون لەو ئیمکاناتە سەرەکیانەی کە دەکرێت لە مرۆڤایەتی‌دا بەدی بهێنرێت (دەستەبەر بکرێت).

یەهودیەت لەناو ئایەنەکاندا نمایشی ئاراستەی ((ئەم جیهانە)) دەکات، هەموو بیرۆکەو تیۆرەکانی عەقڵی یەهودیەت گرنگی دەرن بە پەرپاکردنی بەهەشتێکی زەمینی ((کتێبی ئەیوب))* (کتێبی کار) بریتیە لە خەونێك بۆ دادپەروەریەوە کە هەر دەبێت لەسەر زەوی‌دا بەدی بێت، نەك لەجیهانێکی تردا بەڵکو ((لێرەداو هەر ئێستا)).

یەهود هەرگیز بیرۆکەی نەمرییان قەبوڵ نەکردووە، هەتا سەردەمی مەسیحیش (صەدووقییەکان) هەر ڕەتی ئەم بیرۆکەیان دەرکردووە[1].

---

* Book of Job) کتێبەکە دەگەڕێنرێتەوە بۆ ئەیوب پێغەمبەر، شاعیرە عیبریەکان چیرۆکەکەیان فراوان کردووەو کردویانەتە ئەفسانەی کەسێکی بەرینو ڕاساڵ کەوا تۆڵە بەشێوەیەك قورس بووە لەسەری تاڕادەی ڕەقی‌و زوڵم لێکردن (وەرگێڕ.ع).

[1] / (صدوق)یەکان شوێنکەوتەی (صادوق)ن کە شێوەی حیزبێکی ئاینی سیاسیان پێك دەهێنا، لە ماوەی چاخی دووەم و یەکەمی پێش زاینیداو لە کۆتایی دەوڵەتی یەهودی‌دا بە دڵی ئەرستوکراتیەتی کەهەنووتی

((موسای کوڕی مەیموون)) گەورەترین بیرمەندی یەهودیە لە چاخەکانی ناوەڕاستدا رایدەگەیەنێت کە ـ نەمری بیرۆکەیەکە نابابەتی‌یە، چونکە دژ بەخۆی دەوەستێتەوە[2].

((بندکت سپینوزا)) کە فەیلەسوفێکی تری یەهودی گەورەیە ڕاشکاوانە تر باس لەمە دەکات پێی وایە کە ((تەورات)) هیچ شتێك لەبارەی نەمریەوە باس ناکات[3]. ((ڕینان)) پاش ئەویش ((بردیا ئیف)) ـ بەڕاستی ـ تێبینی ئەوەیان کردووە کە جولەکە نەیتوانیەوە بیرۆکەی نەمری قەبوڵ بکەن چونکە ناگونجێت لەگەڵ ئەو بیرۆکەیاندا لەبارەی جیهانێکەوە کە بێجگە لە ((ئەم لایەنە)) (دنیوی[4]) یە شتێکی تری تێدا نابیننەوە.

((هسدای کریکاس)) Hosdai Craicas دەڵێت ((مادە بریتیە لە جەستەی خودا))، کارێکی ئاسانیشە کە لە ڕێگەی نموونەی ((سپینوزا)) وە ڕێچکەی لە دایکبوونی فەلسەفەیەکی ماددی نوێ لەناو دڵی یەهودیەتدا یان لە سەرچاوە تەقالیدەیەکانیەوە هەڵبگرین، لەحاڵەتێکی وایشدا ئاین لە جەوهەریدا وەکو گۆماوێکی سەتحی دەمێنێتەوە ئەگەر بەراوردێك بکرێت بە گرنگی پێدان و بەهەند گرتنە نەتەوەیی و سیاسی و دونیاییەکانی. ئەمەیش هەڵوێستێکە لەلایەنێکی دژدایە لەگەڵ هەڵویستی مەسیحیەتدا.

لە نووسینەکانی ((سپینوزا))دا، دەکرێت زاراوەی ((سروشت)) لە هەر کوێیەکدا بەدەرکەوت لە بری ئەو زاراوەیە دابینێین کە ئاماژە بۆ ((ئولوهیەت)) دەکات (بەبێ ئەوەی کار بکاتە سەر ماناکەی). بەڵکو ((سپینوزا)) خۆی بە ڕاشکاوانە ئاماژەی پێکردووە.

((سپینوزا)) بە دورخستنەوەی تایبەتمەندی فەردی و ئاگایی و (ئیرادە)، لە زاراوەی ئولوهیەت، ئەوا ئەم زاراوەیەی نزیك کردوەتەوە لە زاراوەی سروشت تا ڕادەی

---

دادەنران، بەشێوەیەکی هەمەکی پشتیان بەیاسای موسا دەبەست و هەموو یاسا نەریتی و تەقلیدیەکانیان ڕەت دەکردەوە.

[2] / بڕوانە: ((مرشد الحیران))ی موسی بن میمون Moses ben Maimon (Maimonides); The Guide of the Perplexed, trans,Shlomo Piens (Chicago;University of Chicago Press,1963).

[3] / بڕوانە: ((سپینوزا)) Leo Strauss: Spinoza 's Critique of Relijgion, trans E.M.Sinclair New York;Sckocken Books , 1965).

[4] / بڕوانە: (ئیرنست ڕینان). Ernest Renan: Oeuvres Completes. ed..Vol.7: Etudes dhistoire religieuse-Le Livre De Job (Paris: Calmann- Lev. 1961) and Nikolai Berdyaev: the Beginning and the End.. (New-york: Harper:1957).

هاویەکیەتی، گومانیش تێدا نی‌یە، ((سپینوزا)) ـ سەرەڕای داماڵینی ڕەسمی لە عەقیدەی یەهودیەت ـ بەڵام لەڕاستیدا ئەو بیرمەندێکی ڕەسەنی جوولەکە بوو[٥].

مەملەکەتی ((خواوەند)) کەوا جولەکە پێشبینیان دەکرد پێش دەرکەوتنی مەسیح، ((پێویست بوو)) کە لەم سەر زەوی‌یەدا بەدی بێت، نەك لەئاسماندا هەروەکو مەسیحیەکان بڕوایان وایە. لەنوسینەکانی جولەکەدا لە بارەی ((سفر التکوین))، شکۆبەرزی دەبەخشنە ئەو مەسیحە تۆڵەسێنەی کە دێت بۆ بەدیهێنانی دادپەروەری.

ئەو مەسیحەی کە جولەکە چاوەڕوانیان دەکرد پێغەمبەرێك نەبوو کە سزاو ناڕەحەتی بچێژێت و بمرێت، بەڵکو پاڵەوانێکی نەتەوەیی بوو کە دەوڵەتی گەلی دەستەبژێری خودا دادەمەزرێنێت. ئەو جیهانەی کە تێیدا دادپەروەر لە نەهامەتی و ناڕەحەتی و بێهودەبوندا دەژی، جیهانێکی بێمانایە. ئەمەیش بنەمای سەرەکی‌یە بۆ دادەپەروەری جولەکەو هەموو ((دادپەروەریەکی کۆمەڵایەتی)).

بیرۆکەی دروستکردنی بەهەشت لێرەداو لەسەر ئەم زەویەدا، بیرۆکەیەکی یەهودیە لە بنەڕەتدا شێوازی هاتنی مێژووی جولەکەش لە رابردووی و ئێستایدا سەرچاوەی ڕاکێشانێکی بەهێزی هەموو بێنەواو چەوساوەکان بووە لەهەموو سەردەمێکدا.

((قەشە ئۆگەستین)) ئەم شێوازە بیرکردنەوەیەیی لەناو مەسیحیەت دا گونجاند، هەروەکو چۆن ((مارکس)) گوێزایەوە بۆناو سۆشیالیزم[٦]. هەروەها هەموو شۆڕشە تۆباوی و بیروباوەڕە سۆشیالیستەکان وە ئەوەی پێیدا تێدەپەڕێت لە بیرۆکەی سەبارەت بەهەشت لەسەر زەوی- هەموویان بیرۆکەی یەهودینی و سەرچاوەیان لە ((العهد القدیم))وە وەرگیراون. بیرۆکەی ((ماسۆنیەت)) لەبارەی نویٚ کردنەوەی ئەخلاقی مرۆڤ لە ڕێگەی زانستەوە، بیرۆکەیەکی وەزعی (پۆزەتیفانەی) جولەکەیە.

ڕەنگە جێگەی گرنگی پێدانیش بێت کەوا کەشفی ئەو پەیوەندیە نهێنی و ئاشکرایانە بکرێن کە لەنێوان ((وەزعیەتی لۆژێکی)) و ماسۆنیەت و یەهودیەتدا هەیە. چونکە ئەم

---

[٥] / (برتراند رسل) لە (مێژووی فەلسەفەی خۆرئاوایدا) Bertrand Russell: History of Western Philosophy (New york: Simon and Schuster, 1945), PP,363-364

[٦] / (ویرنر سومبارت) Werner Sombart: The Jews and Modern Capitalism,trans, M.Epestain (Glencor,Il.:Free Press, 1951).

پەیوەندی و کاریگەریانە تەنها مەعنەوی نین، بەڵکو هەروەها پەیوەندی واقیعی و بەرجەستەیشن.

((سومبارت)) پێی وایە کە مێژووی یەهودیەت بریتیە لە مێژووی پەرەسەندنی بازرگانیی[7] جیهانیی. یەکەم زانستێکی ناوکیش کە بەدەرکەوتبێت ناسراوبوو بە ناوی (ئالان جولەکە)وە. دەکرێت کە زانستی ئابوری سیاسی بەهەمان سیفەت پێناسە بکرێت. شتێکی بە رێکەوتیش نیە کە درەوشاوەترین ناوەکان لە زانستی سروشتی ئەتۆمی و ئابووری سیاسی و سۆشیالیستیدا هەموویان تێکڕا لەجولەکە بن.

جولەکە هەمیشە بەشداریان لەبواری رۆشنبیریدا نەکردووە، بەڵام بەهەمیشەیی بەشداریان لە شارستانیەتدا کردووە. وا دەردەکەوێت کە ئەوان لە کۆچێکی بەردەوامدا بن لە شارستانیەتێکی ئاوا بووەوە بۆ شارستانیەتێکی تری لەدایك بوو، ئەمەیش هەروا لە رۆژئاوادا ڕوویداوە. ((برتراند رسل)) دەڵێت: ((جولەکە هیچ کاریگەریەکیان نەبووە لەسەر رۆشنبیری لە وولاتە مەسیحیەکاندا[8] لەسەدەکانی ناوەڕاستدا)).

لەکاتێکدا کە شار سەردەکەوێت بەسەر رۆشنبیریدا، ئیدی جولەکەیش لەو جێگایانەدا بەدەرکەوتن، بە درێژایی مێژوو ئۆردوگای جولەکە لە هەموو شارە سەرەکیەکاندا دروستکراوە، بۆ نموونە شارەکانی (صور صیدا و ئەنتاکیە و قدس و ئەسکندریە و قرتاجە و رۆما).

(ئەندلس)، هەروەها شارەکانی (غرناطە) و (تولید) و (ئەشبیلیە)، لە ئیسپانیای ئیسلامیدا لە سەرەتای چاخی رێنیسانسدا، شارەکانی ئەمستردام و ڤینسیاو مارسیلیا، لەم چاخەی ئێستاشدا، لە هەموو شارەکانی جیهانی گەورەداو بە تایبەتی تر شارە ئەمریکیەکاندا. ئەمانە هەموو ئەو جێگایانەن کە مێژووی جولەکەیان بونیادناوە.

پشتگیری و یارمەتی دانی جولەکەیش بۆ سەفەرەکەی ((کۆلمبس)) هێمایە بۆ بەشداریکردنی راستەوخۆی ئەوان لەدۆزینەوەی جیهانێکی نوێداو، مومارەسەکردنی شارستانیەتێك هەر لە سەرەتاکانی یەکەمیەوە، (بۆچوونێکیش هەیە بە بەڵگە وە دەیسەلمێنێت کە ((کولمبس)) خۆشی جولەکە بووە). هەروەها باوکی چاخی ئەتۆمی نوێ

---

[7] / بڕوانە: (ویرنر سومبارت) Werner Sombart: les Juifs Dans la vie Economique.

[8] / بڕوانە: (برتراند رسل) (لە مێژووی فەلسەفەی خۆرئاوادا) Russell:..P.342

بەهەمان شێوە جولەکەیە، کە ئەویش ((ئەنیشتاین))ە. بەو شێوەیە جولەکە لەهەموو بارودۆخەکاندا هەڵگری پێشکەوتنی دەرەکی ((مادی)) بوون، بەهەمان شێوەی ئەوەی کە مەسیحیەکانیش هەڵگری پێشکەوتنی ناوخۆیی (باطني) بوون.

## ئاینی (ئەبستراکت)

مادیەتی یەهودی ((یان وەزعیەت))ە سەرنجی ئەقڵی مرۆڤی بۆ دونیا ڕاکێشاوە هەروەها لە ماوەی مێژووی خۆیدا بوەتە مایەی گرنگیدان بەواقیعی دەرەکی ژیان. بەڵام مەسیحیەت ئەوا سەرنجی رۆحی مرۆڤایەتی بەرەو خۆی ڕاکێشاوەتەوە. واقیعیگەرایی ڕاکشاو لە ((العهد القديم)) واتە تەورات دا، ناکرێت بەسەریدا زاڵ بیت تەنها بە میثالیەتی یەکلاکەرەوە نەبێت لە ئینجیل ((العهد الجديد)) دا.

ڕاست نیە - لە مەسیحیەتدا - وزەی مرۆڤایەتی دابەش بکرێت بۆ دوو ئاڕاستەی پێچەوانە: ئاڕاستەی ئاسمان و ئاڕاستەی زەوی.

((مرۆڤ ناتوانێت خزمەتگوزاری دوو گەورەو سەردار بێت، ئەو یا یەکێکیانی خۆش دەوێت و ڕقی لەوی تریان دەبێتەوە، یان دەست بەیەکێکیانەوە دەگرێت و دەست لەوی تریان بەر دەدات.

تۆ ناتوانیت لە هەمانکاتدا خزمەتی خوداو هەم خزمەتی ((مامون*)) نیش بکەیت[9].

(تۆلیستۆ)یش پەرە بەم بیرۆکەیە دەدات و دەڵێت: ((مرۆڤ ناتوانێت سەرپەرشتی و گرنگی بەلایەنی ڕۆحیو هەم چێژی دونیا بدات لە هەمانکاتدا، وە ئەگەر مرۆڤ حەزی لە چێژ کرد ئەوا پێویستە لەسەری کەوا واز لە لایەنە ڕۆحیەکەی بهێنێت، وە ئەگەر حەزی لە ڕزگار بوونی ڕۆحی کرد ئەوا دەبێت واز لە چێژی دونیا بهێنێت، ئەگینا لەنێوانیاندا لەت دەبێت، نە دەگاتە ئەمەیان و نە دەگاتە ئەویشیان.. خەڵکی ڕاهاتوون بۆ ئەوەی ئازادی بە دەست بهێنن. ڕێگای خۆلادان دەگرنە بەر لەو شتانەی کە دەبێتە هۆی بەربەست بۆیان و بۆ جەستەیان، یان دەبێتە ئاستەنگ لەنێوان ئەوان و بەدەستهێنانی حەزو خولیاکانیاندا.

---

* / (مأمون) Mammon لەنوسینە ئینجیلیەکاندا ئاماژەی پێدەکرێت وەکو شەیتانی شەهوەت و ماڵ (و.ع).

[9] / بڕوانە: (ئنیجیل متى) Matthew:6:24

بەلاّم ئەو ئامرازانەی کە دەیانگرنە بەر بۆ بەدیهێنانی چێژە جەستەیی و مادییەکانیان - لە دەوڵەمەندی و پلەوپایەیی بەرزو کەسێتی لەناو خەڵکدا - هەموویان نابنە هۆی ئازادیەکی خوازراو، بەڵکو بەپێچەوانەوە زیاترو زیاتر ئەو ئازادیە کۆت دەکات، ئەگەر خەڵکی ویستیان ئازادیان بەدی بهێنن، ئەوا پێویستە لەگوناهو هەڵەو ئارەزوو گومڕاییەکانیان زیندانێك دروست بکەن و لەنێو دیوارەکانیاندا خۆیان بەند بکەن.....))[10]

دەسەلاّتدارانی کەنیسە تێبینی بوونی چەندین جیاوازی جەوهەریان کردووە لەنێوان ڕۆحی تەورات ((العهد القدیم)) و ئینجیل ((العهد الجدید))دا، لەم بارەیەوە ئینجیلی (مرقص) بەرەو ئەوە دەڕوات کە مەسیح (عیسی) (سەلامی خوای لەسەر بێت) یاسای (موسی)ی هەڵوەشاندوەتەوە، هەروەها ((یهودا))ی خواوەندی دادپەروەری و ڕزگارکەری جیهانی مادی - گۆڕیوە بەخواوەندی خۆشەویستی کە جیهانی غەیب و نەبینراوی بەدیهێناوە، هەروەکو ((کوشود) Coushoud دەڵێت: ((لەم ئینجیلەدا، وادەردەکەوێت کە بنەماکانی زوهدو نەرم ڕەوی و واز هێنان لە بەرەنگاربوونەوەی شەڕ زیاتر روون و دیارە لە ئینجیلەکانی تری))).

لەبەرئەوە، ئایین هەر لە سەرەتاوە هەموو ئاڕاستەیەك دەخاتە لاوە بۆ گۆڕینی جیهانی دەرەکی یان هەوڵ دان بۆ ئەوەی بیکاتە جیهانێکی کامڵ - لەم ڕوانگەیەشەوە - حوکم بەسەر هەر بیروباوەڕێکی مرۆیدا دەدات، بەوەی کە هەر ڕێکخستنێکی جیهانی دەرەکی یان گۆڕینی دەبێتە هۆی زیادبوونی خەیری راستەقینە - هەڵەو گوناحە -، لەحەقیقەتدا جۆرێکە لە جۆرەکانی فێڵ لەخۆکردن یان خۆهەڵخەڵەتاندن چونکە ئاین وەلاّمە بۆ ئەو پرسیارەی کە دەڵێت چۆن دەژیت لەزاتی خۆتداو چۆن ڕووبەری ئەو زاتە دەبیتەوە، نەك وەلاّمی ئەو پرسیارە بێت کەچۆن دەژیت لەجیهانداو لەگەڵ کەسانی تردا. ئایین ئەو پەرستگایە کە ((لە لوتکەی چیایەکەدا...))" و پەناگایەکە کە لەسەر مرۆڤ پێویستە کە بڵند بێتەوە بۆی.

لە دوای خۆیەوە (خوا) و جیهانێك بەجێ بهێڵێت کە هیچ ڕێگایەك نیە بۆ چاك کردن وەجیهانێك کە تەنها شەیتان بەسەریدا دەسەلاّتدارە، ئەمەیە ئاینی پەتی (ئەبستراکت).

---

[10] / بروانە: ((تۆلستۆی)) Leo Tolstoy:((the Christian Teaching ed..Vol,22; The: Complete Works.. (NewYork;AMS press, 1968).

((نیگەران مەبە لەسەر ژیانت دەڵێیت چی بخۆم و چی بخۆمەوە .... ئەگەر چاوی ڕاستت ئازارت دەدات ... ئەوا دەری بهێنە، ئەگەر دەستی چەپت پەریشانی کردوویت ...... ئەوا بیبڕەوە ((هەر کەسێك بڕوانێت بۆ ئافرەتێك بەچاوی شەهوەتەوە وەکو ئەوە وایە زینای لەگەڵدا کردبێت لەدڵیدا[11] .....))

((لە ئینجیلدا هاتووە کە من دانایی دانا تێکدەشکێنم و عەقڵی دەگۆڕم بۆ ((عەدەم)) نەبوون.... کوا دانا؟ کوا نوسەر؟ کێ دابەشکەری ئەم دونیایەیە ؟ کوا ئەو کەسە لەبارەی ئەم دونیاوە (مجادلە)دەکات؟[12] ...

((خەڵکی پرسیاریان لێکرد: باشە ئەی چی بکەین؟ ئەویش وەڵامی دانەوە کە ((هەرکەسێك دوو پۆشاکی هەیە ئەوا یەکێکیان بدات بەو کەسەی کەنیەتی .... هەر کەسێك گۆشتی هەیە با بەهەمان شێوە بکات[13] )).

ئەو لێکچوونەی لەنێوان ئەم دەستەواژانەو هەندێك لە بنەماکانی شیوعیەتدا هەیە تەنها لێکچوونێکی دەرەکی و دیارە. لێرەشدا گفتوگۆ بۆ کۆمەڵگەیەك و ئەو پەیوەندیانە نیە کە تێیدایە، تەنها باس کردنە لەسەر مرۆڤو دەروونی مرۆڤ. ئایین بانگەشە بۆ بەخشین دەکات و شۆڕش (( شیوعیەت))یش بانگەشە بۆ وەرگرتن دەکات، دەشکرێت دەرئەنجامە دەرەکیو ئاشکراکانیان یەکێك بێت، بەڵام دەرئەنجامە ناوەکیەکەیان تەواو لێك جیاوازە.

ئەو ڕێگایەی کە ئاین بانگەشەی بۆ دەکات ڕێگەیەکی سەخت و ناڕەحەتە، تەنها کەسانێکیش دەشێن بۆ پەیڕەوی کردنی ئەوانەن کە دەروونی خۆیان بۆ تەرخان کردووە، کاتێك قورئانیش دەفەرموێت: ﴿ لا يُكَلِّفُ اللَّهُ نَفْساً إِلَّا وُسْعَهَا ﴾[14] ئەوا بە ڕوونی ئاماژە بۆ مەسیحیەت دەکات.

لەبەر ئەوەیش ئاینە پەتیەکان دوو ڕێگا یان دوو بەرنامەیان ناسیوە:

---

[11] / بڕوانە: (ئینجیل متى) Matthew: 6:31,5:and 5: 28

[12] / بڕوانە: (ئینجیل بولس) Pqul: icor.1:19

[13] / بڕوانە: (ئینجیل لوقا) Luke:3:10

[14] / سورەتی البقرة ئایەتی ٢٨٦.

له ((بوزیەتدا)) ((ماهایانا)) یان ڕێگای مەزن هەیە، کە ڕێگەیەکی قورس و ناڕەحەتە تەرخانکراوە بۆ پاڵفتە کراوان، ڕێگایەکی تریش کە ناودەبرێت بە ((هینایانا)) ڕێگەیەکی ئاسان و کەمتر قورس و ناڕەحەتە تایبەت کراوە بەتێکڕای خەڵکەوە[15].

له مەسیحیەتیشدا دابەش کردنی مۆڕاڵی هاوشێوە هەیە: کە ژیانێکی تایبەتی هەیە بۆ قەشەکان و سیستمی ئەکلیروسی، لەبەرامبەر ژیانێکی ئاسایدا بۆ تێکڕایی خەڵك، بێ هاوسەری بۆ پیاوان ئاینی، له بەرامبەردا ژنخوازی و ژیانی خێزانی ڕێ پێدراوە بۆ تێکڕای خەڵك. بێ هاوسەری بریتیە له ڕێگە ڕاست و نموونەیەکە، بەڵام ژنهێنان ئاسانکاری یان چارەسەرێکی مام ناوەندە.

ئەو هێزە ناوخۆیی و شاراوانەی پەیوەندیان بەئینکاری کردنی خودەوە هەیە، تێکڕا مەسەلەیەکی تاکە کەسیەو هەمیشە پەیوەستە بە ڕەتکردنی هەموو چالاکیە کۆمەڵایەتیەکانەوە. مەسیحیەت و هەر ئایینێکی دیش بەشێوەیەکی گشتی، لەو ڕووەوە کە هەردووکیان دژ بەتوندوتیژین، ناکرێت کاریگەرییان لەسەر هەر شتێك هەبێت کە بتوانێت لە ڕەوشی مرۆڤ چاك بکات لەلایەنە کۆمەڵایەتیەکەوە.

گۆڕانکارییە کۆمەڵایەتیەکان بەهۆی پەرستش یان ئەخلاق و لایەنە ئاکاریەکانەوە ڕوونادەن، بەڵکو لە ڕێگەی هێزێکەوەیە کە پشتگیری کراوە بە ئەفکارو بە بەرژەوەندی. لێرەوەیە ئەم تۆمەتبارکردنە هاتووە کە بێگومان مێژوو پاساوی دەکات، بەڵام ئەخلاق پاساوی ناکات، کاتێك ئایین پشتگیری وەکو دەڵێن لەو (ئەمری واقیع) ە دەکات کە باوە لە سەردەمەکەیدا.. بەمەیش خزمەت بەچینی دەسەڵاتدار دەکات بە چاو پۆشین ((لە ناکۆك بوونی لایەنە دەروونیەکەیش)) قورئان مەسیحیەت ناودەبات بە ((بلاغ)) ڕاگەیاندن، ئینجیلەکانیش بە ((مژدە)) ناوی دەبەن.. مژدە بۆ قوڵترین ئەوەی کە لەبوونی مرۆیدا هەیە لە حەقیقەتەکان، ((دراوسێکەت خۆش بوێت وەکو چۆن خۆتت خۆشدەوێت)) دوژمنت خۆشبووێت لەگەڵ ئەوەی نەفرەتت لێدەکەن تۆ لێیان خۆش بە)) ((بەرەنگاری شەڕە مەبەرەوە)) ئەم داواکاریانە دژ بەفیترەتی لۆژیکی کرداری لەژیانی مرۆڤدا ڕێ

---

[15] / بڕوانە ((دایستز تیتارو سوزەکی)) Daietz Teitaro Suzuki: Studies in the Lankavatra Sutra, one of the most important Texts of Mahayana Buddhism,in which almost all its Principles tenets are Presented including the Teaching of Zen (London:G. Routledge, 1972). And Bhikkhu Buddhadasa: Toward the truth: Hinayana Buddhism..(Philadelphia: Westminister, Press,1971).

دەکەن، ئەمەیش وامان لێدەکات بەدوای مانا حەقیقەتەکەیدا بگەڕێن ... کە ئەویش مژدەدانە بەجیهانێکی تر ... وەکو مەسیح فەرموویەتی ((مەملەکەتی من لەم جیهانەدا نی‌یە[16])). پاراگرامی نوێ ئەم ئیلهامە ڕوون و تیژەی ئینجیلەکان دادەنرێت بە خاڵی وەرچەرخان لە مێژوودا، وە بۆ یەکەمجار هۆشیاری مرۆڤ لە بەهای حەقیقەتی مرۆی خۆی بەهۆی پێشکوتنی چۆنایەتی نەك چەندێتی دەستەبەر بووە، لەبەرئەوە دەرکەوتنی عیسی (سەلامی خوای لێ بێت) مەشخەڵێك بوو لە مەشخەڵە جیهانیەکان (( آية للعالم[17] )). ئەمە ئاماژەیەکە بۆ دوو جیهانی بوون.

تێڕوانین و ئەو هیوایەی کە بڵاوی کردەوە بەرجەستە بوون لە هەموو ئەو هەوڵە مرۆییانەدا کە دران لەو کاتەدا. هەتا ئێستاش شارستانیەتی ڕۆژئاوایی سەرەڕایی هەموو لادان و گومڕایی و گومانەکانی - هەر ئەڵقەی ڕێنماییەکانی مەسیحیەتی هەڵگرتووە، وە لەو ململانێ بنەماییانەدا لەنێوان کۆمەڵگەو مرۆڤدا، لەنێوان نان و ئازادیدا، لەنێوان شارستانیەت و ڕۆشنبیریدا، ئەو ڕۆژ ئاوا خۆی لە لایەنگیری ئیختیاری دووهەمدا دەبینێتەوە - کە ئەویش پابەند بوونە بە ترادیسۆنە مەسیحییەکانەوە.

# قەبوڵکردنی مەسیح و ڕەتکردنەوەی

ئایین تەنها کاتێك دەتوانێت کاریگەری لەسەر جیهان هەبێت کە ئەویش خۆی ببێتە دونیایی، بەو مانایەی کە وای لێبێت گرنگی بە سیاسەت بدات لە مانا فراوانەکەیدا، بەم پێیەش، ئیسلام دادەنرێت بە مەسیحیەتێك کە سازێنراوەتەوە بەئاڕاستەی جیهاندا. ئەم پێناسەیە کەشفی ئەو لێکچوونەو ئەو جیاوازیەمان بۆ دەکات لەنێوان هەردوو ئاینەکەدا.

ئیسلام ئەگەر یەکێك لە ڕەگەزەکانی یەهودیەتی تێدابێت، ئەوا لە بەرامبەر ئەمەدا لە کۆمەڵێکی زۆر لە ڕەگەزی ئەو بێبەریە. لە پۆلێنی (هیگل) دا بۆ ئاینەکان ئیسلامی داناوە بە ئەوەی کە درێژکراوەو بەردەوامیی یەهودیەتە ... ئەم بیرۆکەیەش لە بارەی ئیسلامەوە

---

[16] / بڕوانە: ((ئینجیل یۆحنا)) 10 hn:18:36

[17] / ﴿وَالَّتِي أَحْصَنَتْ فَرْجَهَا فَنَفَخْنَا فِيهَا مِنْ رُوحِنَا وَجَعَلْنَاهَا وَابْنَهَا آيَةً لِلْعَالَمِينَ﴾ سورەتی الانبياء ٩١.

له تێڕوانینێکی مەسیحیەوە سەرچاوە دەگرێت[18]. (شپینلگەر) رایەکی هەمان شێوەی ئەمەی هەیە. کاتێك دەڵێت:((کتێبی ئەیوب)) نوسینێکی ئیسلامییە[19].

((مرسیا ئلیادی)) لەکتێبەکەیدا (انماط من الأدیان المقارنة). پێغەمبەری ئیسلام (محمد)ی لە دوڕیانی ئەو رێگەیەدا داناوە کە لە قۆناغی دووهەمەوە دەگوێزێتەوە بۆ قۆناغی سێیەم و (کۆتایی) لەقۆناغەکانی گۆڕانی ((رۆحی لە رەگەزی بەشەریدا، قۆناغی سێیەمیش ـ کە هێشتا کۆتایی نەهاتوە ـ بە (موحەممەد) دەست پێدەکات، (ئیلیادی) پێی وایە کە مێژووی عەقڵی مرۆیی بریتیە لە پرۆسەیەکی (عەلمەنە*)) کە ڕای گشتی بە پێی ئەم بۆچوونەیش، ئەوا ((موحەممەد)) لە کەناری سەرداریەتی مەسیحیەت و سەرەتای چاخی عەلمانیتەی نوێدا دەوەستێت، واتە لەو خاڵەدا دەوەستێت کە چەقە بۆ هاوسەنگی مێژوویی[20].

بە چاوپۆشی لە تێڕوانینی مێژووی یەك ڕەهەندی ((ئیلیادی)) کە ئەمە تێڕوانینێکی قەبوڵ نەکراوە لە گۆشە نیگای ئێمەوە ـ، بەرێگەی ((ناوەنجی)) گیری ئیسلام و پێغەمبەر کە لەم تێڕوانینەدا رەنگی داوەتەوە ئاماژە دەکەین.

ئەم (إنطباع)ەیش هەر بەجێگیری دەمێنێتەوە سەرەڕای جیاوازی تێبینی و بۆچوون و ڕاڤەکاریەکانیش کە لەم بارەیەوە هەن.

مەسیح نەیویست بچێتە ناو (قدس)ەوە چونکە شار ی (فەریسیەکان*)و بەرامبەرکێ کاران‌و نوسەرانی ریاکارو کافران‌و باوەڕ لاوازەکان بوو، لەلایەکی تریشەوە سۆشیالیزم گوتاری خۆی ئاراستەی گوندنشینەکان ناکات، بەڵکو ئاراستەی نەوەی شارە گەورەکانی دەکات. بەڵام موحەممەد، هەرجارێك دەڕۆیشت بۆ (ئەشکەوتی حراء) (بۆ پەرستش)و پاشانیش دەگەڕایەوە بۆ شارە کافرەکە (مەککە)، بۆ ئەوەی پەیامەکەی تێیدا بگەیەنێت.

---

[18] / بڕوانە: (هیگل) George W.F, HegelK: Eariy Theological Writings, trans..(Philadelphia: University of Pennsylvania Press,1971).

[19] / بڕوانە: ((شپنگلر)) Oswald Spengler; the Decline of the West. trans….(New York; A.A.Knopf1926).

* / ((عەلمەنە)) گەڕایی وەرگێراوە لەمانای بنچینەیی ((عەلمانیەت)) وە ((وەرگێڕ. ع))

[20] / بڕوانە : ((مرسیا ئیلیادی)) Mercea Eliade: Patterns in Comparative Religion, .trans….(New York: Sheed & Ward 1958 )

* / (فەریسیەکان) تایفەیەك بوون لە یەهوود لە سەردەمی مەسیحدا، ناسراوبوون بە سروتی شێوەیی‌و نمایش‌و پەرستشی درۆ، (و.ع).

لەگەڵ ئەوەیشدا، هەموو ئەو شتانەی لە شاری مەککەدا روویان داوە ناتوانین پێناسەی بکەین بەوەی کە (ئیسلامە)، چونکە ئیسلام لە مەدینەدا کامڵ و تەواو پێگەیشت. موحەممەد (لە ئەشکەوتی حراء)دا رۆژوەوان و زاهیدو صۆفیو (حنیف)ێك بوو[٢١]، هەروەها لە مەککە بانگخوازێك بوو بۆ بیرۆکەی ئاینی. بەڵام لەمەدینەدا، بوویە بانگخوازێك بۆ ((بیرۆکەی ئیسلامی)). ئەو پەیامەی کەموحەممەد هەڵیگرت (د.خ) لە مەدینەدا کامڵ و چۆر بەست (بلورە) بوو[٢٢]. لەم شارەدا، نەك لە مەککە، ((سەرەتاو سەرچاوەی سیستمی کۆمەڵایەتی ئیسلامیی پێگەیشت))[٢٣].

هەر دەبوو موحەممەد (لە ئەشکەوت) بگەڕایەتەوە، ئەگەر نەگەڕایەتەوە ئەوا هەر ((بەحەنیفی)) دەمایەوە، بەڵام گەڕایەوەو بوویە بانگخوازو پەیامهێنەری ئیسلام. بەو شێوەیە ئاوێتە بوون لەناو جیهانی ((جَواني)) و جیهانی واقیعی، لەنێوان صۆفیگەرو عەقڵ، لەنێوان بیروکرداردا پێکهات. ئیسلام کە صۆفیانە دەستی پێکرد پاشان بەوشێوەیە پەرەی سەندو هەتا بوویە دەوڵەت. ئەمیش مانای ئەوە دەگەیەنێت کە ئاین جیهانی واقیعی قەبوڵ کردو بوویە ((ئیسلام)). مرۆڤو دەروونی خۆی.. ئەمەیە ئەو پەیوەندیە کە لەنێوان حەزرەتی موحەممەدو عیسی (ئینجیل) (دروودی خوایان لەسەر بێت) هەیە.

**لەنێوان کتێبەپیرۆزەکان و لەنێوان دەروونی مرۆڤدا لێکچوونێك هەیە لەسروشتدا... لەجەوهەری هەموویاندا یەك نهێنی هەیە.**

**دەروون و کتێبە پیرۆزەکان یەك نمایندەی ئەوی تریان دەکەن بە ڕێگەیەکی هێمایی... هەریەکەیشیان رۆشنایی دەخەنە سەر ئەوی تر[٢٤].**

**ئیسلام نووسخەی دووەمی مرۆڤە، لە ئیسلامدا تەواوی ئەوە هەیە کە لە مرۆڤدا هەیە.. تێیدا ئەو ئاماژەو تروسکە خوداییە هەیە، ئەو تەعالیمانەی تێدایە دەربارەی واقیع و بان واقیع..**

---

[٢١] / ووشەی (الحنیف) مانای ووشەیی واتە :ئەو کەسەی بێز لەو بیروباوەرە ساختانە دەکاتەوە کە لە چوار دەوریدنیو پابەند دەبێت بە ئاینی راست و ڕەوانەوە.

[٢٢] / ﴿ الْيَوْمَ أَكْمَلْتُ لَكُمْ دِينَكُمْ وَأَتْمَمْتُ عَلَيْكُمْ نِعْمَتِي وَرَضِيتُ لَكُمُ الْأَسْلاَمَ دِيناً ﴾ (المائدة:٣)

[٢٣] / بڕوانە: ((ستیتانو پیانکو)) Stetano Bianco: Polyvalence and Flexibility in the Structure of Islamic Citllo Werk Switzerland, 9(1976).

[٢٤] / بڕوانە: (هنری دی لوباك) Henry de Lubac; the Drama of Atheist Humanism, trans..(New York; New American Library, 1963) PP,4-5,21.

لەئیسلامدا چەند لایەنێك هەیە كە مایەی ڕەزامەندی نیە بۆ شاعیرە ڕۆمانسیەكان، قورئان، كتێبێكی واقیعیەو جێگای پاڵەوانانی داستانەكانی تێدا نابێتەوە. ئیسلام بەبێ مرۆڤێك كە جێبەجێی بكات ناڕەحەتە تێگەیشتنی، یان بەمانایەكی ڕاستتر بڵێین بوونی نابێت.

نموونەكانی: ((ئەفلاتون))و ڕەگەزە بەرایییەكانی ((لیبنتز))و فریشتەكانی مەسیحیەت، ـ لەجەوهەریدا ـ هەموویان ئاماژە بۆیەك شت دەكەن: مەملەكەتی جیهانێكی هەتاهەتایی و ڕەهاو جێگیر. بەڵام ئیسلام، بەهایەكی نموونەیی نابەخشێت بەم جیهانە، فریشتە كە ئینتیمایان بۆ ئەم جیهانە هەیە. هەموویان كڕنوشیان برد بۆ ئەو مرۆڤەی خودا ((هەموو ناوەكانی)) فێركرد[25]. كەچەختی زاڵبوونی ژیان و مرۆڤ و دراما دەكاتەوە بەسەر كەماڵی ئەزەلی جێگیرو نەگۆڕدا.مەسیحیەت هەرگیز نەگەیشتووەتە ئاگایی تەواو سەبارەت بەتاقانەیی خودا، تێیدا مەفهومێكی پڕ لە حەیەویەت هەیە لەبارەی ئولوهیەتەوە، بەڵام بیرۆكەی رونی تێدا نییە سەبارەت بەخودا.

كاری گرنگی (موحەممەد)یش (د.خ) ئەوەبووە كە بیرۆكەیەی ئینجیلی لەبارەی خواوە وا لێ بكات كە زیاتر روون و نزیكتر بێت لە عەقڵ و بیری مرۆڤەوە.

(الله) بریتیە لەو خوادا (تاك)ەی كەدەروونەكان مەیلی لای دەكەن و لەعەقڵماندا بیرۆكەی نەجیب و جوان دەربارەی ئەو سازو چۆڕ بەست دەبێت.

لە ئینجیلەكاندا، خودا (باوكە) و لەقورئاندا (الله) خودای بەندەكانە، خودا لە ئینجیلەكاندا خۆشەویستییە، لە قورئاندا (بەرزوو بێ گەردوو شایەنی سوپاس و ستایشە). ئەم تایبەتمەندیە لە تێگەیشتنی مەسیحیەدا بۆ ئولوهیەت لەدوایدا هەڵگەڕایەوە بۆ زنجیرەیەك لەوێنەی تێكەڵاو كە قوربانی دا بەتاقانەیی ئەصڵی مەسیحیەت لە پێناو (ثالوث) و (وەفاداری بە مەریەمی پاكیزەو قدیسەكان...) نموونەی ئەم پەرەسەندنە لە ئیسلامدا مومكین نییە، سەرەڕای هەموو ئەو ئاستەنگ و گرفتە مێژوویانەی كەهاتوونەتە ڕێی، ئیسلام بە((پوختترین ئاینەكانی یەكتاپەرستی)) ماوەتەوە.

---

[25] / ﴿ وَعَلَّمَ آدَمَ الْأَسْمَاءَ كُلَّهَا ثُمَّ عَرَضَهُمْ عَلَى الْمَلَائِكَةِ فَقَالَ أَنْبِئُونِي بِأَسْمَاءِ هَؤُلَاءِ إِنْ كُنْتُمْ صَادِقِينَ ﴾ البقرة:٣١

دەروونی مرۆڤایەتی تەنها توانای وێناکردنی ئولوهیەتی هەیە. بەڵام لەرێگەی عەقڵەوە ئەوا ئولوهیەت دەگۆڕێت بۆ بیرۆکەی (خودای تاکو تەنها[٢٦]).

خودای مەسیحیەت، خودای جیهانی فەردی -واتە دەرونی- کەسەکانە، لەکاتێکدا شەیتان جڵەوی جیهانی مادی لەدەستدایە[٢٧]. لەبەرئەوە، ئەو بیرو ڕا مەسیحیە سەبارەت بەخودا ئازادییەکی (جَواني) دەخوازێت، لەکاتێکدا بیروباوەڕی ئیسلامی لەبارەی خواوە زیاد لە ئازادییە (جَواني)یەکە هەروەها ئازادییەکی (برانی)یش دەخوازێت.

ئەم دوو بیروباوەڕە لەبنەڕەتیەوە لەئیسلامدا : (الله اکبر) و (لااله إلا الله) هەردووکیان لەهەمانکاتدا گەورەترین هێزی شۆڕشگێڕین لەئیسلامدا. لەڕاستیدا (سید قطب) پێی وایە ئەم دووانە شۆڕشێکن دژی دەسەڵاتی دونیایی کە حەقی ئیلاهی لە حوکم کردنی جیهاندا پێشێل دەکات.

((سید قطب)) پێی وایە ئەم دوو دروشمە واتای :(( سەندنەوەی دەسەڵات لەکاهن و سەرکردەو سەرەك خێڵو دەوڵەمەندو دەسەڵاتدارەکانو گێڕانەوەی بۆ خودا))، لەبەر ئەوە وەکو ((سید قطب)) پووختتر دەڵێت: (لا اله الا الله) دژی هەموو خاوەن دەسەڵاتەکان بووە لە هەموو چاخ و لە هەموو شوێنێکدا[٢٨].

بەهەمان شێوە مەسیحیەت نەیتوانی بیرۆکەی مانەوەی مرۆڤی کامڵ وەکو مرۆڤ قەبوڵ بکات. هەر بۆیە لە قسەکانی مەسیحیەوە بیرۆکەی (خودا - مرۆڤ) یان هەڵێنجاو (عیسی) یان بە کوڕی خودا دانا. بەڵام موحەممەد تەنها بە مرۆڤی مایەوە. وەگەرنا پایەی بەرزتر لە مرۆڤ دەبویە زیادەو حاڵەتێکی ناپێویست. موحەممەد (د.خ) نمونەیەکی باڵای بەخشی بە مرۆڤو بە سەرباز لەهەمان کاتدا، بەڵام (عیسی) (سەلامی خوای لێبێت)، مۆرکێکی فریشتەییانەی بەجێهێشت. ئەم حاڵەتە بەنیسبەت ئافرەتانیشەوە بەهەمان شێوە بوو، قورئان پارێزگاری لە وەزیفەی سروشتی ئافرەتان کردووە وەکو ژن و وەکو دایك، بە

---

[٢٦] / ((لوبون)) Lebon n.p.d

[٢٧] / زۆرێك لە چیرۆکە مەسیحیەکان باس لەتوانای گشتگیری شەیتان دەکەن.

[٢٨] / بڕوانە:(سید قطب) لە کتێبی (ئیسلام و ئاشتی نێو دەوڵەتی) و کتێبی (دادپەروەری کۆمەڵایەتی لە ئیسلامدا) Sayyid Qutb;Isiam and Universal Peace (Indianapolis: American TrustPublications,1977).
Sayyid Qutb: Social Justice in Islam, trans..(New York: Octagon Books,1970).

پێچەوانەی وێنەی مارتاو مریەمەوە لە ئینجیلەکاندا* لەبەرئەمە هێرشی مەسیحی لەسەر سروشتی موحەممەد (ئینسانیەتی پوخت) ((زیاترە لە پێویست)) هێرشێکە لە واقعیدا لەهەڵە حاڵی بوونەوە بەرهەم هاتووە. خودی قورئان جەخت دەکاتەوە کە موحەممەد تەنها مرۆڤێکە)[29]. پەردە لەسەر ئەو تۆمەتانە لادەدات کەلە ئایندەدا ئاراستەی دەکرێن دەفەرمێت: ﴿ وَقَالُوا مَالِ هَٰذَا الرَّسُولِ يَأْكُلُ الطَّعَامَ وَيَمْشِي فِي الْأَسْوَاقِ ﴾[30].

بە تەنها بەراوردێك لەنێوان فەرهەنگی ئەو چەمکانەدا لەئینجیلەکاندا لەگەڵ ئەوانەی لەقورئاندا هاتوون دەمانگەیەنێتە چەندین دەرئەنجامی روون و ئاشکرا، لە ئینجیلەکاندا هەندێك ووشەی دیاریکراو بەشێوەیەکی بەرچاو دووبارە دەبنەوە وەکو:

موبارەك، پیرۆز، فریشتە، ژیانی ئەبەدی، ئاسمانەکان (فریسی) هەستی، گوناە، خۆشەویستی، پەشیمانی، لێبووردن، نهێنی، جەستە، (وەکو هەڵگری گوناە)، دەروون، پاکبونەوە، رزگار بوون ... هتد لە کاتێکدا لە قورئاندا دەبینین هەمان ئەم چەمکانە لەسەر شێوەی ئەم جیهانە دارێژراونەتەوەو فۆرمێکی واقیعیو دیاریکراوتریان گرتۆتە خۆ، وەکو: ( عەقڵ، تەندروستی، پاکژی، (دەستنوێژ) هێز، کرین، عقد، بارمتە، نوسین، چەك، جەنگ، بازرگانی، میوە، عەزم، وریایی، سزا، دادپەروەری، قازانج، تۆڵە، ڕاوشکار، شیفا، سود... هتد.

ئیسلام دەقی ئاینی (لاهوتی) دیاریکراو بەچەمكو ماناو تێگەیشتنی ئەوروپا قەبوڵ ناکات، هەروەکو چۆن دەقی دونیایی ئەبستراکت (مجرد)یش ناناسێت. هەموو بیرمەندێکی ئیسلامی زانایەکی ئاینیشە[31]، هەر وەکو چۆن هەموو بزووتنەوەیەکی ئیسلامی راستەقینەش بریتیە لە بزووتنەوەیەکی سیاسی.

---

* / مارتاو ماری دوو خوشکی لادێی بوون براکەیان ناوی (ئیلعان) Lazarus بووە لە ئینجیلەکاندا واناوی هاتووە ئەو کەسەیە کە حەزرەتی مەسیح زیندوی کردوەتەوە پاش مردنی وەکو یەکێك لە موعجیزەکانی، ئەو دووئافرەتەیش لە شوێنکەوتەو خۆشەویستانی مەسیح بوون ئینجیلەکان بە کەمێك درێژی چیرۆکەکەیان دەگێڕێتەوە: بۆ نموونە بڕوانە ئینجیلی یۆحنا (١٢:١-٧) (وەرگێڕ.ع).

[29] / ﴿ سُبْحَانَ رَبِّي هَلْ كُنتُ إِلَّا بَشَرًا رَّسُولًا ﴾ الاسراء /٩٣
﴿ قُلْ إِنَّمَا أَنَا بَشَرٌ مِّثْلُكُمْ يُوحَىٰ إِلَيَّ أَنَّمَا إِلَٰهُكُمْ إِلَٰهٌ وَاحِدٌ ﴾ الكهف: ١١٠

[30] / (الفرقان): ئایەتی (٧).

[31] / (ئیرنست بلوك) ئەم ئاماژە بۆکردنەی بۆ زیاد دەکاتو دەڵێت: ((زۆربەی زانائاینییە عەرەبەکان لەهەمانکاتیشدا پزیشك بوون)). Ernest Bloch; Natural Law and Human Dignity (Beograd.

دەکرێت چەند بەرەنجامێکی هاوشێوە لەبەراوردکردنی نێوان مزگەوت و کەنیسە وەربگرین، مزگەوت شوێنی خەڵکە بەڵام کەنیسە (پەرستگای خودایە). لەمزگەوتدا کەشێکی ئەقلانی زاڵە، لەکەنیسەدا کەشێکی صوفیانە هەیە، مزگەوت چەقی چالاکیەکی بەردەوام و نزیکە لە بازاڕو لەناوجەرگەی شوێنە ئاوەدان و قەرەباڵغەکاندایە[32].

بەڵام کەنیسە، وادەردەکەوێت کەوا کەمتر ئاوێتەو پەیوەست بێت بەژینگەکەیەوە، نەخشەی بیناسازی کەنیسە زیاتر بەرەو بێدەنگی و تاریکی و باڵانمایی دەڕوات، ئەمەیش وەکو ئاماژەیەك بۆ ((جیهانێکی تر)).

((کاتێك خەڵکی دەچنە ناو کاتدرائی (قوطبة) لەدەرەوە ڕا هەموو گرنگی پێدانێکی دونیاییان فەرامۆش دەکەن وەکو ئەوەی چووبنە ناو دونیایەکی ترەوە[33])).

بەڵام مزگەوت، ئەوا پێویستە خەڵکی پاش لێبونەوەیان لە نوێژ ئیدی گفتوگۆی کاروبارەکانی دونیایان بکەن، جیاوازیەکە لێرەدایە.

بەراوردی مەعصومیەتی پاپا بە مەعصومیەتی ئیجماع بکە لەفقهیی ئیسلامیدا، ((ئومەتی من لەسەر هەڵە کۆ نابنەوە)) وەکو لە فەرموودەیەکی پێغەمبەردا (د.خ) هاتووە، ((ئینجیل)) ئاڕاستەیە بۆ مرۆڤ، قورئان ئاڕاستەیە بۆ خەڵك، بەو شێوەیە بنەمای خەڵك ... هەمووان ... جەماعە سەرچاوە دەکرێت، لێرەدا هیچ شتێك بە ڕێکەوت نیە، ئینجیل لە گونجانێکی تەواودایە لەگەڵ ڕۆحی دەستەبژێری مەسیحەت و بنەما هەرەمیە پیرۆزەکەیدا ... کەهەنوتی کە هاوشێوەی بووزیەتە، بەڵام ئیسلام، کۆمەڵە دەلالەتێکی دونیایی دیاریکراو لە خۆ دەگرێت، وە ئاماژە دەکات بۆ خەڵك وەکو تەعبیر کردنێك لە عەقڵی گشتی شکۆدار، ئیسلام دەستەبژێری ناناسێت ... ئیدی ئەوانە راهیب بن یان قەشە، دوو بەرنامەی تێدایە نیە: یەکێکیان بۆ هەڵبژێراوان و ئەوتریان بۆ کەسانی سادە، بەڵکو ئەو ڕاگەیاندێکە بۆ بنەمایەکی دیموکراتی[34].

---

[32] / (سان برنارد) داوای ئەوەی دەکرد کە دێرو کەنیسەکان هەتا بکرێت لە دووری شارەو دروست بکرێن
KennithClark: Civilization: A Personal View (London; B.B.C. 1962)

[33] / هەمان سەرچاوە.

[34] / لە شورای دوم وانیکاندا پێشنیاری ئەوە کرا هەتا جۆرێك لەسیستمی کارگێڕی کۆمەڵی دابنرێت لەبری حوکمی تاك دەسەڵاتی پاپا بەڵام چونکە ئەم پێشنیارە لەگەڵ ماهیەتی مەسیحیەتدا تەواو جیاواز بوو رەت کرایەوە.

هەریەك لە (ئینجیل) و قورئان جیاوازن لە (تەورات) بەوەی کە بنەمای کۆمەڵی ڕۆحیان ڕاگەیاندوە، بەڵام لە کاتێکدا (ئینجیل) لەم ئاستەدا دەوەستێت و تێپەڕی ناکات، دەبینین ئیسلام دان بە نەتەوەکاندا دەنێت و هەر خۆیشی دەبێتە ڕەهەندێکی نوێ لە سەرو هەموویانەوە ((ئومەتی ئیسلام))، ئەمەیش یەکەیەکی گەورەیەو هەموو دەستەو کۆمەڵەکان تێدەپەڕێنێت بۆ ئەوەی، هەموو موسڵمانێك لە هەر جێگایەك بن لەو یەکە گەورەیەدا کۆ بکاتەوەو لەخۆیان بگرێت[٣٥]. سەرەڕای ئەمەیش ئیسلام جەخت لەسەر خزمایەتی و پەیوەندی خوێن دەکاتەوە، لەحاڵەتێکدا مەسیح بەتەواوەتی ڕەتی ئەم جۆرە پەیوەندیانەی کردوەتەوە[٣٦].

ڕەنگە تێڕوانینێك بۆ ئەو بارودۆخەی ئیسلام تێیدا سەری هەڵدا یارمەتیمان بدات بۆ تێگەیشتنێکی باشتر لە ئیسلام، بەو پێیەی کەبانگەوازێکە بۆ یەکگرتن لەنێوان عەقیدەو سیاسەتدا، عەرەب نەتەوەیەکی پڕلەچالاکیو حەیەویەت بوون، هەروەها خاوەنی دابو نەریتێکی بازرگانی قورسو نارەحەت بوون، جگە لەمەیش خاوەن دابو نەریتی ئاینی میتافیزیکیش بوون.

(کەعبە) کەیان تەنها ناوەندێکی ئاینی نەبوو، بەڵکو ناوەندێکی بازرگانیش بووە بە درێژایی چاخەکان. ئەو بارو دۆخە سروشتیەی کەرێگەی ئەوەی پێنەدا بوون کەگرنگی فاکتەری ئابووری لەژیاندا فەرمۆش بکەن.

وڵاتی عەرەب وەکو شاری پڕ پیت و بەرەکەتی ((جەلیل)) نەبوو کە بێشکەی مەسیحیەتە، مرۆڤ دەتوانێت بە کەمێك ماندوو بوون خۆی بژیەنێت، بەڵکو ژیان لە وولاتی عەرەباندا قورسو نارەحەتەو بەهەوڵو ماندووبونێکی زۆر نەبێت دابین ناکرێت، ئەوان پێویست بوو لەسەریان کەنارەحەتی کاروانە درێژەکانی حوشترەکان قەبوڵ بکەن، یان کاری سەخت بۆ چاندنی یەك پێ لە زەوی، یان دەستخستنی یەك گاڵۆن ئاو. لە

---

٣٥ /﴿ يَا أَيُّهَا النَّاسُ إِنَّا خَلَقْنَاكُمْ مِنْ ذَكَرٍ وَأُنْثَى وَجَعَلْنَاكُمْ شُعُوباً وَقَبَائِلَ لِتَعَارَفُوا إِنَّ أَكْرَمَكُمْ عِنْدَ اللَّهِ أَتْقَاكُمْ إِنَّ اللَّهَ عَلِيمٌ خَبِيرٌ ﴾ (الحجرات:١٣).

٣٦ / ئەم ئایەتە ﴿ يَا أَيُّهَا النَّاسُ اتَّقُوا رَبَّكُمُ الَّذِي خَلَقَكُمْ مِنْ نَفْسٍ وَاحِدَةٍ وَخَلَقَ مِنْهَا زَوْجَهَا وَبَثَّ مِنْهُمَا رِجَالاً كَثِيراً وَنِسَاءً وَاتَّقُوا اللَّهَ الَّذِي تَسَاءَلُونَ بِهِ وَالْأَرْحَامَ إِنَّ اللَّهَ كَانَ عَلَيْكُمْ رَقِيباً ﴾ (النساء:١) وە ئایەتی ﴿ إِنَّمَا الْمُؤْمِنُونَ إِخْوَةٌ فَأَصْلِحُوا بَيْنَ أَخَوَيْكُمْ ﴾ (الحجرات:١٠) بەراوردی بکە لەگەڵ ئەوەی لەئینجیلی متی (١٢): ٤٧-٤٩) داهاتووە (یەکێکیان پرسیاری لێکرد ووتی :دەبینم دایکتو براکەت وەستاون قسەت لەگەڵ ناکەن : / لە وەڵامدا پێی ووت: کێ دایکمە؟ کێن براکانم؟ پاشان دەستی درێژکرد بۆ قووتابیەکانی، ووتی: بڕوانە ئەوانە دایكو براکانمن.

هەمانکاتدا ژیانی بیابان هەست و سۆزی ئاینی بەهێز دەکات و دەیوروژێنێت و قوڵی دەکاتەوە لە دەرونیاندا. لەژێر کاریگەری بەردەوامی ئەم دوو حەقیقەتە دژەدا، غەریزەو بلیمەتی. عەرەب پێکهاتو، سازندنی بۆ ئەوەی پێشوازی لە چارەنووسیان بکەن کە ئەویش ئیسلامە کە لەتەعالیمەکانیدا هەردوو رەهەندی ئاسمان و زەمینی کۆکردۆتەوە، ئینجیلەکان دەتوانن بڵێن: (بژی چۆن گوڵە (زەیبق) لە کێڵگەکاندا دەژین)، بەڵام قورئان هانی خەڵك دەدات بۆ خۆماندووکردن و گەڕان بە شوێنی نان و گوزەرانداو دەڵێت :

﴿ وَجَعَلْنَا النَّهَارَ مَعَاشاً ﴾ النبأ /١١، هەروەها نیعمەتی ڕۆژی ڕۆشنیان وەبیر دەهێنیتەوە کەوا هەوڵ و کۆشش ئاسان دەکات، دەفەرمێت: ﴿ هُوَ الَّذِي جَعَلَ لَكُمُ اللَّيْلَ لِتَسْكُنُوا فِيهِ وَالنَّهَارَ مُبْصِراً إِنَّ فِي ذَلِكَ لَآيَاتٍ لِقَوْمٍ يَسْمَعُونَ ﴾ يونس /٦٧[٣٧].

قورئان ـ بە پێچەوانەی ئینجیلەکانەوە جەخت دەکات لەسەر ئەوەی خودا مرۆڤی دروست کردووە بۆ ئەوەی ببێتە گەورەو (جێنشین) لە زەویدا[٢٨] هەروەها مرۆڤ دەتوانێت سروشت و جیهان تەنها لە ڕێگەی مەعریفەو کاردوە رام بکات، واتە بە زانست و کردەوە.

لەسۆنگەی ئەم حەقیقەتەوە، بە جەختکردنەوەی ئیسلام لەسەر یاساو دادپەروەری، ئەوە دەسەلمێنێت کە ئەو تەنها ڕۆشنبیری بە ئامانج ناگرێت بەڵکو هەوڵیش لەپێناو بونیادنانی شارستانیەتیشدا دەدات[٣٩]. قورئان ئاماژە بە هەڵویستی ئیسلام دەکات سەبارەت بەشارستانیەت ئەمیش لە ڕێگەی گرنگی دانیەوە بەخوێندنەوەو نووسین وەکو ئەوەی کە ئەم دوانە بەهێزترین بزوتنەوەی شارستانیەتن، شتێکی نامۆش نیە کە وەحی لەم بارەیەوە گرنگی پێداون، یەکەمین ئایەتی قورئان بوو کە دابەزیە سەر موحەممەد (د.خ)[٤٠].

---

٣٧ / بەراوردی ئەمە بکە کە لەئینجیلی متی بۆ نموونە هاتووە (٢٨:٦) تێیدا دەڵێت: بۆچی تۆ نیگەرانی لە جل و بەرگەکەت؟ بروانە: چۆن گوڵە زەیبەق لەکێڵگەدا گەشە دەکات، نە هەوڵ دەدات و نە ماندو ئەبێت لەگەڵ ئەوەی لە قورئاندا هاتووە لە هەردوو ئایەتی (١١)ی سورەتی (النباء)و ئایەتی (١٦)ی سورەتی غافر : هەروەها بڕوانە ئایەتی (١٠)ی سورەتی (الجمعە) کە دەفەرموێت: ﴿ فَإِذَا قُضِيَتِ الصَّلَاةُ فَانتَشِرُوا فِي الْأَرْضِ وَابْتَغُوا مِنْ فَضْلِ اللَّهِ وَاذْكُرُوا اللَّهَ كَثِيراً لَعَلَّكُمْ تُفْلِحُونَ ﴾.

٣٨ / ﴿ وَإِذْ قَالَ رَبُّكَ لِلْمَلَائِكَةِ إِنِّي جَاعِلٌ فِي الْأَرْضِ خَلِيفَةً ﴾ (البقرة: ٣٠)

٣٩ / ئیسلام تاکە ئاینێکە کەیاساکەی (شەریعەتەکەی) وەکو بەشێکی دانەبڕاو لەخۆی دەهێڵێتەوە.

٤٠ / ﴿ اقْرَأْ بِاسْمِ رَبِّكَ الَّذِي خَلَقَ خَلَقَ الْإِنْسَانَ مِنْ عَلَقٍ اقْرَأْ وَرَبُّكَ الْأَكْرَمُ الَّذِي عَلَّمَ بِالْقَلَمِ علم الأنسان ما لم يعلم ﴾ (العلق: ٤).

وا دەردەکەوێت کە نوسین نامۆ بێت بەئاینی (ئەبستراکت). ئینجیلەکان ماوەیەکی دوورودرێژ بەشێوەیەکی زارەکی (شەفەوی) مانەوە، ئەوەی ئێمە زانیوومانە نوسینەوەی ئینجیل پاش نەوەیەکی تەواو لە وەفاتی حەزرەتی (عیسا) (سەلامی خوای لێبێت) دەستی پێکردوە.

بە پێچەوانەی ئەمەیشەوە موحەممەد (د.خ) وا ڕاهاتبوو کە قورئان پاش دابەزینی یەکسەر بەسەر نووسەرانی وەحی‌دا دەیخوێندەوە بۆ ئەوەی بینوسنەوە، ئەمەیش مومارەسەیەك بوو کەوا (عیسی) پێی قەبووڵ نەبوو، بەڵکو زیاتر لەگرنگی پێدانی (فەریسیەکان) نزیك بوو کەئەو نکوڵی لێ دەکرد[٤١].

جەختکردنی قورئان لەسەر ڕاستیەتی بەرەنگاربونەوەی شەڕو زوڵم:[٤٢] تەنها لەلایەنی دینداریی‌یەوە نیە بە مانا تەسکەکەی، بنەماکانی ناتوندوتیژی‌و بەرەنگارنەبوونەوە زیاتر لەبنەماکانی ئاینی (مجرد) ئەبستراکەوە نزیکن. هاوشێوەی ئەم بنەمایانەیش لەتەعالیمەکانی حەزرەتی (عیسی)و فیکری ئاینی هیندیدا دەردەکەون، کە درێژبوونەوەی ئەمە لای غاندی لە (ستیاگراها) دەبینین[٤٣] کە شێوازێکی خەباتگێڕی لەرێگەی بەکارنەهێنانی توندوتیژی و یاخی بوونی مەدەنیەوە[٤٤].

کاتێك قورئان بڕیاری جەنگی ڕاگەیاند، بەڵکو فەرمانی پێدا لە بری ملکەچ بوون بۆ موعانات و زوڵم، ئەمە بڕیارێکی ئاینی یان ئەخلاقی نەبوو، بەڵکو دانانی بناغەو دەستورێکی سیاسی و کۆمەڵایەتی بوو.

---

[٤١] / موسی نوسینی بەکاردەهێنا ئەمەیش تەواو دەگونجێت لەگەڵ جێگاو پێگەی پەیامەکەی لەمێژوودا بڕوانە تەورات: Romans (o-5), Nambers 33:2

[٤٢] / ﴿وَالَّذِينَ إِذَا أَصَابَهُمُ الْبَغْيُ هُمْ يَنْتَصِرُونَ وَجَزَاءُ سَيِّئَةٍ سَيِّئَةٌ مِثْلُهَا فَمَنْ عَفَا وَأَصْلَحَ فَأَجْرُهُ عَلَى اللَّهِ إِنَّهُ لايُحِبُّ الظَّالِمِينَ﴾ (الشورى:٣٩-٤٠).

[٤٣] / بڕوانە غاندی: Mohandas Karamchand Gandi: ((Satyagraha in South Africa)),Mahatma Gandi at Work))..(New York: Macmillan Co. 1931), Erik Hombrger-Erikson: Gandis Truth on the Origin of Militant Nonvionlence (New York: Norton,1969).

[٤٤] / ﴿كُتِبَ عَلَيْكُمُ الْقِتَالُ وَهُوَ كُرْهٌ لَكُمْ وَعَسَى أَنْ تَكْرَهُوا شَيْئاً وَهُوَ خَيْرٌ لَكُمْ وَعَسَى أَنْ تُحِبُّوا شَيْئاً وَهُوَ شَرٌّ لَكُمْ وَاللَّهُ يَعْلَمُ وَأَنْتُمْ لاتَعْلَمُونَ﴾ البقرة : ٢١٦) ﴿ أُذِنَ لِلَّذِينَ يُقَاتَلُونَ بِأَنَّهُمْ ظُلِمُوا وَإِنَّ اللَّهَ عَلَى نَصْرِهِمْ لَقَدِيرٌ ﴾ (الحج:٣٩)
- ﴿ إِنْ يَثْقَفُوكُمْ يَكُونُوا لَكُمْ أَعْدَاءً وَيَبْسُطُوا إِلَيْكُمْ أَيْدِيَهُمْ وَأَلْسِنَتَهُمْ بِالسُّوءِ وَوَدُّوا لَوْ تَكْفُرُونَ ﴾ (الممتحنة:٢)
- ﴿ يَا أَيُّهَا الَّذِينَ آمَنُوا هَلْ أَدُلُّكُمْ عَلَى تِجَارَةٍ تُنْجِيكُمْ مِنْ عَذَابٍ أَلِيمٍ ﴾ (الصف ئایەتی:١٠)

(موحەممەد)(د.خ) کەسێکی جەنگاوەر بوو، لە ژیاننامەیدا هاتووە کە نۆ شمشێرو سێ ڕم و حەوت زرێ و سێ قەڵغان و چەکی تری هەبووە، لەم لایەنەوە دەبینین موحەممەد (د.خ) لە حەزرەتی موسا (پێغەمبەری جەنگاوەر) چووە[٤٥].

حەرامکردنی مەی لە ئیسلامدا ـ بە پلەی یەکەم ـ سیفەتێکی کۆمەڵایەتی هەبوو، مەی (شَر)ێکی کۆمەڵایەتیە، ئەگینا لە ئاینی (مجرد)دا شتێك نیە دژ بە مەی بێت. بەڵکو هەندێك لە ئاینەکان مەییان بەکارهێناوە وەکو هۆکارێك بۆ دروستکردن و ئامادەکردنی حاڵەتی نشوە لە مرۆڤدا، وەکو چۆن تاریکایی کاتدارئی و بخوری بۆن خۆش ئەم ڕۆڵە دەگێڕن، هەموو ئەمانە کۆمەڵە ئامرازێکن بۆ بەدەست خستنی ئەم جۆرە لە مەست بوونی پێویست. مەسیحیەکان لەوەدا هەڵە نابینینن کە مەی (بە شێوەیەکی ڕەمزی) لەڕێگەی ئێوارەی خودایەوە بگۆڕێت (بە شێوەیەك ڕەمزی) بۆ خوێنی مەسیح.

هەر بۆیەش مەسیحیەت مەی حەرام نەکردووە هەروەکو ئیسلام چۆن حەرامی کردووەو لە ریزی گوناهە گەورەکانی داناوە. ئەمەیش لەبەر ئەوەی ئیسلام کاتێك مەی حەرامکرد لەمەدا ڕێگەی زانستی گرت نەك ڕێگەی ئاینی (مجرد) رووت.

یەکێتی ئیسلام پارچەپارچە بوو لەسەر دەستی خەڵکانێکدا کەوا ئیسلامیان کورت کردوەتەوە تەنها لەلایەنە ئاینیە رووتەکەیدا، ئەمەیش تایبەتمەندیەکی ئەم ئاینەیە کە لە هەموو ئاینەکانی تری جیا دەکاتەوە.

ئیسلامیان بچووك کردەوە بۆ تەنها ئاینێکی رووت یان زیاتر بۆ صۆفیەت، (بەمەیش ڕەوشی موسڵمانان بەرەو ناڵەباری چوو).

چونکە کاتێك موسڵمانان چالاکیان کز دەبێت و کاتێك ڕۆڵیان (فەرامۆش دەکەن لەم جیهانەدا)[٤٦]، وە دەوەستن لە مامەڵەو کارلێك لەگەڵیدا، ئیدی دەوڵەتی ئیسلامیش وەکو هەر دەوڵەتێکی تری لێ دێت، کاریگەری لایەنە ئاینیەکە لە ئیسلامدا وەکو کاریگەری

---

[٤٥] / زۆر لێکچوونمان دۆزییەوە لەنێوان موسیو موحەممەد یان یەهودت‌و ئیسلامدا بیینەوە، ئەم لێکچوونە بوونی نیە لەنێوان یەهودیەت‌و مەسیحیەتدا. تەعالیمەکانی ئەم دوو ئاینە بەمانایەك لەماناکان لەدانانی (کێشەو دژەکەیدا) رەنگە ئەمەیش راڤەی دیاردەی (دژایەتی سامیەت) مان بۆ روون بکاتەوە کە باوبوو لە زۆربەی دەوڵەتە مەسیحیەکاندا، ئەمەیش هەستێکە بەهیچ شێوەیەك بونی نیە لەنێوان گەلانی ئیسلامیدا.

[٤٦] / ﴿ لَيْسَ الْبِرَّ أَنْ تُوَلُّوا وُجُوهَكُمْ قِبَلَ الْمَشْرِقِ وَالْمَغْرِبِ وَلَكِنَّ الْبِرَّ مَنْ آمَنَ بِاللَّهِ وَالْيَوْمِ الْآخِرِ وَالْمَلَائِكَةِ وَالْكِتَابِ وَالنَّبِيِّينَ وَآتَى الْمَالَ عَلَى حُبِّهِ ذَوِي الْقُرْبَى وَالْيَتَامَى وَالْمَسَاكِينَ وَابْنَ السَّبِيلِ وَالسَّائِلِينَ وَفِي الرِّقَابِ وَأَقَامَ الصَّلَاةَ وَآتَى الزَّكَاةَ وَالْمُوفُونَ بِعَهْدِهِمْ إِذَا عَاهَدُوا وَالصَّابِرِينَ فِي الْبَأْسَاءِ وَالضَّرَّاءِ وَحِينَ الْبَأْسِ أُولَئِكَ الَّذِينَ صَدَقُوا وَأُولَئِكَ هُمُ الْمُتَّقُونَ ﴾ (البقرة:١٧٧)

هەر ئاینێکی تری لێ دێت، دەوڵەت دەبێتە هێزێکی ناپۆشتەو تەنها خزمەت بەخۆی دەکات، ئەمە لەکاتێکدا ئاینی سستو خاو. کۆمەڵگە بەرەو سلبیەتو دواکەوتن دەبات، پاشاو فەرمانڕەواو زانایانی بێ باوەڕو کاهینو کۆمەڵەی دەروێشو صۆفیەتو شاعیرانی سەرخۆش پێك دەهێنێت، هەموویان پێکەوە روخساری دەرەکی بۆ دابەشبوونی ناوخۆیی پێکدەهێنن (کە تووشی ئیسلام هاتووە). لێرەدا دەگەڕێینەوە بۆ ئەو هاوکێشە مەسیحیە کە دەڵێت: ئەوەی هی قەیسەرە بیدە بە قەیسەر ئەوەیش هی خوایە بیدە بەخوا[٤٧]).

فەلسەفەی صۆفیەتو مەزهەبە (باطنیەکان) هەموویان (بێ شك) نمایشی لارترین شێواز دەکەن لەشێوازەکانی خستنە ڕووی ئیسلام، لەبەرئەوە دەتوانین ناوی بنێین بە (مەسیحیەت) کردنی ئیسلام. ئەم حاڵەتە سەرسم پێدانی ئیسلامە لەپەیامی موحەممەدەوە (د.خ) بۆ عیسا (سەلامی خوای لێبێت[٤٨]).

هەروەها لەلایەکی تریشەوە مەترسیی بە (مادی) بوون لەئارادا هەیە، مەبەستم لەمە ((مادیەتی)) ئیسلامە، بەڵام (انطباع)ی گشتیو باو بەو شێوەیەکە مادییەتی ئیسلام یان ئەو کۆمەڵە ڕەگەزە سروشتی و کۆمەڵایەتیانە کە لە کرۆکیدا هەڵی گرتوون، جیهانی ئیسلامی لەو بیرۆکە مادییە توندڕەوانە کە هەمیشە لە ئەورووپاوە دەردەچن پارێزراو بکات.

مەسیحیەت ـ لە رووسیای پێش شۆڕشدا ـ ڕۆڵێکی دەگێڕا هاوشێوەی ڕۆڵی ((دۆن کیشۆت)) نەیتوانی لە بەرامبەر واقیعگەڕایی ئەفکارەکانی شیوعیەتدا خۆڕاگر بێت.

لەبەرئەوە، نەبوونی شۆڕشی شیوعیەت ـ یان شکستهێنانی ـ لە دەوڵەتانی ئیسلامیدا شتێکی ڕێکەوت نەبوو، ئیسلام پێویستی بە (مارکس) نیە چونکە لەخۆیدا مارکسیەتێکی تایبەت بەخۆی هەیە کە بە شێوەیەکی تەواوەتی خستویەتە لاوە [٤٩] ((ئەگەر ئەم تەعبیرە

---

[٤٧] / بڕوانە: ئینجیل متی ٢٢: ٢١٠.

[٤٨] / شایانی باسکردنە لێرەدا کە ئەم قسەیە دەکەین لە زەنماندا ئەو مومارەسە هەڵانەی هەندێ لە گروپی دەروێشی هەیە کە ئەم حاڵە تانەیان دواجار گەیاندنیە سلبیەت و پاشەکشە کردن لەژیانی چالاکانە، بەڵام ئەگەر قسەکردن لەسەر ئایینداری بێت بەمانا قوڵەکەی ئەوا ئێمە دەڵێین هەمووموسڵمانێك پابەندی صۆفیەتە بەمانایەك لەماناکان، پێغەمبەریش ﷺ لەم ڕووەوە لە پێشەوەی هەمواندایە.

[٤٩] / خاڵی هاوبەش هەیە لەنێوان تەوراتو قورئاندا، لەو ئایەتانە کەلە خاوەن دەسەڵاتو سەرمایەدارەکان دەدات، قورئان پەردە لەسەر ئەو سەرکردە خۆبەزلزانانە لادەدات :﴿ قَالَ الْمَلَأُ الَّذِينَ اسْتَكْبَرُوا مِنْ قَوْمِهِ لِلَّذِينَ اسْتُضْعِفُوا لِمَنْ آمَنَ مِنْهُمْ أَتَعْلَمُونَ أَنَّ صَالِحاً مُرْسَلٌ مِنْ رَبِّهِ قَالُوا إِنَّا بِمَا أُرْسِلَ بِهِ مُؤْمِنُونَ ﴾ الأعراف /٧٥، هەروەها ئەرستۆکراتیەتی گومڕاو

گونجاو بێت)). قورئان واقعیەتی تەوراتی لەخۆیدا (احتواء) کردووە، لەکاتێدا مارکسیەت هات بۆ ئەوروپا بۆ بارمتە کرد ئەوەی ئەو رەگەزە یەهودیەی کە کاثۆلییکیەت و ئەرسۆزکسیەت بەتەواوەتی خستبویانە لاوە ـ بەو عەقلانیەتەی کە تێیدا هەیە سەلماندی کە زیاتر توانای بەرەنگاری کردنی ئەو تەحەدا شۆڕشگێڕیەی هەیە. لەم لایەنەوە، مەسیحیەتی پرۆتستانتی دادەنرێت بەوەی کە لە ئیسلام نزیکتر بێت هەتا کاثۆلیکیەت.

بەڵام بەهۆی چەند هۆکارێکی مێژوویەوە هەروەها رووبەڕوو بونەوەی سیاسیەوە لەنێوان مەسیحیەت‌و ئیسلامدا، رۆژئاوا ئەم نزیکیەی نێوان ئیسلام و مەسیحیەتی فەرامۆش کرد. قەبوڵ کردنی ئیسلام بەوەی کە ئینجیل کتێبێکی پیرۆزە، هەروەها قەبوڵ کردنی مەسیح وەکو پێغەمبەری خوا، بەهەمان شێوە ئەمەیش پشتگوێ و خراو فەرامۆش گرا.

لەکاتێکدا ئەگەر (رۆژئاوا) بیتوانیایە راستگۆیانە لەم حەقیقەتە ڕابمایەو هەموو ئەو دەرئەنجامە پێویستیانەی لێ هەڵگۆزیبایە، ئەوا پەیوەندی لەنێوان ئەم دوو ئاینە جیهانیە مەزنەدا لە داهاتوودا بەرەو رەهەندی تازەو تەواو نوێ ئاراستە دەبوون [٥٠].

---

**ستەمکار :** ﴿ وَكَذَلِكَ جَعَلْنَا فِي كُلِّ قَرْيَةٍ أَكَابِرَ مُجْرِمِيهَا لِيَمْكُرُوا فِيهَا وَمَا يَمْكُرُونَ إِلَّا بِأَنْفُسِهِمْ وَمَا يَشْعُرُونَ ﴾ الأنعام/١٢٣، **هەروەها رەخنەی سەرکردە بێباوەڕەکان :** ﴿ فَقَالَ الْمَلَأُ الَّذِينَ كَفَرُوا مِنْ قَوْمِهِ مَا نَرَاكَ إِلَّا بَشَرًا مِثْلَنَا وَمَا نَرَاكَ اتَّبَعَكَ إِلَّا الَّذِينَ هُمْ أَرَاذِلُنَا بَادِيَ الرَّأْيِ وَمَا نَرَى لَكُمْ عَلَيْنَا مِنْ فَضْلٍ بَلْ نَظُنُّكُمْ كَاذِبِينَ ﴾ هود/٢٧، **هەروەکو چۆن رەخنەی ئەو خاوەن سەرمایان دەکات :** ﴿ وَمَا أَرْسَلْنَا فِي قَرْيَةٍ مِنْ نَذِيرٍ إِلَّا قَالَ مُتْرَفُوهَا إِنَّا بِمَا أُرْسِلْتُمْ بِهِ كَافِرُونَ ﴾ سبأ/٣٤، **هەموو ئەمەش بە سروشتی حاڵ گوزارشت لە پابەندبوون دەکات بە هەڵویستێك بەرامبەر بە کۆمەڵگە ئەوەیش خاسیەتێکە لە ئیسلامدا کە یەهودیەتیش بە رێژەیەك تێیدا بەشدارە.**

٥٠/ ﴿قُلْ يَا أَهْلَ الْكِتَابِ تَعَالَوْاْ إِلَى كَلَمَةٍ سَوَاءٍ بَيْنَنَا وَبَيْنَكُمْ أَلاَّ نَعْبُدَ إِلاَّ اللّهَ وَلاَ نُشْرِكَ بِهِ شَيْئًا وَلاَ يَتَّخِذَ بَعْضُنَا بَعْضاً أَرْبَابًا مِّن دُونِ اللّهِ فَإِن تَوَلَّوْاْ فَقُولُواْ اشْهَدُواْ بِأَنَّا مُسْلِمُونَ﴾ آل عمران ٦٤ ، ﴿وَقُولُوا آمَنَّا بِالَّذِي أُنزِلَ إِلَيْنَا وَأُنزِلَ إِلَيْكُمْ وَ إِلَهُنَا وَإِلَهُكُمْ وَاحِدٌ وَنَحْنُ لَهُ مُسْلِمُونَ﴾ العنكبوت/ ٤٦.

# بەشی هەشتەم

## ئیسلام و ئـــایین

﴿نوێژ تەنها گوزارش نیە لە هەڵویستی ئیسلام سەبارەت بە جیهان، بەڵکو هەروەها رەنگدانەوەیەکە بۆ ئەو شێوازەی کە ئیسلام دەیەوێت سیستماتیزەی ئەم جیهانەی پێ بکات﴾.

# دوو ڕەهەندی بوونی پێنج پایەکەی ئیسلام

نوێژ تەنها گوزارشتێك نیە لە هەڵویستی ئیسلام سەبارەت بەجیهان، بەڵکو هەروەها ڕەنگدانەوەی ئەو ڕێگەیە کە ئیسلام دەیەوێت لێیەوە ئەم جیهانە ڕێکبخات. نوێژ ڕاگەیەنەری دوو شتە:

یەکەمیان، ئەوەیە کە دوو ئامانجی مرۆیی بنەڕەتی هەیە.

دووهەمیشیان، ئەم دوو ئامانجە - سەرەڕای دابڕانیکی لۆژیکی - یشیان دەکرێت یەك بخرێتەوە لە ژیانی مرۆڤایەتیدا، بەهۆی ئەوەوە لەوێوە کە نوێژ بوونی نابێت بەبێ پاك بوونەوە، هەروەها هیچ کۆششێکی ڕۆحی بوونی نابێت بەبێ کۆششی مادی و کۆمەڵایەتی کە هاوڕێیەتی بکات. نوێژ کامڵترین نمایشێکە بۆ ئەوەی کە پێی دەڵێن (یەکێتیەکی دوو جەمسەر) لە ئیسلامدا، بە ڕوانین بۆ ئەو ئاسانیەش کە لە نوێژدا هەیە، ئەوا ئەم خاسیەتەی دابەزاندوە بۆ گوزارشت لێکردنێکی ئەبستراکت، بەمەیش بووە بڕبڕەو ڕەمزی ئیسلامیی.

نوێژ لە ئیسلامدا بەتاڵە بەبێ دەست نوێژ، لەکاتێکدا لە ئاینی (مجرد) ئەبستراکدا دەکرێت نوێژ بەجێ بهێنرێت لەگەڵ بوونی (ناپاکژی پیرۆز)دا، کە هەندێك لە سستەمە ڕەهبانیەکانی مەسیحیەت و هیندۆسیەتدا بوونی هەیە، ئەو ڕاهیبانەی کە گوێ بە پاك و خاوێنی نادەن هەست بەشعورێکی ئاینی ڕەسەن دەکەن، ئەویش ئەوەیە کە فەرامۆش کردنی جەستە - بەڵکو فەرامۆشکردنی بە ئەنقەستی پاکوخاوێنی - ڕەگەزی ڕۆحی لە نوێژدا بەهێز دەکات. ئەم لۆژیکەیش لەو گریمانەوە سەرچاوە دەگرێت کە نوێژ لە ڕووی ئەو بنەما بنچینەییانەوە لەسەری وەستاوە، نوێژێکی ڕاستگۆیانە دەبێت ئەگەر (ڕزگار بوو) لە هەر گرنگی پێدانێك و زیادەیێك بەجەستە، ئەوەندەی ئامادە بوونی جەستە کەمتر ببێتەوە ئەوەندەیش جەخت کردنەوە لەلایەنی ڕۆحی زیاد دەکات[1].

---

[1] / لەناو ئەو سەرچاوە ئیکلیرکیە دیارانەدا کە ئەم لایەنەیان لە نوێژدا هەتا ئەوپەڕی ڕادە گرتووەتە بەر ((یعقوب الرسولی))یە لەم بارەیەوە ڕادەی ئەو فەرامۆشکردنە بە ئەنقەسەی جەستەو ڕانەگرتنی پاك و خاوێنی لە بەرایی چاخەکانی ناوەڕاستدا بەم شێوەیە وێنا دەکات: ((وادەیروانیە پاکوخاوێنی کە شتێکی بێزراو بێت هەروەها ڕاهیبە ژن و پیاوەکان شانازیان بەوەوە دەکرد کە ئاو قاچی تەڕ نەکردوون مەگەر کاتێك نەبێت ناچار

دەست نوێژو جموجوڵەکان لە نوێژدا لایەنی عەقڵ پێك دەهێنن وەبوونی ئەم واناکات کە لایەنە ڕۆحیە (مجرد)ە کە فەرامۆش بکرێت بەڵکو سستمو تەندروستیە پێکەوە، وە ئەوە تەنها تێڕامانێکی سۆفیانە نیە، بەڵکو هەروەها چالاکیەکی کرداریشە، لەڕاستیدا شتێك لە ڕۆحی سەربازی لە نوێژدا هەیە، لە دەست نوێژ گرتنی بەیانیاندا بە ئاوی ساردو لە ریزە پێکەوە بەستراوەکانی نوێژدا.

ئەم مانایەش لانەدەچوو لە زهنی یەکێك لە سەربازە دیدەوانیەکانی سوپای فارسدا پێش جەنگی (قادسیە) کاتێك سەربازەکانی بینی ریك وەستابوون لە ریزەکاندا بۆ نوێژی بەیانی، ووتی بە سەرکردەکەی : ((بڕوانە سوپای موسڵمانان خەریکی مەشق کردنی سەربازی ڕۆژانەن[٢])).

جموجوڵە دەرەکیەکان هەتا ڕادەیەك ئاسانن، بەڵام هەموو ئەندامەکانی جەستە دەگرێتەوە. پێنج جار نوێژ لەڕۆژێکدا لەگەڵ دەستنوێژ ((یان خۆشتن)) . یەکەمیان پێویستە بەجێ بهێنرێت پێش هەڵهاتنی ڕۆژو، دواینیشیان لە شەودا ـ ئامرازێکی کاریگەرە دژ بە تەمەڵی و تەوەزلی.

ئەگەر ویستیشمان لەلایەنی عەقڵانی نوێژ وردبینەوە، دەبینین ئەو بەڕۆڵی خۆی یەك لایەن نیە. دوو ڕەهەندی لە دەست نوێژدا دووبارە دەبێتەوە دەست نوێژ هەم پاك و خاوێنیەکی تەندروستیە، بەڵام ئەم پاك و خاوێنیە ((بە تەنها مەعریفە نیە، بەڵکو هەروەها فەزیلەتیشە[٣])).

ئیسلام شتێکی ناوخۆیی (باطنی) خستووەتە سەر، ئەم سیفەتەیش ((لەلایەنی مەنهەجیەوە)) بە تایبەتمەندیەکی ئیسلامی دادەنرێت، دەرئەنجام ئیسلام پاك و خاوێنی بەرز کردەوە بۆ ئاستی پیرۆکەیەك و ئۆرگانیانە پەیوەستی کرد بە نوێژەوە.

---

بوویێتن لە رووبارێکەوە بپەڕنەوە)) بڕوانە ((برتراند راسل)). Bertrand Russell: The History of Western Philosopy (London; n.p.,1946)p.371

[٢] / بڕوانە: لاپەرە (٣٥) لەکتێبی ((رسلر)) Risler: la Civilization Arabe…

[٣] / بڕوانە: (جان جاك رۆسۆ).Jean Jacques Rousseau: Emile , trans…(London: Dent, 1955)

قورئان ((بە پێچەوانەی ئەوانەوە کە خاوەنی بڕوایەکی ((مجرد))ن ڕایدەگەیەنێت ((خودا پاکەکانیشی خۆش دەوێت[4])). دەستەواژەی وەکو ((پاك و خاوێنی لەباوەڕەوەیە)) تەنها لە ئیسلامدا هەیە، جەستە لە هەموو ئاینە ناسراوەکانی تردا ((لە دەرەوەی گرنگی پێدانەوەیە[5])).

نوێژی تەراویح کە پەیوەستە بە ڕۆژوەوە لەمانگی ڕەمەزاندا کاریگەری تەندروستی و مەبەستی پزیشکی هەیە. ئەمەیش هەروەها تەنها لە ئیسلامدا مومکینە.

نوێژ گرێدراوە بە ڕۆژوەوە - تەراویح - بە ئاشکرا ئامانجێکی تەندروستی هەیە، کە ئەمەیش تەنها لەئیسلامدا هەیە. ئەوەی کە نوێژ بۆ کاتێکی دیاریکراوی شەوو ڕۆژو بەرەو ڕووی شوێنێکی تایبەت - کعبە - ئاڕاستە کراوە - بە پێچەوانەی لۆژیکی ئایینی - بەو مانایەیەی کە نوێژ بە سروشت و بزاوتنەوە گرێ دراوە، کاتەکانی نوێژ، هەروەها ڕۆژوو حەج کردن، هەموویان پشت بەچەند حەقیقەتێکی گەردوونی دیاریکراو دەبەستن.

ئەم ڕاگەیاندنە قورئانیە کە دەفەرموێت: ﴿ لَيْسَ الْبِرَّ أَنْ تُوَلُّوا وُجُوهَكُمْ قِبَلَ الْمَشْرِقِ وَ الْمَغْرِبِ[6] ﴾ نزیکترە لە چەمکی ئاینی (مجرد)ەوە، ئەمە لەکاتێکدا کە نوێژی ئیسلامی، بە مانا باوەکەی، وەکو چۆن ڕەگەز مادییە (سروشتیەکان) دەگرێتەوە بە هەمان ڕادەو شێوەیش ڕەگەزە ڕۆحیەکانیش دەگرێتەوە، لەم لایەنەیشەوە نوێژ ئینتیمای بۆ ئەم جیهانمان هەیە کە شوێن و کات دیاری دەکەن. پەرەسەندنی خێرای زانستی گەردووناسیش لە چاخە یەکەمەکانی ئیسلامدا پەیوەندیەکی توندو تۆڵی بەپێویستی موسڵمانانەوە هەبووە بۆ دیاریکردنی ووردی شوێن و کات.

ئێمە بەڵگەی زۆرمان لەبەردەستایە بۆ گەیشتنە ئەو بڕوایەی پەرەسەندن لەم بوارەدا ئامانجێك بووە لە ئامانجەکانی ئیسلام.

---

[4] / ﴿ إِنَّ اللَّهَ يُحِبُّ التَّوَّابِينَ وَيُحِبُّ الْمُتَطَهِّرِينَ ﴾ البقرة / ٢٢٢.

[5] / شیاوی باسە هەموو گەرماوە گشتیەکان کە ڕۆمانیەکان بونیادیان نابوو پاش بڵاوبوونەوەی مەسیحیەت نەمان، دەربارەی ئەوەیش کەنیسە گەرماوەکانی دادەخست و (دێر)ی دروست دەکرد. لە ئیسلامدا بە پێچەوانەوە لە تەنیشت مزگەوتەکانەوە گەرماویش بونیاد دەنێت، هیچ مزگەوتێك نیە لە جیهاندا بەبێ دوشێکی ئاو تێیدا بەلایەنی کەمەوە، ئەمانە بەرێکەوت نین.

[6] / بڕوانە: قورئان سورەتی البقرە ئایەتی (١٧٧).

ئەم لایەنەی نوێژ (ئیتر لایەنی دونیایی یان کرداری یان سروشتی یان هەر ناوێکی تری لیّ بنێت) بە توندی گەشە بەسیفەتێکی تر دەدات، ئەویش سیفەتی کۆمەڵایەتیە. نوێژ تەنها کۆبونەوەی کۆمەڵێك خەڵك نیە بۆ بەجێهێنانی نوێژ بەجەماعەت، بەڵکو هەروەها بۆنەیە کە بۆ پەیوەندیە کەسی‌یە ڕاستەوخۆکان، بەم ئیعتیبارەیش، نوێژ دژ بەفەردیەت و سلبیەت و گۆشەگیری دەبێت. ئەگەر ژیان مرۆڤەکان لەیەك جیا دەکاتەوە، ئەوا مزگەوت کۆیان دەکاتەوەو ئاوێتەیان دەکات. ئەو قوتابخانەیەکی ڕۆژانەیە بۆ هەماهەنگی‌و بەیەك گەیشتن‌و یەکسانی‌و یەکێتی هەستی خۆشەویستی، ئەم ئاڕاستە کۆمەڵایەتی‌یە لە نوێژدا، لە نوێژی هەینی‌دا تەواو ڕەنگ دەداتەوە، خەریکە وەکو نوێژێکی سیاسی شاری لیّ دێت، کە لەمۆڵەتی هەفتانەدا ئەنجام دەدرێت.لە مزگەوتێکی ناوەندی شاردا کە هەندێك لە پیاوانی دەوڵەت تێیدا ئامادە دەبن. ووتاری هەینیش لە پێش نوێژدا بەشێکی دانەبڕاوە لە نوێژەکە، ئەوەیش بە سیفەتێکی بنەڕەتی پەیامێکی سیاسیە. مەسیحیەکان لەم بارەیەوە دەڵێن ئەمە دژ دەوەستێتەوە لەگەڵ مەفهومی نوێژدا، ئەمەیش دەرئەنجامێکە دەگونجێت لەگەڵ شێوازە مەسیحیەکە لە بیرکردنەوەدا، بەڵام دەرئەنجامێکی پاساو نەدراوە لە گۆشە نیگای ئیسلامەوە.

وەرچەرخانیش لە ئاینی (مجرد)وە بۆ ئیسلام بەئاشکرا دیارە لە مەسەلەی زەکاتدا، لە (قۆناغی مەککی)دا، زەکات دەدرایە هەژارەکان بەشێوەی بەخشین وەکو (صدقة).

بەڵام کاتێك کۆمەڵگەی مەدەنیە دامەزێنرا - ئەم وەرچەرخانەیش ئەو ساتە مێژووییە کە تێیدا کۆمەڵگەیەکی ڕۆحی بەرەو (دەوڵەت) هەنگاوی هەڵهێنا - پێغەمبەر (د.خ) ئیدی وا مامەڵەی لەگەڵ زەکاتدا کرد وەکو پابەند بوونێکی یاسایی (فەرزێکی شەرعی)، واتە دانی (ضريبة) باجێك کە دەوڵەمەندەکان دەیدەنە هەژارەکان. ئەمەیش، وەکو ئەوەی ئێمە دەیزانین، یەکەم باجێکی لەو جۆرەیە لە مێژوودا.

بەزیادکردنی ڕەگەزی پابەندبوونی یاسایی بۆ دامەزراوەکانی بەخشینی مەسیحیەت بەگوتەی ((رسلر)) ئیسلام زەکات یان (الصداقة الألزامية)) دانا. ئەمەیش هەمان ئەو لۆژیکەی کە نوێژی تێرامانی (مجرد)ی گۆڕی بۆ نوێژی ((ئیسلامی))، هەمان لۆژیکیشە کە (صدقة)ی گۆڕی و کردی بەزەکات، دەرئەنجامی کۆتایش ئەوەیە کە ئاینی (مجرد)ی گۆڕی بۆ ئیسلام. بەڕاگەیاندنی زەکات، ئیسلام شێوەی یەك بزووتنەوەی کۆمەڵایەتی

وەرگرت، تەنهایش وەکو ئاینێکی (مجرد) نەمایەوە. لێرەوە ئیتر زەکات قورسایی حەقیقی خۆی وەرگرت بەپێکهێنانی کۆمەڵگەی سیاسی بۆ مەدینە، بەڵگەیش لەسەر ئەم خاسیەتەی زەکات ئەوەیە کە لە قورئاندا هەشت جار لە سوورەتە مەککیەکاندا باسکراوە، لەکاتێکدا لە سورەتە مەدەنیەکاندا بیست ودوو جار باسی لێوەکراوە.

فەرزکردنی زەکات لە وەڵامی دیاردەیەکدا بوو کە خۆی لەخۆیدا مەسەلەیەکی یەك لایەنی نەبوو، هەژاری تەنها کێشەیەکی کۆمەڵایەتی نیە، هۆکارەکەشی تەنها تەنگانەیی بێبەش نییە، بەڵکو هەروەها لەو شەڕەدایە کە دەروونی مرۆڤەکانی لە دەور کۆبووەتەوە، بێبەش بوون لایەنی دەرەکی هەژارییە، بەڵام لایەنە ناوەکیەکەی خراپە (یان بەرچاو تەنگییە)، ئەگەر ناچۆن بوونی هەژاری لەکۆمەڵگە دەوڵەمەندەکاندا تەفسیری بکەین؟ ئێمە لە نیوەی دووەمی سەدەی بیستەمداین هەتا ئێستایش سێیەکی بەشەریەت لە حاڵەتی کەم خۆراکیەکی بەردەوامدا دەژین. ئایا هۆی ئەمە دەگەرێتەوە بۆ کەمی لە خۆراکدا یان بۆ کەمی لە هەست کردندا ؟

پێویستە هەر چارەسەرێك بۆ کێشەی هەژاری لەوێوە بێت کە دان نرابێت بە گوناهدا، سەرەڕای ئەوەیش دەبێت بەشوێنیدا تەوبەو پەشیمانی بێت. هەموو چارەسەرێکی کۆمەڵایەتی هەردەبێت زادەی چارەسەرێکی مرۆیانە بێت. بەو مانایەی کە ناکرێت تەنها بەگۆڕینی پەیوەندیە ئابوورییەکان وازبهێنین، بەڵکو هەروەها پەیوەندیە مرۆییەکانیش، پێویستە دابەشکردنی دادپەروەرانە بهێنینە کایەوە، هەروەها پێگەیاندنی راستو دروستی خەڵکی کە لەسەر خۆشەویستی و هاوسۆزی دروست دەبێت.

هەژاری گرفتەو بەڵام هەروەها گوناهیشە. هەژاریش بە گوێزانەوەی موڵکایەتی هەندێك شمەك چارەسەر ناکرێت، بەڵکو هەروەها لە رێگەی هاوکاری شەخصی و، مەبەست و. هەست کردنی خۆشەویستانەوە دەبێت.

هیچ شتێك ناکرێت بەشێوەیەکی راستو دروست تەنها بەهۆی گۆڕینی موڵکایەتی شمەکی جیهانەوە بەئەنجام بگەیەنرێت، مادام لە دەروونەکاندا خراپە و ئیستغلال و کۆیلایەتی مابێتەوە، ئەمەیش بریتیە لە هۆکاری نوشست هێنانی شۆڕشە ئایینەیە مەسیحیەکان و هەموو شۆڕشە سۆشیالیستەکان ((لە ماوەی دوو هەزار ساڵدا قەبارەی

شەڕ لەجیهاندا کەمی نەکردووە، لەم ماوەیەدا نە ئیمپراتۆریەتێکی پیرۆزو نە ئیمپراتۆریەتێکی شۆڕشگێڕی نەیتوانیەوە بە ئامانجەکانی بگات[٧])).

شۆڕشی ئاینی - زیاد لە پێویست ئاینی بووە، شۆڕشی کۆمەڵایەتیش - زیاد لە پێویست کۆمەڵایەتی بوو، ئاین پێی وابوو کە زیاتر بەتوانا دەبێت بە ڕەتکردنەوەی بۆ سیاسەت و توندوتیژی، سۆشیالیزمیش وەکو ئەرکێکی بنەڕەتی خۆی هەوڵی ئەوەی ئەدا پسپۆڕەکان قەناعەت پێبکات کە توندو تیژی تاکە ڕێگایەو (صدقة) تەنها فیڵو هەڵخەڵەتاندنە، مرۆڤ پێویستی بەئاینێکە کە لە هەمان کاتیشدا سیاسەت بێت، وە پێویستیمان بە سیاسەتێکە کە لە هەمان کاتیشدا ئەخلاق بێت، هەروەها (صدقة) یەك کە بکرێت بگۆڕێت بۆ پابەندبوونێکی کۆمەڵایەتی یان باجدانێك... بەو شێوەیەش دەگەینە پێناسەیەك بۆ ((زەکات)).

زەکات ئاوێنەیە بۆ مرۆڤەکان، ئەوەیش لەسەر خۆیان دەوەستێت کە زەکات بە لایانەوە باجێکی سەپێنراو بێت یان بەخشینێکی خۆبەخشانە بێت لە مرۆڤێکەوە بۆ مرۆڤێکی تر. زەکات پێویستی بەکرانەوەی دەرگای سندوقەکانی دارایی و دڵەکان پێکەوە هەیە. زەکات بریتیە لە ڕووبارێکی گەورە کە لە دڵێکەوە دەڕژێتە دڵێکی تر... لە مرۆڤێکەوە بۆ مرۆڤێکی تر. زەکات زاڵ دەبێت بەسەر هەژاریدا لەنێوان دەست کورتەکاندا هەروەها زاڵ دەبێت بەسەر بێ موبالاتی لەنێوان دەوڵەمەندەکاندا. وەئەو جیاوازیەو بەرزو نزمییەی نێوان مرۆڤەکان کەم دەکاتەوەو لە یەکتریان نزیك دەکاتەوە[٨]. ئامانجی ئیسلام ئەوە نیە زاڵ بێت بەسەر دەوڵەمەندەکاندا، بەڵکو زاڵبوونە بەسەر هەژاریدا... کەواتە هەژاری چیە؟

هەژاری کەمییە لەو شتە زەروریانەدا کە ناکرێت لە ژیانێکی ئاساییدا دەستیان لێ هەڵگیرێت، ئەوەیە مرۆڤ کەمتر لە ڕادەی پێویستیی هەبێت بۆ بونیاتنانی ژیان... ئەوەیە کە لە ژێر ((کەمترین ئاستی گوزەرانەوە بێت)). نزمترین ئاستی گوزەرانیش گوتەزایەکی

---

٧ / بڕوانە: ئەلبیرکامۆ. Albert Camus: Lhomme Revolte (Paris: Gallimard, 1951).

٨ / شتێکی سروشتیشە کە دەخالەتی کۆمەڵایەتی لە ڕێگەی دەوڵەتەوە زۆرترین ڕێگەیەك بێت کەوا کاریگەر هەبێت بۆ هێنانەوەی دادپەروەری کۆمەڵایەتی. بەڵام دام و دەزگا کۆمەڵایەتیەکان بەشێوازی ناشەخصی و بەو کاریگەریە کە جیاوازی ناکات لەنێوان کەسانی بێ دەرامەت و وە لەنێوان ئەوانەدا کەوا کەمتر پێداویستیان هەیە، ئەو بناغەیە ڕیشەکێش دەکات کە لەسەری کۆمەڵێکی دروست و شادومان بونیاد دەنرێت.

سروشتیو مێژووییە واتای کۆی ئەو شمەکانە دەگرێتەوە کە پێویستن بۆ مرۆڤ و خێزانەکەی کەدەبێتە مایەی پڕکردنەوەی پێداویستیە مادیو کۆمەڵایەتیەکانیان. پێویست نیە کۆمەڵگە هەموو مرۆڤەکان بهێنێتە یەك ئاستەوە، بەڵام پێش هەموو شتێك دەبێت بۆ هەموو مرۆڤێك نزمترین ئاستی ژیان کە ئاماژەمان پێکرد فەراهەم بکرێت. ئامانجە کۆمەڵایەتیەکانی ئیسلام کورتکراونەتەوە لە زاڵ بوون بەسەر هەژاریدا، وە درێژیش نابێتەوە بۆ ڕادەی بەشکردنی موڵکایەتیەکان لەنێوان هەمووانددا، ئەو پاساوە ئەخلاقی و ئابووریانەیش کە بۆ ئەم جۆرە بەشکردنانە هەن جێگای گومانن.

هەموو کۆمەڵگایەکی جێگر سەرەڕای پێوەرە ئەخلاقیو مرۆییەکان . بنەمای مانەوەیش پشتیوانی لیٚ دەکات. چارەنووسی کۆمەڵگای ئیسلامیش ئەوەیە کە بگاتە ئەوپەڕی ڕادە لەلایەنی مرۆڤایەتی و لایەنی کارامەیی. پێکەوە ئەگەر ئیعتیباراتی مرۆیی، جێگیری کۆمەڵگە بخاتە بەردەم هەڕەشەوە، وە بەپێچەوانەوە ئەگەر جەخت کردنەوەیەکی زیادەڕۆیانە ڕێگەیدا بەتوانستو هێز بۆ لەناوبردنی بنەما بنەڕەتیەکانو ئازادی و مافەکانی مرۆڤ و مرۆڤایەتی، ئیدی لەوکاتەدا ئەم جەخت لێکردنەوەیە ئیسلامی نیە.

چونکە دەستووری کۆمەڵگەی ئیسلامی دیاری دەکرێت بەهۆی پێکەوە بەستنی ئەم دوو مەرجە دژەوە: ئەوپەڕی مرۆڤایەتی و ئەوپەڕی توانست.

ئەو ئیعتیباراتە یاسایانەی پەیوەندیان بە زەکاتەوە هەیە کورتکراوەتەوە لەسەر چەند دەبەخشیت لەوەی کە هەتەو بە کێی دەبەخشیت؟ ئەمە لەکاتێکدا دەزگای زەکات بنەمای هاوکاری لەخۆیدا بەگرنگتری دادەنێت لەوەی تەنها بریتی بێت لەو کەسانەو لە ژمارەی ئەو کەسانەی کە زەکاتیان پیٚ دەدرێت. بەپێی ئەم بنەمایەش، پابەندبوونی دەوڵەمەندەکانی کۆمەڵگەیەك بەکەفالەتکردنی هەژارەکانیان گرنگیەکی لە ڕادەبەدەر لەکێشەکەدا دەخاتەڕوو، بچووکترین گومانیش، نایەت بەدڵماندا لەوەدا ئەگەر سستمێکی ئیسلامی ڕاست و دروست هاتەکایەوە، ئەوا تێدەکۆشێت لەپێناو جیٚ بەجیٚ کردنی ئامانجەکە لەم بنەمایەدا، بەچاوپۆشین لەئاستی داهات یان سەرژمێریەکانی دانیشتوان لەوەدا کە ڕادەیەکی دیاریکراوی تێپەڕاندووە... گرنگ ئەوەیە بنەماکە جێبەجیٚ بکرێت بە پابەندبوونی دەوڵەمەندەکانی ناو کۆمەڵگە بە بەخشینیان بەسەر هەژارەکانی کۆمەڵگەداو دابینکردنی پێداویستیە هەرە گرنگەکانی ژیانیان.

لەوێوە کە زەکات مافێکی هەژارانە[٩] ئەگەر فەراهەم نەکراو پێویستی کرد، ئەوا ڕێگەی هێز بۆ ئەم مەبەستە دەگیرێتە بەر[١٠]. بەپێی هەندێك سەرچاوە، پابەندبوون بە بەخشین یان ئامۆژگاری کردن لەبارەی پێدانیەوە، لە هەشتاو دوو شوێنی قورئاندا باس کراوە، دەرئەنجامی ئەو جەخت لێکردنەوانەی تەعالیمە ئیسلامییەکانیش لەسەر بەخشین، شۆڕشێکی هێمن لە کۆمەڵگە ئیسلامییەکاندا پەیدابوو، دواجاریش لە دەزگای (ئەوقاف)دا گەڵاڵە بوو.

(وەقف)یش، لەڕووی بڵاوبوونەوەو گرنگیەوە، نموونەی لە دەوڵەتە نائیسلامییەکاندا نیە، خەریکە بڵێین یەك دەوڵەتی ئیسلامی نیە، تییێدا دام و دەزگای تایبەتکراو بە ئەوقاف و خزمەتگوزاری خێرخوازی گشتی تییێدا نەبێت، (وەقف) لەقورئاندا باسی نەهاتووە، بەڵام سەرهەڵدانی لەکۆمەڵگە ئیسلامییەکاندا بە ڕێکەوت نەبووە، بەڵکو پەیدابوونی دەرئەنجامی سەروەری ڕۆحی هاوکاری و کاریگەری وەزیفەی زەکاتی فێرکاریە لە کۆمەڵگە ئیسلامییەکاندا، ئەم ئەزموونە مرۆییە ئەو هیوایە فەراهەم دەهێنێت کە کۆمەڵێك ئامانجی کۆمەڵایەتی هەن دەکرێت بەدی بهێنرێن بەبێ بەکارهێنانی توندوتیژی، (وقف) یان شمەکی مادی لە خزمەت ئامانجە مۆراڵیەکاندا، ئەوەمان بۆ دەسەلمێنێت کە گۆڕانکاری گەورە دەکرێت بەدی بهێنرێت لە بواری ئابووریدا بەبێ دەخالەت کردنی بەرژەوەندیە مادییەکان. لەم لایەنەوە (وقف) دادەنرێت بەوەی دژ بوەستێت لەگەڵ ئەوەی پێی دەڵێن (یاسا سروشتیەکانی ئابووری) وە لە تێڕوانینی ئابووری سیاسیەوە بەحاڵەتێکی شاز دادەنرێت، بەڵام لە ڕووی دوانیەتیەوە (وەکو جۆرێك لە ئابووری کە هاندەرەکەی هیومانیزمێکی ڕۆحیە)، ئەوا مومارەسەیەکی ئیسلامی ڕاستو دروستە.

---

[٩] / ﴿ إِنَّمَا الصَّدَقَاتُ لِلْفُقَرَاءِ وَالْمَسَاكِينِ.... ﴾ التوبة/٦٠.

[١٠] / لێرەدا بۆ بەراورد باس لەو بیرۆکەیە دەکەین کە (ملتون فریدمان) ناوی ناوە (باجی پێچەوانەیی) کەخۆی ئابوری ناسێکی ئەمریکیە خەڵاتی نۆبڵی بەدەست هێناوە لەزانستە ئابوورییەکاندا وەزارەتی ئابوری بەپێی پێشنیاری (ملتون) هەڵ دەستێت بەدانی ئەم (باجە) بۆ هەموو ئەوانەی کەمتر لەوەی پێویستیانە پەیدای دەکەن، هەژاری دەکرا هەر لەزووەوە نەمایە ئەگەر پشت پێ بەستنە کۆمەڵایەتیەکان بەرەو ئەوە برۆشتنایە کە لە ڕاستیدا پێویستیان بوو لە بری ئەوەی بەفیڕۆی بدەن لە خزمەتگوزاریە کۆمەڵایەتیەکاندا کە لەسەر توانست ناوەستێت و ئاستی تێچوونەکانیشی بەرزە. Milton Friedman: Social Securtity: Universal or Selective (Washigton, American Enterprise Institute of Public Research, 1972).

ئایا زەکات کاریگەریەکی سلبی دەکاتە سەر هەوڵ و کۆششی خەڵکی بۆ چاك کردنی گوزەرانیان بەهۆی کارەکانیانەوە؟ هەندێك لە خەڵکی ئەم بۆچوونەیان هەیە. بەڵام پێش هەموو شتێك پێویستە دەرك بەوە بکەین کەزۆرێك گرفت هەن چارەسەر ناکرێن بەهۆی هەوڵ و کۆششی تاکەکانەوە وەکو نەهامەتی سروشتیو نەتوانایی کارەساتی سروشتیەوە، هەروەها هەموو ئەوانەی بەهۆیەوە ڕوودەدەن، لەم لایەنەوە، زەکات دادەنرێت بەیارمەتیەکی ماڵی کە جیاوازی نیە لەگەڵ جۆرەکانی تری یارمەتی کە لەکۆمەڵگە شارستانیو ناشارستانیەکاندا هەبووە. لە بووجەی حکومەتی ئەمریکیدا ساڵی ١٩٦٥ ( ١ ملیارد ) یەك بلوێن دۆلار تەرخان کراوە (بۆ یارمەتیدانی هەژارە ئەمریکیەکان[١١] ). هیچ کەسێکیش ترسی خۆی نەخستە ڕوو سەبارەت بەوەی کە ئەم بڕە پارە زۆرە ڕەنگە کار بکاتە سەر ووزەی گەلێك کە بە یەکێك لە زۆرترینی ئەو گەلانەی جیهان ناسراوە کە حەزی لە سەرکێشیە[١٢].

ئەم شیکار (تفصیلی)یە بۆ نوێژو زەکات ـ کە دیارترین مومارەسەی ئیسلامین ـ ئاماژە دەکەن بە دوانیەتێکی (جوانی). بەڵام ئەگەر لە دەرەوە سەیرمان کرد ئەوا وەزیفەی جۆراوجۆری ڕوونو دیارمان بۆ دەردەکەوێت لەچوارچێوەی بونیادە ئیسلامییەکەدا. لەم ڕوانگەیەوە دەبینین نوێژ ڕەگەزێکی ڕۆحیەو زەکات ڕەگەزێکی کۆمەڵایەتیە ـ نوێژ ئاڕاستەکراوە بۆ مرۆڤو زەکات ئاڕاستە کراوە بۆ جیهان.

---

[١١] / ئەم بڕە خەڵکە پێك دێت لەو هاوڵاتیە ئەمریکیانەی کەداهاتی ساڵانەیان کەمترە لە ٢٠٠٠ دۆلاری ئەمریکی، بە پێی سەرژمێریەك کە ئەنجام درا ژمارەیان ٣٥ ملیۆن کەس بوو لەوکاتەدا.

[١٢] / پرۆفیسۆر (لستر تورو Lester Turrouw) لەپەیمانگای ((ماساسۆشیت بۆ تەکنەلۆژیا)) پێچەوانەی ئەم بیرۆکەیەی سەلماند ڕایگەیاند کە هیچ پێکدادنێك نیە لەنێوان بەخشینی کۆمەڵایەتیو توانستی ئابوریدا، هەروەها بەرنامە کۆمەڵایەتیەکان دەکرێت ببنە بەرهەمهێن لەڕووی ئابووری و لەهەمان کاتیشدا دادپەروەرانە لە ڕووی کۆمەڵایەتیەوە، لەم بارەیشەوە پرۆفیسۆر ((تورو) ئەو بیرۆکەیەی ڕەتکردەوە سەبارەت بەوەی کە بەخشینی کۆمەڵایەتی لە ئاستێکی فراواندا هەرەشە لەهاوسەنگی ئابووری نەتەوە دەکات و (مرۆڤەکان خراپ دەکات) بەڵکو ئەو ڕاگەیاندنە ئەو نەتەوانەی کەوا تەسکترین کەلێنیان تێیدایەو لەنێوان هەژاران و دەوڵەمەندەکاندا سەرکەوتوو بوون بەسەر وڵاتە یەککرتووەکانی ئەمەریکادا ئەوانیش وڵاتەکانی سویدو سویسراو دانمارکو نەرویجو بەم نزیکانەیش ئەڵمانیایە، ئەم ڕێگایەی (سێیەم)ە ئاوێتەبەش بۆمان دەسەلمێنێت کە ئەمە نزیکترە لە مرۆڤایەتیەوەو، لەبەر ئەوەیش هەروەها زیاتر بە توانستە.

له نوێژدا سیفەتێکی شەخصی هەیە، له زەکاتدا سیفەتێکی کۆمەڵایەتی هەیە... نوێژ ئامرازێکه بۆ پێگەیشتن، زەکات بەشێکه له سستمی کۆمەڵایەتی، خەریکه هەموو بیرمەنده ئیسلامییەکانیش کۆك بن لەسەر ئەوەی که بەهێز کردنی دووقۆڵی لەنێوان نوێژدا وەکو پەرستشێکی شەخصی‌و، زەکات وەکو هەڵویستێکی کۆمەڵایەتی له گونجانیدایه لەگەڵ نوێژدا. ئەم بیرۆکەیه بوو به هۆی هەڵاوێرکردنی ئەوەی که نوێژ بەبێ زەکات بەکارێکی بەتاڵ دابنرێت.

یەکگرتنی لەنێوان هەردوو فەرزی نوێژو زەکاتدا جەخت لێکراو لەقورئاندا، وه جەخت لەسەر ئەوه دەکرێتەوه که ئەو دووانه بەشێوەیەکی بەردەوام، یەك پشت بەوی تریان دەبەستێت.

(عبدالله کوڕی مسعود) له پێغەمبەری خواوه (د.خ) دەگێڕێتەوه که فەرموویەتی مانای چی‌یه ئەمه: (فەرمانتان پێکراوه به نوێژکردن و بەخشینی زەکات، هەرکەس زەکات نەدات نوێژیشی لێ وەرناگیرێت) هیچ راڤەیەکیش نیه بۆ ئەمه جگه لەوەی که ئەمه بەرزکردنەوەی بانگەوازێکه دژ به جیاکردنەوەی کردارەکان له بڕوا (ئیمان)، یان دابڕینی مرۆڤ له دونیا، ئەمەیش له جەوهەریدا بانگەوازێکی ئیسلامییه، ئەبوبەکری صدیق (خەلیفەی یەکەم) هەمان ئەم لۆژیکەی بەکارهێنا کاتێك بڕیاریدا هێز بەکار بهێنێت دژ بەهۆزێك که ڕەتی ئەوەیان کردەوه زەکات بدەن، دەگێڕنەوه سەبارەت بەم هەڵویستە وتوویەتی: ((سوێند بەخوا شەڕ لەگەڵ هەرکەسێکدا دەکەین جیاوازی بخاته نێوان نوێژو زەکاتەوه)).

ئەم هاوکێشه قورئانیه مەئلوفه، کەوا نوێژو زەکات بەیەکەوه کۆدەکاتەوه تەنها ((صیغة))یەکی دیاریکراوه له هاوکێشەیەکی تر ((دوو جەمسەر)) که زیاتر دووبارەو زیاتر باوه، ئەویش ئەوەیه ((بڕوا بهێنەو کاری چاکه بکه*))، دەکرێت دابنرێت به بنچینەی جەوهەری بۆ فەرمانه ئاینی و ئەخلاقی و کۆمەڵایەتیەکان له قورئاندا[١٣].

---

*/ وەکو له فەرموودەیەکی پێغەمبەردا (د.خ) کەوا کەسێك پرسیاری لێکرد شتێکی پێ بڵێت لەبارەی ئیسلامەوه که پاش ئەو پرسیار له کەسی تر نەکات ئەویش پێی فەرموو: قل آمنت بالله ثم إستقم.

[١٣]/ ئایەتی (٢٧٧) له سورەتی البقره به ڕوونی ئاماژه بەم مانایه دەکات ﴿ إِنَّ الَّذِينَ آمَنُوا وَعَمِلُوا الصَّالِحَاتِ وَأَقَامُوا الصَّلَاةَ وَآتَوُا الزَّكَاةَ لَهُمْ أَجْرُهُمْ عِندَ رَبِّهِمْ وَلَا خَوْفٌ عَلَيْهِمْ وَلَا هُمْ يَحْزَنُونَ ﴾ البقرة/ ٢٧٧.

ئەم هاوکێشەیە دوو ستوونمان بۆ دیاری دەکات کە ئەلتەرناتیڤیان نیە، هەموو ئیسلامیش لەسەر ئەم دووانە دەوەستێت، ڕەنگە گونجاویش بێت کەوا بڕوانینە ئەم هاوکێشەیە بەو پێیە کە یەکەم (صیغة)یە بۆ ئیسلامو بەرزترینیانە.

ئیسلامیش تێکرای دەکەوێتە ژێر ئەم (صیغة) یەوە: یەکێتیەکی دوو جەمسەر. وتنی شەهادەت لەلایەن کەسێکەوە کاتێك موسڵمان دەبێت لەبەردەم چەند کەسێکدا وەکو شاهید ئەم کارە بۆ خۆی هەڵگری دوو مانایە:

یەکەم، پەیوەندی کردن بەکۆمەڵەیەکی ڕۆحیەوە بۆ ئەمەیش پێویست بە شاهید ناکات، بەڵام ئەو کەسەی کە موسڵمان دەبێت، پیاو بێت یان ژن ئەوا پەیوەندی بە کۆمەڵەکەیەوە دەکات کە چەندین لایەنی کۆمەڵایەتی و سیاسی هەیە، وە چەندین پابەندبوونی یاسایی دەیگرێتەوە ئەم پابەندبوونانەیش تەنها ئەخلاقی نین. مانای دووەمیش، پەیوەندی کردنی مرۆڤێك بە ئاینێکەوە پێویستی بە بوونی شاهید نییە، چونکە ئەمە پەیوەندیە کە لەنێوان مرۆڤو خوایدا، وە تەنها بوونی نیەت یان وەرگرتنی بڕیارێکی ناوخۆیی تەواو بەسە لەم بارەیەوە وە پەیوەندی کردن بەئاینێکەوە لەکاتی ئامادەبوونی کەسانی تردا ڕەگەزێك لە ڕەگەزەکانی ڕاگەیاندنی تێیدایە، ئەمەیش شتێکی گرنگی تێیدا نیە لە تێڕوانینی ئاینی ئەبستراکتەوە، بەڵام ئیسلام ئاینێکی ئەبستراکت نیە.

لەڕۆژوودا هەروەها بێگومان. لایەنێکی هاوشێوەی ئەمە هەیە، موسڵمانەکان ڕۆژوویان لە ماوەی مانگی ڕەمەزاندا بەسیمایەك بۆ ڕۆحی کۆمەڵ داناوە. چونکە ئەوان هەستیارن بۆ هەر پێشێل کردنێکی ئاشکرای ئەم فەرزە. ڕۆژوو تەنها مەسەلەی ئیمان نیە ـ تەنها مەسەلەیەکی شەخصی نیە کە پەیوەندی تەنها بە فەردەوە هەبێت، بەڵکو ئەو پابەندبوونێکی کۆمەڵایەتیشە.

ئەم ڕاڤەکردنە بۆ ڕۆژوو وەکو دروشمێکی ئاینی لەناو ئاینەکانی تردا نەزانراوە، ڕۆژووی ئیسلامی یەکە یەکە کەوا زوهدو خۆشنوودی بەیەکەوە کۆدەکاتەوە بەڵکو هەتا چێژیش لەچەند حاڵەتێکی دیاریکراودا... ئەو زۆرترینی ئامرازەکانی فێرکاریە ـ لە ڕووی سروشت و هێزەوە ـ کە خراوەتە جێگەی مومارەسە مرۆڤایەتیەکانەوە هەتا ئێستا.

پۆژوو لە کۆشکی پاشایان و لە کوخی جوتیارەکاندا وەکو یەك مومارەسە دەکرێت... لە ماڵی فەیلەسوفەکان و هەروەها لە ماڵی کرێکارەکاندا، گەورەترین خەسڵەتیش تییدا ئەوەیە کەوا مومارەسەیەکی حەقیقی دەکرێت.

پاشان ئایا بەجێگەیاندنی حەج (بۆ کەعبە) کە پایەی پێنجەمە لەپایەکانی ئیسلام؟ ئایا ئەو دروشمێکی ئاینیە، پێشانگایەکی بازرگانیە، کۆبونەوەیەکی سیاسییە، یان هەموو ئەمانە لەیەك شتدا؟ شتێکی بەڵگە نەویستیشە کە دروشمێکی ئاینیە، بەڵام لە (صیغة) ئیسلامییەکەیدا هەموو ئەوانەیە لە یەك شتدا.

ئەو دوانیەتیە کە ئیسلام تییدا هەیە لە زۆرشتی تردا بە پوونی دیارە، بڕوانە بۆ ئەم ئایەتە ﴿ لا يُؤَاخِذُكُمُ اللَّهُ بِاللَّغْوِ فِي أَيْمَانِكُمْ وَلَكِنْ يُؤَاخِذُكُمْ بِمَا عَقَّدْتُمُ الْأَيْمَانَ فَكَفَّارَتُهُ إِطْعَامُ عَشَرَةِ مَسَاكِينَ مِنْ أَوْسَطِ مَا تُطْعِمُونَ أَهْلِيكُمْ أَوْ كِسْوَتُهُمْ أَوْ تَحْرِيرُ رَقَبَةٍ فَمَنْ لَمْ يَجِدْ فَصِيَامُ ثَلاثَةِ أَيَّامٍ﴾[١٤] بەو شێوەیە دەبینین کەوا کارە کۆمەڵایەتیە سوودبەخشەکان لە جیهانی دەرەکی دا ئەولەویەتیان هەیە بەسەر کارە ڕۆحیە پوختەکاندا، ئەمەی دواییان تەنها جێبەجێ دەبێت وەکو ئەلتەرناتیڤێك کاتێك جێبەجێ کردنی ئەوەی یەکەمیان مەحاڵ دەبێت... لەم ئایەتەیشدا ڕۆژووگرتن وەکو پەشیمانیەك وابووە... کەفارەت و دۆعای لێخۆشبوونە *

(تەورات) بیرۆکەی ئازار بەرامبەر ئازار بونیاد دەنێت، (ئنجیل) یش (لێبووردن)، بەڵام بڕوانە قورئان چۆن لەم دوو گەردە گەردیلەیەك پێك دەهێنێت ﴿ وَجَزَاءُ سَيِّئَةٍ سَيِّئَةٌ مِثْلُهَا فَمَنْ عَفَا وَأَصْلَحَ فَأَجْرُهُ عَلَى اللَّهِ إِنَّهُ لا يُحِبُّ الظَّالِمِينَ ﴾ [١٥].

خەریکە ئەم پێکهاتەیەش وای لێ بێت کەوا ڕاستەوخۆو میکانیکی بێت لە هەندێك کاتدا، قورئان لەو چێوەیەدا کە باسی تەورات دەکات لەم ئایەتەدا دەفەرموێت: ﴿وَكَتَبْنَا عَلَيْهِمْ فِيهَا أَنَّ النَّفْسَ بِالنَّفْسِ وَالْعَيْنَ بِالْعَيْنِ وَالْأَنْفَ بِالْأَنْفِ وَالْأُذُنَ بِالْأُذُنِ وَالسِّنَّ بِالسِّنِّ وَالْجُرُوحَ قِصَاصٌ

---

[١٤] / بڕوانە: قورئان سورەتی المائدة ئایەتی (٨٩).

*/ هەروەها پێغەمبەری ئیسلام دەگێڕنەوە (د.خ) ((من رای منكم منكرا فليغيره بيده، فإن لم يستطع فبلسانه فإن لم يستطيع فبقلبه، وهذا اضعف الأيمان)) حیکمەتی هێنانی ئەم فەرموودەیەش لەم چێوەیەدا پێغەمبەر(د.خ) وای لەمەر جوڵەیەکی ناودڵ یان ڕەت کردنەوەیەکی ناوخۆیی کردوە لەویژدانی مرۆڤدا کەئەو پەڕی لاوازی ئیمانە، لەبەر ئەوەیش لەگۆڕینی خراپەدا کاری مادیو ڕاستەو خۆی خستوەتە پێشەوە.(وەرگێڕ).

[١٥] / بڕوانە: سورەتی شوری ئایەتی (٤٠).

فَمَنْ تَصَدَّقَ بِهِ فَهُوَ كَفَّارَةٌ لَهُ وَمَنْ لَمْ يَحْكُمْ بِمَا أَنْزَلَ اللَّهُ فَأُولَئِكَ هُمُ الظَّالِمُونَ ﴾ [16] **یان بڕوانە بۆ ئەم ئایەتە:** ﴿ يَا أَيُّهَا الَّذِينَ آمَنُوا لا تُحَرِّمُوا طَيِّبَاتِ مَا أَحَلَّ اللَّهُ لَكُمْ وَلا تَعْتَدُوا إِنَّ اللَّهَ لا يُحِبُّ الْمُعْتَدِينَ ﴾ [17] **ئیسلام ئاینێك نییە كە (میوەی زەوی) لەسەر مرۆڤ حەرام بكات - هەروەها زیادەڕەوی ناكات لە حەرامكردندا.**

**ئەو نەفرەت لە زەوی ناكات بەڵكو تەواو بەپێچەوانەوە وای لە زەویەكەی كردووە كەوا پاككەرەوە بێت: ئەگەر مرۆڤ ئاوی دەست نەكەوت بۆ پاكژكردنەوەی و دەست نوێژ ئەوا خۆڵی زەوی جێگرەوەی ئەوەو دەكرێت بەكاربهێنرێت كە پێی دەوترێت (تەیەموم). ڕەمزیەتیش لە تەیەمومدا (دەست نوێژگرتنە بە بێ ئاو) بێجگە لەمە مانایەكی تری نییە.**

**هەندێك بەڵگە نەویستی ئیسلامی هەن ئاینین تەنها لە ڕووی ناونیشان یان (صیغة)كەی یان بنەڕەتەكەیەوە، بەڵام ئیسلامین بە چاكترین مانای ئەم ووشەیە.**

**هەروەها ئەمە بەسەر فەرمان كردن بە پاك و خاوێنی و حەرامكردنی (مەی)یشدا جێبەجێ دەبێت. فەرمانە هاوشێوەكان ئاینی (ڕووت) نین، ئەمەیش لەبەر یەك هۆی ئاسان ئەویش ئەوەیە كە لە گرنگیدان بە ژیانی دەرەكی و مادی یان كۆمەڵایەتییەوە سەرچاوە دەگرن و مانا تەواوەكەی لە چوارچێوە ژیارەكەیدا بەدەست دەهێنێت، شارە قەرەباڵغەكانی ئەمڕۆ، ناتوانن پارێزگاری لە ژیان بكەن بەبێ برێك لە پاك و خاوێنی شەخصی و گشتی.**

**بەڵام ئالوودەبوون بە مەیەوە سەلمێنراوە كە گەورەترین گرفتە لە چاخی تەكنەلۆژیا و ژیانی مەدەنی هاوچەرخدا.**

**ئەو لۆژیكەی لەو بیرۆكانەی پێشوو پەیدا دەبێت ڕاماندەكێشێت بۆ بیرۆكەیەكی جەوهەری لە ئیسلامدا، مەبەستم لێی ئەوەیە كە ئیسلام بە سروشتی خۆی بەرەو پێكەوە گرێدانی هونەر بە تەكنەلۆژیاوە دەڕوات: ئەم نەزعە پێكهاتەیییە بە بەرجەستە ترین شێوە لە هونەری بیناسازیدا دەهێنێتەدی، ڕەنگە ئەمەیش بگەڕێتەوە بۆ ئەوەی ئەم هونەرە یەكێكە لەو هونەرانەی كەمترین تجریدیەتی تێدایە، یان بەمانایەكی تر بۆ ئەوەی كە**

---

[16] / **بڕوانە: سورەتی المائدة، ئایەتی (٤٥).**

[17] / **بڕوانە: سورەتی المائدة، ئایەتی (٨٧).**

((هونەرێکی گشتی‌یە [١٨])). هونەرە تەجریدیەکان زیاد لە پێویست جەخت لەسەر فەردیەتی مرۆڤ دەکەنەوە، ڕۆحی ئەبستراکتیش زیاد لە پێویست جەخت لەسەر لایەنەکی تری مرۆڤ دەکاتەوە هەردوو هەڵویستەکەیش دژن بەو نەزعەی هاوسەنگیە کە ئیسلام سوورە لەسەری. بەڵام هونەری بیناسازی لە تەجریدا ناسوڕێتەوە، بەڵکو هونەرێکی وەزیفی‌یە گرنگی دەدات بە فەراهەم کردنی پێداویستیە مرۆڤایەتیەکان و لەمەیشدا جیاوازە لە هونەری مۆسیقا.

ئەم خاسیەتە دوانیەتیەش بۆ هونەری بیناسازی (جوانی وەزیفە) وایکردووە ببێتە نموونەیەك بۆ هونەری ئیسلامی، بەهۆی ئەو هاوشێوەییەی کە لەنێوانیاندا هەیە، ئیسلام بریتیە لە عەقڵ و جەستە پێکەوە، دەسکەوتە درەوشاوەکانی هونەری بیناسازی ئیسلامی لە ڕێکەوتەوە نەبووە، بەڵکو دەرئەنجامی قووڵی تێڕامان و تێبینی و وورد بووە [١٩].

دوولایەنی بوون بەسەر سەرچاوەکانی ئیسلامیشدا پراکتیزە دەکرێت، دوو سەرچاوەی بنەڕەتی بۆ ئیسلام هەن ئەوانیش قورئان و سوننەتی پێغەمبەرن کەپێکەوە ئیلهام و پسپۆڕێتی، نەمری و زەمەن، بیرکردنەوەو مومارەسە، ئایدیاو ژیان دەنوێنن، ئیسلام ڕێبازی ژیانە پتر لەوەی ڕێبازی بیرکردنەوە بێت، هەموو تەفسیرە قورئانیەکانیش

---

[١٨] / بڕوانە: ((کنیث کلارك)) Kenneth elark icivlization کە ناوی دەبات بە ((هونەرێکی کۆمەڵایەتی یارمەتی خەڵك دەدات لەسەر ئەوەی کە ژیانێکی بژین زیاتر دەوڵەمەندەبێت)).

[١٩] / دووانگیری تەنانەت ڕەنگ دەداتەوە لەپێکهاتەی خودی ووشەکەیشدا ((architrcture)) کە لە مانا ووشەییەکەیدا ئاماژە دەکات بۆ شتێك کە زیاتر لە تەنها ((بونیادنانێکی پیشەیی)) لەبەرئەوە ئەوا ((بیناسازی پیشەیی)) بوونی نابێت چونکە ئەم دژ دەبێتەوە لەگەڵ زاراوەکەدا، ناکرێت هونەری بیناسازی تەسك بکرێتەوە بۆ تەنها پیشەیەك بەبێ ئەوەی ماناکەی وون بکات لەلایەکی ترەوە ئەوەی کە پێی دەڵێن ((هونەری بیناسازی ڕووت)) یان ئەوەی کە وەزیفەیەکی کرداری نیە بوونی نیە ئەوی ترە. هەندێك ئاماژەیش هەیە سەبارەت بەوەی کە بیناسازە گەورەکان لەچاخی ڕێنیسانسدا زۆربەیان گەر نەڵێین هەموویان لە هونەرمەندان بوون (وێنەکێش یان پەیکەرتاش)، هەروەها گەورەترین بیناسازی ئینگلیزی ((کریستۆفەر رین crestofer wern)) زانایەکی بیرکاری و فەلەك بوو، ئەو بینایانەیش کە دروستی کردوون گوزارش لە بیرکاری و پێوەرەکات... دەکات، واتە ئەو ڕەچاوی هەموو بنەما زانستیەکانی کردووە بەڵام - لە هەمان کاتیشدا - دورنەکەوتوەوتەوە لە چێژو زەوقی هونەری معماری. بڕوانە سەرچاوەی پێشوو لاپەڕە (٢١٢) هونەری بیناسازی ((ئاوێزانێکی)) سەیرە لە هونەرو زانست.

ئاماژە بەوە دەکەن کە بەبێ سوونەتی پێغەمبەر... واتە بەبێ ژیانی پێغەمبەر (د.خ) تێگەیشتن لە قورئان بەشێوەیەکی ڕاست کارێکی زەحمەتە.

تەنها لە ڕێگەی تێگەیشتنمانەوە لە ژیانی پێغەمبەر (د.خ)، ئیسلام خۆی وەکو فەلسەفەیەکی کرداری یان وەك پلانێکی گشتگیر بۆ ژیان بەگشتی دەخاتە ڕوو، کە بیرۆکەی (( إجماع )) مان خستنە سەر شیکردنەوەمان بۆ ئەو دوو سەرچاوەیە، ئەوا ئێمە لە شوێنی خۆماندا دەمێنینەوەو تێی ناپەڕێنین ((لەڕووی دوولایەنیەوە)) ئیجماع لای ((ئیمامی شافیعی)) ڕێکەوتنی هەموو ڕاکان دەگەیەنێت لای (طەبەری و ڕازی)) ش ڕێکەوتنی زۆرینەی زانایانی فیقهە.

ئیسلام توانی بەبێ کۆکردنەوەی چۆنایەتی دەستەبژێر، لەگەڵ ژمارەی چەندایەتی لە تاکەکان، شوێنی ئێستای خۆی بەدەست دەهێنێت، لە ئیجماعدا پاڵفتەی جۆری ((الصفوة النوعية)) ((ئەرستۆکراتیەت)) هەیەو لایەنی ژمارەییش ((دیموکراسیەت)) دەهێنێتە ئاراوە.

دەکرێت حاڵەتی هەر یەك لە ((مەککە)) و ((ئەشکەوتی حراء)) بخەینە سەر سستمی ((دوالیزمیەت))، لە ساتە وەختی دەرکەوتنی ئیسلامدا دژایەتی نێوان جیهانی واقیعیو جیهانی ناخەکییان دەنواند، نێوان کارایی و رامان. ئیسلام بەدوو قۆناغ پەرەی سەند، یەکەمیان لە مەککەداو دووەمیشیان لە مەدینەدا ـ دوو ماوەن کە جیاوازیەکەیان لە گیان و مانادا لە هەموو ئەوەی لەمەڕ مێژووی ئیسلام نووسراوە تۆمار کراوە.

لێرەدا تووشی هەمان دژایەتی یان ((دژیەکی ڕواڵەتی)) دەبین لە چوارچێوەی ئیمان و سیاسەتدا... کۆمەڵگەی ئیمانو کۆمەڵگەی بەرژەوەندیەکان. لەکۆتایدا دەبینین کە مەزنترین کەسێتی لە ئیسلامدا کەسێتی شەهیدی تێکۆشەرە لەپێناوی خودادا... ئەو راهیبو سەربازیشە لەیەك کەسدا، ئەوەی لە مەسیحیەتدا بۆ پرەنسیپی رەهبانیەتو پرەنسیپی سوارچاکی دابەش بووە، ئەمە (لە ئیسلامدا) لەکەسێتی شەهیدا یەکی گرتووە ئەمە یەکبوونی عەقڵو خوێنە، وە دوو (پرنسیپ) یشن کە ئینتیمایان بۆ دوو جیهانی جیاواز هەیە.

## ئاینێك ئاڕاستەی بەرەو سروشتە

قورئان بەجێگیری بەردەوامە لە دووبارە کردنەوەی بانگەشە دوولایەنیەکەیدا، بۆیە ئەمە (صیغة)یەکی نوێی پێدەبەخشێت: لێرەدا بانگەشەی بەستنەوەی رامان بە تێبینی کردنەوە... یەکەمیان ئایینە، دوومیشیان زانستە یان (إرهاصات)ی زانستە.

قورئان راستیە زانستیە ئامادەکان لەخۆ ناگرێت، بەڵکو هەڵویستێکی زانستی جەوهەری دەگرێتەوە.. گرنگیدان بەجیهانی دەرەکی کە ئەمە کارێکی نامەئلوفە لە ئاینەکاندا. قورئان ئاماژە بۆ زۆر ڕاستی لە سروشتدا دەکات و بانگی مرۆڤیش دەکات بۆ وەڵامدانەوەی ئەو حەقیقەتانە، فەرمانکردن بە زانست (خوێندنەوە)، لێرەدا وەك دژ لەگەڵ بیرۆکەی ئولوهیەتدا دەرناکەوێت، بەڵکو بەناوی خواوە دەستی پێکراوە: ﴿ اقْرَأْ بِاسْمِ رَبِّكَ الَّذِي خَلَقَ ﴾[٢٠] مرۆڤ (بەم پێیە) تێدا دەمێنێت، پشکنین دەکات، سروشتێك دەبینێت کە خۆی خۆی دروست کردووە، بەڵکو گەردونێك کە خوا ئەفراندویەتی. لەبەرئەوە تێبینی کردن بەبێ ئامانج نیە یان بێموبالاتیو بێشەوقی نیە، بەڵکو ئاوێتەیەکە لە زانست و حەزی زانین و سەرسام بوونی ئاینی، زۆرێك لە وەسفەکانی سروشت لە قورئاندا لە پلەیەکی بەرزی شاعیریەتدان.. ئەم ئایەتانە بەجوانترین شێوە ئەم ڕاستیە دەخەنە ڕوو، باگوێیان لێڕابگرین:

﴿ إِنَّ فِي خَلْقِ السَّمَاوَاتِ وَالْأَرْضِ وَاخْتِلَافِ اللَّيْلِ وَالنَّهَارِ وَالْفُلْكِ الَّتِي تَجْرِي فِي الْبَحْرِ بِمَا يَنْفَعُ النَّاسَ وَمَا أَنْزَلَ اللَّهُ مِنَ السَّمَاءِ مِنْ مَاءٍ فَأَحْيَا بِهِ الْأَرْضَ بَعْدَ مَوْتِهَا وَبَثَّ فِيهَا مِنْ كُلِّ دَابَّةٍ وَتَصْرِيفِ الرِّيَاحِ وَالسَّحَابِ الْمُسَخَّرِ بَيْنَ السَّمَاءِ وَالْأَرْضِ لَآيَاتٍ لِقَوْمٍ يَعْقِلُونَ ﴾[٢١]

﴿ إِنَّ اللَّهَ فَالِقُ الْحَبِّ وَالنَّوَى يُخْرِجُ الْحَيَّ مِنَ الْمَيِّتِ وَمُخْرِجُ الْمَيِّتِ مِنَ الْحَيِّ ذَلِكُمُ اللَّهُ فَأَنَّى تُؤْفَكُونَ(٩٥) فَالِقُ الْإِصْبَاحِ وَجَعَلَ اللَّيْلَ سَكَناً وَالشَّمْسَ وَالْقَمَرَ حُسْبَاناً ذَلِكَ تَقْدِيرُ الْعَزِيزِ الْعَلِيمِ (٩٦) وَهُوَ الَّذِي جَعَلَ لَكُمُ النُّجُومَ لِتَهْتَدُوا بِهَا فِي ظُلُمَاتِ الْبَرِّ وَ الْبَحْرِ قَدْ فَصَّلْنَا الْآيَاتِ لِقَوْمٍ يَعْلَمُونَ (٩٧) وَهُوَ الَّذِي

---

[٢٠] / بڕوانە: قورئان سورەتی العلق ئایەتی (١).

[٢١] / بڕوانە: قورئان سورەتی البقرة ئایەتی (١٦٤).

أَنْشَأَكُمْ مِنْ نَفْسٍ وَاحِدَةٍ فَمُسْتَقَرٌّ وَمُسْتَوْدَعٌ قَدْ فَصَّلْنَا الْآيَاتِ لِقَوْمٍ يَفْقَهُونَ(٩٨) وَهُوَ الَّذِي أَنْزَلَ مِنَ السَّمَاءِ مَاءً فَأَخْرَجْنَا بِهِ نَبَاتَ كُلِّ شَيْءٍ فَأَخْرَجْنَا مِنْهُ خَضِراً نُخْرِجُ مِنْهُ حَبّاً مُتَرَاكِباً وَمِنَ النَّخْلِ مِنْ طَلْعِهَا قِنْوَانٌ دَانِيَةٌ وَجَنَّاتٍ مِنْ أَعْنَابٍ وَالزَّيْتُونَ وَالرُّمَّانَ مُشْتَبِهاً وَغَيْرَ مُتَشَابِهٍ انْظُرُوا إِلَى ثَمَرِهِ إِذَا أَثْمَرَ وَيَنْعِهِ إِنَّ فِي ذَلِكُمْ لَآيَاتٍ لِقَوْمٍ يُؤْمِنُونَ ﴾ (الأنعام:٩٩) [٢٢]

﴿ هُوَ الَّذِي أَنْزَلَ مِنَ السَّمَاءِ مَاءً لَكُمْ مِنْهُ شَرَابٌ وَمِنْهُ شَجَرٌ فِيهِ تُسِيمُونَ (١٠) يُنْبِتُ لَكُمْ بِهِ الزَّرْعَ وَالزَّيْتُونَ وَالنَّخِيلَ وَالْأَعْنَابَ وَمِنْ كُلِّ الثَّمَرَاتِ إِنَّ فِي ذَلِكَ لَآيَةً لِقَوْمٍ يَتَفَكَّرُونَ (١١) وَسَخَّرَ لَكُمُ اللَّيْلَ وَالنَّهَارَ وَالشَّمْسَ وَالْقَمَرَ وَالنُّجُومُ مُسَخَّرَاتٌ بِأَمْرِهِ إِنَّ فِي ذَلِكَ لَآيَاتٍ لِقَوْمٍ يَعْقِلُونَ ﴾ (النحل/١٠ــ١٢)

﴿ وَمَا ذَرَأَ لَكُمْ فِي الْأَرْضِ مُخْتَلِفاً أَلْوَانُهُ إِنَّ فِي ذَلِكَ لَآيَةً لِقَوْمٍ يَذَّكَّرُونَ وَهُوَ الَّذِي سَخَّرَ الْبَحْرَ لِتَأْكُلُوا مِنْهُ لَحْماً طَرِيّاً وَتَسْتَخْرِجُوا مِنْهُ حِلْيَةً تَلْبَسُونَهَا وَتَرَى الْفُلْكَ مَوَاخِرَ فِيهِ وَلِتَبْتَغُوا مِنْ فَضْلِهِ وَلَعَلَّكُمْ تَشْكُرُونَ﴾[٢٣].

﴿ وَاللَّهُ أَنْزَلَ مِنَ السَّمَاءِ مَاءً فَأَحْيَا بِهِ الْأَرْضَ بَعْدَ مَوْتِهَا إِنَّ فِي ذَلِكَ لَآيَةً لِقَوْمٍ يَسْمَعُونَ ﴾ (النحل:٦٥)

﴿ وَإِنَّ لَكُمْ فِي الْأَنْعَامِ لَعِبْرَةً نُسْقِيكُمْ مِمَّا فِي بُطُونِهِ مِنْ بَيْنِ فَرْثٍ وَدَمٍ لَبَناً خَالِصاً سَائِغاً لِلشَّارِبِينَ (٦٦) وَمِنْ ثَمَرَاتِ النَّخِيلِ وَالْأَعْنَابِ تَتَّخِذُونَ مِنْهُ سَكَراً وَرِزْقاً حَسَناً إِنَّ فِي ذَلِكَ لَآيَةً لِقَوْمٍ يَعْقِلُونَ(٦٧) ثُمَّ كُلِي مِنْ كُلِّ الثَّمَرَاتِ فَاسْلُكِي سُبُلَ رَبِّكِ ذُلُلاً يَخْرُجُ مِنْ بُطُونِهَا شَرَابٌ مُخْتَلِفٌ أَلْوَانُهُ فِيهِ شِفَاءٌ لِلنَّاسِ إِنَّ فِي ذَلِكَ لَآيَةً لِقَوْمٍ يَتَفَكَّرُونَ ﴾[٢٤]

﴿ وَهُوَ الَّذِي خَلَقَ اللَّيْلَ وَالنَّهَارَ وَالشَّمْسَ وَالْقَمَرَ كُلٌّ فِي فَلَكٍ يَسْبَحُونَ ﴾ [٢٥]

---

[٢٢] / بڕوانە: قورئان سورەتی الأنعام ئایەتی (٩٥-٩٩)

[٢٣] / بڕوانە: قورئان سورەتی النحل ئایەتی (١٠-١٤)

[٢٤] / بڕوانە: قورئان سورەتی النحل ئایەتی (٦٥-٦٩)

[٢٥] / بڕوانە: قورئان سورەتی الأنبیاء ئایەتی (٣٣).

﴿ فَكَأَيِّنْ مِنْ قَرْيَةٍ أَهْلَكْنَاهَا وَهِيَ ظَالِمَةٌ فَهِيَ خَاوِيَةٌ عَلَى عُرُوشِهَا وَبِئْرٍ مُعَطَّلَةٍ وَقَصْرٍ مَشِيدٍ(٤٥) أَفَلَمْ يَسِيرُوا فِي الْأَرْضِ فَتَكُونَ لَهُمْ قُلُوبٌ يَعْقِلُونَ بِهَا أَوْ آذَانٌ يَسْمَعُونَ بِهَا فَإِنَّهَا لا تَعْمَى الْأَبْصَارُ وَلَكِنْ تَعْمَى الْقُلُوبُ الَّتِي فِي الصُّدُورِ ﴾[٢٦].

﴿ أَوَلَمْ يَرَوْا إِلَى الْأَرْضِ كَمْ أَنْبَتْنَا فِيهَا مِنْ كُلِّ زَوْجٍ كَرِيمٍ إِنَّ فِي ذَلِكَ لَآيَةً وَمَا كَانَ أَكْثَرُهُمْ مُؤْمِنِينَ ﴾[٢٧]

﴿ أَوَلَمْ يَسِيرُوا فِي الْأَرْضِ فَيَنْظُرُوا كَيْفَ كَانَ عَاقِبَةُ الَّذِينَ مِنْ قَبْلِهِمْ كَانُوا أَشَدَّ مِنْهُمْ قُوَّةً وَأَثَارُوا الْأَرْضَ وَعَمَرُوهَا أَكْثَرَ مِمَّا عَمَرُوهَا وَجَاءَتْهُمْ رُسُلُهُمْ بِالْبَيِّنَاتِ فَمَا كَانَ اللَّهُ لِيَظْلِمَهُمْ وَلَكِنْ كَانُوا أَنْفُسَهُمْ يَظْلِمُونَ﴾[٢٨]

﴿ أَفَلَمْ يَنْظُرُوا إِلَى السَّمَاءِ فَوْقَهُمْ كَيْفَ بَنَيْنَاهَا وَزَيَّنَّاهَا وَمَا لَهَا مِنْ فُرُوجٍ وَالْأَرْضَ مَدَدْنَاهَا وَأَلْقَيْنَا فِيهَا رَوَاسِيَ وَأَنْبَتْنَا فِيهَا مِنْ كُلِّ زَوْجٍ بَهِيجٍ تَبْصِرَةً وَذِكْرَى لِكُلِّ عَبْدٍ مُنِيبٍ وَنَزَّلْنَا مِنَ السَّمَاءِ مَاءً مُبَارَكاً فَأَنْبَتْنَا بِهِ جَنَّاتٍ وَحَبَّ الْحَصِيدِ وَالنَّخْلَ بَاسِقَاتٍ لَهَا طَلْعٌ نَضِيدٌ رِزْقاً لِلْعِبَادِ وَأَحْيَيْنَا بِهِ بَلْدَةً مَيْتاً كَذَلِكَ الْخُرُوجُ ﴾[٢٩]

﴿ أَفَلا يَنْظُرُونَ إِلَى الْأَبِلِ كَيْفَ خُلِقَتْ وَإِلَى السَّمَاءِ كَيْفَ رُفِعَتْ وَإِلَى الْأَرْضِ كَيْفَ سُطِحَتْ ﴾[٣٠]

﴿ أَفَرَأَيْتُمْ مَا تَحْرُثُونَ أَأَنْتُمْ تَزْرَعُونَهُ أَمْ نَحْنُ الزَّارِعُونَ أَفَرَأَيْتُمُ الْمَاءَ الَّذِي تَشْرَبُونَأَأَنْتُمْ أَنْزَلْتُمُوهُ مِنَ الْمُزْنِ أَمْ نَحْنُ الْمُنْزِلُونَ أَفَرَأَيْتُمُ النَّارَ الَّتِي تُورُونَ أَأَنْتُمْ أَنْشَأْتُمْ شَجَرَتَهَا أَمْ نَحْنُ الْمُنْشِئُونَ نَحْنُ جَعَلْنَاهَا تَذْكِرَةً وَمَتَاعاً لِلْمُقْوِينَ فَسَبِّحْ بِاسْمِ رَبِّكَ الْعَظِيمِ ﴾[٣١]

**لە هەموو ئەم ئایەتانەدا کە تێکڕای بەرەو سروشت ئاراستە بوون پێشوازیەکی تەواو لە جیهان دەبینینەوە، شوێنەواری هیچ جۆرە ململانێیەك نیە لەگەڵ سروشتدا. ئیسلام ئەو جوانی و نەجابەتەی لە مادەدایە دەیخاتەڕوو هەروەکو چۆن هەمان حاڵەت بە نسبەت جەستەوە لەکاتی نوێژدا هەیە، هەروەها شتومەکەکان لەبەخشینی زەکاتدا. جیهانی مادی**

---

[٢٦] / **بڕوانە: قورئان سورەتی الحج، هەردوو ئایەتی (٤٥-٤٦).**

[٢٧] / **بڕوانە: قورئان سورەتی الشعراء هەردوو ئایەتی (٧-٨).**

[٢٨] / **بڕوان:قورئان سورەتی الروم ئایەتی (٩).**

[٢٩] / **بڕوانە: قورئان سورەتی ق ئایەتی (٦-١١).**

[٣٠] / **بڕوانە: قورئان سورەتی الغاشیة ئایەتی (١٧-٢٠).**

[٣١] / **بڕوانە: قورئان سورەتی الواقعة ئایەتی (٦٣-٧٤).**

مەملەکەتی شەیتان نیيە، جەستەیش شوێنگەی گوناه نیە، هەتا ڕۆژی دوایی. کە گەورەترین ئامانجو هیوای مرۆڤە، قورئان بەشێوەیەك وێنای کردووە کە پڕاوپڕە لە ڕەنگەکانی ئەم دونیایە. مەسیحیەکان لەمەدا واهەست دەکەن کە پێچەوانە بوەستێتەوە لەگەڵ بیروباوەڕیاندا، بەڵام ئیسلام واناببینێت کە جیهانی مادی نامۆ بێت لە چوارچێوە ڕۆحیەکەیدا.

هەندێك ئایەتی قورئان سەرنجی فکری مرۆڤ دەوروژێنن بۆ تێڕامانو هێزێکی پاڵنەر دەبەخشنە عەقڵی دۆزەرەوە:

﴿ أَوَلَمْ يَرَ الَّذِينَ كَفَرُوا أَنَّ السَّمَاوَاتِ وَالْأَرْضَ كَانَتَا رَتْقاً فَفَتَقْنَاهُمَا وَجَعَلْنَا مِنَ الْمَاءِ كُلَّ شَيْءٍ حَيٍّ أَفَلا يُؤْمِنُونَ ﴾[٣٢]

یان ﴿ وَفِي الْأَرْضِ قِطَعٌ مُتَجَاوِرَاتٌ وَجَنَّاتٌ مِنْ أَعْنَابٍ وَزَرْعٌ وَنَخِيلٌ صِنْوَانٌ وَغَيْرُ صِنْوَانٍ يُسْقَى بِمَاءٍ وَاحِدٍ وَنُفَضِّلُ بَعْضَهَا عَلَى بَعْضٍ فِي الْأُكُلِ إِنَّ فِي ذَلِكَ لَآيَاتٍ لِقَوْمٍ يَعْقِلُونَ ﴾[٣٣]

ئەم ئایەتەی دوایی بەتایبەتی فیکر دەوروژێنێت، گرفتێك باس دەکات کە ڕیشەی لە قوڵایی زانستی کیمیادایە. دەرئەنجامیش موسڵمانەکان بوون کە کۆتاییان بەو جەدەلو کێبەرکێیە هێنا سەبارەت بەچەند کێشەیەکی جەوهەری کە زهنی مەسیحیەتی پەرێشان کردبوو، کاتێك کە بەرەو زانستی کیمیا ڕۆیشتن، ئەمەیش وەرچەرخانێك بوو لە فەلسەفەی صۆفییەتەوە بۆ زانستی عەقڵانی.

لە هەموو ئەو ئایەتانەدا کە لەپێشەوە لە قورئانمان وەرگرتبوونو وەکو نموونە هێنابوومانەوە یەك ڕەگەزی هاوبەش هەیە ئەویش بانگەشەیە بۆ سەرنجو تێبینی کردن ، ئەمەیش کردەوەیەکە لە ڕێگەیەوە مرۆڤ توانای شکا بەسەر جیهانو سروشتدا.

توێژینەوە لە بنچینەی هێزە ڕۆژئاواییە کە سەلماندوویەتی، کە ئەو هێزە لە چەكو ئابوورییەکەیدا حەشار نەدراوە، ئەوە تەنها ڕووخساری دەرەکی شتەکانە، بەڵکو لە تێبینی ئەو میتۆدە ئەزموونگەرییە لە بیرکردنەوەدا شاراوەتەوە کە شارستانیەتی ڕۆژئاوایی لە (بیکۆن[٣٤]) وە بۆی ماوەتەوە - ((جان فوراستی)) دەڵێت: ((تێبینی کردنی

---

[٣٢] / بڕوانە: قورئان سورەتی الأنبیاء ئایەتی (٣٠).

[٣٣] بڕوانە: قورئان سورەتی الرعد ئایەتی (٤).

[٣٤] (بیکۆن) میتۆدی ئەزموونگەری لەموسڵمانانەکان وەرگرتووە: بڕوانە بەشی (١١) لەم کتێبەدا.

سروشت و کۆمەڵگەو خەڵك قۆناغی یەکەمە لە فێرکردنی بنەڕەتیدا بۆ هەموو مناڵان لە جیهانی ڕۆژئاوادا... ئەمەش گرنگیدانە بەجیهانی دەرەکی کە پێچەوانەی گرنگی پێدانی فەیلەسوفە بەراهیمی و بوزیەکانە کە لە جیهانە دەرەکیەکەوە بەرەو جیهانە ناوخۆییە کە ڕۆیشتن)).

ئەو جۆرە بیرکردنەوەیەش بێ سودە کەپێی وایە خەڵکی دەتوانن بەپێشکەوتن بگەن بەبێ ئەوەی بنەماکانی بیرکردنەوەی ئەزموونگەری ((گالیلۆ))و ((باسکال))و (نیوتن))و ((گلود برنارد)) لەخۆ بگرن مەرجی پێشینە بۆ هەر پێشکەوتنێکی ئابووری و کۆمەڵایەتی بریتیە لە گۆڕین لە شێوازی بیرکردنەوەدا... وەرچەرخان لە ئەبستراکتەوە بۆ ((عەینیەت))..لە لۆژیکەوە بۆ ئەزموونیو... لە چەق بەستنەوە بۆ ئەفراندن[٣٥]. شتێکی مەحاڵە بتوانرێت ئیسلام لە مومارەسەی کرداریدا بەو شێوەیەی کە لە ئاستە سەرەتاییەکەیدا هەیە جێبەجێ بکرێت، بۆ نموونە نوێژ ناکرێت بە شێوەیەکی ڕاستو دروست ئەنجام بدرێت بەبێ ڕێکخستنی کات و وەرگرتنی ئاڕاستەی ڕووگە، موسڵمانان (لەگەڵ بڵاوبونەوەیان لەسەر گۆی زەوی) پێویستە لەسەریان هەموویان لەکاتی نوێژدا ڕوو بکەنە کەعبە. هەموویان ((بەجیاوازی شوێنەکانیانەوە)) دەبێت بەو شێوەیە بوەستن ڕوویان لە کەعبە بێت. هەروەها دیاری کردنی کاتەکانی نوێژ پەیوەستە بەچەند حەقیقەتێکی زانستی فەلەکەوە، دەبێت بە شێوەیەکی وورد کاتەکانی (پێنج نوێژەکە) لە ماوەی هەموو ڕۆژەکانی ساڵدا دیاری بکرێن، ئەمەیش پێویستی بەدیاریکردنی شوێنی زەوی هەیە لە خولگە گەردونیەکەیدا کە بە دەوری خۆردا دەسوڕێتەوە. لەلایەکی تریشەوە

---

٣٥ / بڕوانە: (جان فوراستی) و (باسکال) و (نیوتن) و (کلود برنارد) لەم کتێبانەیاندا: Jean Fourasti: The Civilization of Tomorrow (Zagreb: n,p.n.d) p.47-48.

فورست لێرەدا دەگەڕێتەوە بۆ فیکری تەجریبی کە (موریس فینوشیارو) و((گالیلو)) لە: Maurice A. Finocchiaro: Galiec and the Art of Reasoning: Rhetorical Foundations of logic and Scientific Method (Dordrecht: Holand: Ridel Publications,1976).

-Blaise Pascal: Oeuvres Complete…(Paris: Hachette et Cie, 1965).

-Sir Isaac Newton. Works..Vol. 3: Remarks Upon a Discourse of Free Thinking (New York Ams Press, 1966).

-Claude Bernard: An Introduction to the Study of Experimental Medicine. trans (New York: Dover, 1957)دایان ناوە.

زەکات پێویستی بە سەرژمێرو ڕێنومایی و ژمێرکاری هەیە*.حەجیش پەیوەستە بە سەفەرکردنەوەو پەیوەست بوون بە زۆرێك لەو حەقیقەتانەوە کەوا گەشتیار دەوێت بۆ ڕێگای دوور. ئەگەر شتەکەمان خستەوە ساناترین شێوە، وە ئەگەر چاوپۆشیمان کرد لە هەر شتێکی تر ـ ( لە ئیسلامدا) ـ ئەوا دەبینین کۆمەڵگەی موسڵمانان، بەبێ مومارەسە کردنی هەرشتێکی تر بێجگە لە پێنج پایەکەی ئیسلام، پێویستە لەسەری بگاتە نزمترین ئاستی شارستانیەت، ئەمەیش مانای ئەوە دەگەیەنێت کە مرۆڤ ناتوانێت موسڵمان بێت و لە هەمان کاتیشدا کەسێکی دواکەوتوو بێت.

بێگومان ئەم ئاڕاستەیەش مەبەستدار بووە، بەڵگەش لەسەر ئەمە لە خودی مێژووی زانستی ئیسلامییەوە دێت ئەم مێژووە بۆمان دەردەخات کە چۆن پەرەسەندنی هەموو ئەو بوارە زانستیانە لە چاخی یەکەمی ئیسلامیدا بەو هەوڵانە دەستی پێکرد کە دەدرا بۆ جێبەجێ کردنی فەرزە ئیسلامییەکان بەوپەڕی ووردی و ڕێكو پێکیەوە.

ئەمە زیاتر ڕوونو ئاشکرا بوو، لەوەدا کە پەیوەندی بە پەرەسەندنی زانستی فەلەکیەوە هەیە لە کتێبی ((جنسن)) دا ((مێژووی زانستە سروشتیەکان)) کۆمەڵە حەقیقەتێك دەبینین کە جەخت لەکاریگەریەتی جیهانی ئیسلامیو ئەو دەستکەوتانەی دەکاتەوە کە لە بواری ئەم زانستەدا بەدەستی هێناون.

موسڵمانەکان لە دۆڵی ڕووباری فوراتدا زانستی ئەستێرە گەرییان گەشاندەوە، هەروەها زانیاریەکی گرنگ لەبارەی دیاردە فەلەکیەکانەوە لە ماوەی سێ هەزار ساڵدا کۆکراوەیە. بەڵام چونکە بڕوابوون بەپەیوەندی چارەنووسی مرۆڤ بە ئەستێرەکانەوە ((کە ئەمە بواری گرنگی پێدانی زانستی ئەستێرەگەرییە)) نامۆیە لەئیسلامدا، ئەوا یەکتاپەرستی و لۆژیکی ئیسلامی و توانی زانستی ئەستێرەگەری بگۆڕێت بۆ زانستی فەلەکناسی. بۆ ئەم مەبەستەش قوتابخانەی بەغداد بۆ زانستی فەلەك ناسی دامەزرێنرا بەناوی ڕوانگە بەناوبانگەکەیەوە ناونرا ((سیدیلوت Seaillot)) لەم بارەیەوە دەڵێت:((یەکێك لەتایبەتمەندترین تایبەتمەندەکانی قوتابخانەی بەغداد بۆ زانستی فەلەك ناسی هەر لەسەرەتای دروستبوونیەوە، ڕۆحە زانستیەکەی بوو: ڕۆیشتن لە زانراوەوە بۆ

---

* / ڕەنگە دانەر مەبەستی سەرژمێری ئەو کەسانە بێت کە زەکات یان پێ دەبەخشرێت، هەروەها بەڵگەی پێشیاوی و ژمێرە کردنی ڕێژەکانی زەکات (وەرگێڕ. ع).

نەزانراو هەروەها قەبوڵ نەکردنی هیچ شتێك لە ڕێگەی ئەزموونەوە نەسەلما بێت))، ڕۆژژمێری ((خەیام)) لەلایەنی ووردەکاریەکەیەوە نزیکە لەو ڕۆژژمێرەی (گریکۆری) کە (ئەوروپا) هەتا ئەمڕۆیش بەکاری دەهێنن[٣٦]. بەڵام خشتەی (تولیدو) کە دانەرەکەی ((ئیبراهیم زرگلی))یە و تایبەتە بەلێکۆڵینەوەی جووڵەی هەسارەکان ـ بۆ ماوەیەکی درێژ بناغەی زانستی فەلەکناسی بوو لە ((ئەوروپا))دا، (بیرونی) لە سەردەمی خۆیدا رایگەیاند کە زەوی بە دەوری خولگەکەیدا دەسوڕێتەوە لەبەردەم خۆردا (نەك خۆر بە دەوری زەویدا بسوڕێتەوە کە لە پێش ئەوەوە بڕوا وابوو). (ئیبن باجە) یش پێی وابوو کە خولگەی هەسارەکان هێلکەیین نەك بازنەیی ئەم گرنگی پێدانە بێ وێنە بەزانستی فەلەك ناسی و بەزانستە سروشتیەکان لە ماوەی چاخی یەکەمی ئیسلامدا، دەرئەنجامێکی ڕاستەوخۆی کاریگەری قورئان بوو، ئاین وەرچەرخابوو بەرەو سروشت، قۆناغێکی مەزن لە پەرەسەندن لە زانستەکاندا دەستی پێکردبوو. ئەمەیش لە مەزنترین ئەو دەستکەوتانەن کە لە مێژوودا بەدی هاتوون.

لە ئامێزگرتنی زانست لەلایەن ئایینەوە ئاڕاستەیەکی ئیسلامییە، دەکرێت لە جوانترین شێوەدا ببینرێت لە پەیوەست کردنی مزگەوت بە قوتابخانەوە. یەکەم بڕیاری بنیاتنانی قوتابخانەکەکان لە نزیك مزگەوتەکانەوە دەگەڕێتەوە بۆ خەلیفەی دووەم (عومەری کوڕی خەتاب) ﷺ ئەم بڕیارەش جارێکی تر لە سەردەمی هاروونە ڕەشیدا (٨٧٦ ـ ٨٠٨) دووبارە بووەتەوە: بەو شێوەیە هەتا سەردەمێکی درەنگ قوتابخانەکان لە مزگەوتەکان جیانەبوونەتەوە، هەتا ئەو کاتەی قوتابخانەی (نیزامیە) لە بەغدا دروست کرا. لەگەڵ ئەوەیشدا، بەرنامەکانی خوێندن هەر لەسەر هەمان بنەمای (یەکێتیەکی دوو جەمسەرە) بەردەوام بوو.

بەدرێژایی مێژوو مزگەوت تەنها جێگەی پەرستش نەبووە. ((رسلو)) جەخت لەسەر ئەم حەقیقەتە دەکاتەوەو دەڵێت: لە چاخەکانی یەکەمی (ئیسلامدا) هەر شوێنێك کە خەڵکانی

---

[٣٦] / بڕوانە: ((لولین بوین))
Liewelyn Powys; Omar Kayyam; Rats in the Sacristy Freeport,
N.Y: Books for Libraies Press, 1967) P.125.

دڵسۆز تێیدا کۆدەبوونەوە - ئیتر ئەگەر ئەو شوێنە قوتابخانە یان یانە یان بازاڕ بوایە - بە مزگەوت دادەنرا[37].

لەم ئاڕاستیەشەوە دیاردەیەك بەرهەم هات کە تەنها لە چوارچێوەی کلتورە ئیسلامییەکەدا ناسراوە، ئەویش ئەوەیە دەکرێت ناوی لێ بنرێت ((المسجدرسة)) کە بینایەکی بێ وێنەیە: هەردوو وەزیفەی مزگەوت و قوتابخانە پێکەوە کۆدەکاتەوە، لە بەرامبەر ئەمەیشدا لە زمانە ئەوروپییەکاندا ناولێکنانێکی هاورێکی تەمەنیە[38]. ئەم بینا جیاوازە بریتیە لەو هاوبەرامبەریە مادی‌یە یان تەکنیکیەی ئەو بەڵگە نەویستە ئیسلامییە بۆ یەکێتی ئایین و زانست کە قورئان خۆی لە یەکەم دابەزیندا بەوە دەستی پێکرد : ﴿ اقْرَأْ بِاسْمِ رَبِّكَ الَّذِي خَلَقَ... ﴾[39] هەمان ئەم چەمکە ڕەنگی دایەوە لە هەموو ئەو بەرنامانەدا کە ئەو قوتابخانانە پێشکەشیان کردوە قوتابخانەی ((نیزامیە)) لە بەغداد، بۆ ماوەیەکی درێژ نموونەی قوتابخانەی ئیسلامی بوو لە هەموو شوێنێکدا. ئەوروپییەکان پێیان وایە ئەم قوتابخانەیە دادەنرێت بە قوتابخانەیەکی (ئایینی باڵا). لە ڕاستیدا بەرنامەکانی ئەم قوتابخانەیە.. بە تەنیشتیەوە زانستەکانی ئایین لە تەفسیرو حدیث و ئەخلاق و عەقیدەی لەخۆدەگرت - هەروەها لەسەر ئاستی خۆیشیدا گرنگی بە یاسا (فقه) و فەلسەفەو ئەدەب و بیرکاری‌و فەلەك‌و حەقیقەتە بنەڕەتیەکانی زانستی پزیشکی دەدا، وەکو بەشێکی جیانەبوەوە ؟؟ بەرنامەکانی[40]((نیزامیە)) نموونەیەکی سەرمەشق بوو بۆ زۆرێك لە قوتابخانەکانی هاوشێوەی، وای لێهات ئەم تەرزە بوویە بڵاوترین شێوەی قوتابخانە لە هەموو شارە ئیسلامییە گەورەکاندا.

لەبەرئەوە ناکرێت قوتابخانەکان لە جیهانی ئیسلامیدا بەپێی پێوەرە ئەوروپییەکان پۆلێن بکرێت، کە قوتابخانە دابەش دەکات بۆ مەدەنی و ئایینی. چونکە ئەم جۆرە

---

[37] / بڕوانە: ((رسلر)) Jacque Risler: la Civlization Arab…P.128. هەروەها بڕوانە ((ستیفانۆ بیانکۆ)) Stifano Bianko: The Polyvalence and Flexibility in the Structure of the . islamic City, (in Werk. Switzerland, Sept, 1976)..

[38] / بەڵگەی مێژوویی هەیە لەسەر ئەوەی کەیەکەم مزگەوت پێغەمبەر خۆی (د.خ) بونیادی نا لەهەمان کاتیشدا قوتابخانە بوو پێی دەوترا (الصفة).

[39] / بڕوانە: قورئان سورەتی العلق ئایەتی (١).

[40] / بڕوانە: ((رسلر)) سەرچاوەی پێشوو.

قوتابخانانه، موسڵمانەکان هەموویان بە شتێکی سروشتی دایانناوە، لەبەرئەوەی ڕاستەوخۆ لە ڕۆحە ئیسلامییەکەیەوە هەڵگۆزراوە، ئەم هەڵویستیە هەتا ئیستاش بەو شێوەیە ماوەتەوە، ئەگەر ناکۆکیەیەش لەسەر ئەمە هاتبێتە کایەوە ئەوا دەگەڕێتەوە بۆ کاریگەریە بیانیەکە. ڕەوشی ئەسڵی قوتابخانە یەکسان دەبێت لەگەڵ چەمکە ئیسلامییە بنەڕەتیەکەدا کەوا ئایین و زانست لە یەکدا کۆدەکاتەوە. ئەزهەری قاهیرە گەورەترین و کۆنترین قوتابخانەیە (ساڵی٩٧٢ ز بووبنیادنراوە)، هەمیشە وەکو مزگەوت و زانکۆ ئامادەی بۆ دەکرێت. فێرکردن لە ئەزهەردا کورت نەکراونەتەوە تەنها لە ئاییندا مەگەر لە خراپترین ماوەکانی ئاڵۆزبووندا. لە ساڵی ١٩٦١ ئەزهەر چاك کرایەوە، خاسیەتە ئەسڵی و تەواوکاریەکەی بەدەست هێنایەوە، لە پاکستانیش دەوڵەت داوای لە پێشەوای مزگەوتەکان کرد کە بەرنامەی نەهێشتنی نەخوێندەواری جێبەجێ بکەن، ئەمەیش لەخۆیدا لێپێچانەوەیەکی دروستە، هەرچەندە وەکو پێویستیش جێبەجێ نەکرێت. هاوشێوەی ئەمەیش لە ئێران هەیە، بۆ نموونە لە خزمەتی سەربازیدا سەربازە خوێندەوارەکان نەخوێندەوارەکانیان فێری خوێندنەوەو نووسین دەکەن، هەروەها مزگەوتەکان وەکو بینایی قوتابخانە بەکاردەهێنرێت.

هاوبەندکردنی مزگەوت و قوتابخانە پێکەوە (المسجدرسة) یەکێکە لەو هێما ئیسلامیانەی کە نە زیادو نە کەم هەڵناگرێت.

ئاڕاستەبوونی ئیسلام بەرەو جیهانی دەرەکی واقیعیەتێکی تایبەتی پێ دەبەخشێت لە تێگەیشتنیدا بۆ مرۆڤ. قەبوڵ کردنی سروشت بەشێوەیەکی گشتی هەروەها قبوڵکردنی سروشتی مرۆڤایەتیش دەگەیەنێت، تێشیدا جەستەی مرۆڤ. ئیسلام بریتیە لە بەدیهێنانی ئەو ئامانجە مەحاڵە کە لە تێڕوانینی مەسیحیەتدا هەیە ئەویش داننانە بەواقیعیەتی جیهاندا. لەم بارەیەوە هەندێك ئایەتی قورئانی نامۆ دەردەکەون لە تێڕوانینی ئاینی ئەبستراکتەوە (بۆ نموونە ئەو ئایەتانەی پەیوەستن بە قەبوڵکردنی چێژی جەستەیی و حەزی سێکسی، کۆشش و تەندروستیەوە). بەو شێوەیە گەورەترین حەقیقەتی یەکلاکەرەوە چۆربەست بویەوە لە مێژووی ئاینەکانداو لە مێژوی عەقڵی مرۆیدا بەشێوەیەکی گشتی ـ بە دەرکەوتنی ئایینی هەردوو جیهان (ئایینی جیهانیان)... یان دەرکەوتنی ئەو سستەمەی کە ژیانی مرۆڤایەتی بە هەموو لایەنەکانیەوە لە ئامێز دەگرێت

هەروەها ئەوە بۆ مرۆڤ دەرکەوت کە پێویست ناکات لەپێناو زانستدا ڕەتی ئایین بکاتەوە، یان واز لە کۆشش بۆ ژیانێکی باشتر بهێنێت لەپێناو ئاییندا. گرنگی پێدانی زۆری ئیسلام لەو حەقیقەتەدا شاراوەتەوە کە ئەو بوونی ناڕەحەتی و موعاناتەکانی فەرامۆش نەکردووە، هەروەها پێویستی تێکۆشان دژ بە موعاناتانە لە ژیاندا، ئەمەیش مەحەکی یەکلاکەرەوەیە لە مێژووی مرۆڤایەتیدا.

لەو کاتەدا ئیسلام تییدا جەخت لەسەر ڕێزوگەورەیی مرۆڤ دەکاتەوە، واقیعیەتێکی توندو تیژ دەخاتە ڕوو، کە خەریکە چەمکی (پاڵەوانێتی) هەڵوەشێنێتەوە کاتێك مامەڵە لەگەڵ مرۆڤدا دەکات وەکو فەردێك. ئیسلام هەوڵی گەشەپێدانی ئەو سیفەتانە نادات کە هیچ ریشەیەکیان نیيە لە سروشتی مرۆڤدا، هەروەها هەوڵی ئەوە نادات بمانکاتە فریشتە، چونکە ئەمە مەحاڵە، بەڵکو بەرەو ئەوە دەڕوات وا لە مرۆڤ بکات کە مرۆڤ بێت.

لە ئیسلامدا بڕێك لە زوهد هەیە، بەڵام بەو زوهدە هەوڵی تێکدانی ژیان یان تەندروستی یان فیکرو حەزی هاوژیانی لەگەڵ کەسانی ترو ئارەزووی ئاسوودەیی و وە چێژ وەرگرتن نادات. ئەو بڕە زوهدە مەبەست لێی ڕاگرتنی هاوسەنگیە لە غەریزەکاندا، یان فەراهەمکردنی جۆرێکە لە هاوسەنگی لەنێوان جەستەو ڕۆحدا.. لەنێوان پاڵنەرە ئاژەڵیەکان و پاڵنەرە ئەخلاقیەکاندا. بەو شێوەیە ـ لە ڕێگەی دەست نوێژو ڕۆژوو نوێژی کۆمەڵی و چالاکی و تێبینی و ئەزموون و کۆشش و (نێوەند گیری) ئیسلام پەرە بەکاری فیترەت ئەدا لەپێکهێنانی مرۆڤدا. لێرەدا هیچ جێگەیەك نیە بۆ بەرەنگاری سروشت. هەتا بە ڕادەی ناهاورێکی بوونی ئامانجەکانیش، بەردەوامیەتی ئەمە بەرپایە.

هەر ئەم هەڵویستە ئیسلامییەشە بووەتە هۆکاری بەدحاڵی بوونی (عەقڵە ڕۆژئاواییەکە) بۆ ئەم ئایینە، ئەم بەدحاڵی بوونەیش هەتا ئەمڕۆکە هەر بەردەوامە.

هەندێ لە ڕەخنەگران سەبارەت بەم حاڵەتە هێرشیان کردوەتە سەر ئیسلام. بۆ بەهێز کردنی ڕاو بۆچونەکانیشیان چەند ئایەتێك لە قورئانی پیرۆزو هەندێك نموونەیان لە ژیانی پێغەمبەر (د.خ) هێناوەتەوە. ئێمە بەڕاشکاوی بەبێ هیچ پێچ و پەنایەك دەڵێین: بەڵێ.. ئیسلام پارێزگاری لە ژیانی سروشتی دەکات و زوهدگەری ناکات... هەروەها پشتگیری دەوڵەمەندی دەکات دژ بە هەژاری، هەروەها پاڵپشتی لە توانای مرۆڤ دەکات بۆ زاڵبوونی بەسەر سروشدا، نەك تەنها لەسەر ئەم هەسارەیەدا بەڵکو لە هەموو گەردووندا، ئەوەندەی

که بۆی کرا. بەڵام بۆ ئەوەی هەڵویستی ئیسلام تێ بگەین تێگەیشتنێکی ڕاست و دروست، ئەوا دەبێت بڕوانین بۆ بیرۆکەکانی: سروشت و دەوڵەمەندی و سیاسەت و زانست و هێزو مەعریفەو ئاسوودەیی بە شێوازی جۆر بەجۆرو بەشێوەی کە خەڵکی لە شارستانیەتی ڕۆژئاوایدا لەسەری ڕاهاتوون.

ئیسلام دەخوازێت لە مرۆڤ کە هەموو لێپرسراویەتیەکانی بە تەواوەتی هەڵبگرێت، میثالیەت هەژاری و زوهدو مەینەت کێشی بەسەردا فەرز ناکات[41]. هەروەها تامکردنی ((خوێی زەوی و ئاوی زەریا سوێرەکان لەسەر مرۆڤ حەرام ناکات[42]، ئەم ئاینە بۆ مرۆڤ ژیانێکی کامڵ و تێروپڕ دەخوازێت[43]. ژیان لە ئیسلامدا دووفاکتەری تەواوکەر جڵەوگیری دەکەن: یەکێکیان ئارەزووی سروشتی لە خۆشبەختی و هێزدا، دووهەمیان کەماڵی ئەخلاقی (یان دروستکردنی بەردەوامی خود).

ئەم دوو فاکتەرە دژبەیەك دەوەستنەوە، تەنها لە چوارچێوەی لۆژێکی تیۆریدا دژ بە یەك دەوەستنەوە، بەڵام بەچەندین شێواز لە ژیانمانداو لەبەردەم چاوەکانماندا ئەم دووانە پاڵپشتی یەکتر دەکەن. ئەمەیش توانستێکە تەنها بە مرۆڤ بەخشراوە، وە لە ڕێگەیەوە دەکرێت حوکمی بەسەردا بدرێت، ﴿ وَكَانَ الْإِنسَانُ أَكْثَرَ شَيْءٍ جَدَلاً ﴾ الكهف/٥٤.

ئینجیلەکان غەریزەکان تۆمەتبار دەکەن و تەنها لەبارەی ڕۆحەوە دەدوێن، بەڵام قورئان، ئەم غەریزانە ئاشت دەکاتەوە چونکە حەقیقەت و واقیعین ئەگەر تێشیاندا باڵایی نەبێت، قورئان لە چاوی تێگەیشتنەوە نەك تۆمەتبارکردنەوە دەڕوانێتە غەریزەکان. سووژدەی فریشتەکانیش بۆ مرۆڤ حیکمەتێکی تێدایە[44]، ئایا ئەم سوژدە بردنە لە پێشتر بوونی ئەوەی مرۆییە بەسەر ئەوەی فریشتەییە ناگەیەنێت ؟، هەروەکو چۆن دراما زیاتر حەقیقی ترە لە نموونە باڵا ئەبستکراتیەکان. مرۆڤەکان بوونەوەری نەجیب و ئاکار شیرین نین، بەڵکو تەنها سازێنراون بۆ چاکەکردن. مرۆڤ بوونەوەرێکی فیزیاوی و زیرە، لەنێوان حەزو ئارەزووەکانیدا گرفتارەو هەریەکەیان بۆلای خۆی پەلکێشی دەکەن، کاتێك

---

[41] / پێغەمبەر (د.خ) لە فەرموودەیەکدا دەفەرموێت: ((رەهبانیەت لە ئیسلامدا نیەیە)).

[42] / بڕوانە: ((ئەندریەجید)): Andre Gide: Fruits of the Earth, trans...(London: Secker and Warburg,1962).

[43] / ﴿ يَا أَيُّهَا الَّذِينَ آمَنُوا لا تُحَرِّمُوا طَيِّبَاتِ مَا أَحَلَّ اللَّهُ لَكُمْ وَلا تَعْتَدُوا إِنَّ اللَّهَ لا يُحِبُّ الْمُعْتَدِينَ ﴾ المائدة /٨٧.

[44] / بڕوانە: ﴿ وَإِذْ قُلْنَا لِلْمَلائِكَةِ اسْجُدُوا لآدَمَ فَسَجَدُوا إِلَّا إِبْلِيسَ أَبَى وَاسْتَكْبَرَ وَكَانَ مِنَ الْكَافِرِينَ ﴾ البقرە/ ٣٤.

دەمانەوێت لە ژێر کاریگەری ئارەزوویەکی شازدا وا لە خەڵك بکەین ببنە بونەوەرێکی پاك لە هەڵەو خاڵی لە خراپە، لە ناکاودا بۆمان دەردەکەوێت - لە بری ئەوە - کۆمەڵە کەسێتیەکی ساختەو هەستیارو نادروستمان بەدەست هێناوە ... جۆرە بونەوەرێك کە توانای ئەنجامدانی خەیرو شەڕیان نی‌یە، ئێمە کاتێك ئەوان جیا دەکەینەوە لە زەوی ئەوا لە ژیانیشیان جیا دەکەینەوە، جیاکردنەوەشیان لە ژیان، نەبوونی ژیان دەگەیەنێت، مادام ژیانیش نەبێت ئەوا فەزیلەتیش هەروەها بوونی نابێت.

((فرۆید)) سەلماندی کە غەریزەی سێکسی ناکرێت لەناوببرێت بەڵکو تەنها دەچەپێنرێت، چەپاندنی پاڵنەرە سێکسیەکانیش دەردەسەری زیاتر بەشوێن خۆیدا دەهێنێت.

هەرچەندە خواستی پاکیزەیی و چەپاندن لە مەسیحیەتدا باڵاییە، بەڵام فیکری ئیسلامی لەبارەی رێکخستنی ژیانی سێکسی و هاوسەنگ ڕاگرتنی و جڵەوڕاگیرکردنی نزیکترە لەسروشتی مرۆڤەوە، چونکە تێیدا داندەنێرێت بەگرفتەکەو رووبەڕوو بوونەوەیدا لەم بوارەدا ئیسلام تەنها ئاینێکی ئەبستراکت نیە، چونکە هەموو ئەو بەڵگانە سەلمێنەری ژیانی سێکسن، هەموویان بەڵگەی عەقڵی و زانستین نەك ئایینی.

ئەو کێشەیەی لێرەدا شایانی باس لێکردنەو لێی دەدوێین کێشەی گونجانی مرۆڤە لەگەڵ خۆیدا، گونجانی نموونە باڵاکانیەتی لەگەڵ ئارەزووە ماددی و کۆمەڵایەتی و فیکریەکانیدا، چونکە ململانێ لەم بوارە ئۆرگانیەدا سەرچاوەی بنەڕەتی نەخۆشیە دەماریەکانە، سەرچاوەیەکی تری ناسازی و ململانێیە لەنێوان مرۆڤو ژینگەکەیدا.

زۆرکەم قورئان ڕووی گوتاری لە فەردە، زۆربەی گوتارە قورئانیەکان ئاراستەن بۆ (خەڵك)، کاتێکیش ئەمە دەکات زۆرجار وەکو هاوڵاتیەك لە کۆمەڵگەدا دەیاندوێنێت. مرۆڤ وەکو ئەندامێك لە کۆمەڵگەدا، کوڕی ئەم جیهانەیە، کاتێکیش لە ئاسماندا نیشتەجێ دەبێت تەنها فەردێکە! ئەوەیش وا لە مرۆڤ دەکات ببێتە بوونەوەرێکی کۆمەڵایەتی ئەو سیفەتە فەردیانەی نی‌یە کە تایبەتن بەخۆیەوە، بەڵکو ئەو سیفەتانەیەتی کە تێیدا لەگەڵ خەڵکانی تردا هاوبەشن. ئەگەر فەردو کۆمەڵگە هەردووکیان سەربەخۆ لە یەکتر دروست بووبن بەپێی وێنەو نموونەی جیاواز، ئەوا ململانێی نێوانیان شتێکی ناچاریە. لێرەوە

ئیسلام دێت نەك بۆ جەخت کردنەوە لە خۆشەویستی ئینجیلیی، بەڵکو بۆ جەختکردنەوە لە دادپەروەری بەو پێیەی کە سستمە باڵاکەیەتی[٤٥].

ئاشکرایە ئەو ویستوویەتی بەمە موسڵمان فێر بکات چۆن یەك بگرن وەکو تاك وەکو هاوڵاتیەك، چونکە دادپەروەری فەزیلەتێکە لەسەر ئاستی شەخصی و لەسەر ئاستی کۆمەڵایەتی، یان وەکو ئەرستۆ دەڵێت ((فەزیلەتێکی سیاسیە))[٤٦] لەبەرئەوە، دەکرێت پێشبینی ئەوە بکەین کە موسڵمان - بەهۆی هاوسەنگی لەنێوان خواستە ماددی و ئەخلاقیەکانەوە لای - زیاتر لە هەر مرۆڤێکی تر سازو گونجاوتر بێت لەگەڵ ژینگەکەیدا. بەڵام تەعالیمە مەسیحیەکان - لەمەدا وەکو هەر تەعالیمێکی میثالی تر - بەرەو تیاچوون و هەست نەکردن بە ئارامی دەڕوات، ئەمەیش بەهۆی ئەو دژیەکە دیارو ئاشکرایەوە کە لەنێوان ئارەزووەکان و واقیعداو لەنێوان تیۆرو نێوان مومارەسەی کرداریدا هەیە[٤٧].

ئەو شڵەژانە دەماری و شێواندنەی تووشی مرۆڤی ڕۆژئاوایی بووە، بەشێکی دادەنرێت بەدەرئەنجامی ئەو ململانێ ناوخۆییە لەنێوان نموونە باڵاکانی مەسیحی و لەنێوان نموونە سیاسیەکانی کۆمەڵگەدا هەیە کە بە شێوەیەکی جیاو سەربەخۆ لەو نموونە باڵایانە پەرەیسەندوە. ئەمەیش ڕەوشێکە کەنیسە تێدا وایلێهاتووە لێپرسراویەتی چاودێری گیان دەکات و، دەوڵەت فەرمانڕەوایی لە جەستەکاندا دەکات ئەمەیش بەپێی ئەو بەڵگە نەویستەی دەڵێت ((ئەوەی هی قەیسەرە بیدە بە قەیسەر ئەوەیش هی خودایە بیدە بە خودا[٤٨])).

لێرەوە ڕێگە دراوە بەمرۆڤی ڕۆژئاوایی کە مەسیحی بێت لە ژیانی تایبەتیداو، (میکاڤیلی) بێت لە کارو مامەڵە گشتیەکاندا، ئەو کەسانەیش کە ناتوانن ئەم ململانێیە چارەسەر بکەن یان هەڵی بگرن ئەوا دەبنە نێچیری شڵەژانە دەماریەکان. لەلایەکی

---

[٤٥] / ﴿ يَا أَيُّهَا الَّذِينَ آمَنُوا كُونُوا قَوَّامِينَ بِالْقِسْطِ شُهَدَاءَ لِلَّهِ وَلَوْ عَلَى أَنْفُسِكُمْ أَوِ الْوَالِدَيْنِ وَالْأَقْرَبِينَ إِنْ يَكُنْ غَنِيًّا أَوْ فَقِيرًا فَاللَّهُ أَوْلَى بِهِمَا فَلَا تَتَّبِعُوا الْهَوَى أَنْ تَعْدِلُوا وَإِنْ تَلْوُوا أَوْ تُعْرِضُوا فَإِنَّ اللَّهَ كَانَ بِمَا تَعْمَلُونَ خَبِيرًا ﴾ النساء ١٣٥.

[٤٦] / بڕوانە: ((ئەرستۆ)) و ((تۆماس الأکوینی)). Aristotle: Politics, trans..(Cambridge, Mas: Harvard University Press,1959).

Thomas Aquinas: Summa Theologia (London: Blackfairs,1964)..

[٤٧] / بڕوانە: ((کارن هورني)) Karen Horney ; New Ways in Psychanalysis(New York; W,Norton, 1939).

[٤٨] / بڕوانە ((ئینجیل متی)) (٢١:٢٢).

تریشەوە، خەریکە ئەوانەی بۆیان ڕەخساوە جیهان ئیسلامی بناسن کۆ دەبنەوە لەسەر ئەم هەڵوێستە ئەویش بوونی گونجانە لەنێوان مرۆڤو ژینگەکەیدا، هەروەها بەبێ تێهەڵکێش کردنی فەرد لە ڕشتە کۆمەڵایەتیەکەدا. ئەم پێکدالکانەیش شتێکی دەست کرد یان سیاسی یان یاسایی نیە، بەڵکو پێکدالکانێکی ناوخۆیی و ئۆرگانیە، ئەمە حەقیقەتێکی بەرپایە سەرەڕای بڵاوبونەوەی هەژاری و دواکەوتنیش لەو وڵاتانەدا.

گومانی تێیدا نی‌یە کە موحەممەد (د.خ) پەرگیری ڕەتکردوەتەوە، ((ڕالف والدو ئیمرسۆن)) قسەیەکی لەم شێوەیە دەگێڕێنێتەوە بۆ ئەو کە فەرمویەتی ((من دوژمنی نەزانی بە تەقواو، زانای کافرم[49])) گومانی تێیدا نیە کە پێغەمبەر (د.خ) دوژمنی زۆرێك لەو حاڵەتە دژبەیەکانە بووە: بڕوادارانی لاواز، ئەو فەرمانڕەوایانەی بڕوایان نی‌یە بەخوا، دەروونێکی پاك لە جەستەیەکی پیسدا، دەروونێکی پیس لە جەستیەکی جواندا، پێغەمبەر (د.خ) دوژمنی دادپەروەریەك بوو کە هێزێك نەبێت پشتگیری بکات، هەروەکو چۆن دوژمنی هێزێکی زاڵمو خراپەکار بووە، پێغەمبەر (د.خ) ڕێگەی نەدەگرت لە دەوڵەمەندی و هەبوونی، بەڵام جەختی لە فەزیلەت دەکردەوە لەگەڵ دەوڵەمەندیدا، بە دڵنیایشەوە دژی فەزیلەتێکی ڕووت و بێ توانا بوو کە هیچ کەسێکی نەبێت پارێزگاری لێ بکات.

پێغەمبەر (د.خ) کۆششی لەپێناو ژیانێکی باشترو، جیهاد بەسەر ستەمکاری و نەزانیو نەخۆشیو هەژارییو پیسیدا لەگەڵ فەزیلەتی ئەخلاقیدا یەکسان کردبوو، موسڵمانانەکان قەدیس نین هەتا کاتێکیش کە نوێژ دەکەنو بە ڕۆژوو دەبن. ئەوان کەسانێکی ئاساین - ژنان و پیاوان - ێکن خەون بەخۆشەویستیو چێژی ژیانەوە دەبینن.

لەگەڵ ئەوەیشدا بەمانای ڕاستەقینەی ووشە ئەوان مرۆڤن، بەشداری لە ژیانی واقیعی دەکەن و هەمیشە دەگەڕێنەوە بۆی، ئەوان لەئەشکەوتەکاندا بەدوور لەکۆمەڵگە گۆشەگیر نابنو خۆیان فەرامۆش ناکەن، ئەوان خۆیان تەسلیم ناکەن بۆ ئەوەی لە ژێر سۆزو ڕەحمەتی دوژمنەکانیاندا بن، ڕەتی ((چێژ وەرگرتنیش لەو شتە پاكو چاکانەی کە خوا

---

[49] / بڕوانە: ((ڕالف والدو ئیمرسۆن)). Ralph Waldo Emerson: Conduct of Life, Nature and Other Essays (New York: dutton, 1915).

پێی بەخشیوون ناکەنەوە[50])). موسڵمانان پێیان وانیە تەنها ئازادی (جوانی) کەس بێت، هەموو موسڵمانێك دەتوانێت چێژ لەم جۆرە ئازادیە ببینێت. بەڵام سوور دەبن لەسەر ئازادی ماددی و رازی نابن بەوەی کۆیلە بن، سەرەڕای ئەوەیش کە ئەوان بڕوایان وایە ئەم ژیانی سەرزەمینە تاکە ژیانێك نیە، بەڵام هێشتا ئارەزووی ئەوەیشیان نیە لێی بکێشنەوە.

دەکرێت پێناسەی ئیسلام بکەین بەوەی بانگشەیەکە بۆ ژیانی ماددیو رۆحی پێکەوە. ژیانێك کە هەردوو جیهان (جوانی) و (برانی) یەکە دەگرێتەوە، یان وەکو قورئان رایدەگەیەنێت: ﴿ وَابْتَغِ فِيمَا آتَاكَ اللَّهُ الدَّارَ الْآخِرَةَ وَلَا تَنْسَ نَصِيبَكَ مِنَ الدُّنْيَا ﴾[51] لە سۆنگەی ئەم پێناسەیەوە دەتوانین بڵێین کە هەموو خەڵکی، یان زۆربەیان، بەم پێیە موسڵمانن[52] ڕەنگە ئەمەیش ئەو مانایە بگەیەنێت کە فەرمودەیەکی پێغەمبەر (د.خ) ئاماژەی بۆ دەکات: ((مرۆڤ لەسەر فیترە لەدایك دەبێت بەڵام باوكو دایکیەتی ئەیکەنە یەهودی یان مەسیحی یان ئاگرپەرست)) بەو مانایەی هەموو منداڵێك لەسەر فیترەت بە موسڵمانی لەدایك دەبێت، ئەوەیش دەبێتە هۆی ئەوەی بگۆڕێت بۆ شتێکی تر بەهۆی دایكو باوکیەوەیەتی یان ئەو ژینگەیەی کە تێدا دەژی.

مرۆڤ ناتوانێت مەسیحی بێت لەوێوە کە: ﴿ لا يُكَلِّفُ اللَّهُ نَفْساً إِلَّا وُسْعَهَا ﴾[53] لە هەمان کاتیشدا، ناکرێت مرۆڤ تەنها حەقیقەتێکی بایۆلۆژی یان ئەندامێك بێت لە کۆمەڵگەدا. ئەو ناتوانێت دەستبەرداری (عیسی) بێت، مرۆڤ ناتوانێت تەواو وەکو عیسی بژی و ناشتوانێت دژی ئەو بژی. چارەنووسی مرۆڤیش لەسەر ئەم زەویە ئەوە بوو کە جێگەیەك لەنێوان ئەم دوو حەقیقەتە دژەدا وەربگرێت، لێرەیشەوە گرنگی ئیسلام دەردەکەوێت بەو پێیەی کە چارەسەرێکی نموونەییە بۆ مرۆڤ، چونکە دان بە دوانیەتیدا دەنێت لە سروشتیدا[54].

---

٥٠ / ﴿ قُلْ مَنْ حَرَّمَ زِينَةَ اللَّهِ الَّتِي أَخْرَجَ لِعِبَادِهِ وَالطَّيِّبَاتِ مِنَ الرِّزْقِ قُلْ هِيَ لِلَّذِينَ آمَنُوا فِي الْحَيَاةِ الدُّنْيَا خَالِصَةً يَوْمَ الْقِيَامَةِ كَذَلِكَ نُفَصِّلُ الْآيَاتِ لِقَوْمٍ يَعْلَمُونَ ﴾ الأعراف /٣٢.

٥١ / بڕوانە: قورئان سورەتی القصص ئایەتی (٧٧).

٥٢ / بەپێی تەعبیری ((گۆتە)) ئەگەر ئەمە ئیسلام بێت ئەوا ئێمە هەموومان رازین بە ئیسلام.

٥٣ / ﴿ لا يُكَلِّفُ اللَّهُ نَفْساً إِلَّا وُسْعَهَا لَهَا مَا كَسَبَتْ وَعَلَيْهَا مَا اكْتَسَبَتْ... ﴾ البقرة/٢٨٦.

٥٤ / ﴿فَأَقِمْ وَجْهَكَ لِلدِّينِ حَنِيفاً فِطْرَتَ اللَّهِ الَّتِي فَطَرَ النَّاسَ عَلَيْهَا لاتَبْدِيلَ لِخَلْقِ اللَّهِ ذَلِكَ الدِّينُ الْقَيِّمُ وَلَكِنَّ أَكْثَرَ النَّاسِ لا يَعْلَمُونَ﴾ الروم/٣٠.

هەر چارەسەرێکی تری جیاوازیش، لایەنێك لە سروشتی مرۆڤ زاڵ دەکات لەسەر حسابی لایەنەکەی تر، کە دەتوانێت ببێتە ڕێگری بەردەم هێزە مرۆییەکە یان ببێتە هۆی ململانێی سایکۆلۆژی (مرۆڤ بە سروشتە دوانگیریەکەی) گەورەترین بەڵگەیە بۆ ئیسلام.

# ئیسلام و ژیان

دووانگیری فەلسەفەیەکی باڵا نییە، بەڵکو جۆرێکە لە ژیانی مرۆییانەی باڵا، شیعر لە ڕوانگەی مەبدەئیەوە مەسەلەیەکە پەیوەندی بە دڵەوە هەیە، لەگەڵ ئەوەیشدا شاعیرانی نموونەی (هومیرۆس) و (فیردەوسی) و (دانتی) و (شکسپیر) و (گوتە) لە شیعرەکانیاندا عەقڵ و هەست و سۆزو، زانست و جوانیان پێکەوە کۆکردۆتەوە.

شیعر پەیوەستە بەفەردەوە پەیوەندی بەکۆمەڵگەوە نیە، بەڵام شیعرەکانی (هۆمیرۆس) یارمەتیدەربوون لەدروستبوونی نەتەوەی گریگی‌دا، هەروەکو چۆن قەسیدە تورپەکانی (هویتر) یارمەتی دەربوون لە لەناوبردنی کۆیلایەتی لە ئەمەریکادا.

بیرکاری ئینتیمای بۆ عەقڵ هەیە بەڵام (زانای بیرکاری باش هەردەبێت شاعیر بێت لە هەمانکاتدا [°°]). گەورە زانایان لە سروشتداو فەلەك ناسیدا هەروەها بە مانایەك لە ماناکان سۆفی بوون، نموونەی ئەمەیش لە هەریەکە لە :(کوبرنیکوس) و (نیوتن) و (کلیر) و (ئەنیشتاین) و (ئوبنهیمر)دا دەبینینەوە (تۆڵەکردنەوە) لە هەمان بیرۆکەی دوانیەتی پێکدێت. تۆڵەکردنەوە ئەگەر چی کردەوەیەکی سەرکوتکەرانە بێت، بەڵام دەکرێت فاکتەرێکی ئەخلاقی بەهێز بێت. ئەگەر هاتوو تۆڵەلێکردنەوە دادپەروەرانە بوو ئەوا بەهایەکی فێرکاری دەبێت بۆ کەسانی تاوانبارو کەسانی تریش. لێرەدا ترس سەرەتایەکە بۆ ئەخلاق، هەروەکو ترسی خودا سەرەتایەکە بۆ خۆشەویستی خودا، ئەم دوانیەتە هەروەها خۆی پەرچ دەکاتەوە لە وەرزشی جەستەیی‌دا، وەرزشی جەستەیی، ئەگەر تەنها چالاکییەکی جەستەییش بێت، بەڵام بەهایەکی فێرکاری گەورەیی هەیە. دەڵێن فەیلەسوفی گەورەی گریکی ((ئەفلاتون)) ناوی خۆی لە سینگ فراوانی خۆی وەرگرتووە. ((عەقڵی ساغ لە لەشی ساغدایە)) بەو شێوەیە هێزی جەستەیی دەبێتە پشتگیری یەکێك

---

°° / ((وستراس)) Weir strassn.p.d

له گەورەترین عەقڵەکان له هەموو زەمانێکدا. بۆیه شتێکی نامۆ نیه که جەستەو دەروون... دڵ و عەقڵ.. زانست و ئاین ...سروشت ناسی و فەلسەفه هەموویان لەیەك خاڵدا کۆدەبنەوه که نمایشی لوتکەی ژیان دەکات. بەڵام عەقڵی رووت یان ئیلهامی ئەبستراکت، هەردوکیان له نیشانەکانی داڕمانن. له یەکێتیەکی دوو جەمسەردا بنەمای عەلمانی خزمەت به بنەما رۆحیەکه دەکات... پاك و خاوێنی جەسته یارمەتی پاکژبوونەوەی دەروون دەدات.. نوێژیش باڵاترین جۆرەکانی تێڕوانینی رۆحیه.

با له هەمان ئەم روانگەیەوه زیاتر لەسەر هەندێ دیارده بڕۆین، بپرسین: مەبەست چی‌یه لەوەی به ((فێرکردنی سروشتی)) ناودەبرێت ((رۆسۆ)) وەڵامێکی ئەمەمان دەداتەوەو دەڵێت: ((ئامانج ئەوەیه لەیەك چوارچێوەدا ئەوەی کەوا دادەنرێت کۆکردنەوەی کارێکی گران بێت کۆی، بکەینەوه، مەبەستیشم لەمه: هێزی جەستەیی‌و هێزی عەقڵی.. فیکری فەیلەسوف‌و هێزی پاڵەوانیکی وەرزشکاره[٥٦])).

((مونتان)) لەبارەی فێرکردنەوه دەڵێت: ((بۆ ئەوەی رۆحی منداڵ بەهێز بێت پێویسته بازووەکانی بەهێز بکەین[٥٧])). ((رۆسۆ))یش دووپاتی دەکاتەوه که ((لوك)) Lokc و ((فلوری)) Fleury و ((دی کروزا)) De Crusa هەموویان هاوڕان لەسەر ئەم خاڵه، لەکاتێکدا ((رۆسۆ)) خۆی جار دوای جار دەگەڕێتەوه بۆ ئەم بابەتەو، ئەوەتا دەڵێت: ((جەسته پێویسته بەهیز بێت بۆئەوەی بتوانێت فەرمانگوزاری عەقڵ بکات، خزمەتگوزاری باشیش هەردەبێت بەهێز بێت. سنوور بەزاندنەکانیش رێگه لەبەردەم ئارەزووەکاندا دەکاتەوه، که لەکۆتایدا جەستەکانمان لاوازدەکات، بەپێچەوانەیشەوه، ئازاردانی جەستەیش بەمانگرتن له خواردن هەمان دەرئەنجام دەدات بەدەستەوه، بەڵام لەبەر هۆیەکی دژ. هەرچەنده جەستەیش لاواز بێت دەسەڵات بەهێز تره ((بەسەر عەقڵدا))، چەنده بەهێزیش بێت ئەوەنده زیاتر گوێڕایەڵ دەبێت. هەموو ئارەزوو کردنه هەستیەکان له جەستی لاوازدا ماڵیان کردوه: چەنده تێربوونیان کەمتر بێت ئەوەنده ئێمه بەسەر ئازارومەینەتیدا دەخەن[٥٨])).هێز له - رووی مەبدەئیەوه - هیچ پەیوەندیەکی به ئەخلاقەوه

---

٥٦/ بڕوانه: ((رۆسۆ)) لەکتێبەکەیدا ((إمیل)) Rousseau: Emile

٥٧ / بڕوانه: ((مونتان)) Michel de Montaigne: The Education of Children, trans....(new York; Appleton, 1899).

٥٨ / بڕوانه: ((رۆسۆ)) هەمان سەرچاوەی پێشوو.

نیە، بەلام لە ژیانی واقیعدا بەبێ هێز ناتوانین دادپەروەریەکی ((راستەقینە)) پەیدا بکەین. عەدالەت یەکە یەکە هەردوو چەمکی ((ویژدان)) و هێز پێکەوە کۆدەکاتەوە، ئایا بزاڤە سیاسیەکان لە زۆرێك لە زوڵمی نادادپەروەریانەی چەندین سەدەی کەنیسەو ئایین خۆیان رزگار نەکردوە؟ بیرۆکەکانی یەکسانی و ئازادی و برایەتی لەئاینەوە سەرچاوەیان گرتووە، بەلام لەواقیعدا - ئەگەر ئەم بنەمایانە بووبێتن بە واقیع - ئەوا لە رێگەی شۆڕشەوە بەدی هاتوون... مەبەست ئەوەیە لە رێگەی سیاسەت و توندوتیژیەوە، دەستەوسانی ئاین لەجێبەجێ کردنی کرداریدا، بۆ هەندێك نموونەی مەزن کە مژدەی پێداوە، بوو بەهۆی لاوازکردنی (مصداقیەتی) لەبەردەم لاوازو ستەملێکراواندا. بەپێچەوانەیشەوە توندوتیژی و سیاسەت لەو ئاستەدایە بتوانێت ئەو ئامرازە پێویستیانە بدۆزێتەوە بۆ بەدیهێنانی ئەو ئەفکارە مەزنانەی کە ئایین بانگەشەی بۆ کردو مژدەی پێدا، وەگەرنا بەبێ ئەمە ، ئەو ئامانجانە بەدی ناهێنرێن.

با (کاری مرۆیی) بەنموونە وەربگرین، لە یەکەم ڕوانینەوە بۆی دەبینین دوو لایەنی تێدایە: یەکەم، خودی چالاکی‌یەکە مرۆییە نەك پراگمایی. دووهەمیش: ئەو دەرەئەنجامەی کە لەم چالاکیەوە پەیدادەبێت، یان ئەو دەرەئەنجامەی کە بەرژەوەندی پاڵی پێوە دەنێت، ئایین گرنگی بەلایەنی یەکەم دەدات و شارستانیەتیش بەلایەنی دووەم.

ئایین چارەنووسی مرۆڤی لەسەر زەوی دیاریکردووە بەوەی فەرموویەتی: (بە عارەقی نێو چاوانت نانی خۆت دەخۆیت[٥٩]). بەلام زانست و فەلسەفەی ماددی مژدە بە بەهەشتێکی سەرزەمین دەدات کە خاڵی‌بێ لە کارکردن، تێیدا ئامێر وردە وردە لە کارکردندا جێگەی مرۆڤ دەگرێتەوە، وای لێدێت ڕۆژەکانی کارکردن کورتترو کورتتر دەبێتەوە، ئایین داوای کاردەکات لەپێناوی کاردا وەکو ئامرازێك بۆ خۆلادان لە خراپە، وەکو دەگوترێت: (عەقڵی لە کارکەوتە شەیتانە) وە لەبەرئەوەی ئامانجی ئایین تەنها بەرهەمهێنان و دووبارەکردنەوەی بەرهەمهێنان نی‌یە بۆ ژیانی ماددی. بەلام شارستانیەت، بەپێچەوانەی ئەمەوە، گرنگی بە دەرئەنجامی کار یان ووردتر بڵێین بە (بەرهەمهێنان)

---

٥٩ / بروانە: ((سفر التكوين)) (٣. ١٩).

دەدات. ((هنری لیفبڤر)) - نووسەری مارکسی - جەخت کردنەوە لەسەر ئەم خاڵە بەپێویست دەزانێت بەپێی مارکسیەت. کار ((ڕەگەزی کارە نەك ڕەگەزی ئەخلاق[٦٠])).

جەختکردنەوە لەسەر کار لە ئەوروپادا بیرۆکەیەکە بنچینەیەکی ((پرۆتستانتی)) هەیە نەك سۆشیالیستی وەکو لای خەڵك وابڵاوە. ئایین مەبەستیەتی هەموو کەس کار بکات بەچاوپۆشین لەو ئەنجامەی بەدەست دێت. بەڵام شارستانیەت بەپێچەوانەی ئەمەوە تەنها بیر لە دەرئەنجامی کار دەکاتەوە، دەیەوێت ئەوەندەی پێی دەکرێت خۆی لە کار کردن لابدات، ئەمەیش لە ڕێگەی بەکرێ گرتنی هێزی کارەوە: ئیتر ئەو هێزی کارانە کۆیلە بوو بێتین لەسەردەمی رابردوودا یان ئامێرەکان بن لە ئێستادا.

لە ڕێگەی ئەوەی لە پێشەوە خستمانە ڕوو کارمان شیکردەوە بۆ ڕەگەزەکانی، بینیمان کار وەکو چالاکیەکی سوودبەخش دوولایەنی هەیە: لایەنی ئەخلاقی و لایەنە ئابووریەکەی: ئەو بەرەنگار بوونەوەیە کە دژی شەڕو ئارەزووبازیە هەروەکو چۆن بەرەنگار بوونەوەیە هەژاریشە، (کارکردن) یش بەم سیفەتە دوانیەتەی دیاردەیەکی ئیسلامییە. دەکرێت تێبینی ئەو هاوڕێکیە بکەین لەنێوان سوودبەخش‌و ئەخلاقی‌دا لە دیاردەیەکدا کەوا گرنگە بەنیسبەت هەردوو ژیانە سروشتی و کۆمەڵایەتیەکەی مرۆڤەوە، ئەویش دیاردەی نەهێشتن و دیاریکردنی ژنخوازییە لەگەڵ خزمی نزیکدا لە ماوەی مێژووی پەرەسەندنی خێزانی مرۆییدا لەم لایەنەوە، دەبینین کە هەڵوێستی زانست و ئەخلاق تەواو ڕێك‌و هاوڕان پێکەوە.

ژنخوازی لەنێوان خزمی هەرە نزیکدا لە هەموو پارچەیەکی ئەم جیهانەداو لە هەموو سەردەمێکدا حەرامکراوە. ئەمەیش نموونەیەکی زیندووە بۆ ئەوەی دەکرێت ناوی بنێن ئیسلامی (فیتری)، وەکو ئەوەی ژیان خۆی ڕێنمایی کرابێت بۆ ڕێبازە ئیسلامییەکەی[٦١].

ئایا حەرام کردنی ژنخوازی لەنێوان خزمە نزیکەکاندا پاڵنەرێکی ئەخلاقی رووتی هەیە، یان هۆکار گەلێکی بایۆلۆژی لە پشتیەوەیە؟ ڕەنگە بۆ ئەمەیش وەلامێکی سادەمان

---

[٦٠] / بڕوانە: ((هنري ليفبڤر)) .Henri Lefebvre (Paper read at the Geneva Interntional Encounters)

[٦١] / شتێکی سەیرە کەلە سەرەتاییەکان لێپێچینەوەیەکی سادە بەڵام هاوبەرامبەر یان دژی هەر لێلادانێکی بێ ئاگاییانەی ئەم تابۆیە داناوە، لەهەندێك لەخێڵە ئەفریقی‌و ئوسترالیەکاندا سستەمێکی کۆمەڵایەتی هەیە کە هەر خێڵێك بەیەك گروپی ((تەوتمیەوە)) پەیوەستن کە لەکۆمەڵە خێزانێکی پێکەوە پەیوەست پێکدێت‌و خاوەنی هێمایەکی تایبەت بەخۆیەتی لەگیاندار یان دارودرەخت، کاتێکیش لاوێك بڕیار دەدات ژن بهێنێت ئەوا دەتوانێت دەزگیرانەکەی لەکۆمەڵەو گروپێکی تر هەڵبژێرێت کە لە هێما تەوەمیەکەیدا جیاواز بێت لە هێمای گروپەکەی خۆی.

دەست نەکەوێت. بەڵام هۆکارە بایۆلۆژیەکان دورن لە گومانەوە. زانای بایۆلۆژی روسی (تیمر یازۆف) لەم بارەیەوە دەڵێت: ((بەڵگەی زۆر هەن ئەوە دەسەلمێنن کە خزمایەتی زۆر نزیك لەنێوان دایكو باوکدا کاردەکاتە سەر تەندروستی منداڵ. پێویستیش ناکات ئەمڕۆ جارێکی تر راستیەتی ئەمە بسەلمێنن، چونکە زنجیرەیەك لە تاقی کردنەوە سەلماندویەتی کە ئەم یاسا سروشتیە تەنها تایبەت نیـیە بە مرۆڤەوە بەڵکو هەروەها بەسەر ئاژەڵ و رووەکیشدا دەسەپێت، ئەمە یاساییەکە بەسەر تێکڕای جیهانی ئۆرگانیدا جێبەجێ دەبێت))[٦٢].

هەروەها تێبینی ئەوەیش دەکرێت کەوا حەرام کردنی ژنخوازی نێوان خزمی نزیکدا زۆر کۆنە، ئەمەیش حەقیقەتێکە دەبێت بمانگەیەنێتە ئەو دەرەئەنجامەی کە ئەم حەرام کردنە لەسەر کۆمەڵە ئیعتیبارێکی ئەخلاقی بونیادنراوە. ئەو حەقیقەتەیش بەدرێژایی مێژوو هەتا ئەمرۆ کە بەو شێوە دەمێنێتەوە کە ژنخوازی نزیك (لەنێوان ئەوانەدا مەحرەمن بەیەکتری) بەهەڵەیکی ئەخلاقی دانراوە، پاش ئەوەیش حەرام کراوە، هەر چۆنێك بێت، ئەوا ئەمە نموونەیەکی کامڵە لە هاوڕێکی لەنێوان ئەخلاق و زانستدا، و ئێمە ئەم جەوهەرە بە دەروازەی ئیسلام ناودەبەین.

ئەگەر لەهەندێك دیاردەی گرنگ راماین کە هاوڕێی پەرەسەندنی زانستی پزیشکی بووە، ئەوا سروشتی (دوانیەتی) ئەم زانستەمان بۆ دەردەکەوێت.

زانستی پزیشکی - چ لە ڕابردوودوا چ لە ئێستادا - تەنها زانستێکی رووت نەبووە بەڵکو دانایی و ئەخلاق و سستمی رۆحی لە یەك کاتدا کۆکردوەتەوە. بەم تازەییە کۆمەڵێك نەخۆشی دۆزراوەتەوە کە هیچ هۆکارێکی ئۆرگانی دیاریکراوی ئەم نەخۆشیانە نەزانراوە. ئەم شڵەژانە کە نەخۆش بەدەستیەوە دەناڵێنێت گەرێنراوەتەوە بۆ ژیانی دەروونی ئەو کەسە. لێرەوە لقێکی نوێ لە زانستی پزیشکیدا پێگەیشت و تایبەت کرا بەلێکۆڵینەوەی کاریگەری هاوبەرامبەر لەنێوان جەستەو دەرووندا، ئەویش زانستی پزیشکی ((سیکوسوماتی)) یان ((جەستە دەروونی)) یە. ئەم زانستە قورحەو رەبووی سیەکان و قەڵەوی و شەکرەو شەقیقە ((الصداع النصفي)) جۆرەکانی تری سەر ئێشەو هەندێ سەر ئێشەی نیوەی و ئازارەکانی رۆماتیزم، هەموو ئەم جۆرە نەخۆشیانە لە

---

[٦٢] / ((تیمر یازۆف)) Timiriazov

بنچینەدا ئەسڵێکی دەروونیان هەیە. توێژینەوە زانستیەکانیش ئاماژە بەوە دەکەن کە لە ڕاستیدا ئەم نەخۆشیانەو هی تریش دەگەڕێتەوە بۆ فشارو ململانێ دەرونیەکان، وە ئەو گۆڕانکاریە ئۆرگانیە هاوڕێ لەگەڵ ئەم حاڵەتانەدا ڕوو دەدات بەهایەکی ناسەرەکی هەیەو لە هەندێ حاڵەتیشدا بەتەواوەتی بوونی نامێنێت.

لەبەر ئەم هۆیەش ناکرێت چارەسەری دروست لە تەنها چارەسەرێکی (فیزو - کیمیایی) یان لە تەنها نەشتەرگەریەکدا کورت بکەینەوە، بەمانایەکی تر ناکرێت چارەسەر تەنها بەهۆی ئامێر یان نەشتەرگەریەوە ئەنجام بدرێت، ئەمڕۆ زانستی پزیشکی هاوچەرخ کەم توانایی (پزیشکی ئامێری) بۆی دەرکەوتووە. هۆی ئەمەیش ئەوەیە کە لە واقیعدا نەخۆشیەك لە ئارادا نیە. بەڵکو مرۆڤێکی نەخۆش هەیە. زانستی پزیشکیش گرنگی نادات بە دیاردەکان بەڵکو گرنگی بە خەڵك دەدات، یان بە دەربڕینێکی وردتر گرنگی بە کەسەکان دەدات. تەنها هۆیەکەش بۆ (نەخۆشی) وەکو پێویست نابێتە هۆی هەمان ئەنجام (لای هەموو مرۆڤەکان). نەخۆشیەكو هەروەها چارەسەرەکەیشی ناکرێت لای دوو کەسی جیاواز وەکو یەك سەیری بکەین.

لەبەرئەوە هەندێك حەقیقەت هەیە لە چیرۆکە کۆنەکاندا دەربارەی چاکبوونەوە لە ڕێگەی دابو نەریتی کۆنەوە نوێژو پاڕانەوەو ڕۆژووەوە نابێت بە دووریان بزانین، هەتا ئێستایش شوێنەواری ئەم جۆرە ئاڕاستانە بوونی هەیە، لە هەندێك لە نەخۆشخانەکانی پاریسدا مۆسیقا بۆ چارەسەرکردن بەکاردەهێنرێت[٦٣].

چونکە نەخۆشی تەنها حاڵەتێکی جەستەیی یان شڵەژانێکی ((فیزو - کیمیایی)) نی‌یە، بەو شێوەیە زانستی پزیشکی - بە پێچەوانەی کیمیاو فەلەك ناسیەوە - لەنێوان دوو جەمسەردا دەمێنێتەوە، چونکە کیمیاو فەلەك ناسی بابەتەکەیان مادەیە، بەڵام بابەتی زانستی پزیشکی ژیانە، یان بەمانایەکی وردتر ژیانی مرۆییە. زانستی پزیشکی وەکو هەر شتێکی تر ڕاستەوخۆ گرنگی بەمرۆڤ دەدات پێویستە ئەم زانستە تەواوکاری لەنێوان زانستو ئاییندا بەدی بهێنێت.

ئەگەر لەم گۆشە نیگایەوە سەیری مەسەلەکان بکەین، بۆ نموونە تێبینی دەکەین هەموو هونەرێك لە پیشەیەك پێك دێت، هیچ کەسێکیش ناتوانێت جیاوازی بکات لەنێوان

٦٣ / ((یهودی مینوهن)) سەرۆکی گروپی چارەسەرە مۆسیقیەکەیە.

هونەرو پیشەدا، هەروەها ئەو ڕەگەزە هاوبەشانەی نێوانیان فەرامۆش بکات. لە یاسای سەندیکای وێنەکێشان و پەیکەرتاشانی پاریسدا کە ـ مێژووەکەی دەگەڕێتەوە بۆ سالّی ١٩٣١ز ـ دەتوانین دلّنیابین لەوە کە هیچ جیاوازییەك لەنێوان ئەوو یاسای هەر سەندیکایەکی پیشەیی تردا نەبووە، تییّدا یەك مەرج دەبینینەوە کە پەیوەستە بە مەشقو ((پیشەیی بوون)) و کردنەوەی شوێنەکانی کارەوە.. هتد، لێرەدا دەکرێت هەمیشە لەم بارەیەوە تێبینی دوو ئاڕاستەی دژبەیەك بکەین :

یەکەم/ ئەوەیە کە هونەر لە پیشە جیابووەتەوەو (هەر دەبوو واشبێت).

دووەم/ ئەم جیابوونەوەیە هەمیشە تەواو کاملّ نەبووە ـ بەلّکو هەریەکە لە هونەر و پیشە بە بەردەوامی پارێزگاریان لە هەندێك سیمای هاوبەش کردوە.

لەم بارەیەوە هیچ کارێکی مرۆیی کارێکی تەواو پیشەیی و (میکانیکی) یان کارێکی تەواو ئەفرێنەرانە نیە. هیچ پیشەیەك نی‌یە بڕێك لە ئەفراندنی تییّدا نەبێت، هیچ هونەرێکیش نی‌یە کەوا بڕێکی پیشە نەبێت.. دەتوانین هەمان ((دوانگیری)) لە ئاستەکانی تریشدا تێبینی بکەین:

هونەرمەندو فرۆشیاری تابلۆ هونەریەکان نووسەرو بلاّوکەرەوە ... بیناسازو سەرمایە گوزار...

مێژووی مۆسیقا پشت بەیەك بەستی فیکرەو تەکنیك دەسەلمێنێت. گەورە دانەرانی مۆسیقی نموونەی ((بتهۆڤن)) و ((باخ)) و ((موزا)) لە تەنیشت کارە داهێنەرەکانیانەوە گرنگیان بەگرفتەکانی تەکنیکی مۆسیقی و ڕێکخستنی ئورکسترا داوە. سیمفۆنیاکانی (بتهۆڤن) ـ کە لوتکەی مۆسیقای ڕۆژئاواین ـ بەبێ ئەو چاکسازیانەی کە پێشتر بەسەر تەکنیکی مۆسیقا داهاتن نەدەکرا بە ئەنجام بگەیشتنایە ـ لەو قۆناغەدا ژمارەی ئامێرە مۆسیقیەکان زۆر زیادیان کرد، ئامێرەکان تاییەت کرانو لەو کۆمەلاّنەدا ڕێکخران کە لە چوارچێوەی گشتی ئۆرکسترادا هەبوون، وای لێهات ژمارەی مۆسیقا ژەنەکان گەیشتنە (١٥٠) کەس. بەو شێوەیە مۆسیقای سیمفۆنی مومکین نەدەبوو بەبێ ئۆرکسترا، وەکو بنچینەیەکی تەکنیکیە دەرەکی‌یەکەی.

ژیانیش هەمیشە دەرەئەنجامی کارلێکی هاوبەرامبەری نێوان دوو فاکتەری سەربەخۆ بوو. لەلایەنی بایۆلۆژیەوە، بریتیە لە یەکبوونێك لەنێوان بنەمای ((فیزو ـ کیمیایی)) و

بنەمایەکی تردا باناوی لیبنێین بنەمای ((ئەنتلیخا))[٦٤]. لەلایەنی مێژوویەوە، بریتیە لە کاریگەری هاوبەش بۆ ئەو بناغە مادیەو ئەو کاریگەریە دروستکەرە بۆ فاکتەری ئاگایی مرۆیی، کە لە کەسێتیە بەهێزو فیکرە مەزن‌و نموونە باڵاکاندا بەرجەستە دەبێت، ڕەوشی مێژوویی لە هەر ساتێك لە ساتەکانی زەمەندا بە شێوەیەکی بنەڕەتی دەرەئەنجامی ئەو کارلێکەیە لەنێوان ئەو دوو فاکتەرە سەربەخۆیەدا ڕوو دەدات.

کاریگەری مرۆیی لە ڕێڕەوی مێژوودا لەسەر هێزی ئیرادەو ئاگایی دەوەستێت، چەندە هێزی ڕۆحی بۆ بەشداری لە ڕووداوەکانی مێژوودا گەورە بێت ئەوەندەیش سەربەخۆییەتی لە یاسا دەرەکییەکاندا بەهێز دەبێت. پێچەوانەی ئەمەیش ڕاستە، لە ڕووی مەبدەئیەوە: مرۆڤ ئازادە ئازادیەکی تەواو، کاریگەییە دەرەکیەکان هیچ دەسەڵاتێکیان بەسەریدا نیە، مرۆڤ دەتوانێت بەهێزی ئیرادەی بەرەنگاری نەخۆشی و مەترسیەکان ببێتەوە، مرۆڤ ئەگەر خۆی لەنێوان کۆمەڵە شێرێکدا بینیەوە ئەوا تیا دەچێت، بەڵام ئەم یاسا ئاشکرایە جێبەجێ نابێت بەسەر ڕاهێنەری شێردا. مێژویش چیرۆکێکی پێکەوە بەستراوە لە چەند کۆمەڵێکی بچوك لە خەڵك کەوا بەیەکلاکەرەوەو ئازایی‌و زیرەکی ناسراون، مۆرکێکیان بەجێ هێشت کە ناسڕێتەوە لە ڕێڕەوی ڕووداوەکانی مێژووداو توانیان ئاڕاستەکەی بگۆڕن.

هێزی ڕەوشە بابەتیەکان زیادەکات بەهەمان ئەو ڕێژەیەی کە تێیدا فاکتەرە فەردیەکە کەم دەکات... چەندێکیش ئەم فاکتەرە خاوو نائەکتیڤ بێت، ئەوەندەش ڕێژە لە مرۆیی بووندا کەم دەکات و پشکی لە (شت بوندا) زیاد دەکات. ئێمە دەسەڵاتمان بەسەر سروشت و مێژوودا هەیە بەو مەرجەی دەسەڵاتمان بەسەر خۆماندا هەبێت، هەر ئەمەش تێڕوانینی ئیسلامە بۆ مرۆڤ.

ئەم تێڕوانینە ئیسلامییە جەوهەریە بۆ ڕووداوە مێژووییەکان دەتوانێت ڕێکردنی مێژوومان بۆ ڕاڤە بکات، هەروەها پشکی خەڵك لە ڕووداوە مێژووییەکاندا دیاری بکات، هەروەها وزەو تواناکانیان بەسەر ڕووداوە مێژووییەکاندا دیاری بکات، هەروەها سنووری

---

[٦٤] / زاراوەی (ئەنتلیخا Entelechy) ئاماژە بۆ هێزێکی گریمانەیی دەکات ـ بەپێی هەندێك مەزهەبی ئۆرگانی ـ شاراوەتەوە لەو مادە زیندوانەدا کەمەڵدەستن بە ڕێکخستیان یان بەئاراستەکردنی کردارە ئۆرگانیەکان لە بونەوەرێکی زیندودا بەڵام ئەمە بەهۆی توێژینەوەی زانستیەوە کەشف نابێت.

ئەم توانایەش، واتە لە توانای جیاکردنەوەیدا لەنێوان ئەوەی مرۆڤ دەتوانێت ئەنجامی بدات، وە ئەوەی (پێویستە لەسەری) ئەنجامی بدات وەکو بابەتێك بۆ ڕووداوە مێژووییەکان. ئەم تێڕوانینە ئەو کاریگەرە دروستکەرمان بۆ نموونە بالاکان لەواقیعی مێژوییدا بۆ ڕاڤە دەکات، هەروەها گۆڕینی ئەم واقیعە لەرێگەی ئیرادە ووزەی مرۆڤەوە.

لەلایەکی تریشەوە، ڕۆڵی ئەو فاکتەرە بابەتیانە زەرورەتی پشت بەستن بە حەقیقەتەکانمان بۆ ڕاڤە دەکات، ئەم تێڕوانینە ئیسلامییە ڕەتی حەتمیەتی مێژوویی دەکاتەوە، هەروەکو چۆن ڕەتی هەر میثالیەتێکی بەتاڵ و بێ ڕیشە لە واقیعدا دەکاتەوە، حەقیقەت و بیرۆکەکان، لەوێشەوە واقیع و مرۆڤ، هەریەکەیان ڕۆڵی خۆی لەم چەمکەدا وەردەگرێت.

## بەشی نۆیەم

# سروشتی ئیسلامیی بۆ یاسا

﴿ یاسا راستەقینەکانی کۆمەڵگە ئەو یاسایانەن، بەتەنیشت هەڕەشەی سزادانەوە، لەهەمانکاتدا ویژدانی هاوڵاتیانیشی بەلاوە مەبەستە ﴾.

# دوولایەنی یاسا

ئەگەر سستمی یاساییمان واپێناسە کرد کە بەرژەوەندی مرۆڤایەتیەو بەڕاستی دانی پێدانراوە، ئەوا ئاییینی ئەبستراکت و سۆشیالیزم هیچ یەکێکیان ناشێن بۆ یاسا چونکە نە ئایین بەرژەوەندییەکان دەناسێت و نە سۆشیالیزمیش مافەکان دەناسێت.

یاسا بەتەنها لەسەر بەرژەوەندی بیناد نانرێت ناکرێت لەسەر ئەوەی کە پێی دەوترێت (بەرژەوەندی هاوبەش) بوونیاد بنرێت، چونکە بەرژەوەندی هاوبەش و مافی فیتری (فەرد) بەگشتی دژبەیەك ناوەستنەوە، ئەگەر مرۆڤ سیفەتی کەسێتی لێداماڵراو تەنها بە ئەندامێکی کۆمەڵگە دانرا، وەکو ئەوەی لە سستمی سۆشیالیستیدا هەیە، ئەوا هەر لە سەرەتاوە مرۆڤ هیچ مافێکی ڕەها یان فیتری نابێت، بەڵکو تەنها کۆمەڵە مافێکی هەیە کە دەوڵەت پێی دەبەخشێت، بێجگە لەمە ئەندامی کۆمەڵگە هیچ مافێکی تری نابێت.

ماف ئەگەر ڕەسەن بێت شیاوی یاری پێکردن نیە یان نەبەستراوەتەوە بە ئیرادەی پادشا یان پەرلەمان یان چینێکی کۆمەڵایەتیەوە - واتە گەر ماف بەخششێکی سروشتی بێت یان بەخششێك بێت لای خوداوە، وە لەگەڵ بەدیهێنانی مرۆڤدا جێگیر بوو بێت. مافەکای سیمایەکن لە ڕێزو کەرامەتی مرۆڤ، هەر لەبەر ئەمەیشە زەمەن‌و بارودۆخەکان و مێژوو تێدەپەڕێت و بەرز دەبێتەوە بۆ کردەی بەدیهێنان، لێرەوە ئەو پەیوەندیە لەنێوان مافە سروشتیەکان و ئایندا بەدەردەکەوێت، هەروەها ئەو جیاوازیەش کە لەنێوان مافەکان و مەزهەبە مادیەکاندا هەیە.

مارکس لەساڵی ١٨٤٤دا لەبارەی کێشەی یەهودیەوە دەڵێت: ((ئەوەی پێی دەوترێت مافی مرۆڤ، بەجیا ڕاگرتنی لە مافەکانی هاوولاتی بوون، شتێك نیە جگە لە مافەکانی ئەندامێك لە چینی ناوەڕاستدا.. مەبەستم مافەکانی پیاوێکی خۆپەرستە کە جیا بوویێتەوە لە کەسانی ترو لە کۆمەڵگە)).

بیرمەندێکی تریش کە (جیرمی بنتام)ە لە هەمان قوتابخانەی مادییەتەوە دێت و بە لاقرتێ کردنەوە لە بارەی مافەکانی مرۆڤەوە دەنوسێت و دەڵێت: ((مافەکانی مرۆڤ هەرایە واتە قسەی پڕوپووچە، بەهەمان شێوە مافە سروشتیەکانی مرۆڤیش پڕوپووچ تر)) -

((بنتام)) جارێك سەبارەت بە ڕاگەیاندنی فەرەنسی بۆ مافەکانی مرۆڤ بەوە ناوی بردبوو کە ((کارێکی میتافیزیکیە))، هەڵبەتە بەمانایەك لە ماناکانیش وایە، گەڕان بە دوای ئەسڵی سێ گۆشەی فەرەنسیدا : ئازادی و یەکسانی و برایەتی، دەمانباتەوە بۆ ڕاگەیاندنی ئەمریکی بۆ سەربەخۆیی ساڵی ١٧٧٦، ((جیلنیك)) ڕاگەیاندنی مافەکانی مرۆڤی دانا بە ئەنجامی بزووتنەوەیەکی چاکسازی ئایینی نەك شۆڕشی فەرەنسی[١].

((ارنست بلوك)) هەوڵیدا گونجان لەنێوان مارکسیەت و مافە سروشتیەکانی مرۆڤدا بکات، بەڵام لە کۆتاییدا ناچاربوو کە بڵێت: ((ناکرێت ئەوە قبوڵ بکرێت کە مرۆڤ بە زایەند ئازادو یەکسانە، لەبەرئەوە هیچ مافێکی فیتری نیە، بەڵکو مافەکانی بەدەست دێت یان پێویستە بەدەست بێن لەرێگەی ململانێ کانەوە[٢]. بەپێی ئەم تیۆرەش.. مێژوو ململانیەك نیە لەنێوان مافە دژبەیەکەکاندا، بەڵکو ململانێیەکە لەنێوان بەرژەوەندیە دژ بەیەکەکاندا، ئەمەیش مانای ((ململانێی چینایەتیە)).

ئەو چینەی کە لەم ململانێیەدا سەرکەوتوو دەردەچێت بەرژەوەندیەکەی - یان ئیرادەکەی - وەکو یاسایەك ڕادەگیرێت - لەبەر ئەم مارکسیەکان دەڵێن: ((یاسا ئیرادەی چینی فەرمانڕەوایەو گۆڕاوە بۆ چەند لێپێچینەوەیەکی یاسایی)). بەهۆی ئەم کێشەیەشەوە نەفی ڕاست و هەڵە دەکاتەوە.. نە دادپەروەری و نە زوڵم لە ئارادا نییە، بەڵکو مەسەلەکە تەنها بەرژەوەندیە سەرکەوتنی خۆی ڕادەگەیەنێت لەم ململانێیەدا[٣].

کەواتە ئەگەر حاڵ بەم شێوەیە بێت، ئەوا تەنها کەسی بەهێز هەموو مافەکان قۆرخ دەکات، ئەمەیش بە تەواوەتی دژ بە یاسا دەوەستێتەوە چونکە یاسا بە سروشتی خۆی مافی لاوازانە، چونکە بەهێز پێویستی بە یاسا نییە یاسا هەمیشە ئامرازی لاواز بووە لە ڕووبەڕووبوونەوەی بەهێزدا، هەروەکو چۆن ئازادی ڕاوبۆچوون و بیروباوەڕ لە بنچینەیدا مافێکە بۆ ئەوەی ڕاوبۆچونێك یان بیروباوەڕێکت هەبێت جیاواز بێ لە هی کەسانی تر.

---

[١] / بروانە: ((جیلنیك)). Tellinek idie Erklarang der Mensch enrechte, 1904.

[٢] / بروانە: ((ئەرنست بلوك)) Ernest Block; Natural Law and Human Dignity (Beograd;n,p,,1977).

[٣] / یەکێك لەپێناسەکانی یاسا دەڵێت: یاسا کۆمەڵێك بنەمایە کە گوزارشت لە ئیرادەی چینی فەرمانڕەوایی دەکات:–ئەم یاسایانەیش بەهۆی هێزی دەوڵەتەوە جێ بەجێ دەکرێن بەمەبەستی بەهێزکردن و پەرە پێدانی پەیوەندیەکان و رەوشە کۆمەڵاییەتیەکان هەتا بگونجێت لەگەڵ ئیرادەو بەرژەوەندی چینی فەرمانڕەوادا بروانە:
Vishinsky: The Main Tasks Of the Science Of Soviet Socialistic Law.1938.

بەڵام یاسا کە((مافی)) چەپڵەلێدان و شکۆدارکردنی چینی فەرمانڕەوا دەبەخشێتە هاووڵاتی ئەوە یاسا نییە، بەڵکو گاڵتەجارییە، مەحەکی تاقیکردنەوەی شەرعیەتی هەر سستمێکی کۆمەڵایەتی ئەو ڕێگەیەیە کە پێی مامەڵە لەگەڵ نەیارەکانی و کەمینەکاندا دەکات.

دەسەڵاتی بەهێز حەقیقەتێکی واقیعە، بەڵام یاسا بەو شێوەیە نییە. یاسا لەوێوە دەست پێدەکات کە سنووری ئەو دەسەڵاتەی کۆتای دێت لەوێوە کە تەبەنی هەڵوێستی لاواز دەکات لە بری بەرژەوەندی بەهێز.

لەبەر ئەم هۆیەش گەلان لەپێناوی دەستووردا کۆشش دەکەن و بە هەموو پاشایەکیش هەوڵ دەدات لێی دەرباز بێت.

(ئیرنست بلوك) راستی وت: هەموو دیکتاتۆریەك هەڵپەساردنی یاسایە)) ئەمەیش بەسەر دیکتاتۆریەتی ((پرۆلیتار)دا جێبەجێ دەبێت.

هەروەکو ((لینین)) دەڵێت : ((حکومێکە پاپەند نییە بە یاساوە.. لەسەر توندوتیژی وەستاوە))؟ ئایا ئەزموون نەیسەلماندووە کە دکتاتۆریەتی ((پرۆلیتاریا)) بوو کە پاشان گۆڕا بۆ دیکتاتۆریەتی سکرتاریەتی حیزبی شیوعی. جەختکردنەوە لەسەر ئەوەی یاسا ئیرادەی چینی حوکمڕانە بەتاڵکردنەوەی جەوهەری یاسایە، پێناسە کردنی ((لینین)) یش: کە (یاسا پیادەکردنێکی سیاسیە)) یان ((ویژدانی یاسا بەشێکە لە ویژدانی سیاسی[٤])). هەمان واتای هەیە گومانیشی تێدا نیە کە نکوڵی کردنی یاسا یەکسانە بەنکوڵی کردنی ئایین و هەڵوێستێکی هاوبەرامبەر، هەردووکیشیان دەرەنجامێکی ڕاستەوخۆی فەلسەفەی ماتریالیزمن، چۆن دەرەخسێت دەسەڵاتی بەهێز لە حاڵەتی نائامادەگی بنەماکانی ئاییندا سنووردار بکرێت؟

یان چۆن دەکرێت میللەتێك کەوا کەمینەیەك لەناویدا هەبێت و بتوانێت بەئاسانی لەناوی ببات و لەهەموو سەروەت و سامانێکی ڕوتی بکاتەوە بەڵام ئەم کارە نەکات؟ لە پاکسازی کردنی دانیشتوانە ئەسڵیەکانی ئەمریکادا سپی پێستەکان سەرپێچی ج

---

[٤] / بڕوانە: ((ڤیشنکی)) ((کۆمەڵگە لەسەر یاسا ناوەستێت، ئەمە وەهمی پیاوانی یاسایە، بەڵکو یاسا لەسەر کۆمەڵگە دەوەستێت، بەو مانایەیی کە گوزارشت کردنە لەو بەرژەوەندی و پێداویستیانەی کە لە ئامرازە مادییەکانی بەرهەم هێنانەوە سەرچاوە دەگرێت.
Vishinsky: The Law of The Soviet, State, trans…(New York: Macmillan) Co, 1948). See also Karl Marxs Position on the subject (Introduction, ibid,,p,37;

بنەمایەکیان کرد؟ ئەگەر یاسا لەڕاستیدا ئیرادەی چینی فەرمانڕەوا بێت وەکو مارکسیەکان دەڵێن ـ ئەوا چینی سپی پێست مافی ئەوەیان هەبوو کە کردیان لە ئەمەریکادا، چونکە ئەوان بەهێزو پێشکەوتووتر بوون، بەکورتی ((چینی فەرمانڕەوا)) ی هەژموون داربوون.

یان ئەو بنەمایانە چی بوون سەرمایەدارەکان سەرپێچیان لێکرد لەو ماوەیەدا کە مارکسیەکان بە ماوەی ئاخنینی سەرمایە ناوی دەبەن؟ ئەگەر یاسا ئیرادەی چینی فەرمانڕەوا بێت ـ وەکو مارکسیەکان دەڵێن ـ ئەوا سەرمایەدارەکان هیچ کارێکی خراپیان نەکردووە بەڵکو هەستاون بەجێبەجێ کردنی یاسا، بەڵکو ئەو کرێکارانەی بەرەنگاریان کرد تاوانبارن.. کرێکارەکان بوون یاسایان بەزاند چونکە ئەوان دژ بە ئیرادەی چینی فەرمانڕەوا کاریان دەکرد بەمانایەکی تر بەپێی بنەمایەك کاردەکەن کە ئەم ئیرادەیە دەبەستێتەوە، ئەمەیش بنەمایەکی دژە[°]. شیکاری ئێمە بۆ سروشتی بنەمای ئیرادەی چینی فەرمانڕەوا بەوەی کە یاسایە، ڕووبەڕوو دەمانخاتە بەردەم هەمان ئەو کێشەیەوە کە لەکاتی گەڕان لە جەوهەری ژیان و هونەرو ئازادیدا ڕووبەڕوومان بویەوە.

یاسا ڕاستەقینەکانی کۆمەڵگە ئەو یاسایانەن ـ کە بە تەنیشت هەڕەشەی سزادانەوە، ـ هەروەها ویژدانی هاوڵاتیانیش مولزەم دەکات، هەموو سستمێکی یاسایش بەم شێوەیە، یان بەلانی کەمەوە وای دەردەخات کەوایە. دیکتاتۆریەتی پرۆلیتاریا لە مومارەسەی کرداریدا بەلای دیموکراسیدا دای دەشکێنێتەوە. واتە ئەو یاسایەی کەدیاری دەکرێت بەوەی کە ((ئیرادەی چینی فەرمانڕەوا))یە لەوەدا دەوەستێت کە ببێتە ((ئیرادە)) بۆ ئەوەی ببێتە ((دادپەروەری)) یان بەمانایەکی تر سروشتی خۆی ڕاست دەکاتەوە بۆ ئەوەی ببێتە یاسا. ئەم دوانگیریە دەرباز بوون نیە لیێ. لە کۆمەڵگە سۆشیالیستەکاندا ئەمە لاسای کردنەوەی دوانگیری ئەسڵی یاسایە.

ئەگەر ئەم دووانگیریەش تێکشکێنرا ئەوا یاسایش لەناودەچێت و نامێنێت، ئەو یان دەبێت نزم ببێتەوە بۆ بەرژەوەندی دەسەڵاتی سیاسی، یان بەرز ببێتەوە بۆ بیرۆکەیەکی ئەبستراکت یان بانگەشەیەکی ئەخلاقی، لە هەردوو حاڵەتەکەیشدا لەوەدا دەوەستێت کە ببێتە یاسا، ((واتە نابێتە یاسا)). ئەمەیش مانای ئەوە دەگەیەنێت کە یاسا ناتوانێت

---

[°] / سەرەڕای ئەوەی رۆمانەکان وا ناسراو بوون کە خاوەن کۆیلەن لەگەڵ ئەوەیشدا یاساکەیان بنەمای ئازادی مرۆڤی ڕاگەیاند: (هەموو خەڵك لە سەرەتادا بە ئازادی لە دایك بوون)، بەبێ ئەم یاسایە نەدەبوو یاسا بێت بەڵکو ((ئیرادەی چینی فەرمانڕەوا)) دەبوو.

لەسەر تەنها یەکێك لەو دوو بنەمایە بوەستێت: نە مەسیحیەت بە تەنهاو نە مادییەت بە تەنها ناتوانن سستمێکی یاسایی بەرهەم بهێنن. مەسیحیەکان وا دەبینن یاسا هەوڵێکی وەهمیە بۆ رێکخستنی ئەم جیهانە، هەوڵێك کە ئەنجامەکەی شکستە لە کۆتایدا.

حەزرەتی عیسی (دروودی خوای لەسەر بێت) لەپێناو بەرپاکردنەوەی خۆشەویستیدا هاتبوو، نەك ئەو دادپەروەریە کە تەورات بڕیاری دابوو. بەڵام خۆشەویستی ئینتیمای بۆ ئەم جیهانە نی‌یە، بەڵکو فەضیلەتێکی ئاسمانی‌یە[٦]. مەسیح دانی بەپێویست بوونی دادوەراندا نەناوە[٧]. لەکاتێکدا ((هۆگۆ گرثیویس)) ئەو پەیوەندیە پێشینەیەی بڕی کە لەنێوان یاسای سروشتی‌و ئامۆژگاری ئیلاهی ((مەوعیزەی ئیلاهی))دا هەبوو چونکە ئەمەی دووەمیان ((لە پلەیەکی باڵاتری پیرۆزی دایە)).

یاسا لەلایەکەوە بابەتی‌و نگرۆیە لە سیاسەت‌و کۆمەڵگەدا، تەواو بەرەو ئەم دونیایە ئاڕاستە کراوە. لەلایەکی تریشەوە لەهەمان کاتدا لەکۆمەڵە پێوەرێکی ئەخلاقی پێکدێت و تێدەکۆشێت بۆ بەرپاکردنی بنەمای دادپەروەری لەم جیهانەدا، ئەمەیش بنەمایەکی ئەخلاقی‌یە شتێك دەگەیەنێت لە دەرەوەی ئەم جیهانەدا. بەم مانایە یاسا دەبێتە یەکەیەکی دوو جەمسەری کە هاوشانی مرۆڤ و ئیسلامە.

ناکرێت یاسا بەتەنها لەسەر ئاینی ئەبستراکت (مجرد) یان بە تەنها لەسەر مادییەت دابمەزرێت، بەهەمان شێوە ناشتوانرێت بەشێوەیەك بونیاد بنرێت کە دژی ئەوان بێت، بەبێ جەختکردنەوەی مەسیحی لە بەهای کەسێتی مرۆیی و لەسەر نیەتەکانی دڵی مرۆڤ دامەزرانی‌و لەسەر مافە سروشتیەکانی مرۆڤ ـ هاوشێوەی ئەمانە ـ بەبێ ئەمانە یاسا دانامەزرێت: لەلایەکی تریشەوە، بەبێ دانپێدانانی بە بەهاو گرنگی ئەم جیهانەدا، بەبێ دانپێدانانی بە بەرژەوەندیەکان و دەسەڵاتدا، واتە بەبێ ئەوەی کە یەهودیەت جەختی لەسەر کردوەتەوە، یاسا مانای نابێت.

---

٦ / بڕوانە: ((تۆماس ئەکوینی)) St, Thomas Aquinas: Basic Writings..((Summa Theologia…(New York: Randon House, 1945).

٧ / بڕوانە: ئینجیلی لوقا (١٢:١٣-١٥): ((یەکێك لەناو جەماوەرە کۆبووەکەدا وتی: مامۆستا بڵێ بەبراکەم بەشدارم بکات لە میراتدا، حەزرەتی ((مەسیح))یش پێی فەرموو کێ منی کردوە بەقازی و بەشکەر لە نێوانتاندا، هەروەها فەرمووی: ((ئاگاتان لەخۆتان بێت خۆتان دووربخەنەوە لە ئارەزووەکان، چونکە ژیانی مرۆڤ لەفرەیی ئەو شتانەدا نی‌یە کەهەیەتی)).

بەبێ دەروازەی مەسیحیش یاسا مومکین نەدەبوو، بەبێ دەروازەی یەهودیش وای لێنایەت کە پێویست بێت. دەتوانین لەم پێشەکیەوە ئەو دەرەنجامە بەدەست بهێنین کە یاسا بەپێی ئەو سروشتەی کە هەیەتی ((ئیسلامیە)).

یاسا لەلایەنی مێژووییەوە بەدیاردەیەك دادەنرێت کە گوزارشت لە قۆناغێکی پێگەیشتوو لە ژیانی رۆشنبیری دەکات. ئەو لەکاتێکدا دەردەکەوێت کە تێیدا خواستە ئاینیو کۆمەڵایەتییەکانی خەڵك هاوسەنگ بووبن. واتە لەکاتێکدا کە هێشتا هەستو سۆزە ئایینیەکان بەهێزنو توانای کاریگەریان هەیە لە ژیانی خەڵکدا، لەگەڵ ئەمەشدا ئەم هەستو سۆزانە بەڕادەیەکی زۆر سنووردارکراون بەکۆمەڵێك فاکتەری عەقڵانییو ڕێگە خۆشکەر بۆ شارستانێتی داهاتوو، بەتەنیشت ئەو مرۆڤەوە کە بەهاکانی لە ڕێگەی ئاینەوە جەخت لێکراوەو سەلماوە، کۆمەڵگەیش هەروەها وەکو واقیعێکی سەربەخۆ بەدیار دەکەوێت. لەم ساتەدا مرۆڤو کۆمەڵگە دەبنە دوو بەهای یەکسان و هاوسەنگیشیان (هاوسەنگی ئیسلامی) مەرجێکە بۆ دامەزراندنو پەرەپێدانی سستمێکی یاسایی کامڵ.

ئەم هەڵوێستە دەکرێت تێبینی بکرێت لەسەرهەڵدانی سێ سستمی یاسایی بەناوبانگ لە مێژوودا، ئەوانیش: ڕۆمانی و ئیسلامی و ئەوروپیە.

قۆناغی یەکەمی یاسای ڕۆمانی کە بە ((زەمەنی یاسای مەدەنی)) ناودەبرێت ((ماوەی پادشایی و سێ سەدەی یەکەمی کۆمارییە)) بەوە جیا دەکرێتەوە کە لەم ماوەیەدا هاوڕێکی و گونجانێکی تەواو لەنێوان یاساو ئاییندا هەبوو، یاسای مەدەنی لە بنەمای ئاینی پێکدەهات، و پێچەوانەکەشی بەهەمان شێوە. بەڵام پاشتر ئەم دوو بنەمایە لەیەك جیابوونەوە.

پێویست بوو لەسەر شارستانیەتی ڕۆمانی و فیکری سیاسی ڕۆمانی کەوا فەلسەفەی ئەخلاقی ئایینی ((ریواقیەکان*)) لەخۆ بگرن، هەتا بتوانن پەرە بە یاسای ڕۆمانی بدەن.

بەو شێوەیە بنەمای (بەرژەوەندی) Utilatis [8] ڕۆمانی ئیمپراتۆری پەیوەست بوو بوو بە بیرۆکەی میثالی ((یاسای گشتی)) Lex Universalis ی (ریواقی)یەوە، بەبێ ئەم

---

* / ((ریـواقی)) مەزهـەبێکی فەلسـەفیە ((زینـون)) سـاڵی ٧٠٠پ.ز دایمەزرانـد. ئـەم ووتـە بەناوبانگـە لـە ((زینـو)) دەگێڕنەوە : ((پیاوی دانا پێویستە لەسەری رزگار بێت لە هەڵچوونو کاریگەری خۆشیو ناخۆشی و بەبێ ناڕەزایی ملکەچی بێت بۆ حوکمی زەرورەتە زاڵەکان)) (وەرگێر.ع)

پەیوەست بوونەیش شارستانیەتی ڕۆمانی یان فەلسەفەی ریواقی بەتەنها نەیدەتوانی سستمی یاسایی رۆمانی بونیاد بنێن[9].

لە ئیسلامدا جۆرێك لە ((یەکێتی شوسناس)) لەنێوان یاساو ئایندا دەبینینەوە، هەوەرها دەبینین زۆرینەی گەورە پیاوانی فیکری ئاینی لە ئیسلامدا کتێبیان لەبارەی فیقهو ئوصولەوە نووسیوە[10]. بەلای ئەوروپیەکانەوە زەحمەتە بتوانن جیاوازی لەنێوان یاساو ئایندا بکەن لەو کتێبە نوسراوانەدا، هەروەکو چۆن ئیسلامیش داننانێت بەو جیابوونەوەیەدا، بەو مانایەی یاسا بریتیە لە دەرەنجامێکی سروشتی ئیسلام؛ (ئەلفرید کریمر Alfred Krameri) دەڵێت: ((عەرەب تاکە نەتەوەیەکن لە ماوەی سەرەتای چاخەکانی ناوەڕاستدا، لە بواری پەرەپێدانی یاسادا، توانیان دەسکەوتی درەوشاوە بەدەست بهێنن. ئەم دەستکەوتانە لە مەزنییاندا ڕاستەوخۆ لەگەڵ ئەو کارانەدا دەوەستێ کە رۆمانەکان (دروستکەرانی یاسا لەجیهاندا) بەدەستیان هێنابوو)).

پەرەپێدانی یاسا - لە مێژووی ئەورووپیدا - هاوکات بوو لەگەڵ زاڵبوون بەسەر دەسەڵاتی کەنیسەدا، ئەمەیش بەردەوام بوو هەتا دەرکەوتنی بیری سۆشیالیستی و مارکسییەکان لە زانستەکاندا لە ئەوروپادا.

ئەو چەند سەدە کەمە، کە تێیدا ڕەگەزەکانی ڕۆشنبیری و شارستانیەتی ئەوروپی هاوژیان بوون - ماوەی پێگەیشتنی دەستوورو یاسا گەورەکانە لە ئەوروپادا - ئەم دوانگیریە - لە جەوهەریدا دوانگیریەکی ئیسلامیە - ئەمەیش بە ڕوونی لەو بەرهەمە یاساییە گەورانەی ((هۆگۆ گروتیوس))دا ڕەنگ دەداتەوە کە چەقی بیرکردنەوەی یاسایی ئەوروپایە، لەکۆتایی سەردەمی ((چاکسازی)) (reform gation). ئەم بەرهەمی نووسەرە یاساییە کاپۆلیك و پرۆتستانتەکانی خستە سەریەك و دەریخست کە چۆن یاسا

---

[8] / باشترین بەشەکانی یاسای رۆمانی بەهۆی کاریگەری ریواقیەکانەوە فۆرمەلە بووە، بۆ نموونە: (ئەمە یاساکەیە: راست و دروست بژی، ئازاری کەس مەدە، هەرکەسێك مافێکی هەیە مافەکەی بدەرەوە).

[9] / رۆمانەکان لەساڵی ١٥٠ پ.ز بەیاسای سروشتی ((ریواقیەکان)) ئاشنابوون ئەمەیش لەسەردەمی ((بانیتووس)) Pantius دا کەیەکێك بوو لەبەناوبانگترین ریواقیەکان. کارەکانی ((شیشرون)) لەدیارترین دەرئەنجامەکانی ئەم ئاوێتەیە دادەنرێت سەبارەت بەکاریگەری ریواقیەکان لەسەر یاسای ڕۆمانی بڕوانە: Barths Die Stoa. p. 120 FF.

[10] / بۆ نموونە: ئیمام مەعروف (ئەبو یوسف) کتێبێکی لەبارەی دارایی‌وە دانا بەناوی (کتاب الخراج) دانەرێکی گەورەتر لە (الشعبانی) لە بارەی یاسای جەنگەوە نوسیویەتی.

سەربەخۆ و لەهەمانکاتدا پەیوەستە بە ئەخلاق و ئایین. بەهۆی ئەم دوانگیریەشەوە هەندێك نووسەرانی پاش ئەو نموونەی ((ورنر)) Werner و (ئەمرنز Ahrens) هاتن و هەوڵیاندا ئەوە بسەلمێنن کە جیاکردنەوە لەنێوان یاسا و ئەخلاقدا دەستکەوتێکی مەزن بوو کە ((گروتیوس)) ئەنجامی داوە. لەکاتێکدا هەندێکی تر نموونەی ((کرشمان)) Kirchmann هەوڵیان داوە پێچەوانەی ئەمە بسەلمێنن. هەر چۆنێك بێت، ئەوا رایگەیاندنی ((گروتیوس)) بەوەی کە ((خوا)) سەرچاوەی باڵایە بۆ یاسا، ئەوا بڕوای خۆی بەپەیوەندی سروشتی نێوان یاسا و ئاین دووپات کردەوە.

سەربەخۆیی یاسا هەتا لە پەرگیرترین دەوڵەتی مارکسیدا ناتوانرێت لەناو ببرێت، بە چاوپۆشین لەو راوبۆچوونە تیۆریە رووت و ئەبستراکتانەش، لە واقیعی کرداریدا ناکرێت یاسا بەتەواوەتی هاورێك بکرێت لەگەڵ ئیرادەی دەوڵەتدا، بەڵکو هەمیشە لەنێوانیاندا مەسافەیەك دەمێنێتەوە کە بواری پەڕینەوە نادات، سۆشیالیزم و سستمی یاسای سەربەخۆو پێشکەوتوو ئاوێتە نابن[11].

هەموو یاسایەك پێویستی بە مەوداو کۆمەڵە پێومرێك هەیە. بەڵام سۆشیالیزم، ئەوا راستەوخۆو بابەتی و کاری خێرا دەخوازێت.

لە سۆشیالیزمدا، کە وادا بەفکری و مادییەکان (یان بایۆلۆژیەکان) بەسەر ژیانی کۆمەڵایەتیدا جێبەجێی دەکات ـ جێگای یاسای تێدا نابێتەوە، چونکە یاسا دژی زانستی سروشتە کە دان ((بەوەی پێویستە)) نانێت بەڵکو تەنها ((بەوەی دەبێت)) دادەنێت[12].

ناوبانگی خراپی دادگاکان لە دیموکراسیەتە گەلیەکاندا ((شوعیەکاندا)) دەرئەنجامی هەڵوێستی ئایدۆلۆژی ئەوانە بەرامبەر بەو یاسایەی ـ کە سەرەڕای هەموو فشارەکان ـ بە

---

[11] / هەتا ساڵی ١٩٧٨ ز واتە پاش ٣٠ ساڵ لەدامەزراندنی کۆماری چینی میللی هیچ یاسایەکی مەدەنی و یاسای (سزادان) لەو وڵاتەدا نەبوو. ئەم لایەنە هەتا ماوەیەکی درێژ ((بە ناوچەی یاساغ کراو)) دادەنرا، ئەمەیش بە گوتەی یاساناسی چینی بەناوبانگ ((هان بی کونچ))، کە لە کۆنگرەی ساڵی ١٩٧٨رایگەیاند.

[12] / بەڵام ناسراوترین تیۆریستی تیۆریستی یاسایی سۆڤیەتی ((یوجین باشوکانسین)) لەنێوان هەردوو جەنگی جیهانیدا کە لەپرۆسەکانی پاکتاوکردنی ستالیندا سەرنگووم بوو دەڵێت: ((شتێك بەناوی یاسای پرۆلیتاریاوە بوونی نیە، لەوێشەوە یاسای سۆشیالیستی بوونی نییە)). بڕوانە:

Eugene Pashokanis: AllegemeineRechtslebre und Marxismus, 1929,p.33.

هەروەها ئەم دەستەواژەیە بەراورد بکە بە دەستەواژەیەکی هاوشێوە لە بەتاڵکردنەوەی یاسادا لەگۆشە نیگای مەسیحیەوە لەسەر زمانی ((رودلف سوهم)) دەڵێت: ((یاسای کەنیسە دژو ناکۆك دەوەستێتەوە لەگەڵ خودی سروشتی کەنیسەدا))..... Radolf Sohn: The Law do the Church

مانایەك لە ماناكان ماوەتەوە، یاسایەكی سروشتی‌یە نەك ئیرادەی چینی فەرمانڕەوا - دادگاكان، بەو پێیەی كە لایەنی جێبەجێكەرن هەردەبێت بە شێوەیەكی گشتی شتێك لە خراپ یاسادانانی بەركەوێت، وە بە لاقرتێ كردنەوە تێی بڕوانرێت [*] (ئەمەیش هەروەها ڕاستە بەنیسبەت ڕەوشتی پیشەی یاساییەوە)، هەموو حكومەتێكی لەم شێوەیە هەوڵ دەدات لە ڕێزی یاسا بهێنێتە خوارەوە بۆ ئاستی سیاسەت. هەروەها ئاستی دادگاكان بۆ ئاستی سیاسی و سكرتاریەتەكان. بەڵام چونكە حكومەتەكان بەتەواوەتی سەركەوتوو نەبوون لەو هەوڵانەیاندا، ئەوا دادگاكان جۆرێك لە فەرامۆشكردنیان بەسەردا دێت، ئەمەیش بە بەكارهێنانی دادگایی كردنە ڕاستەوخۆكان و لەڕێگەی پۆلیس و دەسەڵاتەكانی جێبەجێ كردن‌و ناوەندەكانی دەستگیر كردنەوە، واتە ئەو كارەی دادگا پێی هەڵدەستێت، دەگوێزرێتەوە بۆ ئەمان و ئەمان پێی هەڵدەستن، بە بەكارهێنانی ئامرازی تری سەروو یاساییەوە.

دەوڵەت‌و حكومەت گوزارشت لە دەسەڵات مادی دەكەن، یاساو دادگاكانیش گوزارشت لە دەسەڵاتی ئەخلاقی دەكەن. داننانیش بە دەسەڵاتی ئەخلاقی یاساو دادگاكاندا دەتوانێت دەسەڵاتی مادی بۆ دەوڵەت هاوسەنگ بكات، تێیدا داننانێكی ناڕاستەوخۆ هەیە بە باڵادەستی بیرۆكە بەسەر شتەكانداو هەروەها بە باڵادەستی عەقڵ بەسەر مادەدا، لەبەرئەوە بنەمای سەربەخۆیی دادگاكان ناگونجێت لەگەڵ سیستمی دەوڵەتێكی مولحیدا[١٣].

ئەو شتە جێگیرەی كە لەم ڕەوشەدا ئاماژەمان پێكرد ناگۆڕێت، بریتیە لە ڕێز نەگرتنی دەوڵەت بۆ یاساكانی خۆی و لادان لەم یاسایانە ((بە بەرهەمهێنانی)) ژمارە یەكی زۆر لە

---

[*] / لێرەدا ئەزموونی دەوڵەتێك كە یەكێك بوو لەو شوێنكەوتانەی ماوەیەكی درێژ لەبازنەی سستمی سۆشیالیستدا دەسوڕایەوەو چۆن ئەو ئاژاوەیەی نایەوە كە بوویە هۆی چوونە ناو ئەنجوومەنی دەوڵەت و هێرش كردنە سەر سەرۆكەكەی و دروشمی ڕووخانی یاسا بەرز كرایەوە، هەروەها چۆن هەوڵەكانی حكومەت بۆ ملكەچ پێكردنی یاسا لەو دەوڵەتەدا ئەو كارەساتەی خولقاند كە بە (قەسابخانەی یاسا) ناسرا (وەرگێڕ.ع)

[١٣] / پێویستە تێبینی ئەوە بكەین كە بنەمای هێشتنەوەی دادوەر لە پیشەكەیدا (بە درێژایی ژیانی) كە مەرجی سەربەخۆیی بوونی (قەزایە)، سەربەخۆییەكی ڕاستەقینە لە دەوڵەت سۆشیالیستەكاندا هەمیشە دەگۆڕێت بە بنەمایەكی دژ ئەویش دووبارە كردنەوەی هەڵبژاردنە (واتە دامەزراندنی دادوەر بۆ ماوەیەكی دیاریكراو) ئەم سستمە وا لە دادوەری دەكات لەژێر رەحمەتی حكومەتدابێت. بەمەیش دادوەر هەمیشە لە نیگەرانیەكی بەردەوامدا دەبێت بۆهێشتنەوەی پەیوەندیەكی باش لەگەڵ ئەوانەدا كە دەتوانن جارێكی تر هەڵیبژێرنەوە بۆ ئەو پیشەیە.

لێپێچینەوەی (هەڵاوێردەکراو[14]) ئەمەیش دەرئەنجامی ((کاری ڕاستەوخۆیە))، واتە هەوڵی گۆڕینی یاسا بەکاری سیاسی. یان سادەتر بڵێین بە لێپێچینەوەی نامەو بروسکە سیاسیەکان، بەڵکو هەتا بە گوتاری سەرکردەکان کە وای لێدێت گرنگتر دەبێت لە دەستوورو لە یاسا. بۆ نموونەش بۆ ئەمە : ((هەڵبژاردەیەك لە گووتارەکانی ماو)) کە لە هەموو دەوڵەتانی لەم شێوەیەدا هێزێکی داپڵۆسێنەر دەبینینەوە کە دەسەڵاتەکان لەسەر حسابی دامەزراوە هەڵبژێراوەکان قۆرخ دەکەن. ئەم جۆرە دەوڵەتانە لە گەورەترین سیماکانی ئەوەیە هەوڵ دەدات وا لە دادگاکان بکات ببنە ئامرازێکی گوێڕایەڵ لە دەستی دەسەڵاتە کارگێڕیەکاندا، بەڵام هەرگیز بە تەواوەتی سەرکەوتوو نابێت. یاسا دەکرێت ئاستەنگی بۆ دروست بکرێت یان هەتا ڕادەیەك بچەپێنرێت، بەڵام یاسا، وەکو مرۆڤ، ناکرێت لەناو ببرێت یان بچوك بکرێتەوە بۆ تەنها شتێك.

هەموو خەڵك بڕوایان بەدەروون هەیەو بەپێی ئەم بڕوایەش هەڵسوکەوت دەکەن، هەتا ئەگەر بەشێوەیەکی ئاشکراش ئەمە دەرنەبڕن.

ئەگەر کەسێك تاوانێکی کردوو دانی‌نا بە تاوانەکەیدا بەڵام سوور بوو لەسەر ئەوەی بە ئەنقەست ئەو کارەی نەکردووە ئیتر چ شتێك بۆ دادوەری گشتی و پارێزگارو شاهید و شارەزایان‌و دادگا دەمێنێتەوە لەم حاڵەتەدا، پاشان بۆچی هەریەکەیەکیان هەوڵ دەدات قسەیەك بکات گوزارشت لە ڕاوبۆچوونی بکات‌و بچووك‌و گەورەی ئەو مەسەلەیە شیکار بکات. لەکاتێکدا خودی تاوانەکە دانی پێدانراوەو دەرئەنجامەکانی ئاشکرایە لای هەمووان.

هەموو ئەم کۆششانە پەیوەندی بەحەقیقەتی بابەتی‌و دەرەکی کیشەکەوە نیە ئەوەندی ئەوەی پەیوەندی بە (جوّان) نیەتی کێشەکەوە هەیە کە ئەویش ئەو (مەبەستە) یە کە لەپشتی ئەنجامدانی تاوانەکەوە هەیە، مەسەلەکە تەنها لەوەدا نەماوەتەوە کەچی ڕوویداوە لەواقیعدا، بەڵکو ئەوەیە کەروی داوە لەدڵی تاوانبارەدا کاتێك بە تاوانەکە هەستاوە.

هەتا ئێمە ڕووداوەکانی و هۆکارو دەرەنجامەکانی دەپشکنین، ئەمە دەکەین تەنها بۆ ئەوەی حاڵەتە دەروونیەکەیان مەبەستەکە بزانین. لە سەرووی ئەمەیشەوە دەبینین هەر

---

[14] / لە یەکێتی سۆڤیەت لە ماوەی ساڵی ۱۹۳۷ـ۱۹۷٤ز ڕەزامەندی لەسەر ۲۷۰ یاسا دراوە، بەڵام لەهەمانکاتدا دەسەڵاتە جۆراوجۆرەکان ۷۰ هەزار بڕیاری یاساییان دەرکردووە.

یەکێك کە گرنگی بەکێشەکە دەدات، لە خۆوە بڕوای وایە کە مەبەستەکە گرنگترە لە دەرنجامەکەی. ئەمیش ئەوە دەگەیەنێت کە هەموو کەسێك ـ ڕەنگە بێ ئاگایانەش بێت ـ دەروون دەخاتە جێگەیەکی باڵاتر لە حەقیقەتەکان.

ئەو کرێکارەی کە (بەبێ مەبەست) دەبێتە هۆی ڕوودانی کارەساتی ڕووخانی کانێك کە سەدان کەس تێیدا دەبنە قوربانی لێپرسراوێتی کەمترە، سزاکەشی کەمترە لە سزای ئەو کەسەی ـ بە ئەنقەست ـ ئافرەتێکی پیری کوشتووە بۆ ئەوەی پارەکەی بدزێت. ئایا ئەم سزادانە ((نالۆژیکیە)) کەشفی ئەوەمان بۆ ناکات کە دەروونێك هەیە وە ئێمە لە ڕاستیدا حوکمی ئەوە ناکەین کە لەجیهاندا ڕووی داوە، بەڵکو ئەوە بەلای ئێمەوە گرنگە شتێکە کە لە دڵی تاوانبارەکەدا ڕووی داوە!!

بڕیارە یاساییەکانی مرۆڤ هەوڵدەدات بۆ ئەوەی لاسایی حوکی خوا بکاتەوە، وە ئێمە چەندە مەبەستی مرۆڤمان لە حوکمەکاندا لەبەرچاو گرت، ئەوەندە لەحوکمی خوا نزیك بینەوە. ﴿ وَلَيْسَ عَلَيْكُمْ جُنَاحٌ فِيمَا أَخْطَأْتُم بِهِ وَلَكِن مَّا تَعَمَّدَتْ قُلُوبُكُمْ وَكَانَ اللَّهُ غَفُوراً رَّحِيماً ﴾[15] (هەروەها بە قەبوڵکردنی مەبەست ـ ئەگەر بە کەمترین ڕادەیش بێت ـ ئەوا ناڕاستەوخۆ دان بە خوا دەنێین و بەمەیش ڕەتی مەزهەبی ماددی دەکەینەوە، ئەگەر بە لۆژیکێکی پێچەوانەیش دەستمان پێکرد دەبینین کە فەلسەفەی مادییەت گەیشتووەتە ڕادەی بەتاڵکردنەوەی لێپرسراویەتی، واتە بەتاڵکردنەوەی دادپەروەری و زوڵم پێکەوە... وە جەختکردنەوە لەسەر بنەمایەکی دژیەك کە ((پاراستنی کۆمەڵگایە)) دوو هێڵن بۆ پەرەسەندنی یاسایی کە هەریەکەیان پاساودراون پاساوێکی تەواو.

---

[15] / بڕوانە: قورئان سورەتی الأحزاب ئایەتی ١٥.

# سزاو پاراستنی کۆمەڵگە

مەسەلەی سزادان - ئایا پاساودراوە یان نا - جێگەی مشتومڕێکی درێژ بووە. لەم بارەیەوە دوو هەڵوێستی جیاواز هەیە، یەکەمیان پێی وایە کە بەکارهێنانی سزا پاساوی هەیە، لەوێوە کە هەموو مرۆڤێك ئازادە لە هەڵبژاردنی هەر شتێکدا. دووهەمیش دەڵێت نەخێر سزا مانای نیە چونکە تاوانکاری حەتمەیەتێکی پێشینەیی هەیە، مادام شتەکەیش وەهایە، ئەوا سزادان بێهودەیە، بەڵکو ئەوەی گرنگە ((پاراستنی کۆمەڵگەیە)) - واتە ئەو ڕێ و شوێنانەی کۆمەڵگە دەیگرێتە بەر بۆ پاراستنی خۆی لە تاوانکارە (بێگوناهەکان).

کێشەی سزا یان پاراستنی کۆمەڵگا کێشەیەکی کۆنە پێش یاساکانی سزادان دەکەوێت. لەئەنجامی گفتوگۆ کردنیشدا تێڕوانینێکی نوێ سەبارەت بەکۆمەڵێك پرسیار دروست دەبێت کە ئەم کتێبە چارەسەری دەکات. بیرۆکەی سزادان کۆنەو زۆر زوو لە یاسای ((حامورابی))دا واهاتووە، کە بە کۆنترین کتێبی یاسا دەژمێرێت لە مێژوودا. لەلایەکی ترەوە، ((ڤان دیرماد)) توانی بیسەلمێنێت کە بیرۆکەی ((پاراستنی کۆمەڵایەتی)) لای یۆنانیە کۆنەکان سەری هەڵداوە[١٦].

((تاکگەراکان)) بڕوایان وایە کە مرۆڤ لێپرسراوە لە هەڵەکان. بەڵام ((پۆزەتیڤیزمەکان)) پێیان وایە کە لێپرسراویەتی دەکەوێتە ئەستۆی کۆمەڵگەو بارودۆخەکان، بەو مانایەیی کە شتێکی دەرەکی لەدەرەوەی دەسەڵاتی مرۆڤەوەیەو ئەو لێپرسراوە. بەپێی قوتابخانەی یەکەم، مرۆڤ بکەری ڕاستەقینەو..کەسی لێپرسراوە، بەڵام قوتابخانەی دووەم، دەڵێت مرۆڤ شتێکە لەنێوان شتەکاندا..حەقیقەتێکی بایۆلۆژی ملکەچە بۆ یاساکانی سروشت و هیچ چارێکی نیە، ناتوانێت ئازادی خۆی لەدەست ئەوان دەرباز بکات. هەڵوێستی قوتابخانەی یەکەم لەسەر بنچینەی ئەو بڕوایە وەستاوە کە مرۆڤ توانای هەڵبژاردنی خەیرو شەڕی هەیە. بەڵام هەڵوێستی قوتابخانەی دووەم، ئەوا لەسەر ئەو بیرۆکەیە پێك دێت کە مرۆڤ نە

---

[١٦]/ بڕوانە: ((ڤان درماد)) Van Der Made; ((Contribution a Ietude de Ia Defence Sociale)), Revue de Criminologie et Droit Penat, 1949,50,p,944

چاکەو نە خراپە، بەڵکو ئەوە ڕەوش‌و بارودۆخە دەرەکیەکانە کە ڕەفتارەکانی دیاری دەکەن، ((وەزعیەکان)) بڕوایان بە بوونی مرۆڤێکی ئازاد نیە کەبتوانێت ئیرادەیەکی سەربەخۆ هەڵبژێرێت‌و لێپرسراو بێت لە کردەوەکانی.

بەدەست پێکردن لە بنەمای (پاراستنی کۆمەڵگە)وە دەگەینە دەرئەنجامی جیاواز. بۆ نموونە دەبینین کە سزای سەخت پاساوێکی نی‌یە، چونکە تاوان دەرئەنجامی ئەو ڕەوش‌و بارودۆخانەیە کە لە دەرەوەی ئیرادەی مرۆڤەوەن , لەم ڕوانگەیەشەوە ئەوا هەر جۆرە سزادانێك بی‌مانا دەبێت. بەڵام هەتا ئێستاش لەتواناداية ڕەچاوی بەرژەوەندیەکانی کۆمەڵگەو ڕێ لە پێشێلکردنی بگرین وەکو شتێکی براوەو ڕەها. بەڵام مێژووی یاسای سزادان , سەلماندویەتی کە بنەمای تاوانبار کردنی کەسێك تەنها لێیەوە سزای زۆر قورس بەرهەم نەهاتووە , وەکو ئەو حوکمانەی کە ((دادگاکانی پشکنین)) دەریکردن , بەڵکو هەروەها لێیەوە تەفسیرێکی زۆر مرۆیی بۆ یاساش بەرهەم هاتووە. هەتا بە نسبەت سزای لە سێدارەدانەوە، ئەو لایەنگیریە لە هەردوولاوە هەیە[١٧]. لەوێشەوە، ئەم سزایە دەکرێت پاساوی بۆ بهێنرێتەوە یان هێرش بکرێتە سەری لەهەردوو لایەنەکەوە. ((تاکگەراکان)) پێیان وایە سزای لە سێداردان سزایەکە دەخرێتە سەر کەسێکی ئازاد کەتاوانێکی ترسناکی ئەنجام دابێت. بەڵام بەنسبەت بانگەشەکەرانی پاراستنی کۆمەڵگەوە، ئەوا دادەنرێت بەتەنها (لێکردنەوەی) بەشێکی‌فاسدو بێ کەڵك لەکۆمەڵگەو دور فرێدانی، لە حاڵەتی یەکەمدا راڤەیەکی مرۆیی دەبینینەوە، بەڵام لەدووهەمیدا راڤەیەکی میکانیکی‌و نامرۆیی دەبینینەوە. لەم دوو راڤەیەشدا باکگراوندێکی فەلسەفی یان میتافیزیکی دەبینینەوە.

حاڵەتی یەکەم ((پێشەکیە ئاسمانیەکەیە)) (درامای ئادەم‌و حەواو دەرچوونیان لەبەهەشت) ((وەرگێڕ، ك)) مان بەبیردەهێنێتەوە دووهەمیشیان (داروین)مان لە تیۆری پەرەسەندندا بەبیردەهێنێتەوە ـ بەڵام لێرەدا مەسەلەیەکی جەخت لێکراو هەیە، ئەویش ئەوەیە ((مەزهەبی تاکگەراکان)) هەمیشە پێکدێت لەسەر بیرۆکەی تۆڵە لێکردنەوە.

---

[١٧] / بۆ نموونە: ((م، گریف)) M.Grave کە پارێزەرێکی سویسری لایەنگری چالاکی بزافی پاراستنی کۆمەڵگەیە داوای گێڕانەوەی سزای لە سێدارە دان دەکات لە سویسرا.

ئامانجی ئەم لێپێچینەوەیەش وەك (ئانسڵ) Ancel دەڵێت بریتیە لە ((دابڕکردن[18])). - ئەم زاراوەیەش کە لە زانستی سروشتیەوە وەرگیراوە واتە وا لە تاوانبار بکرێت بێ تواناو نائەکتیڤ بێت ئیتر بە نەهێشتنی بێت یان بەزیندانی کردنی بێت دوور لە کۆمەڵگا، یان لە ڕێگەی چارەسەری سروشتی یان دووبارە ڕاهێنانەوەیەوە بێت.

بەشێوەیەی گشتی، ئەوا جیاوازی لەنێوان سزاو پاراستنی کۆمەڵگە لەوێوە سەرچاوە دەکرێت، کە یەکەم هەوڵ لەپێناو دادپەروەری و کەسێتی‌دا دەدات، دووهەمیش لەپێناو بەرژەوەندی کۆمەڵگادا. لەیەکەمدا سزا کەبەقەدەر تاوانەکەیە، بەڵام لە دووهەمدا، ئەوا پشت بەپلەی ترسناکی کۆمەڵایەتی دەبەستێت بۆ تاوانبارەکە - واتە پشت بە تێڕوانینی کۆمەڵگە دەبەستێت بۆ رادەی ترسناکی تاوانبارەکە.

بۆیە لێرەوە ئەگەری کەم تەرخەمیکردن لەمافەکانی مرۆڤی تاکدا دێت لە ژێر سایەی سستمی ((پارستنی کۆمەڵە))دا، ئەگەری رووبەرووبوونەوەی تاك بۆ لێپێچنیەنەوەیەکی کوێرانە بەبێ ئەوەی تاوانێکی کردبێت. هەروەها ئەو رێوشوێنانە کە دەگیرێتەبەر بۆ پاراستنی کۆمەڵگە، دەکرێت شێوەی زۆر قورس‌و گران وەربگرن لە هەردوو حاڵەتی رێگرتن یان خۆپاراستن لە ئەگەری هەر هەڵەیەك کە روویدات. لەم بارەیەشەوە رێ و شوێنی لەم جۆرە لە هەندێك وڵاتدا دژ بەئۆپۆزسیۆنی سیاسی بەکارهێنراوە بۆ نموونە لەپرۆسەی لێپێچینەوەکانی ((پاکتاوکردنی ستالینی))دا بەپێی چەند خەمڵاندنێکی دیاریکراو (١٠) ملیۆن کەس بەتەواوەتی ((لەناویران)) پێویستە ئەوەیش بزانین کە پرۆسەکانی پاکتاوکردن سزا یەك نەبوون بەسەر کۆمەڵە تاوانێکدا کە ئەنجام درابێت بەڵکو ((پاککردنەوەی)) کۆمەڵگە بووە لەکۆمەڵە رەگەزێکی نەویستراو. تێبینی دەکەین کەزاراوەی (دابڕکردن) یان (پاکتاوکردن) لێپێچینەوەیەکی میکانیکیە، هەردووکیان لەسەر بیرۆکەیەکی میکانیکی فۆرمەلە بوون بە پێچەوانەی ئەمەوە (سزادان) بیرۆکەیەکی ئەخلاقیەو (یەکەمجار) لەکتێبە ئاینیە کۆنەکاندا دەرکەوتووە بەو پێیەی کە سزایەکە لەلایەن خواوە، لێرەدا پەیوەندییەکی زاراوەیی و مێژوویی هەیە لەنێوان ئایین‌و تیۆری

[18] / لە رووی تیۆیەوە هیچ هەڵوێزردنێك لەم بنەمایەدا نییە میثالیەکەی نموونەی ((کانت)) و ((هیگڵ)) بە تەواوەتی جەخت لەسەر بیرۆکەی (سزای هاو بەرامبەر (السن بالسن) دەکەنەوە ((هولباخ)) کە مادییە بە شێوەیەکی ڕەها رەتی بنەما تۆڵە لێ کردنەوە دەکات ((یاسای سزادانەکاندا)) بڕوانە: کتاب هولباخ ((نظام الطبیعة))....Holbach: Systeme de la Nature

سزاداندا. جێ سەرسامیش نی‌یە ئەم یاسا ڕێژییە کە لەسەر بنەمای سزادان پێك دێت لە فەلسەفەیەکی میثالییەوە سەرچاوە دەگرێت، لەکاتێکدا یاساکان کە لەسەر بنەمای ((پاراستنی کۆمەڵگا)) وەستاون، لە فەلسەفەیەکی وەزعیەوە سەرچاوە دەگرن.

بیرۆکەی سزادان لەگەڵ پرۆسەی یاسایدا دەڕوات، لەکاتێکدا پاراستنی کۆمەڵگە لەگەڵ بیرۆکەی چارەسەردا ڕێ دەکات. دادگای یاسایش، درامایەکە مامەڵە لەگەڵ ترسناکترین و کاریگەرترین کێشەی مرۆییدا دەکات.. کێشەی ئازادی و لێپرسراویەتی و دادپەروەری.

دادگایی کردن هەمیشە بەستراوەتەوە بەمەراسیمێکی جێگیریی وە کە شانۆیی درامی یان دروشمە ئاینیەکانمان بەبیر دەهێنێتەوە[19].

بەپێچەوانەی ئەمەوە، ئەو ڕێو شوێنانە دەگیرێنەبەر بۆ پاراستنی کۆمەڵگە، مەسەلەیەکە پزیشکێك یان دەروونناسێك یان زانایەکی کۆمەڵناس یان دەسەڵاتێکی کارگێڕی بڕیاری لەسەر دەدات، دوور لە دادوەر. بەچاوپۆشین لەلایەنی کرداریيەکەی، ئەوا ئەو ڕێو شوێنانەی دەگرێنەبەر بۆ پاراستنی کۆمەڵگە دادەنرێت بە بەشێکی جیانەبوونەوە لەویاریکردنە هەمەلایەنە بە کائینە بەشەریەکان لە (تۆبیا)دا، لە (تۆبیا)دا نە دادگاو نەدادگایی کردنەکان بوونیان نی‌یە، چونکە لە تۆبیادا نە ئازادی و نە لێپرسراویەتی و نە ئەخلاق و نە یاسابوونیان نی‌یە.

لەبەر ئەمە سزای مرۆڤی ئازاد دەدەین، بەڵام خۆمان دەپارێزین لە (ئەندامێکی کۆمەڵگە). چونکە ئەندامێکی کۆمەڵگە نە تاوانبارەو نە لێپرسراو، بەڵکو یان سودبەخشە یان زیانبەخشە، لەهیچ یەکێك لەم دووانەیشدا ئەو بچوکترین (اختیار) هەڵبژاردن نی‌یە، بەڵکو یان سودبەخشەو یان زیانبەخش. ئەو تەنها حەقیقەتێکەو حەقیقەتەکانیش هەستو سۆزیان نی‌یە. مرۆڤگەرایش (هیومانیزم) وەکو پێویست بەزەیی پێداهاتنەوە نی‌یە وەکو (ئەبکتیتوس) دەڵێت: ((تۆ بەزەیت بەلاکەوتەو کوێردا دێتەوە، باشە بۆچی هەروەها بەزەییت بە کەسانی خراپەکاردا نایەتەوە؟ ئەوان بە پێچەوانەی ئیرادەی خۆیان خراپەکارن[20])).

---

[19] / ((ارنست بلوك)) رونی کردوەتەوە دراما دوو سەرچاوەی هەیە: کەدادگاو نهێنیە ئاینیەکان. بڕوانە سەرچاوەی ژمارە (٢) لەهەمان ئەم بەشەداو.

[20] /﴿ أَفَحَسِبْتُمْ أَنَّمَا خَلَقْنَاكُمْ عَبَثاً وَأَنَّكُمْ إِلَيْنَا لا تُرْجَعُونَ ﴾ (المؤمنون:١١٥)

ئەمە نموونەیەکە بۆ بەزەیی پێدا هاتنەوە نەك بۆ مرۆڤایەتی (هیۆمانیزم) یان ئایین. هیومانیزم بریتیە لە جەختکرنەوە لەسەر مرۆڤ بەو پێیەی کە کائینێکی ئازادو لێپرسراوە.

هیچ شتێکیش ئەوەندەی ئەوە لە ڕیزی مرۆڤ ناهێنێتە خوارەوە کە بانگەشەی لێنەپرسراویەتی بکات. مرۆڤ لێپرسراوە، بەڵام گیانلەبەران و (شتەکان لێپرسراو) نین. لێرەدا ئەو جیاوازیەی کە لەنێوان فەلسەفەی ((ریواقی))و ئایندا هەیە دەردەکەوێت، ((ریواقیەت)) بەزەیی و لێبوردن دەخاتە پێشەوە، لەکاتێکدا ئایین لێپرسراویەتی دەخاتە پێشەوە[٢١].

((پاراستنی کۆمەڵگە)) تیۆرێکی نامرۆییە لەبنچینەدا تەنانەت ئەگەر ببێتە هۆی لێخۆش بوون لە مرۆڤ، هێشتاش هەر لە بنچینەدا نامرۆییە بەپێچەوانەیشەوە، تیۆری گوناه تیۆرێکی مرۆییە هەتا ئەگەر بڕیاری قورس بەسەر مرۆڤیشدا بدات. سزادانیش مافێکی مرۆییە بۆ تاوانکار، هەر شلگیریەکیش تێیدا پەیوەستە بە شلگیری لە مافی مرۆڤەکانی تردا، ((هیگڵ)) هەمیشە جەختی لەسەر ئەوە دەکردەوە کە سزادانی - لەو ڕووەوە تۆڵە (قصاص)یە، دەسازێت لەگەڵ کەرامەتی مرۆیی تاوانکارداو پێویست ناکات ئامانجێکی تری وەکو بەرگرتن (خۆپاراستن) یان هاوشێوەی ئەمەی هەبێت. لێپرسراویەتی وەکو سیمایەك (لە سیماکانی کەراماتی مرۆڤایەتی، ئەخلاقیاتی خۆی هەیە. ئەمەیش مانایەکە لەماناکانی جیهانەکەی تر. لێپرسراویەتی مرۆڤ لەسەر زەویدا بەرامبەر خەڵکانی تر لەحەقیقەتدا بوونی نیە، تەنها بەو ئیعتبارە نەبێت کەئەو لێپرسراویەتیە ڕەهاو سەرمەردیە، واتە لێپرسراویەتی مرۆڤە لەبەرامبەر خوادا. هەموو یاساو دادگاکانیش لەم جیهانەدا تەنها هەوڵێکی لاوازە بۆ لاسایی کردنەوەی دادگا ئیلاهی و دادپەروەرییە ئیلاهیەکە.

کێشەی لێپرسراویەتی و، لەوێشەوە دادوەری و سزادان، جێگەیەکی لەفەرهەنگی ماتریالیزمدا نی‌یە. ئامانجیش لەسزادان لەبەر ڕێگرتن یان خۆپارێزی یان چاککردن یان بار بۆ کردنەوە نی‌یە، هەتا لەبەر دووبارە ڕاهێنانەوەی تاوانباریش نی‌یە، ئامانجی سزادان بنەمایەکی دونیایی نی‌یە، شتێکی هاوبەش نیە، بەڵکو ئامانجی گێرانەوەی ئەو

---

[٢١] / نموونە لەسەربوونی بنەمای گوناهی ئەخلاقی لەیاسای نوێی سزادانی ئیتاڵدا هەیە، پێچەوانەی ئەم نموونەیەش لە یاسایەکان سزادانی دەوڵەتەکانی ئەسکەندەنافیادا، بەتایبەتی لە(ئەیسلەندە)دا هەیە.

هاوسەنگی‌یە ئەخلاقییە کەوا کەسی تاوانکار لاسەنگی کردووە، سزادان نەهێشتنی خراپەیە وەکو (هیگڵ) دەڵێت، هەتا ئەگەر ئەم پێناسەیەش تاڕادەیەك خاڵی بێت لە ژیان، بەڵام پارێزگاری لە مانا ئەسڵی و گرنگیەتەکەی خۆی دەکات.

سزادانیش وەکو تۆڵە (قصاص)ێك یان وەڵامدانەوەیەکی ئەخلاقی بۆ کارێکی نائەخلاقی دەمێنێتەوە، هەتا ئەگەر بیشووترێت شتێکی بێسوودە لەلایەنی کرداریەوە.

بەپێچەوانەی بیرۆکەی سزادانەوە دەبینین ئەو ڕێ‌و شوێنانەی دەگیرێتە بەر بۆ پاراستن، هەمیشە پاڵنەرەکەی بەرژەوەندیە..واتە پارێزگاری کردن لە بەرژەوەندی گەورەتر بەقوربانیدان بە بەرژەوەندی کەمتر، یان ملکەچ پێکردنی بەرژەوەندی تاك بۆ بەرژەوەندی کۆمەڵگە (بە پێی تێڕوانینی دەسەڵات). سزادان ئامانج لێی شوێنکاری ئەخلاقیە، ئەمە لەکاتێکدا ئەو ڕێ‌و شوێنانەی بۆ پاراستنی کۆمەڵگە دەگیرێتەبەر ئامانج لێی بەرژەوەندی کۆمەڵگەیە.

لە تێڕوانینی ئاینەوە تاوان دەبێتە مایەی توڕەیی خوا، لێرەوە هەردوو بیرۆکەی‌و متۆڵەو سزدان ئەسڵیان لە بیرۆکەی ئایندا هەیە، سەرەڕای هەموو ئەو سنووردارکردنەو ئەو ڕاستکردنانەوە کە پێشتر بەسەر بیرۆکەی سزاداندا هاتووە، ئەوا وەکو بەشێکی جێگیرە لەمەفهومی دادپەروەریدا دەمێنێتەوە. لەهەندێك حاڵەتدا ئاماژە بۆ ((پێشێل کردنی سستمی ئەخلاقی)) دەکرێت لە بری توورەیی خوا، ئەمەیش شتێك نیە جگە لە جیاوازی لە بەکارهێنانی زاراوەیی‌دا چونکە خوا بەدیهێنەرو هەژمواندارە بەسەر سستمی ئەخلاقی‌دا. ئەو گفتوگۆیانەی پێشەوە گوزارشت لە لایەنە تیۆریەکانی بابەتەکە دەکەن، لە تێڕوانینی ئەم کتێبەشەوە، دوو حەقیقەتی گرنگ هەیە: یەکەمیان، ئەوەیە کە ((گوناهی ئەخلاقی)) پێویستە بگەیەنرێتەوە بەتیۆری ((پاراستنی کۆمەڵگەوە)) وەکو نرێکی هاوبەرامبەری ئەو. حەقیقەتی دووهەمیش، ئەوەیە کە لە لایەنی کرداریەوە دەبینین کە هەموو شەریعەتە واقیعیەکان – بەچاو پۆشین لە فەلسەفەکانیان ـ یاسای (ئەبستراکت) دروست ناکەن. لێرەیشەوە هیچ یاسایەکی سزادان نیە کە بەتەواوەتی لەسەر بنەمای گوناه بونیاد نرابێت، وەیان لەسەر بنەمای پاراستنی کۆمەڵگە بەتەنها. بەڵکو لەحەقیقەتدا، دەتوانین تەنها قسە لەسەر ڕێژەی کەمتر یان زیاتری ئەم بنەمایە یان ئەوی تر بکەین[22].

---

[22] / بڕوانە: ئەو تێبینیە پەراوێزیە ژمارە (٢٠)ی پێشوو.

هەتا بزاڤی نوێی پاراستنی کۆمەڵگە، کە لە سەدەی نۆزدەوە لە هەڵویستێکی زۆر توندو پەرگیریەوە دەستی پێکرد، وردەوردە بەرەو هەڵوێستی کەمتر توندڕەوانە ڕۆیشت، ئەمەیش پاش زنجیرەیەك لەپەرە سەندن کە نەدەتوانرا خۆی لیٚ بدات، یەکێك لە پێشەنگانی ئەو بزوتنەوەیە کە (مارك ئەنسل)ە، لەم بارەیەوە دەڵێت: (لەیاسا داناندا –لە ماوەی هەردوو جەنگە جیهانیەکەدا – لەنێوان مەزهەبی کلاسیکی ((گوناهو تۆڵە))و مەزهەبی پاراستنی کۆمەڵگەدا ڕێگەی ناوەند سەرکەوتنی بەدەست هێنا[٢٣].

پاشان ((ئەنسل)) دەپرسێت: هەرچۆنێك بێت، ئایا ئەمە مانای ئەوە دەگەیەنێت کە بیرۆکەی ((پاراستنی کۆمەڵگە)) وەکو پێویست ڕەت کردنەوەی هەموو لێپێچینەوەیەکی جەبرەیە، لەکۆتایشدا لابردنی سزادانە؟ بەپێچەوانەوە، زۆرێك لە بانگەشەکەرە چالاکەکانی بزوتنەوەی پاراستنی کۆمەڵگە پێیان وایە کە یاسای سزادان و بنەمای پاراستنی کۆمەڵگە پێویستە لە تێڕوانینێکی نوێدا یەك بگرن[٢٤])).

((یەکێتی نێودەوڵەتی بۆ یاسای سزادان)) کە لەساڵی ١٨٨٩ دامەزراوەو لە سەرەتاوە پارێزگاریەکی گەورە بوو لە بنەمای ((پاراستنی کۆمەڵگە)) ـ بەڵام پاشتر هاتە سەر ئەوەی باسی لە پێویستی هەماهەنگی نێوان هەردوو مەزهەبەکە دەکرد. لە ساڵی ١٩١٤ز ئەو یەکێتییە ڕایگەیاند کە ئەو ((نوێنەرایەتی هەردوو مەزهەبەکە) دەکات.

لە تیۆری یاسادا ئەو شۆڕشە دێت کەپێی دەوترێت (تیۆری ڕێژەیی سزادان)) لە یاسادانانی کرداریدا هاوکێشەیەکی نویٚ بەهۆیەوە بەدیار دەکەوێت کەئەویش ((سزای خۆپارێزی))یە، کە شێوەیەکە لە شێوەکانی یەکەی دوو جەمسەر لەبواری یاسادا ـ لە واقیعی کرداریدا ـ ئەوا لە کۆتایدا هەر ڕێگای سێهەم سەر دەکەوێت.

وەکو ئاینێکی ئەبستراکت ئیسلام سەرەتا بەبنەمای تۆڵە (قصاص) دەستی پێکرد، بەڵام پاشان وەکو ئاینێکی (ئیسلام کراو) ڕەگەزەکانی پاراستنی کۆمەڵگەی لە خۆ گرت. ئەمەیش بە جەوهەری ئەو پەرەسەندنە دادەنرێت کە لەسەر ((لێپرسراویەتی بەرامبەر ئەم جیهانە)) بونیادنراوە ـ ئەو پەرەسەندنە کەنوێژی تێڕامانی کردە نوێژێکی ئیسلامی، هەروەها خەیری لەخۆبەخشیەوە کردە زەکاتێکی فەرزکراو، کۆمەڵەی ڕۆحی گۆڕی بۆ ئوممەت (کۆمەڵگەیەکی ڕۆحیی‌و سیاسی پێکەوە) یاسادانانی سزای ئیسلامی دانی ناوە بەسستمێکی تایبەت لە

---

[٢٣] / بڕوانە: (مارك ئەنسل). Marc Ancel: La Defence sociale nouvelle (Paris, n.p,1954).

[٢٤]-بڕوانە: (مارك ئەنسل) سەرچاوەی پێشوو.

فێرکردن بۆ کەم سالآنی تاوانکاردا، کە خەریکە ئەمە هاوشێوە بێت لەگەڵ ئەو چەمکە نوێیەدا بۆ دانانی مندالآنی لاسار لە قۆناغێکی ئەزموونیدا بۆ فێرکردنی رەوشت جوانی، بەمەیش ئیسلام ئاراستەکانی تێگەیشتنی کۆمەلآیەتی بۆ ((للجناح و الجانحين)) لە خۆدەگرێت، هەروەها سستمی یاسایی ئیسلامیی تەبایە لەگەڵ بنەمای دادگایی کردن لەسەر بنچینەی بەڵگەی ئازادو، هەروەها هەندێك لەو تێڕوانینانەی دەربڕی دەرکێکی کۆمەڵناسانەن بۆ دواکەوتوویی و کەسی دواکەوتوو. (مارك ئەنسل) دەڵێت: ((یاسای ئیسلامی لەچاخی چواردە هەمدا بنەمای لێپرسراو نەبوونی منداڵی خوار تەمەن حەوت ساڵی قەبوڵ کرد[٢٥])). هەروەها بۆ ئەو مندالآنەی کە تەمەنیان نێوان ٧ ساڵی تا تەمەنی باڵغ بوون دایە، تەنها فەرمانی دەدا بە دووبارە فێرکردنەوەیان.

ئەم لێپێچینەوانەیش شێوەیەك نین لەشێوەکانی سزادان. بەو شێوەیە بۆ ئەوەی مامەڵە بکرێت لەگەڵ ئەو (الجانحين) کە پێگەیشتوون، لە (یاسای ئیسلامی)دا سستمێك دەرکەوت کە لە هەندێك لایەنەوە بەئاراستەیەك دادەنرێت بەرەو (پارستنی کۆمەڵگە). بەدەر لەو پێنج تاوانە گەورەیەی کە قورئان باسی کردوون دادگاکان ئازادییان پێدراوە سەبارەت بەهەندێك تاوان، بەو شێوەیە کە ئەو ڕەوش و بارودۆخە تاوانەکەی تێدا ئەنجام دراوەو هەروەها کەسێتی تاوانبارەکە لەکاتی لێکۆڵینەوە لە تاوانەکەدا لەبەرچاو بگیرێت[٢٦].

---

[٢٥] / ئەم بیرۆکەیە لە ئیسلامدا لە چاخی چواردەهەمی زاینیدا دەرنەکەوتووە وەکو ((ئەنسل)) دەڵێت بەلآم هەر لەسەرەتاوە بیرۆکەیەکی رەسەن بووە لە ئیسلامدا.

[٢٦] / بۆ زیاتر شارەزای لەم بابەتەدا، بڕوانە :( سید مصطفى سید بگ) و (ل، مليوت): Said Mustapha
El- Said Bey: ((Lanotion de reslosabilite Penal)); Travaux de la Semaine international de droit musulman (Paris;n p,,1951)..
L. Milliot: Introduction I Etude de Droti musulman (Paris, n.p.1953).

## بەشی دەیەم

# بیرۆکەکان و واقیع

﴿ ئەو ئاینەی دەیەوێت بیرکردنەوەی ئازاد بە نهێنییە سۆفیەکان بگۆڕێتەوەو، حەقیقەتی زانستیش بە عەقیدەیەکی دۆگماو، ئەکتیڤیەتی کۆمەڵایەتیش بە سرووتەکان، ئەوا هەر دەبێت لەنێوان ئەو و زانستدا پێکدادان ڕوو بدات ﴾.

# چەند تێبینیەکی ڕێخۆشکەر

ئاینی ئەبستراکت و تۆبیا کاتێک دێنە ژیانەوە دەشێوێنو، تەنیا لە پووپەڕی کتێبەکاندا وەك خۆیان بەچەسپاوی دەمێننەوە بەڵام لە مومارەسەو کرداردا، ئەوا ئاین بە (ناچاری) دان بەبەشێك لەلایەنە ئاژەڵیەکە لە سروشتی مرۆییدا دەنێت و تۆبیاش (بە ناچاری) ((دەکرێتە مرۆیی))ە لەوێوە کە چەند سیمایەك لە ڕەوشت دەخوازێت، بەو شێوەیە، دەبینین شێوانی مەسیحیەت و مادیەت نزیکیان دەخاتەوە لە مرۆڤ یان شیاوتر بڵێین لە شێوە ((ئاژەڵە مرۆییەکە))ی مرۆڤ، ئەم بوونەوەرە کە لەلایەنێك پێك دێت فوویەکی خواوەندی پێداکراوەو لایەنێکی دیکەش کە لەجیهانی ئاژەڵەوە سەرچاوەی گرتووە. گرنگ ئەوەیە کە هەر گۆڕانکاریەك کە بەسەر مەسیحیەت و مادیدیەتدا دێت لە هەردوو حاڵەتەکەدا جووڵەیەکە بەرەو مرۆڤ.

هەندێك لەو روداوە بینراوانەی مێژووی مەسیحیەت تەنها چەند شێوەیەکن لەو شێوانەی کەناکرێ ئاینێك ڕووبەڕووی ژیان دەبێتەوە لێی دەرباز ببێت، نموونەش بۆ ئەمە زۆرن، بۆ نموونە: گۆڕینی ئاین بۆ دامەزراوە (واتە بنیاتنانی ڕێکخستنی کڵێساییانەو سستمێکی ئەکلیرۆسی هەرەمی)و، بڕیاردانی هاوسەرگیری (لە جێگای پاکیزەیی) و، دانانان بەکارکردنداو لەلایەن سان ئۆگستینەوە، هەڵوێستی نوێی لە ئاست موڵکایەتیداو، هێزو فێرکردنو مەعریفە (لەجیاتی ئاڕاستە ئینجیلیەکە، کە دەڵێت "أنعَمْــت علَــيهم" ئەو کەسانەن کە لەگەڵ ئەوەی هەژاری بەڵام ئیرادەیان بەهێزە، ((پیرۆزن ئەو هەژارانە ))و، بەکارهێنانی هێزو توندوتیژی دژ بەوانەی بێباوەڕانە لە ئاین ئەدوان وەك لە سەردەمی دادگاکانی پشکنین ((محاكم التفتيش))دا ڕوویدا..هەروەها خەریکە گەڕان بەدوای شێوازێکدا بۆ توانای هەڵکردن لەنێوان مەسیحیەتو مارکسیەتیشدا دێتە ناو ئەم بابەتەوە.

مارکسیزم یان ماتریالیزم چەند دابەزینێکی لادەرانەیان لەم جۆرە خستووەتە ڕوو: لە وێنەی قبوڵکردنی چەند پرنسیپێکی مرۆیی دیاریکراو لە شۆڕشی فەرەنسیەوە (با لەسەر ئاستی ڕواڵەتی (الشكلي) یش بێت)، وەك مافەکانی مرۆڤو مافەکانی هاونیشتمانی بوون و، هەندێك (دەمارگیری) سەرچاوەی گرتوو لە کەلتوری فەرهەنگی کۆن (وەك ئازادی

شەخسی و ئازادی ڕا دەربڕین‌و ڕێزگرتنی پۆستەی شەخسی و نهێنیە شەخسیەکان‌و، جەخت لەپاڵنەرە مەعەنەوییەکان لەجیاتی پاڵنەرە مادییەکان)، ڕۆڵی کاریگەرو ئەکتیڤ بۆ سیاسیەکان (واتە فاکتەری خودی هەستی)و، پەرستنی کەسە سەردارەکان‌و، داڕنینی سیفەتی دادوەری و بابەتی لە یاساکانیان (کە ئەمە پێچەوانەی پێناسەی یاسایە بەو پێیەی ویستی چینی فەرمانڕەوایە)و، قبوڵکردنی هاوسەرگیری و خێزان‌و موڵکداریتی. ((سنووردار))و، داننان بەدەوڵەتدا (پێچەوانەی مەزهەبی کلاسیکی مارکسیەت)و، پەیڕەوکردنی پرەنسیپی تاوان لە یاسای تاوانکاری (القانون الجنائی)داو، پاریزگاری لە بیرۆکەی برایەتی و نیشتمانپەروەری و کۆمەڵە براییەکان‌و، جەنگە نیشتمانیەکان‌و، هی دیکەش جگە لەمانە دەبا بپرسین: ئایا برایەتی‌و نیشتمانپەروەری چەندە وەهمێکی بۆرجوازین؟

ئەی سەبارەت بەبانگەشە بۆ ژیان‌و کارکردن لەپێناو سەربەرزی وڵاتە سۆشیالیستەکان و دەمارگیریە عەقائدیە تیۆریەکان... (ئایا بەڕاستی حەقیقەت گەلێکی نەمر لە سیستمە مادیەکاندا هەن کە شایانی قوربانیدان بن)؟.

لەگەڵ ئەوەدا کە ئاینی ئەبستراکت لە جەوهەرەکەیدا بانگەشەیە بۆ مرۆڤ بۆ ئەوەی تەنیا بۆ دواڕۆژ بژی، کەچی خەڵکی ئایینیان بە هیواو ئاوات‌و خواستە ڕۆژانەکانیانەوە گرێداوە. ئەوان لە واقیعی مەسەلەکەدا (بەبێ هۆشیاری) بەرەو ئیسلام دەچن خۆشەویستی برایانە لە ڕۆژانی یەکەمی مەسیحیەتدا ڕۆڵێکی گرنگی لە بڵاوکردنەوەی ئاینی نوێدا هەبوو، هەمان شتیش لەگەڵ نوێژدا (یان نزا بۆ ڕزگاربوون لە تاوانەکان) ڕوویدا کە بەئاسانی گۆڕا بۆ پاڕانەوە بۆ ڕزگاربوون لە قەرزەکان، تا ئەوەی ((تێر توولیان)) Tertullian دەبوایە کاری بۆ بکرایە، هەتا خەڵکی بەئاگا بهێنێتەوە بۆ گەڕانەوە بۆ مانا بنەڕەتیەکەی نوێژی مەسیحی. زۆرێك لەو بزاڤانەی لە ماوەی چاخەکانی ناوەندا دەرکەوتن بە هەردوو خەسڵەتی ڕۆحیەت بوون و کۆمەڵایەتی بوون پێکەوە دەناسرانەوە، وەسف کردنی سروشتەکەیشی بە ڕێگایەکی تاك لایەنانە کارێکی قورسە، لە ئەمڕۆدا چەند بزوتنەوەیەکی سۆشیالیستی لە ئارادان کە ئاماژە بە کتێبە پیرۆزەکان دەکەن، ئەم ڕاستیانەش جەخت لەسەر دروستی تێڕوانینی گشتگیرانە بۆ ئیسلام دەکەن. ئاینی ڕووت و سیاسەتی ڕووت تەنیا لەسەر ئاستی بیرۆکەکاندا ئامادەن، بەڵام لە ژیانی کرداریدا،

ئەوەی دەیبینین ئاوێتەیەکە لە چەند توخمێك کە هەموویان پێکەوە پێکهاتوون، لە هەندێ حاڵەتیشدا جیاکاری لەنێوانیاندا مەحاڵ دەبێت.

# عیساو مەسیحیەت

لەکاتێکدا موناقەشەی ئەگەری پراکتیزەکردنی ئاینی ئەبستراکت لەم دنیایەدا دەکەین، ئەوا نموونەیەکی یەکلاکەرەوەمان هەیە کەناکرێ تێ پەڕێنرێت ئەویش شکستی مێژوویی مەسیحیەتە.

بۆئەوەی لە مەسیحیەت تێبگەین و دەرك بەپەرەسەندنە مێژووییەکەی بکەین، ئەوا دەبێت دوومەسەلەی جیاواز لەیەکتر جیابکەینەوە: ژیانی عیسا (سەلامی خوای لەسەر بێت) و مێژووی مەسیحیەت، لەسەرەتای یەکەمەوە عیسا لەلایەك و مەسیحیەتیش لە لایەکی دیکە بووە، ئەم جیاوازیەش بەتێپەڕینی کات گۆڕدراوە بۆ جیاوازی نێوان ئیلاهی و مرۆیی، ئەم حەقیقەتەیش دەکرێت تەفسیری ئەو باوەڕبوونەمان بە مەسیح وەك کوڕی خوا بۆ تەفسیر بکات، لەم بانگەشەیەدا کە پەیوەستە بە (مرۆڤی خواوەند)ەوە دانپێدانانێکی بێدەنگانە خۆی حەشارداوە بەوەی کە مەسیحیەتی ڕووت لە ژیانی واقیعیدا نامومکینە. ڕەنگە هەر ئەمیش بووبێت پاڵی بە (نیچە)وە نابێت بڵێت: (دوواهەمین مەسیحی لەسەر خاچ مردووە[1]).

هەندێ لە نووسەرەکان باوەڕیان وایە کە شکستی مەسیحیەت بوو بوویە پاڵنەری ئەدیبی ئیسپانی ((سێر ڤانتس)) Corvants بۆ دانانی ڕۆمانە ناودارەکەی ((دۆن کیشۆت)) ((ئینجیلی رەش)) و، ((دۆن کیشۆت)) ئەو کەسێتیە کاریکاتێریەیە کەعیسا دەنوێنێت، عیسا (سەلامی خوای لەسەر بێت) لۆمەی (بطرس)ی کرد کە یەکەمین حەواریەکانی بوو لەسەر ((جەخت نەکردنە سەر ئەوەی ئیلاهیەو ئاوڕدانەوەی بۆ ئەوەی

---

١ / بڕوانە: ((نیچە)) Fredrich Nietzche; The Antir Christ
نیچە دەڵێت : (( بڕوام پیێ بکەن کە (مەسیح) زۆر زوو مردوە، خۆ ئەگەر هەتا تەمەنی من بژیایە ئەوا بۆ خۆی لە عەقیدەکەی پاشگەز دەبووەوە لە نەجابەتیشەو بوو گەر بیتوانیبایە بۆخۆی پاشگەز ببایەتەوە)) بڕوانە ((جۆرج بیرلمان)), George Burman; Fredrich Nietzche (New York; Macmillan Co.,

مرۆییه))، لەگەڵ ئەوەشدا (بطرس) ئەو (بەردی گۆشە (حجر الزاویة)یە بوو کە کڵێسا لەسەری بنیاتنرابوو) ,، عیسایش (سەلامی خوای لەسەر بێت) بەم تەعبیرەی بوو بە یەکەمین ئەوانەی هەواڵیان بەپەرەسەندنی ئایندەییانەی مەسیحیەت داوە ـ واتە ئەو مەسیحیەتەی کە بەبێ مەسیح بووە بە کڵێسا.

ئەو پرۆسەیەی تێیدا مەسیحیەت لە رێنماییەکانی عیسا ((ئاینی پوخت رووت))ەوە وەرچەرخا بۆ ئایدۆلۆژیاو، کڵێساو رێکخستن ـ لەگشت رووداوەکان درامی تر بوو لە مێژووی جیهاندا، لەدوای نزیکەی سێ سەدە لەو زوڵم و چەوسانەوەیە کە درێژترین ململانێی نێوان ئاین و بتپەرستی دەنوێنێت، دواجار ئیمپراتۆریەتی ڕۆمانی قەبوڵی واقیعی نوێی کرد: لە ساڵی ٣١١ز دا، ((گالیریۆس Galerious) ی ئیمپراتۆر بەیانێکی دەرکرد بۆ لێبوردن لەگەڵ مەسیحیەت، کاتێکی زۆری نەبرد کە ((قوستەنتین))ی ئیمپراتۆر دانی بەئاینی نوێدا نا.

((قوستەنتین)) هەنگاوێکی مێژووییانەی مەترسیداری گرتەبەر بەرەو شێواندنی مەسیحیەت، بەگۆڕینی کۆمەڵێکی ڕۆحی بۆ رێکخراوێکی بەهێزو، بە بەخشینی دەسەڵاتی سیاسیش بەکڵێسا، لەماوەی سەدەی چوارەمی زاینیدا کۆمەڵگەی کڵێسایی جەختی کرد لەسەر مەزهەبی کڵێساو، سروتی ئاینیەکانیش شێوازێکی ڕازاندوەیان وەرگرتو، چەند جۆرێك لە سروت بتپەرستی ڕۆمانی وەرگیرا، هەر لەوکاتەدا بیر لە پیرۆزکردنی شەهیدان و مەریەمی پاکیز، سەری هەڵدا، لە سەرەتای سەدەی پێنجەمی زاینیشدا ئیمپراتۆر ((ثیودۆسیوس))ی دووەم مەسیحیەتی وەك ئاینێکی دەوڵەت ڕاگەیاند، لە ساڵی ٤٣٥ زاینیشدا بەیانێکی دژی بتپەرستەکان دەرکرد، لەپاشاندا سستمی ئەکلیرۆس هاتە کایەوە و نازناوی ((المطران)) هاتە ئاراوە، مەسیحیەت دوو جۆر لە پیاوانی ئاینی لە یەك ئاوێتەدا کۆکردەوە کە لەکۆمەڵگە دێرینەکاندا بە (هیلینی و ڕۆژهەڵاتی) ناسراو بوون : (یەکەمیان کاربەدەستێکی هەڵبژاردراو خزمەتگوزاری پەروەردگارو دووەمیشیان تەرخان بوو بۆ نهێنیەکان و میانجیگەری[٢])، زۆربەی (ئینجیل)یش لەکۆتاییەکانی سەدەی دووەمدا نووسرایەوە، لەکۆبونەوەی ((نیقیە))دا ساڵی ٣٢٥ز بڕیاردرا کە خاچ بکرێتە سیمبولێك بۆ مەسیحیەت. لقێکی بەهێز لەلقەکانی مەعریفەیش لە تەفسیری ئاین و کتێبە ئاینیەکاندا

---

[٢] / بڕوانە: ((لوسیان هنری)) Lucian Henri; The Origin of Religion,,

هاته ئاراوه، (ئوسقوف)یش ئەرکی ڕۆحی خۆی گرتە دەستو بوو بەدەسەڵاتی ڕەها لە کاروبارەکانی ئایندا، وە لەکەنیسەدا پلەوپایەیی بەدەست دەهات و سستمی لە ئاو هەڵکێشان و سوپاسگوزارە پیرۆزەکان هاتە ئاراوە.

(ئەسقفەکان) لەکۆمەڵگەی کەنەسیدا کۆدەبوونەوە، (لەشێوەی کۆبوونەوە پەرلەمانیەکان) بۆ ئەوەی بڕیار لەسەر عەقیدەو ڕێنماییەکان و شتگەلێکی زۆری دیکەی پەیوەست بە ئاینو عەقیدەوە بدەن، بەمەش بنیاتنانی کڵێسا تارادەیەك بەپایان گەیشت.

مەسیحیە مەزنە دڵسۆزەکان - بە چاوپۆشی لەو سەردەمەی تێیدا ژیاون - لەسەر یەك بڕوا کۆکن ئەویش ئەوەیە کە ڕێنماییەکانی عیسا ناکرێت بگۆڕێنە سەر زانست بەواتای تەواوی ووشە[3]. ((ئیمانی شەخسی لە ویژدانەوە هەڵدەقوڵێت، بەڵام لاهوت لە زانستی بیرکاریەوە)) کڵێسا مەسیحیەتی بۆ فێرکردنێکی سستمی گۆڕی وەك بیرکاری و بایۆلۆژیا[4].

لاهوتی کاثولیکی ((بارث Barth)) لە کتێبەکەیدا ((دجماتیکا)) دەڵێت:((لاهوت زانستێکە کڵێسا ناوەڕۆکی ڕێنماییەکانی بۆ خۆی پێ تەفسیر دەکات - بە پشت بەستن بە ئاستە مەعریفیەکەی - زانستێکی ترسناکە..))، وەك ئەوەی بیرۆکەی خۆشەویستی و برایەتی بشێت بۆ شیکردنەوەی زانستیانە ملکەچ بکرێت و بەڵام هەر وەك خۆی بمێنێتەوە. گومڕایی و سەرگەردانی لە ڕۆحی مەسیحیەتدا بەهۆی ئەم ڕێبازەوە دەستی پێکرد. لەو سۆنگەیەوە کە ئەو مشتومڕانەی بێ کۆتایە سەبارەت بە بیروباوەڕە نهێنیەکان کە چەقی ڕێنماییەکانی عیسا (سەلامی خوای لەسەر بێت) لەجەوهەرێکی ئەخلاقیەوە

---

[3] / ((گاردینی)) لە کتێبەکەیدا ((جوهرة المسیحیة)) ڕوونی دەکاتەوە کە ((هیچ سستمێك بۆ بەها ڕەوشتیەکان یان هەڵوێستێکی ئاینی یاخود بەرنامەیەکی ژیان لەئارادا نیيە کەبتوانرێت لەکەسێتی مەسیح جیابکرێتەوەو لە پاشانیشدا بووترێت: ئەمە مەسیحیەتە.

مەسیحیەت: ((بریتیە لە مەسیح، تەنیا کاتێکیش مەسیحیەت عەقیدەیەکە لە دەمی ئەوەوە دەریچێت. کەسێتی مەسیح لە یەکگرتن مێژووەکەیداو لە ئەفسوونە نەمرەکەیدا ئەو تاکە گوتەزاییە کە بڕیاری جەوهەری مەسیحیەتو کارایی و ڕێنماییەکانی دەدات)).

[4] / ((برتراند ڕاسڵ)) پێی وایە زانستی لاهوت ((تیۆلۆژیا)) لە بیرکاریەوە نموونە بۆ خۆی دەخوازێو ئەم بارەش باو بووە لەیۆنانی کۆنو لەچاخەکانی ناوەندو لە ئەوروپادا، تاسەردەمی ((کانت))ی فەیلەسووف. بڕوانە: ((برتراند ڕاسڵ)) لە کتێبەکەیدا ((تاریخ الفلسفة الغربیة)).

گۆڕییە سەر جەدەلێکی ئەسکولائی*، سستمی کڵێسایی لەسەر بنەمای لاهووت دامەزرا بەهەموو ئەو (سلبیەت)و کەلێنە مەعریفەوە کە هەیبووە ئەو مەراسیم‌و زنجیرە هەرەمیەی لە دەسەڵاتی کارگێڕیداو، بە هەموو ئەوەش کە تێیدایە لە دەوڵەمەندی و هەڵە تراژیدیەکان. بە پێچەوانەی ئەمەشەوە، سستمەکانی ڕەهبانیەت کە لە چەند مەیلێکی ئاینی ڕاستەقینەوە هەڵقوڵا بوون لە دەرەوەی سستمی کڵێساوە پەرەیان سەند°.

ئەو ناکۆکیەی ئێمە لەبەردەمیداین ناکۆکیەک نی‌یە لەنێوان ئایدیا و واقیعدا، بەڵکو ناکۆکیەکە بە جەوهەرە ئەسڵیەکەیەوە پەیوەستە، باوکی مەسیحیەت عیسایە، (سەلامی خوای لەسەر بێت) بەڵام باوکی کڵێسا ((پۆڵس) یان ئۆگەستین))ە. عیسا بە ڕەوشتە مەسیحیەکانەوە هات، بەڵام پۆڵس لاهوتی مەسیحی هێنایە ناوەوە. تەنانەت گومانی کڵێسا لەهەڵبژاردە لەنێوان فەلسەفەی ((ئەفلاتۆن)) و فەلسەفەی ((ئەرستۆ))دا کە جیاکەرەوەی فیکری کڵێسا بوو لەماوەی سەدەکانی ناوەڕاستدا بوو دەرئەنجامی هەمان دژایەتی بوو. ڕێنماییە ئایینیەکانی عیسا لە فەلسەفەی ئەفلاتونەوە نزیکترە، بەڵام لاهوتی مەسیحی لە فەلسەفەی ئەرستۆوە نزیکترە.

((فریدریك یودل) Friedrich Jodl لەکتێبەکەیدا ((تاریخ عالم الأخلاق)) دەڵێت: ((سەبارەت بەوەی بەژیانی کرداریەوە پەیوەستە دەبینین ڕێنماییە پێشینەیی‌یە مەسیحیەکان بەو جۆرەی ئینجیل گوزارشتی لێکردوون، لەو ڕێنماییانە جیاواز بووە کە بە دوای ئەواندا هاتوون (هەر لە لاهوتی پۆڵسەوە بیگرە)، هەروەك لە ڕێنماییەکانی دیکەش لەجیهاندا جیاواز بووە ئیتر ئەگەر یەهودیەت بێت یان بتپەرستی))، لەپاشاندا بەردەوام دەبێت‌و دەڵێت: (( مەسیحیەت ـ وەك ئاینێکی ئەخلاقی لەگشت سەردەمێکدا ـ لە ئینجیلدا هەیە، بەڵام مەسیحیەت وەك نهێنی گەلێکی پیرۆزو ئاینی ڕزگار بوون ئەوا لە

---

*/ مەبەست لە ئەسکولائیەت Scholastisism ئەو فەلسەفە مەسیحیەتەیە کە لە سەدەکانی ناوەندو سەرەتارەکانی چاخی ڕێنیسانسدا باڵادەست بووە، کە تەبەنی فەلسەفەی ئەرستۆی سەبارەت بە میتافیزیك‌و (منطق الصوري) یەکەی کردووە. ئەسکولائیەت بەملکەچ پێکردنی فەلسەفە بۆ لاهوت دەناسرێتەوە، لە دیارترین بڕیارەکانیشی ((تۆماس الأکوینی) یەکە هەوڵیدا پەیوەندییەك لە نیوان عەقڵ‌و ئاییندا بنیادبنێت کە لەوەشدا بەفەلسەفەی ((ابن رشد)) کاریگەر بووە کە (ئیستعابی)ی کردووە لێوەی وەرگرت، لەپاشاندا نکوولی لێکرد هەروەك لەتوژینەوەکانی دکتۆر محمود قاسمدا دەردەکەوێت لە کتێبەکەیدا لەمەڕ (ابن رشد) (وەرگێڕ، ع).

° / فرانسیس الأسیس Francis Assisi مرۆڤێکی سادە بوو فیکرەکەی خۆی ئەبەستووەتەوە بەزانستی لاهوتەوە ...کەنیسە بەرەسمی بیرۆکەی بەهەژاری مانەوەی ئەوەی ڕەتکردەوە.

نامەکاندا هەیە)). کڵێسا هەمیشە بۆ پۆڵس و نامە ئینجیلیەکان دەگەڕێتەوە، بەڵام ئیمان و ئەخلاق بۆ عیساو ئینجیل دەگەڕێتەوە. بە دەرکەوتنی پۆڵس مێژووە سادەو شکۆدارەکەی عیسا کۆتایی هات‌و، مێژووی ئاینی دامەزراوەیی دەستی پێکرد، بە پێچەوانەی ئینجیلەوە، پۆڵس دانی بە موڵکایەتی و کارکردن و ئابووری و نازناوەکان و پلەکان و هاوسەرگیری و گوێڕایەڵی و نایەکسانیدا نا، بەڵکو دانی بە کۆیلایەتیدا نا، ئیدی عیساو ئینجیل کەوتنە لایەکەوەو، کڵێساو لاهوتیش کەوتنە لایەکی دیکەوە، بەوەش دابڕانی نێوان فیکرەو واقیع بە ئاکام گەیشت. یەکەمیان بریتی‌یە لە بیرۆکەو دووهەمیان بریتی‌یە لە واقیع.

## مارکس‌و مارکسیزم

مارکسیزم لە رووی تیۆرییەوە لەگەڵ خۆیدا یەک دێتەوە، بەڵام وەکو پێویست لە مومارەسەی کرداریدا لەگەڵ خۆیدا یەکنایەتەوە. مارکسیزم پێی وایە مرۆڤ بەرهەمی ژینگەکەیەتی لەو ڕووەوە کە بوونەوەرێکی بایۆلۆژیە یان کۆمەڵایەتی‌یە، هەلومەرجە کۆمەڵایەتیەکەشی هوشیاریی دیاری دەکات نەک بەپێچەوانەوە، ئەوە بیرۆکەو بیرو باوەڕەکانی مرۆڤن ڕەنگدەرەوەی بارە کۆمەڵایەتیەکەیەتی، ڕووداوە مێژوویەکانیش نە بیرۆکەکان و نە کارە کارگێڕیەکانی خەڵك بەرهەمی ناهێنن، بەڵکو چەند هەل‌و مەرجێکی بابەتی دابڕاو لەخەڵکی دەیخولقێنن‌و، مێژووش ملکەچی حەتمەتێکی مێژوویی بێ ڕەحمە، کۆیلایەتیش بەهۆی چەند هۆکارێکی ئەخلاقیەوە نی‌یە کە نەماوە، بەڵکو لەبەر ئەوەیە کە لەگەڵ پێداویستیە ئابووریەکان‌و بەرژەوەندیەکاندا گونجاو نی‌یە، سستەمی دەرەبەگایەتیش بەهۆی ویستی فلانە کەسەوە لەناو نەچوو، بەڵکو دەرئەنجامی پەرەسەندنی بەرهەمهێنانە، واتە دەرئەنجامی گۆڕانە لە حەقیقەتە ماددی و بابەتیەکان دور لەکاریگەرێتی مرۆڤ. پەرەسەندنی سەرمایەداری تەنیا وەزیفەیەکە بۆ پێداویستیە ئابووریەکان و هێزەکانی بەرهەمهێنان‌و، پەیوەندی بەو تیۆرانەوە نی‌یە کە فەیلەسوفەکان یان ئابووری ناسەکان یان یاسادانەرەکان یا مۆراڵیستەکان دایان ناون.

کارێکی لۆژیکیانەشە وای دابنێین کە هاتنە کایەی سستمێکی سۆشیالیستی پشت بە پارتـە سیاسـیەکان یـان ئـارەزوو بیرۆکـەکان نابەسـتێت، بـەڵکو پشـت بـە پەرەسـەندنی هێزەکانی بەرهـەمهێنان دەبەستێت، شۆڕشـی کۆمەڵایـەتی کاتێـك دێتـە ئاراوە کـە گەشـەی پەرەسـەندنە تەکنیکیـەکان و سـوپای پرۆلیتاریـا پیشەسـازیەکان و پەیوەندییـە ئامادەکـان هەتا ئەو پلەیە بەرز ببێتەوە کە هاوسەنگی لە دەست بدات بەجۆرێك خۆ بە دوور گـرتن لـە گودەتـا کـارێکی نـامومکین بێـت، شـیکردنەوەی مارکسـیزم لەکتێبـە خوێندنەکانـدا بـەم شێوەیە.

لـە ژیـانی واقیعیـدا مەسـەلەیەکی تـر هەیـە، هـەروەك چـۆن بـڕواداران زۆر پشـت بـە دەخالەتی پەروەردگار نابەستن، بێ بڕواکـانیش زۆر بڕوایـان بـە ((پەرەسـەندنی سروشـتی ڕووداوەکان نییە)). ئەوان هـیچ شـتێك ناهێڵنـەوە بـۆ ئـەو شـتانەی بە(فاکتـەرە بابەتیـەکان) ناوزەد دەکرێن، بـەڵکو هـەوڵ دەدەن کاریگـەریان هـەبێت بەسـەر مرۆڤ و ڕووداوەکان. بـەم شێوەیە ئایـدۆلۆژی کۆمۆنیستی ((بەشێوەی سروشتی)) کاتێـك لـە شـوێنێك دەرناکـەوێت ئەوان هەڵدەستن بە ئیستراد کردنی. هەر لەبەر ئەمەشـە کـە دەبیـنین شـیوعیەت لـە وڵاتێکـدا حـوکم دەکـات کـە چـینی پرۆلیتاریـای تێـدا نییـە. دەبیـنین ئەوانـەی کـە پێیـان دەوتـین کەسەکان لە ڕەوتی ڕووداوە مێژووییەکانـدا ڕۆڵیـان نییـە هـەر خۆیـان چەند سەرکردەیەکی دوور لـە هەڵـە دەخـوڵقێنن (خواوەنـدێك سـەری لـە هـی ئـەوانی دیکـە گـەورەترە)، پێویسـتە ستایشـیان بکـەین لەسـەر حیکمەتـەکانیان لـە هەمووشـتێکدا، هـەر لـە سـەرکەوتنەکانی زەمینـەی جەنگەکانـەوە تـا پەرەسـەندنە ((شۆڕشـگێڕاییەکەیان)) لـە زانسـتەکانی زمانـدا، بەپێی خشتەی ڕووداوە مارکسیەکان، دەبێت چاوەڕێی ئەم ڕووداوانە نەبین: گەشەکردنی پیشەسازی دەبێتە مایەی دەرکەوتنی چینی پرۆلیتـارو حیزبـی سیاسـی، بەڵام ئەوەی لـە واقیعـدا دەگوزەرێـت تـەواو بەپێچـەوانەی ئەمەوەیـەو بـەم شـێوەیە. لـە هەنـدێ دەوڵـەتی دواکـەوتوودا چـەند حکومـەتێکی شـیوعیمان بینـی کـە بڕیـاری دامەزرانـدنی پیشەسـازی داوەو پاشـان لـەدوای ئەمـەوە چـینی پیشەسـازی دەرکـەوتووە، واتـە بوونـەوەرەکـە بـە پرۆسـەیەکی هۆشـیارانە خـەلقکراوەو، مێژووش سیاسـەت دروسـتی کـردووەو، ((بونیـادی سەرخان)) یش بناغەکەی دروستکردووە نەك بە پێچەوانەوە.

بەو شێوەیە هیچ لە پرۆژەکەی مارکس نەماوەتەوە هێزی سیاسی (تۆقێنەر)ی حیزبی شیوعی نەبێت، تەنانەت ئەم حیزبەش لە چینی پرۆلیتار پێك نەهاتووە بەڵکو ئاوێتەیەکە لە چەند ڕەگەزێکی کۆمەڵایەتی جیاواز[٦].

پەرەسەندن لای مارکس پلەبەندیە بەڵام حەتمی و سەرکێش کە ناکرێت ڕێی لێگیرێت یان بەسەریدا زاڵ بین، لەگەڵ ئەوەشدا، مارکسیزمەکان سوورن لەسەر فەرز کردنی تەنیا (وەسف)ێك لە سستمی کۆمەڵایەتی و ئابووری بۆ هەموو دەوڵەتەکان، بێئاگا لەو حەقیقەتەی کە پەرەسەندنی کۆمەڵایەتی و ئابووری ئاستەکەی بەتەواوی جیاوازە لە دەوڵەتێکەوە بۆ دەوڵەتێکی دیکە. بەم شێوەیە، دەبینین بەرنامەی حیزبی شیوعی ئەمریکی جیاوازیەکی جەوهەری لەگەڵ بەرنامەی حیزبە شیوعیەکانی کۆستاریکا یان ئیندۆنوسیادا نیە، لەجیهانی ئەمڕۆدا پتر لە ٨٠ حیزبی شیوعی هەیە کە لە بارودۆخێکی جیاوازی ئابووری و کۆمەڵایەتیدا کاردەکەن لە دەوڵەتانێکدا کە پلەی پێشکەوتنیان لەنێوان خێڵەکی بوون لە ئەفریقیاداو پیشکەوتووترین دەوڵەتە سەرمایەدارەکانی ئەوروپادایە، لەگەڵ ئەوەشدا ئەم حیزبانە بەگشتی مژدەی هەمان نموونە گەلی ئابووری و سیاسی و کۆمەڵایەتی دەدەن: خاوەنداریتی بە کۆمەڵی هۆکارەکانی بەرهەمهێنان و، کێڵگە کۆمەڵیەکان، سیستمێکی سیاسی کە لە تەنیا حیزبێکدا کورت بووەتەوە، پاوانکردنی بیرۆکەکان و سیاسەت.. ئەگەر فیکرە مارکسیەکان کە پەیوەستن بە (ژێرخان : القاعدة) و (سەرخان)ە وە ڕاست بێت، ئیتر چۆن بنیاد نانی هەمان ((بونیادی سەرخان)) لەسەر چەند ژێرخانێکی جیاواز ڕاست دەردەچێت؟ هەروەها چۆن پراکتیزە کردنی سۆشیالیزم لەسەر ئەم بنەما کۆمەڵایەتیە ئابووریە جیاوازانە مەیسەر دەبێت ئەگەر گریمانەکانی ماتریالیزمی مێژوویی ڕاستبن؟

---

[٦] / ئەو بەڵگە ئەویستییەی مارکسیزم سەبارەت بەپەیوەندی نێوان ((بناغە: القاعدة)) و ((بونیادی سەرخان)) دەڵێت: ((خەڵکی لەژیانی کۆمەڵایەتی کەشەسەندویاندا دەچنەناو پەیوەندیگەلێکی پێویستەوە سەربەخۆ لەئیرادەیان. واتە: چەند پەیوەندیەکی بەرهەمهێنان کەهاوڕێك دەبن لەگەڵ پلەی پەرەسەندنی هێزەکانی بەرهەمهێنانی ماددیدا. گشتگیرێتی ئەم پەیوەندیانەش ئەو بونیادە ئابووریە کۆمەڵایەتیانە دروست دەکات کەچەندین جۆری جیاوازی لە هۆشیاری کۆمەڵایەتی لەگەڵیدا هاوڕێك دەبن. واتە: پرۆسەی ژیانی کۆمەڵایەتی و سیاسی و ڕۆحی و گشتی بەشێوەیەکی بەرهەمهێنانی ژیانی ماددیەوە، پەیوەستە، کۆمەڵایەتی بوونی خەڵکی هۆشیاریان دیاری ناکات بەڵکو بەپێچەوانەوە: هۆشیاری خەڵکیش بوونی کۆمەڵایەتیان دیاری دەکات. بڕوانە: ((کارل مارکس)):
Karl Marx: Zur Kritik de Politischen Okonomie… (Pre Face).

شێواوی تەفسیرە ماددیەکان بۆ ڕووداوە مێژووییەکان ئاسانە بە شیکردنەوەی هەر ماوەیەك لە ماوە مێژووییەکان بەڵگەی لەسەر بهێنرێتەوە. بەڵام ـ دوورتر لەمە ـ گاڵتە پێکردنێکی مێژووییانە هەیە لەو حەقیقەتەدا کە هەتا دەرکەوتنی خودی بزاڤە شیوعیەکان و لە نیوەی یەکەمی سەدەی بیستدا بە بەڵگەیەك دادەنرێت دژ بەتیۆری ماددی. کودەتا مارکسیەکان ڕوویان نەدا کە دەبوو بەپێی ئەم تیۆرە ڕوویان بدایە، مێژووی کودەتا مارکسیەکان زنجیرەیەك لەحاڵەتە دەگمەنەکانن کە لە تێڕوانینی ماتریالیزمی مێژووییەوە تەفیسریان نی یە، سەرکەوتنی بزاڤە شیوعیەکانیش بەهۆی ڕەخسانی هەلومەرجە بابەتیەکانەوە نەبووە، بەڵکو بەهۆی فەراهەم بوونی چەند ڕەگەزێکی کەسی (شخصي)و نابابەتیەوە بووە: واتە بەهۆی سەرهەڵدانی حیزبێکی شیوعی بەهێزو یان دەستێوەردانی هێزێکی بێگانەوە بووە.

بەم شێوەیە، بۆمان دەردەکەوێت کە مارکسیزم وەك تیۆرێك پێویست بوو لەسەری بیرۆکەی حەتمیەتی مێژوویی قەبوڵ بکات، بەڵام وەك ژیانێکی واقیعی دەبوو دەسبەرداری ئەم بیرۆکەیە ببێت. هەردوو حەقیقەتەکەیش (فیکرو واقیع) ئاماژەی خۆیانیان هەیە سەبارەت بەو بابەتەی چارەسەری دەکەین، لەو سۆنگەیەوە کە هەموو تیۆرێکی ماددی لەسەر حەقیقەتی یەکەم بونیاد نراوە، لەکاتێکدا دیاردەیەکی زیندووە لەسەر حەقیقەتی دووەم وەستاوە لێرەیشەوە هیچ بوارێکی دەرباز بوون نیە.

((ئەنگلز))یش لە گوتارێکیدا بۆ ((کۆنراد سمیس)) Conrad Smith (لە ٨ی مایۆی ١٨٩٠)دا دانی بەوەدا نا ئەگەر تیۆری مارکسیزم لە بواری ئابووریدا پراکتیزە بکرێت بە شێوەیەکی حەرفیانە ((ئەوا هەرایەکی لێوە بەرهەم دێت کە جێگای باوەڕ پێکردن نەبێت)).

((ئەنگلز)) ئەو بانگەشەی (پاوڵ بارث) بەتاڵ دەکاتەوە کە دەڵێت مارکسیزم هەموو کاریگەریەکی هۆشیاری بۆ سەر ئابووری ڕەت دەکاتەوە[٧]. هەروەها ((ئەنگلز)) ئامۆژگاری ((بەکار نەهێنانی زۆر تەسکی تیۆری هەلومەرجە ((بابەتیەکان))ی کرد، هەروەها باسی " کاریگەریی پێچەوانەی ئایدیاکانی بۆ سەر ژێرخان کرد، بەڵام یەکسەر لە هەڵوێستەکەی

---

[٧] / بڕوانە: (( پاوڵ بارث)) Paul Bourth: History of Philosophy From Negel and His Followers to Marx and Hartman.

پاشەکشەی کرد، کاتێك کە ئەم گووتەی خستەسەری ((پەیوەست بوونی تەواوەتی ئەمانە ((ئایـدیاکان)) بـە هەلومـەرجی ئابووریـەوە. هەرچـۆنێك بێـت، بەهـەر حـاڵ لـەکاتی ڕووبەڕووبونـەوە لەگەڵ ڕاستیەکاندی ژیانـدا، ئـەوەی کـە دەمێنێتـەوە بریتیـە لـە کـەوتن و هەڵخلیسکانێکی ئاشکراو دوورکەوتنەوە لە ماتریالیزم. دەبوایە مارکسیزم دانـی بـە زۆرێك لـەم حەقیقەتانـەدا بنابایـە لەسـەر حسـابی لەدەسـتدانی جـێگیر بـوون و گونجانـە ناوخۆییەکەی، بیریارە پۆزەتیڤیستەکان (الوضعیون) رەتی ئەوەیان کـردەوە کەمارکسیەت وەك ((زانستێك) قەبووڵبکـەن، ووتیـان مارکسـیزم لـە زۆرێـك لـە ((ڕاو بۆچـوون)) و گـەلێك ڕەگەزی سیاسی و ئەخلاقی بەڵکو ئەفسانەیش پێکهاتووە پـۆزەتیڤیزم (الوضـعیة) وەکـو دەقـی کتێبێـك مایـەوە، لەکاتێکـدا مارکسـیەت هـەوڵی داگیرکردنـی جیهانیـدا، تـوانیشـی وابکـات، چونکە مارکسیزم هـەرگیز ڕۆژێك لە ڕۆژان ماددیەتی ڕووت نـەبووە ((وەك خـۆی بانگەشەی ئەمەی دەکرد)).

نووسینە یەکەمینەکانی ((کارڵ مارکس)) لەمەڕ نامۆ بوون لە جەوهەردا میثالی بوون، دەیشکرێت لە فەلسەفەی ((هیگل))دا بۆ ڕەگ و ڕیشەی بگەڕێین، ئەم پیاوە کارگەرێتیـەکی گەورەی لەسەر ((مارکس)) هەبووە. تیۆری نـامۆبوونیش بـۆ ماوەیـەکی زۆر لە ژێـر سـایەی بێدەنگیدا مایەوە، ڕەنگە ئەمەیش لەبەر ئەو میثالییەتە بێت کە تێیدایە. ئەو دەسـتنووسە ئابووری و فەلسەفیانەی ((مـارکس)) کە ئەم تیۆرە دەگرنـە خۆیـان بڵاونەکرانـەوە تـەنیا لـە ساڵی ١٩٣٠ز دا نـەبێت (واتـە دوای هەشـتا ساڵ) لە دەرچوونی مانڤێستی مارکسیزم و، دوای شەست ساڵیش لە بڵاوبوونەوەی یەکەم بەشی کتێبی ((سـەرمایە : الـرأس مـال)). لـە کتێبەکەی ((مارکس))دا ((رساله عن فیورباخ)) Feuerbach کە لەگەڵ کتێبـی (الأغتراب : نامۆ بوون)دا داینـاون (لە سـاڵی ١٨٤٤دا)، لەگـەڵ هـەمان ڕۆحـی پەڕاگەنـدەی ماتریـالیزم دا ڕووبـەڕوو دەبینـەوە.. هـەردوو ئـەو کتێبـە زۆر کـارتێکراو بـوون بەچـەند بیرۆکەیـەکی هیومانیستی کە مۆرکی ڕەوتـی گـەنجێتی (مـارکس)یـان پێوەیـە. بـەڵام کـارە دواییـنەکان، تـەنیا کـارێکن بکـرێ بـە مارکسـیزمانەی ڕاسـتەقینە دابنـرێن. لـە سـەرووهەمووشـیانەوە کتێبـی (رأس المـال) و، کتێبـی (نقـد السیاسـه و الأقتصـاد) یـش کـە لەپێشـەکیەکەیدا پوختەیەکی چەمکی ماتریالیزمیانەی مێژوویی لەخۆگرتوە.

لـە هەرشـوێنێك ماركسـيزم لـە ژیـانی كرداریـدا پراكتیـزە بكرێـت پێویسـتە چـەند ڕەگەزێكی نوێ بخرێتە ناوەوە لە پراكتیزەكردنیدا كە نە ماددی و نە ماركسیشن، تەنانـەت لەوانەیە لەسەر خودی ((ماركس)) خۆیشی قوورس بێت كە شتێك لە ڕێنماییەكانی خۆی بەجێبەجێ كراوی لە زۆربەی دەوڵەتە سۆشیالیستەكاندا ببینێتەوە. حەقیقەتێك هەیـە كە خاوەنی دەلالەتی خۆیەتی ئەویش ئەوەیە كە ئەو دەوڵەتە پرۆتستانتیانەی ـ لە سەردەمی ڕیفۆرمی ئایینیدا خۆیان لـە ڕەهبانیـەتی كـاثولیكی و تەسـەوف ڕزگـار كرد بەگشـتی دژی ماركسـیەت ماونەتـەوە، بـەڵام گەلـە (كـاثـولیكیـە) لاتینیـە نوێكـان (ئیتالیـاو فەرەنسـا و ئیسپانیا) هەروەها دەوڵەتە دواكەوتووەكان، فیكرە ماركسیەكان زۆر سـەركەوتوو بـوون لـە داگیركردنیانـدا. گەلـە پرۆتسـتانیەكان ماركسـیزمیان ڕەت كـردەوە لەبـەر هـەمان ئـەو هۆكارانـەی كـە كـاثـولیكیەتیشـیان بەهۆیـەوە ڕەفـز كردبـوو، بـەو شـێوەیە دەگەینـە بـەرەنجامێكی لــە ڕووكـاردا دژ، ئـەویش ئەوەیـە: شـیوعیەت تواناكـانی لەهـەمان ئـەو سەرچاوانەوە وەردەگرێت كە كاثولیكیەت لێوەی هەڵدەگۆزرێت.

نـاتوانین لــە تێڕوانینــی ماتریـالیزمی مێــژوویی یەكلاییكــەرەوە لــە پەیوەندییــە كۆمەڵایەتیـە دادپـەروەرەكان یـان سـتەمكارانەكان بـدوێین، ئەمـە تـەنیا لـە مومارەسـەی كرداریـدا دەكرێت. بـەڵكو بـەپێی ئـەم تیـۆرە ـ تـەنیا پەیوەندیـە گـەلێك لـە ئارادا هەیـە كە دەشێت پارێزگارییان لێ بكرێت یان لێیان نەكرێت. پێویستە تێبینـی ئـەوەش بكـەین كە زاراوەی ((دادپــەروەری)) زاراوەیــەكی ئەخلاقیــە، بــەڵام زاراوەی ((پارێزگــاری لێكــردن)) زاراوەیەكی ماددی میكانیكیە. مادام سەرمایەداری سازاو بێت لەگەڵ بنەما تەكنیكیەكەیدا (واتـە هێزەكـان بەرهـەمهێنان بـە تـەعبیری مـاركس)، ئـەوا سسـتم بـەردەوام پارێزگـاری لەمانەوەی خۆی دەكـات و پاساودراویش دەبێت لەهـەمان كاتـدا، پرنسـیپە ئەخلاقیـەكان هیچ شتێك یەكلا ناكەنەوە، هـیچ شتێك یەكلاناكرێتـەوە تـەنها فاكتـەرە بابەتیـەكان نـەبێت، یاخود وەك ((ماركس)) بە ڕوونی دەڵێت ((مادام سستمی بەرهەمهێنان پێویست بێت، ئـەوا ئیستیغلال كردنی مرۆڤیش لەلایەن مرۆڤەوە دەبێتە كارێكی پێویست)).

**ئەمە لایەنی تیۆری شتەکانە، ئەی لایەنی مومارەسەی چۆنە؟**

مارکسیەکان بۆ خۆشیان پابەندیەکی یەکلاکەرەوە یان بەم پێناسە بلیمەتانە (العبقري)یەوە نییە، چونکە ئەمە وادەکات هەموو هەوڵێکی مرۆیی بێسوود بێت و ڕاهاتووین دۆزینەوەی پێناسە زیرەك و لۆژیکیەکان لەکتێبەکانی قوتابخانەدا بۆیان بگەڕێین، بەڵام لە مومارەسەی کرداریدا هەموومان چەند چەمکێك بەکاردەهێنین کە کەمتر وردن، بەڵام لە مرۆڤو ژیانەوە نزیکترن، لە مومارەسەدا مارکسیەکان ــ بە تایبەتیش سەرکردە سیاسیەکانیان ــ زاراوەی ((ئیستغلال)) تەنیا بەمانا ئەخلاقیو ئینسانیەکەی بەکاردەهێنن، ئیستغلالیش لەوەدا دەوەستێت کە ((ڕێبازی بەکارهێنانی ئەوانی دیکە)) بێت. واتە (پیادەکردنێکی ئابوریانە ی تەکنیکیە لە کرۆکی پرۆسەی بەرهەمهێناندا). لە کتێبی ((راس مال))ی (مارکس)دا لە فەسڵی (ڕۆژی کار)دا بە ڕوونی زاراوەی ئیستغلال خراوەتە ڕوو لە چوارچێوەی بیرۆکەی خێرو شەڕدا. بەرهەم هێنەر کەسایەتی شەڕخواز لەخۆ دەگرێت و، قوربانی بەرهەم هێنان کەسایەتی چاك و دادپەروەر دەنوێنێت. ((یەکێتی پیاوچاکان))مان لە یاد ناچێت کە لای ((مارکس)) پێش ((یەکێتی شیوعیەکان)) کەوتووە، ئەمەش شوێنەوارێکە لە نوسینەکانی (مارکس)دا تەنانەت بەناویش ماوەتەوە). لەکاتێکدا ((مارکس)) نموونە گەلێکی لەبارەی (ئیستغلال)ی کرێکارانەوە پێشکەش دەکرد، پڕ بوو لە تۆمەتی وا کە ناکرێت بشارێنەوە، هاوشان لەگەڵ ڕای پێغەمبەرانی ((سەردەمی کۆیلەکان)) ((العهد القديم))ە کە ستەمو کارە شەڕ ئامێزەکانیان دەخرۆشان. بەڵام هەڵوێستی چاکسازە ئایینەکان ئاشکرایە کە بڕوایان وایە شەڕ ئەگەری لابردنی هەیە، تاوانبارکردنی مرۆڤ لەسەر کارە خراپەکانی ئەوە دەگەیەنێت کە تۆ دان بەوەدا دەنێیت کە هۆکەی دەرئەنجامی هەڵبژاردنی ئازادانەی مرۆڤە، ئەگەر نا ئەوا تاوانبارکردنی شەڕ بێ مانا دەردەچێت. بەڵام مادام لە واقیعدا ئیستیغلال کردن ئیدانە دەکەین ـ تەنانەت ((مارکس)) یش بۆ خۆی وایدەکرد ـ ئەوا ئەمە بەڵگەیە لەسەر ئەوەی کە پەیوەندیەکانی نێوان خەڵکی ناکرێت بچوك بکرێتەوە بۆ کۆمەڵە زاراوەیەکی ئابووری ڕووت [8]. مارکس

---

[8] / کاتێك هاوسەری هاوڕێیەکی مارکس کە (کوجلمان Kugelmann) سکاڵای تێنەگەیشتنی لە نووسینەکانی مارکس دەکات، ئامۆژگاری دەکات بەوەی کتێبی (راس المال) بخوێنێتەوە لە فەسڵی (ڕۆژی کار)ە کەیەوە. ئەم بەشەی کتێبەکە لەزۆر وڵاتدا بەجیا چاپکراوە، کە بەشێکی نزیکترە لەخەڵکیەوە چونکە دەرچەیەکی ئەخلاقی لەخۆدەگرێت، نەك هی مێژوویی یان بابەتی. دراما ئاڵۆزترە لە هاوکێشە بیرکاریەکان

لەسەر هەق بووە لە ئیدانە کردنیدا بۆ ئیستیغلال کردنی ((پێویست))، بەلام لەمەدا لەگەڵ فیکری خۆیدا هاوڕێك و گونجاو نەبوو.

بەو شێوەیە، تەنانەت ناودارترین بیریاری ماتریالیستیش ماددییەکی ((خۆڕاگر)) نەبووە و نەیتوانیوە وابێت. دەبا سەرسام بین لەوەی کە ماددیەتی ((لینین))ی بێباوەڕ چۆن بووە، ئەو وتوویەتی نووسەرە هەر کارتێکەرەکەی ((تۆلستۆی)) بووە. وادیارە هێزی مارکسیزم لە نەبوونی جێگیریەوە بووە لەسەر ماددیەت، واتە لەبوونی چەند ڕەگەزێکی ئەخلاقی و میثالیەوە تێیدا کە (مارکس) نەیتوانیوە خۆی لێ دەرباز بکات. مارکسیزم ویستی ببێتە زانست (بەلام سەرکەوتوو نەبوو)، لەبەرئەوەی بانگەوازێك بووە، مژدەی بە هیواو دادپەروەری هیومانیزم داوە [٩]. بەپێچەوانەی ئیرادەو ئامانجەکانیەوە، (مارکس) سەرمایەداری و کرێکارانی بەتەنها وەکو کارکرد داینەناون بەڵکو بەچەند کەسێتیەکی ئەخلاقی و هێماگەلێکی زیندووی خێروشەڕ داینـاون. یەکەمیان (سەرمایەداری) ستەمکارێکی زاڵەو، دووەمیشیان (پرۆلیتاریا) چەوساوەیەکی ژێر دەستەیە، ئەم پۆلێن کردنەش مرۆڤەکانی گیرۆدەی مەسەلە ئەخلاقیەکان کردووە. لەرێگەی ئەم پەیوەندیەشەوە لەنێوان پرۆلیتارو خاوەن سەرمایەکان دا مرۆڤی ئەورووپی گەڕاوەتەوە مومارەسەی دووژمنایەتی جولەکەکان دەکات لەنێوان دادوپەروەرو زاڵمدا.

وادیارە مرۆڤ ناتوانێت مولحیدێك و هەم ماددیەکی دڵسۆز بێت، با لەهەموو دڵیشیەوە ئەوەی بوێت.

---

بەلام هێشتا خەڵکی هەر لەدراما زۆر خێراتر تێدەگەن بە بەراورد لەگەڵ بیرکاریدا، سەبارەت بەم فەسڵەی کتێبی (راس المال)یش هەروایە.

[٩] / (برتراند راسڵ)یش تێبینی هەمان مەسەلەی کردووە کاتێك وتوویەتی: (مارکس) پێی وابووە کە مولحیدە بەلام مژدەی بەهیوایەکی گەردونیانەداوە،ئەمەیش کاتێك دەبێتە پاساو کەخاوەنەکەی بڕوادار نەبێت بە (ئولوهیەت) بڕوانە ((برتراند راسڵ)) لەکتێبەکەیدا (تأریخ الفلسفة الغربیة) کە پێشتر ئاماژەی بۆ کراوە (ل ٥٧٤).

# هاوسەرگیری

هاوسەرگیری دامەزراوێکی کۆنە بەڕادەی کۆنی مرۆڤ، نموونەیەکی زیندوشە بۆ ململانێی نێوان ئایدیاکان و واقیع یان نێوان ئایدیاکانو ئیسلام. ئاینی ڕووت داوێنپاکی (ڕەها) دەخوازێت، مادییەتیش وەك پرەنسیپێك ڕێگە بەئازادی سێکسی دەدات بەتەواوی، بەڵام هەر یەکێك لەم دوو مەزهەبە، کاتێك لە پراکتیکدا ڕووبەڕووی گرفتەکان بوونەوە، ئەوا بەرەو دامەزراوەی هاوسەرگیری کەوتنە جووڵە، هەڵبەتە ئەمەیش وەك چارەسەرێکی نێوەند.

لە مەسیحیەتی ئەسڵیدا هاوسەرگیری شوێنی نیە، مەسیح بانگەشەی پاکیزەیی ڕەهای کرد: ((فەرمانم پێکردن کە تاوانی زینا ئەنجام نەدەن، پێشتان دەڵێم هەر یەکێك لە ئێوە بە ئارەزووەوە بۆ ئافرەتێك بڕوانێت ئەوا بەدڵ زینای لەگەڵدا کردووە[10])).

ئەوەی لەم قسەیە لێی تێدەگەین ئەوەیە کە ڕێنماییەکانی مەسیح (سەلامی خوای لەسەر بێت) مرۆڤ هاندەدات کەلە پێناوی داوێنپاکی ڕەهادا تێبکۆشێ، ((تۆڵستۆی))ش هەمان بیرۆکەی بەرهەم هێنا کاتێك ووتی: ((ئەوانەی باوەڕیان وایە ئاهەنگی ژنهێنان پابەند بوون بە داوێنپاکیان بۆ مسۆگەر دەکات یان یاریدەریانە بۆ گەیشتن بەئاستێکی باڵاتری پاکێتی ئەوا لە هەڵەدان)). قەشە ((پۆڵس))یش لە یەکێك لە پەیامەکانیدا باسی ئەوەی کردووە کە:

((ڕەبەن لە خەمی پەروەردگاریدایە چۆن ڕازیی بکات، بەڵام خاوەن هاوسەرەکان لە خەمی دونیادان، واتە لە خەمی ئەوەدان چۆن هاوسەرەکانیان ڕازی دەکەن[11])). بە سیفەتێکی گشتی مەسیحیەت وا بۆ هاوسەرگیری دەڕوانێت کە (شڕ) ێکە ناچاریە و دابەزینێکە لە ئاستی کەماڵداو دەربازبوون نیە لێی، ((واباشە بۆ پیاو دەست لە ئافرەت نەدات، بەڵام بۆ ئەوەی لە تووشبوون بە زینا خۆی بەدوور بگرێت ئەوا دەبێ پیاو ژنی

---

[10] / بڕوانە: ((ئینجیل متی)) (٥: ٢٧-٢٨).

[11] / بڕوانە: العهد الجدید ((الکورنثیون)) (٣٨:٧).

هـەبێت و ژنـیش مێـرد[١٢])). لـەم پەیامـەدا هەسـتدەكەین كـە پرەنسـیپە راشـكاوەكانی مەسـیحیەت لاواز دەبـن و بـەرەو واقیـع دەچـن، ئەمـەش جۆرێكـە لەدابـەزینی ئاشـكرا. لـە تێڕوانینـی مەسـیحیەتەوە، هاوسـەرگیری رێگـا چـارەیەك نی‌یـە لەسـەر هـیچ پرەنسـیپێك وەستا بێت بەڵكو چارەسەرێكە واقیع سەپاندوویەتی (((هـەتا لـەزینا دوور بكەویتـەوە)) بـە پێی گووتەكەی قەشە پۆلس).

هەروەها مادیەتیش هاوسەرگیری رەت دەكاتەوە بـەلام لەبـەر هۆكارێكی تـەواو پێچـەوانە ((هاوسـەرگیری بـەو شـێوە بـۆی دەڕوانرێـت كـە ملكـەچ پێكردنـی رەگەزێكـە بـۆ رەگـەزێكی تـر))، یـان وەك وتـراوە: یەكـەم دوژمنایـەتی چینایەتی بەپەرەسـەندنی دوژمنایـەتی نێـوان پیـاو ژن بـەهۆی هاوسـەرگیری فەردیـەوە سـەری هەڵـداوە،.. هـەروەها بـە گوێزانـەوەی هۆكارەكانی بەرهـەم هێنـان بۆ خاوەنداری گشتی، ئیدی خێـزان وەك یەكەیـەكی ئابووری كۆمەڵگـە نامێنێتـەوە، ماڵـداری تایبـەت دەگۆڕدرێـت بـۆ پیشەسـازیەكی كۆمەڵایـەتی و، فێركردنـی منـداڵان و چـاودێری كردنیشـان دەبێتـەوە بەبەشـێك لـەكاروباری گشـتی و، كۆمەڵگە چاودێری تەواوی هەموو منداڵان بە شـەرعی و ناشـەرعیانەوە لەسـەر یـەك ئاسـت دەكـات. بەمـەش ئـەو دڵـە ڕاوكێیـە لـەو دەرئەنجامانـە نامێنێـت كـە دادەنرێـت بـە گـرنگترین فاكتـەری كۆمەڵایەتی و ئەخلاقی و ئابووری، كـە رێگـە لـە كـچ دەگرێـت بـە تـەواوەتی خـۆی ببەخشێتە ئەو پیاوەی خۆشی دەوێت، ئایا ئەمە بەس نیە بۆ ئـەو بـەرێ كردنـەی گەشـەی پلەبەنـدی بـێ سـنووری تێكـەڵی سێكسـی ئازادانـەو، هاتنـە كایـەی ئاسانكاریەكی گشـتی زۆرتر سەبارەت بەوەی بە ئابڕووی كچ و عەیبەی ژنەوە پەیوەستە[١٣]؟.

پەیوەندیـەكی ئاشـكرا لـەنێوان تێڕوانینـی مەسـیحیەت بـۆ دونیـاو بانگەشـەكردنی بـۆ داوێن پاكی لە ئارادایە[١٤].

---

[١٢] / بڕوانە: هەمان سەرچاوە (٢:١).

[١٣] / بڕوانە: ((إنجلز)): Engels The Origin of Family, Private Property and State

[١٤] / ئەم بانگەشەیە بۆ چەند رەوتێكی توندڕەوانە پەرەی سەند كە لەمێژووی مەسیحیەتدا گەیشتە ئاستی خەساندن. ((ئۆریگن)) Origen هەستا بەخەساندنی خۆی تاخۆی پاكبكاتەوە. شوێن كەوتووانی تیرەی ((ڤالێرانی)) Valeriani لە دوورگەی عەرەبیدا تەنیا بەخەساندنی خۆیان هەڵنەدەستان، بەڵكو ئەم پەیڕەوەیان بەسەر هەموو ئەوانەیشدا پیادە دەكرد كە دەهاتنە ناوچەكیانەوە. خەساندن لەچەند ئاینێكی تری كەشدا هەبووە كڵێساش هەتا كۆتایی سەدەی نۆزدە یاساغی نەكرد.

هەندێك ڕەوتی ماتریالیزمی لە خۆرئاوادا لە ڕەبەنیدا پەیوەندی نێوان سستەمە کۆمەڵایەتییە دواکەوتووەکان و چەپاندنی سێکسی بەدیدەکەن، تیۆرەکانی ((ولیام ریچ Wilhelm Reich و ((ترۆتسکی)) Trotsky و تیۆری ((قوتابخانەی فرانکفۆرت)) ئینتیمایان بۆ ئەم بۆچوونە هەیە. ((هربرت مارکیوز)) یش بەرەو ئەوە دەچێت کە سەرمایەداری پەیوەندییە سێکسییەکان دەچەپێنێت لەپێناوی ئەوەی وزەی سێکسی لە بوارەکانی دیکەدا بەکار بهێنێت.

ڕەبەنی پشت بە وەسیەتی ڕاستەوخۆ لە خواوە نابەستێت، لە تەقلیدە نۆبەرەکانی کڵێساشدا بوونی نەبووە[15]. بەڵام ڕەبەنی (بە مانای خۆگرتنەوە لە هاوسەر گرتن)، بەشێکی سروشتییە لە مەزهەبی ماتریالیستی، لە دوا کۆنگرەی ڤاتیکاندا هەوڵی لابردنی ڕەبەنی قەشەکان ڕەفز کرا. ئەمە لە ڕووی پرەنسیپەوە، بەڵام لە ڕووی واقیع و پراکتیکەوە، کەسانێکی کەم نەبێت لە خەڵکی مومارەسەری ڕەبەنی ناکەن. ـ لە یەکێتی سۆڤیەتیشدا ـ دوای زۆرێك لە ئەزموونە سلبییەکانی لەگەڵ ئازادی سێکسیدا ـ دامەزراوەی هاوسەرگرتن هێنرایەوە ناوەوە.

ئەگەر دامەزراوەی هاوسەرگیری بڕیاری گێرانەوەی درا بێت بۆ مەسیحیەت و شوعیەتی ماتریالیزمی، ئەوا لە هەردوو حاڵەتەکەدا سەرەتاکەی جیاواز بووە لە مەسیحیەتدا لە خواستەکانی داوێن پاکی تەواوەوە دەستی پێکردو، لە ماتریالیزمیشدا لە خواستی ئازادی تەواوی سێکسەوە. مەسیحیەت هاوسەرگیریی کرد بەیەکێك لە دروشمە پیرۆزەکان، لەکاتێکدا ماتریالیزم گۆڕی بۆ پەیمانی ڕێکەوتن، لە هەندێ حاڵەتیشدا بۆ پەیمانێکی ڕەسمی کەملکەچی چەند مەراسیمێکی دیایکراو دەبێت. بەڵام ماوەیەکی زۆر دەمێنێتەوە لەنێوان هاوسەرگیری کاثولیکی و هی مەدەنیدا. بنەمای جیاوازییەکەیش تەڵاقە، هاوسەرگیری پیرۆز ناکرێت گرێ بەستەکەی بەتەڵاق هەڵبوەشێنرێتەوە ئەگەر نا دەبێتە پەیمانی ڕێکەوتن. لەلایەکی تریشەوە، ئەو هاوسەرگیرییەی کە ناکرێت گرێ بەستەکەی بە هیچ شێوەیەك هەڵبوەشێنرێتەوە ئەوا سیفەتەکەی لەدەستدا بەو پێیەی کە پەیمانی ڕێکەوتنەوە دەبێتە شتێکی پیرۆز، ئەمەش کارێکە هیچ (پۆزەتیڤیزمێك) نییە ئامادەی قبوڵ کردنی بێت.

---

[15] / مەجمەعی مەسکونی دانی بەرەبەنی دانا ((لاترانی دووەم)) ساڵی ١١٣٩ی ز.

هاوسەرگیری ئیسلامی هات و ئەم دوو جۆرە هاوسەرگیرییەی یەکخست، هاوسەرگیری ئیسلامی لە تێڕوانینی ئەوروپییەوە ـ ئایینی و مەدەنیشە، واتە پەیمانێکی ڕێکەوتنە لە هەمان کاتیشدا لە ئاهەنگێکی ئاینیدا ئەنجام دەدرێت، ئەو کەسەش کە گرێ بەستەکە دەکات ((پیاوی ئاین))و هەم کارمەندیشە لە دەوڵەتدا.

هەردووکیان لە یەك کەسدا، لەبەر ئەوەی لە هاوسەرگرتنی ئیسلامیدا سیفەتی گرێبەستی هەیە، لەبەر ئەوە دەکرێت لەکاتی پێویستدا هەڵبوەشێنرێتەوە. تەڵاق ڕێگەی پێدراوە بەهۆی چەند هۆکارێکەوە کە پێویستی دەکات. پێغەمبەری خوا ﷺ تەڵاقی بە ((بێزراوترین حەڵاڵ لای خوا)) داناوە، ئەمەیش بیرکردنەوەیەکی ئاینی و ئەخلاقیە بە یەکەوە. لەپاشاندا هاوسەرگرتن نموونەیەکی زیندووی دامەزراوەیەکی ئیسلامییە.

هاوسەرگرتن ـ وەك لە ئیسلامدا زانراوە ـ هەوڵی وەڵامدانەوەی گرفتێکی جەوهەری دەدات، چۆن مرۆڤ گونجان لەنێوان مەیل و ئارەزووە ڕۆحیەکان و پێویستیە ماددیەکانی دەکات، چۆن پارێزگاری لە بێگەردی دەکات بێ ئەوەی دەسبەرداری خۆشەویستی ببێت، چۆن حەزی سێکسیانەی ئاژەڵێك ڕێك دەخرێت کە دەکرێت ببێتە مرۆڤ بەڵام ناتوانێت ببێتە فریشتە. ئەم ئامانجە جەوهەریە لە ناوەڕۆکیدا ئامانجێکی ئیسلامییە.

دەکرێت هاوسەرگرتن بە دادپەروەری بەراورد بکرێت (هەردووکیشیان لە تایبەتمەندیەکانی ئیسلامن)، ڕووی بەراوورد کردنەکەش ئەوەیە کە ئەمانە دوو بیرۆکەن برێك لە زبری ڕواڵەتی لەخۆدەگرن، بەڵام ژیانێکی بێگەردترو دامەزراوتر لە هاووتاییە مەسیحیەکە بۆ مرۆڤ مسۆگەر دەکەن، مەبەستم لەمەش ڕەبەنی و خۆشەویستی گشتیەکەیە.

وادیارە ((تۆڵستۆی)) بەڕوونی دەرکی بەم ڕاستیانە کردووە بەڵام دەرئەنجامی جیاوازی لێ هەڵگۆزیوە، ئەو دەنوسێت:

((لەبەرئەوەی ڕێنماییە پوختەکانی مەسیحیەت بنەمایەکیان بۆ دامەزراوەی هاوسەر گرتن تێدانیە، هەر بۆیە گەلان لە دونیا مەسیحیەکەماندا نازانن چۆن ئینتیما بەم دامەزراوەوە دەکەن. ئەوان واهەست دەکەن کە ئەمە دامەزراوەیەکە لە جەوهەردا نامەسیحیە، بەڵام ئەوان نموونە. بالاکە لە مەسیحدا نابینن ـ کە خۆگرتنەوەیە لە سێکس ـ چونکە لە پشت عەقیدەی ئێستاوە خۆی شاردراوە.

لێرەوە دیاردەیەك بەدەركەوت كە لە یەكەم تێڕوانینەوە نامۆ دەردەكەوێت: لەنێوان ئەو نەتەوانەی چێژ لە بوونی ئاستێك لە ڕێنماییە ئایینیەكان وەرناگرن كە لە مەسیحیەتدا ئامادەن، لەزەت لە چەند پێوەرێكی سێكسیانەی ڕوون و باشتر دەبینن. لە نموونەی دڵسۆزی نێوان ژن و مێردو دڵسۆزی بۆ خێزان كە بەهێزترە لەوەی لەنێوانی ئەوانەدا هەیە كە خۆیان بەمەسیحی ناودەبەن، لەنێوان ئەو گەلانەی ڕێنمایی كەمیان هەیە لەبارەی مەسیحیەتەوە، چەند پێوانەیەكی (متعە) كردن و فرەژنی و فرە مێردی بوونی هەیە، بەلام نەك بەو قورساییەی كە لەو پەیوەندییە سێكسیانەو (متعە) كردن و فرە مێردیو فرە ژنیەی كە لە كۆمەڵگە مەسیحیەكاندا باوە لە ژێر پەردەی درۆینەی تاك هاوسەریدا[16])).

## دووجۆر بیروباوەڕی ئەفسانەیی

ئەگەر ئەوەی دەیڵێین ڕاست بێت، ئەوا دوو جۆر بیروباوەڕی ئەفسانەیی هەیە: جۆری یەكەم: هەوڵدانی زانستە بۆ تەفسیركردنی ژیانی (جوانی)مرۆڤ بۆمانو، دووەمیش هەوڵدانی ئاینە بۆ ڕاڤە كردنی دیاردە سروشتیەكان.

كاتێك زانست هەوڵی تەفسیركردنی جیهانی دەروون دەدات، ئەوا شیكاری دەكات بۆ دەرك پێكراوێكی هەستیانە، واتە بۆ شتێك. كاتێك ئاینیش هەوڵی تەفسیركردنی سروشت دەدات. كەسایەتی پێدەبەخشێت واتە دەیگۆڕێتەوە بۆ (ناسروشت) : (اللاطبيعة)، بەم شێوەیە لە هەردوولاوە ڕووبەڕووی چەمكێكی هەڵە دەبینەوە.

ئاینە سەرەتاییەكان بەجادویی و تابۆكانیانەوە زۆر لە ئەفسانەكانەوە نزیك بوون بە جۆرێك كە جیاكردنەوەیان نا مومكین بێت. ئەم ئاینانە ـ لە ڕاستیدا ـ ڕەنگدەرەوەی شێوازیی ناوەكی مرۆڤن. لە دوو جۆری جیاوازی سەرقاڵیە زهنیە بنەڕەتیە زووینەكانی ڕەگەزی بەشەرییەوە هەڵقوڵاون، جۆری یەكەم ڕۆحییە، ئەمە لەكاتێكدا دەستی پێكرد كە مرۆڤ هۆشیاربوو بە خودی خۆی وەك بونەوەرێكی مرۆیی سەربەخۆو جیا لەو سروشتەی

---

[16] بڕوانە: ((تۆلستۆی)).. Tolstoy: The Road to Life.

دەوری داوە، دووەمیش ماددیەو لە پێویستی مانەوەی لەجیهانێکی دژی پڕ لە مەترسیدا خۆی دەنوێنێت، ئایینە سەرەتاییەکان لە دەرەنجامی ئەم دوو هێزە دژ بەیەک بەڵام دەسەڵاتدارانەوە دروست بوون، ئاگایی هۆشیاری ئایینی (الضمیر الدیني) ـ لە ژێر فشاری حەزی مانەوە (حب البقاء)دا ـ ڕووی دونیاگەرایی کرد چونکە ئامانجی مرۆڤ وای لێ هات جەختی کردە سەر سروشت پتر لە هەر شتێکی دیکە، ئەو حەزی لە: ڕاوی سەرکەوتوو و دروێنەی زۆرو، خۆپاراستن لەسروشتی دوژمنکارو نەخۆشیو گیانلەبەرە دڕەندەکان... لەکاتێکدا ئامرازە ئایینیەکانی مرۆڤ مانەوە، مەبەستم سیحرو قوربانیەکانو سەمای ئاینیو گۆرانیو هێماکانە. کەواتە ئاینی سەرەتایی هەستێکی ئاینیانەیە بەڵام بەرەو ژیانی دەرەکی، بەرەو پێداویستیەکانی ژیان ئاراستەی گرتووە، لە جیاتی ئەوەی بەرەو لایەنی ناوخۆیی (جوانی) و شەوقە ڕۆحیەکان ئاراستە بگرێت. بەڵام لەکاتێکدا کە مرۆڤ لە توانایدا نەبوو هیچ شتێك لەجیهانی واقیعی بهێنێتە دی، ئەوا ئاینی سەرەتایی شێوەیەك لە لاوازی و گومڕایی مرۆڤی لێکەوتەوە.

ئەو ئاینەی دەیەوێت بیرکردنەوەی ئازادانە بەنهێنی گەلێکی سۆفیانە بگۆڕێتەوەو، حەقیقەتی زانستیش بەچەند بیروباوەڕێکی دۆگما بگۆڕێتەوەو، کارایی کۆمەڵایەتیش بە سروتەکان، ئەوا هەر دەبێت لەگەڵ زانستدا پێکدا بدەن، ئایینی ڕاستیش ـ بەپێچەوانەی ئەمەوە ـ گونجاوە لەگەڵ زانستدا. زۆرێك لە زانا مەزنەکان دان بەجۆرێك لە یەکتاپەرستیدا دەنێن، لە سەرووی ئەمەشەوە زانست دەتوانێت یارمەتی ئاین بدات لە دژایەتی کردنی بیروباوەڕە ئەفسانەییەکاندا، بە لەیەك جیابوونەوەیشیان ئاین بەرەو دواکەوتنو زانستیش ڕووەو بێباوەڕی مل دەنێت.

بەڵام زانستیش خاوەنی بیروباوەڕی ئەفسانەیییە، ئەوەش لەکاتێکدایە کە بواری سروشت بەجێ دەهێڵێت. ئەگەر توانای زیرەکی مرۆڤ سەرکەوتنی خۆی لەو مەسەلانەدا مسۆگەر کردبێت کە پەیوەستن بەجیهانی ماددییەوە (هەروەك لە زانستی سروشت و گەردوون و ئەوانی تریشدا هەیە)، ئەوا هەمان زیرەکی لەبواری ژیاندا نامۆو گەلۆرو گومانـاوی دەردەکەوێت. کاتێك زانست مێتۆدە شیکاریو چەندایەتی (کمیة)یەکانی لە بواری ژیاندا بەکارهێنا لە ئاکامدا گەیشتە نەفی کردنی هەندێك لە حەقیقەتە دەروونیو ژیانییە جەوهەریەکانو، دایبەزاندن تەنیا بۆ ڕووکارە دەرەکیەکانی. بەو شێوەیە، بینیمان

سۆسیۆلۆژیای ئاینی بەسەر جەوهەری بنەڕەتی ئاینـدا زاڵ دەبێـتو، هـەوەها زانسـتی بایۆلۆژیـاش بەسـەر ژیانـدا زاڵ دەبێـت و، سـایکۆلۆژیاش بەسـەر دەرونـداو، زانسـتی ئەنثرۆپۆلۆژیاش بەسەر کەسێتی مرۆیدا زاڵ دەبێت، مێژووش مانا دەروونیەکەی مرۆڤ لە دەست دەدات[17].

ماتریـالیزمی دیالـەکتیكو مێـژوویی نموونـە گـەلێکی روون لـە شکسـت دەردەخـات لـە پراکتیـزە کردنـی میتـۆدی زانسـتی بەسـەر ژیـانو مێـژوودا کاتێـك بـەم گوتـە بەناوبانگانـە گەیشت : ((ئاین تریـاکی گەلانـە)) و، یاساش ((ئیرادەی چینی دەسـەڵاتدارە)) و، زاڵبـوون بەسـەر سیستمی کۆیلایەتیـدا ((لەبەرژەوەنـدی گەشـەی سـەرمایەداریدایە))، و ((کانـت)) و ((گۆتـە)) ش لـە (داکۆکیکـەرانی سیسـتمی سـەرمایەدارین)) و، فەلسـەفەی پـووچ گـەرایش ((رەنگدانـەوەی قـەیرانی سیسـتمی سـەرمایەداریە)). یەکێك لەنووسـەرە مارکسیستەکان و وتبووی فەلسەفەی ((سارتەر)) سەبارەت بە ترسو مەرگ، شتێك نیە جگە لە گوزارشت لە قەیرانی سستمی بەرهەمهێنان نەبێت[18].

ئەدیبی فەرەنسی ((بلزاك))یش بەشداری لەم جۆرە هەڵانەدا کردووە کاتێك پیشەکیەك دەلکێنێـت بـە رۆمانـە بەناوبانگەکـە یـەوە کەئـەمیان ناوبـانگی کـەمترە، تێیـدا هەوڵیـداوە کائینی مرۆیی بە بەکارهێنانی چـەند شێوازێکی زانستی پۆزیشیستی شـی بکاتـەوە، ئەم پێشـەکیەی ((بلـزاك))یـش نموونـەیـەکی گونجـاوە لەسـەر شکسـتی میتـۆدی زانسـتی لـە باسـکردنی ژیـانی (جوانی)ی مرۆڤـدا. لەبەرئـەوە دابڕانێکـی تـەواومان بینیـەوە لـە نێـوان ئەوەی کە دانەر حەقیقەتی مرۆیـی لـە رۆمانەکەیـدا ((الکومیـدیا الأنسـانیة))دا پێـی وەسـف کـردووە کـە وەسـفێکی دڵسـۆزانەو زینـدوو بـووە، وە لـەنێوان ئـەو تەفسـیر فیکریانـەی سەبارەت بە چارەنووسەکانی مرۆڤ وەك لە پێشەکی رۆمانەکەدا هێناویەتی.

کاتێـك زانسـت پارچـەیەکی هونـەری وەسـف دەکـات، ئـەوا دایدەبـەزێنێت بـۆ دیاردەیـەکی دەروونـی، هونەرمەنـد لەدیـدی زانسـتدا قوربـانی حاڵـە دەرونیـەکانی خۆیـەتی

---

[17] / پەرەسەندنی سایکۆلۆژیاش لەم رووەوە دەلالەتی خۆی هەیە، سایکۆلۆژیای رەفتاری کە کۆتایی ئەم قۆناغە دەنوێنێت، ((دەرکردنی دەروون لە دەروونناسی و پێشنیاری بونیادنانی دەروونناسیەکی بێ دەروون)) رادەگەیەنێت، سەرئەنجامە لۆژیکیەکەشی ئەوەیە کە مرۆڤێك خاڵییە لە ئازادی و بالابوون. بڕوانە:
ب، ف، سکینەر: B. F. Skinner: Beyond (Freedom and Dignity (New York: Knopf, 1971).

[18] / بڕوانە: ((لوسیان گۆلدمان)) Lucien Goldman in (Art) Writing about existentia lism

(شێوانی عەقڵی)، ((ستیکاڵ)) ((Stekal))ی دەروونناس رایگەیاند کە توێژینەوەکانی گەیاندوویانەتە قەناعەتێك کە جیاوازی لەنیوان شاعیرو دەروون شێواوێکدا نی‌یە *.
زانست پێی وایە کە باشترین کەس کە داهێنانی هونەری شێتەڵ بکات دەروونناسی شیتەڵکاریەو، دەرئەنجامی ئەم ئاڕاستەیەش هاوڕێکی کردن بوو لەنێوان داهێنان‌و دەروون شێواوی‌دا [19].

هەروەها لە هونەری بیناسازی ((میلز ڤان در روە)) یشدا دەرئەنجامێکی لۆژیکیانە هەڵدەهێنجرێت کە هاوڕێ لەگەڵ مەزهەبەکەیدا لە ((هونەری وەزیفی))دا دەڕوات، کاتێك ووتی: ((ئەگەر دڵسۆزانە کارمان کرد، ئەوا کاتدرائیەت پێویست ناکات لەگەڵ کارگەدا جیاواز بێت)). لە ڕووی عەقڵانیەتەوە بواری ڕەخنەگرتن لە بیناکردنی شارە پیشەسازی یان سەربازگە جەنگیەکان نیە، بەڵام ئەگەر بیناسازی لەم لایەنە وەزیفییە عەقڵانیەدا کورت ببێتەوە، ئەوا خۆی خۆی هەڵدەوەشێنێتەوە.

زانستی بایۆلۆژیاش بەرەو ئەوە دەچێت کە مرۆڤ لەحەقیقەتدا تەنیا ئاژەڵێکەو هیچی دی، ئاژەڵیش لە حەقیقەتەکەیدا شتێکە، ژیانیش دواجار تەنیا چەند پرۆسەیەکی میکانیکی ـ نازیندووە ـ واتە ژیان نیە. پەرەسەندنێکی هاوشێوەیش لە زانستی ئەخلاقدا ڕوویداوە، عەقڵیش ئەوەی بەرهەمهێناوە کە ئەو کردارەی بە ئەخلاقی ناوزەدی دەکەین تەنیا جۆرێکە لە خۆپەرستی ((الأنانیة)) یان جۆرێکە لە ((رۆشنگەری)) یەکی پاڵفتەکراو لە خۆپەرستی ـ واتە ئەخلاق نەفی کردنی ئەخلاقە. بەم شێوەیە توێژینەوەی زانستی لە بوارە مرۆییەکەیدا، بە زنجیرەیەك لە ئینکاری کردن کۆتایی هات: یەکەم جار ئینکاری بوونی خوای کرد، لە پاشاندا بەپێی شێوازێك لە پلە کاری دابەزی و، ئینکاری مرۆڤو پاشان ژیانی کرد. لەکۆتایشدا گەیشتە ئەو دەرئەنجامەی کە هەموو شتێك تەنیا گەمەیەکەو جێگۆڕکێی چەند کارلێکێکی هێزە گەردیلەییەکانە.. عەقڵ لە ئاکامدا نەیتوانی شتێکی دیکە لەم گەردوونەدا بدۆزێتەوە خۆی نەبێت : میکانیکیەت‌و سەبەبیەت (الألیة والسببیة).

---

* / د.(مصطفی سویف) توێژینەوەیەکی گونجاوی لەم بوارەدا هەیە لەکتێبەکەیدا ((الأبداع الفني)) خستوویەتیە ڕوو کە نامەی ماجستێرەکەیەتی، لە پەنجاکاندا بڵاوکراوەتەوە، (وەرگێڕ، ع).

۱۹ / بڕوانە: ((ڤ، جیرۆتتش)). V, Jerotic: Sickness and Creation (Belegrade: n,p.,1976)

# بەشی یازدەهەم

## (( ڕێگای سێیەم )) دەرەوەی ئیسلام

﴿ ئاینی ئەوروپاو بێ باوەڕیەکەی بە سەرسامیەوە دەمێنینەوە لە سروشتە پەرگیرەکەیاندا... ﴾

# جیهانی ئەنگلۆ سەکسۆنی

ئـەورووپا بیرۆکـە بنەڕەتیـەکانی لەرێگـەی قوتابخانـە سـەرەتاییەکانەوە لەچـاخەکانی ناوەنـدەدا بنیادنـا، سـەرەڕای پێگەیشتنیشـی ئـەوا ئـەم شـارەزاییە منداڵانەیـە هێشـتا لـە عەقڵی ئەورووپیـدا هـەر زینـدووە، ئیتر لـە ئاینـدەدا بێـت یـان لـە دەرەوەی ئاینـدا بێـت ئـەوا ئـەورووپا هـەر بـەو شـێوەیە دەمێنێتـەوە کـە لەچوارچێوەی هەڵبژاردنـە مەسـیحیەکەدا بیر دەکاتەوە: یان مەملەکەتی پەروەردگار یان مەملەکەتی زەوی. ئەورووپا زانست یـان ئایین بـە بەدبـەختی ڕەت دەکاتـەوە. هـیچ بزاڤێکـی ئـاینیش لـە ئـەورووپادا ناتوانێـت بەرنامەیـەکی کۆمەڵایەتی بونیاد بنێت. ئاییني ئەورووپا و بێباوەڕیەکەی هەر بە سنووورداری دەمێنێتـەوە لە سروشتە پەرگیریەکەیاندا.

بەڵام بەشێك لە جیهانی خۆرئاوا هەیە ـ بەهۆی شوێنە جوگرافیەکەو مێژووەکەیـەوە ـ بە ئازادکراوی ماوەتـەوە لە کاریگەرێتیـە راستەوخۆکانی مەسیحیەتی سەدەکانی ناوەند، ئـازادکراو لـەگرێ ئاڵۆزەکـانی ئـەم سـەردەمە. ئـەم بەشـەی جیهـانی خۆرئـاوا هەمیشـە لـە تۆژینەوەی بەردەوامدا بوو بۆ دۆزینـەوەی ڕێگـای سـێیەم، توانیشـی پـەی پـێ بەرێت، کـە ڕێگایەکە لە هاوشێوەی سیماکانی ڕێگەی سـێیەمی ئیسـلامە، ئـەو دەوڵەتـەیش مەبەسـتمە ئینگلتەرایە هەروەها تا ڕادەیەکیش جیهانی ئەنگلۆسەکسۆنیە بەسیفەتێکی گشتی[1].

پێشـەکی یەکـەم وەرگێـڕاوی ئینگلیـزی کتێبـی پـیرۆز بـەم ووشـانە دەسـت پێـدەکات: حیکمــەتی کڵێســای ((ئــەنجلیکانی)) لــەو کاتــەوەی دەســتی بــە بــەجێهێنانی ســروتە گشـتییەکانی کـردووە، ئـەوە بـووە کـە شـوێن ڕێگـای ناوەنـد بکـەوێت لـەنێوان دوولایەنـە دژەکـەدا، وادیـارە ئـەم هەڵوێسـتەش بووبێتـە یاسـای یەکـەم بـۆ ژیـانی ئـاییني و کـرداری ئینگلیزی.

---

[1] / لەدوایدا تێیدا دەرکەوتنی دیاردەیەکی هاوشێوە دەبینین بە پلەی سووکتر، لە کۆمەڵێك لەو دەوڵەتانەی چەند تەرزێکی ریفۆرمیستیانەی مەسیحیەتی بەخۆوە بینیوە.

مەسیحیەت مێژووی جیهانی خۆرئاوای بۆ دوو سەردەمی تەواو دژیەك دابەشکردوە، ئەوانیش چاخەکانی ناوەندو چاخی نوێیە. کە نمایشی دوو هەڵبژاردن دەکەن و سێیەمیان نی یە: ئاین یان زانست..کڵێسا یان دەوڵەت. بەڵام ئەم پلانە مێژوویە بەسەر ئینگلتەرەدا پراکتیزە ناکرێت، لانی کەم بەو مانایە نا کە لە ئەوروپادا دەبینین.

لەبەر ئەوە، هەر دەبێ تێروانینێکی سەربەخۆمان بۆ ئەزموونی ئینگلتەرا لە مێژووی ئەوروپادا هەبێت. ئەوروپا ـ بەبێ ئینگلتەرا ـ تەنیا دوو سەردەم دەناسێت: سەردەمی کڵێساو سەردەمی دەوڵەت. ئایا دەکرێ بڵێین سەردەمی ناوەندی ئیسلامیش لە ئەوروپادا* تەنیا بۆ ئینگلتەرا درێژبۆتەوە؟ هەروەها دیموکراسیەت لە ئەوروپادا– کە ئاوێتەیەکە لە پرەنسیپە عەلمانیو میتافیزکیەکان ـ داهێنانێکی ئینگلیزییە، ((نیچە)) کە پیاوێکە بە دڵو جەستە ئەوروپییە لە پرسیارە بە ناوبانگەکەیدا گوزارشت لەجیاوازی نێوان عەقڵی ئینگلیزی و عەقڵی ئەوروپی دەکات: ((چۆن ئەوروپا لە ئینگلیز ڕزگار بکەینو، چۆن ئینگلتەراش لە دیموکراسییەت ڕزگار بکەین))؟

لە تێروانینی فەلسەفەی مێژووەوە، ئینگلتەراو ڕۆحی ((ئەنگلۆسەکسۆنی لە مێژووی خۆرئاوادا دادەنرێت بەهاوشێوەی دەرکەوتنی ئیسلام لە مێژووی خۆرهەڵاتدا. ڕەنگە ((شپنجلەر)) یش ئەمەی مەبەست بوو بێت لە بەراوردکردنیدا لەنێوان موحەممەد پێغەمبەر (د. خ) و ((کرۆمیل))دا[٢].

((شپنجلەر)) ئەم دوو کەسێتیەی لە چوارچێوەی تێروانیندا بۆ مێژووی جیهان وەکو دوو کەسێتی هاوچەرخ تێی ڕووانیون: یەکخستنی نێوان کڵێسای ئینگلیزیو دەوڵەتو، هەروەها دەرکەوتنی ئینگلیز وەك هێزێکی جیهانی، هەموو ئەوانە بە ((کررمۆیل)) دەستیان پێکرد، هەروەها یەکخستنی ئاینو دەوڵەت و دەرکەوتنی هێزە جیهانیەکەی ئیسلام بە موحەممەد دەستی پێکرد.

---

* / لێرەدا نوسەر ئاماژە بۆ بوونی دەوڵەتی ئیسلامی لە ئەندەلووسداو ژیارە درەوشاوەکەی لەسەدەکانی ناوەندا دەکات (ئەوروپا بەگشتی لەچاخی تاریکیدا بوو جگە لەم ناوچە ئیسلامیە)، (وەرگێڕی ع).

٢ / بڕوانە: ((شبنجلر)): Spehyler: The Decline of the west, trans ...(New York;Knopf,1926)pp. 211-213.

هەردووکیشیان دوو بڕواداری پاكو دامەزرێنەری ئیمپراتۆریەتی گەورە بوون. وا دیارە ئەمەیش کارێکی زۆر سروشتی بێت بە نیسبەت عەقڵی ئیسلامیو ئەنجلۆ سەکسۆنیشەوە، بەڵام زۆر نامۆیە بەلای عەقڵی ئەوروپییەوە. قەشە ((لویس)) دەوڵەتی فرانکۆنی تێکشاند، بەڵام لە جیهانی ئیسلامیدا ــ بەپێچەوانەی ئەوەوە هیچ پێشکەوتنێکی سیاسی یان کۆمەڵایەتی ڕووی نەدا بە ڕابوونێکی ئاینی نەبێت. لە ئەورپادا، کاتێك دەوڵەت هەستی بەهێزی خۆی کرد ڕووی لە سەپاندنی دەسەڵاتی خۆی بەسەر کڵێسادا کرد، ئەمەش هەمان ئەوکارە بوو کە کڵێسا بەرلەوە بەچەند سەدەیەك پێی هەستا، لەکاتێکدا لە لوتکەی هێزیدا بوو، کاتێك هەستا بەسەپاندنی هەژموونی خۆی بەسەر دەوڵەتدا. هەروەها لە ئەورووپادا دادگاکانی پشکنین بڵاو بونەوە بەڵام لە ئینگلتەرادا بڵاونەبونەوە.

بەم شێوە ئینگلتەرا نە دادگاکانی پشکنینی تاقیکردەوەو نە هەژموونی کڵێسا، ئیسلامیش هیچ لەمانەی تاقی نەکردەوەو پێیدا تێنەپەڕی. ریفۆرمی ئاینی لە ئینگلتەرادا - بە لۆژێکی فیطریانە - بەسەر هەردوولایەنە دژەکەدا زاڵبوو: دەسەڵاتی پاپایی و ستەمی پاشایەتی. ئینگلتەرا لە هەردوو سەدەی پانزەو شانزەدا، دەوڵەتێکی شۆڕشگێڕی بوو، ئەو لەتێڕوانینی ئەورووپای ئەمڕۆکەدا دەوڵەتێکی موحافیزکارە. وشەی ((موحافیزکارێتی)) لای ئینگلیز بانگەشەیە ((بۆ پارێزگاریکردن)) لە ڕۆحی ڕەسەنی ئینگلیزی، کە لەچەمکە فراوانەکەیدا، ڕێگەی ناوەند دەگەیەنێت.

دەکرێ زیاتر لەم دوا لیزمێتیەی شێوازی ژیانی ئینگلیزی تێ بگەین کاتێك لە هەڵوێستی ((ڕۆجەر بیکۆن)) ڕامابین کە بە دامەزرێنەرو پێشەنگی پێشکەوتنی ڕۆحی ئینگلیزی نوێ دادەنرێت، ((بیکۆن)) لە سەرەتاوە بونیادی فیکری فەلسەفی ئینگلیزی لەسەر دوو بنەما دانا کە لە ئەسڵدا سەربەخۆن: ئەزموونی ناخەکی کە دەبێتە مایەی ڕۆشنکردنەوەی ڕۆح (یاخود ئاین)و، ئەو تێبینیەی کەدەبێتە مایەی زانستی حەقیقی (یان زانستی ئەزموونی ((التجریبی)))، ((بیکۆن)) جەختی لەسەر پێکهاتە ئاینیەکان کردوەو لەسەر دوالیزمێتیەکەی خۆی مایەوە هەروەك ئیسلام کردی. هەوڵیشی نەدا تێڕوانینە زانستیەکە یان ئاینیەکە لەئاست یەك - لەسەر حیسابی ئەوی تر - دابەزێنێت،

بەڵکو هاوسەنگی لەنێوان ئەم دوو تێڕوانینەدا بوونیادنا. ئەم لایەنە لەبلیمەتی ((ڕۆجەر بیکۆن))، زۆربەی ئینگلیز بە مەزنترین تەعبیری ڕەسەن لەمەڕ فیکری ئینگلیزی و هەستە ئینگلیزەکان دادەنێن، بەڵکو زۆرێك وایدەبینن فەلسەفەی ئینگلیزی کە دوای ئەو دەرکەوت هیچ نیە جگە لە پەرەسەندنێکی پرنسیپە فیکریەکانی ((بیکۆن)). دەروازەی دوالیزمێتی فیکری ((بیکۆن))ە کەوا کاریگەرێتیە مەزنەکەی لەسەر ئاراستەو شێوازەکانی فەلسەفەی ئینگلیزیو زانستە ئینگلیزیەکانمان بۆ تەفسیر دەکات.

بەڵام حەقیقەتێکی گرنگ سەبارەت بە ((بیکۆن)) دەمێنێتەوە کە بەتەواوی لێی نەکۆڵراوەتەوە یاخود دانی پێدا نەنراوە، ئەمەیش ئەوەیە کە باوکی فەلسەفەو زانستە ئینگلیزیەکان لە ڕاستیدا قوتابیەکی دڵسۆزی فەرهەنگی عەرەبی ئیسلامییە. ((بیکۆن)) زۆر کاریگەر بووە بە بیریارە موسڵمانەکان بەتایبەتیش ((ئیبن سینا))، ((بیکۆن)) بە مەزنترین فەیلەسوفی داناوە کە لەدوای ((ئەرستۆ))وە دەرکەوتبێت[٣]. ڕەنگە لەمەیشدا تەفسیری تایبەتمەندیەکانی فیکری ((بیکۆن)) ئامادە بێت کە ((ڕێگای سێیەمی )) دامەزراندو، بۆیە مۆرکی ژیانی فیکری و کرداری لە ئینگلتەراداو وای لێکرد کە جیاواز بێت لە هەموو هاوشێوەکانی لە وڵاتەکانی تری کیشوەری ئەورووپیدا[٤]، بەڵگەیەکی دیکەش هەیە لەسەر ئەوەی کە هەتا ئەمڕۆکە بارودۆخی فیکری لەم ڕەوتە لاینەداوەو ئینگلتەرا هێشتا هەر بۆ ڕۆحە فیکریە تایبەتیەکەی دڵسۆزە، بەڵگەش کەسێتی پیاوێکی دیکەی مەزنە کە ئەویش ((جۆرج برناردشۆ))یە. ((شۆ)) شاعیرو سیاسیش بوو، لەیەك کاتیشدا

---

[٣] / بڕوانە: (برتراند رسل) Bertrand Russell; History of the WesternPhilosophy....pp.452-453.
دەستەواژەیەکی هاوشێوە لای ((کارل پرانت)) هەیە کە دەربارەی ((ڕۆجەر بیکۆن))ە، وتوویەتی ((هەموو دەرەنجامەکانی زانستە سروشتیەکان کە بۆ ئەو دەگێڕدرێتەوە خۆی لە عەرەبەوە وەریگرتوون)).
بڕوانە:((کارل پرانت)) .. Karl Prant;Geschichte der Logic, III (Leipzig: np,1972), p.121

[٤] / ((برتراند رسل)) بۆ تەفسیری ئەم دیاردەیە دەڵێت: ((ڕق لێبوونی مرۆڤی ئینگلیزی بۆ تیۆرە هەمواندنیەکان (النظريات التعميمية) بۆ ئەزموونە سلبیەکەی لەجەنگە ئەهلیەکاندا دەگەڕێتەوە. ململانێی نێوان پاشاو پەرلەمان لەماوەی جەنگی ئەهلیدا بەسیفەتێکی یەکلاکەرەوە مەیلی بۆ ڕێگاچارە ناوەندەکانی بەکەسی ئینگلیزی بەخشی، هەروەها ترسیشی لەوەی کە هیچ تیۆرێك بەرەو ئەوپەڕی دەرەنجامە لۆژیکیەکانی بەرێت، ئەمەش هەتا هەنوکەیشی هەر زاڵە بەسەر فیکری ئینگلیزیدا ))، بڕوانە: ((برتراند رسل))، سەرچاوەی پێشوو، ل: (٦٢٥).

بانگەشەی بۆ سۆشیالیزم‌و ئازادی فەردیش دەکرد، تا ئەوەی هی وا هەبووە وەسفی کردوە بەوەی ((یەکە یەکە لە دژگەلێك کە دووبارە نابنەوە))، مەبەستی ئەوەیە کە ((شۆ)) کەسێتی نوکتەبازی‌و سۆفی‌و، هەروەها کەسێتی رەخنەگرێکی کۆمەڵایەتی توندو میثالیەکی هەرگیز چارەسەر نەکراویشی لەخۆیدا کۆ کردبوویەوە.

با لەم حەقیقەتە رابمێنین. لە کیشوەری ئەوروپیدا ـ وەك رێسایەکی گشتی ـ زانای ئەزموونگەر (العالم التجریبي) هەمیشە بێباوەڕ (ملحد) دەبێت. بەڵام لە ئینگلتەرادا، ((جۆن لۆك))ـ باوکی مێتۆدی ئەزموونەگەری ـ ((خودا))ی لەسەنتەری تیۆرە ئەخلاقیەکەیدا داناوە،ئەو بەشەوقی قەشەیەکەوە بەرگری لە رۆڵی حەرامکراوەکان (کە دەرەنجامی پاداشت و سزای قیامەتن) لە بونیادنانی بنچینەکانی ئەخلاق دا دەکات و ((جۆن لۆك)) دەڵێت : ((ئەگەر هەموو هیوایەکی مرۆڤ لەم جیهانەدا کورتببێتەوەو، ئەگەر ئێمە لێرەداو تەنیا لەم دنیایەدا چێژ لە ژیان بکەین، ئەوا سەیرو نالۆژیکی‌یە کە بەدوای بەختیاریدا بگەڕێین‌و لەهەمو ئەوشتانە دووربکەوینەوە کە ئەم ژیانەمان لێ تەنگ دەکەن‌و، تەنیا هەوڵ بۆ ئەو شتانە بدەین کە چێژمان دەست دەخەن. ئەگەر لەدوای گۆڕەوە هیچ شتێك نەبێت، ئەوا ئەم دەرەنجامە مسۆگەرە: لێمان بگەرێن بابخۆین‌و بخۆینەوە، لێمان بگەڕێن با لەزەت لەو شتانە بکەین کە بەختیارمان دەکەن، چونکە ئێمە بەیانی دەمرین))[5]. لەپاشاندا ((جۆن لۆك)) ئەزمونگەری گەورە بەدرێژی دەست بەبەڵگە هێنانەوەی لەسەر بوونی خوا دەکات[6]. هەروەها (هۆبز Hobbs ــ کە ماتریالێکی پۆزەتیڤیشە (وضعي) ـ بەڵگەهێنانەوە بۆ هەماهەنگی لەنێوان یاسا سروشتیەکان‌و کتێبی پیرۆزی خستۆتە سەرشانی خۆی[7]. ئەمەش بەتەواوی لەگەڵ رێبازی بیرکردنەوەی ئینگلیزیدا گونجاوە. بیریارە ئەوروپیەکان بە تێکرا رایانگەیاند کە هەڵوێستی ((لۆك)) ناکرێ بەرگری لێبکرێت. لەگەڵ ئەوەشدا ئەم حەقیقەتە لەجێی خۆیدا دەمێنێتەوە کە

---

٥ / بروانە: ((جۆن لۆك)). John Locke;......Human Understanding,Book II, Chapter 23.

٦/ هەمان سەرچاوە، کتێبی چوارەم لە ژێر ناونیشانی : .((Our Knowledge of Gods Existance))

٧ / بروانە: ((جۆن لۆك)). John Locke; De Cive, Chapter Iv.

فەلسـەفەکەی ئـەمو هـی ((بیکـۆن)) و ((هـۆبز))یـش ـ خولقێنـەری جـەدەلن ـ خـاڵی لێـوە دەرچوونن لە پەرەسەندنی فیکری و کۆمەڵایەتی ئینگلیزیدا.

دژایەتی توندی نێوان سروشت و ئەخلاقی کە دەروازەی مەسیحی پێ دەناسرێتەوە وای لێهاتووە، گونجاندنی نێوانیان لای ژمارەیەك لە بیریارە ئینگلیزەکان شتێکی مومکینـە هـەتا ((شافتسـبری)) Shaftesbury هـات کەبەتـەواوی بەسـەر ئەم دژیەکیەدا زاڵبـوو. لای ((شافتسبری)) رەوشت حاڵەتیکە لە هاوسەنگی لەنێوان منخوازیو ئەوخوازی ((الأنانیة و الغیریـة))دا، ئـەم هاوسـەنگیەش دەکرێـت لـەناو ببرێـت لەهـەردوو حاڵـەتی زاڵبـوونیو لەسـنوور دەرچـونی لایەنـە منخوازیەکـە یـاخود زیـادرەوی لـە هەسـتە ئـەو خوازیەکانـدا رووبـدات، (ئەمـەش دەنگدانـەوەی هەڵوێستی ئەرستۆییانەیە لەئەخلاقدا، هـەروەك چـۆن هاورێکە لەگـەڵ مانـای چـەند ئایەتێکی قورئانیشـدا)، ئـەوەش کە بە ((فەلسـەفەی هەسـتی ئینگلیزی هاوبـەش)) نـاوزەد دەکرێـت ئینتیمـای بـۆ هـەمان ئەم هەڵوێستە هەیـە، هـەروەها هاوکێشـەی((جـۆن ئیسـتیوارمیل))ش بـۆ گونجانـدن لـەنێوان تـاكو کۆمـەڵگادا. دەتوانرێـت ئامـانجی ((قوتابخانـەی کامبریـدج))ی بـەناوبانگ بەوردی دیـاری بکرێـت بـەوەی کـە ((بـە عەقڵانی کردن))ی لاهوتە. ((یـودل)) لەمـەڕ ((کـە دویـرث))ەوە ـ کە نوێنـەرێکی دیـاری ئـەم قوتابخانەیـە ـ دەڵێـت :((پەیوەنـدی پتـەوی نێـوان فەلسـەفەو ئـایینو، فیکـرو ئیمـان، خاسیەتێکن لەخاسیەتەکانی قوتابخانەی کامبریدج)).

((لـەم سیاقەوە دەکرێ تێبگـەین چـۆن پیـاو خـۆی ـ یەکـەمجار وەکـو فەیلەسوفێك ـ بـە توانابووە لـە جەختکردنـەوە لەسـەر ئـەوەی کـە بـە هێـزی جـەخت بکاتـە سـەرئەوەی کـە : بنـەمای عـەقڵانی بـۆ ئـەخلاق لـە خـۆیدا بەسـە، ئینجا ـ وەك ئامۆژگاریکـەرێکی ئاینیـەش ـ بەهـەمان هێزەوە ئاماژە بەزەروورەتی بالأبوونی ئاینی دەکات. بـەو جـۆرە دەبیـنین خـاوەنی فەلسەفەیەکە پێداویستیە ئاینیەکان تێر دەکاتو، ئاییینیش دەگونجێت لەگـەڵ عـەقڵداو بـە هەستێکی گەرمەوە دەچێتە دڵەکانەوەو دەیگرێتەوە[8]))؟.

عەقڵی ئینگلیزی بەخولقاندنی تیۆری ئەخلاقی پراگماتی خۆی تێپەراندووە. یان وەك هەنـدێك وەسـفی دەکـەن بـەوەی کـە ((بازنـەی چوارگۆشـەیە))و هەنـدێکی دیکـەش بـە

---

٨ / بروانە: ((فریدریك یۆدل)) Frederich Jodle: The History of Eohics, p.145

((ئەخلاقی پراگمایانەی ئینگلیزی)) ئاماژەی پێ دەکەن، بە هەرحاڵ نموونەیەکی (نمطي) بیرکردنەوەی ئینگلیزیانەی پوختەخوازانەی دانەرانەیە. ئەم تیۆرە مۆرکێکی لاهوتیانە (ئاینیانە)ی لەپەرەسەندنە دواینیەکانیدا وەرگرت و وەك ئاراستەیەکی نوێ لەژێر ناوی ((پراگماتیزمی لاهوت))دا دەرکەوت. ((بتلەر))یش ئینتیمای بۆ ئەم ئاراستە هەیە بە جەخت کردنی لەسەر ئەوەی کە ((ویژدان و خودپەرستی)) ـ ئەگەر بەدروستی لێیان تێبگەین ـ یەك رێگە بەرەو بەختیاری دەگرنە بەر، هەروەها(هارتلی))ش ئینتیمای بۆ ئەم رەوتە هەیە، کە خاوەنی ئاراستەیەکی مادییە لە سایکۆلۆژیادا، بەڵام لەهەمان کاتیشدا بیرۆکەکەی جەخت لەسەر خوداو باوەڕبوونی بە نەمری دەکاتەوە. هەروەها هەتا رادەیەکیش بیرۆکەکانی هەریەك لە ((واربرتۆن)) Warburton و ((ریچارد پرایس)) Richard Priceو ((پالی)) Paliیش ئینتیمایان بۆ ئەم رەوتە هەیە. بیرۆکەی (پالی)) لەمەڕ ((ئیرادەی ئیلاهی))و گونجانی لەگەڵ بەرژەوەندیەکانی بەشەردا لەسەر تێبینیەکانی دەربارەی سروشت وەستاوە. ئەمەیش میتۆدێکی ئیسلامیانەی رووتەو ئایەتگەلێکی زۆری قورئانی پیرۆزمان دەخاتەوە یاد[9]. لەنێوان ئەم ئەستێرانەی پیاوانی فیکری ئینگلیزی، خاوەنانی ((رێگەی نێوەند))، ناوێك لەناو درەوشاوەترینیاندا بەدی دەکەین کە ئەویش ((ئادەم سمیث)) Adam Smitho ((ئادەم سمیث)) دوو کتێبی داناوە کە دژایەتیەکی رواڵەتیان لەنێواندا هەیە بەڵام لە رووی ناوەڕۆکەوە تەواوکەری یەکترین. یەکێك لەم دوو کتێبە ((تیۆری هەستە ئەخلاقیەکان))ە Theory of Moral Sentiments، دووەمیشیان بریتی‌یە لە کتێبی ((تۆژینەوەیەك ـ دەربارەی سروشت و هۆکارەکانی سامانی نەتەوەکان)) An Inquiry into the Nature and Causes of the Wealth of Nations.

کتێبی یەکەمیان بەکاریگەرترینی کتێبەکان دادەنرێت لەسەر فیکری سەدەی هەژدەهەم. کتێبی یەکەم بابەتی ئەخلاق چارەسەر دەکات و پرەنسیپی هاوسۆزی بەخاڵی دەست پێکردن دادەنێت. بەڵام کتێبی دووەم، لە ئابوری دەدوێت و پرەنسیپی ((خودپەرستی: الأنانية)) بۆ ئایدیا سەرەکیەکەی بەکاردەهێنێت. ئەمەش وامان لێدەکات

---

٩ / بڕوانە: ((پالی)) Pali; Natural Theo logy

باوەڕ بەوە بکەین کە ئەم دوو کتێبە دژی یەکترن. بەڵام ئەمە ڕاست نییە، چونکە ((سمیث)) ـ کە لە زانکۆی ((گلاسگو)) مامۆستا بووە ـ وانەی ئەخلاق و ئابووری و سیاسەتی وەك چەند بەشێك لە بەرنامەیەکی تێروتەسەل لە فەلسەفەدا دەوتەوە.

لەگەڵ ئەمەشدا، ((سمیث)) لەکتێبەکانیدا ڕاشکاوانە، ئاماژەی بە پەیوەندی نێوان زانستی ئەخلاق وسامانی نەتەوەکان کردووە، لە کتێبەکەیدا ((تیۆری هەستە ئەخلاقیەکان)) دا دەڵێت: ((هەریەك لە ئەنانیەت و هەستە ئەخلاقیەکان حەقیقەتگەلێکی واقیعین، لە ئابووری گەردوونی پرۆژەی ئیلاهیدا هەردوکیانی بەلاوە مەبەستن، مرۆڤ بە یەکێك دەژمێرێت کە (کۆکەرەوەی نێوان ئەمیان و ئەویانە) و ناتوانێت لە ژیانی ئابووریدا شتێکی جیاواز بێت لەوە.

((توتومیانك)) چەند بۆچوونێکی دەربارەی ئەو ناکۆکیە خستەڕوو کە بەشتێکی ڕەگ داکوتاوی دانا لە چەند بەشێکی جیاوازی کارەکانی ((سمیث))دا، لای ئەوروپیەکانیش هەستێك سەبارەت بە قورئان و ئیسلامیش ئامادەیە، (بەڵام گرفتەکە لە کورت بینیدا خۆی حەشارداوە نەك لە ناکۆکی فیکردا). ڕقی ((ئادەم سمیث)) و ((هیوم)) لەدامەزراوی ئاینی و سیستەمە ئەکلیرۆسیەکەی لەگەڵ هەڵوێستی ئیسلامیدا هاوڕایە.

دەکرێت واخەیاڵ بکەین کە کتێبەکەی ((هربرت سپنسەر)) Herbert Spencer لە پەروەردەدا یەکێك لە موسڵمانەکان دایناوە (لەمەشدا ناتەواویەك نابینین).

لەگەڵ ئەوەشدا، فیکرێکی ئینگلیزی ڕەسەن، ((سپنسەر)) دەڵێت: ئەخلاق لەجەوهەریدا حاڵەتێکە لەگونجان لەنێوانَ تاك و کۆمەڵگادا، دوو ئاراستەی هاوزەمەنیش بۆ پەرەسەندن لەئارادان، زیاد بوون لەفەردانیەتداو زیادبوون (لەسەریەك وەستان) (واتە گەشەی لایەك لەسەر گەشەی لایەکی دیکە وەستاوە).

لەکاتێکدا کە لە فەرەنسای کاثولیکدا ململانێیەکی توند لەنێوان قوتابخانەی ڕۆحی و قوتابخانەی (وضعي)دا هەر بەردەوامە، ئەخلاقناسی ئینگلیزی هەماهەنگی لەنێوان پرەنسیپی بەرژەوندی و پرەنسیپی ویژدان (الضمیر)دا دەکات، بیرۆکەی ((جۆن ئیستیوارت میل)) لەمەڕ ئابوری و سووربوونی لەسەر سازشی نێوان پرەنسیپی تاك و پرەنسیپی کۆمەڵگەداو، و بۆچونەکەی لەوەدا کە سامان گرنگی ئەخلاقی هەیە، زۆرێك

لەگیانی زەکاتی ئیسلامی و ڕێنماییەکانی قورئانی پیرۆزی تێدایە. لێرەدا دەبێت ئاماژە بۆ ئاراستەیەك بکەین کە بە ((میثالیەتی نوێ)) ناوزەد دەکرێت و لەماوەی نیوەی دووەمی سەدەی نۆزدەهەمەوە لە ئینگلتەرادا (لەکارەکانی ((مارتن)) Martin و ((برادلی)) Bradley و ((گرین)) Green و غەیری ئەمانیشدا)) سەری هەڵدا وەك پەرچەکردارێکی فەلسەفەی ئەزموونگەری - ئەمەیش گونجاوە لەگەڵ نموونە ئینگلیزیەکەدا لە بیرکردنەوەدا.

لێرەدا دەمەوێت پارچەیەکی تاڕادەیەکی درێژ لە ژیانی سیاسی ئینگلیزی لە نوسینەکانی ((کروسمان)) Grossman وەربگرین کە نوسەرێکی هاوچەرخی ئینگلیزی و خاوەنی بۆچوونێکی سۆسیالیستیانەیە، دوای ئەوەی ((کروسمان)) ئاماژەی بۆ ئەوە کرد کە هەر جەختکردنێکی سادە کراوە لەمەڕ ژیانی سیاسی ئینگلیزی دەبێت ساختە بێت، دەڵێت:

((بەپێچەوانەی ئاراستەی خاوەنانی تیۆری پراگماتیەوە)) ((پیاوی کار)) لەسەردەمی ڤیکتۆریدا سیاسەتەکەی لەسەر بناغەی ئاین بنیاد دەنا، ئەو ڕقی لە حوکمکردنی کەمینەی ئیستغلال کراو بوو تەنیا لەبەرئەوەش نا کە پاسەوانی دەرەبەگەکانی دەکرد بەڵکو هەروەها لەبەر بێ ئاگاییە زۆرەکەشی بوو هەروەها لە پرەنسیپە ئەخلاقیەکان. وزەی ڕەخنەیش لەسەردەمی ڤیکتۆریدا تەنها ڕووی لە ئابووری ناسی بەرژەوەندی نەکرد بەڵکو ڕووی لە بیرکردنەوەی لاهوتیانەش کرد. ئەوەیش کە چینی ناوەندی ئینگلیزی تووشی شڵەژان کرد کتێبی ((راس المال))ەکەی ((مارکس)) نەبوو بەڵکو کتێبەکەی ((داروین)) بوو سەبارەت بە ((بنچینەی جۆرەکان: أصل الأنواع))، ئەم کتێبە پریشکی شەڕێکی لەجەدەل لەنێوان قوتابخانەی ئۆکسفۆردو ئەوانەی خاوەنی نەزعەیەکی ئاینی بوون هەڵگیرساند)و، چالاکی بەتوانا ترینی عەقڵەکانی لە هەردولادا داگیرکرد. ((گلادستۆن)) بەقووڵی هەستی بەوە کرد کە سیاسەت هەڵبژێردراوی دووەمیەتی لە فەزڵدا لە دوای ئایین لە ڕووی وەڵام گۆیی و ڕێنماییەکانەوە. دەکرێت لەم دامەزراوییە ئەخلاقیە بتەوو متمانە بەخۆ بوونە لە ئینگلتەرای سەدەی نۆزدەدا تێبگەین ئەگەر دەرکی حەقیقەتی ئەو هێزە ئیمانیەمان کرد کە لە پشتیانەوە خۆی حەشارداوە..هەڵوەشاندنەوەی سستمی کۆیلایەتی و، زیندوکردنەوەی پرۆسەکانی بەمەسیحی کردن و، سەرزەنشتکردنی ئیستغلال کردنی

منداڵان لەکارکردنداو، بڵاوبوونەوەی فێرکردنی گشتیو، دەیان بزاڤی دیکەی لەم جۆرە، لە بیروباوەڕێکی سیاسیەوە نەهاتوون؛ هێندەی ئەوەی لە ویژدانێکی مەسیحیانەوە بەرامبەر کۆمەڵگە سەرچاوەی گرتووە..زۆربەی بزاڤە ریفۆرمیستەکانی سەدەی نۆزدەیەم لەم چاوگەوە هاتوون، پاش ئەوەی خەیاڵی جەماوەر جۆشی سەندو بوو بەبەشێك لەبەرنامەی سیاسیەکان.. تەنیا لەسەر بنەمای ئەم باکگراوندەیش بڕوای ئاینیو ریفۆرمە کۆمەڵایەتییەکان دەکرێت وێنەی روخساری دروستی فیکری سیاسی لە بەریتانیادا بگرین[10].

((کروسمان)) لە شوێنێکی دیکەی کتێبەکەیدا دەڵێت: ((دیموکراسیەتی بەریتانی بە توندی پەیوەست بووە بە خەبات لەپێناو ئازادی ئاییندا، لەبەر ئەوە پێگەیاندنی هەستی ئاینی لەشێوە مەسیحیە بنەڕەتیەکەیدا لە پێناو دیموکراسیەتدا بەئاکام گەیشتووەو، سەرکەوتنی لیبرالیزمیش بووە مایەی نوێبوونەوەی ئاین لە ئینگلتەرای سەردەمی ڤیکتۆریدا..ئەمەش نەدەبوو لەهیچ شوێنێکی دیکە رووبدات بێجگە لە ئەمەریکا لەکاتێکدا دەبینین پێشکەوتنو گەلانو دیموکراسیەت لای لیبرالیستە ئەڵمانیو ئیتالیەکان، کۆمەڵە بابەتێکن لە نەزعەی عەلمانیانەدا کورتکراونەتەوە. بڕواداران بە کاثولیکیەت پێیان وایە کە هیچ پردێك لەنێوان ئەو کەلێنە جیاکەرەوەیەی بڕوا بوون بەمەسیحو بڕوا بوون بە پێشکەوتندا نییەو، ئەوانەیش بڕوا یان بە پێشکەوتن هەیە پێیان وایە کە ئاین هیچ پەیوەندیەکی بە دیموکراسیەت یان ئازادییەوە نییە[11])).

تەنانەت سۆشیالیزمی ئینگلیزیش جۆرێکی دیکەی جیاوازە لە هاوشێوەکانی لە ئەوروپادا، سۆشیالیزم لەئەوروپادا زۆر پەیوەستە بەفەلسەفەی ماددیو ئیلحادیەوە، لەکاتێکدا ((لە سەر سەکۆی پارتی کرێکارانی بەریتانیاوە چەند وتەیەك لەکتێبی پیرۆز ((ئینجیل)) دەبیستین، هەمان ئەم وتانە لەبڵند گۆی کڵێساکانەوە لەوێ دەیانبیستینەوە)).

ئەمەیش بە ووتەی یەکێك لە پەیامنێرە رۆژنامەنووسە فەرەنسیەکان کە بە سەرسوڕمانەوە گوزارشت لەمە دەکات. بێگومان نموونەیەکی ئینگلیزی هەیە کەوا

---

١٠ / بڕوانە: ((کروسمان)) Crossman: The Govermernt and Governed (New York: Pice Press, 1969),pp.155-158.

١١ / هەمان سەرچاوە.

دژەکان کۆدەکاتەوە هەروەك ((برتراند راسڵ)) راڤەی دەکات و دەڵێت: ((گرفتی هێنانە کایەی سستمێکی کۆمەڵایەتی ڕەگ داکوتاو و پەسەندکراو دەکرێ بەکۆکردنەوەی نێوان بەهێزی و پتەویی ئیمپراتۆریەتی رۆمانی و میثالیەتی ((ئۆگەستین)) لەکتێبەکەیدا ((شاری پەروەردگار : مدینه الرب)) چارەسەر بکرێت[١٢])) وە لەوەڵامی ئەو پرسیارەشدا کە ئایا بیرۆکەکان جیهان دەگۆڕن یان بەپێچەوانەوە؟ وەڵام دەداتەوەو دەڵێت: ((لەلایەنی منەوە حەقیقەت لەنێوان ئەم دوولایەنەدا لایەنی شلگیریی و پەرگیریەدا حەشار دراوە، لەنێوان بیرۆکەکان و ژیانی کرداریدا ــ هەروەك لە هەرشتێکی دیکەشدا وایە ــ کارتێکردنێکی ئاڵوگۆڕکراو هەیە[١٣])).

دەتوانین لەم روانگەیەوە سەرچاوە رۆحیەکانی پراگتیزمی ئەمەریکی ببینین. دوو لایەنی بوونی فەلسەفەی پراگماتی و، لەخۆگرتنی ئاین و زانست بەیەکەوە بەو مەرجەی کە بەها کردارییەکانیان بیسەلمێنن و، هەروەها تەسلیم بوونیشی بەوەی کە ئەزموونی زیندەگیانی دەبێ بکرێتە پێوەرێك بۆ حەقیقەت ـ هەموو ئەمەش لەکرۆکی فەلسەفەی ئەنجلۆسەکسۆنیدایە ـ و بەگشتی دژیش لەگەڵ ئاراستە ئەورووپییەکەدا دەوەشێتەوە. ((ولیەم جیمس)) جەوهەری ئەم فەلسەفەیە لە کتێبەکەیدا ((پراگماتیزم)) دەخاتە روو کە سێ نموونەی لێ دەخوازین:

((زۆرجار ئێمە چاوەڕێ دەکەین شتە باشەکان لە هەردوو سەری هێڵەکەدابن، ڕاسشتیەکان باشن، هەر بۆیەش ژمارەیەکی زۆر لە پرەنسیپەکان بەئێمەش دەبەخشنەوە جیهان بێ هیچ گومانێك ((تاکێکە)) ئەگەر لەگۆشەیەکی دیاریکراوەوە بۆی بڕوانین، بەڵام هەروەها فرە چەشنیشە ئەگەر لە چەند گۆشەیەکی ترەوە بۆمان ڕوانی. کەواتە لە هەمان کاتدا تاکەو فرەیشە، بۆ ئەوەش جۆرێك لە ((یەکبوون)) مان قەبوڵە کە فرەلایەن بێت. بەڵێ، هەموو شتێك حەتمیەتە، بەڵام هەروەها ئیرادەشمان ئازادە کە ڕەنگە جۆرێك لە حەتمیەتی و ئازادی ئیرادەیش گونجاوترین فەلسەفەی ((مومکین)) بێت. شەڕ لە کائینە

---

[١٢] / بڕوانە: ((بتراند رسل)) لە کتێبەکەیدا:تاريخ الفلسفة الغربية..ل (٥٠٥).

[١٣]/ هەمان سەرچاوە، (٦٢٠).

فەردیەکاندا ناکرێ نکوولی لێ بکرێت، بەڵام ناکرێت هەموو هەر شەڕ بێت...بەم ڕێگایە کەدەگرێت ڕەشبینی کرداری بە گەشبینی میتافیزیکیەوە گرێ بدرێت[١٤]))

((ولیەم جیمس)) لێرەدا هیومانیزمی سروشتیمان لەبەرامبەر دوالیزمیەتدا کە جۆرێکە لە ((ئیسلامی فیطري)) بۆ دەخاتە ڕوو، ئەو وەسفی فەلسەفەکەی دەکات بەوەی ((ناوێکی نوێیە بۆ چەند شێوازێکی کۆن لەبیرکردنەوەدا[١٥])).

((ولیەم جیمس)) بەردەوام دەبێت و دەڵێت: ((کاتێك گیروگرفتێك دەبێت، چ فەلسەفەیەك بۆ چارەسەرکردنی هەڵدەبژێریت؟ فەلسەفەی ئەزموونگەریت پێشکەش دەکرێت و دەبینێت ئەوەندەی کە پێویستە لە ئایینی تێدا نییە بەشی پێداویستیەکانت بکات، فەلسەفەی ئاینیشت پێش کەش دەکرێت بەڵام شتێکی لە ئەزموونگەری تێدا بەدی ناکەیت پێداویستیەکانت تێر بکات[١٦]))، لە پاشاندا دەڵێت گرفتی تۆ بەم شێوەیە: تۆ لەم دوو سیستەمەدا کە بەسەریاندا کراویتەوە هیچ شتێك نابینیتەوە دابڕانێکی تەواو نەبێت کە ڕێگەی یەککگرتنەوەی نییە، ئەزموونێك دەبینێتەوە بەڵام نە مرۆیی و نە ئاینیشە، هەروەها فەلسەفەیەکی ئەقڵیش دەدۆزێتەوە کە بانگەشەی ئاینداری بۆ خۆی دەکات بەڵام نکوڵی هەر پەیوەندیەکی دیاریکراو بە حەقیقەتە واقیعیەکانەوە[١٧]، یان بەخۆشی و ناخۆشیەکانی خەڵکەوە دەکات.

((برتراند راسل)) هاوکێشەیەکی پەسەندکراوی بۆ تێگەیشتنی پراگماتیزم بۆ خستوینەتە ڕوو کە دەڵێت: ((کارە فەلسەفیەکانی ((ولیەم جیمس)) دوو ڕوویان هەیە یەکەمیان زانستی و ئەوی دیکەشیان ئاینی، لەلایەنە زانستیەکەوە دەبینین لێکۆڵینەوەکەی لەبواری پزیشکایەتیدا فیکری بەرەو ئاراستەیەکی ماددی بردووە بەڵام ئەم ئاراستەیەی بەسۆزە ئاینیەکانیەوە کۆنترۆڵ کراوە[١٨]. هەردوو فیکری ئینگلیزی و

---

[١٤] / بڕوانە: (( ولیم جیمس)) William James: Prag Matism (Cambride: Harvard University Press,1978)P.16.

[١٥] / ئەمەیە ناونیشانی ناسەرکی کتێبەکەی ولیەم جیمس ((پراگماتیزم))ەکە لەتێبینی پەراوێزی ژمارە (١٤)دا ئاماژەی بۆ کراوە.

[١٦] / هەمان سەرچاوە، ل (١٧).

[١٧] / هەمان سەرچاوەی، ل (١٩).

[١٨] / بڕوانە: بتراند راسل لە کتێبەکەیدا ((تأریخ الفلسفه الغربیه)) ل (٧٧٤)).

ئەمریکی لە هەمان ئەو دوو گریمانەیەوە هاتوون کە ((رۆجەر بیکۆن))بەر لەحەوت سەدە بونیادی ناون. لەم ماوەیەدا ئەوروپا نیوە بازنەیەکی تەواو سوڕایەوە، کە لەلایەکەوە بە ((توماس الأکوینی))دەستی پێکردو بە (لینین)یش کۆتایی پیێ هات لەلاکەی ترەوە، ئێمە ناتوانین بەشێوەیەکی وردو دیاریکراو باسی ئەوجۆرە لە تێڕوانین بکەین کە پراگماتیزم لەعەقڵی ئەورووپیدا جێی هێشتووە، بەڵام وای دا دەنێنین کە جۆرێك لە بێزاری بەجێ هێشتووە، لە تێڕوانینی ئەورووپیەوە: پراگماتیزم نالۆژیکیەو گونجان‌و دامەزراوی تێدا نی‌یە، ئەمانەیش سیفەتێکن کەبەردەوام ئەورووپیەکان بە ئیسلامیشیانەوە لکاندووە[١٩].

بەڵام پراگماتیزم ئەو سیستمە گەورە فەلسەفیە ئەمریکیەیە کە ئەورووپا نەیدەتوانی دایبهێنێت بەحوکمی سروشتە فیکریەکەی. گومانیشی تێدا نی‌یە کەئەم فەلسەفەیە گوزارشتێکە لە زیندوێتی گەلی ئەمریکی و وزەی لە ڕادە بەدەرەکەی لە هەمان کاتدا.

هاوشێوەیی نێوان بیرکردنەوەی ئینگلیزی و بیرکردنەوەی ئیسلامی دەکرێت لە ڕێگەی زنجیرەیەك لە حەقیقەتی خاوەن دەلالەتەوە بەدوایدا بچین کە تۆژینەوەیەکی سەربەخۆ هەڵدەگرن، شۆڕشی ئینگلیزی ساڵی ١٦٨٨ خۆشی بە پەڕگیری نەدەهات. بەرای ((برتراند راسل)) لە هەموو شۆڕشەکان میانڕەو تربووەو لەهەمان کاتیشدا لەهەموویان سەرکەوتوو تر بوە لە جیهاندا، زۆرێك لە رووداوەکان لەمێژووی سیاسی بەریتانیدا هەرگیز درێژ نەبوونەتەوە تا ئەوەندەی بگاتە ئەوپەڕی ئەنجام‌و شێوە پێشبینی بۆ کراوەکەی، بەڵکو لەناوەندی ڕێگەدا پەکی کەوتووە. لەئینگلتەرادا شۆڕشی دژی پاشایەتی هەڵوەشاندنەوەی پاشایەتی لێوە بەرهەم نەهات، بەڵکو لەویٚ چەند رەگەزێك لە سیستمی ئەرستۆکراتی مایەوە کە شانبەشانی لەگەڵ دامەزراوە دیموکراسیەکاندا دەڕۆیشت.

لە ئینگلیزیدا وشەی ((Minister))ناوەرۆکێکی ئاینی و سیاسیشی پێکەوە هەیە، نازناوێکە بۆ وەزیفەی ((وەزیر)) لەدەوڵەتداو بۆ قەشەیشە لە کڵێسادا، ئێمە لێرەدا رووبەڕوی دوولایەنیەك دەبینەوە لەدەلالەتی زاراوەکانی هەروەك لە زاراوە

---

[١٩] / هەیە پێی وایە ((پراگماتیزم بەشە جێگیرو پەیوەستەکەیە بە دابونەریتەکانی فیکری ئیسلامی لە عەقڵی ئینگلیزیدا)) بروانە ((دراگۆش کلایتش)). Dragosh Kalaich ((Actuality of Islam)) , Delo, Belgrade, No.7,1978,P.62.

ئیسلامیەکانیشدا هەیە، جیاواز لە هەموو دەوڵەتە ئەوروپییەکانی تر، ئینگلتەرا جۆرێك لە باجی داهێنا بۆ بەرژەوەندی هەژارەکان کە بیرۆکەی زەکاتی ئیسلامیمان بیر دەهێنێتەوە، سەیریش نییە، لێکچوویی عەقڵەکان لەبیرکردنەوەدا، لەکاتێکدا ڕووبەڕووی هەمان گرفتی ژیانی کۆمەڵایەتی دەبنەوە، زۆرجار خاوەنی چارەسەری هاوشێوەیش دەبن. شتێکی چاوەڕوانکراویشە کەلە ئایندەدا ئەوروپا هەموو ئەو ئەنجامە پەسەند دەکات کە زانست پێیان دەگات تیایشیدا ئەو دەرەنجامە پەرگیرانەی لە نامرۆی بوونیدا، لەکاتێکدا لە زۆرینەی زۆریدا ئینگلتەراو ئەمەریکا لەرێگەی نێوەنددا دەوەستن، کەئەمەش هەڵوێستێکی پراگماتیە. لە ئەوروپادا ـ گونجاو لەگەڵ هەڵوێستی مەسیحیدا ـ ئاین هەر بە ئاین بوونیو، زانستیش بە زانستیبوونیەوە دەمێنێتەوە، لەکاتێکدا لە ئینگلتەرادا گەورەترین مەحەك بریتیە لە شارەزایی (واتە ژیان).

## ((ڕێکسازیی مێژوویی))و دیموکراسیەتی سۆسیالیستی

ڕووکردنە ((ڕێگای سێیەم)) دەکرێت لەبەشەکانی دیکەی جیهاندا ببینرێت، ئەگەر چی نەزعە جیاوازیش بێت لەگەڵ هاوشێوەکەی لە ئینگلتەرادا. لەئینگلتەرادا ئاراستەکە لەسەر هەردوو ئاستە فیکرو هەستیەکان بەیەکەوە بوونی هەیە، لەکاتێکدا ئاراستەکە لە ئەوروپادا تەنیا وەك زەرورەتێکی کرداری خۆی دەنوێنێت نەك لە ڕووی باوەڕ پێ بوونەوە بێت. ئەم دیاردەیە بەشێوازێکی جیاواز گوزارشت لەخۆی دەکات لەنێوان دەوڵەتە کاثولیکەکانو دەوڵەتە پرۆتستانیەکاندا، لەوێوە کە جەمسەرگیریە عەقیدەیەکە ڕوونتر دەبینن لە دەوڵەتە کاثولیکەکان کە لە ڕووی مێژووییەوە بەهێزتر بوون ئاڕاستە بوونیش بەرەو ڕێگەی نێوەند بەسەختو درامی گوماناوی دەبینین. ڕەنگە ئەم وڵاتانە ـ بەمانایەك لەماناکان ـ بێ توانا بن لە ڕەفتارکردنی ((ڕێگەی سێهەم))دا، ئیتالیاو فەرەنساو ئیسپانیاو پورتوگال (هێشتا هەر) نموونە گەلێکن بۆ چەند کۆمەڵگەیەکی تەواو جەمسەرگیری. ڕای

گشتی لەم وڵاتانەدا دابەشبووە ـ بەشێوەیەکی سازش نەکراو ـ لەنێوان چەند بزاڤو حیزبێکی راستڕەوی مەسیحیو، چەپڕەوی مارکسیدا.

بەڵام رێگە ناوەندەکە، یان زۆر سنوورداره یاخود هەر بەتەواوی لەناوچووە، لەم وڵاتانەدا دوو لە گەورەترینو رەقترین بیروباوەڕ لەمێژوودا پێکدا دەدەن: کاثولیکیەتو شیوعیەت، ئەو ململانێیەش کە بردنەوەی هیچیانی تێدا نییە هیلاکی کردوون. ئیسپانیا لە پێش جەنگی ناوخۆوە راستەوخۆ نموونەیەك بوو بۆ ئەم هەڵوێستە. لە هەڵبژاردنە گشتیەکانی ساڵی ١٩٣٦دا حیزبە چەپڕەوەکان ٥١,٩٪یان بەدەستهێنا و راست ڕەوەکانیش ٣٤,٢٤٪و نێوەندەکانیش تەنیا ٤,٨٦٪یان لەکۆی دەنگی هەڵبژێراوەکان بەدەستهێنا[٢٠*]. لە ئیتالیای ئەمرۆکەشدا خەریکە هەڵوێستەکە هاوشێوەی هەڵوێستەکەی ئیسپانیا بێت، هەروەها لەفەرەنساش هەمان ئەم جەمسەرگیریە گشتگیرە دەبینینەوە.

توانەوەی ناوخۆیی لە هەر یەکێك لەم دوو بیروباوەڕەدا، لە زنجیرەیەك نیشانەدا دەبینرێت، یەکەم نیشانەیان گفتوگۆی نێوان مارکسیەکانو کاثولیکەکانە کە بە پارێزەوە لەشەستەکاندا دەستی پێکرد[٢١]. ئەم دیالۆگە نەرۆکانە نموونەیەکن بۆ عەقڵیەتی ئەورووپیو پەیوەندیەکان لەسەر ئاستی ئایدۆلۆژی لەنێوان مارکسیەتو ئایندا. ئەم پەیوەندیە پێکدادەرانەیە هەر بەردەوام بوون بەبێ وەستان لەماوەی سەدەیەك لە زەمەن بەبێ ئەوەی هیچ یەکێك لەدوو لایەنە دەستپێشکەرییەکی سازشکارانە بۆ بەرامبەرکەی بێتە ڕوو. ئەمەش نیشانەیەکە لە نیشانەکانی شکست کە ئەنجامی سوور بوونە لەسەر رێکخستنی ژیان لەسەر یەك پرەنسیپی ڕەهاو یەکلایەن. مارکسیزم ناچاربوو پاشەکشە لەگوتەزا مێژووییە تەقلیدیەکەی خۆی بکات لەوەی کە ((ئایین تلیاکی گەلانە))و،

---

[٢٠] / لەکاتی نوسینی ئەم دێرانەدا ئیسپانیا خۆی بۆ یەکەم پرۆسەی هەڵبژاردنی ئازاد ئامادە کرد هەندێك لەخەڵکی باوەڕیان وایە گەلی ئیسپانی بۆ یەکەمجار لە مێژوویاندا نێوەند هەڵدەبژێرن کە ئەمەش روویدا، ئیدی دۆگماتیستە راستەڕوو چەپڕەوەکانیش هەردووکیان پێکەوە شتێك تێدەگەن.

[*] / چەپڕەوەکان بە سەرۆکایەتی ((جۆنزالین)) بردیانەوە کەسیش هیچ فێر نەبوو. (وەرگێڕی ع).

[٢١] / وەکو بزانم یەکەم گفتوگۆی لەم جۆرانە لە سالزبرج بەسترا ساڵی ١٩٦٥ بە دەستپێشکەری لاهوتیە کاثولیکیە لیبرالیستەکان لە ئەڵمانیای رۆژئاوا، ئینجا لەدوای ئەوە بوو بەگشتی.

کاتولیکیەتیش بەناچاری دانی بەوەدانا کە ئامانجی مارکسیزم پەرەپێدانی سستمێکی دادگەرانە ترە.

لەرەوتی دیالۆگی نێوان هەردوو لایەنی مارکسیو کاتولیکی کە کۆمەڵەی (( Paulus Gesellschaft Society)) پێی هەستا نوسراوێك پێشکەشکرا بەناونیشانی: ((خۆشەویستی مەسیحی بۆ رەگەزی مرۆیی و هیومانیستی مارکسیزم)). لەکۆبونەوەی ((سالز برج))یشدا مارکسی بەناوبانگ ((رۆجیە گارودی**)) وتی: ((لەدایك بوونی مەسیحیەت بۆ یەکەمجار لەمێژوودا بانگەشەی کۆمەڵگەیەکی بێ سنووری لەگەڵ خۆیدا هێنا، بۆ گشتگیرییەك کە هەموو گشتگیریەکان لەباوەش دەگرێت، ئەمەش بە بەرز راگرتنی خۆشەویستیەکە ئەو چەمکەیە مرۆڤی لە رێگەوە خولقاندوو مرۆڤ بەیارمەتی ئەوانی دیو لە رێگەیانەوە بە خۆی ئاشنابوو.. ئەمەش مەزنترین وێنەیە کە مرۆڤ توانیویەتی بۆ خۆی و ئامانجی ژیان بیکێشێ)). - ((بالیمرو تولیاتی)) - سەرۆکی حیزبی شیوعی ئیتالی - جەختی لەسەرئەوە کردەوە کە مارکسیزم پێویستە هەڵوێستی لەبەرامبەر ئایندا بگۆڕێت و داوای لە مارکسیستەکانیش کرد بۆ دەستپێشکەری لە روانین لەم زەروورەتەدا. لەلایەکی دیکەشەوە، لەرێو رەسمە پاپاییەکاندا گوێمان لە نەغمەیەکی زۆر نوێ دەبێت، کە داننانە بە ئەولەویەتی موڵکایەتی کۆمەڵایەتی بەسەر موڵکایەتی فەردیداو هەروەها مافی دەسەڵاتی گشتیش بۆ دەستخستنە ناو ئابوریەوەو مەشروعیەتی چاکسازی کشتوکاڵیو خۆماڵیکردن بۆ بەرژەوەندی کۆمەڵگەو، پاڵپشتیکردن بۆ بەشداری کرێکاران لە بەرێوەبردنی بەرژەوەندیەکانیاندا...شتانی تریش[٢٢].

لە کۆبوونەوەی بیستو دووەمی کڵێسای کاتولیك (لیژنەی دووەمی ڤاتیکان)دا ئەو ئیدانەکردنە تەقلیدیانەی ئاراستەی مارکسیەت دەکران نەمان. لەئەنجامی روانین لە

---

** / ((رۆجیە گارودی)) موسڵمان بوو و وازی لە شیوعیەت هێناو ئێستاش ناوەکەی بووە بە : ((رجاء گارودی)). (وەرگێڕی ع).

٢٢ / پاپا ((پۆڵسی دووەم)) بە بۆنەی سەردانی بۆ وڵاتە یەکگرتووەکان لەساڵی ١٩٧٩دا رایگەیاند ((کە هەرەشە کردنی رێکخراو لەمافەکانی مرۆڤ بەدابەشکردنی کاڵا ماددیەکانەوە پەیوەستە))و ئەوەی دووربینیەکی هەبێت لە سروشتی مەسیحیەتدا دەتوانێت ئەوە ببینێت کەبرێك لە گۆڕانکاری تێدا ئەم دەستەواژەیەی لێهەڵپێچراوە.

هەندێك لەو ڕاپۆرتانەی ئەم کۆنگرەیە، دانی بەوەدا ناوە کە هەڵوێستی ڕۆحی پەرگیرانەی کاثولیکن ناکرێت دەستی پێوە بگیرێت، هەروەها کاودینالْ ((شاردان)) Chardan ووتی: ((بە بڕوای من جیهان دەتوانێ خۆی لەگەڵ هیواکانی مەسیحیەتدا بسازێنێت، بە مەرجێك ئەگەر مەسیحیەتیش لەگەڵ هیواو ئومێدەکانی ئەم جیهانەدا خۆی سازاند، تەنها لەم ڕێگایەوە دەتوانرێت ئەم جیهانە بکرێت بەسەر زەمینی خودا))، ئایا لەم قسەیەدا ئاماژە بۆ ((بەئیسلام کردنی مەسیحیەت)) لە ئارادا نی‌یە؟.

هەروەك چۆن کە هەندێك لە ئاماژەکانی گۆڕان لە فەرەنسادا دەیسەلمێنێت کە دیدو تێڕوانینەکان تێکەڵاو لێك گرێ دراون. لە ساڵی ١٩٧٧دا لیژنەی هەمیشەیی قەشە (الأساقفه)) فەرەنسیەکان بڵاوکراوەیەکیان دەرکرد بەناونیشانی ((مارکسیزمو مرۆڤو بیروباوەڕی مەسیحی)) کە قەشەکان تێیدا جەختیان لەسەر شکستی سیاسی کۆمەڵایەتی لیبرالی کردەوە، هەروەها دانیان بەوەدا نا کە ((مارکسیزم پێکدێت لە بەشێك لەو حەقیقەتەی کە ناتوانین فەرامۆشی بکەین))، بەر لە ساڵێکیش ((جۆرج مارشیە)) Georges Maurchais سەرۆکی حیزبی شیوعی – لە بانگەشەکەیدا کە بە ((بانگی لیۆن)) Lyon Aepeal ناوزەد کراوە رایگەیاندو وتی: ((ئامانجمان ئەوەیە مارکسیستەکانو مەسیحیەکان وا لێبکەین هەریەکەیان دان بەوی دیکەیاندا بنێت، هەر یەکێکیشیان ڕێز لەڕەسەنایەتی ئەوی دیکەیان بگرێتو، هەموان بەیەك ڕیز بوەستن لەهەڵمەتی بیناکردنی کۆمەڵگایەکی مرۆیانەتردا)). دەکرێت بەوێنەیەکی پتر درامیەوە لە ئیتالیادا تێبینی ئەم دیاردەیە بکرێت، لەدوای ساڵگارێکی دوورودرێژ لەپێکدادانی توند، حیزبی شیوعی ئیتالی بڕیاری دا کە هەنگاوێکی لۆژیکیانە بهاوێژێت ـ ئەگەرچی چاوەڕوان نەکراویش بێت ـ بانگەشەی ((ڕێکسازیەکی مێژوویانە)) بکات. ئەگەر تێڕوانینەکەیشمان دروست دەربچێت، ئەوا ئەم بانگەشەیە بزاوتنێکی تەکتیکی رووتی خاوەن ئامانج گەلێکی کاتی نی‌یە، بەڵکو تەنیا پێشنیارێکی دڵسۆزانەی هەڵقوڵاوە لە هۆشیاری بەوەی هیچ دەرچەیەك نی‌یە جگە لەسازش کردن ئاشت بوونەوە. کاتێك حسابەکانیش ئەنجامدرانو هەواڵەکان هێدی بوونەوە هەموان وونو بوونو تەنیا دوو هێزیان لە گۆرەپانەکەدا بەجێهێشت، ئەگەر لەدەرەوە بۆمان ڕوانین ئەوا ئەم دوو هێزە : مەسیحیە دیموکراسیخوازەکان و

شیوعیەکانن و، ئەگەر لەناوەشەوە سەیرمان کردن: ئاین‌و ماتریالیزمن‌و، ئیتالیاش لەمەدا دەبێتە ئەزموونێکی گرنگ سەبارەت بەداهاتووی‌بەشێکی گەورەی ئەم جیهانە[٢٣*].

ئەوەی ئەمڕۆ بە ((شیوعیەتی ئەوروپایی)) ناوزەد دەکرێت گوزارشتە لە نەزعەی جەمسەرگیری کردن لەکۆمەڵگە کاثولیکیە ئەوروپیەکاندا (ئیتالیا و فەرەنسا و ئیسپانیا). دیاردەکە نوێیە بەڵام بە تەواوی روون بۆتەوە، بەو مانایەی یەکسانە بەمارکسیزم دیکتاتۆریەتەو دیموکراسیەتیشی بۆ زیادەکراوە. ئەمەش بە بەزاندنێك دادەنرێت لەئەوپەری چەپی پەڕگیرەوە (پەرژینکراو بە دیوارێکی دۆگماتیستانە) بەرەو ئاراستەیەکی ناوەند[٢٤].

بەم شێوەیە، لە ژێر فشاری واقیعدا، شیوعیەت دەسبەرداری هەڵوێستە رەق هەڵهاتووەکەی دەبێتەوەو چەند ئایدیایەك قبوڵ دەکات کە لە جەوهەردا (میثالین) لە وێنەی ئازادی‌و فرەحیزبی. ئەمەش مانایەکی روونی لەرێکسازی بە ((شیوعیەتی

---

[٢٣]/ لە دەستوری حیزبی شیوعی ئیتالیدا بڕگەیەك هەیە کە بوونی لەم کاتە زووەدا بەخەیاڵدا نەهاتوو بوو کە دەڵێت: ((دەکرێت ئەندامانی حیزب لەنێوان ئەوانەدا بێت کە بەرنامەی حیزب پەسەند دەکەن بەچاوپۆشی لە بیروباوەرە ئاینی‌و فەلسەفەیەکانیان)) (بەندی دووەم لەدەستووری حیزب). لەگەڵ ئەوەشدا کەحیزبی شیوعی ئیتالی هەڵوێستی خۆی سەبارەت بەئاین گۆڕی بەڵام زۆرینەی حیزبە شیوعیەکانی تر هێشتا هەر خۆیان بەجۆرێك لە ئیلحادی مردار بوەوە هەڵواسیوە. وا دیارە ئەم حاڵەتەش لەوڵاتە دواکەوتووەکانداو لەوانەشدا کە کەمتر پێشکەوتوون رون بێت، لەگەڵ ئەوەشدا پەرەسەندن هەر بەردەوامە.

* / تەنانەت لەدوای ئەو بوومەلەرزەیەش کە تووشی سستەمە شیوعیەکان بوو لەبلۆکی خۆرهەڵاتیداو، لەدوای شکستی تیۆرە مارکسیەکاندا، دەبینین لەوڵاتە موسڵمانەکاندا هێشتا زۆرێك لە مارکسیەکانی ئێستا دەبینین کە شانازی بەخراپەوە دەکەن، بێئاگا لەحەقیقەتی ئەو وەهمەی کە ماوەیەکی زۆرە بەسەریاندا زاڵ بووە، بەڵام هەندێك لەزیرەك‌و هەلپەرستەکانیان بەلای دوژمنی دوێنێدا بایانداوەتەوە کە ((سەرمایەداری))یە، یان لانی کەم چاویان لەئاست خراپەو ئیمپریالێتیەکەیدا نووقاندووە، هیچ شتێك لەشوێنەواری دڵسۆزییان بۆ مارکسیەت نەماوەتەوە ئیلحادو دوژمنایەتیکردنی ئیسلام‌و هەموو ئەو شتانەش نەبێت کە بەئیسلامەوە پەیوەستن. (وەرگێڕی ع).

[٢٤] / هەمان مانا بەسەر وەلانانی ((شۆڕشی رۆشنبیری)) لەچین دا پراکتیزە دەبێت لەدوای مەرگی ((ماوتسی تۆنگ))ەوە، شۆڕشی رۆشنبیری ترسناکترین هەوڵی شوێنەوار دوور بوو بۆ گەیشتن بەمێنانەدی کۆمەڵگەیەکی میثالی تۆباوی. بەڵام شکستی خۆی سەلماند چونکە چین نەیتوانی لەسەر یەك پێ بوەستێت، مەبەستم ئەوەیە لەسەر چەپڕەویە پەڕگیرەکەی دە ساڵ بوەستێت. ئەوەش کە بەدوای ئەوداهات‌و ئەو گۆڕانکاریە ناچاریەبوو بۆ حاڵەتێك کە لەحاڵەتە سروشتیەکەوە نزیکترە، ئەگەر ئەو زاراوانەیشمان (راست ـ چەپ) بەکارهێنا کە لەسەریان راهاتووین ئەوا جووڵەیەك لەچەپەوە بەرەو نێوەند لەچیندا بەدیدەکەین.

ئـەورووپایی)) بەخشـی جیـاوازیش لـەنێوان ((شـیوعیەتی ئـەورووپایی))و ((ڕێکسـازی مێژووییانە))دا ئەوەیە کە ئێمە لە حاڵەتی یەکەمدا مامەڵە لەگەڵ شیوعیەتێکی ڕاستکراوە یان شیوعیەتێکی ڕێککراوەدا دەکەین، لە حاڵەتی دووەمیشدا مامەڵە لەگەڵ شیوعیەت و مەسیحیەتدا دەکەین وەکو دوو هێزی یەکسان[٢٥].

بەڵام ((ڕێگـەی نێوەنـد)) شتێکی تـرە لەکۆمەڵگە پرۆتستانیەکاندا ((ڕێگـەی سێیەم)) خۆی لە گەشەکردنی حیزبەکانی نێوەنددا لە ژیانی سیاسی ئەم کۆمەڵگانـەدا دەردەخـات. ئەم وڵاتانـە مەسیحیەتی ڕووت (مجرد) یان ڕەفز کرد، هەروەك چۆن حکومەتـە شیوعیە (ئەبستراکت) کانیشیان ڕەفز کـردو، مەیلێکی بـەردەوام بـەرەو چارەسـەرەکانی نێوەنـد بـە دیارکـەوت. ئـەم ئاراستەیە بەشێوەیەکی تایبـەت لەبانگەشـەکردنی زیـاتردا بـۆ ((سۆشـیال دیموکرات)) ڕەنگ دەداتەوە. وڵاتە پرۆتستانیەکان لە دیموکراسیەتی سۆسیالیستیدا ئەو چارەسـەرەیان دۆزیـەوە کـە وڵاتـە کـاثولیکـەکان لـە ((ڕێکسـازی مێژووییانـە))دا هـەوڵی دۆزینـەوەی دەدەن. ئـەو دیموکراسـیەتە سۆشیالیسـتەی لـە ئـەورووپادا ((ڕێگـە چـارەی نێوەند)) دەگەیەنێت، لـەنێوان لیبراڵیەت و دەست تێخستنی ـ کۆمەڵایـەتی و هەروەها لـە نێوان نەریتـەکانی مەسیحیەت و مارکسیزمدا، بزاوتەکەی لەماوەی قۆنـاغی دوای جـەنگی جیهـانی دووەمـەوە لـە هـەموو جێگایـەکی دنیـادا گەشـەی کـرد[٢٦]. دەتـوانین ئەمـەیش لـە دەرئەنجامـەکانی ئـەو هەڵبژاردنـە گشـتیانەدا بەدیبکـەن کـە لـەدوای جەنگـەوە ڕاستەوخۆ پیادەکران، ژمارەی ئەو دەنگانەی ((سۆشیال دیموکرات)) بەدەسـتی هێنـان ڕووی لـە زیـاد بوون بـوو لە هەموو ئەو وڵاتـانەدا کە هەڵبـژاردنی ئازادیـان تێدا پیـادە کـراوە، بۆ نموونـە زیادبوونی ٢٢٪ی دەنگەکان لە سوێددا دەبینین، ٣٦٪ لە دانیمارکدا، ٥٤٪ لـە هۆڵەنـداداو ٢٧٪ لە نـەرویج و پتر لـە ١٠٠٪ لـە ئـەڵمانیای ڕۆژئاوادا (بـەر لـە یـەککرتنی) و ٣٤,٨٪ لـە

---

[٢٥] / هەنـدێ لەحیزبـە شـیوعیەکان زاراوەی ((دیکتاتۆریـەتی پرۆلیتاریـا)) یـان لەهـەموو دیکۆمێنتـە حیزبیەکانیاندا لابرد.

[٢٦] / دەوڵەتە ئایدۆلۆژیە هەرە دەمارگیرەکان مەسەلەکان لـەژێر ئەم ڕۆشنایيەدا نابینن، گۆڤاری ((الشیوعی)) کە لەمۆسکۆ دەردەچوو لەژمارەی یۆلیۆ ١٩٧٩دا ڕایگەیاند کە ((ڕێگەی نێوەند)) لەڕووی بابەتیەوە مەحاڵـەو، تـەنیا دوو سیسـتمی کۆمەڵایـەتی و سیاسی دژ هـەن و، پرۆسـەی بەجەمسـەر بـوون ناکرێ تیابچێت، بـەڵکو بەپێچـەوانەوە بـەهێزتر دەبێـت، تەنانـەت هـەموو دەوڵەتـەکان زوو بـێ یـان درەنـگ خۆیـان دەبیننـەوە کـە بەسەرمایەداریەوە یان بە سۆشیالیزمەوە لکاون.

(مالطا)دا. زیادبوونی ئەم ڕێژەیە لەبەریتانیادا تەنیا ٥٪ بوو. بەڵام پێویستە ئەوە بەهەند وەربگرین کە پرۆسەی پەرەسەندن ڕەوتی خۆی زۆر زوو وەرگرت لەئینگلتەراداو، لەم ڕووەوە ئینگلتەرا گەیشتە حاڵەتێك لەهاوسەنگی بوون پێش هەر دەوڵەتێکی دیکە. دیموکراسیەتی سۆسیالیستی ((ئاوێتەیەکی جێگیرە))، و شێوەیەکە لەشێوەکانی هاوسەنگی کۆمەڵایەتیو سیاسی لە ئەوروپادا.

مەکسیك و فەنزویللا دوو دەوڵەتی نزیکن لە ((سۆشیال دیموکرات))یەوە، لەبەر ئەوە لە جێگیرترینی دەوڵەتانی ئەمریکای باشوورن، شتێکی زانراویشە کە ئەم ناوچەیە لە شێواوترینی ناوچەکانی جیهانە. پەرەسەندن لە یاباندا سەری نەکێشا بۆ جەمسەر بوون بەڵکو بۆ هێزی نێوەند. زاراوەی ((ڕێگەی نێوەند))یش بوو بەو زاراوەیەی کە زیاترو زیاتر لە گفتوگۆ سیاسیەکاندا لە مەکسیك و یاباندا دەبیسترا، لەکۆبونەوەی ((سۆشیال دیموکراسی خوازەکان))دا لەکراکاس ساڵی ١٩٧٦ کۆبوونەوەکە بە ((کۆبوونەوەیەکی مێژوویی)) ناونرا لەو ڕووەوە کە چەند بڕیارێکی گرنگی لێوە دەرچوو، هەروەها بۆ هەستکردن بەوەی هەنگاوی یەکەمە بەرەو داڕشتی مەزهەبێکی نوێ ـ وتەکەی قسەکەری مەکسیکی ((جونزالزسوس)) Gonzales Sos ئەوە دەگەیەنێت کە ئەم مەزهەبە چۆن مەزهەبێك دەبێت، دەڵێت: ((لە دنیایی ئێستادا سێ هەڵبژاردنی سیاسی گەورەمان لەبەردەمدایە: سەرمایەداری و شیوعیەت و دیموکراسیەتی سۆشیالیستی، مەکسیکیش لەسەریەتی یەکێك لەم سیانە هەلبژێرێت)).

شلەژانی ناوخۆیی لە دەوڵەتە سۆشیالیستەکاندا وەك گرفتێکی ئابووری گرنگی بە سۆشیالیزم نادات، چونکە مەترسیدارترین نەیار تێیدا لە خەمی گرفتی مافەکانی مرۆڤدایە، لەگشت شوێنێکدا وادەردەکەوێت گەلان ڕوو لەجۆرێك لە مەسیحیەت بکەن کە خاوەن بەرنامەیەکی سۆشیالیستیە، یان لە سۆسیالیزمێك بەبێ ئیلحادو دیکتاتۆریەت ـ واتە ((سۆسیالزمێکی خاوەن ڕوویەکی مرۆیی[٢٧]))، لەچیندا –بۆ نموونە– لەدوای مردنی

---

[٢٧] / ئەمە ئەوەیە کە ((مۆریس دیڤرجر)) بەو پرۆسەیەی ناودەبات کە دەربازبوون نییە. لێی...ئاراستەیەك بەرەو ئازادی لە خۆرهەڵاتداو ئاراستەیەکیش بەرەو سۆشیالیزم لە خۆرئاوادا)).

بڕوانە: کتێبەکەی: Maurice Diverger: Introduction a La Politique(Paris: Gallimard, 1970), P.367.

((ماوتسی تۆنگ))ەوە وردە وردە شانسۆر لەسەر کارەکانی ((بیتهۆڤن))و ((شکسپیر)) هەڵگیرا ئەگەرچی ئەمەیش بەبێ ئارەزوویەکی راستەقینەو بوونی قەناعەتیش بێت بەڵکو ئەمە بەهەمان ئەو رێبازە بوو کە تێیدا شانسۆر لەسەر کارەکانی ((دستۆیفسکی)) و ((شاجال)) و ((کافکا)) لە یەکێتی سۆڤیەتی ((پێشوو)) لابرا. خواستی ئازادی دەنگی زیاترو زیاتر لە دەوڵەتەکانی ئەوروپای خۆرهەڵاتدا بەرز دەبێتەوە... گرنگ نی یە ئەگەر خاویش بێت، مەسەلەکان هەر ئەم ئاراستەیە دەگرن و ئاراستەکەیش یەکجار روونە*.

قەیرانی دەوڵەتە سەرمایەدارەکان لەجۆرێکی دیکەیە، لەگەڵیدا خواستی دەست تێخستنی زیاتری لەلایەن کۆمەڵگەوە تێکەڵ بووەو، ئەمەش برێك لە کۆنترۆڵ کردنی ئازادی بێ سنووری لەگەڵدایە، بەهۆی چەند هۆکارێکی کرداریەوە بینیمان کارگە ئەمریکیەکان ئاراستەیان رووەو خۆماڵی کردنە لەکاتێکدا دامەزراوە ئابووریەکان لە یەکێتی سۆڤیەت ((پێشوو))دا دوور لە مەرکەزیەت دەجوڵێنەوە. پرۆفیسۆر ((ویدنباوم)) Wiedenbaum وادەبینێت کە دامەزراوە ئەمریکیە هاوچەرخەکان ((نیوە خۆماڵیکراوەکان)) پشت بەستنی زۆریان بەدەوڵەت بەهەند دەگرن. کۆبوونەوەی گەورە کارەبەدەستان لەبواری سیاسی و گشتی لە وڵاتە یەکگرتووەکان و یابان و ئەوروپادا لە ((کیوتو)) بەسترا لە ساڵی ١٩٧٥دا کە بە ((لیژنەی سیانی)) ناوزەد دەکرێت. ئەم کۆبوونەوەیە لەخەمی قەیرانی زێدە رۆیی لە دیموکراسیەتدا بوو لە دەوڵەتە سەرمایەدارە پێشکەوتووەکاندا، یان ئەوەی پێ دەوترێت، ((قەیرانی دیموکراسیەت)). کۆبوونەوەکە بەچەند وەسیەتێك لەبارەی ((دیموکراسیەتی هاوسەنگ))ەوە کۆتایی هات و هەروەها ئاماژەی بە پێویستی چەند پێدا چوونەوەو راست کردنەوەیەك کرد کە پەیوەستە بە ئازادی زیادەرەوی رۆژنامە نووسینەوە. هەروەها وەسیەتەکانی کۆنگرەکە پاڵپشتی

---

*/ نووسەر ئەم قسەیەی لەکۆتایی حەفتاکاندا نووسیوە، واتە چەندساڵێك بەر لەرووخانی ئیمپراتۆریەتی سۆڤیەتی و داڕووخانی سستەمە شیوعیە دیکتاتۆریەکانی ئەوروپای خۆرهەڵات یەکبەدوای یەکدا. دانەر تێڕوانینەکەی لەسەر دووحەقیقەت بنیاتناوە: دەرککردنی راستەوخۆی وەك بیروباوەڕو شایەتێکی سەردەمەکەی و وەکو هاوڵاتیەکیش کە لەگەڵ ئازاری ئەو گەلە زوڵم لێکراوانە دا دەژی. دووەمیش باوەڕبوونی بەوەی ئەم سستەمە هەرەمەکی نارێکە دروستکراوانە کە سروشتی مرۆڤایەتی فەرامۆش دەکەن یان ئەوەی بە ((ئیسلامی فیتری)) و ((رێگەی ناوەند ناودەبرێت))، ئەم سستمانە زووبێت یان درەنگ چارەنووسیان هەڵوەشان و رووخانە. (وەرگێڕی ع).

بیرۆکەی پلان دانانی ئابوری‌و، داخوازی لێهاتوویی زیاتریان لەکارگێڕیدا کرد. ڕەنگە ئەمەیش پلانێکی تەواو نەبێت بۆ سیاسەتێکی گشتی نوێ هێندەی ئەوەی کە دەربڕی چەند ئاماژەیەکی دڵنیاکەرە بۆ دەرکەوتنی کەشێکی ئایدۆلۆژی نوێ. هەموو ئەو دیاردانەی گفتوگۆمان لەسەر کردن خاوەنی دەلالەتن لەسەر ئاڕاستەکان. بەڵام ئیسلام نییەو سەرناکێشێت بۆ ئیسلام، لەو سۆنگەیەوە بەزۆر دەکرێت‌و نەگونجاوە لەگەڵ خۆیداو کەموکوڕیشی هەیە. بەڵام ئیسلام، ڕەفزکردنێکی هۆشیارانەی سەلمێنراوە ئاینی‌و سۆشیالیستە تاکلایەنەکانەو، تەسلیم بوونێکی ئیرادیانەیە بە پرەنسیپی دوو لایەنی بوون. هەرچۆنێکیش بێت، ئەوەی بینینمان لە بەسەرداهاتن‌و لادان‌و ڕێکسازیە بەزۆرەکان، سەرکەوتنی ژیان‌و واقیعی مرۆیی دەنوێنێت بەسەر هەموو ئەو ئایدۆلۆژیایانەدا کە تێڕوانینێکی تاک لایەنانەیان هەیە، ئەمەش لەخۆیدا سەرکەوتن بۆ چەمکی ئیسلامی دەگەڕێنێتەوە.

# تەسلیم بوون بەخوا

سروشت حەتمەیەتێکی هەیە کەدەیبات بەڕێوە، مرۆڤیش قەدەری خۆی هەیە، تەسلیمبوونیش بەم قەدەرە دوا بیرۆکەی باڵای ئیسلامە.

ئایا قەدەر ئامادەیەو.. چ شێوەیەك وەردەگرێت؟ لێگەڕێ با لە ژیانمان بڕوانین تابزانین چی لەو پلانانە ماونەتەوە کە لە لامان ئازیز بوونو خەونەکانی گەنجیمان چی لێماوەتەوە؟ ئایا ئێمە نەهاتین بۆ ئەم جیهانە بێ هیچ هێزو توانایەکی خۆمان، ئینجا ڕووبەڕوی پێکهاتە کەسییەکەمان بووینەوەو، بڕێك لە زیرەکیمان پێ بەخشرا وە کەم بێت یان زۆر، چەند سیمایەکیش کە یان سەرنج ڕاکێش یاخود ڕەوێنەرەوەنو، بونیادێکی جەستەییش کە وەرزشیانە یان کورتە بنانەو لەکۆشکێکی پاشایانە یان کوخێکی هەژارانەدا گەورە بووین، لەچەند کاتێکی سەختدا یان زەمەنێکی ئاشتی، لەژێر دەسەڵاتی ستەمکارێکی توندوتیژ یان ئەمیرێکی نەجیبدا، لە هەلومەرجێکی جوگرافیو مێژووییانەی وادا کە هیچ ڕۆڵێکمان تێدا نەبووە، ڕووبەڕوو نەبوینەتەوەو ڕاوێژمان دەربارەی بەئاکام نەگەیشتووە؟ چەندە سنوردارە ئەوەی بەئیرادەمان ناوزەدی دەکەین وەچەندێکیش مەزنو بێسنوریشە قەدەرمان؟

مرۆڤ خراوەتە ئەم جیهانەوەو بۆی دیاریکراوە کە لە بووونیدا پشت بە زۆرێك لەو ڕاستیانە ببەستێت کە دەسەڵاتی بەسەریاندا نییە، ژیانیشی بەچەند فاکتەرێك کاریگەر دەبێت کە لێیەوە نزیکنو کۆمەڵە فاکتەرێکی دیکەش کەپتر لەوە لێوەی دوورن کە خەیاڵی دەیان گاتێ.

لەکاتی چوونە ناو ئەوروپاوە لەلایەن هاوپەیمانەکانەوە ساڵی ١٩٤٤ (لە ماوەی جەنگی دووەمی جیهانیدا) بۆ چەند ساتێکی کەم شێوانێك ڕوویدا کە گشت پەیوەندیە بێتەلی (لاسلکی) یەکانی گرتەوە، ئەگەری ئەوە هەبوو ئەم ڕووداوە ببێتە هۆی کارەساتێكو بەسەر ئەو کردەوە سەربازیانەدا زاڵ ببێت کە تازە ڕێگایان گرتبووەبەر.

تادوای چەند ساڵێك كەس هۆكاری ئەم شێوانەی نەزانی، پاشان ئەم حاڵەتە درایە پاڵ تەقینەوەیەك كەلە كۆئەستێرە (مجموعة نجمیة)یەكدا روویداوە كەبەكۆمەڵی ((ئەندرۆمیدا)) Andromeda ناوزەد دەكرێت، شیاوی باسە ئەم كۆ ئەستێرەیە چەندین ملیۆن ساڵی تیشكی لەهەسارەكەمانەوە دوورە. هەروەها لەسەر زەوی جۆرێك لە بوومەلەرزەی كارەساتبار هەیە كەبۆ چەند گۆڕانكاریەكی دیاریكراوە دەگەڕێتەوە كە لەسەر رووی خۆر روودەدەن.

چەندێكیش زانیاریمان سەبارەت بەجیهان گەشە كردووتر بێت دەركردنمان بەوەی كە ناتوانین ببینە خاوەنی چارەنووسەكانی خۆمان زیاتر دەبێت. تەنانەت لەگەڵ گریمانەی مەزنترین پێشكەوتنی سومكینی زانستدا، ئەوا تەنها بڕێك لەفاكتەرەكان لەژێر كۆنترۆڵماندا دەبێت كەهیچ نیە ئەگەر بەو بڕە مەزنە هۆكارانە بەراورد بكرێت كەلەدەرەوەی ئەم كۆنترۆڵەدایە. قەبارەی مرۆڤ لەگەڵ قەبارەی ئەم گەردونە زەبەلاحەدا ناگونجێت و، تەمەنی مرۆڤایەتیش بەگشتی یەكەی پێوەر نی یە بۆ ئەو روداوانەی لەم گەردونەدا روودەدەن. ئەمەش هۆكاری ئەو هەستكردن بەمەترسییەیە هەمیشەییەی مرۆڤو، ئەوەش كەلە سایكۆلۆژیەتیدا رەنگدەداتەوە لەحاڵەتەكانی رەشبینی و یاخیبوون و بێئومێدی و بێباكی، یان تەسلیمبوون بەخوا.

ئیسلام لەهەوڵی رێكخستنی ئەم جیهانەدایە لە رێگەی پێگەیاندن و فێركردن و ئەو یاسایانەوە كە دایناون، ئەمەش بوارە سنووردارەكەیەتی بەڵام بوارە فراوانەكەی تەسلیم بوونە بەخوا.

دادپەروەری فەردی بەهیچ شێوەیەك بەهۆی هەلوومەرجەكانی چیانەوە بەتەواوی نایەتەدی. ئێمە شوێن هەموو رێساو رێنماییە ئیسلامیەكان دەكەوین. ئەوانەی لەباریاندایە بەختیاریمان لە هەردوو دنیادا پێببەخشن (واتە دونیاو دوارۆژ)، هەروەها هەموو رێگە چارەیەكی پزیشكی و كۆمەڵایەتی و ئەخلاقیش دەگرینەبەر، بەهۆی تێك ئاڵانێكی ترسناكی قەدەرو ئارەزوو روداوەكانەوە، ئێمە بەردەوام جەستەو دەرونمان پێكراوەو گیرۆدەیە بەزۆرێك لەمەینەتیەكانی ژیانەوە. چی دەتوانێت سەبوری دایكێك

بداتەوە کە کورە تاقانەکەی لەدەستداوە؟ چ دڵدانەوەیەك لەتوانادایە بۆ پیاوێك تووشی رووداوێك بووەو بەهۆیەوە دانیشتوو کەم ئەندام بووە؟

پێوستە بە هەلومەرجی مرۆییمان هۆشیاربین، ئێمە نگرۆی چەند بارودۆخێکی دیاریکراوین. رەنگە بتوانم کار لەسەر گۆڕینی ئەم رەوشە بکەم، بەڵام لەوێدا چەند رەوشێك دەمێنێتەوە کە بەپێی سروشتی خۆی گۆڕانکاری قبوڵ ناکات. دەکرێت ئەم بارو دۆخانە شێوازی جیاواز وەربگرن و دەشێ هێزە زاڵەکەیمان لێ ون بێت، بەڵام ئەم حەقیقەتانە لەبەردەماندا دەمێننەوە: من هیچ دەربازبوونێکم لە مەرگ نییە، هەر دەبێ ئازارو نارەحەتیش بچێژم، تێ بکۆشم، من قوربانی بەختم، من بێ ئارەزووی خۆم دەکەومە ناو حاڵەتی هەستکردن بە تاوانەوە. ئەم بارودۆخە بنەڕەتیانە لە ژیانی مرۆڤدا پێیان دەگوترێت : (( بارودۆخە سنووردارەکان [٢٨] )) گومانی تێدا نییە ئەرکی مرۆڤ ئەوەیە هەوڵی خۆی بدات بۆ چاککردنی هەموو شتێك لەم جیهانەدا کە لە توانایدایە چاکی بکات. لەگەڵ ئەوەشدا، هێشتا منداڵانێك هەن بەشێوازێکی تراژیدیانە دەمرن تەنانەت لە کامڵترینی کۆمەڵگەکانیشدا. مرۆڤ لە باشترین گریمانەدا دەتوانێ لە ڕادەی مەینەتیەکانی

---

[٢٨] / بڕوانە: ((کارل جاسبرز)) Karl Jaspers; An Introduction to Philosophy,vol.2. (chicogo; The University of Chicago,1970):

دەڵێت: ((مەرگ و مەینەتیکانی لە (بارودۆخە سنووریەکان)ن کە بۆم پەیدابون بەبێ هیچ کردارێك لە منەوە ... دەشتوانم بە یەك ڕوانین ئەوە ببینم کە ئەوان لە سیماکانی ئەم بوونەن، بەڵام تێکۆشان و هەستکردن بەتاوان (بارودۆخە سنووریەکان)ن بەڕادەیەك کە یارمەتیدەرم لە ڕوودانیانداو بەشێکن لە کردارەکانم، بەڵام لەو ((بارودۆخە سنووریەکان))ن چونکە ناتوانم ببم بەبێ ئەوەی دروستیان بکەم بۆخۆم، هیچ ڕێگایەکیش نییە بۆ وەستاندنیان چونکە من بەهەمان بوونی خۆم بەشداریی لە پێکهاتنیاندا دەکەم. هەر هەوڵێکیش لە منەوە بۆ دوورکەوتنەوە لێیان دەبێتە بەڵگە لەسەرئەوە کە یان ئەم دوو ڕەوشە جارێکیتر دابڕێژمەوە بە دارێژانەوەیەکی تر یان خۆم لەناوبەرم، من مامەڵە لەگەڵ مەرگ و مەینەتیەکاندا دەکەم مامەڵەیکی وجودیانە لە چوارچێوەی ((ئەو ڕەوشە سنوورییەی))کە دەیبینم، بەڵام ململانێ و موعاناتەکان ناتوانم پێشوەخت دروستیان بکەم ئەمیش وە هەروەها وەکو ((ڕەوشێکی سنووری)) هەروەها دەکرێت وام لێبێت هۆشیاریم پێیان و بونیاتیان بنێم بەچاوپۆشی لەوەی کە چۆن ئەوە بکەم)).

ئەم جیهانە کەم بکاتەوە. لەگەڵ ئەوەشدا ستەمو ئازار بە بەردەوامی دەمێننەوە، هەر چەندە سنوورداریش بن، لەوە ناکەون کە ببنە هۆکارێك بۆ تەنگ پێ هەڵچنین و لادان[29].

تەسلیم بوون بەخوا یان یاخی بوون دوو وەڵامی جیاوازن بۆ هەمان پرسیار. لە تەسلیم بوون بەخوادا شتێك لە هەموو حیکمەتێکی مرۆیی هەیە تەنها یەکێك نەبێت: کە ئەویش گەشبینی رووکەشانەیە، تەسلیم بوون چیرۆکی چارەنوسی مرۆییە هەر لەبەر ئەوەش رەشبینیش بەڕوویدا کراوەیە، چونکە هەموو چارەنووسێك چارەنووسی تراژیدی خەم ئامێزە ئەگەر ئێمە هەستاین بەشیکارکردنەوەی بۆ قوڵترینی قوڵاییەکانی[30].

داننان بەقەدەردا وەڵامدانەوەیەکی وروژێنەرانەی ئەو مەسەلە مرۆییە مەزنەیە کە لە جەوهەردا ئەو مەینەتیانە لەخۆ دەگرێت کە دەرباز بوون لێیان نییە، داننانە بە ژیان بەو شێوەیەی کە هەیە، هەروەها بریاردانێکی هۆشیارانەیە بەخۆڕاگریو دان بەخۆداگرتن و خۆ ڕازاندنەوە بە ئارامگری. لەم حاڵەدا ئیسلام جیاوازە جیاوازییەکی زۆر لەمیثالیەتی دروستکراوو فەلسەفەی ئەوروپی گەشبینانەو چیرۆکە سادەکەی لەبارەی ((باشترینەوە لەهەموو ئەوەی مومکینە لەهەردوو جیهانیاندا)) ئەمەیش لەبەر ئەوەی کە تەسلیمبوون بەخوا تیشکێکی تیژپەڕە کە رەشبینی دەبڕێت و تێی دەپەڕێنێت.

وەك دەرەنجامێك داننانی مرۆڤ بەدەستەپاچەیی و هەستکردنی بەمەترسی و بێ ئاسایشی، دەبینیت تەسلیمبوون بەخوا لەخۆیدا هێزێکی نوێو ئارامیەکی تازەیە. باوەڕ بوون بەخواو باوەڕ بەسەر پەرشتیەکەی هەست کردنێکمان پێ دەبەخشێت بە ئاسایش کەناکرێت بەهیچ شتێکی دیکە قەرەبووی بکەینەوە. تەسلیم بوونیش بە خوا مانای سلبی بوون لە هەڵوێستی مرۆڤدا ناگەیەنێت وەك زۆرێك لە خەڵکی بە هەڵە واگومان دەبەن، لە حەقیقەتدا ((هەموو قارەمانەکان لە باوەڕداران بوون بە قەدەر[31])) گوێڕایەڵی خوا گوێڕایەڵیو ملکەچی بۆ مرۆڤەکان دەخاتە لاوە. پەیوەندییەکی نوێیە لەنێوان مرۆڤو خواداو، پاشانیش لەنێوان مرۆڤو مرۆڤدا.

---

[29] / بڕوانە: ((ئەلبێر کامۆ)).Albert Camus; Lhomme rerolte(Paris: Gallimard.

[30] / ((جاسیت)) .Gasseth. P,d.

[31] / ((ئیمرسون)) .Emerson,n.P.d.

هەروەها ئازادییەکە مرۆڤ بە بەردەوامی باوەڕبوونی بە قەدەر دەستی دەکەوێت، درێژەدان بەتێکۆشان‌و جیهاد دوونیشانەی مرۆیی مەعقولن، تێیاندا میانڕەوی‌و پاڵفتەیی دێتە دی، ئەگەر ئێمە باوەڕمان بەوە هێنا کەئەنجامی کۆتایی بەدەستی ئێمە نیە، بەڵکو تەنیا لەسەرمانە هەوڵبدەین‌و کاربکەین، ئەوەکەی تریشی لەدەستی خوادایە.

بۆ ئەوەی هەست بەحەقیقەتی بارودۆخمان لەم جیهانەدا بکەین پێویستە تەسلیمی خوابین‌و، هەوای ئاشتی هەڵمژین‌و، وەهەمیش وامان لێنەکات تواناکانمان پەرتوبڵاوبکەین لە پەی بردن بە هەموو شتێکداو زاڵبوون بەسەریدا. پێویستە لەسەرمان ئەو کات و شوێنە قبوڵ بکەین کە لە دایك بوونمانیان لەخۆ گرتووە، کات‌و شوێنیش قەدەری خواو ئیرادەی ئەون. تەسلیم بوون بە خوا تاکە ڕێبازی مرۆییە بۆ دەرچوون لە بارودۆخی ئەو ژیانە تراژیدیەی کە نە چارەسەری هەیەو نە مانا... ڕێگایەکە بۆ دەرچوون بەبێ یاخی بوون‌و بێ ئومێدی و هیچگەڕایی‌و خۆکوشتن. هەستێکی قارەمانانەیە (نەك هەستی قارەمان)، بەڵکو هەستی مرۆیەکی ئاسایی‌یە کە بە ئەرکی خۆی هەستاوەو قەدەری خۆی قبوڵ کردووە.

ئیسلام ناوی خۆی نە لە یاساکانی و نە لە سستمەکەیەوە وەرگرتووە و نە لە حەرامکراوەکانی و نە لە کۆششەکانی نەفس‌و جەستەش کە لە مرۆڤیان دەخوازێت، بەڵکو لە شتێکەوە کە هەموو ئەمانە دەگرێتەوەو بالادەبێت بەسەریاندا: لە ساتە وەختێکی جوداییەوە کە پریشکی هۆشیاریەکی ناوەکی کڵپە دەسێنێت... لە هێزی دەروونەوە لە ڕووبەڕوو بونەوەی مەینەتیەکانی زەمانەدا... لە خۆ ساز کردن بۆ ئەگەری هەموو ئەو شتانەی لە بوونەوە بۆی دێن.. لە حەقیقەتی تەسلیم بوون بە خوا... ئەمەیش تەسلیم بوونە بە خوا.. ناوەکەش ئیسلامە !



## کورتەیەك لەژیانی نووسەر

- ( عەلی عیززەت بیگۆڤیج ) لەساڵی ١٩٢٥ز لە خێزانێکی موسڵمانی بۆسنەیی دێرین لە شاری ( کروپا ) لە کۆماری ( بۆسنەو هرسك ) لەدایك بووە.

- لە قوتابخانەکانی شاری ( سەرایێڤۆ ) خوێندوویەتی و پاشان چووەتە زانکۆو چەندەها بڕوانامەی لە بوارەکانی یاساو ئەدەب و زانستدا بەدەست هێناوە.

بۆ ماوەی ٢٥ ساڵ راوێژکاری یاسایی بووە، پاشان بەتەواوی خۆی تەرخان کردووە بۆ لێکۆڵینەوەو نووسین.

- لەساڵی ١٩٤٩ز لە سەردەمی ( جۆزێف بروزتیتۆ ) بۆ ماوەی پێنج ساڵ زیندانی کراوە لەگەڵ کاری قورسدا.

- لە پاش هەڵوەشاندنەوەی یەکێتی یوگوسلاڤیا لەگەڵ هاوەڵەکانیدا حزبی کاری دیموکراتیان پێك هێناو پاشان لە هەڵبژاردنیشدا سەرکەوتنیان بەدەست هێنا بەمەیش ( عەلی عیززەت ) لەساڵی ١٩٩٠ز بوویە سەرۆك کۆماری بۆسنەو هرسك.

# ناوەڕۆك

بەشی سێیەم :



بەشی چوارەم :

بەشی پێنجەم :



بەشی شەشەم :



دەروازە دووەم /



بەشی حەوتەم :



بەشی هەشتەم :

بەشی نۆیەم :



بەشی دەیەم :



بەشی یانزەهەم :



دوا ڕوانین /